# ئینسکلۆپیدیا
# پارێزگەها دهۆکێ

سەرنڤیسەر و سەرپەرشتێ گشتی
**موسەدەق تۆڤی**

هاریکارێ سەرنڤیسەری
خالد سالح

## بەرگێ چواری

# دیرۆکا هەڤچەرخ

٢٠١٧ ز ٢٧١٧ ک ١٤٣٩ مش

# ناڤەرۆك

# روودانێن سالا ١٩١٩ێ ل دەڤەرا بادینان "شرۆڤەكرنەكا دیرۆكی"

پ.هـ.د.سەلاح محەمەد سەلیم هرۆری
زانكۆیا دهوك - كولیژا پەروەردا بنیات

هندەك نڤیسەران ب چاڤەكێ ئایینی تەماشەیی روودانێن سالا ١٩١٩ێ ل بادینان كرییە، وێ هزرێ دكەن، كۆ گرێدانا موكما كوردان ب ئایینێ ئیسلامێ و هەبوونا هێزا بریتانیا یا كافر ل دەڤەرێ ل گەل رۆلێ دەولەتا ئۆسمانی بۆ خورتكرنا ڤێ هزرێ، كوردێن بادینان دژایەتییا لەشكرێ بریتانیا كرییە. بەلێ خواندەكا دیرۆكی و شرۆڤەكری بۆ ڤان روودانان دێ هندەك خال وپێشهاتێن نوی دبابەتی دا ئاشكرا بن، وەكی: رەنگێ رێڤەبەریا كاربەدەستێن بریتانی ل دەڤەرێ وپالپشتییا وان بۆ ئاسوورییێن دەڤەرێ، رۆلێ خوە د چێكرنا ڤان روودانان دا كرییە.

ڤان روودانان سەرۆكێن عەشیرێن دەڤەرێ هەڤنێزیكرینە، ئەڤە ژی وەكە خالەكا بەێز د ڤان روودانان دا پەیدا دبیت، د قۆناغێن ڤان روودانان دا، ئەڤان سەرۆكان ب هەڤرا نەخشێ چەپەران ل هەمبەری لەشكرێ بریتانی دارێژتییە، و لەشكرێ وان د ئێك چەپەردا شەركرییە. كەسایەتیێن ئایینی ژی وەك شێخ ئەحمەدێ بارزانی و شێخ بەهائەدینێ نەقشەبەندی تەڤلی ڤان روودانان بووینە، ئەڤ خالە ژی گرۆڤێ وێ یەكێ یە، كۆ دەستەلاداریا ئایینی-عەشیری بۆ قورتالكرنا دەڤەرێ ژ لەشكرێ بریتانی هەڤگرتییە.

ب پێداچوونەكا هویر بۆ بابەتی دێ هندەك خالێن دی یێن گرنگ ئاشكرا بن.

## دەستەلاداریا بریتانیا ل دەڤەرا بادینان:

پشتی ئاگر بەستا مودرس (چریا دووێ ١٩١٨)ێ دناڤبەرا بریتانیا و دەولەتا ئۆسمانی هاتییە مۆركرن، و شەر دناڤبەرا هەردو دەولەتان دا هاتییە راوەستیان، لەشكەرێ ئنگلیزی باژێرێ مووسلێ گرت، و كاپتن لیچمان كرە حاكمێ سیاسی ل باژێری، پاشان لەشكەرێ ئینگلیزی بەرەڤ دەڤەرێن باكوورێ مووسلێ (دەڤەرێن كوردی) هات. هەر چەندە ل ڤێرێ ژێدەرێن دیرۆكی ب رۆناهییەكا ئاشكرا بەحسێ هاتنا لەشكرێ ئنگلیزی بۆ دەڤەرا بادینان ناكەن، بەلێ

ل دووڤ ژێدەرێن بەردەست خوەیا دبیت، لەشكرێ ئینگلیزی بێ شەر دەڤەرا بادینان گرتییە،(مس بیل) ل سەر ڤی بابەتی دیار دكەت، ل دووماهیا چریا دووێ كولونیل لیجمان (حاكمێ سیاسی یێ بریتانی ل مووسلێ) سەرەدانا باژێركێن تەلەعفر و شنگال و زاخۆ و ئامێدیێ و دهۆك و پیرەكەپرێ و ئاكرێ كر، كو هێشتا ئالایێ توركی ل ڤان دەڤەرا یێ هەلاویستی بوو و هندەك ژ لەشكر و كارمەندێن توركی ل ڤان دەڤەرا ل سەر كارێ خوە بوون، بەلێ لیجمان ئالایێ ئنگلیزی ل جهێ یێ توركی بلندكر و كارمەند و لەشكرێ تركان ژ جهێن وان راگرن، وهاریكارێن حاكمێ سیاسی ل ڤان جهان دەستنیشانكرن، ب ڤی رەنگی ئەڤ دەڤەرە هەمی كەتنە دبن دەستەلاتداریا ئنگلیزی ڤە[1].

(عزیز الحاج) ژی دیار دكەت: بریتانیا حاكمێن سیاسی و هاریكارێن وان ل دەڤەرێن كوردی دامەزراندن، كو كارێن ئیداری و ناڤخۆیی ددەستێ وان دا بیت، و ئەوان هەڤبەندی ژی ل گەل سەرۆك عەشیرەتێن كوردان هەبیت، و دیاریا ژی پێشكێشی وان بكەن، هندەك ژ ڤان حاكما هاریكارێن خوە هەبوون ئەو ژی سەرۆك عەشیرەتێن دەڤەرێ بوون و ل جهێ حاكمێ سیاسی یێ بریتانی رێڤەبەری دكر[2].

دیسان (محمد امین عثمان) دبێژیت: دەمێ لەشكرێ بریتانی دهۆك و زاخۆ و ئامێدیێ و ئاكرێ ستاندی، ل سوارەتۆكا بنگەهێ لەشكرێ دانا، هەروەسا هندەك لەشكرێ دی ل گوندێ بێبادێ (نێزیكی ئامێدیێ) و ل باژێركێن دهۆك و زاخۆ و ئاكرێ و ئامێدیێ جێگیركر، و ل هەر قەزایەكێ حاكمەك دانا وەك هاریكارێ حاكمێ مووسلێ.[3]

ل دۆر گۆتنێن سەری دیاردبیت، بریتانیا بۆ گرتنا دەڤەرا بادینان كارێ لەشكری بكارنەئینایە، بەلكی حاكمێ سیاسی یێ مووسلێ ئالایێ بریتانی ل ڤان دەڤەرا بلندكرییە و لەشكرێ ئنگلیزی ل ڤان دەڤەرا بەلاڤكرییە.

كارێ بریتانیا بۆ رێڤەبەریا كاروبارێ كارگێری ل ویلایەتا مووسلێ (ژوانا دەڤەرا بادینان) بێ ئاستەنگ ب رێڤەدچوو، چونكی توومار و بادەكێن فەرمی یێن توركی هێشتا مابوون، جوداهی ل گەل یێن ویلایەتێن دی وەكی یێن بەغدا و بەسرا نەبوون یان هاتبوون سۆتن، و بریتانیا بۆ كارێ كارگێری ل دەڤەرێ مفا ژ ڤان توومار و بادەكێن فەرمی یێن توركی وەرگرت[4]، هەروەسا بریتانیا ئەو سیستەمێ كارگێری بكارئینا ئەوێ تركان ل دەڤەرێ بكارئینای، و ل گەل هندەك گوهۆرینێن بچویك، ئەفسەرێ (حاكمێ) سیاسی یێ بریتانی جهێ (متصرف)ێ تركان ل دەڤەرێ گرت، ل گەل وێ چەندێ بریتانیا هەر ئەڤ كارە ل دەڤەرێن دی ژی بكارئینا بوو. بریتانیا چەند یەكەیێن كارگێری ل دەڤەرێن كوردی دانا بوو، وەكی ویلایەتا مووسلێ، (ژ دەڤەرێن زاخۆ، دهوك، شنگال، ئامێدیێ، ئاكرێ پێكهاتبوو)، و سلێمانێ و كەركوك و هەولێرێ، كەسەك وەك حاكمێ سیاسی یێ بریتانی ل ڤان ویلایەتان وەك كەسێ ئێكێ دانا بوو، هەر ولایەتەك ژ چەندین قەزا پێكدهات و ل هەر قەزایەكێ قائمەقام (هاریكارێ حاكمێ سیاسی) و ٢٤ سوار و رێڤەبەرەكێ دارایی هەبوون، و قەزا ژ چەندین ناحییان پێكدهات، كو ل ژێر رێڤەبەریا (مامورەكێ دارایی) ڤە بوو. ئەڤ مامورە یێ بەرپرسیار بوو بەرامبەر رێڤەبەرێ دارایی ل قەزایێ، دیسان ل هەر ناحیەكێ رێڤەبەر و كاتب و كۆمەكا كێم ژ سوارا هەبوو، و ناحییە ژ چەندین گوندان پێكدهات، كو موختارێ گوندی رێڤەبەر بوو و كارێ موختاری پەیداكرنا تەناهیێ ل گوندی و دەستنیشانكرنا بەرهەمێ چاندنێ و ل گەل مامورێ ناحیێ یێ دارایی ئەڤ كارە دهاتە كرن، موختاری مفا ژ هندەك داهاتێ جوتیاران وەردرگرت، ٣٪ێ ژ هندەك بەرهەمێ بازرگانیێ ل گوندی دهاتە وەرگرتن[5].

بریتانیا ل دەستپێكا حوكمێ خوە ل دەڤەرێن كوردی گرنگییەكا تایبەت دابوو وەرگرتنا باجێ، ئەوێ یاسایێن توند بۆ وەرگرتنا باجێ دەرئێخستبوون، ب رێژا ١٠٪ێ باجە ژ چاندنێ دهاتەوەرگرتن، هندەك باجێن دی یێن گران هەبوون، ل گەلەك كاودانانڤدا رێژا باجێ گەلەگ گران دبوو، بۆ نموونە ل باژێرێ سلێمانیێ و پشتی سەرهلدانا شێخ مەحمودی

یا ئێكێ و ل سەر دەمێ حوكمێ میجەر سونی ل سلێمانیێ باجە ب رێژا ١٥٪ێ ژ سەردەمێ حوكمێ تركان ل دەڤەرێ گرانتر بوو(٦).

باجێن گران و رێكێن نەباش یێن وەرگرتنا وێ كارتێكرن ل سەر سەروبەرێ دەڤەرێ یێ ئابووری یێ لاواز كربوو، نەخاسمە هێشتا دەڤەرێن كوردی ل ژێر كاریگەریا كاودانێن سالێن شەرێ جیهانیێ ئێكێ دەرباس نە ببوو، د ماوەیێ سالێن شەری دا كولپ و



شێخ مەحموودێ بەرزنجی(١٨٨١-١٩٥٦)

تالانكرنێن مەزن ب سەر دەڤەرێن كوردی داهاتبوون.

سیاسەتا ئەفسەرێن بریتانی بەرامبەری سەرۆك عەشیرەتێن كوردان ئەگەرێ لاوازیا دەستەلاداریا وان سەرۆك عەشیرەتان بوو ب تایبەتی ل سەر دەڤەرێن وان، نەخاسمە دەمێ حاكمێن بریتانی هندەك كەسێن دی وەك كارمەندێن دەولەتێ بۆ وەرگرتنا باجێ دەستنیشانكرین(٧). ئەڤ رەنگێ سیاسەتێ ژبلی بریارێن وەرگرتنا باجێ ب وی رەنگێ مە دیاركری، كارتێكرن مەزن ل سەر رەوشا دەڤەرێن كوردی هەبوو نەخاسمە ژ لایێ سیاسی و جڤاكی و ئابووری ڤە، ئەڤە هەمی ببوون ئەگەرێ پەیداكرنا دژاتیەكێ ل دەف كوردان بەرامبەر ڤێ هێزا دەستەلادار.

## ئەگەرێن روودانێن سالا ١٩١٩ێ:

### ١- رێڤەبەریا بریتانی:

رەنگێ كارگێری یێ بریتانیا ل دەڤەرا بادینان، ئەگەرەكێ سەرەكی بوو بۆ پەیدابوونا چەندین نەرازیبوونان دژی بریتانیا، سیاسەتا هاریكارێن حاكمێ سیاسی یێ مووسلێ، ئەنجامدانا حوكمەكێ راستەوخۆ ل دەڤەرێ بوو، ئانكو هەمی كاروبارێ كارگێری و ناڤخۆیی ددەستێ وان دا بوو، وەكی دیرۆكنڤیسەك دبێژیت "ئێك ژ ئەگەرێن ڤان روودانا (مەبەست روودانێن دەڤەرا بادینان) نەرازیبوونا سەرۆك عەشیرەتێن كوردان بوو بەرامبەر حوكمێ راستەوخو یێ بریتانی)، ل جهەكێ دی دیاردكەت: كابتن (وایلی) (هاریكارێ حاكمێ بریتانی ل ئامێدیێ) رژدی ل سەر حوكمەكێ راستەوخۆ ل ئامێدیێ دكر. هەروەسا لیجمانی هاریكاریا وی بۆ ڤێ چەندێ دكر(٨).

كارێن حاكمێن سیاسی یێن بریتانی ل دەڤەرێ بووینە ئەگەرێن ڤان روودانان مینا كارێ وایلی ل ئامێدیێ بۆ دابەشكرنا كەل و پەلێن خوارنێ و پارەیی ل سەر جۆتیاران، كۆ بەری هاتنا بریتانیا و ل سەردەمێ ئوسمانیا ددەستێ سەرۆك عەشیرەتێن كوردان دا بوو، هەروەسا هاریكاریا فەلا (ئاسووریان) دهاتەكرن ل دەمێ دابەشكرنا ڤان كەل وپەلان، دیسان ژ كریارێن بریتانیا گەلەك جاران وەسا دیاردبوو، كو ئەوان ل بەرە ئەردێ بوسلمانان ژی بدەنە ئاسووریان(٩).

بێ گومان ئەڤ رەنگێ كارگێری پالدەرەك بوو بۆ پەیدابوونا دژاتیەكێ دژی بریتانیا، هندەك شاشیێن كارگێری ژی هاریكاریا ڤان پالدەران كربیە و كەسێن بریتانی بخوە بەحسێ ڤان شاشیێن كارگێری كربیە، وەكی ویلسون دیاركەت: سەركردێ فرقا (١٨) هندەك لەشكەر ل زاخۆ و دهۆكێ و ب دووراتیا

١٤ میلا ژ ئامێدیێ بەلاڤکرییە بێی بزڤریتە بنکەهێ سەرەکی[١٠]. و ل جهەکێ دی دبێژیت : کابتن وایلی بێ ئاگەهداریا بنکەهێ گشتی یێ بریتانی هێزەکا لەشکری ژخەلکێ دەڤەرێ دامەزراندییە[١١].

و سەبارەت ئەگەرێ روودانا دەڤەرا زێباریان ویلسون دبێژیت : (سکوت)ی ل دوومەهی یا چریا ئێکێ پارەك وەك سزا دانایە سەر دو سەرۆك عەشیرەتێن زێبار یا فارس ئاغا و بابەکر ئاغایی. ویلسون ل جهەکێ دی دا شاشیێن حاکمێن بریتانی دیارکرینە، دبێژیت: "کوشتنا پیرسونی (هاریکارێ حاکمێ سیاسی یێ بریتانی ل زاخۆ) شاشی وی رەنگێ رەفتارا وی ل گەل عەشیرەتێن کوردان دیاردکەت"[١٢].

ژ گۆتنا سەری دیاردبیت رەنگێ رێڤەبەریا حاکم و ئەفسەرێن بریتانی ل دەڤەرا بادینان بوییە ئەگەرێ پەیدابوونا چەندین بزاڤان دژی دەستەلاتداریا بریتانی ل دەڤەرێ.

هەروەسا (عبدالمنعم الغلامي)ب درێژی بەحسێ رەفتارا حاکم و ئەفسەرێن بریتانی ل دەڤەرا بادینان کرییە، دەمێ دبێژیت "شاشیێن کارگێری یێن حاکمێن سیاسی یێن ئینگلیزی" ئێك ژ ئەگەرێن ڤان رووداناں بوو[١٣]، دیسان ل هندەك جهێن دی دیارکرییە، ئەو کەسێن بریتانیا ل دەڤەرێ دەستنیشانکرین ب رەنگەکێ نەباش رەفتار ل گەل خەلکی کرییە[١٤]، هەتا گەلەك ژڤان کەسان دەست درێژی ل سەر خەلکی کرییە، بۆ نموونە وایلی بخوە گەلەك جارا رەفتارێن نەباش هەمبەری سەرۆك عەشیرەتێن کورد کرییە.[١٥]

(عزیز الحاج) سەبارەت سەرەدەریا بەرتیانیا ل گەل کوردان دبێژیت "رەنگێ نەباش یێ رەفتارا ڤان ئەفسەرێن بریتانی رۆلێ خوە د پەقینا ڤان رووداناں دا هەبوو"[١٦] و ل جهەکێ دی ژی دیاردکەت "رووداننێن ئاکرێ و دەڤەرێن دی ئەنجامێ کارێن نەباش یێن ئەفسەر و کەسێن بریتانی بوو"[١٧].

ب گشتی ئەم دشێین بێژین ئەفسەرێن بریتانی ئەوێن هاتینە دەستنیشانکرن ل دەڤەرا بادینان چ ژ رەوشت و تیتالێن کوردا نەزانییە ژبەر ڤێ چەندێ کەتینە د چەندین شاشیاندا، و ئەو سیاسەتا ل دەڤەرێ بکارئینانی ل دووڤ بەرژوەندیا خوە بکارئینایە، بزاڤ و رووداننێن ل دەڤەرێ پەیدابووین ئەنجامێ ڤێ سیاسەتێ و رەنگێ رێڤەبەریا وان یا نەباش بوو.

## ٢- ئەگەرێ ئایینی:

ئەگەرێ ئایینی ژی رۆلێ خوە د روودانێن سالا ١٩١٩ێ ل دەڤەرا بادینان هەبوو، ژێدەرێن دیرۆکی گەلەك بەحسێ ڤی ئەگەری کرییە، مینا (عبدالمنعم الغلامي) دەمێ دیاردکەت: ئەگەرێ ئایینی و باوەریا کوردان یا موکم ب یاسایێن قورئانا پیرۆز، ئەو پالداینە ڤان رویدان و دژاتییا بریتانیا، کوردان هزر دکر، کۆ ئەو وەك هێزەکا کافر و غەریب هاتینە دەڤەرێ دڤێت دەستەلاتداریێ ل دەڤەرێ بکەن.[١٨] دیسان (عزیز الحاج) ددەتە خویاکرن: هەستێ ئایینی ل دەڤ کوردان یێ ب هێز بوو و ئێك ژ ئەگەرێن ڤان روودانان بوو[١٩].

ژ ڤان هەردو گۆتنان دیار دبیت کۆ ئەگەرێ ئایینی ژی رۆلێ خوە دڤان روودانان دا هەبوو، بەلکو ئەم دورنابینین خەلکێ دەڤەرێ بەرێ خوە دایە لەشکرێ بریتانی (نەخاسمە بەهرا پتر ژ لەشکرێ وێ ژ هندێ بوون) وەك کافر و فەرە جیهاد دژی وان بێتە کرن، ودبیت سەرۆك عەشیرەتێن کوردان سەرکردێن ڤان روودانان ئەڤ ئەگەر بکارئینابیت بۆ خورتکرنا هەستێ خەلکێ دەڤەرێ دژی لەشکرێ ئنگلیزی.

## ٣- رۆلێ ئاسووریان:

بریتانیا گەلەك خوە نێزیکی ئاسووریان کربوو هێزەکا لەشکری ب ناڤێ (لیڤی– لیوی) ژ وان پێکئینابە، کۆ ڤێ هێزا لەشکری بۆ هندەك مەبەستا بکاربینیت[٢٠]. و بریتانیا هاریکاریا وان کربوو وێن دناڤ ڤێ هێزێدا کارکری، و بۆ بەرژەوەندیا خۆ و بۆ بجهئینانا نەخشێ خوە ل دەڤەرێ بریتانیا مفا ژ ڤێ هێزێ وەرگرتییە[٢١]، ل دوور ڤێ چەندێ (مس بیل) خویا دکەت: ئەڤ روودانە وەك خو نەرازیبوونەکێ بوو دژی دەستەلاتداریا بریتانی بوو. دیسان (مس بیل) ئەڤ

نەرازیبوونە ب رەنگێ دژاتییا فەلا دیارکرییە[٢٢].

(عبد الرزاق الحسني) ژی دیاردکەت: ئاسووریان د گەلەك روودانان دا، ژوانا رووداننێن ل کوردستانێ پەیدابووین پشتگیرییا بریتانیا کریوو[٢٣].

(غلامي) "ئاکنجیکرنا تیاریان ل گوندێن کوردان ژلی وان ماف و هاریکارێن بریتانیا بۆ بەرهەڤکرین" ب ئێك ژ ئەگەرێن ڤان روودانان دزانیت[٢٤].

(عزیز الحاج) خوەیا دکەت: ئنگلیزی گەلەك ئاسووری کرینە دناڤ هێزا لیڤی دا و بۆ کارێن کوشتنێ بکارئینانینە، ئەڤ کارە ژی بووینە ئەگەرێ پەیدابوونا دژاتییا کوردان دژی ئاسووریان.[٢٥]

کوتلوف دبێژیت "ئاکنجیکرنا ئاسووریان ل دەڤەرێن کوردی بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا دژاتیێ دناڤبەرا کورد و ئاسووریان دا"[٢٦].

گرنگیپێدانا بریتانیا ب ئاسووریان بوویە ئەگەرێ پەیدابوونا دەنگ و باسا دناڤ کوردان دا، کو بریتانیا دێ دەولەتەکا ئاسووری دامەزرینیت، کورد ژی دێ بنە پشکەك ژ ڤێ دەولەتێ[٢٧].

ل ڤێرێ وەسا دهێتە دیارکرن ڤی ئەگەری ژی رۆلێ خوە د ڤان روودانان دا هەبوو، چونکی بریتانیا ئاسووری بۆ مەرەما خوە و بجهئینانا نەخشێ خوە یێ ئیستعماری بکارئینانینە، ژبلی پەیداکرنا دووبەرەکیێ دناڤبەرا بوسلمان و فەلا دا، ژبەر ڤێ چەندێ ژی بریتانیا ب هاریکارییا ئاسووریان یا بەردەوام کریوو.

## ٤- پروپاگندا تورکی:

ژێدەرێن بریتانی پروپاگندەیەکا تورکی ب ئەگەرێ سەرەکی بۆ روودانا دەڤەرا گوییان دبینن، بەلێ د روودانێن دی دا (روودانێن دەڤەرێن ئامێدیێ، گولییا، ئاکرێ)، چ بەلگێن دیار ل دۆر هاریکارییا تورکی بۆ ڤان روودانان نینن.

د راپۆرتا ئێك ژ بەرپرسێن بریتانی دا، ناڤێ وی (ملیز)ە دیاردبیت، کۆ ئێك ژ چەڤەنگێن پەیدابوونا گرفتارییا ل باکوورێ دەڤەرا زاخۆ(مەبەست روودانا دەڤەرا گوییایە) سەرۆکێ عەشیرەتا هەڤێرکا (عەلیێ بەتێ) و سەرۆکێ شەرنەخا (عەبدولرەحمان شەرنەخی) یە، دیسان (ملیز) پێدا دچیت و دبێژیت: کونگرە ل باژێرێ میدیاتێ ل ١٠ ئادارا سالا ١٩١٩ێ و ب ئامادەبوونا سەرۆکێن عەشیرەتا هەڤێرکا و شەرناخ و صەلاحیە هاتییە گرێدان، مەرەما سەرەکییا ڤی کونگرەی دامەزراندنا قولپەکێ ل دژی بیانییا (مەبەست بریتانی نە)[٢٨].

(مس بیل) ژی خویا دکەت: سەرۆکێ عەشیرەتا شەرنەخ (عەبدولرەحمان شەرنەخی) ل ١٩ ئادارا ١٩١٩ێ هاتییەگرتن و چەندین پەرتۆك (نامە) ل گەل دا بوون، ناڤەرۆکا ڤان نامان ل سەر پالدانا کوردان بوو، کو ل دژی بیانییا (بریتانیا) ب راوەستن، دڤان ناماندا هاتییە: ب هاریکارییا حوکمەتا تورکی و ب پالپشتییا وێ ئەڤ بزاڤە دهێتەکرن، چەند لیژنە و کەسێن دی ژی ل ستەنبۆلێ و قاهیرە و پاریس دەست دڤێ بزاڤێ دا هەیە، مەرەما وان وەکی دیار دامەزراندنا دەولەتەکا کوردی یا سەربەخۆیە، چەندین ئەفسەرێن تورك ژی سەرەدانا دەڤەرێن کوردی کرییە و ئێك ژ وان هاتییە دناڤ ویلایەتا مووسلێ دا[٢٩].

دیسان درایڤەری ژی بەحسێ کارتێکرنا پرۆگاکندا تورکی کرییە دەمێ (عەبدولرەحمان شەرنەخی) کرییە پالدەرێ سەرەکی بۆ روودانێن دەڤەرا گوییا[٣٠].

ژێدەرێن دیرۆکی بو پەیدابوونا روودانێن دەڤەرێن بادینان ل سالا ١٩١٩ێ ئاماژە ب هندەك ئەگەرێن دی کرینە، مینا (عبدالمنعم الغلامي) دەمێ بەحسێ رۆلێ کۆمەلا (العهد) ل مووسلێ دکەت، کۆ ئەڤێ کۆمەلێ هەڤبەندی ل گەل سەرۆك عەشیرەتێن کوردان چێکرینە[٣١].

ئەم دبێژین بۆ پەیدابوونا هەر رویدانەکێ پێدڤیە چەندین ئەگەر هەبن، گرنگە ئەڤ ئەگەرە گرێدای ب بارێ ناڤخۆیی یێ وێ دەڤەرێ ڤە هەبیت، ئەگەر سەرۆبەرێ ناڤخۆیی یێ هاریکار نەبیت، بێ گۆمان رووداون و بویەر پەیدانابن، لەورا ئەم دبینین کو پەیدابوونا روودانێن سالا ١٩١٩ ئەگەرێن ناڤخویی و سەروبەرێ دەڤەرێ بوو، ژبەر سیاسەت و کارێ کارگێری یێ بریتانیا ئەگەرێن سەرەکی بوون یێن ڤان

روودانان بوو، سەبارەت رۆلێ كۆمەلا (العهد) دڤان روودانان دا، ل بەری مە ئاماژە ب ڤێ هزرا خەلەت هاتییەكرن و گەنگەشە ل سەر هاتییەكرن[٣٢]. و بتنێ دێ بێژین كوتلوف ژی دبێژیت: بزاڤا كوردی بزاڤەكا سەربەخۆ یە، و ژ بزاڤا نیشتمانی یا كۆمەلا (العهد) جودایە[٣٣].

دیسان ئەگەرێ نەتەوەیی وەك پالدەرەك رۆلێ خوە دڤان روودانان دا دیتییە، بەلێ نە ل وی ئاستێ نوكە ئەم تێدگەهین، یان هزرا نەتەوەیی و خوە قورتالكرن ژ دەستەلاتداریا بریتانی گەلەك ژ كوردان بۆ ئەنجامدانان ڤان روودانان پالداینە، چونكی هزرا نەتەوەیی یا كوردی ل وی سەردەمی نەگەهشتبوو قوناغەكا پێشكەتی ل ڤێ دەڤەرێ. و ئەم نابێژین نەبوو بەلكو هەبوو و یا تێكەل بوو ل گەل گەلەك هەستێن دی وەكی یێن جڤاكی و ئایینی.

## روودانێن دەڤەرا بادینان

**ئێك: روودانا دەڤەرا گۆییان:** ئەڤ رویدانە ل ٤ نیسانا ١٩١٩ێ پەیدا بوو، وەكی د ژێدەرێن دیرۆكی دا هاتییە دیاركرن هێزێن لەشكرێ ئنگلیزی ل ئێكی كانوونا ئێكێ یا سالا ١٩١٨ێ گەهشتبوون زاخۆ و كاپتن ووكر وەك هاریكارێ حاكمێ سیاسی ل دەڤەرێ هاتە دەستنیشانكرن، بەلێ پشتی چەند رۆژا كاپتن پیرسونی جهێ وی وەك هاریكارێ حاكمێ سیاسی یێ بریتانی ل زاخۆ گرت، دیسان چەندین كەسێن دی بۆ هاریكاریا پیرسونی ژبو رێڤەبەریا دەڤەرێ دەستنیشانكرن[٣٤].

كاپتن پیرسونی و ئەو كەسێن ل گەل وی كاركرین گەلەك رێك ژبۆ سەپاندنا دەستەلاتداریا بریتانی ل دەڤەرێ بكارئینانە، ئەڤ چەندە ژی بوویە ئەگەرێ نەرازیبوونا خەلكێ دەڤەرێ، و هەتا د دەرفەتەكا نێزیك دا هزرا كوشتنا وی بێتەكرن، ل دووڤ ژێدەرەكێ دیرۆكی دیار دبیت، كۆ سەرۆكێن دەڤەرێ گەنگەشا كارێن نەرەوا یێن پیرسونی دكر هەتا گەهشتنە وێ چەندێ هزرا كوشتنا وی بكەن ل دەمێ ئەو سەرەدانا دەڤەرێ بكەت[٣٥].

سەرەدانا پیرسونی بۆ دەڤەرا گۆییان ل دەستپێكا هەیڤا نیسانا سالا ١٩١٩ێ دەرفەتەك بوو بۆ سەرۆكێن كوردان ل دەڤەرێ، كو كارێ كوشتنا وی ئەنجام بدەن، پیرسونی سەرەدانا گوندێ سەناتێ و بلەهێ و كرۆرێ كر، دروینشتنەكێ دا ل گەل حەسو دینویی پیرسونی ڤیا ب پارەی ئەوی ب كێشیت لایێ هێزا ئنگلیزی، بەلێ حەسو دینو ب توندی دژی ڤێ چەندێ راوەستیا، دەمێ پیرسونی گوندێ كرۆرێ ل ٤ نیسانا ١٩١٩ێ بجهـ هێلایی و بەرەف زاخۆ هاتی حەسو دینویی بویسەك ل جهەكێ دەستنیشانكری بو وی دانا بوو، و دەمێ گەهشتییە جهێ دەستنیشانكری گوولە بارانكر و د ئەنجامدا پیرسون دڤێ بویسێ دا دهێتە كوشتن و ئەو لەشكرێ ل گەل دا ژی دهێنە ژ چەكرن. و ل دەمێ حاكمێ سیاسی ل مووسلێ كاپتن (لیچمان)ی ب ڤێ چەندێ زانی چەندین فرۆكە هنارتنە دەڤەرێ ژبو بومبا بارانكرنێ، و كارێ پەیادە یێ لەشكری نەهاتە ئەنجامدان چونكی رێكێن هاتن و چوونێ د باش نەبوون لەوا بریتانی یا بتنێ فرۆكە ب كارئینان، بەلێ چ ئەنجام نەبوون چونكی دەڤەرێن دەستنیشانكری نە دهاتنە بومبە بارانكرن[٣٦].

روودانا دەڤەرا گۆییان جهێ مەترسیا بەرپرسێن بریتانی ل ستەنبۆلێ و میسوبوتامیا بوو لەورا مەندوبێ بریتانی ل ستەنبۆلێ ئەدمیرال (ویب)ی د نامەكێ دا بۆ مەندوبێ بریتانی ل میسوبوتامیا دیاردكەت: پێدڤییە مفا ژ (عەبدولقادر نەهری) بێتە وەرگرتن و بێتە هنارتن و ژلایێ دەولەتا ئوسمانی بۆ دەڤەرا گۆییان ب مەرەما رازیكرنا سەرۆكێن دەڤەرێ، كو جارەكا دی سەروبەر ئارام بكەن. ژلایێ خوە ڤە مەندوبێ میسوبوتامیا بەرسڤا وی ددەت و دیاردكەت: ئەڤ رویدانە ب پرۆپاگندا توركی هاتییە ئەنجامدان و داخواز كر، كو دەولەتا ئوسمانی هێرشەكا لەشكری بكەتە دەڤەرێ، و پێشنیازكر نوینەرەكێ بریتانی ژی ل گەل ڤێ هێرشێ دا بیت هەرچەندە دەولەتا ئوسمانی رازیبوو ل سەر پێشنیازا سەری و ژێدەر دیاردكەن كو دەولەتا ئوسمانی هێرشەك كرە دەڤەرێ بەلێ رەنگێ هێرشێ دیار ناكەن[٣٧].

**دو: رووداننا دەڤەرا ئامێدیێ:** ئەڤ رویدانە ژی ئەنجامەك بوو ژ ئەنجامێن وێ سیاسەتا بریتانیا دژی خەلكێ دەڤەرێ ب كارئینایی، ئەڤ سیاسەتە ژی بۆ ئەگەرێ سەرۆكێن ئێل و سەرۆكێن مالمەزنێن دەڤەرێ بكەهنە ئێك و بەحسێ رەنگێ سەرەدەریا وێ ل گەل كوردان بكەن، هەتا گەهشتنە وێ چەندێ نەخشەكی بۆ سەرهلدانەكێ بدانن. هەژی گۆتنێ یە شێخ (بەهائەدین) ژی ئەڤ رێكە لێ پیرۆز كربوو[٣٨].

دەنگ و باسێن لڤلڤینا سەرۆكێن دەڤەرێ گەهشتبوون هاریكارێ حاكمێ سیاسیێ بریتانی ل ئامێدیێ (كاپتن وایلی)، ئەوی ژی داخواز ژ حەجی رەشید بەگێ بەرواری كر بێتە ئامێدیێ ب مەرەما گرتنا وی، بەلێ بەرواری ب هێزەكا مەزن گەهشتە ئامێدیێ، كۆ هندەك دبێژن ٥٠٠ لەشكر ل گەل خوە ئینا بوون ٣٠٠ ژ وان ل گەل خوە برنە د ئامێدیێ دا و ٢٠٠ێن دی ل دەور بەرێن ئامێدیێ هێلابوون. دەمێ (وایلی) بەرواری ب ڤێ هێزێ ڤە دیتی ئێكسەر ژ بریارا گرتنا وی لێ ڤەبوو و ب رێزڤە پێشوازیا وی كر. و بەری بەراوری ئامێدیێ بجهـ بهێلیت ل گەل حەجی شەعبان محەمەد صالح ئاغایی كومبوونەكا نەپەنی گریدا، دڤێ كومبوونێ دا بریارا ئەنجامدانا بزاڤەكێ ل دژی هێزێن ئنگلیزی دان، كۆ ل شەڤا (١٥)ی هەیڤا تیرمەهێ بیت، دیسان بریار هاتە دان ئەڤ بزاڤە ب سەرۆكاتیا حەجی شەعبان ئاغایی بیت. ل ڤێرێ وەسا دهێتە دیاركرن، ئەڤ بزاڤە ب نەخشەكێ و ب سەركرداتیا (عەبدوللا سەعدوللا)ی هاتیە ئەنجام دان، و ل دووڤ بریارا كومبوونا ناڤبری هێزێن كوردی هێرشەك كرە بنكەهێ هاریكارێ حاكمێ بریتانی ل ئامێدیێ، و دڤێ هێرشێ دا هاریكارێ حاكمی (وایلی) هاتە كوشتن ل گەل چەندین كەسێن دی. ویلسون سەبارەت ڤێ روودانێ خوەیا دكەت: چەندین ئاغایێن كورد گەهشتنە ئێك و بریار دا هێرشەكێ بكەنە ئامێدیێ و ل شەڤا (١٥)ی هەیڤا تیرمەهێ شیان بچنە دناڤ باژێری دا، هەتا گەهشتینە بنكەهێ هاریكارێ حاكمی، پاشی بەرەڤ ژوورا حاكمی چوون و شیان (وایلی و مكدونلد و تروب)ی بكوژن[٣٩].

پشتی ڤێ روودانێ، بامەرنێ و بێبادێ ژ دەستێ هێزێن ئنگلیزی هاتە ستاندن، پشتی ڤان كارێن لەشكری، هەمی لەشكرێ ئنگلیزی ل نێزیك سوارەتۆكا كۆمبوو، ب مەرەما بەرهەڤكرنا هێرشەكا مەزن ل سەر ئامێدیێ، ویلسون ل دۆر ڤان رووداننان دیاردكەت: فرقا (١٨)، كو ب سەرۆكاتیا (نایتنكیل)ی بوو ل گەل هندەك هێزێن بریتانی ژ بەغدا بەرەڤ دەڤەرێ هاتن، ویلسون پێدادچیت و دبێژیت "جەنرال كاسلس سەركردێ ڤان بزاڤێن لەشكری بوو، هێزا لەشكری یا بریتانی ب سەرۆكاتییا (سر جورج ماكمن) بوو مەبەستا وێ ڤەگەراندنا دەستەلاداریا بریتانی بۆ سەر دەڤەرێ بوو." ئانكو ویلسون بەحسێ (لیچمن)ی دڤان رووداننان دا ناكەت[٤٠]. بەلێ (غلامی) دیاردكەت: دەمێ (لیچمن)ی ب دەنگ و باسێن ڤێ روودانێ زانی ئێكسەرهاتە سوارەتۆكا و پشتی ب سەروبەری زانی جارەكا دی زڤری مووسلێ، ژبۆ بەرهەڤكرنا هێزەكا لەشكری، كو ئەوی سەرپەرشتیا ڤی كارێ لەشكری ل دەمێ هێرشێ كربوو[٤١].

لەشكرێ ئنگلیزی، كو ژ دو فەوجا و چەند فرۆكا پێكاتبوو، ل ٣ تەباخا سالا ١٩١٩ێ گەهشتنە نێزیكی بامەرنێ و دەست ب تۆبارانكرنێ كر، و ژبەر هێزا مەزن یا لەشكرێ ئنگلیزی شێخ (بەهائەدین)ی بریار دا، شەر بەرامبەر وان نەهێتە كر، دەمێ ئنگلیز چوویە دباژێری دا، شێخ (بەهائەدین) گرت و ڤرێكرە باژێرێ مووسلێ. گرتنا وی جهێ نەرازیبوونا كوردان بوو، نەخاسمە كوردێن هەكاری و ئاكرێ. ژێدەرێن دیرۆكی دیاردكەن، حەجی رەشید بەگێ بەرواری ڤیا هاریكاریا خەلكێ بامەرنێ بكەت، بەلێ دەمێ گەهشتیبە نێزیك بامەرنێ ئنگلیز دناڤ بامەرنێ دابوو، وهێزا بەرواری شیا بۆ ماوەكی هاتنا لەشكری بۆ ئامێدیێ گیروبكەت و ئەڤە دەرفەتەك بوو، بۆ حەجی شەعبان ئاغایی، كو خێزانا خوە ژ ئامێدیێ دەربێخیت[٤٢].

ل ٦ تەباخا سالا ١٩١٩ێ هێزا ئنگلیزی گەهشتە د باژێرێ ئامێدیێ دا و دەست ب گرتنا خەلكی كر،

(٥) كورد ژ وان سێدارەدان، ویلسون سەبارەت ڤێ چەندێ دبێژیت "هندەك ژ وان كەسێن دەست د كوشتنا حاكمێن سیاسی یێن بریتانی دا هەی هاتنە سێدارەدان"[٤٣].

پشتی هێزێن بریتانی باژێرێ ئامێدیێ ستاندی ڤیا بچیتە دەڤەرا بەروارییا، ب مەبەستا سزادان و گرتنا وان كەسێن ب سەرهلدانێ رابووین، بەلێ دەمێ لەشكرێ بریتانی، كۆ ژ دو فەوجێن لەشكری پێكهاتبوو، گەهشتییە دناڤ گەلیێ مزیركا دا هێزا كوردی ب سەرۆكاتییا حەجی شەعبان ئاغایی بوو و هێزا بەراوری یا كو ب سەرۆكاتییا حەجی رەشید بەگێ بەراوری، كو ژ (٢٥٠) زەلاما پێكهاتی بوو، دەور و بەرێن گەلی گرتبوون، و ل دەمێ دەست نیشانكری، كوردان ژ هەمی لایەنانڤە ئاگر لێ باراند. (غلامی) دیار دكەت، شەری دوو رۆژان ڤەكێشا هەتا چەكێ سپی (خەنجەر) ژی هاتە ب كارئینان، پتر ژ (٧٠٠) كەسان ژ لەشكرێ بریتانی هاتنە كوشتن ژ وانا نەقیب (لویس) و میجەر شبرد، ژبلی چەندین چەكێ گران ژی كەفتە دەستێ هێزا كوردی دا. و (لیچمن) ئەوێ ل گەل هێزا بریتانی شیا خوە قورتال بكەت وبەرەڤ مووسلێ بچیت[٤٤]. مایی سەبارەت ڤی شەری دیار دكەت: بتنێ (دو دەمژمێران شەری ڤەكێشا بوو و كوشتیێن بریتانی(٥٠٠) كەس بوون.[٤٥] بەلێ (غلامی) ئاماژە ب بەیانەكا بریتانی دكەت سەبارەت ڤی شەری[٤٦].

دبەرێ خۆدانەكێدا بۆ ژێدەرێن مە ئاماژە پێكری دیاردبیت: ژێدەرێن بریتانی بەحسێ ڤێ رووادنا گرنگ نەكرییە، دیسان ژێدەرێن دی ژی ژمارەكا مەزن ژ كوشتیا دیاركرییە هەتا دو رۆژا شەری ڤەكێشایە، ئەڤ جیاوازیا دناڤبەرا ژێدەران دا جهێ پرسیاركرنێ یە ب تایبەتی ژمارا كوشتییان، بریتانیا (٧٠٠) كوشتی دڤێ رووادنێ دا ژ دەست دابن، ئەرێ ئەوێ چەند لەشكر دڤان شەران دا بكارئینابیت؟ ، ب هزرا مە ئەڤ ژمارە گەلەك ژ راستیێ دوورە، یان دو رۆژان شەر هاتبیتەكرن، ئەڤە ژی جهێ گۆمانێ یە!

**سێ: رووادنا سوارەتۆكا:** پشتی ب دووماهاتنا رووادنا ئامێدیێ ، ژێدەرێن بریتانی دیاردكەن: لەشكرێ وان بەرەڤ دەڤەرا بەرواریان چوو، ئانكو شەرێ گەلیێ مزیركا كارتێكرن ل سەر هێزا وێ یا لەشكری نە كرییە، پشتی ڤان رووادنان هێرشا لەشكرێ كوردان بۆ سەر لەشكرێ بریتانی ل سوارەتۆكا ل ٢٢ تەباخا سالا ١٩١٩ دەسپێدكەت ، ویلسون ل دۆر ڤێ هێرشێ دبێژت "هندەك ژ هۆزێن كوردی هێرش كرییە بنگەهێ مە یێ لەشكری ل سوارەتۆكا و جهێن بلند یێن هنداڤ بنگەهێ گرتبوون، بەلێ لەشكرێ مە شیا بگەهتە ڤان جها و ئەوان دووربكەن..."[٤٧]. (غلامی) وەسا دیاردكەت، هێزا كوردی و ل گوندێ (سەیداڤا) نەخشە ژلایێ صادق برویی و تاهر ئاغایێ هەمزانی و حەسو دینویی هاتبوو دانان، و ل رۆژا ٢٢ تەباخێ هێرشەك مەزن كربوو بنگەهێ لەشكرێ بریتانی ل سوارەتۆكا و شەر هەتا پشتی مەغرب یێ بەردەوام بوو، و(٣٠) كەس ژ كوردان هاتبوون كوشتن (٢٠) ژوانا بریندار ببوون، و ژوانا (حەسو دینو) بوو، دیسان



سادق برو _ زیندان ١٩٥٨

گەلەك ژ لەشكرێ بریتانی ژی هاتبوون كوشتن، و ل رۆژا دووێ فرۆكەیێن بریتانی دەست ب توپبارانكرنا گوندێن دەڤەرێ كر[٤٨].

**چوار: رووادنا دەڤەرا گولییان:** وەسا دیارە، كو پشتی رووادنێن بامەرنێ و ئامێدیێ و سوارەتۆكا بریتانیا لەشكرێ خوە بۆ قۆناغەكا نوی بەرهەڤكر، وەكی ویلسون بخوە دیاردكەت: لاپەرەكێ نوی ژ بزاڤان ل (١٨) تەباخێ دەسپێكر، ئەڤ لاپەرە ل دەڤەرا گولییان دەسپێكر، لەشكرێ بریتانی ژ هێزێن دو جەنەرالان پێكهاتبوو، ئەو ژی هێزا جەنەرال (وولدرج) وهێزا جەنەرال (نایتنكل)ی ل گەل فەوجەكا ئاسووریا، هێزا لەشكرێ بریتانی ل نیڤا ئێلولێ گەهشتبوو دەڤەرا گولییان و دەڤەرێن بەهنینە و گەلا شابانیێ و دەشتكا چیێ و ملا عەرەبی هەمی كۆنترۆلكرن[٤٩].

پشتی بریتانیا ئەڤ دەڤەرە هەمی گرتین، صادقێ برویی و ل گەل سلێمانێ قوتی و تاهر ئاغایێ هەمزانی و حەجی رەشید بەگێ بەرواری و حەجی شەعبان ئاغایی و حەسو دینویی دەست ب بەرگریێ كر، و ب چەندین قۆناغان دەڤەرا گولییان ژ لەشكرێ بریتانی پاقژ كر. د شەرێ ئێكێ دا، گوندێ بەهنینە كەتە دەستێ هێزا كوردی، دشەرێن دی دا كەلا شابانیێ هاتە ستاندن، پاشی دەشتكا چیێ (كو لەشكرێ ئنگلیزی ئوردیا خوە ل وێری دانا بوو) ئەو ژی هاتە ستاندن، د قۆناغێن دی دا گوندێ ملا عەرەبی ژی كەتە د دەستێ هێزا كوردی دا، هەتا ل دووماهیێ لەشكرێ بریتانی نەچار بوو خوە ڤەكێشیت باژێرێ زاخۆ[٥٠]. (غلامی) دەمێ بەحسێ شكەستنا بریتانیا دكەت دڤان شەراندا دبێژیت "هێزێن ئنگلیزی تۆشی شكەستنەكا مەزن بوو، پتر ژ (١٣٠٠) كەس ژ لەشكرێ وێ هاتبوون كوشتن، و چەكەكێ گران كەتە دەستێ كوردان دا، لەشكرێ بریتانی ژ نەچاری خوە ڤەكێشا گوندێ گركێ سندییان نێزیك باژێرێ زاخۆ"[٥١].

دڤان رووادنێن سەری گەلەك خال هەنە پێدڤی روهنكرنێ نە ژوانا:

١- لەشكرێ بریتانی تۆشی زیانەكا مەزن، هەر چەندە ژێدەران ژمارەكا مەزن یا كوشتیێن لەشكرێ بریتانی دیاركرییە. بەلێ دەمێ جارا دووێ هاتی ب لەشكرەكێ مەزن ڤە هاتە دەڤەرێ.

٢- هاریكاریا ئاسووریا (هێزا لیڤی) بۆ لەشكرێ بریتانی، هەتا د هندەك شەراندا بتنێ وان شەردكر، یان د هندەك جهێن ئاسێ دا ئەوان رۆلەكێ مەزن دیتییە.

٣- گەلەك ژێدەران ئاماژە ب هندێ كرییە، كو صادقێ برویی فرۆكەكا ئنگلیزی ئێخستییە ژ وانا (رەفیق حلمی)ی[٥٢] و (غلامی)[٥٣]، خەلكێ دەڤەرێ ژی ئەڤێ سوحبەتێ دكەن، بەلێ مە كەس نەدیتییە كو شوینوارێن ڤێ فرۆكێ دیتبن، ئانكو بتنێ گوتنە دناڤ خەلكێ دهێتە گوتن.

هەژی گۆتنێ یە، لەشكرێ بریتانی ب هێزەكا مەزن ڤە هێرش كرە دەڤەرا گولییان، هەر چەندە بەرگرییەكا موكم ژ لایێ كوردان ڤە هاتبوو ئەنجامدان نەخاسمە ل چەپەرێ بەهنینە و كەلا شابانیێ، بەلێ ژبەر هێزا بریتانی و چەكێ وێ یێ گران سەرۆك عەشیرەتێن پشكدار دڤان رووادنان دا نەچاربوون دەست ژ شەری بەردەن، مەرەما وان ئەو بوو دا زیانێن مەزن ب خەلكێ نەكەڤن، خوە بۆ ناڤ دەڤەرا گوییان ڤە كێشان، ئەڤ دەڤەرە ژی تۆشی هێرشا بریتانی بوو، وەكی ویلسون دیاردكەت: فرقا (١٨) ژ لەشكرێ بریتانی، كۆ ژ هێزا جەنەرال (نایتنكیل و وولدرج)ی پێكهاتی بوو، شیان بگەهنە دەڤەرا گولییان و گوندێ كرۆرێ ب سۆژن و تولا خوە ژ وان ڤەكەن ئەوێن پیرسون كوشتی[٥٤]، بڤێ چەندێ رووادنا دەڤەرا گولییان ژی ب دووماهی هات.

**پێنج: رووادنا دەڤەرا ئاكرێ و زێبار:** ل دەسپێكا چریا دووێ رووادنێن دەڤەرا ئاكرێ و زێبار دەسپێكر، دڤان رووادنان دا بارزانی و زێباری و خەلكێ ئاكرێ شیان وێنێن باش ژ بەرخودانێ پێشكێش بكەن، باژێرێ ئاكرێ بۆ چەند رۆژان كەتبوو د دەستێ هێزا كوردی دا.

مستر بیل ل ١٢ چریا ئێكێ سالا ١٩١٩ێ وەك

حاکمێ سیاسی یێ بریتانی ل باژێرێ مووسلێ هاتە دەستنیشانکرن، کو بەری وی (لیچمن) حاکمێ سیاسی یێ ڤی باژێری بوو، مستر بیل ل دووماهی یا هەیڤا ناڤبری سەرەدانا دەڤەرا ئاکرێ کر، ب مەبەستا زانینانا سەروبەرێ ڤێ دەڤەرێ و موکمکرنا دەستەلاداریا بریتانی، مستر بیل و ل گەل کاپتن (کی.ئار.سکوت)ی، کو هاریکارێ حاکمێ سیاسی یێ بریتانی ل ئاکرێ بوو (ل ٩ چریا ئێکێ سالا ١٩١٩ێ ببوو هاریکارێ حاکمێ ل باژێرێ ناڤبری) و عەبدولکەریم (کو فەلە بوو وخەلکێ گوندێ بێدارێ ئەوا ل نێزیك زاخۆ بوو) ژی وەك وەرگێر و هێزەکا پۆلیسێن ئاکرێ ل گەل بوون. هەمی بەرەف گوندێ (بیرە کەپرا) چوون و داخوازا بەرهەڤبوونا فارس ئاغایێ زێباری و برایێ وی مەحمود ئاغا و بابەکر ئاغا پسمامێ فارس ئاغایی یە، کۆ ل گوندێ ناڤبری کر، ل دەمێ بەرهەڤبووین مستر بیل بەحسێ سەروبەرێ دەڤەرێ کر، گۆت: پێدڤییە ئەو ئێمناهیێ بپارێزن، چونکی ئەو بەرپرسێن ڤێ دەڤەرێ نە، دیسان (بیل)ی بریاردا، ئەو چەکێ خوە رادەستێ بریتانییا بکەن، هەروەسا ژ نوکە پێڤە باجێ بدەنە بریتانییا، وسزایەك دانا سەر فارس ئاغایی و بابەکر ئاغایی چونکی زەلامێن وان هندەك مرۆڤ ژ (شبانە) یا (کو هێزەکا بریتانی یە) کوشتینە، پاشی (بیل)ی ل گەل هێزا ل گەل دا، گوندێ (بیرە کەپرا) بجهـ هێلا و بەرەڤ گوندێ (بلە) چوون، کۆ مەرەما وی کۆمبوون ل گەل شێخ ئەحمەدێ بارزانی بوو، بەلێ بەری بیل بگەهیتە دەڤەرا بارزان دەنگ و باسێن وی و کارێن وی ل گەل خەلکێ گەهشتبوون شێخ ئەحمەدی، دیسان زێباری یا نەخشێ کوشتنا (بیل)ی دانا بوو و داخوازیا هاریکاریا شێخ ئەحمەدی کربوو،

کو ئەوی ژی ژلایێ خوە ڤە برایێ خوە محەمەد صەدیق و گەل چەند زەلاما هنارتبوون گوندێ (بیرە کەپرا).ل دەمێ بیل گەهشتیبە نێزیك بنگەهێ شێخ ئەحمەدی کەسەك هنارت جەم شێخی بەلێ بەرسڤ نەبوو و بۆ (بیل)ی دیاربوو کو شێخی نەڤێت وی ببینیت، لەورا (بیل) جارەکا دی زڤریڤە، و بەرەڤ



**شێخ ئەحمەدێ بارزانی (١٨٩٦ - ١٩٦٩)**

گوندێ (بیرە کەپرا) هات، بەلێ ل دەمێ ژ زێیی مەزن دەربازبووی و نێزیکی گوندی (شریعە دلان) بووی، هێزا بارزانییا و زێبارییا ل هیڤیا وی بوون و ژ هەمی لایەنان ڤە ئاگر لێ باراند و بۆ ئەگەرێ کوشتنا (بیل) و (سکوت)ی و ئەو کەسێن د گەلدا[٥٥].

کوشتنا (بیل)ی و (سکوت)ی ل ٢ چریا دووێ سالا ١٩١٩ی نیشانا شکەستنا هێزا بریتانی بوو ل دەڤەرێ، لەوا هێزا کوردی شیان دەڤەرێ هەمییێ ژ هێزا بریتانی رامالن، پشتی گوندێ (شریعە دلان) ستاندی، گوندێ (بیرە کەپرا) ژی هاتە ستاندن، ل رۆژا ٥ چریا دووێ، هێزا کوردی گەهشتنە د باژێرێ ئاکرێ دا، و بڤێ چەندێ باژێرێ ناڤبری ژی هاتە ستاندن، بەلێ پشتی دو رۆژان بارزانییان خوە ژ باژێری ڤەکێشا و ل دووڤ دا و پشتی (٦) رۆژا زێباری ژی ژ باژێری دەکەرتن[٥٦].

پشتی ڤان روودانا و ب بریارا بریتانی هاریکارێ حاکمێ سیاسی یێ بریتانی ل رەواندوز کاپتن

(کیرك) و ب هێزەکا لەشکری ڤە بەرەف باژێرێ ئاکرێ هات، هەرچەندە ل دەشتا هەریر و بێتاس تۆشی هێرشا عەشیرەتا سۆرچییان بوو، وەکی (غلامی) دیاردکەت، بەلێ سەرەرایی ڤان گرفتاریا (کیرك) ل ٢٧ چریا دووێ سالا ١٩١٩ێ بێ بەرگری گەهشتە باژێرێ ئاکرێ، هەر ل وێ دیرۆکێ کیرك وەك هاریکارێ حاکمێ سیاسی یێ بریتانی ل ئاکرێ هاتە دەستنیشانکرن، وکولونیل (نولدر) بۆ حاکمێ سیاسی یێ بریتانی ل مووسلێ[٥٧].

هەژی گۆتنێ یە، شەرەکێ گران ل گوندێ گردەسینێ ل ٦ کانوینا ئێکێ دناڤبەرا عەشیرەتا سۆرچییان و هێزا کاپتن (کیرك)ی هاتبوو ئەنجامدان، و زیانەکا مەزن گەهشتبوو لەشکرێ بریتانی، وەکی (غلامی) دیاردکەت، بەلێ ل دووماهیێ ژبەر هێزا بریتانی سۆرچییان خوە قورتال کربوو و بەرەف دەڤەرێن چیایی چوبوون[٥٨].

کارێ (کیرك)ی یێ دی ئەبوو، کو جارەکا دی بگەهیت گوندێ (پیرە کەپرا)، ل (١٠) کانیونا ئێکێ سالا ١٩١٩ێ گەهشتە مەرەما خوە، فارس ئاغا ژی ل گوندی نەما بوو و خوە گەهاندبوو کوردستانا ئیرانێ ل جەم سمکویێ شکاك[٥٩].

ل ڤێرێ رووداندا دەڤەرا ئاکرێ و زێبارێ ژی ب دووماهی دهێت پشتی کوردان چەندین درێن مەزن داوەشاندینە دوژمنێ خوە بریتانییان.

گەلەك دیرۆکڤان و نڤیسەر دەمێ دەربارەی ئەگەرێن نەسەرکەتنا ڤان رووداناندیەفین، دیار دکەن: نەبوونا هەڤبەندیێ دناڤبەرا خەلکێ دەڤەرێدا ب ئێك ژ ئەگەران دەسنیشاندکەن، رەنگە ئەڤ هەڤبەندییە د ناڤبەرا خەلکێ دەڤەرا ئامێدیێ وگولییان و گۆیان دا ژ لایەکێ ڤە و د ناڤبەرا خەلکێ دەڤەرا ئاکرێ و زێبار ژ لایەکێ دی ڤە نەبیت، چونکی رێك ب وی رەنگی دخوش نەبوون، کو ب رێکان ڤە بگەهنە ئێك، بەلێ ئەگەر بەرێ خوە بدەینە رووداندێن دی وەکی رووداندا ئامێدیێ دێ بینین، کو عەشیرەتا بەرواریان و خەلکێ ئامێدیێ دژی بریتانییان ب هەڤرا شەر کرییە، دیسان د رووداندێن سوارەتۆکا و دەڤەرا گۆلییان ئەڤ هەڤکاریی دیاردبیت دەمێ عەشیرەتێن گولی و بەرواری و دۆسکی و گۆییان و خەلکێ دەڤەرا ئامێدیێ پێکڤە هەمیا دژی لەشکرێ بریتانی شەر دکری.

ئەنجامێن دی یێن گرنگێن ڤان رووداندان، خەلکێ دەڤەرێ (کورد) هاتنە کوشتن و دەڤەر دهاتە تۆپبارانکرن و زیانەکا مەزن ب گوندێن وان دکەفتن، کوردان ژبەر کاودانێن شەری گوندێن خوە بجهدهێلان و دەربەدەردبوون، ژێدەرێن بریتانی ب خوە ئاماژێ ب ڤان کریارا دکەن وەکی (ویلسون)ی دەمێ دیاردکەت، لەشکرێ بریتانی گوندێ (کرۆر) ستاندی و نیڤەکا وی سۆت[٦٠].

سەبارەت زیانێن گیانی یێن هەردو لایەنێن شەری، ژێدەرێن بریتانی ژمارێن کێم یێن کوشتییێن خوە بەرچاڤ دکەن، جوداهی ل گەل ژێدەرێن مە، گەلەك جارا ژمارا کوشتیان ژ هزارا دبۆرینن.

کارێن لەشکری ئەنجامەك نەباش ل سەر خەلکێ دەڤەرا بادینان هەبوو، بەلێ ڤان رووداندان هەڤکاری دناڤبەرا عەشیرەتێن دەڤەرێ بەرچاڤ کرییە، کو ب هزرا مە ئەڤە خالەکا سەرنجراکێشە دڤی بابەتی دا، ژبلی ڤێ رووداندێ دیارکرییە، کو کوردان دشیان دایە هەڤرکیێ بەرامبەری هێزا بریتانییان ب راوەستن[٦١].

ڤان رووداندان دیسان کارتێکرنا خوە ل سەر بریتانییا و سیاسەتا وێ هەبوو، بۆ ئەگەرێ هندێ کو جارەکا دی بەرێ خوە بدەتە سیاسەتا خوە و نەخشەکێ دی بدانیت، نەخاسمە حوکمێ نەراستەوخۆ بکاربینین، هەر چەندە هندەك ژ کەسێن کارگێری یێن بریتانی دژی ڤێ هزرێ بوون[٦٢]. ل گەل ڤێ چەندێ هندەك کەسێن سیاسی یێن بریتانی دیارکرییە، کوردان دژاتییەك بۆ بریتانییا هەیە، هەر دەرفەتەك هەبیت دێ دژی وێ سەرهلدەن[٦٣]. ئەڤان رووداندان بریتانی یا پالدایە لەشکرێ خوە ژ هندەك دەڤەرا ڤەکێشیت، بۆ نموونە لەشکرێ خوە ژ باکوورێ زاخۆ ڤەگوهێزیتە باژێرێ زاخۆ، و ل ئامێدیێ ژی بریتانییا لەشکرێ خوە ڤەکێشا دهۆکێ، پشتی (عەبدوللەتیف ئاغا) کرییە حاکم (حاکمێ مەدەنی) ل باژێری و ل دەڤەرا بەراوریا (مۆسا بەگ) کرە رێڤەبەرێ دەڤەرێ، ل دەڤەرا زێبار ژی بریتانییا لەشکر خوە ڤەکێشا باژێرێ ئاکرێ[٦٤]، ئانکو ئەڤ رویدانە بوون ئەگەرێ لاوازی و کێم بوونا دەستەلاداری یا بریتانی ل دەڤەرا بادینان.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. المس بيل، فصول من تأريخ العراق القريب، ترجمة جعفر الخياط ، (بيروت,١٩٧١)، بپ ١٥٦.

٢. د.عزيز الحاج، القضية الكردية في العشرنيات،( بيروت، ١٩٨٤)،بپ ٩٢.

٣. محمد امين عثمان، حصاد الحنظل، ( دهوك، ١٩٩٨)، بپ ٢١.

٤. بيل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٦.

٥. بنێرە بابەتێ(فترة الحكم المباشر ١٩١٩-١٩٢٠، ادارة الميجر سون في جنوب كردستان)، ژ مالپەرێ (.www.alayislam com) هاتییە وەرگرتن.

٦. هەمان ژێدەر.

٧. هەمان ژێدەر.

٨. سروة اسعد بپابر، كوردستان من بداية الحرب العالمية الاولى الى نهاية مشكلة الموصل ١٩١٤-١٩٢٦، دراسة تأريخية سياسية وثائقية، (اربيل،٢٠٠١)، بپ ٣٥٦.

٩. هەمان ژێدەر.

١٠. سر ارنلد تي. ويلسون، بلاد مابين النهرين، خواطر شخصية و تأريخية، ترجمة فؤاد جميل، تقديم و مراجعة د.علاء نورس، ( بغداد، ١٩٩٢)،ج ٣، بپ ٤٣.

١١. هەمان ژێدەر، بپ ٤٤.

١٢. هەمان ژێدەر، بپ بپ ٤٤،٥٣.

١٣. بنێرە پەرتۆكا وی، ثورتنا في شمال العراق ١٩١٩-١٩٢٠، (بغداد، ١٩٦٦)، ج ١، بپ ٣٣.

١٤. هەمان ژێدەر، بپ ٣٥.

١٥. هەمان ژێدەر، بپ بپ ٤٢-٤٣.

١٦. بنێرە، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٤.

١٧. هەمان ژێدەر، بپ ١١٣.

١٨. ژێدەرێ بەرێ، ٣٣.

١٩. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٥.

٢٠. ل دۆر ڤێ هێزا لەشکری بنێرە، رياض رشيد ناجي الحيدري، الاثوريون في العراق ١٩١٨-١٩٣٦، (القاهره، ١٩٧٧). بپ بپ ١٣١-١٣٧.

٢١. انور المايي، الاكراد في بهدينان، (دهوك،١٩٩٩)ط٢، بپ ٢٣٦؛ الحيدري، ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ١٤٧-١٥٠.

٢٢. بيل، ژێدەرێ بەرێ، ٢٢٠.

٢٣. العراق من دوری الاحتلال و الانتداب،(صيدا، ١٩٣٥)، ج ١، بپ ٢٨٨.

٢٤. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٥.

٢٥. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٤.

٢٦. ليف نيكولافيج كوتلوف، ثورة العشرين الوطنية التحررية في العراق، ترجمة عبد الواحد كريم، (بغداد، ١٩٧١)، بپ ١٩٤

٢٧. محمد امين عثمان، المصدر السابق، بپ ٢١.

٢٨. د.احمد عثمان ابو بكر، كردستان في عهد السلام،( السليمانية، ١٩٩٨)، ق ١٦.

٢٩. بيل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٤.

٣٠. احمد عثمان ابو بكر، نظرة من كتابات الكردلوغ الانكليز بعد الحرب العالمية الاولى، مجلة شمس كوردستان، العدد ٦١، اذار و نيسان ١٩٨١.

٣١. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٢.

٣٢. محمد امين عثمان، ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ٤٧-٥٥.

٣٣. كوتلوف، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٥.

٣٤. غلامي، ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ٣٤-٣٥.
٣٥. هەمان ژێدەر، بپ ٣٥.
٣٦. سەبارەت ڤێ رویدانێ بنێرە، الغلامي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٦؛ الحاج، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٣؛ محمد امين عثمان، ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ٢٢-٢٣.
٣٧. احمد عثمان ابو بكر، ژێدەرێ بەرێ، القسم (٢٥).
٣٨. الغلامي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٣.
٣٩. رفيق حلمي، يادداشت، بەشێ دووەم، (هەولێر،١٩٨٨)،بپ بپ ١٤-١٥؛المائی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٩.
٤٠. ويلسون، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٦.
٤١. ژێدەرێ بەرێ، ٤٦.
٤٢. هەمان ژێدەر، ،بپ ٤٦.
٤٣. هەمان ژێدەر، ، بپ ٤٦.
٤٤. هەمان ژێدەر، ، بپ بپ ٥٠-٥١.
٤٥. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠١.
٤٦. ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ٥٣-٥٤.
٤٧. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٧.
٤٨. ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ٥٥-٥٦.
٤٩. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٧.
٥٠. بنێرە، الغلامی،ژێدەرێ بەرێ،بپ ٦٠.
٥١. هەمان ژێدەر، ، بپ ٦٠-٦١.
٥٢. ژێدەرێ بەرێ، ،بپ ٦٢.
٥٣. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦١.
٥٤. ويلسون، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٨.
٥٥. سەبارەت ڤێ رویدانێ بنێرە، الغلامي، ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ٧٥-٨٠؛ الحاج، ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ١١٥-١١٦؛ محمد امين عثمان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٢.
٥٦. محمد امين عثمان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٢.
٥٧. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٣.
٥٨. هەمان ژێدەر، بپ ٨٤.
٥٩. محمد امين عثمان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٣.
٦٠. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٨.
٦١. كوتلوف، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٦.
٦٢. المس بيل، ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ٢٢١-٢٢٩؛ الغلامي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٨؛المائی،ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠١.
٦٣. كمال مظهر احمد، الكرد و ثورة العشرين، مجلة المجمع الكردي، ع (٦)، (بغداد، ١٩٧٨)،بپ ٥١.
٦٤. الغلامي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٨؛ المائي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠١.

# ژیانا سیاسی و پارتایەتی ل بادینان

**پ.د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی**
**زانکۆیا دهۆک - کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی**
**وەرگێران : موسەدەق تۆڤی**

## پێشگۆتن:

ل دەستپێکا دامەزراندنا دەولەتا شاهینیا عیراقێ ل هەیڤا تەباخا سالا ۱۹۲۱ێ دەڤەرا بادینان سەر ب پارێزگەها مووسلێ ڤەبوو و پارێزگەهـ ژئالیێ کارگێری ڤە ژ نەهـ قەزایان پێك دهات کو حەفت ژ وان کوردی بوون ئەوژی: (ئامێدیێ - زاخۆ - ئاکرێ - دهۆك - شێخان - زێبار (بیرا کەپرا) و شنگال و ژ دو قەزایێن دی تێکەل ژ عەرەب و تورکومان و کوردان ئەوژی (تەلەعفەر وسەنتەرێ قەزا مووسل) بوون.

ژبەر کو مووسل وەکو بازارێ کوردستانێ و تایبەت بۆ بادینان بوو، ژبەر هندێ خەلکێ وێ بێ پێڤە گرێدای بوو و بەردەوام ڕیهـ سپی و سەرۆك عەشیرەتێن وان ژ ئەگەرێ نەبوونا چ پارێزگەهێن دی ل دەڤەرێ هاتن و چوونا مووسل دکرن، ژبەر ڤان ئەگەران ژیارا سیاسی ل بادینان ناهێتە نڤیسین بێ ئاماژێ ب چالاکیێن سیاسی یێن کوردان ل مووسل و کارتێکرنا وێ ل سەر وان بێتە دان، ژ مووسلێ چالاکیێن سیاسی یێن کوردان بەرەف بازێرێن بادینان دەردکەتن و ل ڤێرە ناهێتە ژبیرکرن کو دیاردا دامەزراندنا پارتێن سیاسی دیاردەکا شارستانی بوو، ئانکو حزب ژ دایك بوویێن بازێرانە، و چ بازێرێن مەزن ل بادینان نەبوون، خۆ ناڤەندا قەزایان ژی وەکی گوندێن مەزن بوون و عەشیرەتێن کوردی کونترۆلەکا کاریگەر ل سەر هەبوو.

ژ ئەڤا بووری دیار دبیت کو دەڤەرا بادینان ب گشتی چ چالاکیێن سیاسی یێن کاریگەر هەڤبەر دگەل دەڤەرێن هەولێر - سلێمانی - کەرکوك - نە هەلدابنە، لێ دگەل هندێ هندە بزاڤێن تایبێن پارتێن سیاسییێن کوردی لێ هەبووینە و هندە کوڕێن وێ هاتینە دناڤ چالاکییان دا و هندەك ژ وان ڕۆلەکێ کاریگەر د ناڤ سەرکردایەتییا بزاڤێن وێ یێن سیاسی دا گێرایە مینا: (سالح عەبدوللا یوسفي[1] - حەمزە عەبدوللا[2] - سوبغەتوللا ئەمین حەسەن مزووری[3] - مەلا ئەنوەر محەمەد مایی[4] - وعزەت عەبدولعەزیز ئامێدی[5].

دەستپێکا هەستپێکرنا کوردان ب کارکرنێ و ئێککرتنێ درێکخستنەکا سیاسی دا ڤەدگەڕیتەڤە هاڤینا سالا ۱۸۸۰ێ، دەمێ شێخ عوبەیدوللا بێ نەهری (۲۲۰) کەسایەتیێن ڕیهـ سپی یێن کورد

ژ دەڤەرێن جودا یێن كوردستانێ ژبۆ هندێ داكو پێكبهێن و رابن ب خەباتێ سەخمەراتی سەرخۆبوونا كوردستانێ خرڤەكرین، وبەلگەنامەیەكا بەریتانی ئاماژێ ددەت: نێزیك بوو كۆمەلەكا كوردی ب ناڤێ (اتفاق الكورد) وەكی یەكەمین كۆمەلا سیاسی ولەشكەریا كوردی بێتە چێكرن.

هەر چەند ئەڤ كۆمەلە ناهێتە رێزا پارت یان كۆمەلەكا سیاسی كو پەیرە و پروگرامێن ناڤخۆ هەبن، لێ كارتێكرنێن خۆ ل سەر هشیاركرن و پێشڤەبرنا هزرا نەتەوایەتی یا كوردی كرییە، دناڤدا مەزنێن كوردان گەهشتنە وێ چەندێ كو دشیاندا نینە كوردستان بێی رێكخستن یان ئێكرتن رزگار ببیت.

ل سالا ۱۸۹۷ێ رەوشەنبیرێن كورد داخوازا پێك ئینانا كۆمەلەكا سیاسی كرن. و (سورەیا بەدرخان) ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ كو ژبو ئازادكرنا وەلاتێ خۆ، هەژمارەكا سەركردێن كوردان كۆمەلەكا سیاسی دامەزراندن، و(مەدحەت بەدرخان)ی دەست پێكر ب بەلاڤكرنا بووچون و ئارمانجێن خۆ درێكا (رۆژنامەیا كوردستان) دا ئەوا ل ۲۲ نیسانا سالا ۱۸۹۸ێ ل قاهیرە دەركەتی، ڤێ رۆژنامێ رولەكێ بەر چاڤ د هشیاركرنا هەستا نەتەوایەتییا كوردی دا گێرا. وسەقایەكێ گونجای روخساند كو پشتی هینگێ رێكخستنێن سیاسی ل كوردستانێ و ژ دەرڤەی كوردستانێ پەیدا بىن، كو خۆ كوردان ل بادینان ژی پەیوەندی پێڤەكر و نامە دگەل دگوهارتن[6].

گەلەك ژ نڤیسەران ئاماژە ب كۆمەلا (عزمی قوی كردستان) ددان، كو ئەو یەكەمین كۆمەلا سیاسییا كوردییە، ل قاهیرە سالا ۱۸۹۸ێ هاتییە دامەزراندن و چالاكیێن وێ تا سالا ۱۹۰٤ێ دبەردەوام بوون، لێ چ پێزانین و ئارمانجێن وێ نەهاتینە زانین، و بارا پتر كۆمەلەكا رەوشەنبیری بوویە، یا گرنگ د بابەتی دا ئەوە كو كوردستانا ل ژێر دەسەلاتا دەولەتا ئوسمانی هەر ژ (۱۵۱٦- ۱۹۱۸)ێ، چ پارت و كۆمەلێن سیاسیێن خودان پەیرەو وپروگرامێن ناڤخۆیی نەهاتینە دامەزراندن و زمان حال (رۆژنامە) نەبووینە، تا (۱۹ ئەیلولا سالا ۱۹۰۸ێ) واتە پشتی دو هەیڤا ژ راگەهاندنا دەستووری ئوسمانی ل ۲۳ تیرمەها سالا ۱۹۰۸ێ، دەمێ كوردان كۆمەلا (كورد تعاون وترقي جمعيتي) ل ستەنبولێ دامەزراندی و ل ۲۵ ئەیلولێ ب فەرمی بارەگایێ وێ هاتییە ڤەكرن و هەر ئێك ژ (ئەمین عالی بەدرخان، شێخ عەبدولقادر نەهری، جەنەرال شەریف پاشا، دكتور شوكری محەمەد صكبان و حاجی توفیق (پیرەمێرد) ژ دیارترین دامەزرینەرێن وێ بوون، ئەڤ كۆمەلە دمێژوویا نوو یا كوردان دا دهێتە هەژمارتن یەكەمین كۆمەلا رێكخستییا سیاسییا نەتەوەییا كوردی، و بۆ دەربرین ل سەر هزرو بیرێن وان رۆژنامەك ب ناڤێ (كورد تعاون وترقی غزتەسی) دەرئێخستن[7]. كۆمەلێ تایێن خۆ ل باژێرێن كوردان یان ئەو باژێرێن گەلەك كورد لێ هەین ڤەكرن، ل ۱۷ كانوونا ئێكێ سالا ۱۹۰۸ێ تایەكێ خۆ ل مووسلێ ڤەكر و ڤی تای پێزانین ل سەر بزاڤین خۆ و كا چ ل دەڤەرێ روودەت، بۆ ناڤەندا گشتی ل ستەنبولێ دهنارتن. ل داوییا سالا ۱۹۱۱ێ و ل ژێر كارتێكرنا كۆمەلێن سیاسی یێن كوردی ل ستەنبول كو شێخ عەبدولسەلام بارزانی(۱۸۷٦-۱۹۱٤) پەیوەندی پێڤە هەی، ل دهۆكێ كومبوونەك هاتە گێران كو ژ بلی شێخ عەبدولسەلامی هەر ئێك ژ: نور محەمەد بریفكانی وشێخ بەهائەلدین نەقشەبەندی وحەجی رەشید بەگ بەرواری تێدا بەرهەڤ بوون و بریاردان یادداشتنامەكێ بۆ هەر ئێك ژ سەرۆكایەتییا جڤاتا نوونەران(مجلس المبعوثان) وجڤاتا ماقویلان (الأعيان) وبارەگایێ ویلایەتا (مووسل) و كوپیەكێ وێ بۆ عەبدولقادر شەمزینی و ئەمین عالی بەدرخان وفەریق شەریف پاشا فرێكەن و داخواز د پێكهاتیبوون ژ:

١- زمانێ كوردی ل هەر پێنج قەزایێن كوردی، زمانێ رەسمی بیت، دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ، ئاكرێ، شنگال.

٢- زمانێ پەروەردێ ب كوردی بیت.

٣- قایمقام، رێڤەبەرێن ناحیا وكارمەندێن رێڤەبەریا ژ وان كەسا بن، كو كوردی زان بن.



**شێخ عەبدولسەلام بارزانی**

٤- چنکی دینێ رەسمییێ دەولەتێ ئیسلامە، دڤێت دەسەلات ل دووڤ شەریعەتێ ئیسلامێ ب رێڤە بچیت.

٥- دڤێت قازی و موفتی ژ مەزهەبێ شافعی بێنە هەلبژارتن.

٦- باج دێ ژ وان کەسا هێتە وەرگرتن کو ل سەر بیت، و ل دووڤ شەرعی، و یێ زێدەتر چێ نابیت ژێ بێتە وەرگرتن.

٧- ئەو پارێ ل جهێ خزمەتا لەشکری دهێتە وەرگرتن، هەر بمینیت لێ بۆ چێکرنا رێکا بێتە ب کارئینان د ڤان قەزادا.

ئەڤە ئاشکراترین داخوازێن چاکسازیێ بوون کو ژئالیێ کوردان ڤە ل وی دەمی هاتینە پێشکێشکرن، هەر چەند داخوازا جودابوونێ نەکربوون. لێ دەولەتا ئوسمانێ هێرش کرە سەر بارزان و شیان شێخ عەبدولسەلام بارزانی دەستەسەربکەن و ل ئێکی کانوونا ئێکێ ل سالا ١٩١٤ێ ل مووسل سێدارەبدەن، دیسان شێخ نۆر محەمەد گرتن و د زیندانێ دا مر، هەر وەسان محەمەد ئاغا هێشەتی و عەبدی ئاغا مزووری ژووری وعەلی محەمەد ئەمین بابسیڤی و تەتەر بەگ عەلی نێروەیی ژی سێدارەدان[٨].

بەلگەنامەکا بریتانی ئاماژێ ب هندێ دەەت کو خویندکارێن کوردان ل مووسل کۆمەلەکا نهێنی ب ناڤێ (هیڤی) ل سالا (١٩١٠)ێ دامەزراندینە[٩]، وکۆمەلێ خۆ ل ٢٧ تیرمەها سالا ١٩١٢ێ دایە راگەهاندن، دەمێ پارتا (الحرية والائتلاف العثماني) حکۆمەت پێکئینایی، وڤێ پارتێ (رابطة/کۆمبەند)ەکا کوردی پێکئینا و ب سەدان کورد چوونە د ناڤ رێزێن وێ دا، و شێخ عەبدولسەلامی بارزانی پشتگیری و هەڤسۆزیا خۆ بۆ دیار د کر[١٠].

بەری دەست پێکرنا شەرێ جیهانیێ ئێکێ ل هاڤینا سالا ١٩١٤ێ کۆمەلەکا نەتەوەییا عەرەبی ل مووسل ب ناڤێ (العلم) ژ بەر ئالایێ عەرەبی هاتە دامەزراندن و ل نیسانا سالا ١٩١٩ێ ئەڤ کۆمەلەیە چوویە دناڤ کۆمەلا (العهد) یانەتەوەیی یا عەرەبی دا و عەبدولمنعم ئەلغولامی کو ئێك ژ سەرکردێن ڤێ کۆمەلێ بوو دبێژیت: کۆمەلێ پەیوەندی ب شێخ بەهائەدینێ نەقشەبەندی ل گوندێ بامەرنێ ڤە کر و دئەنجامدا هەردو برازایێن وی شێخ جەمالودین و شێخ سەلیم و شێخ رەئوفێ کورێ شێخ عەلائەدینی هاتنە دناڤ رێزێن کۆمەلێ دا و هەر دیسان کۆمەلێ پەیوەندی ب حەجی رەشید بەگێ بەرواری و حەجی شەعبان ئاغا (سەروکێ باژێرڤانیا ئامێدیێ) ومحەمەد سالح یەحیا مزووری و تاهر ئاغا هەمزانی و مستەفا ئاغا بێسفکی و محەمەد حاجی ئاغا شەرەفانی ڤەکر، دیسان غولامی دبێژیت: کۆمەك ژ عەشیرەتێن گۆییان کو ل مووسلێ ئاکنجیبوون بازنێن پەیوەندیێ بوون دناڤبەرا کۆمەلێ و کورێن عەشیرەتا خۆ ل باکوورێ زاخۆ، و دەستەلاتێ هەست ب چالاکیێن وانا کر و (١٨) زەلام ژ وانا دەستەسەرکرن و کرنە دزیندانێ دا.

هەژی گوتنێ یە کو کۆمەلا (العهد) ل ٢٤ ئادارا ١٩١٩ شیا (٣٢) کەسان ژ کەسایەتیێن دهۆك و

ئامێدیێ و زاخۆ رازی بكەتن ئیمزایێ ل سەر راپورتەكێ (مضبطة) كو ئاراستەكری بوو بۆ كونگرێ ئاشتیێ و جڤاتا كۆما مللەتان و تێدا داخوازا سەرخۆبوونا عیراقێ و رادەستكرنا كاروبارێن وێ بێن سیاسی بۆ (شەریفێ مەكە) حسینێ كورێ عەلی كربوون و هەر د وێ راپۆرتێدا راسپاردبوون میر فەیسەل (شاهێ عیراقی یێ پاشتر) و مەولود مخلص و عەلی جەودەت كو ب ناڤێ وان د ڤی بواریدا باخڤن[11].

كۆمەلا (العلم) و پشتی وێ كۆمەلا (العهد) باندۆرا خۆ د لڤاندنا هەستا ئایینی ل دەڤ كوردان ل بادینان هەبوو داكو هندی بشێن وان د پشكداریێ د هەر بزاڤەكا نەتەوەییا كوردی دا ل پشتی شەرێ جیهانیێ ئێكێ دا دووربێخن و ناڤتێدانا وان بۆ بەرسنگگرتنا هێزێن داگیركەرێن بریتانی ل دەڤەرێن زاخۆ و ئامێدیی و ئاكرێ بكەن ژبو جێبەجیكرنا داخوازێن نەتەوەیێن عەرەبی.

## رێكخستن و تایێن كۆمەلە و پارتێین سیاسی یێن نهێنی ل بادینان ١٩٢٥- ١٩٥٨ :

پەیدابوونا ئارێشەیا ویلایەتا مووسل كو پتریا ئاكنجیێن وێ كورد بوون، ڤەدگەرێتەڤە بۆ پشتی دەولەتا ئوسمانی د جەنگێ جیهانیێ ئێكێ دا شكەستی و پێكهاتنا ئاگربەستا مودوروس ل ٣٠ چریا ئێكی سالا ١٩١٨ێ ئیمزا كری و ئینگلیزی ویلایەتا مووسل پشتی پێكهاتنا ئاگر بەستێ داگیركری، داخوازكرنا تركان بۆ ویلایەتێ ب بهانە یا هندێ كو داگیركرنا وێ كارەكێ نەیێ یاسایی و پێشێلكرنا ئاگربەستێ بوو. دەمێ ئارێشە چوویە بەر كۆما مللەتان(عصبة الامم)، بریارەك ل ١٦ كانوونا ئێكێ سالا ١٩٢٥ێ دەركر و دویات ل سەر وێ چەندێ كر كو سەر ب عیراقێ ڤەیە. هەر چەند بریتانیا گرانییا خو یا سیاسی دابوو دگەل مانا ویلایەتا مووسل دچارچۆڤی عیراقێ دا لێ كوردان ل بادینان ژی رۆلەكێ تایبەت و كاریگەر د بەرژەوەندیا عیراقێ دا هەبوو، وەكی خەیرەلدین ئەلعومەری كو ئێك بوو ژ هەڤچەرخێن روودانان دبێژیت: كوردێن قارەمان ژی لایەرەكێ زێرین نەخشاندن و عیراق ب سەركەت[12].

پشتی داگیركرنا ئینگلیزی بۆ باشوورێ كوردستانێ، تركان چ رۆل د بزاڤێن بادینان دژی دا گیركەران نەبوو، بەلكی پالدەرێن ئایینی ئەگەرێن وان بزاڤان بووینە، ژێدەر ئاماژێ ددەنە وێ چەندێ كو سەرۆك عەشیرەت و شێخێن ئایینی یێن دەستێ وان دچیت هەڤپەیڤینێن نهێنی ل ئامێدیێ ل خزیرانا سالا ١٩١٩ێ ئەنجامداینە و دناڤخۆدا رێككەفتن كو بەرەنگاریا داگیركەرێ بریتانی بكەن، دبیت ئەڤ رێكەفتنە ئەو بیت یا ب ناڤێ (الجمعیة المحمدیة) هاتییە ب ناڤكرن كو ل ٢٢ تیرمەها سالا ١٩١٩ێ پەیوەندی ب تركان ڤە كری و داخوازا پالپشتییا لەشكەری كری لێ تركان بەرسڤا وان نەدا. مرۆڤ دشێت بێژیت كو كۆمەلا محەمەدی نە كۆمەلەكا سیاسی بوو بەلكو ئێكەتییەك بوو دناڤبەرا مەزنێن كوردان ل بادینان كو ل سەر بەرخوەدانێ بەرامبەری بریتانیان پێكهاتبوون[13].

هەروەسان د ڤێ قۆناغێدا بادینان بوو مەیدانا چالاكیێن كۆمەلا سەربەخۆییا كوردان (جڤاتا خۆسەریا كورد) كو سالا ١٩٢١ێ ل (ئەرزرۆمێ) هاتبوو دامەزراندن و تایێن خۆ ل پتریا باژێرێن كوردان ڤەكرن، و ژ گرنگترین ئارمانجێن وێ سەرخۆبوونا كوردستانێ و رزكاركرنا كوردان ژ ستەما تركان بوو، مرۆڤ دشێت ڤێ پارتێ ب یەكەمین پارت یان كۆمەلەیا سیاسییا كوردی بدەتەنیاسین كو پەسنێن رێكخستنا سیاسی و ئارمانج و هەبوونا ساخلەت و مەرجێن پارتێن سیاسییێن هەڤدەم دناڤدا د ناڤدا هەبوون.

یا گرنگ ئەوە كو باژێرێ مووسل دناڤبەرا سالێن ١٩٢١- ١٩٢٧ێدا ببوو گرنگترین ناڤەندا چالاكیێن ڤێ پارتێ و شێخ مەهدی برایێ (شێخ سەعیدێ پیران) سەركردێ شۆرشا ١٩٢٥ێ بەردەوام هاتن و چوونا دەڤەرا بادینان دكر و ل مووسل ئاكنجی دبوو، و یێ دەستووردای بوو بۆ ڤەكرنا تایێن پارتێ و ژ بەر چالاكیێن وی دەسەلاتا ئینگلیزی ئەو ل زاخۆ دەستەسەركر و گرتی هنارتە بەغدا، هەژی گۆتنێ یە

کو تایێ ڤێ پارتێ پەیوەندییێن خورت دگەل کۆمەلا (پێشکەوتن)[١٤] هەبوون کو وێ ژی رێکخستنا خۆ ل باژێری هەبوو.

هەر چەند پشتی گرێدانا باشووری کوردستانێ ب عیراقێ ڤە کورد بوونە عیراقی، لێ حکومەتێن ئێك دووڤ ئێکێن عیراقێ پویتە نەداینە وێ چەندێ کو کوردان مافێ ئەنجامدانا کارێ سیاسی ب رەنگەکێ ئاشکرا هەبیت، چونکە ئەو حکومەتێن عەرەبیێن نەتەوەیی بوون و ب بەهانەیا وێ چەندێ کو پارتێن کوردی دێ تنێ گرێدای کوردان بن.

دەلیڤەنەدانا دەستەلاتدارێن عیراقێ ب هەبوونا چالاکیێن سیاسی یێن کوردی ب رەنگەکێ ئاشکەرا، کورد پالدانە هندێ کو رابن ب دامەزراندنا هندەك پارت و رێکخستنێن سیاسی یێن نهێنی و بزاڤێن خۆ دناڤدا ئەنجام بدەن، ژ بلی هندێ کو گەلەك کورد چوونە دناڤ رێزێن پارتا کومونیستا عیراقی دا ئەوا ل ٣١ ئادارا سالا ١٩٣٤ێ هاتییە دامەزراندن، چونکە تاکە پارت بوو د ئەدەبیاتێن خۆدا باوەری ب مافێ کوردان د دەستنیشانکرنا چارەنڤیسێ خۆدا دئینا.

ئەڤە ژی ئەو رێکخستن و تایێن کۆمەلە و پارتێن سیاسییێن نهێنی نە کو ل بادینان هەبوون و خەلکێ وێ دناڤبەرا سالێن ١٩٢٥ ـ ١٩٥٨ێدا بەرهەڤی د چالاکیێن واندا هەبوو:

### ١- کۆمەلەی پشتیوانی کوردان:

ئەڤ کۆمەلەیە ل ١٠ تیرمەها سالا ١٩٢٧ێ هاتییە دامەزراندن و مستەفا شەوقی (کو کەڤنە ئەفسەرەکێ ئوسمانی بوو) سەرۆکێ وێ بوو، ئارمانجا وێ ئێکگرتنا رێزین کوردان و داخوازا مافێن نەتەوەیی و پویتەدان ب زمان و ئەدەبیاتێن کوردی و ب فەرمیکرنا زمانێ کوردی ل خواندنگەهـ و فەرمانگەهێن میری ل کوردستانێ و هاندانا عەشیرەتێن کوردان دژی بریتانیا بوون، کۆمەلە شیا تایەکێ خۆ ل مووسلێ ڤەکەتن و کۆمەکا بەلاڤوکێن ناڤخویی دەربێخیت و پتریا ئەندامێن وێ ئەو ئەفسەرێن کورد بوون کو ل سەربازگەها سیارەتوکا کاردکرن و ڤان چالاکی دناڤ رێزێن سەرۆك عەشیرەتێن بادینان دا دکرن و هەر ئێك ژ سەعید ئاغایێ دۆسکی، شێخ غیاسەدینێ بامەرنی، ئێك ژ کورێن رەشید بەگێ بەرواری، شێخ عەبدولرەحمانێ ئەترووشی، فارس ئاغایێ زێباری، تاهر ئاغا هەمزانی و چەند شێخێن سۆرچییان ل ئاکرێ چوونە د ناڤ رێزێن ڤێ کۆمەلێ دا، کو شێخ ئەحمەد بارزانی وەکو سەرۆکێ تایێ وێ ل دەڤەرا عەشیرەتێن کوردیێن مووسلی هەلبژارتبوو، شێخ ئەحمەدێ بارزانی ژی هەر ئێك ژ خەلیل شاهین و عەلی محەمەد و شەریف ئاغا بارزانی وەکی پۆستەچی بکارهینانە بۆ ڤەگوهاستنا دەنگ و باس و بزاڤێن کۆمەلێ بۆ سەرۆك عەشیرەتێن دەڤەرێ. دەمێ عیراق ل سالا ١٩٣٢ێ بوویە ئەندام دناڤ کۆما مللەتاندا، شێخ ئەحمەدی نامەیەك درێکا یونس ئەحمەد دا بۆ کومەلێ ل مووسل هنارت و تێدا باسی پاشەرۆژا کوردان پشتی سالا ١٩٣٢ێ کربوو.

ئەندامێن کۆمەلێ ل مووسل بزاڤکرن پەیوەندییان دگەل چەند ئەفسەرێن عەرب ڤەگرێدەن و دگەل وان ل سەر پاشەروژا کوردان پێکبهێن، و ئەفسەرین کورد کۆمبوونەك ل مووسل گرێدان و تەکەز ل هندێ کرن کو دڤێت کورد ب گەهنە مافێن خۆ ئەگەر خۆ ڤێ چەندێ پێدڤی ب کارئینانا هێزێ ژی بوو[١٥].

### ٢- کۆمەلا زەرەدشت:

ل سالا ١٩٢٧ێ ل سەر دەستێ کۆمەکا رەوشەنبیرێن سلێمانیێ هاتییە دامەزراندن، ئارمانجا وێ ئەو بوو کارگێریەکا خۆسەری ب هەڤکاری دگەل حکۆمەتا ئیرانێ ل کوردستانێ بدەستڤە بینن و وان پەیوەندی دگەل شێخ مەحموودێ بەرزنجی و مەحموود خانێ کانی سانان ل کوردستانا ئیرانێ هەبوون، ناڤەندا کۆمەلێ ل بەغدا بوو و تایێن خۆ ل مووسل و سلێمانیێ و هەولێرێ هەبوون و ژبەر چاڤترین ئەندامێن کۆمەلێ: هۆزانڤانێ کوردێ بەرنیاس شێخ سەلام و مستەفا سائیب و شەوکەت عەزمی بابان و فوئاد مەستی و عەبدولواحد نوری و روستەم شالوم.

مستەفا سائیب ڤەدگێریت: کۆمەلە رابوویە ب پروپاگندەیێن بەرفرەهـ ل مووسلێ و پەیوەندی ب کۆمەکا ئەفسەران و حازم شەمدینی ل زاخۆ ڤە کرییە، هەر وەسان ژبۆ هەڤکاریێ و پێگڤە کارکرنێ بۆ بەرەنگاربوونا بریتانییان، پەیوەندی ب عەشیرەتێن زێباری و سۆرچی و ئێزیدییان ڤە کرییە و کۆمەلێ رێکەفتن د گەل هندەك نەتەوەخوازێن عەرەب ژی کرییە ژبو بەرهنگاربوونا داگیرکەرێن بریتانی و کۆمەلێ ژبۆ ڤێ مەرەمێ سێ نوینەرێن خۆ هنارتنە ئاکرێ دا کو هەماهەنگیێ دگەل سەرۆك عەشیرەتان بکەن کو هێرشێ بکەنە سەر لەشکەرگەهان ل دەڤەرێ. هەر دیسان کۆمەلێ رولەکێ باش د رسواکرنا تاوانا ٦ ئەیلولا ١٩٣٠ێ ئەوا حکۆمەتا عیراقێ ئەنجامدایی گێرا و شیا دەنگێ نەرازیبونێ بگەهینیتە کۆما مللەتان[١٦].

هەر وەسا کۆمەلێ رێکخستن ل زاخۆ هەبوو و حازم شەمدین ئاغای برێڤەدبر، و ژ ئەندامێن وێ کورێ مامێ وی حاجی ئاغا کو ب بزاڤێن خۆ یێ دیار بوو ب بەلاڤکرنا بەلاڤۆکێن رێکخستنێ.

## ٣- کۆمەلا خۆیبوون:

پشتی ژناڤبرنا بزاڤا سالا ١٩٢٥ێ ب سەرکردایەتییا شێخ سەعید پیران و سێدارەدانا بەرچاڤترین سەر کردێن وێ، پتریا سەرکردێن بزاڤێ نەچاربوون بەرەڤ عیراقێ و سوریایێ بچن، و ژبۆ سەروژنوی هەڤگرتنا رێزێن کوردان و ب مەرەما رووبرووبوونا دەولەتا تورکی، پەیوەندی دناڤبەرا کەسایەتی و مەزنێن کوردان‌دا هاتنەکرن ژبۆ دامەزراندنا پارتەکا کوردی کو هەموو پارتێن کوردیێن وی سەردەمی هەمبێزبکەت، یەك ژ ئەندامێن دامەزرێنەرێن کۆمەلێ (مەلا ئەحمەد شوزی) ب هەڤالینییا عەبدوللا جزیری سەرەدانا زاخۆ و دهۆك و ئامێدیێ و مووسل کرن و چاڤپێکەفتن دگەل ریهـ سپیێن بادینان ژ وانان حازم شەمدینی ل زاخۆ کرن، و دەرگەهێ پێکئینانا کۆمەلێ بۆ ڤەکر و هەمیان بەرهەڤی و رازیبوونا خۆ ل سەر ڤێ چەندێ دیارکرن.

ل کانونا ئێکی سالا ١٩٢٧ێ کۆمەلا خۆیبوون هاتە دامەزراندن، و یەکەم کونگرەیێ خۆ ل هاڤینگەها بحەمدون ل لبنانێ گرێدان و عەبدوللا جزیری نونەراتییا عەشیرەتێن بادینان دناڤ کونگرێ دا کر[١٧] و کونگرە ب سەرۆکاتییا میر جەلادەت بەدرخان بوو، ژ گرنگترین ئارمانجێن کۆمەلێ دامەزراندنا دەولەتەکا کوردی یا سەربەخۆ بوو .

کۆمەلە شیا تایێن خۆ ل پتریا باژێران ڤەکەت و چالاکیێن وێ گەهشتنە دەرڤەیی کوردستانێ ئەوروپا و ئەمریکا باکوور، ل بادینان ژی شێخ عەبدولرەحمانێ عەبدوللا گارسی بۆ بەرپرسێ تایێ کۆمەلێ یێ مووسلێ بوو، و ژبەر کو چالاکیێن وێ گەلەك د نهێنی بوون کەس نەهاتییە نیاسین ژ بلی ئەندامێ وێ مەلا خەلیل میرزا صوفي، و مرۆڤ دشێت بێژیت کو پتریا ئەندامێن جڤاتا (خۆسەریا کورد) ل بادینان چوونە دناڤ رێزێن وێ دا. هەر وەسان کۆمەلێ رێکخستنەك ب رێڤەبەریا حازم شەمدین ئاغا ل زاخۆ هەبوو، ژ دیارترین ئەندامێن وێ پسمامێ وی حاجی ئاغا کو د وارێ بەلاڤکرنا بەلاڤۆکێن رێکخستنێ یێ چالاك بوو[١٨].

ژبۆ ئێکرێزی و ئێك هەلویستی و ئەندام بوون دناڤ رێزێن کومەلێ دا، کۆمەلێ ب پەیوەندی کرن دگەل کەسایەتی و سەرۆك عەشیرەتێن کوردان و دەست ب چالاکیێن خۆ کر. ل گولانا سالا ١٩٢٨ ێ مەمدوح سەلیم ئەندامێ دامەزرێنەرێ کۆمەلێ ب مەرەما بەلاڤکرنا ئارمانجێن کۆمەلێ ل دەڤەرێ و ژبەر چالاکیێن کۆمەلێ ل بادینان ب تایبەت ل زاخۆ کو حازم شەمدین ئاغا ل وێرێ بوو گەهشتە مووسل، دەسەلاتدارێن بریتانی مەمدوح سەلیم و هەڤالێ وی فەقی ئەحمەد دەستەسەرکرن دا کو هزربیر و ئارمانجێن کۆمەلێ ل دەڤەرێ بەلاڤ نەبن[١٩] و دەستەلاتێ عەبدولرەحمان گارسی و ئوسمان سەبری کو کاردکرن دا بچنە سلێمانیێ و دیدارەکێ دگەل شێخ مەحموودێ بەرزنجی بکەن ل هەولێری دەستەسەرکرن و گرتی برنە مووسل. پاشی عوسمان سەبری رادەستی هێزێن فەرەنسی

کرن کو وان پتریا سەرکردێن خوویبوون ل دیمەشقێ دەستەسەرکرین.

ژگرنگترین ئەرکێن رێکخستنا خۆیبوون ل مووسلێ مسۆگەرکرنا رێکا پوستە و گەهاندنێ بوو دناڤبەرا رێکخستنێن کۆمەلێ ل ترکیا و ئیرانێ و عیراقێ و سوریا. ل خزیرانا سالا ١٩٣٢ نامەك ژ ناڤەندێ گەهشتە مووسل تێدا هاتبوو:

سەرهلدانەکا نوی دەڤەرێن موکس و هەکاری و ئارارات بەرپابوویە و فەرە گارسی بچیتە دەڤەرێ دا کو پەیوەندییان ب سەرهلدایانڤە بکەت و نووچەیان ب گەهینیتە ناڤەندا کۆمەلێ و گارسی ب کریار دگەل هێزەکا چەکدار ل بادینان بەرەف موکسێ ڤە چوون، لێ ژئالیێ خۆفرۆشەکێ کورد ڤە هاتە کوشتن و ل کومتا چیایێ ئارنوس هاتە ڤەشارتن[٢٠].

### ٤- کۆمەلا بڕۆسك:

ئێکە ژ کۆمەلێن کوردی کو ل مووسل ل ٤ نیسانا سالا ١٩٣٩ێ هاتییە دامەزراندن، پشتی وەغەرکرنا مەلك غازی کورێ فەیسەلی ژ ئەگەرێ روویدانا ترومبێلێ دەمێ ل بەغدا ل ستوونەکا کارەبێ دای، ب دیتنا گەلەکان ئەو قارەمانەکێ نەتەوەیی بوو، ژبەر ڤێ چەندێ گۆتگۆتك بەلاڤبوون کو ژ ئالیێ ئینگلیزی ڤە یێ هاتییە کوشتن، و پشتی نووچەیێ کوشتنا وی ل سپێدەهیا ٤ نیسانێ بەلاڤبووی خواندنگەهان سەرهلدا و خەلك ل دۆر کونسلخانا ئینگلیزی ل مووسل خرڤەبوون و قونسل کوشتن. ئەکرەم رەشید ئاکرەیی ل سەر روودانا کوشتنا مەلك غازی نڤیسییە دبێژیت:

دەمێ دەنگ و باسێ کوشتنا شاهی (مەلکی) بەلاڤبووی ئەم خویندکاربووین ل ئامادەییا مووسل، خویندکاران خرڤەبوونەك ئەنجامدان و ب خۆنیشادانان دەرکەتنە سەر جادان، و تا گەهشتینە ناڤ جادەیێن ناڤخویی یێن بازێری جەماوەر ژی گەهشتێ، و مامۆستایێن سوری کو وانە ل ئامادەیێن مووسلێ ددان ڕۆلەکێ گرنگ د رێکخستن و رێڤەبرنا خۆنیشاندانێدا هەبوون، هێشتا ل بیرا منە کا چەوان ئێکێ گۆتار بۆ سەرهلدایان دخواند کو تێدا هاتی: ئەز بانگەوازییا عەرەبان ب تنێ دکەم، و یێ نە عەرەب بلا گوهداریێ نەکەت و خۆ کەڕ ب هەژمێریت.

دیسان ئەکرەم رەشید پێدا دچیت و دبێژیت: ئەڤێ چەندێ دلگرانی و نەرەحەتی ئێخستە د دلێ خویندکارێن کورد یێن پشکداری د خۆنیشاندانێدا کری و ب ئارامی خۆ ڤەکێشان و بەرەڤ مالێن خۆ چوون، د وێ رۆژێ دا مە حەفت خویندکاران کومبوونەك ئەنجامدا و مە بریاردا کۆمەلەکا سیاسییا کوردی یا نهێنی ب ناڤێ (بروسی BIRUSI) دامەزرینین و خویندکار ژی ئەڤەبوون: حوسنیێ زاخۆیی (حوسنی حەجی رەشید)، سەدیق ئەترووشی، شەفیق محەمەد سەعدللا، سالح یوسفی، حەمزە عەبدوللا، ئەکرەم رەشید حەسەن و ناڤێ خویندکارێ حەفتێ ل بیرێ نەبوو لێ ئاماژە دا وێ چەندێ کو ئەو خەلکێ دهۆکێ بوو[٢١].

و دکومبوونا ئێکێ دا خویندکارەك ژ زاخۆ هەلبژارت کو ببیتە سەرۆکێ کۆمەلێ[٢٢] و ئارمانجێن وێ هاتنە دەستنیشانکرن ب بەلاڤکرنا هزرا نەتەوەیی و رەوشەنبیریا کوردی دناڤ جەماوەرێ کوردستانێ دا ددەمێ گونجای دا بێخنە دناڤ خەباتێ دا.

کۆمەلێ دەست ب چالاکیێن خۆ ل مووسل و بازێر و گوندێن بادینان کرن، و یەکەم کونگرەیێ خویندکار و لاوێن کورد ل بهارا سالا ١٩٤٠ێ ل گوندێ (جیلە) ل رۆژهەلاتێ یێ مووسل گێرا، مرۆڤ دشێت بێژیت کو کۆمبوونا جیلە یەکەم کۆمبوونا خویندکار و لاوێن کورد بوو ل بادینان و پتریا خویندکارێن کورد ل دوواناڤنجییێن مووسل تێدا د بەرهەڤبوون، خویندکار ب رێز بوون کو دبوونە پتر ژ پێنجی خویندکاران و ئێك ل دووڤ ئێکی ژ رێزێ دەردکەتن و ل بەرامبەر هەمیان د راوەستیا و خۆ بۆ هەڤالێن خۆ ددا نیاسین: ناڤێ خویێ سێ قولی و قۆناغا ئەو لێ دخوینت و ڤەدگەریاڤە جهێ خۆ[٢٣].

دراستی دا بروسك یەکەمین کۆمەلا سیاسی بوو خویندکارێن کورد ل بادینان دامەزراندی، چونکە کۆمەلا هیوا هێشتا رێکخستنێن خۆ ل دەڤەرێ

پێك نەهینابوون، ژبەر هندێ بروسك دهێتە هەژمارتن بەرێ بنیاتی بۆ پێکهینانا تایێن هیوا ل بادینان و پشتی وێ پارتا رزگاری کورد.

## ٥- کۆمەلا هیوا:

ئەڤ کۆمەلا نهێنی ل نیسانا سالا ١٩٣٩ێ ل کەرکوکی هاتیە دامەزراندن، رەفیق حلمی کو د وی سەردەمیدا رێڤەبەرێ ئامادەیا مەلبەندی (مرکزی) بوو ل کەرکووکێ سەرۆکایەتییا وێ دکر، هەر ئێك ژ نوری شاوەیس، یونس رەئوف(دلدار)، ئەحمەد خانەقا، موکەرەم جەمال تالەبانی و رەشید باجلان ژ دیارترین ئەندامێن لیژنا ناڤەندیا کۆمەلێ بوون[٢٤] و سالح یوسفي وهەردو ئەفسەر میر حاج ئاکرەیی و عزەت عەبدولعەزیز ئامێدی ژ کەسێن دەستپێکی بوون ژ خەلکێ بادینان د ناڤ رێزێن کۆمەلێ دا ل بەغدا.

کۆمەلێ چ پەیرەو و پروگرامێن ناڤخۆییێن چاپکری نەبوون، دبیت ئەڤە ژ بەر نهێنیا چالاکیێن وان بیت، و ئارمانجێن وان ئێکگرتنا پارچێن کوردستانێ و دامەزراندنا دەولەتەکا کوردی بوو، لێ ئارمانجێن وان یێن ئاشکرا یێ پێهاتیبوو ژ داخوازێن چێکرنا پرۆژێن مەزن و ئاڤاکرنا رێك و پران ل کوردستانێ و زمانێ کوردی ببیتە زمانێ فەرمی ل دەڤەرێن کوردان و کارکرن ژبۆ نەهێلانا سیستەمێ دەرەبەگایەتی و راکرنا ستەمێ ل سەر جۆتیاران. ئارمێ پارتیێ ژی یێ پێکهاتی بوو ژ چیایێن ب رەنگێ کەسك نەخشاندی و رۆژەکا هەلاتی دناڤ ئەسمانەکێ شیندا ل هنداڤ و ل سەر نڤیسیبە (بژیت کورد و کوردستان) و کۆمەلێ ئالایەکێ پێکهاتی ژ چوار رەنگان هەبوو ئەو ژی: سپی و کەسك و سوور و زەر[٢٥].

کۆمەلە د رێکخستنێن خۆدا سیستەمێ شانێن بچووك پەیرەو دکر و هەر شانەکێ ناڤەکێ وەرگرتی (مستعار) هەبوو، و هەر کەسەکێ دبوو ئەندام دڤێت ب قورئانێ و خەنجەرێ و ئالایێ کوردی سویند خواربا کو ئەو خیانەتێ ل مللەتێ خۆ نەکەت و خۆ سەخمەراتی کوردستانێ بکەتە گۆری[٢٦].

ئەڤ کۆمەلە دهێتە هەژمارتن گرنگترین و دیارترین کۆمەلەیێن سیاسی یێن کوردی و ب لەز پێشکەت و تا بنکەهێن وان ل پتریبا باژێر و گوندێن کوردان هاتینە ڤەکرن و ژمارەکا مەزنا ئەفسەر و نۆشدار و ئەندازیار و سەرۆك عەشیرەت و خودان پیشەیێن جودا چوونە د ناڤ رێزێن وێ دا.

نوری شاوەیس د یادداشتنامێن خۆ دا دبێژیت: ل سالا ١٩٤٠ێ وی دیدارەك دگەل سالح یوسفي ل بەغدا کر و هەر ئێك ژ عەلی حەمدی، شاهین صوفي، فەریق عەقراوی، جەمیل رەشید ئامێدی، صادق بەهائەدینێ ئامێدی، شێخ جەلال بریفکانی، سەدیق ئەترووشی و حەمە رەش (محەمەد حویزی) دگەلدا بوون و (( مە کۆمبوون کر و مە د کۆمبوونێ دا بریار دا تایەکێ هیوا (بۆ جارا ئێکێ) ل دەڤەرا بادینان ڤەکەین[٢٧] و ئەو مینا شانا ئێکێ بوون ل دەڤەرێ)).

وەسان دیارە شانا ئێکێ و ژ بەر کو هەمی ل ئێك جهـ یان باژێر نەبوون نەشیان چ چالاکیێن هەژی گۆتنێ ئەنجام بدەن و ئەڤە بۆ مە دیار دکەت کو سەرۆکێ کۆمەلێ رەفیق حلمی دڤیا تایێن کۆمەلێ ل هەر قەزایەکێ ل بادینان ڤەکەت، و ژ بۆ ڤێ چەندێ ل گولانا سالا ١٩٤٢ێ گەهشتە دهۆك و دناڤ چەمێ نور محەمەد شێخ عوبەیدوللا بریفکانی کۆمبوونەك دگەل هەر ئێك ژ نور محەمەد شێخ عوبەیدوللا بریفکانی، وشێخ جەلال نوری بریفکانی (فەرمانبەر) وصونعوللا مفتی و ئەمین سالح حەسەنکو (رێڤەبەرێ خواندنگەها سەرەتایی) و تەها مستەفا بامەرنی (ئەفسەر) کر[٢٨].

تەها بامەرنی د یادداشتنامێن خۆ دا ل سەر ڤێ کومبوونێ نڤیسیبە: رەفیق حلمی ل سەر دامەزراندنا هیوا و پەیرەوێ ناڤخۆ و ئارمانجێن وێ دگەل وان ئاخفتیبە وپشتی هەمی تشت راڤەکرین پرسیار کر ئەگەر ئێکێ پرسیارەك هەبیت، بامەرنی پرسیار ل سەر چەند خالێن گرێدای سیستەمێ ناڤخۆیی کرن، پشتی هینگێ رەفیق حلمی داخواز ژ کۆمبوویان کر بچنە دەستێ وی و سووندا تایبەت ب ئەندامبوون دناڤ هیوا دا بخوون، پاشی صونعەللا

مفتی کرنە بەرپرسێ رێکخستنێ ل قەزا دهۆك و ل سپێدەهییا دووڤدا چوو ئامێدیێ و پاشێ ڤەگەریاڤە دهۆکێ و ژ وێرێ سەرەدانا زاخۆ کر، پاشێ چوو هەردو قەزایێن شێخان و ئاکرێ و ل ڤان باژێران رێکخستنێن کۆمەلێ ژ چەندین رەوشەنبیرێن قەزایان دروستکرن و سەرەدانا خۆ ب ڤەگەریان بۆ بەغدا ب داوی هینا[29].

ژ کەسانێن دیار کو هاتینە دناڤ ریزێن هیوا دا: محەمەد سەعید مفتی، ئیسماعیل سەعید ئاغا دۆسکی، محەمەد سەعید دۆسکی، محەمەد حەسەن بالەتەیی، ئەحمەد عەبدوللا بامەرنی و ل بامەرنێ ژی: عەبدوللا مەلا خالد، ئەحمەد حاجی سەعید(مامۆستا)، سەعید نەقشەبەندی و حەجی یوسف، ل شێخان: محەمەد شاهین صوفی، عەلی خدر، حەجی بابا شێخ، مادو عەلی، مەلا عاصم شێخکی، حەیدەر بابا شێخ، محەمەد خدر، ئەنوەر مایی(فەرمانبەر)، ل ئاکرێ: میر حاج ئەحمەد (ئەفسەر)، سلێمان صورە، مستەفا یونس، بەهجەت عەبدولخالق (دادوەر)، شەوکەت ئەحمەد (ئەندازیار)، عەلائەدین سەعید، رەمەزان محسن، ئیسماعیل محەمەد تاقی، حەفزوللا ئیسماعیل و یێن دی[30].

سەبارەت قەزا ئامێدیێ: هەر ئێك ژ عیزەت عەبدولعەزیز، سادق بەهائەدین و محەمەد مەلا نەجیب رۆل د بەلاڤکرنا هزر و بیرێن هیوا دا هەبوون و دیارترین ئەندامێن رێکخستنێ ل دەڤەرێ: یونس ئەمین، ئەسعەد مفتی، یوسف محەمەد تەمەر، مەلا عەبدوللا درباز، کەمال حاجی تاهر، عەبدولرەحمان حەسەن (مامۆستا) و یێن دی[31].

رێکخستنێن هیوا گەهشتنە دەڤەرا بەرواری بالا، ب تایبەت هەردو گوندێن مایێ وبێدوهێ و ژ دیارترین ئەندامێن وان: مەلا تەها مایی، شێخ مەزهەرێ مایی، محەمەد ئەحمەد عەبدوللا، حەجی عەلی هرۆری، مەلا تەها حەبیب، سەلام شێخ تەها، شوکری عوبەید حاجی، محەمەد ئەحمەد تەها بێدوهی و عەبدوللا شانە[32].

عەونی یوسف کو ل گولانا سالا ١٩٤٢ێ ل دووڤ حەزا وی وەکی (دادوەر) ل زاخۆ هاتییە دامەزراندن بەرپرسیارەتییا رێکخستنا هیوا ل زاخۆ وەرگرت، ژبەر چالاکیێن وی یێن سیاسی و کۆمبوونا وی دگەل خویندکارێن ناڤنجی و ئەفسەرێن کورد: تەها بامەرنی، خالد نەقشەبەندی، عەبدولکەریم ئەیوب شەمدین و زاهد محەمەد سالح ل مالا وی و سەرەدانا وی بۆ مالێن وان و ئەو پروپاگندێن ئاشکرا کو بۆ کۆمەلێ د کرن، سەرۆکاتییا سوپاسالاریا لەشکەری و فەرماندەیا تیپێ ل مووسل فەرمانەك دەرێخستن کو نابیت پەیوەندی دگەل وی بێنەکرن و بکەڤیتە ژێرچاڤدێرییەکا دژوار، هەر وەسان ژبەر بزاڤێن وان یێن سیاسی پێشنیاز کر کو ئەفسەرێن کورد بێنە ڤەگوهاستن بۆ دەرڤەیی دەڤەرێن کوردی[33] و ل چریا دووێ دەستەلاتداریێ عەونی یوسف ڤەگوهاستە مووسل و ژبەر چالاکیێن وی یێن سیاسی ل نیسانا سالا ١٩٤٣ێ هاتە ڤەگوهاستن بۆ (بەسرە)[34].



سادق بەهائەدین



ئیبراهیم رەمەزان نەجار

ژ زنجیرا روودانان دیارە کو رەفیق حلمی ل گولانا سالا ١٩٤٢ێ دیدارەك ل زاخۆ دگەل عەونی یوسف کریە و پشتی ێ داویێ هاتییە ڤەگوهاستن، خالد حەسەن نەجمەدین یوسفی بەرپرسیارەتییا رێکخستنێ ل داوییا سالا ١٩٤٢ێ وەرگرتییە و هەر ئێك ژ ئیبراهیم رەمەزان نجار (مامۆستا)، محەمەد عەبدولقادر (مامۆستا)، عەبدولمەجید میرزا (مامۆستا)، حوسنی حاجی رەشید، سلێمان حاجی بەدری و حەنا عیسا هەربولی ژ دیارترین ئەندامێن رێکخستنێ بوون و رێکخستنێن کۆمەلێ گەهشتنە گوند و ناحییێن قەزایێ[٣٥].

هیوا بۆ خودان جەماوەرەکێ بەرفرەهـ و ژ بلی ئەندامان ب هزاران لایەنگر هەبوون و کۆمەلە د ماوەیەکێ کورت دا شیا تا و رێکخستنێن خۆ ل پتریا بازێر و گوندێن کوردان ڤەکەتن، و ژبۆ خورتکرنا کارێن کۆمەلێ ل لیوا (پارێزگەها) مووسل و ب تایبەت ل ناڤەندا بازێری دا ببیتە خەلەکا هەڤبەندیێ دناڤبەرا سەرکردایەتیێ و تایێن وێ ل قەزایێن لیوایێ و دا پەیوەندیا دگەل کۆمەلا خۆیبوون ل کوردستانا سوریێ و کۆمەلا ژیانەوەی کورد (ژ. ك) ل کوردستانا ئیرانێ، کۆمەلێ هەردو ئەندامێن خۆ عەونی یوسف و جەعفەر عەبدولکەریم (نۆژدار) راسپاردن ژبۆ دامەزراندنا تایێ خۆ ل بازێری مووسل. ل سەر چەوانییا دامەزراندنا تایێ مووسل: سوبغەتوللا مزووری دبێژیت :

ل داوییا سالا ١٩٤٢ێ عەونی یوسف و جەعفەر محەمەد کەریم پەیوەندی ب چەند خویندکارێن زانستێن ئایینی ل مزگەفتێن مووسل ڤە کر و کۆمبوونەك دگەل وان گرێدا و د ئەنجامدا پتریا وان هاتنە د ناڤ ریزێن رێکخستنێ دا و سویند خواندن و شانا ئێکێ هاتە پێکهینان ژ: سوبغەتوللا مزووری، شەمسەدین سەیدخان، عەبدوللا عومەر زێباری،



محەمەد عەبدولقادر ئەرمەغانی

ئەحمەد تەها کۆیی، ئەسعەد شاهین، و فەق سەعید مەلا عەبدولرەحمانێ بەرازی و دەمێ رێکخستن بەرفرەهـ بووی عەبدولمەجید رەشید بەرواری (پارێزەر) بوو بەرپرسێ وێ و پشتی وی محەمەد عەبدولقادر ئامێدی یێ بەرنیاس ب (ئەرمەغانی) مامۆستایێ کیمیایێ ل دوواناوەندییا مووسل بەرپرسیارییا کۆمەلێ گرتەدەست[٣٦]. ژبەر کو ئەرمغانی مامۆستا بوو ل دوواناوەندییا مووسل شیا گەلەك خویندکارێن کورد بکێشیتە دناڤ رێزێن کۆمەلێ و رێکخستنەکا خویندکاران ژ خویندکارێن بادینان و هەولێر هاتە پێکهینان، یێن ژێ هاتینە نیاسین: محەمەد سەدیق شەرەفانی، محەمەد سەعید دۆسکی، ئیسماعیل سەعید ئاغا دۆسکی، عەلائەدین سەعید ئاکرەیی، رەمەزان محسن ئاکرەیی، عیزەت مستەفا بریفکانی، کەمال ئەربیلی، خورشید ئەربیلی و یێن دیتر..... هەژی گوتنێ یە کو ڤێ رێکخستنا خویندکاران وێنەیەکێ هەڤپشکێ ئەندامێن خۆ بۆ کۆڤارا رۆناهی کو ل شامێ دەردکەت هنارتن و ل ژمارا وێ(١٢) کو ل ئێکێ ئادارا سالا ١٩٤٣ێ دەرکەتی هاتبوو بەلاڤکرن و ل ژێر وێنەی دەستەواژا (بژی ئێکەتیا لاوێن کورد) هاتبوو نڤیسین، هەروەسان هندەك ئەفسەران ل سەربازخانا (الغزلاني) ل مووسل پەیوەندی دگەل هیوا هەبوون و ژوانان: یوسف دۆسکی و مەحموود خاوەر و پتریا ئەندامێن وێ پشکداری دگەل کۆڤارا گەلاوێژ کو ل بەغدا دەردکەت داهەبوون و نوینەرێ وان ل مووسل سوبغەتوللا الله مزووری بوو، هەر وەسان د گەل گۆڤارا رۆناهی و بەلاڤۆکێن وێ و نوینەرێ وان ومحەمەد عەبدولقادر ئەرمەغانی بوو، هەژی گوتنێ یە کو چەند ئەندامێن رێکخستنێ ل مووسل گۆتار و هۆزان بۆ هەردو گۆڤارێن هاوار و رۆناهی و رۆژنامەیا رۆژا نوو د هنارتن[٣٧].

کۆمەلا هیوا رێکخستنێن بەرفرەهـ ل دەڤەرا بادینان هەبوون کو بەری هینگێ و تا دامەزراندنا پارتی دیموکراتی کوردستان ل١٦ تەباخا ١٩٤٦ێ دەڤەرێ ئەو رەنگە رێکخستن ب خۆڤە نەدیتبوون، کۆمەلێ رۆلەکێ کاریگەر د بەلاڤکرنا هەستا نەتەوەیی و رەوشەنبیرییا کوردی دا هەبوو، و پەیوەندیێن خۆ دگەل رێکخستنێن سیاسی یێن کوردی ل سوریا ئەنجامدان و درێکا وان دا گۆڤارێن کوردی کو ل بەغدا و شامێ دەردکەتن د گەهشتنە بادینان، هەر چەندە ئەو قەدەغەبوون و ب تایبەت ئەوێن ل شامێ دەردکەتن. ل سەر ڤێ چەندێ تەها بامەرنی دبێژیت:

ل سالا ١٩٤٢ێ نڤیسینگەها پەیوەندییان (دار العلاقات) یا بریتانی ل زاخۆ هەبوو کو جۆرێن رۆژنامەگەری و پەرتووکان لێ هەبوون، وی دگەل هەڤالێ خۆ یێ ئەفسەر جەلال ئەمین داخواز ژبەرپرسێ نڤیسینگەهێ کر کو رۆژنامە و کۆڤارێن کوردی یێن سوریێ دەردکەڤن کوئینانا وان د قەدەغە بوون بینن و ب کریار هەردو کۆڤارێن رۆژا نو و رۆناهی گەهشتنە پەرتووکخانا نڤیسینگەهێ و خویندکار و رەوشەنبیرێن زاخۆ ژی بەرێ خۆ دانە وێ نڤیسینگەهێ دا بخوینن و هندەکان ژ وان ناڤێن خۆ بۆ پشکداریکرنێ د هەردوو گۆڤاراندا توومارکرن[٣٨].

حنێرا چالاکییێن هیوا ل بادینان و مووسلێ ڤەدگەریێتەڤە بۆ وان کەسێن بەرپرسیایەتیێن رێکخستنێ ل قەزا و ناحیە و گوندان وەرگرتین و ژوانان: سالح یوسفي، محەمەد سەعید حەسەن مفتی، عەونی یوسف، محەمەد عەبدولقادر ئەرمغانی، محەمەد شاهین صوفي، ئەنوەر مایی، مەلا تەها مایی، شێخ مەزهەرێ مایی، خالد یوسفي، عەبدوللا مەلا خالد، صونعوللا مفتی، عەلی خدر، عیزەت عەبدولعەزیز، مستەفا محو باتیفي، جەعفەر محەمەد کەریم و سوبغەتوللا مزووری و یێن دی کو پشتی هینگی بووینە کاکلکا ئێکێ بۆ پێکئینانا ریکخستنا (پارتی) ل بادینان.

ژبەر ناکووکیێن هزری و هەڤرکمانیا د ناڤبەرا هەردو چەمکێن چەپ و راست دا[٣٩]، کۆمەلا هیوا تووشی ژێکڤەبوونا ناڤخوویی بوو و د ئەنجامدا لاواز بوو، و مەلا مستەفایێ بارزانی بزاڤکرن گیانێ وێ ڤەژینیتەڤە و ژبۆ ڤێ چەندێ لیژنا ئازادی دامەزراند .

## ٦- لیژنا ئازادی:

ئەڤ لیژنەیە ل ١٥ کانونا دووێ سالا ١٩٤٥ێ ب سەرۆکاتیا بارزانی و ئەندامەتیا هەر ئێك ژ ئەفسەرێن کورد: عیزەت عەبدولعەزیز ئامێدیی و میر حاج ئەحمەد ئاکرەیی و جەلال ئەمین و عەزیز شەمزینی هاتەپێکهینان، ژ ئارمانجێن وێ: پێکئینانا هێزێن چەکدار ژبۆ بەرەڤانی ژ کوردستانێ و رزگارکرنا وێ ژ ستەم و ژێردەستیێ وچێکرنا پەیوەندیان دگەل هەمی رێکخستنێن سیاسی یێن کوردی ل هەمی کوردستانێ و رسواکرنا سیاسەتا حکومەتا عیراقێ دژی گەلێ کوردان، و یەکەمین کار لیژنە پێ رابووی یادداشتنامەك ئاراستەی حکومەتا عیراقێ کر و تێدا داخوازا کریوو کو ل دووڤ داخوازیێن کوردان بهێن و بەرهەڤێن لەشکەری هەلوەشینن، وێنەیەکێ یادداشتنامێ بۆ کۆمەلا هیوا ژی هنارتن، ئەڤ پێنگاڤە مینا ڤەژاندنەکێ بوو بۆ گیانێ هیوا کو بزاڤا خۆ یا سیاسی ڤەگەرینتەڤە. یاگرنگ د بابەتی دا ئەوە هاریکاریا ناڤبەرا هیوا و ئازادی سەرهلدانا تەباخا سالا ١٩٤٥ێ بەریا کر[٤٠]. و حکومەتێ ب هێرشێن لەشکەریێن دژواری بەرسڤا وان دا و د ئەنجامدا بارزانی نە چار بوو ل چریا ئێکێ ١٩٤٥ێ بەرەڤ کوردستانا ئیرانێ ڤە بچیت، ب ڤێ چەندێ چالاکیێن لیژنا ئازاد ب داویهاتن، لێ ناکۆکی د ناڤبەرا هەردو چەمکێن چەپ و راستێن هیوا دژوارتر لێ هاتن و بۆ ئەگەرێ هەلوەشاندنا رێکخستنێن هیوا ل داوییا ١٩٤٥ێ و بۆ ئەگەر کو هندە رێکخستنێن سیاسیێن نوی پەیدابن، ژ گرنگترینێن وان رێکخستن پارتا شۆرش و پارتا رزگاری کورد و پارتی دیموکراتی کورد (الپارتی) و بادینانییان رۆلێن کاریگەر دناڤ ڤان رێکخستناندا هەبوون و ب تایبەت د ناڤ رزگاری و پارتی دا.

## ٧- پارتا رزگاری کورد:

ل داوییا سالا ١٩٤٥ێ ئەڤ پارتە ژ رەوتێ چەپێ کۆمەلا هیوا پشتی هاتیبەهەلوەشاندن هاتە پێکهینان، دگەل ڤێ چەندێ ڤێ پارتێ ئارمانجێن نەتەوەیی یێن کوردی هەبوون، و ژ دیارترین دامەزرێنەرێن وێ: عەونی یوسف، عاصم حەیدەری، نوری شاوەیس، حەمید ئوسمان، جەمال حەیدەری و عەلی فەتاح دزەیی و سەرکردایەتییا ڤێ پارتێ تا رادەیەکی ل بەغدا بوو. لێ ئارمانجێن وێ پێکهاتیبوون ژ: ئێکگرتن و رزگارکرنا کوردستانێ و پەیرەوکرنا زمانێ کوردی ل فەرمانگەهێن میری و خواندنگەهان و پەیداکرنا پەیوەندی و هاریکاریان دگەل پارت و رێکخستنێن دیموکراتی[٤١].

پارتا رزگاری کورد شیا رێکخستنێن خۆ بگەهینیتە بادینان و هەبوونەکا کاریگەر ل ئاکرێ هەبوو، پتریا لایەنگرێن چەپرەوێن د ناڤ رێکخستنا هیوا چوونە دناڤدا، ژ وانان: ئەکرەم رەشید(مامۆستا) بەرپرساتیا رێکخستنێ وەرگرت، عەلائەدین سەعید (فەرمانبەر)، شەوکەت تاهر(فەرمانبەر)، محەمەد خالد(پۆستەچی)، صادق محسن (بەرپرسێ پۆستەی ل ناحیا بەردەرەش)، سەدیق دەروێش(فەرمانبەر)، تەها عەبدولخالق (پالە)، عەزو محەمەد ئەمین (کاسبکار)، عەبدولخالق عەلی و فازل عەزو (پالە) و رێکخستنێ هەر جار کۆمبوونێن خۆ ب شەڤ ل کانی زەرکێ، یان ل مالا ئەکرەم رەشید گرێدان.

پشتی دەستەلاتێ چەند بەلگەیەك د مالا ئەکرەم رەشیدی دا دیتین کو وێ چەندێ پشتراست دکەن ئەو یێ دناڤ رێکخستنا ڤێ حزبێدا و دگەل "جوداخوازێن کورد کار دکەت"[٤٢] ئەو دەستەسەرکر و ڤەگوهاستە بازێرێ دیوانیێ ل باشوورێ عیراقێ، ئەو دگەل چەند خویندکارێن کوردێن زاخۆ ل بەغدا چووبوونە د دناڤ رێزێن پارتی رزگاری کورد دا و ژوانان: سالح یوسفي کو ئێك بوو ژ ئەندامێن چالاك دناڤ پارتێ دا، هەر وەسان ل ئامێدیێ ئەڤ کەسانە چووبوونە د ناڤ رێزێن ڤێ پارتێ دا: (توما داود) توما قەشە (ابو نضال)، و مستەفا حەسەن ئامێدیێ، و سەید ئەحمەد (خویندکار)، و عەبدوللا شانە هرۆری، و عەلی حەمدی بێدوهی و کونگرێ دامەزراندنا پارتێ ل مالا یێ داویێ دەما یێ ئاکنجی ل وێرێ هاتبوو گرێدان[٤٣].

یا گرنگ د ڤێ مژاریدا ئەوە كو ئەندامێن كۆمەلا هیوا و پارتا رزگاری كورد پاشتر كاكلكا ئێكێ یا پارتا دیموكراتا كورد(پارتی) پێكئینا ئەوا كونگرێ خو یێ دامەزراندنێ ل بەغدا ل ١٦ تەباخا ١٩٤٦ێ گرێدای.

هەژی گوتنێ یە كو سەلاح محەمەد سەعدوللای دگەل چەند هەڤالێن خۆ ژوانان: محسن نەجم قەصاب و سالحێ حەجی رەشیدی و عەبدولعەزیز تاهر (محەمەد عەزو) دەستپێكا سالا ١٩٤٦ێ ل زاخۆ كۆمەلەك ب ناڤێ (لاوێن كورد) پێكهینا و ئارمانجا وێ رزگاركرن و ئێككرتنا كوردستانێ بوو و د یەكەم كوومبوونا خۆ دا (سەلاح محەمەد سەعدوللا) وەكو بەرپرسێ خۆ هەلبژارتن[٤٤].

## ٨- پارتا كومونیستا عیراقی:

ل دەستپێكا سالا ١٩٢٠ێ هزر و بیرێن ماركسی گەهشتنە كوردستانێ، (مێجەرسون) حاكمێ بریتانی ل سلێمانیێ ل شباتا سالا١٩٢٠ێ نڤیسییە:

ناڤێ بەلشەفی ل سلێمانیێ بیی كو بزانن واتایا وێ كا چیە یا بەرنیاس بوو، و هندە دیلێن سلێمانیێ و كۆیێ كو ژ روسیا ڤەگەریاین پروپاگندەیان بۆ حوكمێ سوڤیەتی (كومونیستیێ) دكەن و دناڤ خەلكی دا بـ(بەلشەفیك) یان (بەلشەفی) دهاتنە نیاسین، ئەڤ كۆمەلەیە كەتنە دهەڤركمانییاندا دگەل دەرەبەگان كو بزاڤ دكرن وان بكوژن[٤٥].

ل سالا ١٩٢٧ێ یوسف سەلمان یوسف (فەهد) شیا یەكەمین شانا پارتا كومونیست ل بەصرا پێكبهینت، و هەر دوی دەمیدا شانێن وەكی وێ ل بەغدا و كەركوكێ پەیدابوون و ئەڤان شانان ئێككرتن و پارتا كومونیست ل ٣١ ئادارا ١٩٣٤ێ ب فەرمی هاتە دامەزراندن و ل سالا ١٩٣٥ێ گوڤارەك ب ناڤێ (الكفاح) دەرئێخستن و ل سەر مانشێتێ ژمارا (٢) ژ گوڤارێ كو ل تەباخا سالا ١٩٣٥ێ دەركەتی درووشمێ سەربەخۆبوونا كوردستانێ ل سەر بوو، و پارتا كومونیست هەر ژ دامەزراندنا خۆ ئەڤ شەرێ بەردەوامێ ل سەر گەلێ كورد ریسوا دكر[٤٦].

ل سالا ١٩٥٣ێ پارتێ پەیمانەكا نیشتیمانی (المیثاق الوطني) دانا و تێدا دیاركر كو پارت خەباتێ ژ پێخەمەت نەهێلانا كولونیالیزمێ و گەشەكرنا ئابووریا نیشتمانی وبەرەڤانیكرن ژبەرژەوەندیا كرێكاران، و دەست ب سەرداگرتنا زەڤیێن دەرەبەگێن مەزندا دكەت. و كار بۆ بهێزكرنا برایینێ و ئێكەتیێ دناڤبەرا كورد و عەرەباندا دكەت و دانپێدان ب مافێ بریارادان ل سەر چارەنڤیسێ خۆ و ژوان مافان جودابوونا گەلێ كورد دكەت[٤٧].

هەر چەند ئەڤ پارتە ژ هەلویستێ خۆ یێ ل سەری دیاركری بەرامبەر دۆزا كوردی پاشگەز بووڤە، لێ ژ بەر پویتەپێدانا وێ ب مافێن نەتەوا كورد شیا پتر ژ هەر پارتەكا دی هەڤسۆزیا كوردان راكێشیتە نك خۆڤە، و ب هزاران كورد چوونە دناڤ رێزێن وێ دا و سەرەرایێ هەمی ناكۆكیبان لێ (پارتی) و پارتا كومونیست نێزیكترین دو رێكخستنێن نێزیكی ئێك بوون ل كوردستانێ، و چونكی یەكەمین سكرتێرێ پارتی (حەمزە عەبدوللا) كومونیست بوو و پاشی چوویە د ناڤ پارتا شۆرش (پارتا كومونیستا كوردستانێ)دا، و ژبەر مشەختبوونا سەرۆكێ پارتی مەلا مستەفا بارزانی ل خزیرانا ١٩٤٧ێ بۆ ئێكەتیا سوفیەتێ، حكۆمەتا عیراقێ جیاوازی نەدئێخستە دناڤبەرا ئەندامێن هەردو پارتییاندا پارتی و پارتا كومونیستی، پارتی وەك رێكخراوەكا لایەنگر بۆ كومونیستان ددا نیاسین.

ل دەستپێكا سالێن چلان رێكخستنێن پارتیا كومونیست بەری یێن پارتی ل دەڤەرا بادینان هەبوون، ئەندام و لایەنگر ل قەزایێن زاخۆ و ئاكرێ و ئامێدیێ و شێخان و دهۆك هەبوون، و ئەو فەرمانبەر و مامۆستایێن كومونیست كو ژ ئەگەرێن سیاسی هاتینە دووركرن بۆ دەڤەرێ و خویندكارێن كوردێن بادینی كو ل مووسل و بەغدا دخواندن رۆلەكێ كاریگەر د بەلاڤكرنا هزر و بیرێن كومونیستی و پەیداكرنا رێكخستنێن پارتا كومونیست ل باژێر و گوندێن دەڤەرێ دا هەبوون .

ژ بەر نهێنیا رێكخستنێن پارتا كومونسیت و توندیا دەستەلاتێ ب راهێلان و دەستەسەركرن

و دوورئێخستنا ئەندامێن وێ، ب دروستی مێژوویا پێکئینانا یەکەم شانەیا ڤێ رێکخستنێ ناهێتەزانین، لێ مرۆڤ دشێت بێژیت کو چەند ژ کورێن دەڤەرێ و ب تایبەت ئەوێن ل مووسل و بەغدا دخواندن یان ئەوێن د زێندانان‌دا کەتینە دگەل کومونیستان کەتنە ژێر کاریگەریا هزر و بیرێن کومونیستان بەری شانێن وێ ل دەڤەرێ بێنە پێکهینان چوونە د ناڤ ریزێن وێ دا، دگەل ڤێ چەندێ ژ بەر رەوشتێن جڤاکێ بادینی یێ خۆپاریز و عەشیرەتگەری کومونیست نەشیان رێکخستنێن خۆ بەرفرەهـ بکەن کو خەلکەك ب بەرفرەهی بچنە دناڤ کومونیستان دا و بەلگە ل سەر وێ چەندێ ژی ئەوە هەردەم رێکخستنێن پارتیا کومونیست ل دەڤەرێ سەر ب مووسلێ ڤەبوون و بزاڤێن وان ژ وێرێ د هاتنە ب رێڤەبرن.

ژێدەر ئاماژێ ددەنە وێ چەندێ کو یەکەمین شانا کومونیستان ل دهۆکێ ل سالا ١٩٤٦ ـ ١٩٤٧ێ هاتە پێکهینان و یا گرێدایی رێکخستنا مووسل ڤە بوو و ژ دیارترین ئەندامێن وێ رەشاد محەمەد مەحموود بالەتەیی، سەلاح قازی، حسێن نوری کیکی، حافز قازی، عەلی حەجی حەسەن ئاکرەیی، عەلی سەعید مەلا تەها بوون. مختار محەمەد عەلی بەرپرسێ رێکخستنێ بوو کو ئەو ژی گرێدای محەمەد عەزو بەرپرسێ رێکخستنا زاخۆ ڤەبوو.

نوری حسێن یونس کیکی دبێژیت: پارتێ رێکخستنەك یان رێکخراوەك ل دەوروبەرێن سالا ١٩٥٢ ێ ل دهۆکێ هەبوو کو ژ ئالیێ ئیبراهیم (شبوط)ڤە هاتبوو دروستکرن، ئەڤ کەسە خەلکێ قەزا حەی ل پاریزگەها ناصریێ بوو و مامۆستا بوو ل دهۆکێ، ژ وێ مێژوویێ ڤە بەلاڤۆکێن پارتییا کومونیست ژ مووسل دگەهشتنە دهۆکێ و ل دەستپێکا سالا ١٩٥٦ ێ سکرتێرێ پارتێ حەمید ئوسمان یێ بەرنیاس ب سەلمان گەهشتە دهۆکێ و شیا رێکخستنەکا خویندکاریا پارتا کومونیست چێبکەت و رەشید محەمەد ئامێدی ژ گرنگترین ئەندامێن وێ بوو، هەر ئەو هاتییەراسپاردن بۆ ئینان و برنا پۆستێ پارتییا کومونیست دناڤبەرا مووسل و دهۆك و ئامێدیێ دا. هەروەسا چەند ژن ژی چوونە دناڤ ریزێن پارتێ دا و ژوانان فضیلة احمد الفخري ونعیمة فخري کو ئاکنجیێن مووسل بوون. ژ کومونیستێن دەڤەرێ یێن د ناڤبەرا سالێن ١٩٥٢ ـ ١٩٥٨ێ دا هاتینەنیاسین: جەمیل نوری کیکی، یونس ئەحمەد سەعادە، تەحسین ئەحمەد بەگ بەرواری، خاجیك ئەرمەنی، عوبەیدێ حەلاق، یونس یەعقوب، محەمەد سالح حەجی، ئەمین ئامێدی، محەمەد سالح سواری، محەمەد تاهر عەلی مبارك، محەمەد ستی و یێن دی[٤٨].

پشتی شۆرشا ١٤ تەموزێ ل ١٩٥٨ کومونستێن بادینان شیان یەکەمین لژنا ناڤخۆ یا پارتا خۆ دابمەزرینن کو بارەگایێ وێ ل دهۆکێ بوو و سەرپەرشتییا رێکخستن و چالاکیێن پارتێ ل دهۆك و زاخۆ و ئامێدیێ د کر و ل سالا ١٩٦٢ێ لژنە پێك دهات ژ: محەمەد بەشیر عەبدوللا (ژ زاخۆ) بەرپەرس و ب ئەندامەتییا بەکر عەبدلکەریم کۆڤلی هاریکار و رەشید محەمەد مستەفا ئامێدی (مامۆستا) و حەسەن حاجی نعمان و داود قادر عەبد و ئەدیب سەعید (ژ زاخۆ) و ئەسعەد توفیق[٤٩].

هندی پەیوەندی ب قەزا ئامێدیێ ڤە هەی، دهێتەگۆتن کو یەکەمین شانا کومونیستان ژئالیێ فارس حەبیب (فەرمانبەر ژ کەرکۆك) هاتە پێکئینان و ناڤێن ئەندامێن وێ نەهاتینە زانین، لێ ئەڤ کومونیستێن ل داوییا سالێن چلان و دەستپێکا سالێن پێنجیبان ژ سەدێ بووری هاتینە نیاسین: ئیسماعیل مەحموود(چایچی)، سەلاح مفتی (فەرمانبەر)، محەمەد زەکی (بارێزەر)، تاهر عوبەید (مامۆستا)، محەمەد سالح ئەمین (خویندکار)، تەحسین تاهر(خویندکار)، نعمان حەجی ئەمین، عارف محەمەد، محەمەد سەدیق علامە، محەمەد مستەفا عەبدولرەحمان (مستەفایێ شەرێ)، ئەحمەد عەبدوللا (ئەحمەد بەسێ)، موحسن سالح عەبدلعەزیز (ملکدار)، رەئوف عەبدولرەزاق، توفیق ئەمین ئوسمان، مستەفا سەدیق، یاسین مستەفا(رەشاڤەیی)، هەژی گوتنێ یە کو موسلح

مستەفا جەلالی (رێڤەبەرێ گشتیێ رەوشەنبیریا كوردی ل بەغدا ژ داویيا سالێن حەفتیانڤە) ژ بەر راهێلانا دەستەلاتێ ژ كەركۆكێ پەنا ئینابوو ئامێدیێ و ب (ابو ناظم) دهاتەنیاسین و ژ بەر كو كادرەكێ كومونیست و شەهرەزابوو رۆلەكێ باش د راكێشانا گەلەكاندا بۆ ناڤ رێزێن كومونیستان گێرا [٥٠]. توما داوود توما یێ بەرنیاس ب (ابو نضال) دبێژیت: دناڤبەرا سالێن ١٩٥٠ ـ ١٩٥٨ێ محەمەد زەكی حەسەن(پارێزەر) بەرپرسێ رێكخستنێ بوو ل ئامێدیێ وی و هەرئێك ژ: محەمەد سالح ئەمین، مەسعود مستەفا كتانی (پاشتر دكتور)، توما داوود توما، مسلح مستەفا، محەمەد مستەفا عەبدولرەحمان، سەلاح مفتی، شانا سەركردایەتیيا پارتا كومونیست ل قەزا ئامێدیێ پێكدهینان[٥١].

ل گوندێ بامەرنێ: عەلی شێخ غیاسەدین نەقشەبنەدی، تەیب فوئاد، حەسەن شانە، سەلمان عەبدوللا، قادر سەعید صفار، توفیق سەلیم، سەدیق عومەر خالد، رەمەزان ئەیوب و یێن دی ژ كومونیستێن بەرنیاس بوون.

پشتی شورەشا ١٤ تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ رێكخستنێن پارتا كومونیست و بزاڤێن وێ ل قەزا ئامێدیێ بەرفرەهبوون، شیان كونترولێ ل سەر پتریا رێكخراوێن پیشەیی و جەماوەری ل قەزایێ بكەن و محەمەد نەجیب بەرپرسێ بزاڤا پشتەڤانێن ئاشتیێ (انصار السلام) بوو، شەوقی یەحیا عەبدوللا ناصر و نوری ئەحمەد بەرپرسێن ئێكەتیيا گشتیيا خویندكاران و نەعمان حەجی ئەمین هاتە دامەزراندن وەك بەرپرسێ بەرگریيا مللی كو بارەگایێن خۆ ل بەرواری بالا ڤەكرن و ابو نضال وەك بەرپرسێ وێ هاتەدانان و بارەگایەكێ دی ل دەڤەرا دۆسكێ ژووریا هاتە ڤەكرن، و دیسان هەڤبەندا بەرگری كرنێ ژ مافێن ژنێ كو هەر ئێك ژ بەدیع نەجیب و زاهیدا مختار و فاطمة عبدالله شهوان بەر پرسایەتیيا وێ وەرگرتین.

ژ كومونیستێن پشتی ١٤ تیرمەها سالا ١٩٥٨ ێ چالاك ل قەزا ئامێدیێ هاتینە نیاسین: ئیسماعیل محەمەد كو بەرپرسیارەتیيا رێكخستنێ ل سالا ١٩٥٩ وەرگرتی، مەحموود عەزو (دەلال ژ زاخۆ)، ئەحمەد عەلی قەنتار(مامۆستا)، غازی سەید نەجیب (خویندكار)، ئەحمەد رەشید بابا حەجی (خویندكار)، یونس ئەمین (پەرۆكفروش)، عەلی حەسەن ئاشی، فاروق عەبدوللا عەبدولعەزیز، قەشە ئودیشو و یورام داود توما ویێن دی[٥٢].

چالاكیێن كومونیستان ل قەزا ئاكرێ د لاواز بوون و ژ ناڤەندا باژێرێ ئاكرێ دەرنەكەتن، ئەڤە ژی ئەنجامێ كاریگەریيا جڤاكێ عەشیرەتكانی ل دەڤەرێ و دگەل ڤێ چەندێ یەكەمین شانەیا كومونیستان ل ١٩٤٨ێ هاتە پێكهینان و ل بەری هینگێ هندەك كەس كەتبوونە ژێر كاریگەریيا هزر و بیرێن كومونیستان، شانەیا ئێكێ یا پێكهاتیبوو ژڤان مامۆستایان: ئەكرەم رەشید، عەبدولرحمان خەمو، جەمیل سەبری و ژ پارێزەران فەریق عەبدولعەزیز، و باراپتر جاران كۆمبوونێن خۆ ل مالا ئەكرەم رەشید دكرن كو ژ ئالیێ دەستەلاتێ ڤە هاتییە دەستەسەركرن پشتی سەر مالا وی دا گرتین و چەند بەلگەنامە و نەخشەیێ كوردستانا عیراقێ و نامەیەكا كەسایەتی كو داخوازا سەرخۆبوونا كوردان دكر تێڤە دیتین و دهێتە ڤەگوهاستن بۆ خواندنگەهـا بەردەرەش[٥٣].

تشتەك ژ رێكخستنێن كومونیستان ل زاخۆ نەهاتییە زانین كا كەنگی یەكەمین رێكخستنا كومونیستان هاتییە دامەزراندن، لێ مرۆڤ دشێت بێژیت كو بەری هەر باژێرەكێ دی یێ بادینان هزر و بیرێن كومونیستان و هەبوونا كەسان وەكی كومونیست لێ هەبوویە، ژبەر كو باژێرەكێ سنووری بوویە و تێكەلی د گەل هەمی چەمكێن سیاسی و رێبوارانڤە هەبوویە، سەرەرای مشەختبوونا ب سەدان خێزانێن كوردان و ئەرمەن و كلدانان كو ژ بەر ستەما تركان ل پشتی شەرێ جیهانیێ یێ ئێكێ ژ كوردستانا تركیا هاتینە دەڤەرێ.

ل دووڤ گوتنا گەلەك ژ كومونیستێن باژێری، ل سالا ١٩٤٨ێ محەمەد عەبدولعەزیز تاهر (محەمەد عەزو) بەرپرسێ رێكخستنا كومونیستا بۆ ل زاخۆ،

ژ كومونیستێن وی دەمی ل زاخۆ هاتینە نیاسین: حوسنی حەجی رەشید، مەحموود سالح قصاب، هاشم نەجم قصاب، ئەحمەد سفری، شەفیق و سەلاح محەمەد سەعدوللا، سامی ئەسعەد، سالم نەجم قصاب، عەبدولمەجید میرزا، رەئوف نەجم قصاب، شوكری كریبت، غازی نەجم قصاب، تەها محەمەد جقسی، عەبدولحەمید محەمەد سەعدوللا، ئەنوەر جەمیل، بەشیر عەبدوللا، عەلی جەنبەلی، عەلی حەسەن حاجی و یێن دی[٥٤] و نڤیسینا هاریكارێ پۆلیسێن زاخۆ ل ئێكێ تیرمەها سالا ١٩٥٣ێ ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ كو: شێخ عابد شێخ محەمەد هاتە حوكمكرن ژبەر بەلاڤكرنا پروپاگندەیان بۆ كوردان و هاتە دوور ئێخستن و هەر ئێك ژ حسنی حاجی رەشید و مەحموود سالح و عیسا حاجی و مەحموود حاجی ئەحمەد كومبوونان گرێددەن و پروپاگندەیان بۆ كومونیستان دكەن[٥٥].

پشتی هینگی ئەڤ رێكخستنە پێشكەفت و بۆ چەند شانە، ل بەراهیێ مەحموود سالح قەصاب سەرۆكاتیا وێ كر و پاشی عەجیل مەحموود، هەروەسان رێكخستنەكا ژنان ژی هەبوو. و رێكخستێن پارتا كومونیست گەهشتنە گوند و ناحیێن قەزایێ، وەكی ناحیا سلێڤانی (ئاسیهێ) و گوندێ بێدارێ، ژبەركو پارتا كومونیست ژ دژوارترین بەرەنگارێن دەستەلاتێ بوو و دژی كارێن دەرەبەگان و مولكداران دراوەستیا و جوتیار هاندان كو دژی وان ب راوەستن، دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەت ژی ل بەرامبەر وان راوەستیان و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرێ پەیدابوونا لێكدانەكێ ل ئەیلولا ١٩٥٤ێ دناڤبەرا واندا و دەستەلاتێ پشتەڤانیا دەرەبەگ و سەرۆك عەشیرەتان دكر و رابوو ب دەستەسەركرنا هەر ئێك ژ (حسنی حەجی رەشید، مەحموود سالح، حكمەت محەمەد سەعدوللا، حسێن عەلی، محەمەد جەلەبی، عەجیل مەحموود، محەمەد سەعید مەلا ئەحمەد، دەروێش رەشید و یێ داویێ هاتەحوكمكرن پشتی پۆلیسا بەلاڤۆكێن كومونیستا د مالا وی دا دیتن.

هەژی گوتنێیە كو پارتا كومونیست بنكەكێ جەماوەریێ بەرفرەهـ ل زاخۆ هەبوو، كو ژمارا لایەنگرێن وان پتر بوون ژ ئەندامێن وان، و دەستەلاتێ هەمی بەرهەلستكارێن خۆ ب كومونیست (شیوعی) تاوانباردكرن، هەروەكی (حەجی صادق برو) سەرۆكێ عەشیرەتا گولی و حسو ئیبراهیم (حەسەن برو)[٥٦] و كەسانێن دی ب ڤێ چەندێ گوناهباركرین.

هەر وەسان ل زاخۆ بزاڤا پشتەڤانێن ئاشتیێ (انصار السلام)[٥٧] پەیدابوو كو ئەو ژی روویەك بوو ژ روویێن كومونیستان و هەر ئێك ژ: حوسنی حەجی رەشید و هاشم نەجم و مەلا سالح بالقوسی و گەلەك ژن چوونە د ناڤ رێزێن وێ دا. و ژ بەر ڤی ناڤی خودانێ چایخانەكێ ناڤێ چایخانا خو كرە (ئەلسەلام)[٥٨].

سەبارەت قەزا شێخان و باشوركێ ژی، قەوالێن ئێزدییان دهێنە هژمارتن ژ كەسانێن دەستپێكی كو هزر و بیرێن ماركسی ل دەڤەرێ بەلاڤكرین، ژ بەر كو وان ل بەری شۆرشا ئوكتوبەرێ و ل پشتی هینگێ ژی هاتن و چوونا ئێزدیێن ئەرمەنستان و ئازەربایجانێ دكرن، و ل وێرێ وان نیاسیبوونەك د گەل هزرا كومونیستی كرن و كەتنە ژێر كارتێكرنا وان هزران و ل دەمێ ئەو ڤەگەریاینەڤە وان ئەو هزر و بیر بەلاڤكرن و خەلكەكێ مشە ل دۆر خۆ خرڤەكرن، خۆ بەری دامەزراندنا پارتا كومونیستیا عیراقی ژی ل ١٩٣٤/٣/٣١ێ، و شێخ حسێن و مالەلا دێوالی و ئلیاس خەلو و جمعە كنجی و شێخ سەبری و خدر حەجی مادو و عەلی الجمل پیر حەیدەر مجێور و شێخ زندین و شێخ عەبو و عەلی خەلیل ژ كومونیستسێن دەستپێكی بوون ل دەڤەرێ[٥٩].

پشتی كو ل ٦ چریا ئێكێ سالا ١٩٥٨ێ مەلا مستەفا بارزانی سەرۆكێ پارتی دیموكراتی كوردستان ژ ئێكەتیا سوڤیەتا (بەرێ) كو ب نەچاری بەرەڤ وێرێ چوبوو ڤەگەریایە عیراقێ، بالادەستیا سیاسیا كومونیستا ل بادینان پیچ پیچە بەرەڤ كێمیێ ڤە چوو، هەروەسان ئالوزی كەتە پەیوەندیێن پارتا كومونیستا عیراقی دگەل دەستەلاتێ كو مۆلەتا



مەلا مستەفا بارزانی

كاركرنا وان راگرتی، و دانا مۆلەتا كاركرنێ ل ٩ شواتا سالا ١٩٦٠ێ بۆ پارتی دیمەكراتی كوردستان و دەسپێكرنا شۆرشا كوردی ل ١١ ئەیلونێ سالا ١٩٦١ ێ، باندۆرا خۆ هەبوو ل سەر كێمبوونا كومونیستان و ئالیگرێن وان نە تنێ ل بادینان بەلكو ل هەمی كوردستانێ، ئەڤە ژبلی رەخنێن كومونیستان ل پارتی كو ب پارتەكا بورژوازی ددانیاسین و پاشكەزبوونا وان ژ مافێ چارەنڤیسێ بۆ گەلێ كورد هندە دی بوونە ئەگەرێ ل كێمیدانا كومونیستان.

## ٩- پارتی دیموكراتی كوردستان (پارتی):

پارتی ب دەست پێشخەریەكێ ژ ئالیێ مەلا مستەفا بارزانی هاتە پێكئینان، پشتی پارتا شۆرش و رزگاری یا كورد و پاشمایێن كۆمەلا هیوا هەڤكرتین، كونگرێ خۆ یێ دامەزراندنێ ل بەغدا ل ١٦ تەباخا ١٩٤٦ێ گێرا، و بارزانی وەك سەرۆكێ پارتی هاتە هەلبژارتن و لەتیف شێخ مەحموود بەرزنجی (جێگرێ ئێكی یێ سەرۆكی) و كاكە زیاد (جێگرێ دو یێ سەرۆكی)، و حەمزە عەبدوللا (پارێزەر) سكرتێرێ لیژنا ناوەندی (مەركەزی) و ژ بلی یێ داویێ هەر ئێك ژ سالح یوسفي و میر حاج ئەحمەد ئاكرەیی بۆ لیژنا ناوەندی هاتنە هەلبژارتن و ب ڤێ چەندێ ژمارا بادینانیان بوونە ٣ ژ (١٥) ئەندامان. پەیرەوێ ناڤخۆیی یێ پارتی رژدی ل سەر ئارمانجێن نەتەوایەتیێن گەلێ كورد و حەزا وی د پێكڤە ژیانێ د ناڤ عیراقەكا ئێكرتیدا كو (ل دووڤ ڤیانا ئازادا كوردان ب خۆ بیت) نە ب رێكا (پێكڤە گرێدانا كوتەكی) كو كولونیالیزما بریتانی ل سەر كوردان سەپاندی، د ڤی واریدا پارتی دروشمێ خۆیێ ناڤدار دارشتبوو: (ل سەر كەڤرێ ئێككرتنا عەرەب و كوردان كۆلونیالیزم و پرۆژە و دووڤەلانكێن وێ دێ شكێن)، هەروەسان پەیرەوێ پارتی دخواست چاكسازی دژیانا كۆمەلایەتی و ئابووریدا بێتەكرن، و رژدی ل سەر دادپەروەریا مافێن ژنێ وەكی یێن زەلامی و دابەشكرنا زەڤیان ب سەر جۆتیاران و بەرەڤانیكرن ژ مافێن كاركەر و جۆتیاران و گەشەكرنا زمان و ئەدەبیاتا كوردی دكر، و بنەمایێن ئاشكرا یێن پارتی رۆل هەبوو كو بنكەكێ مللی یێ بەرفرەهـ بۆ پەیدا ببیت و خویندكار ژ هەر كەرتەكێ دی پتر د كاریگەر بوون دناڤدا، و ژ بۆ بەلاڤكرنا هزرو بیرێن خۆ پارتی رۆژنامەیا (رزگاری) دەرێخست دا ببیتە زمانحالێ وێ و ژمارا ئێكێ ل ٨ ئەیلولا سالا ١٩٤٦ێ دەرچوو و یا بەردەوام بوو تا سالا ١٩٥٦ێ كو رۆژنامەیا (خەباتی كوردستان) شوونا وێ گرتی، و پشتی ١٤ تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ بەردەوامبوو و پشتی رۆژنامەیا خەبات شوونا وێ گرت، هژمارا وێ یا ئێكێ ل ٤ نیسانا ١٩٥٩ێ ب رەنگەكێ ئاشكرا هاتەبەلاڤكرن.

سەبارەت پەیرەوێ ناڤخۆیێ پارتی وەكی هەر پارتەكا نهێنی بنەمایێن هووربینی د رێكخستنێدا و پێگیری دیسپلینێن پارتایەتی وەك پێدڤیێن هەرەگرنگ بۆ قۆناغا خەباتا نهێنیا پارتی وەرگرتن، ب دامەزراندنا (پارتی) گەلێ كورد د چیتە دناڤ قۆناغەكا نوو یا خەباتێ دا ژبۆ ب دەست ڤە ئینانا مافێن خو یێن نەتەوەیی ل كوردستانا عیراقێ.



کاکە زیاد



شێخ لەتیف

ل سالا ١٩٥٠ێ سکرتێرێ پارتی حەمزە عەبدوللا هاتە دەستەسەرکرن و پاشی هاتە دوور ئێخستن بۆ ترکیا، بۆ دەمێ سالەکێ (١٩٥٠- ١٩٥١) پارتی (سەرکردایەتییەکا بەروەخت) هەبوو، و ل ١٣- ١٤ ئادارا ١٩٥١ێ کونگرەیێ خۆ یێ دووێ ل بەغدا ل مالا عەلی حەمدی بەرواری گرێدا و ئیبراهیم ئەحمەد وەك سکرتێرێ پارتی هاتە هەلبژارتن، و ل ٢٦ کانونا دووێ سالا ١٩٥٣ێ، گونگرەیێ خۆ یێ سیێ ل کەرکوکێ گرێدا و کۆمەکا بریاران دەرئێخستن، ژ گرنگترین بریار پەیرەوکرنا (مارکسیا لینینی) یە وەکی بنیاتەك کو پارتی د خەباتا خۆ یا سیاسی دا ل سەر بچیت، ژبەر هندێ حکۆمەتا عیراقێ هەر ژ سالا ١٩٥٣یڤە (پارتی) وەك ریکخراوەکا سەر ب پارتا کومونیستا عیراقێ ڤە دەسنیشانکر، گوهورینا ناڤێ پارتی دیموکراتی کوردی بۆ پارتی دیموکراتی کوردستان و دەرئێخستنا سکرتێرێ کەڤن حەمزە عەبدوللای ژ ناڤ رێزێن پارتی و ئەڤ چەندە بۆ ئەگەرا پارچەبوونا پارتی، هەر وەسان کونگرەی بریارا پێکئینانا رێکخراوێن جەماوەری و پیشەیی ژێ دا. و ئێکەتیا قوتابیێن کوردستانێ و ئێکەتیا لاوێن دیموکراتا کوردستانێ ل ١٨ شواتا سالا ١٩٥٣ێ هاتنە دامەزراندن، و ئێکەتیا ئافرەتێن کوردستانێ و ئێکەتیا مامۆستایێن کوردستانێ ل ١٦ گولانا ١٩٦٢ێ و ئێکەتیا زانایێن ئایینێ ئیسلامێ ل کوردستانێ ل ٢١ ئەیلولا ١٩٧١ێ هاتنە دامەزراندن و ناڤێ رۆژنامەیا پارتی ژ رزگاری هاتە گوهارتن بۆ خەباتی کوردستان.

پشتی گرێدانا کونگرێ دامەزراندنێ، پارتێ ئەندامێ کومیتا ناڤین سالح یوسفي کو فەرمانبەر بوو ل دادگەها مووسل راسپارد ب ڤەکرنا لقێ پارتی ل بادینان و بارەگایێ وێ ل مووسلێ بیت، و بۆ ڤێ چەندێ یوسفي پەیوەندی ب تەها مستەفا بامەرنی (ئەفسەر) و سوبغەتوللا مزووری (ئیمامێ مزگەفتا العومەریە ل مووسلێ) و کاکە ئەمین (نائیب) ئەفسەرێ خانەنشین و خودانێ ستودیویەکا



حەمزە عەبدوللا



میر حاج ئەحمەد ئاکرەیی

وێنەگرێ ل مووسل و رەمەزان محسن عیسا (فەرمانبەر بوو ل باژێرڤانییا مووسلێ) کر و ئەڤ کەسانە وەکی شانا ئێکێ یا پارتی بوون، پاشی پتریا ئەندامێن رێکخستنا هیوا یا هەلوەشیای و ئەندامێن پارتا رزگاری ژ وانان: محەمەد شاهین صوفی(پارێزەر)، محەمەد سەلیم سالح مێرسیدی، محەمەد سالح ایرسی، عومەر حەسەن محەمەد بامەرنی، فەریق حەجی عەبدولعەزیز ئاکرەیی(پارێزەر)، ئەسعەد و سەلاح ئەحمەد مفتی، محەمەد ناصر گویی، شەمسەدین سەید خان (زانایێ ئایینی)، ئەحمەد تەها کویی، ئەسعەد شاهین،، سالح بەگ میران (ئەفسەر)، جەرجیس فەتحوللا (پارێزەر)، مەلا عاصم عەبدوللا و کورێ وی رەشید و یوسف میران(ئەفسەر) چوونە د ناڤ رێزێن پارتێ دا.

ژ ئەنجامێ چالاکیێن سیاسیێن پارتی دەسەلاتداریێ ل سالا ١٩٥٠ێ حەمزە عەبدوللا دەستەسەرکر و دوور ئێخستنە ترکیا و سالح یوسفی هاتە ڤەگوهاستن بۆ دادگەها شنگالێ، و سالح روشدی ئامێدی (خویندکار ل کولیجا ماف) بەرپرساتییا رێکخستنێ وەرگرت.

هەر وەسا ل ئادارا سالا ١٩٥٣ێ پۆلیسان سوبغەتوللا مزووری ب گونەها هندێ کو خەلەکا پەیوەندییێ دناڤبەرا شێخ ئەحمەدێ بارزانی کو ل بەسرە یێ زیندانکری بوو و برایێ وی مەلا مستەفا بارزانی ل ئێکەتیا سوفیەتا (بەرێ)، دیسان گونەهبار کر کو کۆمبوونان دگەل سەربازێن کورد د ناڤ مزگەفتێ دا دکەت و وان فێری (بنەمایێن ژێکجودابیا نەژادی) دکەت، هەر وەسان حۆکمەتێ ناسنامێن بارێ شارستانی ژ ژمارەیەکا خویندکارێن کورد ل مووسلێ وەرگرتن ب هێجەتا کو ئەو یێن ژ ترکیا هاتین.

پشتی وێ هەوا گرتنێ کو تووشی پارتی بووی، ئیسماعیل تاقی ئاکرەیی کو فەرمانبەر بوو ل رێڤەبەریا دابەشکرنا قویتی ل مووسلێ بەرپرساتییا پاراستنا رێکخستنێن پارتی ژ بژالەبوونێ وەرگرت و



سالح یوسفی

ژبەر زێرەڤانیکرنا دژوارا دەزگەهێن ئەمنێ بارەگایێ خوبێ نهێنی ئەوێ د ژوورەکا ئوتێلەکێڤە ل جادا حەلەب (سەعدون) ڤەگوهاستە مالەکێ ل تاخی (خەزرەج).

ل خزیرانا سالا ١٩٥١ێ حەمزە عەبدوللا شیا ژ جهێ بۆ هاتیبەدوورئێخستن ب رەڤیت و خۆ دناڤ مالا ئەندامێ پارتی عومەر حەسەن بامەرنی ل تاخی دەواسە ل بازێرێ مووسل ڤەشێریت و ل مووسل ئاکنجی ببیت و ب مەرەما چارەسەرکرنا ئاریشا ناڤبەرا وی و پارتی، جەلال تالەبانی دوو جاران سەرەدانا وی کر، لێ پارتێ د کونگرێ خۆیێ سێێ دا بریارا دەرئێخستنا وی ژ پارتی دا و پتریا ئەندامێن لقێ ل دۆر وی خرڤەبوون لەوما وان جودابوونا خۆ ژ پارتی راگەهاند و رێکخستنەك ب ناڤی (بالێ پێشڤەروویێ پارتی دیموکراتی کورد - عیراق) یان (بەرەی پێشکەوتووی پارتی دیموکراتی کورد) پێکهینا و ڤێ رێکخستنێ رۆژنامەکا ناڤەندی وەکی ئورگان ب ناڤێ رزگاری دەرئێخست.

پشتی کو ل سالا ١٩٥٦ێ بالێ حەمزە عەبدوللای ڤەگەریایەڤە ناڤ ریزێن پارتی و ژمارەکا کادرێن پارتا کومونیستا عیراقی هاتینە د ناڤ ریزێن پارتی دا و خسرو توفیق و سالح حەیدەری ژ دیارترین وان کەسان بوون رێکخستنێن پارتی گەشەکر، و سەرکردایەتیێ عەبدوللا ئیسماعیل (مەلا ماتور) راسپارد سەرپەرشتیا رێکخستنێن وێ ل بادینان بکەت.

دەمێ ل داویا سالا ١٩٥٦ێ خسرو توفیقی بەرپرسیا رێکخستنێن پارتی ل مووسل و بادینان وەرگرتی[٥٩]، رێکخستنێن پارتی چوونە د قوناغەکا نوودا و پەیوەندی ب سوبغەتوللا مزووری و سالح یوسفي و هاشم حەسەن ئاکرەیی و ئیسماعیل محەمەد تاقی ئاکرەیی ڤەکر و بۆ وان خانییەك ل تاخی سویکا بچویك ل نێزیکی جادا نەجەفي بکرێ گرت و ئەو خانی وەکی بارەگایەکێ نهێنیێ پارتی



سالح روشدی ئامێدی



عەلی حەمدی بەرواری

لێ هاتبوو، و خسرو توفیقی سەخمەرات ڤەژاندنەڤا رێکخستنێن پارتی ل زاخۆ و ئاکرێ و شێخان و ئەترووش و ئامێدیێ سەرەدانا وان جهـان کر.

پشتی کو هەریەک ژ محەمەد کەریم فەتحوللا[١٠] و نوری سەدیق شاویس[١١] هاتینە د ناڤ ریزێن رێکخستنێن پارتی ل موسل، بزاڤێن رێکخستنێن مووسل کو سەرکردایەتیا هەمی رێکخستنێن بادینان و رۆژئاڤایێ دیجلە دکرن بەرەڤ زێدەبوونێ ڤە چوون، هەر ئێك ژ: خسرو توفیق، نوری خەلیل عەبدوللا بامەرنی، نوری شاویس، سوبغەتوللا مزووری، محەمەد کەریم فەتحوللا دناڤبەرا سالێن ١٩٥٦- ١٩٥٨ێ سەرکردایەتیا رێکخستنێن مووسل و بادینان پێکدهینان و ئەڤ سەرکردایەتییە شیا د ماوەیەکێ پێڤەریدا رێکخستنێن مللی و پیشەیی پێکبهینیت و رێکخستنا ئێکەتیا قوتابیێن کوردستانێ ژ وان هەمیان چالاکتر بوو، و پارتی بۆ خودان رێکخستن د ناڤ هەمی کارگەهێن بازێری دا، و رێکخستنێن وێ گەهشتنە سەربازگەها لەشکەری ل غزلانی، و سەربازگەها دینارتە ل قەزایا ئاکرێ، و ئەفسەر یوسف میران ژ دیارترین ئەندامێن رێکخستنا لەشکەری بوون کو ئیسماعیل تاقی بەرپرسیارەتیا وێ دکر.

ئەدەبیات و رێنمایێن پارتی درێکا نوری شاویس دگەهشتنە رێکخستنێ کو وی دەمی ژ بەر کارێ وی مشە هاتن و چوونا هەڤلێر و کەرکوك و سلێمانیێ دکر، و رێکخستنێ بزاڤکرن ئامیرێن چاپکرنێ ژ سوریێ ب دەست خۆ بێخن و شیان ئێکێ بیننە مووسل، لێ کەتە د دەستێ دەستەلاتێدا و ئەڤ ئامیرێن چاپکرنێ هاتە رەوانەکرن بو فەرمانگەها (المیرة) یا سەر ب وەزارەتا بەرگریێ ڤە[١٢].

رێکخستنێن پارتی ل دەڤەرا بادینان ژ ئالیێ سەرکردایەتیا لقێ مووسل ڤە دهاتنە ب رێڤەبرن ئەوا شیای د ماوەکێ کورت دا رێکخستنێن خو ل



جەرجیس فەتحوللا



**ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی**

ناڤەندێن قەزایا ئاڤا بکەتن، ل بازێرێ ئاکرێ و ب راسپاردنا سالح یوسفی ل ئەیلولا ١٩٤٦ێ یەکەمین شانا پارتی ژ ئەندامێن پارتا رزگاری یا هەلوەشیای هاتە پێکئینان کو ئەو ژی: ئەکرەم رەشید (مامۆستا) کو بەرپرساتییا رێکخستنێ وەرگرتی و عەلائەدین سەعید (فەرمانبەر)، عەبدولرەحمان عەبدوللا عەبدولرەحمان، عەلا سەعید قازی، پاشتر هەریەك ژ بەهجەت عەبدولخالق، شەوکەت ئەحمەد، مەلا سلێمان موسا، قادر موسا، شەریف و غەریب عەبدوللا، شوکری عەبدوللا میروشی، خالد شەریف، زەکی کامل، شەوکەت تاهر، مام عەلی سەلیم، هاشم حەسەن و یێن دی[٦٣] هاتنە دناڤ رێزێن پارتی دا.

ل خزیرانا سالا ١٩٤٨ێ و ژبەر بزاڤا سیاسی یا پارتی، پشتی دەستەلاتێ مالا ئەکرەم رەشیدی پشکنی و بەلگەیێن ئەندامبوونا وی دناڤ پارتی دا دیتین ئەو دەستەسەرکر، ل شواتا سالا ١٩٤٩ێ خەیرەدین رەشید (خویندکارێ دەرئێخستی ژ خانەیا مامۆستایێن گوندا ل بەغداد) و مەلا محەمەد عەزو (موختاری تاخی کوراوە) هاتنە دەستەسەرکرن و گرتی هاتنە هنارتن بۆ مووسل دا ڤەکۆلین ل هۆبا تایبەت دگەل واندا بێتە کرن[١٤].

سەبارەت بازێری زاخۆ ژی ئەو دهاتە هەژمارتن ناڤەندا سەنگا پارتی ل دەڤەرێ، و هەر ژ هەیڤێن دەستپێکی پشتی کونگرێ دامەزراندنێ، کاکلکا ئێکێ یا پارتی هاتە پێکئینان، و ژ پارتیێن بەراهیێ کو هاتینە نیاسین: مەلا سالح بالقوسی و شێخ جەمال بریفکی و رەمەزان دۆلی و نعمان عیسا بارزانی و عومەر حەسەن بامەرنی، و مەلا حەیدەر گۆیی و عەلی هالو و مەلا تەها بوصەلی و سالح حامد و یێن دی، و هەر وەسان پارتی شانە ل باتیفا و شەرانش و بۆسەلێ و گوندێن دی هەبوون.

و ژبەر چوونا سەرۆکێ پارتی و دامەزرێنەرێ وێ مەلا مستەفا بارزانی بو ئێکەتییا سوڤیەتا بەرێ، و کومونیست بوونا حەمزە عەبدوللا سکرتێرێ پارتی ل بەرێ، دەسەلاتا عیراقی نەدشیا جیاوازیێ بێختە دناڤبەرا ئەندامێن پارتی و کومونیستا عیراقی، و بەلگەنامەیێن حکومی کو ل نیسانا سالا ١٩٤٨ێ دەرکەتی ئاماژێ ددەتە وێ چەندێ کو رێکخستنەکا سیاسیا کوردی ل زاخۆ هەیە و ب شانێن کومونیستێن خرابکەر ناڤدکەت، و نوینەرێ رێکخستنێ ل بازێری حسنی حەجی رەشید قەصابە و محەمەد شاهین صوفی (پارێزەر) بەرپرسێ رێکخستنێ یە ل مووسل - و ئەندامێن چالاك ل زاخۆ ئەڤەنە: حاجی حەجی صادق برو، حسو ئیبراهیم (موختارێ گوندی باتیفا)، عەبدلرەحمان حەجی عەلی رەشید، مەحمووود سالح (ئەرزوحالچی)، یونس محێ دین، عیسا سالح عیسا، ئەحمەد سەید عەبدوللا، مەحمووود حەجی ئەحمەد، نایف ئەیوب ژ مالا شەمدین ئاغای، و رەئوف نەجمەدین، هدایەت تاهر، هاشم نەجم، عەبدی خیاط و ل ناحیا گولیا حاجی کورێ حەجی صادقێ بروی و حەسو ئیبراهیم و هدایەت تاهری کارێ ڤەگوهاستنا پۆستێ پارتی دناڤبەرا بەغدا و



خالد یوسفی

مووسل و زاخۆ دا دكر. و عارف نەجم كو ئاكنجیێ بەغدا بوو كارێ هنارتنا بەلاڤوكا بۆ زاخۆ دكر.

گەلەك ژ ئەڤ ناڤێن ل سەری هاتین دیاركرن چ پەیوەندی دگەل كومونیستان نەبووینە، بۆ نموونە محەمەد شاهین صوفي ئەندامەكی دیارێ پارتی بوو و دەمێ حوسنی حەجی رەشید هاتییە دەستەسەركرن گەف ل دەستەلاتێ كرن و گۆت: نە خەمە ئەگەر هەوە ئەم زیندانكرین چونكی پشتی بیست رۆژێن دی مەلا مستەفا بارزانی دێ ژ مۆسكو ڤەگەریێتە ڤە عیراقێ و ئەم دێ ژ زیندانێ ئازادبین(٦٥).

ل سالا ١٩٥٧ێ خسرو توفیق بەرپرسیێ رێكخستنێ ل بادینان سەرەدانا زاخۆ كر و دیدارەك دگەل سالح یوسفي و عوسمان قازی كر و لیژنەكا ناڤخۆ یا پارتی پێكئینا و هەر ئێك ژ سالح یوسفي و مەلا سالح حاجی بالقوسی و عوسمان قازی و شێخ جەمال بریفكانی و عەلی هالو و عومەر حەسەن بامەرنی و نعمان عیسا بارزانی بەرپرساتییا وێ وەرگرتن .

ژ هەژێ گوتنێ یە كو زاخۆ باژێرێ ئێكانە بوو ژن تێدا چووینە دناڤ رێزێن پارتی دا و بووینە ئەندام، و سامیە عەبدولمەجید تێلی د هێتە هەژمارتن یەكەم ژن بوویە ئەندام دناڤ پارتی دا و پشتی وێ عەیشێ ئەحمەد حاجی، سەبریە سلێمان، وەسیلە حەجی مەحموود بوصەلی، فاتما ئەسعەد شاهین، عەدلە محەمەد، قومری ئیسماعیل حاجی، كۆتر یوسف ئاڤدەل هاتن(٦٦).

سەبارەت باژێرێ دهۆكێ ژی پێزانین ل سەر دەستپێكا رێكخستنێن پارتی ل وێرێ هێشتا دكێمن، لێ مرۆڤ دشێت بێژێت كو كاكلكا ئێكێ یا رێكخستنێ ژ ئەندامێن بەرێ یێن كۆمەلا هیوا هاتە پێكئینان ئەو ژی: خالد یوسفي، محەمەد سەعید محەمەد حەسەن مفتی، محەمەد سەعید دۆسكی،



لەزگین سندوری



مەحەمەد سەعید مەحەمەد حەسن مفتی

محەمەد سالح مەلا جەبرائیل، محەمەد حەسەن بالەتەیی، حسێن حەسەن ئاکرەیی و ئەحمەد عەبدوللا مسیری، و پشتی سەرەدانا خسرو توفیق بۆ باژێری مەلا عەلی ئیسماعیل بەرۆشکی بۆ بەرپرسیێ ڕێکخستنا دهۆکێ و مستەفا عەلی ئەفەندی بۆ هاریکاریێ وی، دیسان د ناڤبەرا سالێن ١٩٥٦- ١٩٥٨ هندە ناڤێن دی ل دهۆکێ دناڤ ڕێزێن پارتی دیار بوون وەکی: حەسەن بێکەس، حەسەن مەحموود بەزاز، محەمەد حەسەن مالتایی[٦٧]، ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی، لەزگین سندوری، ئەحمەد مستەفا ئامێدی (فەرمانبەر) و صاریا مستەفا دۆسکی[٦٨].

هەر چەند مەسعود سەعید (مامۆستا) نە د ناڤ ڕێزێن پارتی دا بوو، لێ وی و دایکا خۆ صارایێ بزاڤەکا سیاسییا بەرچاڤ ل بەری شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ دا هەبوو، و مەسعود سەعید ل سالا ١٩٤٦ێ ژ بەر بەلاڤکرنا وی بۆ وێنەیێن مەلا مستەفا بارزانی و پەیرەوێ پارتی هاتە دەستەسەرکرن، و دایکا وی دووڤچوونا کێشا کوردی دکر ل دامەزراندنا کۆمارا کوردستان ل مهابادێ ل ٢٢ کانونا دووێ ١٩٤٦ێ یا بەرهەڤبوو، دیسان وێ سەرۆك عەشیرەتێن دەڤەرێ دژی دەستەلاتێ هاندان تا هاتییە دەستەسەرکرن و ب شەش هەیڤان هاتییە زیندانکرن و دەستەلاتێ ئەو ب سیخور (جاسوس) ب ناڤکربوو چونکی گەلەك ب سەر ماقوولێن کوردانڤە د هات و د چوو و ل سەر کێشا کوردی دئاخفتن.

ژبەر بزاڤا سیاسییا مامۆستایان ل دهۆکێ دەسەلاتداریێ ل ئادارا سالا ١٩٥٧ێ ١١ مامۆستا ژ دهۆکێ بۆ جهێن دیتر ڤەگوهاستن. محەمەد سەعید عەرەب ڤەکوهاستنە دەڤەرا زمار و عبد لحەکیم ئەحمەد بۆ تەلەعفەر و مەسعود سەعید بو گوندی نەپاخیێ ل قەزا ئاکرێ[٦٩] و سالح مەجید بو گوندی سینو ل شنگالێ و نەبی محەمەد جەرجیس و ژنا وی یا مامۆستا نەسرین فائیق بۆ دەرڤەی دهۆکێ[٧٠].



مەحەمەد حەسن بالەتە



ژ راست بو جەپ ئەکرم، عزەت نوعمان، فاخر محەمەد ئاغا مێرگەسوری، ئەشرەف، نوری ئەحمەد نوعمان ئەحمەد، عزەت ئاکرەیی، محەمەد موستەفا ئامێدی، رەجەب سەید عەلی ئامێدی، مرافق فاخر

ل قەزایا ئامێدیێ ژی، سالح روشدی ئامێدی (پارێزەر)، کو هەر کورەکێ ڤی باژێری بوو ل دەستپێکا سالا ١٩٤٨ێ بەرپرساتیا رێکخستنێن پارتی ل مووسل وەرگرتبوو، هەروەسان کونگرێ دووێ یێ پارتی کو ل بەغدا ل سالا ١٩٥١ێ و ل مالا عەلی حەمدی بێدوهی (بەرواری) هاتیەگێران، بێدوهی وەك ئەندامێ کومیتا ناڤێن ل کونگرێ سێێ ئەوێ ل کەرکوکی ل سالا ١٩٥٣ ێ هاتیەگیران هاتە هەلبژارتن و ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی یەکەم سەروکێ ئێکەتیا قوتابیێن کوردستانێ بوو، ئەوا ل ١٨ شباتا ١٩٥٣ێ هاتیەدامەزراندن[71].

ژ بەرپرسێن پارتی ل باژێرێ کو ل بەری شورەشا ١٤ تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ هاتینە نیاسین: یونس ئەمین، خالد حەسەن یوسفی، عارف سەعید، رەشید ئیبراهیم، عارف مستەفا، ئەشرەف عزەت، مەلا ئەحمەد مەلا ئەمین باوانی، ئەسعەد عەبدولقادر و عارف خالد، ئیسلام محەمەد ناصر و یێن دی[72].

و پارتییان ژی مل ب ملێ رێکخستنێن کومونیستا عیراقی پشکداری د پتریا وان بزاڤێن سیاسیدا کریە ئەوێن بەری شورەشا ١٤ تیرمەهێ ل دەڤەرێ دهاتنەئەنجامدان.

قەزا شێخان و دەور و بەرێن وێ، نەخاسمە هەردو ناحیێن ئەترووش و ئەلقوش (کو یا دووماهیێ ژ ئالیێ کارگێری ڤە سەرب قەزا شێخان ڤەبوو) رێکخستنێن (پارتی) هەر ژ سالا ١٩٤٨ێ چالاکی لێ ئەنجامدابنە، و ژ دیارترین پارتی و دلسوزێن وێ: مەلا عاصم عەبدوللا عاصم (پەرۆکفرۆش)، کورێ وی رەشید (بازرگانێ دەخل ودانی)، ئەحمەد جەرجیس

(مامۆستا)، یونس هرمز (کارکەر)، مەلا ئەنوەر مایی (فەرمانبەر)، مەلا خەلیل سلێمان (مشەختی)، خدر سلو، سلو خدر حەجی، حسێن بابا شێخ، محەمەد ئەمین سەیدا (پەرۆکفرۆش)، محەمەد شاهین صوفی (پارێزەر)، ئەندازیار نوری شاویس رۆلەکێ گرنگ د رێکخستناندا هەبوو کو خەلکێ قەزایێ ئینانە دناڤ رێزێن پارتی[٧٣].

## پارت و کۆمەلێن سیاسی یێن ئیسلامی:

### ١- (ئیخوان ئەلموسلیمون):

ل ئادارا سالا (١٩٢٨)ێ بزاڤا برایێن موسلمان (الاخوان المسلمون) ل باژێری ئیسماعیلیەیێ مسرێ ل سەر دەستێ حەسەن ئەحمەد عەبدولرەحمان ئەلبەنا (١٩٠٦- ١٩٤٩) دەستپێکر، بانگەوازا وان ل عیراقێ ل باژێری مووسل ل سالا ١٩٤٦ێ ل سەر دەستێ محەمەد مەحموود الصواف دەستپێکر، ئیخوان ئەگەرێن پاشڤەمانا وەلاتێن عەرەبی ڤەدگەرینتەڤە دوورکەتنا وان ژ ئایینێ ئیسلامێ، و وەسان دبینن کو ئیسلام سیستەمەکە هەمی لایەنێن ژیانێ ڤەدگریت، و بەنا بنەمایێن ئیخوانا دڤان دەستەواژەیان دا کۆمڤە دکەت: خودێ ئارمانجا مەیە، پێغەمبەر پێشەنگێ مەیە، قورئان دەستورێ مەیە، جیهاد رێیا مەیە، شەهادەت داخوازیا مەیە، و سیمایێن وێ د پێنج پەیڤان دا کۆمڤە دبن ئەوژی: سادەیی، قورئان خواندن(التلاوة)، نڤێژ، سەربازی، رەوشت.

سەبارەت پەیرەوێ ناڤخۆیی ژی خێزان دهێتە هەژمارتن بچویکترین یەکەیا رێکخستی و پێك دهێت ژ پێنج کەسان و گرێدای هۆبێ یە و هۆبە گرێدای نڤێسینگەها دەڤەرێ ڤە و دەڤەر ب نڤێسینگەها کارگێری ڤە کو ئەو ژی گرێدای مەلبەندێ گشتی یە[٧٤].

(ئیخوان موسلمین)ێن عیراقێ ل ژێر ناڤێ کۆمەلا برایێن ئیسلام کارکر و شیان ل ١٣ ئەیلولا ١٩٤٩ێ مۆلەتا کارکرنێ وەرگرن و دەستەکەکا کارگێریا ئێکێ یا کۆمەلێ پێکهاتی بوو ژ: ئەمجەد ئەلزەهاوی(سەرۆك) محەمەد عاصم ئەلنەقیب (جێگری سەرۆکی) و محەمەد مەحموود ئەلصەواف (سکرتێر) و ئیبراهیم مستەفا ئەلئەیوبی (ئەمینداری سندۆقێ) و دەستەکەکا دامەزرێنەر کو یا پێکهاتیبوو ژ پتر ژ شێست کەسان هاتە هەلبژارتن، و ل سەر هەمان رێبازا رێکخستنا ئیخوانان ل مسرێ ل سەر دچن ب رێڤەچوون.

و مامۆستایێن مووسلی ئەوێن ل بەهدینان کار دکەن شیان گەلەك ژ کورێن دەڤەرێ بکێشنە ناڤ رێکخستنێن ئیخوانان‌دا، و گەلەك هەڤال و لایەنگر و شانە بۆ ئیخوانان ل قەزایێن دهۆك و ئاکرێ و زاخۆ دروست بوون، و محەمەد ئەلصەواف گەلەك سەرەدان برنە دەڤەرێ، هەر وەسان ئیخوانان ژی گەلەك سەرەدان بۆ دەڤەرێن کوردی رێکخستن، ل هاڤینا سالا ١٩٥٤ێ خێڤەتگەهەکا (وەرزشی) ل نێزیك سیارەتۆکا دانان و ئێکا دی ل نێزیکی گوندێ بامەرنێ، و ژ گرنگترین ئارمانجێن ئیخوانا ل کوردستانێ (سستکرنا هزر و بیرێن نەتەوەیێن بەرتەنگ بۆ هزرا نەتەوییا بەربەلاڤ د وی دەمیدا و رێ نیشادانا وان بەرەڤ باشتر...) ل دووڤ گوتنا وان[٧٥].

بزاڤێن ئاشکرا یێن ئیخوانان تا ئەیلولا سالا ١٩٥٤ێ بەردەوام بوون، وی دەمی هەمی پارت و کۆمەلە هاتنە هەلوەشاندن، لێ بزاڤێن وان یێن نیڤ ئاشکرا تا نیڤا سالا ١٩٥٩ێ هەر د بەردەوام بوون، و ئەنجامێن بزاڤێن وان ل بادینان ئەو بوو کو: هزر و بیرێن ئیخوانان هەر ژ سالا ١٩٥٣ێ هاتنە دناڤ دهۆکێ دا پشتی محەمەد مەحموود صەوافی سەرەدانەك ئینایە دهۆکێ و گۆتارەك د مزگەفتا مەزنا دهۆکێ دا پێشکێشکری، و ژ وان کەسانێن هزر و بیرێن وان کارتێکرن لێ کرین و چووینە د ناڤ رێزێن وان دا: سالح عەبدولغەنی بوو، کو ژ ئالیێ سەرۆکاتیا ئیخوانان ڤە ل مووسل هاتییە راسپاردن ببیتە بەرپرسێ برێڤەبرنا کاری و دووڤچوونا کاروبارێن ئیخوانا ل باژێری، و گەلەك ژ ئیخوانان پالپشتیا وی کر و ژ وانان: ئیسماعیل عەلی بەربهاری، تاهر صوفی مستەفا، محەمەد عەلی هاشم و گەلەك ژمامۆستایێن مووسلی رۆل

د بەلاڤكرنا هزرو بیرێن ئیخوانان دناڤ خویندكارێن خواندنگەهێن باژێری دا هەبوون و كومبوون د ناڤ دیارترین مزگەفتێن باژێری دگەل وان د هاتنەئەنجامدان وەكی: مزگەفتا مەزن، مزگەفتا حەجی مستەفا، مزگەفتا رێكانییا، مزگەفتا مفتی، و ل هندە جاران د مالێن چەند ئەندامێن وان دا، و بەلاڤۆك و ئەدەبیاتێن ئیخوانان ل سەر وان بەلاڤدكرن و ژوانان گۆڤارا (الأخوة الأسلامية) .

هەر چەوا بیت بانگخوازی (دعوة) و بزاڤا وان ل دهۆكێ هەر ما لاواز و كێم رێكخستی، و هەر ب تنێ ل سەر هەڤالینیا كەسوكی بوویە و فەرمان و رێنما ژ مامۆستایێن ل باژێری كاردكرن وەردگرتن و یا بزاڤێن وان ل جهەكی راوەستاندین و نەهێلاین بەرفرەهـ ببن ئەو بزاڤێن سیاسی و نەتەوەیی و كومونیستی بوونە كو ل دڤەرێ هەبن[٧٦].

بزاڤێن ئیخوانان ل زاخۆ ل دەستپێكا سالێن پێنجییان ژ چەرخێ بووری دەستپێكر و یا پێكهاتی بوو ژ وان سەرەدانێن ژمارەكا ئەندامێن چالاكێن وان بۆ باژێری دكرن وەك: غانم سەعدوللا حمودات (بەرپرسێ رێكخستنێ ل مووسل) و نامق شێخ عەلی و عەبدولرەزاق حاج قاسم، و سەوافي ل سالا ١٩٥٦ێ سەرەدانا باژێری ژی كر، هەر وەسان هندەك ژ خێزانا (الجوادی) یا مووسلی كو ل زاخۆ د ئاكنجی بوون رۆل د بەلاڤكرنا هزر و بیر و ئەدەبیاتێن وان دا هەبوو، و مصلح شێخ ضياء الدين (ژ باتیفا) بەرپرسیارەتییا ئیخوانان ل زاخۆ وەرگرت، و سالم داوود ئەلجەوادی و غانم شیتە هاریكارییا وی دكرن[٧٧].

ئیخوانان پەیوەندیێن باش دگەل كەسایەتیێ بەرنیاس (حاجی شەمدین ئاغا) نوینەرێ زاخۆ ل پەرلەمانێ عیراقێ هەبوون، و چەندەك ژوان دگەل غانم حامد (خویندكار ژ زاخۆ) ل ئەیلولا ١٩٥٤ێ سەرەدانا وی كرن و شەڤەكێ مێڤانداریا وان كر و جارەكا دی ڤەگەریانە مووسل پشتی گوتارێن ئایینی د گەل ژمارەكا زانایێن ئایینێ ل مزگەفتا زاخۆ پێشكێشكرین ژوانان: مەلا ئەحمەد و شێخ موسلح و سەید محەمەد شیلانی و شێخ جەمال و مصلح ضياء الدين الاخلاطي. لێ دگەل ڤێ چەندی و ژ بەر بەرەنگاربوونا كومونیستان ل سەر بزاڤێن وان ل ناڤ مزگەفتان و ل جهێن گشتی، ئیخوان نەشیان رێكخستنەكێ ل باژێری پێكبینن[٧٨].

قەزا ئاكرێ ژی گەلەك سەرەدانێن سەركردایەتییا ئیخوانان ب خۆڤە دیتن، محەمەد مەحموود ئەلصەواف ل سالا (١٩٥١ - ١٩٥٢)ێ سەرەدانا باژێری كر و دیدار د گەل ژمارەكا زانایێن وان كر ژ وان: یاسین مەلا حەبیب، عەبدولصەمەد مەلا عەبدلغەفور، عەلی مەلا سەعید مەلا سەلیم، سەلیم مەلا سەعید، ئەحمەد مەلا محەمەد، فازل مەلا عەبدوللا و (سەوافي) پێشنیازا ڤەكرنا هۆبەكا ئیخوانان كر، لێ مەلا ئەحمەد مەلا محەمەد پێشنڤێژ و گوتارخوینێ مزگەفتا مەزن نەرازیبوونا خۆ ل سەر وێ چەندێ دیاركر، و پشتی بزاڤێن سەوافي بزاڤەكا دی ژ ئالیێ مامۆستا نامق شێخ عەلی ڤە هاتەكرن، لێ ئەو ژی د دروستكرنا رێكخستنێ دا سەرنەكەت[٧٩].

و ژێدەر و روودان ئاماژێ نادەنە چ كەسەكی ل هەردو قەزایێن ئامێدیێ وئاكرێ كو كەتبنە ژێر كارتێكرنا هزر و بیرێن (ئیخوان ئەلمسلمین).

### ٢- پارتییا رزگارییا ئیسلامی (حزب التحرير الاسلامي):

ئەڤ پارتە ل دەستپێكا سالا ١٩٥٢ێ ل ئوردنێ سەر دەستێ شێخ تەقیەدین ئەلنەبەهانی هاتەدامەزراندن، و پەیرەوێ ڤێ پارتێ داخوازییا پراكتازیكرنا ئیسلامێ دناڤ هەمی لایەنێن ژیانێدا دكەت، و ئەو وەسان دبینت كو بزاڤا نەتەوەیی یا ل سەر شەنگستەكێ كولونیالیزمی هاتییە ئاڤاكرن، دا ئێكەتییا موسلمانان ژێكڤەكەت و نەهێلیت دەولەتا ئیسلامی بێتە پێكهینان، و (خەلیفە) شەنگستەیە ل دەولەتی، ل سالا ١٩٥٤ێ هزر و بیرێن ڤێ پارتێ ل سەر دەستێ عەبدولعەزیز عەبدوللەتیف ئەلبەدری و عەبدولغەنی محەمەد حسێن المساح وغصوب

ئەلجبوری بەلاڤبوون[٨٠]، هەر چەند هندەك كورد ل مووسل چوونە دناڤ ریزێن ڤێ پارتێ دا لێ دەڤەرا بادینان چ رێكخستن و بزاڤێن وێ یێن هەژی گۆتنێ نەدیتن، ژ بلی ئەو ئاماژە نەبیت كو ل ٨ شواتا سالا ١٩٥٨ێ چەند ئەندامێن ڤێ پارتێ سەرەدانەك برنە ئامێدیێ دا بەلاڤۆكێن خۆ لێ بەلاڤبكەن، ژ ئەنجامێ ڤێ سەرەدانێ هاریكاریا پۆلیسێن ئامێدیێ رابوون ب پشكنینا مالێن هەر ئێك ژ سالح رەشید نعمان و تاهر حەجی سەلیم بۆ ڤەكۆلینێ ژ پەیوەندیا وان ب پارتا قەدەغەكریڤە، هەرچەندە چ بەلگە ل دۆر پەیوەندیا وان دگەل ڤێ پارتێ نەدیتن، لێ هەردو دانانە بن چاڤدێریكرنێ[٨١].

ل داویێ نە ئیخوان و نە پارتی رزگاری ئیسلامی نەشیان چ تا یان كومیتە یان هۆبەكێ ل باژێرێن بادینان ڤەكەن و بزاڤێن ئیخوانان مانە دچارچۆڤێ پەیوەندیان دگەل چەند زانایێن ئایینی و كەسان ل دەڤەرێ ، چونكی بنەمایێن بانگخوازیا وان چ بەرسڤ ژ پتریا خەلكێ گرێدای ب ئیسلامێ و بنەمایێن وێ بێ رێكخستن نەدیتن، ئەڤە ژ بلی بزاڤا سیاسیا كومونیست و پارتیان و بنەمایێن وان كو ل وی دەمی ب دلێ پتریا خەلكێ وێ

**٣- پارتا داشناك (طاشناق)،**

پارتەكا نەتەوەیا ئەرمەنی یە ل سالا ١٨٩٠ێ ل تبلیس (تفلیس)ی پایتەختێ گورجستان هاتە پێكئینان، ژ ئارمانجێن وێ رزگاركرنا گەلێ ئەرمەنی ژ حوكمێ ئوسمانییان بوو، و ژ بەر كو گەلەك ئەرمەنی ژ ئەگەرێ كوشتارێن تەبایێن ئەرمەنان ئەوێن ژ ئالیێ دەستەلاتدارێن تركانڤە هاتینەئەنجامدان دسالێن شەرێ جیهانیێ ئێكێدا هاتبوونە زاخۆ و ل وێری ئاكنجیبوون، ئەڤ پارتە شیا ل ١٩٤٩ێ رێكخستنەكێ ل ڤی باژێری پێكبینیت، و گوندێ هەورێسكێ بۆ ناڤەندا وان و رێكخستنا وان ژ (٤٥) ئەندامان پێكدهات و سەرۆكێ وێ لیڤون پاشا بوو، و بەرپرسێ زاخۆ عەباس ماردیروس بوو. ژ بزاڤێن وان ڤەژاندنا گیانێ نەتەوەیی بوو ل دەڤەرێ دناڤ ئەرمەناندا، و ئەڤ بزاڤە تا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ یا بەردەوام بوو[٨٢].

## رێكخستن و لقێن كۆمەل و پارتێن سیاسییێن ئاشكرا ل بادینان ١٩٢٢- ١٩٥٨

پشتی شۆرشا عیراقی ل٣٠ خزیرانا١٩٢٠ێ، داگیركەرێن بریتانی نەچاربوون سیاسەتا خۆ ل عیراقێ ب دامەزراندنا رەنگە حوكمدارییەكا نیشتیمانی ب گوهۆرن، یەكەم حكۆمەتا عیراقی ل٢٧ چریا ئێكێ١٩٢٠ێ هاتە پێكهینان ول ٢٣ تەباخا ١٩٢١ێ فەیسەل كورێ حسێن وەكی شاهێ (مەلكێ) عیراقێ هاتەدانان، و دا كو حكۆمەت رادەكی بۆ وان كۆمبوونێن سیاسی یێن نهێنی و ئەشكرا كو ل مزگەفت و ل مالان دهاتنە ئەنجامدان بدانیت، لەزكر ب راگەهاندنا یاسا كۆمەلا (الجمعیات) ل ٢ تیرمەها سالا ١٩٢٢ێ، و پارتا نیشتمانی(الحزب الوطني) دهێتە هەژمارتن یەكەم پارتا مۆلەتدای ل سەردەمێ شاهانی.

ئەو پارتێن سیاسی یێن بەری دەستپێكرنا ژیانا نوینەرایەتی ل ١٦ تیرمەها ١٩٢٥ێ مۆلەت وەرگرتی وەك پارتا نیشتمانی (حزب الوطني) و پارتا ئازادا عیراقی (حزب الحر العراقي) و پارتا گەل (حزب الشعب) چ دەنگڤەدان ل مووسل و دەڤەرا بادینان نەدیتن، هەر چەند هندە كەس چووبوونە دناڤدا مینا حازم شەمدینی و عەبدوللا بریفكانی كو چووینە دناڤ پارتا پیشكەفتن (التقدم) دا كو ژئالیێ عەبدولموحسن ئەلسەعدون ڤە هاتییەدامەزراندن و مۆلەتا كاركرنێ ل ٢٢ تەباخا ١٩٢٥ێ پێ هاتییەدان، دەمێ ژیانا پارتایاتی (حزبی) ل دەڤەرێ پشتی ئاریشا مووسل گەشەكری، مووسلی شیان لقەكێ كۆمەلا بەرگریا نیشتمانی (جمعیة الدفاع الوطني) ل زاخۆ دابمەزرینن پشتی (ولایەتا مووسل) ب عیراقێڤە هاتییە گرێدان ئەڤ كۆمەلەیە ب داویهات. هەر وەسان حازم شەمدین چوو د ناڤ رێزێن پارتا ئێكەتیا نیشتیمانی (حزب الوحدة الوطنیة) كو ژ ئالیێ عەلی جودت ئەلئەیوبی ڤە ل ٢٧ تەباخا سالا ١٩٣٤ێ هاتبوودامەزراندن، و

د هەمان سالدا حەمزە عەبدولئالیێ وی دەمی (خویندكار ل كولیژا ماف) د ناڤ كۆمەلا نەهێلانا كولونیالیزم و تەپەسەركرنێ (جمعية مكافحة الاستعمار و الاستثمار) (یا كومونیستی) و بۆناڤ كۆمەلا چاكسازیا مللی(جمعية الاصلاح الشعبي) كو ل ١٢چریا ئێكێ ١٩٣٦ێ هاتبوودامەزراندن .

ل دەمێ شەرێ جیهانێ یێ دووێ (١٩٣٩-١٩٤٥)ێ هشیاریا سیاسی پتر لێهات و چەمكێن سیاسی پێكەهشتن و داخوازی ل سەر مۆلەتدانا پارتێن سیاسی مشەبوون ئەوێن ل ٢٩ نیسانا ١٩٣٥ێ هاتینەراگرتن، و حكۆمەت نەچاربوو بهێلیت بێنەڤە دامەزراندن، و وزارەتا ناڤخوو ل ٢ نیسانا ١٩٤٦ێ مۆلەت دا پێنج پارتێن سیاسی ئەوژی: پارتا سەربخوویا عیراقی (الحزب الاستقلال العراقی) و پارتا ئازادیخوازان (حزب الاحرار) و پارتا نیشتمانیا دیموكراتی (الحزب الوطني الديمقراطي) و پارتا گەل (حزب الشعب) و پارتا ئێكەتیا نیشتمانی (حزب الاتحاد الوطني)، و ل بەرامبەر وەزارەتا ناڤخۆ مۆلەت نەدا پارتا رزگاریا نشتمانی (التحرر الوطني) كو وەسان دزانی ئەڤە روویێ پارتا كومونیستە و دیسان مۆلەت نەدا پارتەكا كوردی ب بەهانەیا وێ چەندێ دێ تنێ یا ب كوردانڤە گرێدای بیت، و دێ یا نەژاد پەرست بیت و یا گونجای نابیت دگەل پارتێن دی ل عیراقێ[٨٣].

هەر وەسا وەزارەتا ناڤخۆ ل ٢٦ گولانا ١٩٥١ێ مۆلەت دا پارتا بەرەی مللی یا ئێكگرتی (حزب الجبهة الشعبية المتحدة) و ل ٢٤ چریا ئێكێ ١٩٤٩ێ مۆلەت دا پارتییا ئێكەتیا دەستوری (حزب الاتحاد الدستوري) و ل ٢٤ حزیرانا ١٩٥١ێ (حزب الامة الاشتراكي).

هەر چەند ئەڤ پارتێن ناڤبری ب رەنگەكێ ئاشكرا كاردكرن لێ د كاریگەر و خودان باوەریەكا سیاسی یا رۆن نەبوون، و حكۆمەتێ ل ٢٢ ئەیلولا سالا ١٩٥٤ێ هەموو ئەو حزبە هەلوەشاندن و مۆلەتا چ پارتێن دی نەدا تا رووودانا شۆرشا ١٤ تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ و دەرچوونا یاسا پارت و كۆمەلان ل ئێكێ كانونا دووێ سالا ١٩٦٠ێ.

یا گرنك د بابەتیدا ئەوە كو ئەڤ پارتێن ئاشكرا د ناڤبەرا (١٩٢٢ ـ ١٩٣٥)ێ و (١٩٤٦ ـ ١٩٥٤)ێ نەشیان چ لق و رێكخستنان ل بادینان ڤەكەن، چونكی پتریا وان تا رادەكی چ پویتە ب دۆزا كوردی نە ددان و چ سیاسەتێن ئاشكرا بەرامبەر مافێن نەتەوەیێن كوردان نەبوون، ژبلی چەند پێنگاڤێن وێرەكانە نەبن كو ژ ئالیێ هندە پارتێن چەپرەو ڤە سەبارەت كێشا كوردی هاتینە هاڤێتن، وەكی (حزب الشعب) و (حزب الاتحاد الوطني)، و ئەڤە وێ چەندێ د گەهینت كو هندە كورد ل مووسل و بەغدا چووبنە دناڤ رێزێن وان پارتان دا.

هەر چەند ئەو پارتێن دناڤبەرا (١٩٢٢ ـ ١٩٣٥)ێ دا هاتینە پێكهینان چ ئاماژە و هەلویست دناڤ پەیرەوێ خۆدا بەرامبەر كێشا كوردی دیارنەكرینە، لێ چەند ئاغا و ماقوولێن بادینان چوونە دناڤ رێزێن هندەك ژوان پارتان دا، بۆ نموونە: عەبدوللا ئاغایێ شەرەفانی (سەرۆك عەشیرەت) و حاجی شەمدین ئاغا (سەرۆك عەشیرەت) و حازم عەبدولعەزیز ئاكرەیی (پارێزەر) وتەحسین سەعید بەگ (میرێ كوردێن ئێزدی) چوونە د ناڤ رێزێن پارتا ئێكەتیا دەستوری (الاتحاد الدستوري) كو نوری سەعیدێ سەروكوەزیرێن عیراقێ سەرۆكاتیا وێ دكر، ئەوێ سەرەدانا قەزا ئاكرێ كری و كۆمبوون دگەل سەرۆك عەشیرەت و خودان دەسەلاتان ل وێری كری دا كو پشتەڤانی لێ بێتە كرن و لقەكا پارتا خۆ ڤەكەت، و حازم ئاكرەیی ل كونگرێ گشتی یێ پارتێ ل ٢٧ چریا دووێ ١٩٥٠ێ ئامادەببوو، و زنجیرەكا گۆتاران ل رۆژناما (نصير الحق) یا مووسلی بەلاڤكرن و ب باشی ئاماژە د دا هزر و بیر و بنەمایێن پارتێ و داخواز دكر بێنە د ناڤ رێزێن وێ دا و نەرازیبوونا خۆ بەرامبەر بەرهەلستكارێن وێ دەربری، و دگەل ڤێ چەندێ ئەڤ پارتە سەرنەكەفت ب ڤەكرنا لقەكێ خۆ ل مووسل.

هەر وەسان هەر ئێك ژ عەبدوللا ئاغا شەرەفانی،

حەجی شەعبان ئاغا ئامێدی، تەحسین سەعید بگ، ئەمین عەبدو، حەسەن زکری و حسین عەلی ئاغا چوونە د ناڤ پارتا (الأمة) یا سالح جەبری سەرۆکاتیا وێ دکر و سالح جەبری سەرەدانا دەڤەرێن کوردی کر و لقەکا پارتا خۆ (حزب الأمة) ل ٩ گولانا ١٩٥٢ێ ل مووسل ڤەکر، هەژی گوتنێ بە کو ژمارەکا شێخ و ئاغایێن عەشیرەتێن کوردی و عەرەبی پەیوەندیێن خۆ دگەل نوری سەعید و پارتا وی نەبرین و د هەمان دەم دا چوو بوونە دناڤ ریزێن پارتا سالح جەبری ژی دا، واتە د ئێك دەم دا ئەندام بوون د دو پارتاندا[٨٤].

سەبارەت پارتێن سیاسی یێن کوردی یێن ئاشکرا، هەر چەند حکۆمەتا عیراقێ یاسایا کۆمەلا ل ٢ تیرمەها سالا ١٩٢٢ێ و یاسایا کۆمەلا ل نیسانا سالا ١٩٤٦ێ دەرئێخستبوون، کو هەردووان مۆلەت دابوونە چەند پارتان ئاشکرا کاربکەن، لێ حکۆمەتا عیراقێ ل دەمێ شاهینی رێ نەدا و نەهێلا مۆلەتێ بدەتە چ پارتێن سیاسی یێن کوردی، ب بەهانەیا وێ چەندێ دێ بیتە هاندان بۆ نەتەوێن دی یێن نە عەرەب ب پێکهینانا پارتێن تایبەت ب وانڤە، و ئەڤ پارتە دێ د تایبەت بن ب نەتەوەکی ب تنێ ڤە و ژ بۆ رازیکرنا کوردان حۆکمەتێ ل بەرامبەر ڤێ چەندێ رێ ددا کوردان ب پێکهینانا کۆمەلێن رەوشەنبیری و جڤاکی ب مەرجەکی مایێ خۆ د کاروبارێن سیاسی نەکەن[٨٥]، و ژ ئەنجامێ ڤێ چەندێ کوردان پارت و کۆمەلێن نهێنی پێکئینان، یان چوونە د ناڤ وان پارتێن پویتە ب کێشا کوردی ددان ب تایبەت پارتا کومونیستا عیراقی.

## حزبا بەعسا عەرەبیا سوشیالیست (حزب البعث العربي الأشتراكي):

کونگرێ دامەزرێنەرێ ڤێ پارتێ ل ٤ نیسانا ١٩٤٧ێ ل دیمەشقێ هاتە گرێدان و کونگرەی کارێن خۆ ل ٧نیسانێ ب داویئینان و ئەڤ رۆژە هاتە هەژمارتن دەستپێکا دامەزراندنا ڤێ پارتێ، و بنەمایێن بنەرەتی یێن ڤێ پارتێ رژدی ل سەر دەستڤەئینانا ئێکەتیا عەرەبی دکر، و وەلاتێن عەرەبی وەکی ئێك یەکەیا سیاسی و ئابووریا ژێکڤەنەبووی بێتە ل قەلەمدان، و شانە دهێتە هەژمارتن یەکەیا بنەرەتیا رێکخستنێ دناڤ کیانێ پارتێ دا، و رێکخستن ب رەنگەکێ گشتی یا گرێدای ناڤەندیێە و گوهداریا وێ دکەت و یەکەیێن وێ پێکدهێت ژ: شانە، تیپ، هۆبە، لق، وەلات، کونگرەیێ وەلاتی، کونگرەیێ نەتەوەیی (الخلية، الفرقة، الشعبة، الفرع، القطر، المؤتمر القطري، المؤتمر القومي).

ل دەسپێکێ هزروبیرێن بەعسییان د رێکا وان خویندکارێن عیراقی کو ل زانکویێن دیمەشق و بەیروت ل عیراقێ بەلاڤبوون، هەر وەسان ئەو خویندکارێن سوری یێن ل پەیمانگەهـ و کولیژێن بەغدا د خواندن پشکداری دبەلاڤکرنا هزر و بیرێن بەعسییاندا کر، و یەکەم تیپا پارتێ ل بەغدا ل سالا ١٩٤٩ێ هاتە پێکهینان، ل گولانا سالا ١٩٥٤ێ یەکەم شانا بەعسییان ل باژێرێ مووسل هاتە پێکئینان، و پشتی ١٤ تیرمەها سالا ١٩٥٨ ێ ئاستێ رێکخستنێ هاتە بلندکرن بۆ فەرماندەییا هۆبێ کو یا پێکهاتی بوو ژ دو تیپان.

بەعسی نە شیان چ شانان ل بادینان پێکبینن، لێ هندە کوردێن بادینان وەك: تەها یاسین رەمەزان (جـزراوی) و حاجی مادۆ (ژ باشیکێ) و هۆزانڤان محسن ئاکرەیی و حکمەت حاجی سەلیم ئەترووشی و ئیبراهیم حەیدەر ئەترووشی و حاجی مادۆ چوونە دناڤ رێزێن وێ دا، هەر وەسا ژمارەکا فەرمانبەرێن عەرب کو ل قەزایێن بادینان بوون پەیوەندی پێڤە هەبوون، و عەبدولغەفار ئەلصائیغ (ژ بەعسیێن دەستپێکی ل عیراقێ) د گۆت: دەمێ ئەو ل بەریا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ مامۆستا ل دوواناوەندیا دهۆکێ، شیا چەند خویندکاران دناڤ پارتا بەعس دا رێکبێخیت، لێ بەربەرێن دیرۆکی پشتگیریا گۆتنێن وی ناکەن[٨٦].

# ژێدەر و پەراوێز:

١. سالح عەبدوللا نەجمەدین یوسفي ل سالا ١٩١٨ێ ل گوندێ بامرنی قەزا ئامێدیێ ژ دایك بوویە، ژ کولیژا زانستێن شەریعێ ل سالا ١٩٤٣ێ ل بەغدا دەرچوویە، دگەل چەندین پارتێن سیاسی یێن کوردی کار کریە، ژبەر چالاکیێن وی یێن سیاسی ل ٢٥ خزیرانا سالا ١٩٨١ێ ژ لایێ حکومەتا ئیراقێ ڤە هاتە تیرورکرن.

٢. حەمزە عەبدوللا سالا ١٩٠٤ێ ژ دایکبوویە، ل سالا ١٩٣٤ێ ژ کولیژا ماف دەرچوویە، ژ ئەگەرێ چالاکیێن وی یێن سیاسی ل ١٩٣٨/٢/٢٣ ێ رەگەزناما ئیراقی ژێ هاتە ستاندن، ل ١٩٩٨/١/١٣ ل سلێمانیێ وەغەر کریە.

٣. سوبغەتوللا ئەمین حەسەن مزووری: ل سالا ١٩٢٦ ێ ل گوندێ باوان ل قەزا ئامێدیێ ژ دایکبوویە، زانستێن ئایینی ل مووسل خواندیە و گەلەك کار وەك فەرمانبەر کرینە، ل ٢٠٠١/١١/٢٩ ێ ل دهوکێ وەغەر کریە.

٤. ئەنوەر محەمەد تاهر سالا ١٩١٣ێ ل گوندێ مایێ- بەرواری ژووری ژ دایك بوویە، نڤیسەر و هوزانڤان و رۆژنامەڤان و مێژوناس بوویە، ل سالا ١٩٤٥ێ پەیوەندی ب بزاڤا بارزان ڤە کریە وچوویە د ناڤ ریزێن شورشا ١١ئەیلولا ١٩٦١ێ دا، ل ٢٢ خزیرانا سالا ١٩٦٣ێ شەهید بوویە.

٥. عزەت عەبدولعەزیز ئامێدی ل سالا ١٩١٢ێ ل ئامێدیێ ژ دایك بوویە، ل سالا ١٩٤٥ ێ ژ کولیژا سەربازی دەرچوویە، چوویە دناڤ بزاڤا بارزان و کۆمارا مهاباد دا و ل ١٩ خزیرانا سالا ١٩٤٧ ێ هاتییە سێدارەدان.

٦. بنێرە ژمارە (١٥) یا کو ل ١٨٩٩/٥/١٥ دەرکەتی .

٧. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : علی تتر توفیق ، الحیاة السیاسیة في کوردستان ١٩٠٨- ١٩٢٧ ، ترجمة عن الکردیة: تحسین ابراهیم الدوسکي (دهوك ، ٢٠٠٧) ص ٨٦-٩٤.

٨. بۆ پتر پێزانینان بنێرە، علی تتر توفیق، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨- ١٩٢٧ ، (هەولێر، ٢٠٠٢) بپ ٣٠٦- ٣٠٧.

٩. دار الکتب والوثائق (د.ك.و) ملف تشکیل دولە کوردیة ، تقریر الاستخبارات الخارجیة في ١٩٢٤/١٢/١١ ، رقم الوثیقة (٢٧).

١٠. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : عبدالفتاح علی البوتاني ، الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة ، دراسات ووثائق اربیل ٢٠٠٤ ، ص٤٣ ـ ٤٤ .

١١. بۆ پتر پێزانینان: عبدالمنعم الغلامي ـ ثورتنا في شمال العراق ( ١٩١٩ ـ ١٩٢٠) ج١ (بغداد) ١٩٦٦ ، ص ٢٥ ـ ٢٨

١٢. بنێرە پەرتووکا وی: مقدمات ونتائج (مخطوط) ج٢ ص ٢٥٧ ـ ٢٥٩

١٣. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: علی تتر توفیق، بزاڤا سیاسی ل کوردستانێ ١٩٠٨- ١٩٢٧ ، (هەولێر، ٢٠٠٢) بپ ٢٠٧-٢٠٩.

١٤. ل سلێمانیێ ل سالا ١٩٢٦ێ هاتییە دامەزراندن، ژ ئارمانجێن وێ خەبات ژبۆ مافێن نەتەوەیێن کوردی.

١٥. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : سروە اسعد صابر (الدکتورة) کوردستان الجنوبیة ١٩٢٦-١٩٣٩ دراسە تأریخیة – سیاسیة (السلیمانیة، ٢٠٠٦) ص ٣٤٥-٣٥٠ ؛ خلیل مصطفي عثمان الاتروشي – کوردستان الجنوبیة (العراق) في سنوات الاحتلال والانتداب البریطاني ١٩١٨ ـ ١٩٣٢ رسالة ماجستیر غیر منشورة ، قدمت الی مجلس کلیة الاداب جامعة دهوك ، ٢٠٠٥ ص٢١٧ ـ ٢٢١ ، عثمان علی (الدکتور) الکورد في الوثائق البریطانیة (اربیل ٢٠٠٨) ص٢٨٢ ـ ٢٨٩.

١٦. هەمان دوو ژێدەرێن بەرێ بپ٣٤٣ ـ ٣٤٥، بپ٢٢٢ ـ ٢٢٦

١٧. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : محمد ملا احمد ، جمعیة خویبون والعلاقات الکوردیة ـ الارمنیة (اربیل ٢٠٠٠)

١٨. وصفیة محمد شیخو. زاخو في العهد الملکي ١٩٢١ ـ ١٩٥٨ دراسة تأریخیة في اوضاعها العامة، رسالة ماجستیر غیر منشورة قدمت الی مجلس کلیة التربیة في جامعة زاخو ، ٢٠١٢ ، ص ٢٤٨

١٩. الاتروش ، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٢٢٩ ـ ٢٣١

٢٠. عبدالفتاح علي بوتاني : الحیاة الحزبیة في الموصل ١٩٢٦ ـ ١٩٥٨ / اربیل ٢٠٠٣ ص ٣١٤ ـ ٣١٥.

٢١. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : عبدالفتاح علي بوتاني ، صفحات من الذاکرة الموصلیة (دهوك ، ٢٠١٠) ص ٢٣٩ ـ ٢٤٣

٢٢. دناڤ دەستەکا دامەزرینەردا چوار خویندکارێن زاخۆ بوون ئەو ژی : صالح یوسفي و حوسنی حەجی رەشید و شەفیق سەعدوللا و حەمزە عەبدوللا: دوور ناهێتەدیتن یێ دووماهیێ سەرۆکاتیا کۆمەلێ کریت .

٢٣. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : عبدالفتاح علي بوتاني ، صفحات من الذاکرة ، ٢٠٠٠ بپ ٢٤٢- ٢٤٣

٢٤. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : هلبین محمد امین المزوري ، حزب هیوا (الامل) ١٩٣٩ ـ ١٩٤٦ (اربیل ـ ٢٠٠٣) ص ٥١ ـ ٦٨، عبدالستار طاهر شریف (الدکتور) ، الجمعیات والمنظمات والاحزاب الکوردیة في نصف قرن ١٩٠٨- ١٩٥٨، ط ٢ (السلیمانیة، ٢٠٠٧)

ص ١٣٩، ١٤٦ .
٢٥. بۆ زانینا جەڤەنگێ هەر رەنگەکی بنێرە : هلبين المزوري ص٦١ في نصف قرن ١٩٠٨ ـ ١٩٥٨ ، ط٢١ / السليمانية ٢٠٠٧ ص ١٣٩ ـ ١٤٦
٢٦. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : نوری شاويس من مذكراتي (لام ، ١٩٨٥) ص ٢٤
٢٧. هەمان ژێدەر ، بپ ٢٢ .
٢٨. بنێرە : مذكرات طه البامرني ، ص١٨٧ مخطوطة (ل نك کەس و کارێن وی یە) .
٢٩. هەمان ژێدەر ، بپ ١٨٤
٣٠. للتفاصيل ينظر : هلبين المزوري، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٧ ـ٨٢.
٣١. رجب جميل حبيب ، ئامێدیێ (العمادية) ١٩٢١ ـ ١٩٧٥ دراسة في التأريخ السياسي (دهوك ، ٢٠١٢) ص ١٢٥ ـ ١٢٦.
٣٢. هلبين المزوري، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٩ - ٨٠.
٣٣. طه البامرني ... المصدر السابق ص(١٨٨ ـ ١٨٩).
٣٤. طارق ابراهيم شريف ، شخصيات تتذكر، ط (اربيل ، ١٩٨٨) ، ص٦٥ ـ ٦٦.
٣٥. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : وصفية محمد شيخو ، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٢٥١-- ٢٥٣.
٣٦. عبدالفتاح علي اليوناني ، الحياة الحزبية ... ص ٣١٦ ـ ٣١٧.
٣٧. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : عبدالفتاح علي بوتاني ، الحياة الحزبية ، ص ٢١٦ ـ ٢٢١.
٣٨. طه البامرني : المصدر السابق ، ص ٢٠٤ - ٢٠٥.
٣٩. بۆ پتر پێزانینان ل سەر ناکۆکیان بنێرە : عبد الستار طاهر شريف ، المصدر السابق ، ص ١٤٧ ـ ١٥٧.
٤٠. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكوردية ، ثورة بارزان ١٩٤٣ ـ ١٩٤٥ ، (كوردستان ١٩٨٦) ص ٥٣ ـ ٦١.
٤١. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالستار طاهر شريف ـ ژێدەرێ بەرێ ص ١٨٧ ـ ١٨٩.
٤٢. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالفتاح على البوتانى، وثائق عن الحركة القومية الكردية التحررية، ملاحظات تأريخية ودراسات اولية (اربيل، ٢٠٠١)، ص ٣٩٩- ٤٠٦.
٤٣. رجب جميل ، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١٣٠ ؛ وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٢٥٥.
٤٤. وصفيه محمد شيخو ، ژێدەرێ بەرێ ، ص ٢٥٥
٤٥. هاتیيە ڤەگوهاستن ژ: جلال الطالباني ، كوردستان والحركة القومية الكردية ، ط٢ (بيروت ١٩٧١) ص ١٠٥.
٤٦. عبدالفتاح على بوتانى (الدكتور) موقف الاحزاب السياسية العراقية من القضية الكوردية ١٩٤٦ ـ ١٩٧٠ (دهوك ٢٠٠٧) ص ٥١ ـ ٥٢.
٤٧. بۆ پتر پێزانیان بنێرە، عبدالرزاق مطلك الفهد (الدكتور) الاحزاب السياسية في العراق ودورها في الحركة الوطنية والقومية ١٩٣٤- ١٩٥٨ ، (بيروت ، ٢٠١١) ص ٦٠-٦١.
٤٨. هلز عثمان ميرو ، دهوك ١٩٤٥ ـ ١٩٧٥ دراسة تأريخية ميدانية ، رسالة ماجستير غير منشورة قدمت الى مجلس كلية التربية جامعة زاخو ـ سنة ٢٠١١ ، ص ٨٩ ـ ٩٠.
٤٩. هەمان ژێدەر ، بپ ٩٠ ـ ٩١.
٥٠. رجب جميل ـ ژێدەرێ بەرێ ، ص ١٨٨ ـ ١٩٠.
٥١. هەمان ژێدەر ، بپ ١٩١- ١٩٨.
٥٢. هەمان ژێدەر ، بپ ١٩١- ١٩٨.
٥٣. جمبد شكرى ـ ئاکرێ (عقرة) في العهد الملكي (اربيل ، ٢٠٠٨) ص٢٠٨.
٥٤. وصفيه محەمەد شێخو ، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٢٦٣.
٥٥. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : عبدالفتاح على بوتانى (الدكتور) الحركة القومية الكوردية التحررية دراسات ووثائق (اربيل ٢٠٠٤) ص١١٣ ـ ١٢١.
٥٦. وصفيه محەمەد شێخو ، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٢٦٥.

٥٧. ل سالا ١٩٥٠ێ هاته دامەزراندن و كونگرێ خۆ یێ ئێكێ ل بەغدا ل سالا ١٩٥٤ێ گرێدا و ژ دیارترین ئارمانجێن وێ دەركەفتنا عیراقێ ژ هەڤپەیمانیێ بوو .

٥٨. وصفیه محەمەد شێخو ، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٢٧٢.

٥٩. بۆ زانیاریێن بەرفرەهتر بنێرە: صباح كنجي (( بدايات الفكر الماركسي بين الازديين في العراق))، مجلة الثقافة الجديدة، العددان (٣٥٠- ٣٥١)، بغداد...

٥٩. ل وێ دەمێ خسرو توفیق وەكی ژمێریار ل كومپانیەكا لوبنانی كو كارگەها شەكرێ ل مووسل دروست دكر كاردكر.

٦٠. پشتی فەرمانا گرتنا وێ ژ ئەگەرێ خۆنیشاداندێن نەرازیبوونێ ل سەر (العدوان الثلاثي) بۆ سەر مسرێ هاتیە دەركرن هاتە مووسل، لێ خسرو توفیق واستەكاری بو كر دا بێتە دامەزراندن وەكی ئەمینداری كۆگایێ ل كومپانیێ .

٦١. وەكی ئەندازیار ل رێڤبەریا كارێن مووسل كاردكر. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالفتاح عەلی بوتانی ، الحية الحزبية ...، ص ٣٣٣ ـ ٣٣٩.

(٦٢) بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالفتاح عەلی بوتانی ، الحياة الحزبية ...، ص ٣٣٣ ـ ٣٣٩.

٦٣. عبدالفتاح عەلی بوتانی وثائق عن .... ، بپ ٤٠٦ ـ ٤٠٧ ، جمبد شكري ، ژێدەری بەرێ بپ ٢١٠ ـ ٢١١.

٦٤. عبدالفتاح علی بوتانی وثائق عن .... بپ ٤٠٨ ـ ٤١٨.

٦٥. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : عبدالفتاح علي بوتاني ، الحركة القومية الكوردية التحررية دراسات و وثائق، اربيل (٢٠٠٤) بپ ١١٣ ـ ١٢٢.

٦٦. وصفیه محەمەد شیخو ، ژێدەرێ بەرێ بپ ٢٥٦ ـ ٢٦٠.

٦٧. عبدالفتاح علي بوتاني وثائق عن .... بپ ٣٨٦.

٦٨. هلز عثمان میرو ، ژێدەرێ بەرێ بپ ٨٠ ـ ٨١ .

٦٩. خودێ ژێ رازی مسعود سەعیدی گوت كو مەسعود بارزانی سەروكێ پارتی دیموكراتی كوردستان ئێك بوو ژ قوتابیێن وێ ل قوتابخانا نەپاخیێ ل وێ دەمێ .

٧٠. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : عبدالفتاح علي البوتاني وثائق عن .. بپ ٦٣٦ ـ ٦٤١.

٧١. رجب جمیل : ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١٩٩ ـ ٢٠٠.

٧٢. بۆ پتر پێزانینان بنێرە : هەمان ژێدەر، بپ ٢٠٠ ـ ٢٠١.

٧٣. عبدالفتاح علي البوتاني ـ وثائق عن ... بپ ٣٩٠ ـ ٣٩١.

٧٤. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالفتاح علي بوتاني ، الحياة الحزبية ... ، بپ ٢٧٠ ـ ٢٨٣.

٧٥. هەمان ژێدەر، بپ ٢٨٢- ٢٨٣.

٧٦. بۆ پتر روهنكرنا بنێرە : ايمان عبدالحميد الدباغ (دكتوراه) الاخوان المسلمون في العراق ١٩٥٣ ـ ١٩٧١ (عمان ٢٠١٣) بپ ٢١٨ ـ ٢٨٢ ، هەلز ئوسمان ، ژێدەرێ بەرێ بپ ٩٢ ـ ٩٣.

٧٧. ايمان الدباغ : ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨٣ ـ ٢٨٤ ، وصفیه محەمەد شێخو ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٨ ـ ٢٧٠.

٧٨. ايمان الدباغ : ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨١ ـ ٢٨٢.

٧٩. ايمان الدباغ : ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨١ ـ ٢٨٢.

٨٠. بو رونكرنا بنێرە: عبدالفتاح عەلي البوتاني ـ الحياة الحزبية ... بپ ٢٨٧ ـ ٢٩٢.

٨١. رجب جەمیل ـ ژێدەرێ بەرێ بپ ٢١٤ ـ ٢١٦.

٨٢. وصفیه محەمەد شێخو ، ژێدەرێ بەرێ بپ ٢٧٢ ـ ٢٧٣.

٨٣. سعد ناجی جواد (الدكتور)، العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨-١٩٧٠ (لندن، ١٩٧٠)، ص٢٧؛

٨٤. بو رونكرنا سەحكە : عبدالفتاح البوتاني ـ الحياة الحزبية .... بپ٢٢٣-٢٣٦؛ رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، ص٢١٢.

٨٥. بنێرە: بابەتێ لڤێن كۆمەلەیێن كوردی و عیراقی ل بادینان.

٨٦. بو رونكرنا بنێرە: عبدالفتاح البوتاني ـ الحياة الحزبية... بپ ٣٤١-٣٥٥.

# دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ

**رەجەب جەمیل رەجەب**
**ماستەر ب مێژوویا نوی و هەڤچەرخ**
**وەرگێران: موحسن عەبدولرەحمان**

پشتی زنجیرەکا رووداںان ل عیراقێ و ژ وان شۆرشا بیستێ (۳۰ خزیرانا ۱۹۲۰)ێ[١] بریتانیا قایلبوو و سیستەمێ ئینتیداب سەپاند[٢] و ب فەردیت هەموو عیراقییان د حوکمێ وەلاتیدا پشکدار بکەت، پشتی گەهشتنا برسی کوکس وەکو ئێکەم هنارتیێ (مەندوبێ سامی) یێ بریتانی بۆ عیراقێ ل١١چریا ئێکێ ١٩٢٠ێ، دگەل هندەك کەساتیێن عیراقی و کارمەندێن کارگێریا بریتانی ژبۆ پێکئینانا حوکمەتەکا عیراقی یا بەروەخت راوێژکر، پشتی ڤێ راوێژکاریێ کوکس شیا (عەبدلرەحمان ئەلنقیب ئەلگەیلانی) بۆ پێکئینانا وەزارەتا نەقیبی یا ئێکێ (چریا ئێکێ١٩٢٠- تەباخا ١٩٢١)ێ قایلبکەت، ئەوا ژ سەرۆك و هەشت وەزیران پێکدهات، پاشی دوازدە وەزیرێن بێ وەزارەت لێ زێدەکرن[٣].

بریتانیا گرنگی ب بابەتێ کانێ کی وەك شاهـ دێ حوکمی ل عیراقێ کەت دا، و ناڤێ میر فەیسەلێ هەڤپەیمانێ بریتانیا د شەرێ جیهانیێ ئێکێ دا ئەوێ تەختێ خۆیێ شاهینیێ ل سوریا ژ دەستدای ژ دیارترین بەرێزترێن ڤی پۆستەی بوو، بریتانیا ئەڤ مژارە ل کۆنگرێ قاهیرە ل ئادارا ١٩٢١ێ ئێك لا کر[٤] پشتی کاندیدکرنا وی بۆ شاهاتییا عیراقێ پەسەند کری، ب مەرجێ حوکمەتەکا دەستووری پەرلەمانی یا پێگیر ب قانوونێ بیت[٥].

کوکسی ڤیا راپرسییەکا رویمەتی بکەت دا رادێ گۆنجاندنا ڤێ بریارێ دگەل داخوازیێن عیراقییان بزانیت[٦] و رەنگە شەرعییەتەکێ بدەتە حوکمێ فەیسەلی[٧] و حوکمەتا عیراقی د روونشتنا جڤاتا وەزیراندا ل ١١ تیرمەها ١٩٢١ێ ل دووڤ راسپاردنا مەندوبێ بریتانی کورد ئازادکرن د پشکداریا راپرسیێ دا و بریار دا "... چنکو حوکمەتا بریتانیا ل دووڤ بەندێن پەیمانا سیڤەر[٨] رێکێ ددەت دەڤەرێن کوردی پشکداربن د هەلبژارتناندا یان نە، جڤاتا وەزیران ژی

دبینیت کو وان دەڤەران ئازادییەکا تمام د پشکداریێ یان نەپشکداریێدا ل دووڤ پەیمانا ناڤبری هەبیت و پشکداری و نەپشکداریا کوردان د پاشەرۆژێ دا نەبیتە بەهانە ل سەر وان و حوکمەتا عیراقی حەزدکەت ئەو دەڤەر پشکداریێ دگەلدا بکەن و حەزدکەت ژ پێکهاتا شاهنشینیا عیراقێ ڤەنەبن..."[9].

ئەنجامێن هەلبژارتنان بۆ بەرێزبرکرنا میر فەیسەلی وەکو شاهـ ل سەر عیراقێ رازیبوونا ٩٦٪ێ بوو، دگەل نەپشکداریا خەلکێ سلێمانیێ و رەواندزێ د راپرسیێدا و ل کەرکووکێ دژی بەرێزبریا وی دەنگدان، و خەلکێ هەولێرێ د بەرژەوەندا وی دا دەنگدان ل گەل دابینکرنا مافێن کوردان[10]. هندی پەیوەندی ب قەزایێن کوردی ڤێن سەر ب لیوا مووسلێ ڤە ( ئامێدی، زاخۆ، ئاکرێ، دهۆک) هەی ژبۆ دەنگدانێ هندەك مەرج دانان ژ وان دانپێدان ب زمانێ کوردی وەك زمانێ فەرمی د فێرکرن و دادگەهـ و کارگێرێدا، دگەل دابینکرنا مافێ کوردان ل باشوورێ کوردستانێ بۆ یەککرتنێ دگەل باکوورێ کوردستانێ هەر دەمێ سەربەخۆ بوو ل دووڤ پەیمانا سیڤەر و بەردەوامیا ئینتیدابا بریتانی و پاراستنا مافێن وان یێن سڤیل و سیاسی[11].

لێ هەلویستێ خەلکێ وان قەزا (قەزایان) یێ پشتەڤان بوو بۆ میر فەیسەلی ل دووڤ راپۆرتا نهێنی یا کومەلا (العهد)[12] ل ١٩ تیرمەها ١٩٢١ێ پێشکێشی شاه فەیسەلی کری، تێدا هاتییە کو راوێژکارێ وەزارەتا ناڤخۆ (فیلبی) فایلەك بدەستڤە ئینایە ژ جڤاتا رێڤەبەریا دهۆکێ کو چوار بەند تێدانە ژ وان: دهۆك ببیتە لیوایەك و قەزاێن زاخۆ، ئاکرێ و ئامێدیێ پێڤە دگرێدای بن و ئەو ب سەر مووسلێ ڤە بیت. راپۆرتێ ئاماژەکرە قەزا زاخۆ و دیارکر کو راوێژکارێ لیوا مووسلێ چوویە زاخۆ و گۆتییە سەرۆکێ باژێرڤانییا وێ محەمەد ئاغا شەمدین کو پەیوەندیێ ب سەرۆکێن کوردان بکەت، ژبو داخوازکرنا سەربەخۆییێ، راپۆرت دیاردکەت کو خەلکێ دەڤەرێ پشتەڤانێن بەرێزبرکرنا شاهـ فەیسەلی نەبوون، هەروەسا راپۆرتێ ئاماژەکرییە شێخ نوری بریفکانی کو تشتەکێ وەسا ل دهۆکێ کرییە، لێ پسمامێ وی رێك لێ گرتییە. و د راپۆرتێدا هاتییە کو خەلکێ ئاکرێ ئالیگرێن حوکمەتا عەرەبینە، دەربارێ دەڤەرا زێبار راپۆرتێ دیارکرییە کو دەرڤەی دەستەلاتا داگیرکرنێ یە، بەلێ لێکتێکەهشتنەك د ناڤبەرا سەرکردێ لەشکرێ ترکی ل ئامەدێ و فارس ئاغایێ زێباری حاکمێ راستەقینەیێ دەڤەرێ دا هەیە[13]. راپۆرت دیاردکەت کو خەلکێ باژێرێ ئاکری یێ خەلکێ دەڤەرێن دی یێن سەر ب قەزایێ ڤە پشکداری د راپرسیێدا کرییە و د بەرژەوەندا هەلبژارتنا شاهـ فەیسەلی دا دەنگدایە[14].

د راپۆرتێ دا پشتەڤانییا خەلکێ ئامێدیێ بۆ بەرێزبرکرنا شاهـ فەیسەلی هاتییە، و ئەڤە دەڤێ وێ یە" نها حاکمێ دەڤەرێ عەبدوللەتیفێ لایەنگرێ ئیگلیزی یە، لێ دەستەلاتا راستەقینە یا دەڤەرێ ددەست شێخێن نەقشەبەندی دایە (شێخ



شاهـ فەیسەلێ ئێکێ

بەهائەددینێ نەقشەبەندی) و رەشید بەگێ بەرواری، و ئاماژەکرییە کو راوێژکارێ لیوایێ (کولونێل نولدر) ژ ئامێدیێ دۆسیێەکا کولونیالیزمێ ( پشتەڤانکرنا کولونیالیزمێ- مؤیدة للأستعمار ) دەستڤەئینایە، و هندەك داکۆکیێ دکەن کو دەمێ چوویە ئامێدیێ دو سندۆقێن دەرهەمان ل سەر لایەنگران بەلاڤکرنە[١٥].

ب چاڤنوقاندن ژ راستی و نەراستیا ڤێ راپۆرتێ، دیارە ماقوولێن ئامێدیێ سەرباری بۆچوونێن وان یێن جودا و ب هەر شێوەی بیت ژ لایەنگرێن میر فەیسەلی بوون، وی سەردەمی حاکمێ ئامێدیێ حەجی عەبدوللەتیف عەبدولعەزیز ئاغایێ ئامێدی ژ لایەنگرێن ئینگلیزی بوو، و ژبەر پشتەڤانیا وی بۆ ئینگلیزی ل دەمێ سەرهلدانا بادینان ١٩١٩ێ وەك پاداشت بۆ وی ب حاکمێ ئامێدیێ هاتییە دانان[١٦].

دوور ناهێتەدیتن کو وی پشتەڤانیا میر فەیسەلی کربیت، چنکو میر بەربژێرێ ئینگلیزی بوو، لێ سەرۆك هۆز و ماقوولێن دەڤەرێ وەکو رەشید بەگێ بەرواری، شێخ بەهائەددینێ نەقشەبەندی، تاهرێ هەمزانی، عەبدلوەهاب رێکانی، محەمەد سالح یەحیا ژ مەزنێن بەرواری ژێریا و حەجی خەلیل ژ بازرگانێن ئامیدیێ و هندەکێن دی[١٧]، ئەوان میر فەیسەل بۆ کونگرێ ئاشتیێ ل پاریس سالا ١٩١٩ێ بەربژێرکربوو، و دیارە هاندەرێ دینی ئەڤ سەرۆکە بۆ بەربژێرکرنا میر فەیسەلی هاندایبە، چنکو ئەو ژ مالباتەك دینی و رەڤشتا هاشمییانە، سەرباری کو ئەو ل سالا ١٩١٩ێ هەر ژبەر هۆکارێ دینی ل دژی ئینگلیزی راوەستیابوون، چنکو وان دەولەتا ئینگلیزی نە مووسلمان هژمارتییە و شەرێ وێ ب ئەرك زانییە.

د ئاهەنگەکا تایبەتدا کو ب ڤێ هەلکەتێ هاتبوو گێران[١٨] و ب بەرهەڤبوونا کەساتیێن نوونەراتییا لیوایێن عیراقێ دکر[١٩] ئەوێن پشکداری د دەنگدانێ دا کری، ل ٢٣ێ تەباخا ١٩٢١ێ فەیسەل وەك شاهێ (مەلکێ) عیراقێ هاتە دانان[٢٠]. و وەزارەتا ناڤخۆ ٢٥ کەسایەتی ژ لیوا مووسل داخوازکرنە رێورەسمێن چوونە سەر تەختا شاهی ل بەغدا، ژ وان شێخ نوری بریفکانی وەکو نوونەرێ سەرۆك عەشیرەتێن دهۆك، کو دهێتە ئالیسەنکرن ئەو نوونەرێ هەردو قەزایێن دهۆك و ئامێدیێ بیت، چنکو عەشیرەتێن دەڤەرێ وەکو هۆزا دۆسکی دکەڤتە ناڤ سنورێ کارگێریێ هەردو قەزاندا، و محەمەد ئاغا شەمدین سەرۆکێ باژێرڤانیا زاخۆ، قادر ئاغایێ زێباری ژ ئاکرێ، سەعید بەگ میرێ ئێزدییان و عەزیز ئاغا ژ پێشابورێ زێدە باری هندەك ماقوولێن دی یێن کوردان[٢١] ئەوێن رۆژنامەیا (العراق) ب مەزنێن کوردان ناڤکرین[٢٢].

هەروەسان ل باژێرێ دهۆکێ بهەلکەفتا چوونە سەر تەختا شاهی ئاهەنگەك ژ ئالیێ کارگێریا ناڤخۆییڤە هاتەگێران، دروژنامەیا (الموصل) دا هاتییە" رۆژا سێشەمبی ٢٢ی تەباخا ١٩٢١ێ ئاهەنگەکا هێژا ب هەلکەفتا چوونە سەر تەختا شاهی هاتەگێران و گۆتار ب بەرهەڤبوونا قازی و ژمێریارێ قەزایێ هاتە پێشکێشکرن و ئالایێن عەرەبی هاتنە بلندکرن و ل داوییا ئاهەنگێ دوعا بۆ شاهی و حوکمەتا بریتانیا مەزن هاتنەکرن و خانی و بازار هاتنە خەملاندن و فەرمانگەهـ و مزگەفت و پەرستگەهێن دینی ب ئالا و رۆناهییان هاتنە جوانکرن"[٢٣] پشتی راگەهاندنا ئەنجامێن راپرسیێ مەندوبێ بریتانی داکۆکی ل شاهـ فەیسەلی کرییە، کو پشکداریا قەزایێن کوردی ل لیوا مووسل (ئاکرێ، ئامێدیێ، زاخۆ، دهۆك، شنگال) و لیوا هەولێر رامانا دەستبەردانا وان ژ مافێن وان یێن د پەیمانا سیڤەر دا هاتین ناگەهینیت[٢٤].

ل ئێکی چریا ئێکێ سالا ١٩٢١ێ شاهـ فەیسەلێ ئێکێ گەهشتە مووسلێ و مووسلییان ب کەیفخۆشی پێشوازی لێکر و شاندێن دەڤەرێن کوردی ژی بۆ بخێرهاتنێ هاتبوون ژ وان: شاندێ ئاکرێ ، تەلەعفر، شنگال و دهۆکێ و شاندێ دهۆك ژ شێخ نوری بریفکانی و مفتیێ باژێری و قەشە یوسف بەهرو پێکدهات[٢٥].

دەڤەرا دهۆکێ ژ روودانێن سیاسیێن عیراقێ یا دوور نەبوو، ب تایبەت مژارا پێکئینانا جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقی و وەکو هەر دەڤەرەکا دی یا کوردی یا سەر ب

ویلاتەتا مووسلڤە پشکداری د وان هەلبژارتناندا یێن جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقێ پێکئینای کر[٢٦].

حوکمەتا عیراقێ رۆژا ٢٤ێ چریا ئێکێ ١٩٢٢ێ وەکو ژڤانێ هەلبژارتنا جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقێ دەستنیشانکر[٢٧]، ل پتریبا عیراقێ دەرچوونا بڕیارێ تووشی بەرهنگاریەك دژواربوو، بتایبەت پشتی زانایێن دینی یێن شیعە فەتوا ب حەرامکرنا پشکداریێ د هەلبژارتنان دا دەرئێخستی[٢٨].

ل دەستپێکێ دەستەلاتا بریتانی دزانی کو پشکداریا کوردان د هەلبژارتناندا دێ یا لاوازبیت، لەورا بەرپرسێن بریتانی سیاسەتا نەرمی و خاپاندنێ ژبۆ قایلکرنا کوردان کو پشکداری هەلبژارتنان بن بکارئینا، و وەزیرێ کۆلۆنییێن (المستعمرات)بریتانی چرچلی خۆیاکر: مە نەڤێت کوردان نەچاربکەین ل ژێر دەستەلاتا حوکمێ فەیسەلی بن و ئەو ئازادن د پشکداریێ د وان هەلبژارتناندا یێن بریارە ل دەمەکێ نێزیك بێنەکرن، و حوکمەتا بریتانی ڤەکۆلینێ ل سەر حەزا کوردان بۆ بجهئینانا ئوتونومی[٢٩] دکەت، جارەکادی دەستەلاتێ حەزا خۆبۆپشکداریکرنا کوردێن دەڤەرێن (ئامێدیێ، ئاکرێ، دهۆك، زاخۆ) د هەلبژارتنێن داهاتی دا دیارکر دگەل دابینکرنا هندەك گرەنتییان بۆ وان[٣٠]، ژ وان: نەدامەزراندنا هیچ فەرمانبەرەکێ عەرەب ل وان دەڤەران ژبلی تایبەتمەندێن تەکنیکی، نە ناچارکرنا خەلکی کو زمانێ عەرەبی د کاروبارێن فەرمی دا بکاربینن، دگەل پاراستنا مافێن کێماتیێن دینی ل دەڤەرێن کوردی[٣١].

دەمێ قۆناغا ئێکێ ژ هەلبژارتنان د دەمێ دەسنیشانکری دا دەستپێکری، ژ گەلەك هۆکاران دیاربوو کو بەردەوامیدان ب هەلبژارتنان یا ب زەحمەتە، ل پێشییا وان هۆکارن کێشەیا کوردی یە، زێدەباری فەتوایێن دینی و ترس ژ عەسکەریبا ب خۆرتی و کێمیا نوونەراتییا عەشیرەتان د جڤاتێدا، هەروەسا حوکمەتا بریتانی و عیراقی نەدڤیا بەردەوامیێ ب پرۆسەیا هەلبژارتنان بدەن، ژبەر داخوازکرنا ترکی ب ویلایەتا مووسل پشتی کو کونگرێ لوزان ل ٢٠ چریا ئێکێ ١٩٢٢ێ دەست بکاربووی، ب رێکا راپرسییەکا ناڤخۆیی و گرنگیدانا رایا گشتی ب کێشەیا مووسل[٣٢] پشتی ڤەگوهاستنا وێ بۆ کۆما مللەتان (عصبة الأمم)[٣٣].

دەمێ ل تیرمەها ١٩٢٣ێ[٣٤] قۆناغا دووێ ژ هەلبژارتنان دەستپێکری، قەزایێن کوردیێن لیوا مووسل پشکداری هەلبژارتنان بوون، لێ پرۆسە وەك پێدڤی ب رێڤەنەچوو، چنکو خەلکی ناڤێن دەنگدەرێن دەسپێکی نەددان، ژبەر مەسەلا سەرخۆبوونا کوردستانێ راگەهاندنا شێخ مەحموودی کو خۆ وەك شاهێ (مەلکێ) کوردستانی راگەهاندی[٣٥] و ترس ژ عەسکەریبا ب خۆرتی[٣٦] وەکو ڤەکۆلەرەکی پشتگەرم ب راپۆرتا پشکێنەرێ کارگێریێ مووسلێ ئاماژەپێکری، بەلێ دەنگدەرێن قەزایێن ئامێدیێ و دهۆکێ ژ لایەنگرێن کەساتیێ مووسلێ یێ بەرنیاس مستەفا سابۆنچی ئێك ژ جەمسەرێن پارتا نیشتمانییا عیراقی بوون[٣٧].

یاگرنگ د بابەتی دا ئەوە قەزایێن کوردیێن سەر ب لیوا مووسلڤە پشکداری دڤان هەلبژارتنان دا کر، یێن ل سەر بنەمایێ تەخمینکرنێ[٣٨] ب ئامادەبوونا سەرۆك هۆز و موختارێن گۆند و تاخان هاتینەکرن، داکو رەنگە شەرعیبەتەکێ بێی بەرهەڤبوونا دەنگدەران ب دەنێ[٣٩].

ل دووڤ داخوازیا شاهی ل رۆژا ٢٧ێ ئادارا ١٩٢٤ێ جڤاتا دامەزرێنەر (المجلس التأسيسي) روونشتنا خۆ یا ئێکێ گرێدا، تێدا شاهێ عیراقێ گۆتارا شاهینی (عەرشی) پێشکێشکر و داکوکی ل سەر مەسەلێن گەوهەری یێن جڤاتێ کرن ئەوژی: پێداچوون ب پەیمانا بریتانی- عیراقی یا سالا ١٩٢٢ێ[٤٠]، دانانا دەستوورێ عیراقی، دانانا قانوونا جڤاتا نوونەران[٤١]، و عەبدولمحسن سەعدون وەکو سەرۆکێ جڤاتێ هاتە هەلبژارتن[٤٢]، ئەوا ژ سەد نوونەران پێکدهات و چوارده ژ وان نوونەرێن مووسل بوون، و محەمەد رەشید تەتەرخان بەگێ بەرواری نوونەراتییا ئامێدیێ و محەمەد ئاغا شەمدین نوونەراتییا دەڤەرا زاخۆ دکر[٤٣].

جڤاتا دامەزرێنەر تاکو دەرکەتنا بڕیارا شاهی

ل ٣ێ تەباخا ١٩٢٤ێ ب هەلوەشاندنا وێ کارێ خۆ کر، د ماددێ ٢٤ ژ قانوونا بنکەهین هاتییە کو دەستەلاتا تەشریعی گرێدای جڤاتا گەلە (مجلس الامة) ل گەل شاهی، و جڤاتا گەل پێکهاتییە ژ جڤاتا ماقوولان (مجلس الأعیان)[٤٤] و جڤاتا نوونەران (مجلس النواب)[٤٥]، چنکو جڤاتا نوونەران پێدڤییە ژ ئالیێ مللەتیڤە بێتە هەلبژارتن، حوکمەتا عیراقێ ل چریا دووێ ١٩٢٤ێ بریارا هەلبژارتنەکا گشتی بۆ هەلبژارتنا ئەندامێن جڤاتا نوونەران دا، هەلبژارتن ل ١٨ ێ تیرمەها ١٩٢٥ێ هاتنە کرن و حۆکمەتێ ژبۆ پشتەڤانیکرنا بەربژێرێن خۆ ل هەموو عیراقێ و ژ وان ژی دەڤەرێن کوردی مایتێکرن کر[٤١].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. بۆ پتر پێزانینان ل سەر شۆرشا بیستێ بنێرە: عبدالرزاق الحسنی، الثورة العراقیة الکبری، (بیروت-١٩٨٢)، ط ٥ .

٢. ل دووف کۆنگرەیێ سانریمۆ ئەوێ ل ٢٤نیسانا ١٩٢٠ێ هاتییەگرێدان سیستەمێ ئینتیدابێ ل سەر عیراقێ هاتەسەپاندن، بنێرە: أ.م.منتشاشفیلی، العراق فی سنوات الانتداب البریطانی، ترجمة : الدکتور هاشم صالح التکریتي، (بغداد- ١٩٧٨)، ص ١٦١ .

٣. عبدالرحمن البزاز، العراق من احتلال حتی استقلال، دار البراق، (لندن- ١٩٩٧)، ط ٤، ص ص٩٦- ٩٧.

٤. ب سەرۆکاتیيا وەزیرێ میتینەگەهێن (کولۆنیالیێن) بریتانی وینیستون چرچل هاتەبەستن، شاندێ عیراقی د کۆنگرەی دا پێکهاتی بوو ژ مەندوبێ سامیێ بریتانی و مسز بیل سکرتێرا رۆژهەلاتی یا (دار الاعتماد البریطانی) ل بەغدا و سەرکردێ گشتیێ هێزێن بریتانی ل عیراقێ و راوێژکارێن وەزارەتێن دارایی، بەرگری و کار و گەهاندنێ د حوکمەتا عیراقی یا بەرووەخت دا، هەروەسا دو وەزیرێن عیراقی تنێ وەکو چاڤدێر دگەلدا بوون، ئەوژی جەعفەر عەسکەری وەزیرێ بەرگریێ و ساسون حەسقیل وەزیرێ دارایی.بنێرە: عثمان علی (الدکتور)، دراسات في تأریخ الحرکة الکردیة المعاصرة، ١٨٣٣- ١٩٤٦ دراسة تأریخیة وثائقیة، (اربیل- ٢٠٠٣)، ص ص٣٧٥- ٣٨٥.

٥. جریدة لسان العرب ، العدد ١٧ في ١٩٢١/٧/١٥

٦. سفانة هزاع اسماعیل محمود الطائي، الموصل في سنوات الانتداب البریطاني ١٩٢٠-١٩٣٢، رسالة ماجستیر غیر منشورة مقدمة الی کلیة الاداب بجامعة الموصل، ٢٠٠٢، ص ٢٢.

٧. خلیل مصطفی عثمان الاتروشي، کوردستان الجنوبیة(العراق) في سنوات الاحتلال و الانتداب البریطاني ١٩١٨- ١٩٣٢، رسالة ماجستیر غیر منشورة مقدمة الی مجلس کلیة الاداب بجامعة دهوك، ٢٠٠٥، ص ٣٧.

٨. پەیمان ل ١٠ تەباخا ١٩٢٠ێ د ناڤبەرا هەڤپەیمان و دەولەتا ئوسمانی دا هاتەگرێدان، سێ بەندێن وێ (٦٢، ٦٣، ٦٤) گرێدای دۆزا کوردی بوون، تێدا هات کو د ماوەیێ شەش هەیڤان دا لیژنەك ژ نوونەرێن بریتانیا و فرەنسا و ئیتالیا پێکبهێنت ژبۆ پێشکێشکرنا پلانەکێ بۆ ئۆتونومیێ بۆ دەڤەرێن پتریا کورد و، ئەگەر کوردان داخوازا سەرخۆبوونێ دماوەیێ سالەکێ دا ژ بجهئینانا پلانێ کر، پێدڤیە دەولەتا ئوسمانی ل سەر داخوازێ رازی ببیت و، کوردێن ویلایەتا مووسلێ ماف هەیە بگەهنە وێ دەولەتێ. بنێرە: سروه اسعد صابر، کردستان من بدایة الحرب العالمیة الاولی الی نهایة مشکلة الموصل ١٩١٤- ١٩٢٦، دراسة تأریخیة سیاسیة وثائقیة، (اربیل- ٢٠٠١)، ص ص ١٤٢- ١٤٤.

٩. جریدة لسان العرب، العدد ١٧ في ١٩٢١/٧/١٥؛ ابراهیم خلیل احمد، ولایة الموصل دراسة في تطوراتها السیاسیة ١٩٠٨-١٩٢٢، رسالة ماجستیر غیر منشورة مقدمة الی مجلس کلیة الاداب بجامعة بغداد ، کانون الثاني ١٩٧٥، ص ٤٤٦؛ عزیز الحاج (الدکتور)، القضیة الکوردیة في العشرینات، (بغداد- ١٩٨٥)، ص ٤٢.

١٠. غانم محمد الحفو (الدکتور) و عبدالفتاح علي البوتاني(الدکتور)، الکورد و الاحداث الوطنیة في العراق خلال العهد الملکي ١٩٢١- ١٩٥٨، دار سبیریز للطباعة و النشر،(اربیل- ٢٠٠٥)،ص ١٩.

١١. کمال مظهر احمد (الدکتور)، کرکوك و توابعها دراسة وثائقیة في القضیة الکوردیة في العراق، (اربیل- ب.ت)، ج١،ص ١٤٠؛ ابراهیم خلیل احمد، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٥٠.

١٢. کۆمەلا (العهد) یا عەرەبی ل داویا سالا ١٩١٣ێ ژبۆ داخوازکرنا سەرخۆبوونا عەرەبان ل ستانبولێ سەر دەستێ (عزیز علي

المصري) هاته دامەزراندن. ل ئادارا ١٩١٩ێ تێکەلی کومەلا (جمعیة العلم العربیة) بوو، بوو دو پشك (عهد) یا سوری و (عهد) یا عراقی ب سەرۆکاتیا یاسین ئەلهاشمی ل حەلەبێ. بنێرە : ثورتنا في شمال العراق ١٣٣٧- ١٣٣٨( ١٩١٩-١٩٢٠م)، (بغداد- ١٩٦٦)،ج١، ص١٩-٢٠

١٣. ابراهیم خلیل احمد، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٥٥- ٤٥٦.

١٤. جمبد شکری، ئاکری(عقرة) في العهد الملكي(اربیل-٢٠٠٨)، ص ١٧٦.

١٥. هاتییەوەرگرتن ژ ابراهیم خلیل احمد، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٥٦.

١٦. بۆ پتر پیزانینان ل سەر بزاڤێن بادینان بنێرە، عبدالمنعم الغلامي، ژێدەرێ بەرێ..

١٧. رجب جمیل حبیب ، ئامێدی(العمادیة) ١٩٢١-١٩٧٥ دراسة في التأریخ السیاسي، (دهوك- ٢٠١٢)، ص ص ٣٥- ٣٦ . ناڤێ حەجی شەعبان ئاغای هەڤپێچی وواژوکەرێن ل سەر بەربژێرکرنا شاهـ فەیسەلی نەبوو، چنکو ئەو پشتی روودانێن ١٩١٩ێ ژ ئامێدیێ دەرکەتبوو و چوو بوو ترکیا بۆ زانین ئەو ژ واژوکەرێن داخوازنامەیا بەربژێرکرنا فەیسەلی بوو، بۆ کۆنگرێ ئاشتیێ ل پاریس.

١٨. جریدة الموصل، العدد ٤١٢ في ١٩٢١/٨/٢٢؛ عبدالرزاق الحسني، ژێدەرێ بەرێ...چاپا ٥، بپ٣٧٧.

١٩. پشتی پێکئینانا حوکمەتا عیراقی یا بەرەوەخت، دەستەلاتداریا بریتانی ب راوێژ دگەل حوکمەتا عیراقێ یا بەرەوەخت سیستەمەکێ نوو یێ کارگێری بۆ عیراقێ دانا ئەو ژی ب لێکڤەکرنا وێ بۆ ١٠ لیوا و ٣٤ قەزا و ٨٤ ناحیان. بنێرە: ذنون الطائي(الدکتور)، الاوضاع الاداریة في الموصل خلال العهد الملكي ١٩٢١- ١٩٥٧، (الموصل- ٢٠٠٨)، ص ١٣١.

٢٠. عبدالرزاق الحسني، ژێدەرێ بەرێ، چاپا ٥،بپ ٣٧٧.

٢١. بۆ زانینا ناڤێن وان بنێرە: جریدة العراق، العدد ٣٧٩ في ١٩٢١/٨/٢٣؛ جریدة الموصل،العدد٤١٢ في ١٩٢١/٨/٢٢.

٢٢. جریده العراق، العدد ٣٨٦ في ١٩٢١/٨/٣٠.

٢٣. جریده العراق، العدد ٤١٧، في ١٩٢١/٩/٢

٢٤. عزیز الحاج (الدکتور)، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٤٤.

٢٥. جریده العراق، العدد ٤٢٩ في ١٩٢١/١٠/٢٠.

٢٦. ژ ئەرکێن جڤاتا دامەزرینەر: دانانا دەستووری و باوەریدان ل سەر پەیمانا عیراقی بریتانی یا سالا ١٩٢٢ێ و دارشتنا قانوونا هەلبژارتنێن جڤاتا نوونەران. بنێرە: محمد مظفر الادهمي، المجلس التأسیسي العراقي دراسة تأریخیة سیاسیة،(بغداد- ١٩٧٦)،ص٢٦٧؛فاروق صالح العمر، المعاهدات العراقیة البریطانیة و أثرها على السیاسة الداخلیة١٩٢٢- ١٩٤٨،(العراق- ١٩٧٧)،ص٩٢. هەژی ئاماژەپێدانێ یە کو پەیمانا د ناڤبەرا عیراق و بریتانیا دا ل دەمی چریا ئێکێ ١٩٢٢ێ هاتەگرێدان دا جهێ ئینتیدابێ بگریتن کو ژ لایێ ئەندامێن جڤاتا دامەزرینەر یا پاشەرۆژێ باوەری ل سەر بێتەدان و، عەرەبان ل لیوا مووسل رەتکر، د دەمەکیدا هەلویستێ کوردان یێ پشتەڤان بوو بۆ ئینتیدابێ بۆ ماوەکێ درێژتر، چنکو پتر زەمانەتا مافێ کوردان دکر: بنێرە: فاروق صالح العمر، هەمان ژێدەر، بپ ٤٢.

٢٧. محمد مظفر الادهمي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٧.

٢٨. غانم محمد الحفو (الدکتور) و عبدالفتاح علي البوتاني (الدکتور)، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٢٠.

٢٩. هەمان ژێدەر، بپ ٢١.

٣٠. محمد مظفر الادهمي، ژێدەرێ بەرێ،، ص ٢٩٨؛ جمبد شکری، ژێدەرێ بەرێ،، ص ١٨٠.

٣١. شاکرو خدو محوی، المسألة الکوردیة في العراق المعاصر، ترجمة: الدکتور عبدی حاجی، مؤسسة سبیریز للطباعة و النشر، (دهوك- ٢٠٠٨)، ص ٥٣.

٣٢. پاشتر دێ ل سەر ئاخڤین .

٣٣. غانم محمد الحفو (الدکتور) و عبدالفتاح علي البوتاني (الدکتور)، ژێدەرێ بەرێ،، ص ٢١.

٣٤. عبدالامیر هادي العکام (الدکتور)، الحرکة الوطنیة في العراق ١٩٢١- ١٩٣٣م، (النجف الاشرف- ١٩٧٠)، ص ١٣٠.

٣٥. شێخ مەحموودێ بەرزنجی سالا ١٨٨١ێ بوویە، پشتی داگیرکرنا ئینگلیزی بۆ کەرکۆکێ وەك حوکمدارێ سلێمانیێ هاتییەدامەزراندن ژ ئەنجامێ تێکچوونا پەیوەندیێن وی دگەل ئینگلیزی، ل سالا ١٩١٩ێ د شەرێ ناڤدارێ دەربەندی بازیاندا هاتە دیلکرن و دوورئێخستن بۆ دەرڤەی عیراقێ، ل ئیلولا ١٩٢٢ێ ڤەگەریاڤە سولێمانیێ دوبارە وەك حوکمدار هاتەڤەدامەزراندن، لێ وی دڤیا خۆ وەکو شاهـ ل سەر کوردستانێ رابگەهینیت، ئەڤە بوو ئەگەرێ هندێ پەیوەندیێن وی دگەل ئینگلیزی تێکبچن، پاشی چەندین شەر دژی هێزێن بریتانی و عیراقی کرن. سالا ١٩٥٦ێ ل بەغدا مرییە و ل

سولێمانیێ هاته ڤەشارتن. بنێرە: محمد علي الصويركي(الدكتور)، معجم اعلام الكورد في التأريخ الأسلامي و العصر الحديث في كوردستان و خارجها، مؤسسة ژين (السليمانية- ٢٠٠٦)، ص ص٦٩٨- ٧٠٠.بۆ پتر پێزانینان ل سەر بزاڤێن شێخ مەحموودی بنێرە : عبدالرحمن ادريس صالح البياتي، الشيخ محمود الحفيد البرزنجي و النفوذ البريطاني في كوردستان العراق حتى عام ١٩٢٥.(السليمانيه-٢٠٠٧).

٣٦. محمد مظفر الادهمي، ژێدەرێ بەرێ، ص ص ٣٠٠- ٣٠١ .

٣٧. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٣٤، (الحزب الوطني العراقي) ل ٢ تەباخا ١٩٢٢ێ ب سەرۆكاتییا سیاسەتمەدار محەمەد جەعفەر ئەبو تەمن هاتییەدامەزراندن و بەرهەلستكارا سیاسەتا بریتانی بوو،

پاراستنا سەربەخۆییا عیراقێ و یەكێتیا وێ ژ ئارمانجێن ڤێ حزبێ بوو. بنێرە: حسن ڤافا، عیراق لێكولینەوەیەكە لە مێژووە سیاسیەكەی( پارت و رێكخستنەكان لە ١٩٠٨- ٢٠٠٨)، وەرگێران، ئامانج نعمەت، (سلیمانی- ٢٠٠٩)، ل ل ٣٦- ٣٧.

٣٨. ئەڤە رێكە سەرێ و بلەز بوو، چ رەنگێن هووربینیێ تێدا نەبوون، دەربرین ژ لەزێ و كارێ رویمەتی دكر، بنێرە: غانم محمد الحفو (الدكتور) و عبالفتاح علي البوتاني (الدكتور) ژێدەرێ بەرێ، ص ٢٢.

٣٩. غانم محمد الحفو (الدكتور) و عبالفتاح علي البوتاني (الدكتور) ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢

٤٠. هەژیە بێژین د دەمێ گەنگەشەكرنا جڤاتا دامەزرینەر ل دۆر پەیمانێ حەجی رەشید بەگێ بەرواری داخوازكربوو ب ئێكجاری بێتە رەتكرن، دەمێ گۆتی: وژدانا من هاریكاریا من ناكەت باوەریێ ل سەر ڤێ پەیمانێ بدەم و پەیڤینا خۆ ب داوی ئینا ب گۆتنا: ئەز حەجی محەمەد رەشید وەكو نوونەرێ عەشیرەتێن مووسل پشتبەستن ب خودێ و وەرگرتن ژ گیانێ پێغەمبەری (د.خ) ب ئێكجاری ڤێ پەیمانێ رەتدكەم و، دەمێ ل ١٠ خزیرانا ١٩٢٤ێ باوەری ل سەر پەیمانێ هاتییەدان حەجی رەشید بەگ ل روونشتنا دەنگدانێ یێ بەرهەڤنەبوو بنێرە: عدنان سامي نذير، دور نواب الموصل في البرلمان العراقي خلال العهد الملكي ١٩٢٥-١٩٥٨، نامەكا دكتورایێ یا نە بەلاڤكرییە هاتییە پێشكەشكرن بۆ جڤاتا كولیژا ئاداب زانكۆیا مووسلێ، ١٩٩٣، بپ ٤٣- ٤٤.

٤١. فاروق صالح العمر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٢؛ عبدالرحمن البزاز، ژێدەرێ بەرێ، ص ص ١١٨- ١١٩.

٤٢. فاروق صالح العمر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٢؛ عدنان سامي نژیر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٧؛ محمود شيخ سين حسو الريكاني، سنجار في العهد الملكي(١٩٢١- ١٩٥٨) دراسة تأريخية، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة الموصل، ٢٠٠٧، ص ٤١.

٤٣. عدنان سامي نژیر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٧؛ خليل مصطفى عثمان الاتروشي، ژێدەرێ بەرێ، بپ٩٧- ٩٨.

٤٤. جڤاتا ماقوولان ژ ئالیێ شاهی (مەلكی)ڤە دهاتنەدانان ب مەرجەكێ هژمارا وان ژ بیستان نەبۆریت، دەمێ ئەندامەتیێ هەشت سالبوون ژ رۆژا دامەزراندنێڤە، دشیاندا هەبوو ئەندامێن بەرێ بێنەڤە دانان، كۆمبوونێن جڤاتا ماقوولان دگەل كوبوونێن جڤاتا نوونەران دەست پێدكرن و دگەل وان ژی ب داوی دهاتن، هەروەسان ڤانوون و بەرنامەیێن ژ جڤاتا نوونەران دەردكەتن رێكا خۆ بەرەڤ جڤاتا ماقوولان دگرتن دا ل وێرێ بێنە پەسەندكرن، مەرج بوو ژیێ هەر نوونەرەكێ ژ چل سالان كێمتر نەبیت. بنێرە: عدنان سامي نژیر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٨ ؛ خليل مصطفى عثمان الاتروشي، ژێدەرێ بەرێ بپ ٩٨.

٤٥. جڤاتا نوونەران، جڤات ب رێكا هەلبژارتنێ برێژەیا ئێك بۆ هەر بیست هزار كەسێن نێر دهاتە دامەزراندن و، هەر خولەكا جڤاتێ چوار كۆمبوونن، مافێ هەر عیراقییەكی یە ژیێ وی ژ سیهـ سالان كێمتر نەبیت، تێدا ببیتە ئەندام ئەگەر رێگرەكێ ڤانوونی ژ ئەوێن د ماددی ٣٠ ژ ڤانوونا بنەرەتی دا هاتین نەبیت. بنێرە: خليل مصطفى عثمان الاتروشي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٨.

٤٦. خليل مصطفى عثمان الاتروشي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٨؛ نوشیروان مصطفى، كوردستان العراق، عصر القلم و المراجعات ١٩٢٨- ١٩٣١، ترجمة حمه صالح كلالي،(السليمانية- ٢٠٠٠)، ص١٧؛ جمید شكري، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٣.

# کێشا مووسلێ

رەجەب جەمیل رەجەب
وەرگێران: موحسن عەبدولرەحمان

کێشەیا مووسلێ پشتی جەنگێ جیهانییا ئێکێ ژ دەرئەنجامێ داگیرکرنا ویلایەتا مووسل ژ ئالیێ هێزێن بریتانی پەیدابوو، سەرباری گرێدانا پەیمان مودرس ل ٣٠ چریا ئێکێ ١٩١٨ێ[١] د ناڤبەرا هێزێن هەڤپەیمان و دەولەتا ئوسمانی دا هێزێن بریتانی پشتگەرم ب بەندەکێ رێکێ ددەت هێزێن هەڤپەیمان هەر دەڤەرەکا گرنگییەکا ستراتیژی هەی داگیربکەت ئەڤ بازێرە گرت[٢].

دەستەلاتداریا بریتانی رێڤەبەرییەك تایبەت بۆ ویلایەتا مووسلێ دیارکر، چنکو ل دووڤ پێکهاتنا سایکس- بیکو دکەفتە دەڤـەرا ژێر دەستەلاتا فرەنسی، لێ ل داوێ شیا فرەنسا قایلبکەت ل بەرامبەر بەهرەکا پترۆلا مووسلێ دەست ژێ بەردەت، ئەڤێ دەست ژێ بەردانێ دەلیڤە دا بریتانیا مووسلێ دگەل دەولەتا نوو چێکریا خۆ (عیراقێ) گرێدەت، ل ئالیێ دی دەولەتا ترکی بەردەوام داخوازا وێ وەك پشکەك ژ ئەردێ خۆ[٣] یێ هێزێن بریتانی پشتی ئاگربەستا مودرس کارگێریا دکر.

کێشەیا مووسل دناڤ خشتەیا کارێن کونگرێ لۆزان (چریا دووێ ١٩٢٢- تیرمەها ١٩٢٣)بوو، وەکو د بەندەك تایبەت دا ژ پەیمانا لۆزان[٤] ل تیرمەها ١٩٢٣ێ و کۆنگرێ قستەنتینیێ ١٩ی گولان- ٩ خزیرانا ١٩٢٤ێ دا هاتی، پشتی نەرێککەفتنا هەردو لایەنێن هەڤرکیێ کێشە بۆ کۆما مللەتان ل ٦ تەباخا ١٩٢٤ێ هاتە هنارتن[٥]. پشتی چەندین گەرێن دانوستاندنێ دناڤبەرا هەردو ئالیێن هەڤرك ب سەرپەرشتییا کۆما مللەتان، کۆما مللەتان ل ٣٠ی ئەیلولا ١٩٢٤ێ بریاردا لیژنەکا نیڤدەولەتی بێتە پێکئینان[٦] ژبۆ دووڤچوونا کێشەیێ و بەرچاڤکرنا راسپاردەیان بۆ چارەسەریا وێ[٧]. ل ١٦ی کانوونا دووێ ١٩٢٥ێ لیژنە پشتی سەرەدانا لەندەن و ئەنقەرە کری گەهشتە بەغدا[٨]، بەری گەهشتنا لیژنێ بۆ ویلایەتا مووسل هەر ئێك ژ دەستەلاتا ترکی ژ ئالییەکیڤە و یا عیراقی ب پشتەڤانیا بریتانیا ژ ئالیێ دی پێرابوونێن پێویست بۆ ب هێزکرنا هەلویستێ خۆ د ناڤ کورداندا و راکێشانا ماقوولێن کوردان ژ وان ژی ماقوولێن دەڤەرا دهۆکێ بۆ ئالیێ خۆ گرتنەبەر و سەرەدانا وەزیرێ ناڤخۆیێ عیراقی عەبدولموحسن سەعدون بۆ دەڤەرێن کوردی ژ بۆ بدەستڤەئینانا پشتەڤانیا کوردان[٩]، پەیوەندیکرنا موتەسەرفێ (پارێزگارێ) مووسلێ عەبدولعەزیز قەسابی ب ماقوولێن قەزایێن کوردی یێن ب سەر

لیوا مووسل ڤە[١٠]. ژ لایەكێ دیڤە موتەسەرفێ مووسل د بیرهاتنێن خۆ دا ئاماژەكرییە: كو دەستەلاتا ناڤخۆیێ نامەیێن نهێنی دیتینە، تێدا ترك خەلكەكی ب مەرەما لایەنگریا خۆ بۆ خۆنیشاندانان بەرامبەر لیژنا كۆما مللەتان هاندەدەت[١١].

ل ٢٧ی كانوونا دوویێ ١٩٢٥ێ لیژنە گەهشتە مووسلێ[١٢]، و هەر یەك ژ هاریكارێ لیژنێ ژئالیێ بریتانییان مستەر (د. ف. گاردین)[١٣] و نوونەرێ حوكمەتا تركی جەواد پاشا[١٤] و وەزیر سەبیح نەشئەت[١٥] وەكو نوونەرێ حوكمەتا عیراقێ دگەلدا بوون، هەر وەسا مستەر ئەدموندز وەكو ئەفسەرێ پەیوەندیێ دگەل لیژنێ بوون[١٦]. ئەندامێن لیژنێ ل ١١ شواتا هەمان سال بریار دا ببنە چار دەستەكێن لاوەكی كو هەر دەستەكەك بۆ دەڤەرەكا دەستنیشانكری بێتە رەوانەكرن[١٧] و ئەندامێن لیژنێ چەندین پرسیاران ژ كەساتیێن دبینن بكەن. ژ وان پرسیاران: رادێ حەزا خەلكی كو بگەهنە عیراقێ یان تركی و ل دۆر ئینتیدابا بریتانی و هەلویستێ وان ژ پەیمانا (بریتانی- عیراقی ١٩٢٢)[١٨].

مستەر گاردینی سەرەدانا ئاكرێ كر و پتریا خەلكێ قەزایێ و ناحیا بەردەرەش (العشائر السبعة) د بەرژەوەندا عیراقێ دا دەنگدابوو، دهەمان دەمدا ژمارەكا كێم د بەرژەوەندا تركی دا دەنگدابوو، ژ وان شێخ عوبەیدوللا سۆرچی و كوڕێ وی مەزهەر و برایێ وی شەفیقی[١٩]. فیرسن ئاماژەكرییە بارێ نە گرنگیپێدانا دناڤ هندەك گەنجێن دەڤەرێ بەرامبەر وێ كێشەیا چارەنڤیسساز بۆ مللەتێ كورد و سەرەدەریكرنا وان دگەل كێشەیێ ل دووف حەزێن خۆ یێن كەسوكیێن بەرتەنگ[٢٠].

پشتی سەرەدانا لیژنێ بۆ پتریا دەڤەرێن ویلایەتا مووسل و ل ١٥ی ئادارا ١٩٢٥ێ سەرا زاخۆ دا، دو رۆژان ل وێدەرێ ما[٢١] لیژنا نێڤدەولەتی ل زاخۆ شێخ و ماقوول و سەرۆكێن مەسیحیێن ئاكنجی ل وێرێ دیتن[٢٢] هەروەسا جەواد پاشا دگەل سكرتێرێ خۆ د ناڤ بازێری دا گەریا و هەولدا ب دانا پارەی هندەك ژ خەلكی تەماعبكەت[٢٣].

دەربارەی دەنگدانێ د بەرژەوەندا عیراقێ یان تركی جوداهی د هەلویستێ خەلكێ زاخۆ دا هەبوو، كریستیان و جۆهییان د بەرژەوەندا حوكمەتا عیراقێ دا دەنگدا[٢٤] ژبەر ئەو چەوساندنا ژ دەولەتا ئوسمانی گەهشتیێ، هەروەسا پتریا خەلكێ زاخۆ ژ هەمان ئەگەر د بەرژەوەندا عێراقێ دا دەنگدا، سەربارێ تۆشبوونا وێ بۆ هێرشێن لەشكەرێ تركی و زێدەگاڤیێن باندێن ل سنوورێ عیراقی- تركی هەین، هەروەسا نابیت كارتێكرنا ژناڤبرنا سەرهلدانا سالا ١٩٢٥ێ ب سەركێشیا شێخ سەعیدێ پیران[٢٥] ژ ئالیێ حوكمەتا تركی ڤە ل سەر خەلكێ زاخۆ بێتە پشتگوهـ ئێخستن، زێدەباری رۆلێ دختورێ ئەرمەنی ئەستارجیانی د قایلكرنا خەلكی دا بۆ دەنگدانێ د بەرژەوەندا عیراقێ دا[٢٦].

سەرباری وێ هندەك سەرۆك هۆزان د بەرژەوەندا دەولەتا تركی دا دەنگدا، ژ وان سەرۆكێ عەشیرەتا سندی (جەمیل ئاغا) ژ گوندێ دارهۆزانێ[٢٧]. لەورا ژ دەڤەرا زاخۆ دووركەڤت و پەنا برە دەڤەرێن عەشیرەتا گۆیان (شەرنەخێ) ل ناڤ دەولەتا تركی[٢٨]. و هندەكا نەدەنگدانا عەشیرەتێن گولی و سندی د بەرژەوەندا دەولەتا عیراقێ دا شرۆڤەكرن كو ژ ترسا ژ دەستدانا چەروانێن خۆ ئەوێن دكەڤنە ناڤ دەولەتا تركی بوویە[٢٩].

پوختەیا گۆتنێ پتریا خەلكێ زاخۆ د بەرژەوەندا عیراقێ دا دەنگدا ژبەر بەرژەوەندێن وان یێن ئابووری دگەل مووسلێ و ل دۆر ڤی بابەتی رۆژنامەیا (العراق) ل سەر بەرپەرەكێ خۆ بڕۆسكەیا ماقوولەكێ زاخۆ ل ژێر ناڤونیشانێ ( حول تمسك اهالی زاخو بالعرش الهاشمي) بەلاڤكرییە، تێدا هاتییە "پیرۆزباهیێ ل هەر ئەڤیندارەكێ وەلاتێ خۆ دكەم و مزگینیێ د دەمە هەوە كو دووڤچوونا لیژنا نێڤدەولەتی ل زاخۆ گەهشتییە وی ئەنجامی كو سەرێ مووسلێ یێ پێگیرە ب ئێكبوونا عیراقێ و تەختێ هاشمی ڤە، بژیت مووسل و زاخۆیا وێ یا عیراقی...حاجی شەمدین ئاغا "[٣٠].

پشتی لیژنێ ل زاخۆ كارێ خۆ داوی ئینای بەرەڤ

دهۆکێ چوو[٣١]. و ژ خرابییا رێکا و سەقایێ ماقوولێن ئامێدیێ داخوازکرنە دهۆکێ ژبۆ وەرگرتنا بۆچوونێن وان[٣٢].

ئەدموندز دیارکرییە: ئەوی زانییە ژ بەر نەبوونا تەخەکا رەوشەنبیر ژ ئەفسەرێن کورد و فەرمانبەرێن سڤیل یێن چاڤەرێ دکەن کو سەروبەرێ عیراقێ دێ باشتربیت بۆ هیڤی و ئومێدێن وان ژ یێ ترکی، چ ئەو هیڤی و ئۆمێد میانرەو یان تۆندرەوبن، ئامێدی و زاخۆ و دهۆك و زێبار دێ هەلویستەکێ ب زەحمەت وەرگرن[٣٣].

دەمێ ل ١٧ی ئادارا ١٩٢٥ێ لیژنە گەهشتییە دهۆکێ کومێن بۆش ژ سەرۆك عەشیرەتێن کوردان و لایەنگرێن وان بەرەڤ جڤاتا لیژنا ڤەکۆلینێ چوون، پشتی کومبوونەك بۆ ریسواکرنا قایمقامی و کریارێن وی ئەنجامدای، هەر وەکی د هێرشەکێدا بن ب رەنگەکێ بێ سەروبەر بەرەڤ پێش چوون، و گەلەك ژ ئاغایان ل پێش جەواد پاشای سەرۆکێ شاندێ ترکی خۆ چەماندن و دەستێ وی ماچیکرن و پاشتر ب سەرۆکاتییا شێخەکێ بەرنیاسێ رێبازا نەقشەبەندی دەست ب خواندنا ئایەتێن قورئانێ کرن[٣٤]. دوور ناهێتە دیتن کو شێخ بەهائەدینێ نەقشەبەندیێ بامەرنی بیت،

سەرۆکێ لیژنێ فیرسنی دیارکرییە: ئەڤێن کۆمڤەبووی هزرکرن ویلایەتا مووسل بۆ ترکی ما و عیراقێ خۆ ڤەکێشا و هەڤسار د دەستێ لیژنا دووڤچۆنێ دایە، لەورا فیرسن دگەل پەیڤی و گۆتێ د ئارامبن و ئەوا دهێتە گۆتن حوکمەتا عیراقێ خۆ ڤەکێشایە یا بێ بنەمایە[٣٥]. پاشی پتریا کۆمڤەبوویان بەرەڤ گاردینێ سەرۆکێ شاندێ بریتانی ئەوێ ماوەیەکی لوێدەری ل پۆستێ جێگرێ ئەفسەرێ سیاسی کارکری چوون، کو ل جەم وان یێ بەرنیاس بوو، و شکیات ل قایمقامی کرن و گۆتن: تنێ ئەو دشێت قانوونێ ڤەگەرینیت و هاریکارێ وان بیت کاروبارێن خۆ رێڤەببەن[٣٦].

د یاداشتەکا نهێنی یا سەرپەرشتێ کارگێری ل مووسلێ بۆ وەزارەتـــا ناڤخۆ دا هاتییە، کو شێخ عەبدولرەحمانێ ئەترووشی زاڤایێ حەجی عەبدوللەتیف ئاغایێ ئامێدی بەرپرسیاربوو ژ لایەکێ خۆنیشادانا دەمێ سەرەدانا لیژنێ بۆ دهۆکێ ل دژی حۆکمەتێ هاتییەکرن[٣٧].

یا گرنگ د ڤێ مژارێدا ئەوە پتریا ماقوولێن دهۆکێ ب باندۆرا قایمقامێ دەڤەرێ و ل دووڤ رێنمایێن (جمعية الدفاع الوطني) د بەرژەوەندیا عیراقێ دا دەنگ دا[٣٨]. و دەربارەی ئەوێن د بەرژەوەندا ترکیا دا دەنگدای پشکەك ژ دۆسکی و بریفکیان بوون [٣٩].

د هوندرێ هەڤبەرکرنا ڤان پێزانینان دگەل روودانێن دەڤەرا بادینان ل هاڤینا هەمان سال دیاردبیت، کو ئەوێن د بەرژەوەندا ترکی دا دەنگدای: سەفەر ئاغایێ شندۆخی (د هەمان سالدا هاتەکوشتن)، و شەفیق سالح ئاغا و برایێ وی توفیق ژ گوندێ (زێوکا شەفیق ئاغای) و رەشید ئاغایێ حۆجاڤای، مستەفا ئاغایێ بێسفکی و عەلی دێرگژنیکی( ناحیا دۆسکی) ئەوێن دگەل هندەك ئالیگرێن خۆ چووینە ترکیا، هەروەکی د راپۆرتەکێدا ناڤێن (٧٥) کەسان ژ خەلکێ ( زێوکا شەفیق ئاغا، دێرگژنیك، بێسفکێ، گەلناسکێ، شاوریکێ، چرانێ و حوجاڤا)هاتین یێن پەنا بریە بەر ئەردێ ترکیا و پاشی ل گەل جەمیل ئاغایێ سندی ب چەندین کریارێن چەکدار دژی مەخفەرێن سنووری یێن عیراقی رابووین[٤٠].

ئەدموندزی دەربارەی هەلویستێ ماقوولێن دەڤەرا ئامێدیێ ئەوێن هاتینە دهۆکێ دیارکرییە" دەمێ شاندێ ئامێدیێ دانێ سپێدێ گەهشتییە خیڤەتگەهێ دیمەنێن بەرللای و تێکدانێ دووبارە نەبوون و قایمقام عەبدولحەمید عەبدولمەجید... زەلامەك ژ تەرزێ ئێکێ بوو، مە وەسا دانا کو پتریا دەنگدانا سەرۆك عەشیرەتێن بەرنیاس دێ بەرۆڤاژی دەنگدانا دهۆکێ بیت، چنکو پتریا وان کەسێن پشتەرێبووی یێن بەرێ بوون و کریارێن وان یێن زێدەگاڤییان پشتی دەرچوونا لێبوورینا گشتی بۆ وان پشتیێ وان گرانترکربوو، زێدەباری هەبوونا چەندین گوندێن ئاسووری یێن رەسەن، و کەمپ یان ئاکنجیگەهێن پەنابەرێن نوو، هەلبەت ئەڤان د بەرژەوەندا عیراقێ دا دەنگدا[٤١].

والیێ مووسل د بیرهاتنێن خۆدا دیارکرییە: ژمارا ئەوێن ژ شاندێ ئامێدیێ د بەرژەوەندا لایەنێ ترکی دا دەنگدای تنێ هەشت کەس بوون[٤٢].

د هوندرێ هەڤبەرکرنا ڤان پێزانینان و هندەك پێزانینێن دی ل دۆر روودانێن دەڤەرا ئامێدیێ د مەهێن خزیران و تیرمەها هەمان سالدا؛ و ل دووڤ راپۆرتێن نهێنی یێن بریتانی دیاردبیت ژ ئەوێن د بەرژەوەندا ترکیادا دەنگدای: حەجی تاهر عەلی ئاغا هەمزانی یەك ژ سەرۆکعەشیرەتێن دۆسکی بوو، د راپۆرتەکا پشکێنەرێ کارگێریێ لیوا مووسلێ بۆ راوێژکارێ وەزارەتا ناڤخۆیی دا هاتییە: تاهیر هەمزانی...دۆسکی ژ دەڤەرا ئامێدیێ لایەنگرێ ترکانە وی ژی لبەرە برەڤیت ترکیا[٤٣].

دیارە دەستەلاتا بریتانی و عیراقی چاڤدێریا تاهیر ئاغایێ هەمزانی دکر، و شیان دەستەسەر بکەن بەری پەنایێ بۆ ترکیا ببەت، د راپۆرتەکا دی دا هاتییە کو ل ئامێدیێ یێ دەستەسەرە" هەروەکی د راپۆرتێدا هاتی هێژ تاهیر هەمزانی ل ئامێدیێ دەستەسەرە و سەعید ئاغایێ دۆسکی و لایەنگرێن حوکمەتی چاڤەرێنە بێتە بەردان، چنکو ئەو د ناڤبەرا خۆ دا گەهشتینە هەڤتێگەهشتنەکێ[٤٤]. دیارە سەعید ئاغا گەهشتییە تێگەهشتنەکێ دگەل دەستەلاتا بریتانی و عیراقی ب مەرجێ بەرامبەر تاهیر هەمزانی بێتە بەردان، چ بزاڤێن دی ب هاریکاریا ترکی دژی دەستەلاتا ناڤبری نەکەت.

کەسێ دی یێ د بەرژەوەندا ترکی دا دەنگدای محەمەد ئاغا کورێ حسێن ئاغایێ بەرئاشی یە، ئێك ژ سەرۆکێن عەشیرەتا بەرواری ژێریا، ناڤێ وی د راپۆرتەکا ل دۆر کاروبارێن بەرواری ژێریا دا هاتییە" مەحموود ئاغا کورێ حوسەین ئاغا {محمد اغا بن حسین اغا البراشی}یێ بەرئاشی ل ئامێدیێ دەستەسەرە[٤٥] سەرباری راپۆرتێ ئاماژەنەکرییە ئەگەرێن گرتنێ، لێ دهێتە ئالیسەنگکرن ژبەر دەنگدانێ بۆ بەرژەوەندییا ترکی ئەو هاتییە گرتن، چنکو گرتنا وی هەڤدەم بوو دگەل گرتنا تاهیر هەمزانی د ماوەیێ سەرۆك عەشیرەتێن بادینان ب هاندانا ترکی ب بزاڤێن دژی حوکمەتا عیراقی رابووین.

ژ یێن د بەرژەوەندا ترکی دا دەنگداین، حەجی رەشید بەگێ بەرواری بوو، ناڤێ وی د راپۆرتەکێ دا هاتییە و ئەڤە دەقێ وێ یە"رێك هاتییەدان حەجی رەشید بەگ{رەشید بەگێ بەرواری} ڤەگەریتە مالا خۆ[٤٦]. ژ راپۆرتێ دیارە حەجی رەشیدی مالا خۆ هێلا بوو و ل حۆکمەتێ یێ قاچاغ بوو، و گەهشتبوو ئاغایێن بادینان ئەوێن ل وی دەمێ بزاڤ دژی حۆکمەتێ دکرن، لێ ئەو شیا ل داویێ بگەهیتە تێگەهشتنەکێ د گەل دەستەلاتا بریتانی و عیراقی داکو ڤەگەریتە مالا خۆ پشتی کو ژ یانا قاچاغیێ بێ ئۆمێد بووی.

هەروەسا دوور ناهێتەدیتن شێخێن تەکیا بامەرنێ د بەرژەوەندا ترکی دا دەنگ دابیت، ئەدمونذزی دیارکرییە: ئێك ژ هاندرێن خۆپیشاندانێ ل پێش لیژنا کۆما مللەتان ل دهۆکێ شێخەکێ نەقشەبەندی بوو، وەکو ل پێشیێ هاتی، دەمێ ئایەتێن قورئانا پیرۆز پێش خۆپیشاندەران دخواندن[٤٧]. دهێتە ئالیسەنگکرن کو ئەو شێخ بەهائەددینێ نەقشەبەندی بیت، چنکو وی دەمی ئەو سەرکێشێ تەکیا نەقشەبەندی بوو ل بامەرنێ .

دەربارەی حەجی عەبدوللەتیف عەبدولعەزیز ئاغای دیاردبیت ئەوی ژی د بەرژەوزەندا ترکی دا دەنگدایە، چنکو ئامێدیێ هێلایە و چوویە ترکی، د راپۆرتێ دا ئەڤە هاتییە: (حەجی شەعبان)و مەلك خۆشابا نها ل چەلێ نە و حەجی عەبدوللەتیف ئاغا بەرەڤ جولەمێرگێ چوویە[٤٨]. ژ دەقی دیارە کو حەجی عەبدوللەتیف ژ هێزێن بریتانی و عیراقی یێ قاچاغ و داخوازکری بوون لەورا ئامێدیێ هێلا و بەرەڤ ترکی چوونە.

حەجی شەعبان ئاغایێ ئامێدی دگەل ئالیکرێن خۆ ب هاندانا دەستەلاتا ترکی ب کریارێن شەری دژی حوکمەتا عیراقی رادبوون، پاشی دێ بەحسێ بابەتی هێتەکرن، فایق ئەحمەد حەجی شەعبان دیاردکەت: کو حەجی شەعبان ل ناڤ ئاخا ترکی بوو، بەری لیژنەیا دووڤچۆنێ بگەهیتە دهۆکێ[٤٩].

کورت و کرمانجی ئەوێن لایەنگریا ترکی کری ژ

هۆکارێ دینی بوو، ب وێ رامانێ کو ترک خەلیفەیێن دەولەتا ئوسمانی نە، یان ژی ب هیڤیا ڤەگەڕاندنا هێز و دەستەلاتا ل سەر دەمێ ئوسمانییان هەی، و ئەوێن د بەرژەوەندا ئێکگرتنێ دگەل عیراقێ دەنگدای ژ ئەگەرێ گرێدانا بەرژەوەندێن وان یێن ئابووری بوو ب مووسلێ ڤە، زێدەباری کارمەندێن دەستەلاتداریێ یێن ناڤخۆیی ل دەڤەرێ کو قائیمەقام عەبدولحەمید عەبدولمەجیدی نوونەراتیا وێ دکر، و هەر وی ناڤێن ئەندامێن شاندێ ئامێدیێ یێن هاتینە دهۆکێ ژبۆ وەرگرتنا بووچۆنێن وان ژ ئالیێ لیژنا دووڤچۆنێ دەستنیشانکریبوون[٥٠]. لیژنە ڤەگەریا مووسلێ و ل ٢٣ی ئادارا ١٩٢٥ێ پشتی کارێ خۆ تمامکری بەرەڤ جنێڤ چوو[٥١]، و ل ١٦ی تیرمەهێ ١٩٢٥ێ راپۆرتا خۆ یا داویێ پێشکێشی کۆما مللەتان کر، راپۆرت ژ ١١٣ لاپەران دگەل نەخشەیەکێ یا هەڤپێچ پێکدهات[٥٢].

لیژنێ د راپۆرتا خۆ دا راسپارد ویلایەت دناڤبەرا عیراق و ترکی دا نەهێتە لێکڤەکرن[٥٣]. یا گرنگ ئەو بوو لیژنێ هندەك مهانە بەرچاڤکرن وەك مهانێن ئابووری و جوگرافي و لەشکەری کو پشتەڤانیێ ل هندێ دکەن ویلایەتا مووسلێ بدەنە دگەل عیراقێ،[٥٤] ئەڤ هەردو مەرجێن ل خوارێ بەرچاڤ بێنە وەرگرتن[٥٥].

**ئێك-** بۆ ماوەیێ بیست و پێنج سالان عیراق ل ژێر ئینتیدابا بریتانی بمینیت.

**دوو-** حەزێن کوردان د کاروبارێن کارگێریدا ل بەر چاڤ بێنە وەرگرتن، و زمانێ کوردی د فێرکرن و کاروبارێن دادی دا زمانێ فەرمی بیت.

بەری گەنگەشەکرنا راپۆرتێ ژ ئالیێ کۆما مللەتانڤە، ل هەر دو ئالیێن هێلا بروکسل د ناڤبەرا ترکی و عیراقێ دا ل هاڤینا ١٩٢٥ێ سڤکەشەرێن لەشکری هاتنەکرن[٥٦]. و هەر دو ئالیێن عیراقی و ترکی دژی هەڤ سکالا بۆ جڤاتا کۆما مللەتان پێشکێشکرن[٥٧]. کو هەر یەك ژ عیراقێ و ترکی ژ بۆ گەهشتنا بەرژەوەندێن خۆ یێن تایبەت کورد ئیستیغلالکرن، ژ ئالییەکیڤە ترکی پشتەڤانیا کوردێن عیراقی یێن دژی حوکمێ عیراقی کر و ل بەرامبەر عیراقێ پشتەڤانیا عەشیرەتێن کورد و کریستیانێن دژی حوکمێ ترکی کر.

یا گرنگ بۆ مە ئەو بزاڤن یێن سەرۆك عەشیرەتێن بادینان تێدا پشکداربووین، وەکو ل پێشیێ مە دیارکری دەستەلاتا عیراقی سەرۆك عەشیرەتێن ئامێدیێ گرتن ژبەر لایەنگریا وان بۆ ترکی، ژ وان: تاهیر هەمزانی و محەمەد حوسەین ئاغایێ بەرئاشی، لێ حەجی عەبدوللەتیف ئاغا شیا بگەهیتە ترکی، ددەمێ حەجی شەعبان ل ناڤ ئاخا ترکی بوو، ب هاندانا ترکی خۆ بەرهەڤدکر دا هێرشێ بکەتە سەر ئامێدیێ، د یاداشتەکا نهێنی یا سەرپەرشتێ کارگێری ل مووسلێ بۆ راوێژکارێ وەزارەتا ناڤخۆ دا هاتییە، پێزانین ل دوور بەرهەڤیان ژ ئالیێ حەجی شەعبان ئاغایی ڤە بۆ هێرشکرنێ ل سەر ئامێدیێ هەنە، و یادداشتێ دا هاتییە" ل ڤێ داویێ هەر ئێك ژ شێخ عەبدولرەحمان ئەترووشی (زاڤایێ حەجی عەبدوللەتیفي) و حاجی مەلا ئەحمەد کوڕێ مەلا عەبدولهادی نامەیەك بۆ حەجی شەعبان هنارتییە، دپرسن کا دێ چ کەت و ترك دێ چکەن. حەجێ شەعبانێ د بەرسڤێ دا گۆتییە ترکا رەتکرییە کو هەر هاریکارییەکێ ب دەنێ دا هێرشێ بکەتە سەر ئامێدیێ، لێ بەرسڤا وی داینە (هەر تشتێ ژ تە دهێت بکە) و عەشیرەتێن ل ترکی و عیراقێ هەموو د نەرازینە کو هەر ئاریشەك بۆ حۆکمەتێ بێتە ئازراندن. و حەجی شەعبان ئاغایی زێدەکرییە کو چ هیڤی ژ عەشیرەتێن پشت سنووری نینە تشتەکی بکەن، ئەگەر ئەو (شێخ عەبدولرەحمان و هەڤالێن خۆ) نەشیان ئاریشەیا ل ناڤ عیراقێ پەیدابکەن، ئەگەر ئەو شیان وی کاری بکەن، ب دیتنا وی دێ شێت عەشیرەتێن پشت سنووری ژی بەشدارکەت، و دهێتە گۆتن کو شێخ عەبدولرەحمانی بەرسڤدایە کو ئەو دێ هەولدەت ئاژاوەیێ پەیدابکەت، و ئەگەر د بزاڤا خۆدا سەرنەکەت ئەڤە ئەو ژی دێ هێتە ترکیا[٥٨].

ژ دەڤی دیارە کو حوکمەتا ترکی هیچ هاریکارییەکا

مادی پێشکێشی حەجی شەعبان ئاغای نەکرییە، بەلکو تنێ پشتەڤانییەکا مەعنەوی بوو، چنکو وەسا دیارە حوکمەتا ترکی نەدڤیا پتر نەئارامی ل سەر سنووری دگەل عیراقێ هەبیت، و هەر پشکدارییەکا عەشیرەتێن کوردی ل ئالیێ ترکی د هەر بزاڤەکا دژی دەستەلاتا بریتانی و عیراقی ل دەڤەرێن ئامێدیێ، یائێکێ گرێدایە ب رابوونا عەشیرەتێن کوردی ل ئالیێ سنوورێ عیراقێ یە، و شێخ عەبدولرەحمان ئەترووشی د بزاڤێن خۆ دا بۆ پەیداکرنا ئاژاوەیێ ل دەڤەرا بادینان یێ بەردەوامبوو.

د برۆسکەیا والیێ مووسل بۆ وەزارەتا ناڤخۆ هنارتی دا هاتییە، کو حەجی شەعبان ئاغا و مەلك خۆشابا و ئوسمان بەگ و ئولیا بەگ (میرێ چەلێ) چووینە جولەمێرگێ بۆ دیتنا والیێ وێ ل دووڤ داخوازا وی[٥٩]. د دەمەکیدا د یاداشتەکا نهێنی یا سەرپەرشتێ کارگێری ل مووسلێ دا هاتییە، کو حەجی شەعبانی ب هیڤیا ڤەگەراندنا پەزێ خۆ دەست ب گەریانێ کرییە ل سنوورێ دەڤەرا ئامێدیێ و تێدا هاتییە: پشتی حەجی شەعبانی سۆز ژ مەلك خۆشابای وەرگرتی کو ژ ئالیێ ئاشوریانڤە توشی چ دەستدرێژیان نەبیت ب مەرەما کۆمکرنا پەزێ خۆ دەست ب گەریانێ ل سەر سنوورێ مە کرییە. و دگەل هندێ قایمقامێ ئامێدیێ د دەمێ گونجای دا پێزانین وەرگرتینە و پەز بۆ گۆندێ سوینا (پتر هزر بۆ گوندێ سینیایێ دەڤەرا نێروە دچیت) دوورئێخستینە و نها دەست ب سەر وی پەزی دا دهێتەگرتن[٦٠].

ل قەزا زاخۆ شەرەکێ چەکدار دناڤبەرا هێزێن ترکی و هێزێن سادق برویێ گۆلی روودایە، دەمێ چوونا هندەك ژ عەشیرەتا وی بۆ چەروانێن خۆیێن هاڤینی ل زۆزانا ل ناڤ ترکی و د شەری دا برازایێ سادق بروی هاتییە کوشتن[٦١]. هەروەسا جەمیل ئاغایێ سندی بۆ چەندین جاران ب پشتەڤانییا هێزێن ترکی هێرش کرییە سەر چەند بنکەهـ و گۆندێن سنووری (بەرەخ، شەرانش، ماسیس، باڤانکا، باڤان، سەناتێ) ب مەبەستا پەیداکرنا ئاژاوەیێ د ناڤبەرا عەشیرەتێن دەڤەرا زاخۆ دا[٦٢]. هەروەسا دەستەلاتا ترکی فشار ل سەر عەشیرەتا گۆیان کرییە داخۆ بدەن دگەل هێزێن جەمیل ئاغایێ سندی[٦٣]. بەلگەنامەیەك وەسان دیاردکەت کو هندەك ژ سندییان هەڤسووزی دگەل جەمیل ئاغای هەبوو و هاریکاریا وی دکر د هاتنوچوونێدا ل ناڤ گوندێن سندییان [٦٤]. ژ ئالیەك دی دەستەلاتا عیراقی پشتەڤانیا کوردێن ترکی کر کو هێرشێ بکەنە بنگەهێن سنووری یێن ترکی، بۆ نموونە پشتەڤانیا هەر ئێك ژ عەلی خان ئاغایێ شەرنەخی و نعمەت شەریف و حوسەین ناسر و میرزا عەلو، ژ مەزنێن گۆیان دکر، پشتی ژ دەستەلاتا ترکی رەڤین و پەنا بۆ عیراقی بری[٦٥]. هەروەسا عیراقێ پشتەڤانیا مەسیحیێن ژ ستەما دەستەلاتا ترکی رەڤین دکر[٦٦].

ل قەزا دهۆکێ سەرباری پشکداری و پشتەڤانیا شەفیق ئاغایێ دۆسکی بۆ جەمیل ئاغای د کریارێن وی یێن چەکداری دا، رەشید ئاغایێ حۆجاڤای هێرش کرییە سەر گۆندێ ناڤشکێ و چەندین پارچێن چەکێ ژ خەلکی ستاندینە[٦٧]. ژ ئالیەك دی دەستەلاتا عیراقی فشار ئێخستە سەر خەلکێ گۆندێن دۆسکیان یێن د بەرژەوەندا ترکی دا دەنگدای، و سزایێن دارایی سەپاندن تاکو خەلکێ گۆندێن(دێراگژنیك، بێسفکی، حۆجاڤا) دگەل شەفیق ئاغای نەچاربوون داخوازا لێبورینێ ژ دەستەلاتا عیراقی بکەن [٦٨].

ل ١٦ی کانوونا ئێکێ ١٩٢٥ێ کۆما مللەتان بڕیارەك دەرئێخست کو ویلایەتا مووسلێ ب عیراقێ ڤە بێتەگرێدان[٦٩]. و هێلا بروکسل وەك هێلەکا باش بۆ چەسپاندنا سنووری دناڤبەرا عیراق و ترکی دا دەسنیشانکر[٧٠]. ب مەرجێ گرێدانا پەیمانەکا نوو دناڤبەرا بریتانیا و عیراقێ دا ماوەیێ ئێنتیدابێ بکەتە بیست و پێنج سال[٧١]. و پێدڤییاتییا بەرچاڤ وەرگرتنا حەزێن کوردان د بکارئینان زمانێ ناڤخۆییدا[٧٢].

پشتی دەرچوونا بڕیارا ناڤبری چەندین سەرۆك بازێرڤانی و تائیفێن دینی و مەزنە فەرمانبەرێن دەولەتێ برۆسکە بۆ کۆما مللەتان و مەندوبێ بریتانی ل عیراقێ و سەرۆکاتیا حوکمەتا عیراقێ هنارتن و تێدا سوپاسی و شادمانیا خۆ ب ڤێ بڕیارێ

دیاركرن[٧٣].

سەرۆكێ باژێرڤانییا ئامێدیێ محەمەد مستەفا ئەفەندی (ال قاضی)[٧٤] ب ڤێ هەلكەفتێ بروسكەك بۆ سكرتێرێ جڤاتا كۆما مللەتان هنارت، تێدا هاتییە"... جڤاتا بەرێز ژ سوپاسیێن مە ئاگاداركەن ژبۆ یەكلاكرنا كێشەیا مە ب حەقی و خێرا وەلاتی... ل ب جهـئینانا حەقیێ[٧٥].

هەروەسا بروسكەك بۆ وەزیرێ كۆلۆنیالیان (المستعمرات) د حوكمەتا بریتانی دا مستەر لیوبولد ئامیری هنارت، تێدا هاتییە" ل سەر زەحمەتا هەوەكێشای دۆر كێشەیا مە سوپاسیێن خۆ پێشكێشی هەوە یێن رێزدار دكەم[٧٦]. ب هەمان هەلكەفت سەرۆكێ باژێرڤانییا دهۆكێ بروسكەك بۆ سكرتێرێ كۆما مللەتان هنارت" ب ناڤێ تەڤایا خەلكێ قەزا دهۆكێ سوپاسیێن خۆ یێن گەرم دگەهینم...ب هەلكەفتا دەرئێخستنا حوكمێ خۆ یێ دادوەر دەربارەی كێشەیا مووسل و ئێكلاكرنا وێ ب دەستپاكی..."[٧٧]. و د بروسكەیا سەرۆكێ باژێرڤانییا زاخۆ دا هاتییە" پشتەڤانییا هەوە بۆ مە دێ ناڤێ كۆمەلەیا ئاشتیێ بۆ بەرەبابێن پاشەرۆژێ زیندی هێلیت، بناڤێ مللەتێ زاخۆیی سوپاسیا هەوە دكەم خۆ بۆ هەوە دچەمینم"[٧٨]. و سەرۆكێ باژێرڤانییا زێبار ب ناڤێ عەشیرەتێن دەڤەرا زێبار سوپاسیا سكرتێرێ ئێكەتیا گەلان كر، ل سەر ماندیبوونا د چەسپاندنا حەقی و دادیێ دا[٧٩]. و د بروسكەیا قەشە یوحەنا سەرۆكێ گیانیێ كلدانی ل گوندێ پێشابوورێ دا هاتییە" كورێن مللەتی كلدانی ل دوورترین سنوورێ مووسلێ سوپاسیا هەوە دكەت... ب ڤەگەراندنا حەقی بۆ خودانێن وێ و هەوە دیاركر كو هوون پشتەڤانێن بەلنگازانن..."[٨٠]. هەروەسا سەرۆكێ باژێرڤانییا ئاكرێ سوپاسیا وەزیرێ میتینگەهێن بریتانی كر، ل سەر زەحمەتكێشانا وی د رێیا بەرڤانیكرنێ ژ كێشەیا وان یا رەوا دا [٨١].

پشتی دەرچوونا بریارێ ژ كۆما مللەتان حوكمەتا بریتانی و عیراقی ب مەرەما بجهـئینانا بریارا جڤاتا كۆما مللەتان كەفتنە دانوستاندنێ بۆ گرێدانا پەیمانەك نوو دا جهێ پەیمانا سالا ١٩٢٢ێ بگریت[٨٢]. و ل ١١ كانوونا دویێ ١٩٢٦ێ هاتە واژووكرن[٨٣]. پەیمانا نوو كوپییەكێ دووبارەكریێ هەمان پەیمانا كەڤنبوو و چ جوداهی د ناڤبەرا واندا نەبوو ژبلی دەمێ دیاركریێ وێ[٨٤].

سەرباری پێكئینان لیژنەیا عیراقی تركی یا بـــەردەوام[٨٥] لێ دەستدرێژی ژ ئالیێ خەلكێ ئاكنجیێن هەردو ئالیێن سنووری د بەردەوامبوون، حوكمەتا عیراقی ئالیێ تركی ب خەمساریێ د كونترۆلكرنا سنووری دا تاوانباردكر[٨٦]. د ناڤەراستا هەیڤا ئیلولێ دا هێزێن تركی گوندێ ئاشیتێ ئەوێ نها دكەڤیتە ئالیێ تركی ژ سنوور كونترۆلكر و بەرەڤ گوندێن دەڤەرا بەرواری بالا هات، لەورا هێزێن لیفی یێن ژ ئالیێ هێزێن بریتانی پشتەڤانی لێ دهێتەكرن، نەچاربوون بەرەڤ سەرێ ئامێدیێ و گوندێ بێبادێ خۆ ڤەكێشن[٨٧]. هێزێن بریتانی پلانەك بۆ ڤەگەراندنا بەرواری بالا دانا و فەرمان دا سەرۆك عەشیرەتێن ئاشووری پشتەڤانییا هێزێن لیفی بكەن، و خاتوون سرمی خان[٨٨]. مەتا مار شەمعونی یا شیای رۆلەكێ مەزن د هاندانا سەرۆك عەشیرەتێن ئاشووری دا هەبوو كو شەری دژی تركی بكەن، و ژبەر رۆلێ وێ ب مەدالییا (ویسامێ) ئیمبراتوریێ هاتە خەلاتكرن. مەتران ماریولاها مەترانێ بەرواری بالا پشكداری د شەری دا كر [٨٩]. هێزێن هێرشبەر شیان جارەكا دی دەڤەرا بەرواری بالا كونترۆل بكەنەڤە و حەجی رەشید بەگ ژبەر راوەستانا وی بەرامبەر پێشڤەچوونا هێزێن هێرشبەر هاتە گرتن و هاتە هنارتن بۆ ئامێدیێ [٩٠]. چونكی وان هێزان ژمارەكا گوندێن كوردان ل دەڤەرا ناڤبری سۆتبوون و وێرانكربوون [٩١].

لیژنا سنووریا عیراقی و تركی یا بـەردەوام د كـــارێ راستڤەكرنا ئاریشەیێن سنووری ب شێوەكێ ئاشتییانە ل زاخۆ و مووسلێ كومبوو؛ پشتی چەندین كومبوونێن هەیڤەكێ ڤەكێشای، شاندێ تركی سۆپاسیا لایەنێ عیراقی ل سەر مێڤانداریێ كر و ڤەگەریا تركی[٩٢]. دیارە هەردو لا گەهشتنە پێكهاتنەكێ، چنكو پشتی وێ دیرۆكێ چ رووبرووبوونێن هەژی بەحسكرنێ ل هەردوو ئالیێن سنووری روونەدان.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. ژبۆ داوی ئینانا شەری دناڤەرا هەردو لایان دا، ل چریا ئێکێ ١٩١٨ێ ل بەندەرا مودرس ل گزیرتەکا یونانی ئاگربەست د ناڤبەرا دەولەتا ئوسمانی و دەولەتێن هەڤپەیمان هاتەکرن. بنێرە: حنا عزو بهنان، التطورات السياسية في تركيا ١٩١٩- ١٩٢٣، رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب بجامعة بغداد، اب ١٩٨٩، ص ٢٠.

٢. فاروق صالح العمر (الدكتور) ژێدەرێ بەرێ، ص ١٤٢؛ خليل اسماعيل محمد (الدكتور)، البعد القومي لمشكلة الموصل دراسة في ضوء تقرير عصبة الأمم لسنة ١٩٢٥، مجلة گولان العربي، العدد ١٧، تشرين الاول١٩٩٧،ص ٨٣.

٣. جرجيس فتح الله ، يقظة الكورد تأريخ سياسي ١٩٠٠- ١٩٢٥ ومما يتناول النزاع على جنوب كوردستان امام عصبة اللأمم مع الوثائق و المذكرات المتعلقة به، دار ئاراس للطباعة و النشر، (اربيل- ٢٠٠٢)، ص ص ٢٣٣-٢٣٤.

٤. پەیمان ل ٢٤ تیرمەها ١٩٢٣ێ د ناڤبەرا دەولەتێن هەڤپەیمان ( بریتانیا، فرەنسا، ئیتالیا، ژاپون) ژ لایەکی و ترکی ژ لایێ دیڤەهاتە گریدان، دووڤ دەڤێن پەیمانێ برگەیێن گرێدای ئوتۆنومی و سەرخۆبوونا کوردان ژ پەیمانا سیڤەر١٩٢٠ێ هاتنە ژبە ربرن. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: بیار مصطفى سيف الدين، تركيا و كوردستان العراق" الجارين الحائرين"، (اربيل- ٢٠٠٨)، ص ص ٥٧- ٨٣.

٥. فاضل حيسن(الدكتور)، مشكلة الموصل دراسة في الدبلوماسية العراقية- الانكليزية- التركية و في الرأي العام، (بغداد- ١٩٦٧)،ط ٢، ص ص ٢٨- ٥٠؛ محمد صالح زيباري، تقرير لجنة التحقيق الدولية حول ولاية الموصل ملاحظات و استنتاجات تأريخية، مجلة مه تين العدد ٧٠، تشرين الثاني ١٩٩٧، ص ص ١٣٢- ١٣٣.

٦. لیژنە ژ، أم.دي فيرسن، وەزیرێ کەڤنێ کەرتێ دبلوماتیکێ سویدی هەڤالێن وی ئەو بۆ سەرۆکاتیا لیژنێ هەلبژارد، چنکو وەلاتێ وی پشکداری جەنگێ جیهانیا ئێکێ نەبووبوو، هەروەسا سەرهەنگێ خانەنشین باولس یێ بەلجیکی، پشکداری د جەنگێ جیهانیا ئێکێ دا کربوو، زێدەباری زانایێ جوگرافیێ هنگاری کونت پول تیلکی. ينظر: جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٦٣- ٤٦٤ .

٧. فاضل حسين (الدكتور) ، ژێدەرێ بەرێ ٥٤.

٨. فاضل حسين (الدكتور) ، ژێدەرێ بەرێ،، ص ٦٠.

٩. خليل مصطفى عثمان الاتروشي ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٥.

١٠. سروة اسعد صابر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٩٧، جمید شکری، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٦.

١١. عبدالعزيز، مذكرات عبدالعزيز القصاب، اعداد وتحقيق : الدكتور خالد عبدالعزيز القصاب، (بيروت – ٢٠٠٧)ص ص٢٩٣-٢٩٦.

١٢. فاضل حسين (الدكتور) ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٢

١٣. هەر ژ سالا ١٩١٩ێ هاریکارێ سەرپەرشتێ کارگێری یێ مووسلێ بوو.بنێرە : جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٦٧.

١٤. ئێك ژ سەرکردێن تورکە ل سالا ١٩٢٠ێ ژ لایێ هەڤپەیمانان ڤەهاتەگرتن و سالا د دووڤدا هاتە بەردان، گەهشتە کەمال ئەتاتورکی. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٦٦.

١٥. ئەفسەرەکێ کەڤنە د سوپایێ ئوسمانی دا، کوردە ژ هەولێرێ، چەندین جارا بوویە وەزیر، هەروەسا بۆ چەندین خۆلان وەکو نوونەرێ هەولێری د جڤاتا نوونەرێن عیراقی دا بوویە نوونەر. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ،، بپ٤٦٧.

١٦. سروه اسعد صابر، ژێدەرێ بەرێ،، بپ بپ ٢٩٩- ٣٠١؛ جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ،بپ ، ٤٤٦- ٤٤٧؛ خليل مصطفى عثمان الاتروشي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٧.

١٧. فاضل حسين (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ،، ص ٦٦.

١٨. سروه اسعد صابر، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٣٠٠.

١٩. جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٤٥٦.

٢٠. هەمان ژێدەر، بپ ٣٥٥- ٣٥٦.

٢١. جريدة (العراق)، العدد (١٤٨١)، ١٨ اذار ١٩٢٥

٢٢. فاضل حسين، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٧ ؛ جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٥٥- ٤٥٦ ؛ سروة اسعد صابر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٠٠ ؛ ولاية الموصل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٧.

٢٣. جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٥٦.

٢٤. سى.جى. ادموندز ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٧٩.

٢٥. بۆ پتر پێزانینان ل سەر سەرهلدانا شێخ سەعیدێ پیران بنێرە: عثمان علی (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، ص ص ٤٧١- ٥١١.

٢٦. وصفية محمد شيخو، زاخو في العهد الملكة ١٩٢١- ١٩٥٨ (دراسة تأريخية في اوضاعها العامة) رسالة ماجستير غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية التربية بجامعة زاخو، ٢٠١٢-، ص ١٩٩.

٢٧. هەمان ژێدەر، بپ ١٩٩.

٢٨. د.ك. و (دار الكتب والوثائق العراقية) ملف تقارير عن شمال ووسط كردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد ١٨١٥ في ١٩٢٥/٧/٦ الى مستشار وزارة الداخلية .

٢٩. سى.جى. ادموندز، ژێدەرێ بەرێ،، ص ٣٧٩

٣٠. جريدة العراق، العدد١٤٨١ في ١٩٢٥/٣/١٨.

٣١. جريدة العراق، العدد ١٤٨٢ في ١٩٢٥/٣/١٩.

٣٢. جريدة العراق، العدد ١٤٨٥ في ١٩٢٥/٣/٢٣؛ سى.جى. ادموندز، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٣٧٨؛ جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٣٨٠.

٣٣. سى.جى. ادموندز، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٨٠.

٣٤. سى.جى. ادموندز، ژێدەرێ بەرێ،، ص ٣٨١؛ عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، دراسات و مباحث في تأريخ الكورد و العراق المعاصر، دار سبيريز للطباعة و النشر، (اربيل- ٢٠٠٧)، ص ١٨٩.

٣٥. جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ،، ص ٣٦٤.

٣٦. سى.جى. ادموندز، ژێدەرێ بەرێ،، ص ٣٨١.

٣٧. د.ك..و، ملف تقارير عن شمال و و سط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد س/١٥٣٥ في ١٩٢٥/٦/١٧ الى مستشار وزارة الداخلية.

٣٨. سى.جى. ادموندز، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٨١. ل ٢٥ كانوونا دووێ ١٩٢٥ێ كۆمەلەیەك ژ ئالیێ سەرۆكعەشیرەت و كەسایەتیێن باژێری ژ بۆ بەرگریێ ژ مووسلێ هاتەدامەزراندن و لیژنەكا كارگێرییا پێكهاتی ژ هەریەك ژ ئەحمەد فەخری، حەبیب ئەلعوبەیدی و مستەفا سابونچی و هندەكێن دی ژ بۆ سەرپەرشتییا وێ هاتە هەلبژارتن، پاشتر لقێن كۆمەلەیێ ل قەزایێن كوردی و هندەك گوندێن گرنگ ژێ هاتەدامەزراندن. بۆ پتر پێزانینان بۆ زانیاریێن بەرفرەهـتر بنێرە: عبدالعزیز القصاب، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٢١٧؛ جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٤٤٣.

٣٩. جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٥٦.

٤٠. د. ك. و،ملف تقارير عن شمال وو سط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الكوصل السرية، العدد ٤٩٠ في ١٩٢٥/٦/٢٣، العدد١٧٩٣ في ١٩٢٥/٦/٢٢، العدد ١٣٢٨ في ١٩٢٥/٧/١٢ الى مستشار وزارة الداخلية.

٤١. هاتيیەوەرگرتن: سى. جى. ادموندز، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٣٨٢.

٤٢. عبدالعزیز القصاب، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٢٢٧؛ جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٤٥٦.

٤٣. د. ك. و، ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد س/١٣٠٣ في ١٩٢٥/٦/٣الى مستشار وزارة الداخلية.

٤٤. د. ك. و، ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، تقرير المفتش الأداري للواء الموصل، العدد ١٨١٥ في ١٩٢٥/٧/٦ الى مستشار وزارة الداخلية.

٤٥. د. ك. و، ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، تقرير المفتش الأداري للواء الموصل، العدد ١٧٩٣ في

١٩٢٥/٦/٢٢ الى مستشار وزارة الداخلية.

٤٦. د. ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، تقرير المفتش الأداري للواء الموصل، العدد ١٧٧٠ في ١٩٢٥/٦/٨ الى مستشار وزارة الداخلية.

٤٧. سی.جی. ادموندز، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٨١.

٤٨. د. ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، تقرير المفتش الأداري للواء الموصل، العدد ١٧٩٣ في ١٩٢٥/٦/٢٢ الى مستشار وزارة الداخلية.

٤٩. پشتی چوونا حەجی شەعبانی و خێزانا وی بۆ توركی ل سالا ١٩١٩ێ و سێ سال بۆراندن و پاشی ڤەگەریا بازێرێ خۆ ئامێدیێ، لێ پشتی ماوەكێ كێم ژ ئەگەرێ روودانێن گرێدای ئامێدیێ یێن سالا ١٩١٩ێ حوكمەتا عیراقێ یاداشتەكا دەستەسەركرنێ بۆ دەرئێخست، لەورا حەجی شەعبانی دگەل هندەك كەسان ژ خێزانا خۆ ئامێدیێ هێلا و جارەكا دی بەرەڤ تركی چوون، هژمارا سالێن ل تركی بوراندین هەفت سالن، و كەمال ئەتاتوركی ب پارچەكا چەكی خەلاتكر ژ كەدا وی د شەرێ دژی ئینگلیزی دا. دیدارەكا تایبەت دگەل فائق ئەحمەد حەجی شەعبان ئامێدی ل دهۆكێ ل ٢٠١٠/٢/١ێ. سالا ١٩٤٣ێ ل ئامێدیێ ژ دایكبوویە و ل وێرێ چوویە خواندنگەهێ لێ خواندنا دواناڤنجی بداوی نە ئینا، ژ دەسپێكا شۆرشا كوردستانێ ل سالا ١٩٦١ هەتا ١٩٦٦ێ گەهشتە شۆرشێ، ئەندامێ پەرلەمانێ عیراقی ٢٠٠٥- ٢٠٠٦ بوو، خانەنشینە و نها ل دهۆكێ یە.

٥٠. دەربارەی هوشیاریا نەتەوەیی ل دەڤەرا بادینان ب گشتی كێمتربوو هەروەك سەرۆكێ لیژنێ ڤیرسن ئاماژە پێكری ژ ئەوا هەبی ل رۆژهەلات و باشووری رۆژهەلاتی كوردستانا عیراقێ، نەبەلاڤبوونا هزرێن نەتەوەیی د ناڤ كوردێن بادینان دا ژ نزمیا ئاستێ زانستی و خۆ سەپاندنا سەرۆك عەشیرەتان ب سەر كاروبارێن دەڤەرێ ئەوێن بەرژەوەند دگەل دەستەلاتێن بریتانی و عیراقی هەین، نەمازە بەرژەوەندێن ئابووری، لێ نابیت خافلبین ژ لیژنا كو برسیار ژ خەلكی نەدكر دەربارەی حەزكرنا وان بۆ سەرخۆبوونێ، لێ وەكو تێ زانین پرسیارێن لیژنێ دسنورداربوون ب حەزركرنا وان كو بگەهنە عیراقێ یان تركی. بنێرە: جرجیس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٨٠؛ جمید شكری، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٩.

٥١. فاضل حسین (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، ص ٦٧؛ محمد صالح زیباری، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٧

٥٢. جرجیس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٧٤؛ خلیل مصطفی عثمان الاتروشي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٨.

٥٣. عبدالرحمن البزاز، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٦؛ سروە اسعد صابر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣١٠.

٥٤. بۆ پتر پێزانینان ل سەر وان مهانەیان بنێرە: فاضل حسین (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٣- ١٣٠.

٥٥. عبدالرحمن البزاز، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٦؛ سروە اسعد صابر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣١٠.

٥٦. فاضل حسین (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٢.

٥٧. سروە اسعد صابر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣١٤.

٥٨. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩ ، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد س/١٥٣٥ في ١٩٢٥/٦/١٧ الى مستشار وزارة الداخلية.

٥٩. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، برقية متصرف الموصل، العدد ٤٩٨ في ١٩٢٥/٦/٢٥ الى وزارة الداخلية.

٦٠. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩ ، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد س/١٦٦١ في ١٩٢٥/٧/٣٠ الى مستشار وزارة الداخلية.

٦١. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩ ، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد ١٧٧٠ في ١٩٢٥/٦/٨ الى وزارة الداخلية.

٦٢. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩ ، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد س/١٤٢٩ في ١٩٢٥/٦/١١، العدد٢٥٤ في ١٩٢٥/٧/٥، العدد ٣٧٩٨ في ١٤/ ٧/ ١٩٢٥ الى وزارة الداخلية.

٦٣. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد ١٨٢٨ في ١٩٢٥/٧/١٣ الى وزارة الداخلية.

٦٤. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد ١٨٣٢ في ١٩٢٥/٧/١٥ الى وزارة الداخلية.

٦٥. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد ١٥٣٠ في ١٩٢٥/٦/١٧، العدد١٧٩٩ في ١٩٢٥/٦/٢٩ الى وزارة الداخلية.

٦٦. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد ١٤٤١ في ١٩٢٥/٦/١٣، العدد١٨١٥ في ٦ د.ك. و في ٧/٦ /١٩٢٥ الى وزارة الداخلية.

٦٧. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد ١٨١٥ في ١٩٢٥/٧/٦، العدد١٨٣٥ في ١٩٢٥/٧/١٢ الى وزارة الداخلية.

٦٨. د.ك. و. ملف تقارير عن شمال ووسط كوردستان، رقم الملف ٤٩، مذكرة المفتش الأداري للواء الموصل السرية، العدد ١٨٣٥ في ١٩٢٥/٧/١٢، العدد١٩٣١ في ١٩٢٥/٧/١٧ الى وزارة الداخلية.

٦٩. فاضل حسين (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٦؛ جمید شكری، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٩.

٧٠. جرجيس فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، ص ٦٧٧؛ محمود شيخ سين حسو الريكاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٤- ٥٥؛ محمد صالح زيباري، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٠.

٧١. فاضل حسين (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٦؛ هنری فوستر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٧٨.

٧٢. سروه اسعد صابر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣١٤؛ محمود شيخ سين حسو الريكاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٥.

٧٣. د.ك.و. وزارة الداخليه، ملف الحدود العراقية التركية ١٩٢٥- ١٩٢٦، رقم الملف ٨٤٨٤/ ٣٢٠٥٠، كتاب متصرفية الموصل،العدد ٩٨٧٧ في ١٩٢٥/١٢/٢٨ الى وزارة الداخلية.

٧٤. ل سالا ١٨٥٧ێ ل باژێرێ ئامێدیێ ژ دایكبوویە، ژبەر شارەزاییا وی یا بەرفرەهـە د زانستێن دینی دا ب (مەلا محەمەد) ناڤداربوو، زێدەباری زمانێ كوردی زمانێن عەرەبی، تركی و فارسی دزانین، دهێتە هژمارتن یەكەم سەرۆك باژێرڤانی ل ئامێدیێ پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ، سالا ١٩٢٨ێ وەغەركرییە. بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور) و زەڤەر مظفر سليمان، ملف ئاميدی (العمادية)، مجلة دهوك، العدد٤، اب ١٩٨٨، ص ٨٣.

٧٥. د.ك. و. وزارة الداخلية، ملف الحدود العراقية التركية١٩٢٥- ١٩٢٦، رقم الملف ٣٢٠٥٠/٨٤٨٤، كتاب متصرفية الموصل، العدد ٩٨٧٧ في ١٩٢٥/١٢/٢٨الى وزاره الداخلية.

٧٦. د.ك. و. وزارة الداخلية، ملف الحدود العراقية التركية١٩٢٥ - ١٩٢٦، رقم الملف ٣٢٠٥٠/٨٤٨٤، كتاب متصرفية الموصل، العدد ٩٨٧٧ في ١٩٢٥/١٢/٢٨الى وزارة الداخلية.

٧٧. د.ك. و. وزارة الداخلية، ملف الحدود العراقية التركية١٩٢٥- ١٩٢٦، رقم الملف ٣٢٠٥٠/٨٤٨٤، كتاب متصرفية الموصل، العدد ٩٨٧٧ في ١٩٢٥/١٢/٢٨الى وزارة الداخلية.

٧٨. د.ك. و. وزارة الداخلية، ملف الحدود العراقية التركية١٩٢٥- ١٩٢٦، رقم الملف ٣٢٠٥٠/٨٤٨٤، كتاب متصرفية الموصل، العدد ٩٨٧٧ في ١٩٢٥/١٢/٢٨الى وزارة الداخلية.

٧٩. د.ك. و. وزارة الداخلية، ملف الحدود العراقية التركية١٩٢٥- ١٩٢٦، رقم الملف ٣٢٠٥٠/٨٤٨٤، كتاب متصرفية الموصل، العدد ٩٨٧٧ في ١٩٢٥/١٢/٢٨الى وزارة الداخلية.

٨٠. د.ك. و. وزارة الداخلية، ملف الحدود العراقية التركية١٩٢٥- ١٩٢٦، رقم الملف ٣٢٠٥٠/٨٤٨٤، كتاب متصرفية الموصل، العدد ٩٨٧٧ في ١٩٢٥/١٢/٢٨الى وزارة الداخلية.

٨١. د.ك. و. وزارة الداخلية، ملف الحدود العراقية التركية١٩٢٥- ١٩٢٦، رقم الملف ٣٢٠٥٠/٨٤٨٤، كتاب متصرفية الموصل، العدد ٩٨٧٧ في ١٩٢٥/١٢/٢٨الى وزارة الداخليه.

٨٢. فاروق صالح العمر (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٠؛ احمد رفيق البرقاوي، العلاقات السياسية بين العراق و بريطانيا ١٩٢٢- ١٩٣٢، دار الرشيد للنشر، (بغداد- ١٩٨٠)، ص ١٠٠؛ خليل مصطفي عثمان الاتروشي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٤.

٨٣. غانم محمد الحفو (الدكتور) و عبدالفتاح على البوتانى (الدكتور) ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥. ئەڤ پەیمانا نوی یا گرێدای بوو دگەل پەیمانا سێ قۆلی یا د ناڤبەرا عیراق و بریتانیا و تركی دا هاتیە گرێدان و ل ٥ خزیرانا ١٩٢٦ێ وواژۆ ل سەر هاتەكرن، تێدا تركی دانپێدان ب دەولەتا عیراقێ كر و عیراقێ ب سەفقەكا سەركەفتی زانی، هەروەسا لیژنەكا بەردەوام د ناڤبەرا عیراق و تركی بۆ چاڤدێریكرنا سنووری هاتە پێكئینان. بنێرە: غانم محمد الحفو (الدكتور) و عبدالفتاح علي البوتاني(الدكتور) ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥- ٢٦- محسن محمد متولي، كورد العراق منذ الحرب العالمية الاولى ١٩١٤ حتى سقوط الملكية ١٩٥٨، دار العربية للموسوعات ، دار ، (بيروت- ٢٠٠١)، ص ١٣٠.

٨٤. فاروق صالح العمر (الدكتور)، المصدر السابق، ص ١٥٨. ژ بەر کاودانێن کوردستان وی دەمی تێدا دەربازدبوو، هەروەسا پێرابوونێن حوکمەتا عێراقێ ب پشتەڤانیا بریتانیا د گڤاشتنا لیوایێن کوردی دا، پەیمانێ چ دژکارێن توند ژ لایێ کوردان نەبوون. ینظر: خليل مصطفي عثمان الاتروشي، المصدر السابق، ص ١٢٧.

٨٥. لایەنێ عیراقی دلیژنێ دا پێکهاتیبوو ژ موتەسەرفێ لیوا مووسل ناجی بەگ و سەرپەرشتێ وێ یێ کارگێری مستەر گاردین و قایمقامێ قەزا ئامێدیێ عهبد لحەمید عەبدلمەجید و قایمقامێ زاخۆ، لایەنی ترکی یێ پێکهاتیبوو ژ والیێ جولەمێرگێ و بریکارێ تیپا دوو یا ترکی، جريدة العراق، العدد ١٩٨٤، في ١١/٥/ ١٩٢٦؛ جريدة العراق، العدد ١٩٣٩ في ١٩٢٦/٩/١٣.

٨٦. جريده العراق، العدد ١٠٣٥ في ١٩٢٦/٩/٨.

٨٧. جي. كيلبرت براون، قوات الليفي العراقية ١٩١٥- ١٩٣٢، ترجمة، الدكتور مؤيد ابراهيم الونداوي، مؤسسة ژين، (السليمانية-٢٠٠٦)،ص ص ١٢١-١٢٣.

٨٨. ناڤێ وێ (سرما دبيت مارشەمعون)ە، ل سالا ١٨٨٣ێ ل گوندێ قوجانس ل دەڤەرا هەکاریا ژ دایکبوویە، مەزنترین کچا خێزانا ژ هەشت زارۆکان پێکهاتی بوو، ژێ خۆ بۆ پەروەردەکرنا خووشك و برایێن خۆ تەرخانکر و خودانا دەستەلاتێ بوو د خێزانا بەترپارکی دا، ل سەر دەستێ سەرۆکێ ئەسقوفێ کانتربری فێربوویە، سرما کەساتیەکا بهێز و رەوشەنبیر بوو، نوونەراتیا ئاشوریان د کونگرێ ئاشتیێ ل پاریس سالا ١٩١٩دا کریبە، سالا ١٩٧٥ێ وەغەرکریبە. بنێرە: عدنان زيان فرحان، السياسة البرطانية تجاه الاقليات الدينية في العراق١٩٢١ – ١٩٤١، اطروحة دكتوراه غير منشورة مقدمة الى مجلس كلية الاداب جامعة دهوك، ٢٠٠٩، ص ٤٨ .

٨٩. جي. كيلبرت براون، المصدر ب السابق، ص ص ١٢٣- ١٢٤.

٩٠. هەمان ژێدەر، بپ ١٢٥ .

٩١. دیدارەکا تایبەت ل گەل مەعسوم ئەنوەر مایی ل دهۆکێ رێکەفتی ٢٠١٠/١/٢٦ێ. سالا ١٩٣٨ێ ل گوندێ مایێ ژ دایکبوویە، ل سالا ١٩٤٥ێ چوویە خواندنگەهێ ل گوندێ بێدوهی پاشی کانی ماسێ، خواندنا ناڤنجی ل مووسلێ و ئامادەیی ل دهۆکێ تمامکریە، ل سالا ١٩٥٧ێ ل بەغدا چوویە خۆلەکا پەروەردەیی، ل سالا ١٩٥٨ تا سالا ١٩٦١ێ ل گوندێ بێدوهێ وەکو ماموستا هاتیە دامەزراندن، ب تاوانا هاندانا عەشیرەتان هاتە گرتن و تا خزیرانا ١٩٦٣ێ د زیندانێ دا ما، ل سالا ١٩٥٧ێ پەیوەندی ب (پارتی) کر و ژ گولانا ١٩٦٣ تا خزیرانا ١٩٦٤ێ بو ئەندامێ لیژنا ئامێدیێ، پاشی چوو بەغدا و کارێ فێرکرنێ کر، ئەندامێ سکرتاریەتا سەندیکا مامۆستایانە ١٩٧١- ١٩٧٥ێ، سالا ١٩٧٠ێ چوو کولیژا ئادابێ و ل سالا ١٩٧٦ێ ژێ دەرچوو، دناڤبەرا سالێن ١٩٧٨- ١٩٨٨ کارێ فێرکرنێ کریبە، نها خانەنشینە و ل دهۆکێ دژیت.

٩٢. جريدة العراق العددين ١٩٣٩ و ١٩٨٤ في ١٩٢٦/٩/١٣ و ١٩٢٦/١١/٥ ل دووڤ یەك.

# بزاڤا شێخ ئەحمەدێ بارزانی

پ. د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

پشتی سێدارەدانا شێخ عەبدولسەلامێ بارزانی شێخ ئەحمەد (١٨٩٦- ١٩٦٩)ێ سەرکردایەتیا دەڤەرا بارزان گرتەدەست، پشتی کو بریتانیا عیراق داگێرکری، دەستەلاتێ وی هێژ بەرفرەهتر لێ هات، بارزان دەڤەرا ئێکانە بوو یا مایە ل دەرڤەی دەستەلاتێ کارگێریا بەریتانییان ل عیراقێ، چالاکیێن سیاسی و لەشکەریێن شێخ ئەحمەدی دەسپێکر دەمێ هێزەك ژ شەرڤانێن بارزان ل سالا ١٩١٩ێ هنارتییە هاریکاریا شێخ مەحموودێ بەرزنجی ل سلێمانیێ و ناڤتێدانا هندەك سەرۆك عەشیرەتان کری داکو پشتەڤانیێ ل سەرهلدانا شێخ مەحموودی بکەن، بەلێ پرانییا وان سەرۆکعەشیرەتان ئەو نامەیە دانە دەست فەرمانداریێ سیاسیێ بەریتانی ل مووسلێ، هەروەسان ل ٤ چریا ئێکێ ١٩١٩ێ بێل فەرمانداریێ سیاسیێ بەریتانی ل دەڤەرا ئاکرێ و هاریکارێ وی سکوت ب ناڤتێدانا شێخ ئەحمەدی هاتنەکوشتن، هەر دوێ سالێدا شێخ ئەحمەدی کۆمەکا داخوازان پێشکەشی بەغدا کرن کو تێدا خواستبوو بەغدا ئیعترافێ ب کارگێریا خۆیا دەڤەرا بارزان بکەت خواندنگەها لێ ئاڤاکەت و جادەیان بگەهینتە دەڤەرێ.

چالاکیێن شێخ ئەحمەدی بوونە ئەگەرێ مەترسیا دەستەلاتێ داگیرکەرێ بریتانی، ل مەها گولانا ١٩٢٩ێ فەرمانداریێ لەشکەرگەهێ غەزلانیێ مووسلێ هوشداری دا حکۆمەتێ کو شێخ ئەحمەد دێ بزاڤەکێ دژی حکۆمەتێ کەت، و شێخ ئەحمەد بەردەوام یێ نامەیان ل دۆر سەربەخۆیا کوردان ژ دەڤەرێن زاخۆ و رەواندزێ وەردگریت، د راپۆرتەکا دی یا بەریتانیدا ل ٢٢ شباتا ١٩٣٠ هاتییە: کو وی داخوازنامەیەك (مضبطة) ل دۆر مافێن کوردان دایە حکۆمەتا عیراقێ و دناڤبەرا عەشیرەتاندا بەلاڤکرییە. هەروەسان ئاماژە ب شێخ ئەحمەدی هاتییەکرن کو وی پەیوەندی دگەل کۆمەلەیا (پشتیوانی کوردان) هەنە و ئەو وەك سەرۆکێ کۆمەلەیێ ل دەڤەرا عەشیرەتێن کوردان یێن مووسلێ هاتییە دەسنیشانکرن و پەیوەندیێن وی دگەل عەشیرەتان د بەردەوامن، زێدەباری هاریکاریا وی بۆ شۆرشا ئیحسان نوری پاشای ل چیایێ ئاگری و هەڤسوزیا وی دگەل کوردێن ترکیا[1]. زێدەباری ڤێ هەمیێ بەرچاڤ وەرنەگرتنا داخوازێن کوردان د پەیمانا ١٩٣٠یدا هاندەرەکێ دیترێ بزاڤا شێخ ئەحمەدی بوو.

ئەڤ گوهۆرین و چالاكیێن سیاسی هاندەربوون كو دەستەلاتدار بەرهەڤیێ بۆ ب داویئینانا دەستەلاتێ شێخ ئەحمەدی بكەن، بەری دەست ب هێرشێ بۆ سەر بارزان بكەن ل مەها حزیرانا ١٩٣١ێ ژێ خواستن بێی هیچ مەرجەك خۆ رادەستی دەولەتێ بكەت، ب مەرەما نەهێلانا ترسا حكۆمەتێ و پێككرن و د هەڤدو گەهشتنێ شێخ ئەحمەدی دەسپێشخەرییەك كر و برایێ خۆیێ بچووك مەلا مستەفایێ بارزانی ژ پێش خۆڤە ل ٢٨ ئەیلوولا ١٩٣١ێ هنارتە مووسل و بەغدا، بەلێ ئەڤ كارە دگەل ئارمانج و بەرژەوەندیێن حكۆمەتا عیراقێ كو پشتگەرما دەستەلاتێ بەریتانی بوو نە دگونجا.

گرنگ ل ڤێرێ ئەوە هێزێن عیراقێ ب پشتەڤانییا هێزا ئاسمانیا بریتانی هێرش برنە سەر بارزان و شیان ل ١٨ گولانێ دەڤەرا بارزان داگیربكەن، بەلێ ڤێ هیرشێ بەرخوەدان ب داوی نەئینا، لەوما ل داوییا مەها گولانێ حكۆمەتێ شێخ نوریێ بریفكانی هنارتە بارەگایێ شێخ ئەحمەدی داكو وی رازی بكەت دانوستاندنێ بكەت، ئەو ژی ب ڤێ چەندێ رازیبوو، ب مەرجەكی دانوستاندن دووری بارەگایێن لەشكەرێ دەولەتێ بێنەكرن و هندی وی بڤێت چەكداران دگەل خۆ بینتە جهێ دانوستاندنێ، بەلێ حكۆمەت ب ڤان مەرجێن شێخ ئەحمەدی رازی نەبوو، شێخ ئەحمەدی ل دۆر ڤێ چەندێ گۆتە شێخ نوریێ بریفكانی: ئەگەر ئەم دەستا ژ چەكێن خۆ بەردەین ئەو بەلاخۆ ژ مەڤە ناكەن، وان بێ ماف و را و بۆچوون ئەم دڤێین، ئەو داگیركەرێن وەلاتێ مەنە[٢].

پشتی زڤرینا شێخ نوری فرۆكەیێن بەریتانی دەست ب بۆمبابارنكرنا هەر تشتەكی كر یێ ل دەڤەرا بارزان بەرچاڤێن وان دكەفت[٣]. شێخ ئەحمەد و گەلەك ژ شەرڤانێن وی ناچار بوون ل ٢٢ حزیرانا ١٩٣٢ێ پەناببەنە بەر تركیا و ل مەها تەباخا ١٩٣٢ێ حكۆمەتا تركیا ئەو زڤراندنەڤە عیراقێ و ل مووسلێ هاتنەنیشتەجێكرن و پاشتر هاتنەڤەگوهاستن بۆ ناصریێ و ژ وێرێ بۆ حلە و ژ وێرێ بۆ دیوانیێ ل باشوورێ عیراقێ، دووڤرا هاتنە ڤەگوهاستن بۆ بازێرێ سلێمانیێ[٤].

پشتی سەركوتكرنا بزاڤا شێخ ئەحمەدی بۆ یەكەمین جار شاهێ (مەلكێ) عیراقێ فەیسەلێ یەكەم ل ١٦ تەباخا ١٩٣٢ێ سەرەدانا كەركووكێ و مووسلێ و هەولێرێ كر بۆ دەمێ رۆژەكێ ما ل جندیان نێزیكی رەواندزێ.

قەزا ئاكرێ ژ بەر نێزكیبیا وێ ژ جهێ روودانان ئێك ژ تەوەرێن سەرەكیێن فشارا لەشكەری بوو بۆ سەر بارزان، خەلكێ ئاكرێ هەڤسۆزی دگەل بزاڤا بارزان هەبوو و پشتەڤانی لێ دكر، ئەڤ هەڤسۆزییە ل ئاستەكێ بوو نوونەرێ دەڤەرا ئاكرێ د جڤانا نوونەرێن عیراقێدا هیبەتوللا مفتی ل گولانا ١٩٣٣ێ داخواز ژ دەستەلاتدارێن عیراقێ كر گرنگی ب بارزان بێتەدان ئەو ژی ب رێكا كارگێرییەكا رێك و پێك ل دەڤەرا وان، بەلێ د بەرامبەردا پرانییا سەرۆكعەشیرەتێن دەڤەرێ دژی بزاڤا شێخ ئەحمەدی راوەستان و پشتەڤانی ل هێرشێن حكۆمەتێ بۆ ژناڤبرانا بزاڤێ كرن[٥].

ئامێدیێ تەوەرێ رۆژئاڤایێ هێرشان بوو بۆ سەر بزاڤا بارزان ئەڤە ژی ب پشتەڤانییا هژمارەكا سەرۆكعەشیرەتان، د بەرامبەردا شێخ ئەحمەدی حەجی تەهایێ عەبدولعەزیزێ ئامێدی راسپاردبوو ل بەرۆكا بالندا بەرسنگێ هێزێن حكۆمەتێ بگریت، هەژییە ل ڤێرێ بێژین هندەك ژ مالباتا حەجی تەهای و عەبدولعەزیزی (كتانی) گەهشتبوونە رێزێن بزاڤا بارزان، پەنا بربوو بەر تركیا و پشتی شكەستنا بزاڤا شێخ ئەحمەدی هاتبوونە سەرگونكرن بۆ ئەرزرۆمێ[٦].

هەرچەندە زاخۆ یا دووربوو ژ روودانێن بزاڤێ، بەلێ خەلكێ زاخۆ هەڤسۆزی د گەل بزاڤێ هەبوو هەروەك بەریا وی دەمی هەڤسوزی دگەل بزاڤێن شێخ مەحموودێ بەرزنجی هەی و راپۆرتێن بەریتانی و عیراقی ژی ئەو چەند پشتراستكرییە كو بەردەوام نامە ل دور مزارا سەربەخۆییا كوردان ژ دەڤەرا زاخۆڤە دگەهشتنە شێخ ئەحمەدی. و دەمێ شێخ ئەحمەد د رێكا زاخۆرا زڤریەڤە عیراقێ، خەلكێ زاخۆ و رێڤەبەریا وێ ب گەرمی پێشوازی ل وان كر و بەری كو ل تەباخا ١٩٣٣ێ بەرەڤ مووسلێ بچن پێویستیێن چوونێ بۆ وی و هەڤالێن وی دابینكرن[٧].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: صديق عثمان محو، العامل الخارجي و دوره في اخماد الأنتفاضات الكردية و دور بريطانيا في اخماد انتفاضتى بارزان الأولى و الثانية ١٩٣١- ١٩٤٥ نموذجا، (اربيل- ٢٠١٠)، ص ١٢٣- ١٢٧.

٢. زبير بلال اسماعيل، ثورات بارزان ١٩٠٧- ١٩٣٥، (اربيل- ١٩٩٨)، ص ١٢٥.

٣. هەمان ژێدەر، بپ ٢٥- ٢٦.

٤. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: سروة اسعد صابر، كوردستان الجنوبية....، ص ٢٣١- ٢٥٠.

٥. جمبد شكرى، ئاكرێ (عقرة) في العهد الملكي، (اربيل- ٢٠٠٨)، ص ٢١٨- ٢١٩.

٦. رجب جميل، ئامێدى (العمادية) ١٩٢١- ١٩٧٥ دراسة في التأريخ السياسي، (دهوك- ٢٠١٢)، ص ٩٥- ٩٦.

٧. وصفية محمد.. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٣٨.

# بزاڤا ئاسووریيان

**پ. د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی**
**وەرگێران: موسەدەق تۆڤی**

ئاسووری کۆمەکا عەشیرەتێن مەسیحیێن نەستوورییێن جیایینە ل دەڤەرێن جودایێن کوردستانێ دژیان، گرنگترینێ وان دەڤەرا: دەڤەرێن هەکاری و ئۆرمیێ و بادینان، د سالێن شەرێ جیهانیێ یەکەم(١٩١٤- ١٩١٨)دا پشتەڤانی ل بریتانیا کر، لەوما ژی دەولەتا ئوسمانی ل دەڤەرا هەکاری هێرش برە سەر وان و ناچاربوون ل مەها تەباخا ١٩١٨ێ پەنابیننە بەر عیراقێ و ل کەمپەکا بریتانییان ل باژێری بەعقوبە نێزیکی رووبارێ دیالا ئاکنجی بوون، هژمارا وان نێزیکی ٣٥ هزار کەسان بوو، بریتانیا ئەو کرنە د رێزێن لەشکەرێ لیفي دا[1]. پشتی ب داویهاتنا شەرێ جیهانیێ یەکەم بریتانیا رازی نەبوو رێکێ بدەتە وان بزڤرنەڤە دەڤەرا هەکاری، پشتی کو ئاریشا مووسلێ د بەرژەوەندیا عیراقێ دا ب داویهاتی دەستەلاتێ داگیرکەرێ بریتانیا بریاردا وان ل کوردستانێ ب تایبەت ل دەڤەرێن زاخۆ و ئامێدیێ و ئاکرێ نیشتەجێبکەت[2] .

سەرکردایەتیا ئاسووریيان شیا دۆزا ئاسووریيان بکەتە د بەرنامێ کارێ کۆما مللەتاندا، بەلێ ل دووڤ داخوازا وان نەهات، هەر وێ سەرکردایەتیێ د ناڤبەرا ١٥- ١٦ حزیرانا ١٩٢٢ێ کۆنگرەك ل سەرێ ئامێدیێ گرێدا و د ئەنجامدا کۆمەکا داخوازان پێشکەشی دەستەلاتداریا داگیرکەرا بەریتانی کرن و گرنگترینێن وان داخوازان: باوەرپێنان ب ئاسووریيان وەك مللەتەکێ ئاکنجیێ عیراقێ، وان بزڤرینەڤە دەڤەرا هەکاری، ئەگەر ئەو نەزڤراندنەڤە وەلاتەکی بۆ وان ل کوردستانێ دروستکەن کو دەڤەرێن زاخۆ و دهۆك و ئاکرێ و ئامێدیێ ب خۆڤە بگریت و ئەو دەڤەر مینا لیوایەکێ (پارێزگەهەکێ) بیتن سەر ب مووسلێ ڤە و مەلبەندێ وێ دهۆك بیتن، بەریتانا ب ڤان داخوازان رازی نەبوو و ئاسووریيان ژی ئەڤ هەلویستێ بەریتانییان ب خیانەت دانیاسین[3].

پشتی عیراق بوویە ئەندام د کۆما مللەتاندا پەیوەندیێن ناڤبەرا وێ و ئاسووریيان ئالۆزبیان، ئەڤ ئالۆزبیە گەهشتنە بکارئینانا چەکی، ل مەها گولانا ١٩٣٣ێ ل دەڤەرا دهۆکێ ئاسووریيان دەست ب بزاڤەکێ دژی حکومەتێ کر، ب چەکێ خۆڤە هاتنە د ناڤ باژێریدا و قەبێ قائیمەقامێ دهۆکی مەکی صدقی ئەلشەربەتی خواست، تێلێن تەلەفونا ناڤبەرا مووسل و دهۆکێ برین و دەست ب سەر

ئاڤاهیێ حکۆمەتێدا داگرت، ل ١٩ حزیرانا ١٩٣٣ێ نێزیکی ٢٠٠ چەکدارێن ئاسووری دەست ب سەر جادا ناڤبەرا دهۆك- ئامێدیێ دا گرت، قائمەقامێ ئامێدیێ ماجد مستەفای ئاگاداریەك دا وان، بەلێ وەسان دیارە مفا نەدا لەوما فەرمانا خرڤەبوون و ئامادەباشیێ ل دهۆکێ دانە هێزێن لەشکەرێ عیراقێ، هێزێن لەشکەری ل دەڤەرا بادێ ناڤبەرا دهۆك و زاویتە خرڤەبوون و هێزەکا پولیسان ژی ل نێزیکی ئامێدیێ کۆمبوو، هێزێن حکۆمەتا عیراقێ رێکێن لڤینی ل بەر ئاسووریان ل ئامێدیێ و دهۆك و شێخان گرتن و ب خۆ بدەستڤەدانا سەرکردێ ئاسووریان یاقو مەلك ئیسماعیل ل رۆژا ٢٦ حزیرانێ بزاڤا وان ب داویهات بەرامبەر هندی کو کەسەك نێزیکی وی نەبیت و وی ژی پەیمان دا تەناهیێ تیك نەدەت(٤).

ل ٢٠ تیرمەها ١٩٣٣ێ ئاسووریێن نەئالیگرێن حکۆمەتا عیراقێ بریاردان بەرەف سوریێ کوچبکەن، ب چەکێن خۆڤە بەرەف دەڤەرا پێشابوورێ چوون، ژ رووبارێ دیجلە بەرەف ناڤ خاکێ سوریێ دەربازبوون و هژمارا وان گەهشتە ١٣٠٠ کەسان، پرانیا وان ئاسووریێن هەردو قەزایێن دهۆکێ و ئامێدیێ بوون، ڤان کەسان خێزانێن خۆ دگەل خۆ نەبربوون بەلکی هێلابوونە ل سەر گوندێن خۆ، حکۆمەتا عیراقێ ئەڤ کریارە ب گەف ل سەر سەروەریا عیراقێ دا نیاسین و هێزێن خوێێن لەشکەری ل ئالیێ چەپێ یێ رووبارێ دجلە کۆمکرن، حکۆمەتێ بریارەك دەرێخست کو نابیت ئاسووریێن عیراقێ دەربازبینە ناڤ خاکێ سوریێ و گەف ل هەرکەسەکی کرن یێ ناڤتێدانا ڤێ کریارێ بکەت. ژ بۆ دیتنا چارەیەکێ بۆ ڤێ ئاریشەیێ بریاردان کۆبوونەك د ناڤبەرا نوونەرێن حکۆمەتا عیراقێ و دەستەلاتداریا داگیرکەرا فەرنسا ل سوریێ بێتەئەنجامدان، ل ٢٦ێ تیرمەهێ ئەو کۆمبوون ل گوندێ خانکێ ناڤ خاکێ عیراقێ هاتەکرن، د کۆمبوونێدا فرەنسیان وەسان دیارکر کو



یاقو مەلك ئیسماعیل

ئەو ب بوونا ئاسووریان ل ناڤ سوریێ رازی نابن و دێ وان ب زۆری زڤرینینەڤە ناڤ خاکێ عیراقێ، عیراق ژی رازی نەبوو ئەو بزڤرنەڤە بێی کو چەکێ خۆ رادەست بکەن.

ب هەر رەنگەکێ هەبیت روودان بلەز کەتن و هژمارەکا فاکتەران بوونە ئەگەرێ هندێ ئاسووری ژ سوریێ بەرەف ناڤ عیراقێ بزڤرنەڤە و دگەل یەکەیێن لەشکەرێ عیراقی ل دەڤەرا پێشابوورێ بکەڤنە لێکدانێ، د ناڤبەرا رۆژێن ٤- ٧ تەباخا ١٩٣٣ێ چەند شەرەکان د ناڤبەرا هەردو ئالیان رووداـ، گرنگترین روودانا ڤان شەران ئەو بوو ئەوا ل گوندێ سێمێلێ روودای دەمێ هژمارەکا مەزنا ئاسووریان لێ کۆمبووین و هەتا ئێڤارا حەفتێ تەباخێ شەرەکی نەبەرامبەر د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا رووداـ، د ڤی شەریدا لەشکەرێ عیراقێ و هندەکان ژ عەشیرەتێن کوردێن ئالیگرێن حکۆمەتێ سەرەدەریەکا نە مرۆڤانە دگەل

ئاسووریان کر و دئەنجامدا ٤٨٠ زەلام و ٦ ژن و ٤ زارۆك ژێ هاتنەکوشتن[٥]. ڤێ کوشتارێ رایا گشتیا جیهانی و کۆما مللەتان دژی عیراقێ ئازراندن و حکۆمەتا عیراقێ لێبۆرین خواست و پەیمان دا کەسێن بەرپرس ژ روودانێ سزا بدەت و د هەمان دەمدا سەرکردێ ئاسووری مار شەمعون ب ئەگەرێ روودانێ تاوانبار کر و رەگەزنامەیا عیراقی ژ وی و خێزانا وی ستاند و ل رۆژا ١٨ تەباخا ١٩٣٣ێ ئەو سرگونی گزیرتا قوبرس کرن.

ئەوا جهێ سەرنجراکێشانێ کارگێریا مووسلێ ل رۆژا ٢٠ تەباخا ١٩٣٣ێ ب هەلکەتا سەرکوتکرنا بزاڤا ئاسووریان ژ ئالیێ لەشکەریڤە ئاهەنگەك گێرا و شاندێ ئامێدیێ یێ پیکهاتی ژ قائیمەقام ماجد مستەفا و ئەحمەدی حەجی رەشید بەگێ بەرواری و محمەد ئاغایێ بەرئاشی و میرخان ئاغایێ بارەمینکی و حەجی شەعبان ئاغایێ ئامێدی و ئەدیب ئەفەندی سەرۆکی باژێرڤانیا ئامێدیێ و ئیبراهیم ئاغایێ کورەمارکی و ژ ئاسووریان ژی مەلك زەیا و مەتران ماریولاها مەترانێ بەرواری بالا لێ ئامادەبوون[٦].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. بۆ پتر پێزانینان دەربارەی لەشکەرێ لیفی بنێرە: العمید جی. کیلبرت براون، قوات اللیفي العراقي ١٩١٥- ١٩٣٢، ترجمة و تحقیق مؤید ابراهیم الونداوي (الدکتور)، مراجعة رفیق صالح، السلیمانیة- ٢٠٠٦).

٢. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: ریاض رشید ناجي الحیدري، الاثوریون في العراق ١٩١٨- ١٩٣٦، (القاهرة- ١٩٧٧)، ص ٢٩٧- ٣١٥ ؛ براون، المصدر السابق، ص ١٩٨- ٢٠٢.

٣. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: یوسف مالك، الخیانة البریطانیة للاثوریین، ترجمة ایلیا یونان ایلیا، (دمشق- ١٩٩٥).

٤. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: الحیدري، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٢٣- ٣٢٨.

٥. بۆ پتر پێزانینا بنێرە: الحیدري، ....، بپ ٣٦٦- ٣٧٠ ؛ بۆ بەراوردکرنێ بنێرە: یوسف مالك، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٦- ١٥٤.

٦. رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٣- ٨٤.

# بزاڤا خەلیل خوشەڤی

پ. د. عەبدولفەتاح عەلی بوتانی
وەرگێران: موسەدەق توڤی

سەرەرای داگیرکرنا دەڤەرا بارزان و ویرانکرنا زۆربەی گوندێن وێ لێ بەرخودان ل دەڤەرێ ب داوی نەهات، شێخ محەمەد سەدیق و مەلا مستەفایێ بارزانی یێن خۆ رادەستی حکۆمەتێ نەکرین دگەل هژمارەکا چەکداران دەست ب کریارێن شەرێ (پارتیزانی) دژی بنگەهێن لەشکەر و پۆلیسان کر، هەر بۆ ڤێ مەرەمێ مەلا مستەفا چوو دەڤەرا شەمدینان و هاریکاری ژ عەشیرەتا گەردی وەرگرتن، دەمێ ل رۆژا ١٣ گولانا ١٩٣٣ێ حکۆمەتێ لێبۆرینەکا گشتی راگەهاندی مەلا مستەفایێ بارزانی زڤریڤە بارزان و پاشتر هاتەناچارکرن ل مووسلێ دگەل شێخ ئەحمەدی ئاکنجی ببیت، بەری مەلا مستەفا بزڤریتەڤە خەلیل خۆشەڤی کو لێبۆرنێ ژ وی نەدگرت راسپارد بەردەوامیێ ب بەرخودانێ بدەت، وی ژی بەردەوامی ب بەرخودانێ دژی لەشکەرێ عیراقێ دا و دەستەلاتدار ناچارمان ل رۆژا ٥ تەباخا ١٩٣٥ێ سەروبەرێ لەشکەری (الأحكام العرفية) ل دەڤەرا بارزان رابگەهینن، دەست ب ڤالاکرن و ڤەگوهاستنا گوندێن مایی کرن و ل مەها چریا دووێ ١٩٣٥ێ مالباتا شێخێن بارزان ژ مووسلێ بەرەف ناسریێ دوورئێخستن، ژبەرکو ڤێ مالباتێ پەیوەندی دگەل خەلیل خۆشەڤی هەبوون و هاریکاریا وی دکرن، حکۆمەتا عیراقێ ب ڤێ چەندێ تەنا نەبوو بەلکی داخوازا هاریکاریێ ژ حکۆمەتا ترکیا یا کو لەشکەرێ خۆ هنارتیە شەرێ خەلیل خۆشەڤی کر.

ب هەررەنگەکێ هەبیت هێزێن عیراقێ ب هاریکاریا هندەك خۆفرۆشێن کورد شیان خەلیل خۆشەڤی و شەرڤانێن وی ل دەڤەرا رێکان دوورپێچدەن و پشتی شەرەکی د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا خەلیل خۆشەڤی و چەند چەکدارێن وی ل رۆژا ١٣ ئادارا ١٩٣٦ هاتنەکوشتن[1].

ڤێ بزاڤێ هاریکاریێن مادی و مەعنەوی ژ دەڤەرا بادینان دەستڤە دئینان، د ڤی واریدا رۆلێ خەلکێ ئاکرێ د پێشکەشکرنا هاریکاری و پێدڤیان بۆ بزاڤێ یێ بەرچاڤبوو، د ئەنجامدا حکۆمەتا عیراقی بازرگانێ ئاکرەیی عیسا جەجو گرت و ب گونەها پشتەڤانی

و پێشکەشکرنا هاریکاریان بۆ خۆشەڤی بۆ دەمێ حەفت سالێن زیندانێ سزادا، هەروەسان جڤاتا لەشکەری (المجلس العرفي) ب گونەها هاریکاری و پشتەڤانیا بزاڤا ناڤبری بریارا سێدارەدانێ ل سەر هەریەك ژ عەلی محەمەد جیجو، تاهر حەجی حەسەن و فارس نالبەند دا و رۆژا ١٦ ئەیلوولا ١٩٣٥ێ تاهرێ حەجی حەسەنی ب ئاشکرا بەرامبەری ئاڤاهیێ قائیمەقامیا ئاکرێ (قشلا ئاکرێ) ل سێدارێ دا[٢]. بەلگەنامێن حکۆمەتێ وێ چەندێ بەرچاڤدکەن کو عەشیرەتێن هەرکی و سۆرچی هاریکاریا خۆشەڤی دکر و د هەمان دەمدا هندەك ئاغایان هاریکاریا لەشکەریا حکۆمەتا عیراقێ دکر[٣].

ل زاخۆ ژی دەمێ سەرکردێ بزاڤێ پەنا ئینایە بەردەڤەرا گولییان سەرۆکێ عەشیرەتا گولی سادقێ برۆی هاریکاریا بزاڤێ کرییە.[٤]

ل سنوورێ قەزا ئامێدیێ حکۆمەت شیا بوو ویژدانا گەلەك ژ عەشیرەتێن دەڤەرێ بکریت و وان دژی خەلیل خۆشەڤی و شەرڤانێن وی هاندەت، هەژیە بێتەگۆتن روودانێن داویێ یێن ڤێ بزاڤێ ل دەڤەرێن قەزا ئامێدیێ روودان، ئەو شەرڤانە د دەمێ ڤەمانا خۆدا ل ڤان دەڤەران تۆشی گەلەك فشارێن دژوارێن هێزێن حکۆمەتێ بوون، ئەو هێزە بەردەوام ب دووڤ وانڤەبوون ل هەردو ناحیێن نێروە رێکان و کانی ماسێ، هژمارەك مەزن ژ شەرڤانان هاتنەکوشتن و هژمارەکێ ژی ژ ناچاری خۆ دا دەست حکۆمەتێ، د ڤێ ناڤبەرێدا خۆفرۆشێن کورد رێك ل بەر خۆشەڤی و شەرڤانێن وی گرت نەهێلان ژ رووبارێ رووشینی دەربازی دەڤەرا بارزان ببن و دەمێ ڤیای دەربازببن هژمارەك ژێ کوشتن. حکۆمەتێ گۆژمەیێ پێنج هزار دینارێن عیراقی (یێن وی سەردەمی) تەرخانکربوون بۆ هەرکەسەکی خەلیل خۆشەڤی ساخ یان مری بدەتە دەست حکۆمەتێ، ئەڤە ژی بۆ وێ چەندێ بوو کو پتر ناڤتێدانا عەشیرەتان بکەت بۆ شەرێ وی، وەرزێ زڤستانێ بوو و خۆشەڤی ناچار بوو پەیوەندیێ ب سەرۆکێ عەشیرەتا رێکانییان بکەت داکو هاریکاریا وی بکەت و هەتا وەرزێ بهارێ وی ب حەوینیت، خەلیل خۆشەڤی و چەند شەرڤانەك ل شکەفتا گوندێ (هریاشکی) ڤەحەویان و پشتی دو هەفتیان دەستەلاتدارێن حکۆمەتێ ب هاریکاریا هندەك خۆفروشێن کورد شیان جهێ وان دەسنیشانبکەن و دووریپێچدان و هێرشکرە سەر وان هەتا ئەو و هندەك هەڤالێن وی کوشتین.

پشتی کوشتنا خەلیل خۆشەڤی موتەسەرفێ (پارێزگارێ) مووسلێ حیسامەدین جومعە و رێڤەبەرێ پۆلیسان عەبدوللا عەونی ل حزیرانا ١٩٣٥ێ سەرا ئامێدیی دا داکو خەلاتێن دراڤی و مەدالیێن هێزێن لەشکەری بدەتە وان عەشیرەتان یێن پشکداری د هەوا سەرکوتکرنا بزاڤێدا کری، عەشیرەتا هەرکی ٢٤ دینار و عەشیرەتێن ئورەماری و نێروە رێکان ٣٣١ دینار خەلات وەرگرتن، موتەسەرفی پێشنیازکر دو مەدالیان بدەنە هەریەك ژ سەعید عەبدولقادر قائیمەقامێ زێبارێ و ئەحمەد حەجی رەشید رێڤەبەرێ ناحیا نێروە رێکان ژ بەر رەنجا وان د سەرکوتکرنا بزاڤێدا کێشای[٥]. هەروەسان حکۆمەتا عیراقێ دادگەهەکا تایبەت بۆ دادگەهکرنا وان شەرڤانان دانا یێن پشکداری د بزاڤێدا کری و هندەك ژ وان ل سێدارێ دان و یێن دیتر زیندانیکرن[٦]. جڤاتا تەنگاڤییان (المجلس العرفي) د هاتنوچوونێدا بوو د ناڤبەرا ئاکرێ و زێبار و مووسلێ دا بۆ دەرێخستن سزایێن سێدارەدان و سەرگونکرنێ و زیندانیێ. ئەندامێ جڤاتا ماقویلان (مجلس الأعيان)یا عیراقێ هیبەتوللا مفتیێ ئاکرەیی ب ئاخینك و مخابنیڤە دەربارەی ڤی دادگەهکرنێ د پەیڤی و دگۆت: ((گەلەك ژ ڤان کەسان ب زولم هاتینەگونەهبارکرن)) و پشتی ڤان دادگەهان گەلەك ژ بارزانییان رەڤینە ناڤ چیان[٧].

## ژێدەر و پەراوێز:


١. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: رۆژ عبدالله ئەرگۆشی، ناوچەی بارزان لە نێوان سالانی ١٩٣١- ١٩٤٦، ناما ماستەرێ یا نە بەلاڤكری، بپ ٥٥- ٧٣.

٢. ئەكرەم رەشید ئاكرەیی، رۆژێن گەش، رۆژێن تاری و رەش، كوڤارا دهۆك، هژمار ٢٨- چریا ئێكی ٢٠٠٦، بپ ١٣- ١٦ ؛ جمبد شكری، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٠.

٣. جمبد شكری، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٠.

٤. وصفیە محمد شێخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٣٩.

٥. رۆژ ئەرگوشی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٣ ؛ رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٩ و ٣٦٦.

٦. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: رۆژ ئەرگۆشی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٣- ٧٤، صدیق عثمان محو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٣ ؛ جمبد شكری، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٠.

٧- زبیر بلال اسماعیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٠.

# کوشتنا مزگینیدەرێ ئەمریکی کامبەرلاند

پ.د. عەبدلفەتاح عەلی بۆتانی
وەگێران: موسەدەق تۆڤی

پەیدابوونا مزگینیدەر(المبشر)ان ل کوردستانێ دزڤریتەڤە دەسپێکا سەدسالیا هەڤدێ زایینی، ئەرکێ مزگینی دەران دیارکرییە ب بەلاڤکرنا بیروباوەرێن دێرا رۆژئاڤا د ناڤ مەسیحیێن دەڤەرێدا، زێدەباری هندێ چەند ئارمانجەکێن دن د ناڤ بزاڤا مزگینی دەریێدا هەبوون یان ژی خۆ ل ژێر پەرێ وێ ڤەشارتبوو. ژ دەمەکێ زووڤە بادینان دگەل بزاڤا مزگینی دەریێ ئاشنابوویە، بۆ نموونە ئەم دکارین ئاماژە پێ بکەین ل دەسپێکا سالا ١٧٥٠ێ هنارتیا بابێن دومنیکان (الاباء الدومنيكان) مەلبەندەکێ بچووک ل پایتەختێ میرگەها بادینان ئامێدیێ هەبوو، میرێ بادینان بارام پاشای پێ رێك دایە ڤەکرنا ڤی مەلبەندی هاندانا مەسیحیێن کورد دکر کو ڤی ئایینزای (مەزهەبی) وەرگرن و رێ ل بەر وان خۆشدکر، هەمان ڤێ هنارتیێ ژ سەردەمێ دەولەتا ئوسمانیڤە مەلبەندەك ل گوندێ قەشەفرێ (ماریاقو) رۆژهەلاتێ باژێرێ سێمیلێ هەبوو و هەتا سالا ١٩٨٨ێ کار دکر، دێرا مار یاقوی ل سەردەمێ شۆرشا ئەیلوولێ پەناگەهەکا تەنا یا پێشمەرگەی بوو.

ئەو هنارتیا مزگینی دەرا روجر کریغ کامبرلاند (١٨٩٤ - ١٩٣٨) سەر ب وێ ڤە، سەر ب دێرا شێخییە (كنيسة الشيخية)ڤە بوو ئەوا ژ دەسپێکا سەدسالیا شازدێ زایینی ل عیراقێ کاردکر، پشتی کو ژ کارکرنێ راوەستیای، سەرژنوو هنارتیا خۆ ئاڤاکرەڤە و بۆ خودانا پێنج مەلبەندان ل عیراقێ و یەك ژ وان ل دهۆکێ بوو.

کامبرلاند ل سالا ١٩٢٣ێ ل دهۆکێ ئاکنجی بوو، دەست ب گەریانێن خۆ ل گوندێن دەڤەرێ کر و سەرا دەڤەرا بەروارییان دا هەتا گەهشتییە ناڤ سنوورێ ترکیا، رۆژانە تێبینیێن خۆ تۆماردکرن و فێری زمانێ کوردی بوو، سالا ١٩٢٥ێ ب گۆژمەیێ (٤٠٠) لیرەیێن ترکی گوندێ بابلۆ ژ محەمەد عەبدولرەحمانێ ئیتویتی کری، سالا ١٩٢٧ێ بۆ داوەتا خۆ دگەل هاریرت گلبرت گان چوو مانێللا، سالا ١٩٢٨ێ ئەو و هەڤژینا خۆ زڤرینەڤە دهۆکێ ل خانیێ خۆ یێ نها

ژی ب قەسرا كامبەرلاندی دهێتەناڤكرن نیشتەجێ بوون.

ل سالا ١٩٣٠ێ كانییەكا ئاڤێ ل نێزیك قەسرا شێخ نور محەمەدێ بریفكانی ل تاخێ زۆزانێ نها كو ب (كانیا خەلكی) یان ب (كانیا شێخی) دهاتەناڤكرن كری. ب مەرەما كێشانا ئاڤێ بۆ دهۆكێ دو تانك یەك ل نێزیكی مالا وی تاخێ فەلان ل مەیدانا دگۆتنێ مەیدانا داوەتان و یا دیتر ل نێزیكی قەسرا شێخ نور محەمەدی دانان، ژ ڤان دو تانكا ئاڤ دكێشا پێنج حەنەفییان كو ل جهێن ژێری دانابوون:

١- یا ئێكێ ل تاخێ فەلان نێزیكی تانكێ ئێكێ دانابوو و تاخێ فەلا و شێلێ مفا ژێ وەردگرت.

٢- یا دووێ بەرامبەری قەسرا كامبەرلاندی دانا بوو.

٣- یا سێێ ل نێزیكی تانكێ دووێ دانابوو و هەردو تاخێن زۆزان و گەلی ئاڤ ژێ ڤەدخوار.

٤- یا چوارێ ل تاخێ بازاری نێزیكی جادا دختۆران یا نها دانابوو.

٥- یا پێنجێ كێشابوو مزگەفتا مەزن ل نیڤا بازاری.

پرانییا كەسێن هەڤچەرخێن وی و ئەوێن هەڤالینییا وی كری ژێ نەڤەگێرایە كو بابەتێ چوونە ناڤ ئایینێ مەسیحی دگەل وان ئاخفتبیت، بەلێ سەرەرای ڤێ چەندێ یێ بەرنیاس بوو دناڤ خەلكێدا كو یێ هاتی دا موسلمانان بكەتە مەسیحی، ئەڤە ل دۆر وی دهاتەگۆتن و هەر ئەڤەژی بوو ئەگەرێ كوشتنا وی ژ ئالیێ سەلیمێ مستەفایێ بیسفكی ڤە ل ١٢ حزیرانا ١٩٣٨ێ ل دهۆكێ. قائیمەقامێ دهۆكێ مەكی سدقی شەربەتی و هندەك زانایێن ئایینی هاندانا كوشتنا وی كربوو، ئەو ژی پشتی كو مامۆستایەكێ عەرەب ل دهۆكێ بوویە مەسیحی و د هەمان دەمدا كامبەرلاندی هژمارەكا مەزنا ئینجیلان و كتێبێن پیرۆز یێن مەسیحیان ل دهۆكێ و گوندان بەلاڤكرین[1].

هندی سەلیم مستەفایە كو ل دەڤەرێ ب سەلیمێ مستێ دهێتەنیاسین ما قەچاخ ژ حكۆمەتێ یا كو نەیا مجد بوو د گرتنا وی دا، هەتا ل سالا ١٩٤٥ێ لێبۆرینەكا تایبەت بۆ دەرێخستی، ل ئەیلوولا ١٩٤٦ێ هەر وی سەعید ئاغایێ دۆسكی ل مووسلێ كوشت، د ئەنجامدا حكۆمەتێ ل شباتا ١٩٤٩ێ ئەو ل سێدارێ دا[2].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: ریاض یلدە، روجر كریغ كامبرلاند المبشر الامریكي في دهوك ١٨٩٤- ١٩٣٨، مجلة مەتین، العددان (٧٩- ٨٠)- أب و ایلول ١٩٩٨دهوك ؛ عبدالفتاح علي البوتاني، قصة مقتل المبشر الامریكي كامبرلاند في مذكرات ملا قاسم الكوجر و حافظ القاضي، رأی و تعقیب، مجلة دهوك، العدد ٢٢- شباط ٢٠٠٤ دهوك، ص ١٠٦- ١١٣.

٢. بۆ زانیارییێن بەرفرەهتر بنێرە رۆژناما (نصیر الحق) یا مووسلی ئەوا د ناڤبەرا ١٩٤٦- ١٢ شباتا ١٩٤٩ێ دهاتەبەلاڤكرن، هژمارێن (٤٨٦، ٤٩٠، ٤٩٣، ٤٩٤، و ٥١٣).

# بزاڤا بارزان
# ١٩٤٣ -١٩٤٥

**پ.د عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی**
**وەرگێران: موسەدەق تۆڤی**

شەرێ جیهانیێ یەکەم و روودانێن دووڤرا هاتین کورد بێ هیڤی کربوون کو ئەو ژی ببنە خودان دەستەلاتەکێ سیاسیێ سەربەخۆ، ب هەمان شێوە دەمێ پەیمانا ١٩٣٠ێ هاتییە موورکرن و ل سالا ١٩٣٢ێ عیراق چوویە د کۆما مللەتاندا، ئەڤ بێ هیڤیبوونا کوردان دوبارە بووڤە، پاشتر شەرێ جیهانیێ دووەم ب سەرداهات و هەول و داخوازێن نەتەوەیێن کوردان سەر ژ نوو لڤینەڤە، د قوناغا شەرێ جیهانیێ دووەمدا چەندین فاکتەرا هەستا نەتەوەییا کوردی هشیارکرەڤە، چالاکیێن رێکخستنێن سیاسیێن کوردی، بزاڤا شێخ مەحموودێ بەرزنجی و سەرنەکەتنا وێ گولانا ١٩٤١ێ و ئالۆزیا سەروبەرێ ئابووریێ کوردستانێ د سالێن شەریدا ل پێشییا وان فاکتەران بوون، هەروەسان داگیرکرنا پشکەك ژ کوردستانا رۆژهەلات ژ ئالیێ یەکێتییا سوڤیەتی ڤە باندۆرا خۆ د ناڤەندێن بزاڤا نەتەوەییا کوردی ل باشوورێ کوردستانێ هەبوو.

ل سەر ڤی بنیاتی کوردان ژی دەست ب بزاڤێ کر ژ بۆ داخوازا مافێن خۆ، وەك بەرهەڤییەك بۆ هەر لڤینەکا کوردان هەکەر هاتەپێش حکۆمەتا عیراقێ بزاڤێن خۆ کرن بۆ تەنا کرنا هەستا کوردان یا دژی وێ، ل تەباخا ١٩٣٩ێ وەصی عەبدولئیلاهی سەرا دەڤەرا بادینان دا، ب چاڤێن خۆ ئەو پویتەپێنەکرن و پشتگوههاڤێتنە دیت یا دەڤەر تێدا دژیا، ئەڤ پویتەپێنەکرنە تنێ تێرا هندێ هەبوو گەلێ کورد بزاڤێ ژ بۆ دەستڤەئینانا مافێن خۆ بکەت، د ڤی واریدا دەستەلاتداران ب مەرەما رازیکرنا کوردان پێنگاڤەکا دی یا گرنگ هاڤێت دەمێ بارزانیێن سرگونکری بۆ ناصریێ ژ وان ژی مەلا مستەفایێ بارزانی و برایێ وی شێخ ئەحمەد ژ ناصریێ ڤەگوهاستینە سلێمانیێ، ڤێ چەندێ نەتەوەپەروەرێن کورد بەرەف بزاڤێ پالدان، د ڤی سەروبەریدا بزاڤا کوردی پێویستی ب کەسەکی بوو بکاریت سەرکردایەتییا وێ بکەت و سەروبەرێ وێ رێك بێخیت، پێدڤی بوو ئەڤ کەسەك ژی کەسەك بیت هەتا ئاستەکێ باش د ناڤ ناڤەندێن کوردیدا خودان پشتەڤانییا جەماوەری بیتن، ئەو کەسە مەلا مستەفایێ بارزانی بوو، یێ خەلکەکی لێ دنێری و وەلاتپارێزێن کورد ل دۆرێن وی خرڤەبووین و پتر سەرەدانێن وی دکرن دەمێ ئەو ل سلێمانیێ، گەلەك پێڤەنەچوو و ب هاریکاریا ئەندامێن کۆمەلا برایەتی و هیوا بارزانی شیا ل ١٢ تیرمەها ١٩٤٣ێ ژ دەستێن حکۆمەتێ دەرکەڤیت و ب نهێنی د رێکا رۆژهەلاتێ



**مەلا مستەفا بارزانی**

کوردستانێ را بێتە دەڤەرا بارزان و ل ٢٨ تیرمەها وێ سالێ گەهشتە دەڤەرێ.

زڤرینەڤا بارزانی بۆ دەڤەرا بارزان حکۆمەت تۆشی نیگەرانیێ کر، دەست ب ڤەکۆلین و دووڤچوونی دگەل بارزانییێن سرگونکریێن سلێمانیێ کر، فەرمانێن دژوار بۆ راهێلانا بارزانی دان، شێخ ئەحمەد و برایێن وی و خێزانێن وان زڤراندنەڤە باژێرێ حلە، خەلاتەکێ گرانبها بۆ هەرکەسەکی تەرخانکر بارزانی ب ساخی یان مری بگریت[١].

بارزانی ب گەریانەکا بەرفرەهـ سەرا گوند و دەڤەرێن بارزان، بالەك، رەواندز، ئامێدیێ، سەرسنکێ و بامەرنێ دا، ناڤتێدانا خەلکێ دکر بکەهنە وی، هژمارەکا زۆر ژ خەلکێ ڤان جهان گەهشتنە ریزێن لەشکەرێ وی، د هەمان دەمدا پەیامەك بۆ حکۆمەتێ هنارت تێدا بەرهەڤیا خۆ دیارکر بۆ دیتنا چارەکا سیاسی بۆ دۆزا کوردان، بەلێ دەولەتێ بریاردا پەنا ببەتە بەر چارەیا لەشکەری، بەرسڤا بارزانی ژی ل سەر بەرهەڤیێن حکۆمەتێ بۆ شەری بەرهەڤی بوون بۆ بەرسنگگرتنا هێرشێن حکۆمەتێ و ب کریار ژی ل ٢ چریا ئێکێ ١٩٤٣ێ دەست ب هێرشان بۆ سەر بنکەهـ و مەخفەرێن حکۆمەتێ کر و سەرکەتنێن وی حکۆمەتا عیراقێ تۆشی ئالۆزی و شەپرزەییێ کر.

دەملدەست دگەل رووادنا بزاڤا بارزان کۆمەلا هیوا پشتەڤانی لێکر، ل مەها کانوونا یەکەم ١٩٤٣ێ بەیاننامەك بۆ هەموو خەلکێ عیراقێ بەلاڤکر، تێدا هوشداری ژ ئەنجامێن سیاسەتا حکۆمەتێ بەرامبەری کوردان دا، د بەیانامەیێدا هاتییەکو مەلا مستەفایێ بارزانی یەك ژ ئەندامێن کۆمەلەیێ یە، بەیاننامە هاتەبەلاڤکرن و هەلاویستن ل سەر دیوارێن زۆربەی باژێرێن عیراقێ، ل باژێرێ مووسلێ کۆمەلێ سێ ژ ئەندامێن خۆ مەجید بەهائەدین، محەمەد سەعید دۆسکی و ئیسماعیل سەعید دۆسکی ب ئەرکێ دابەشکرن و هەلاویستنا بەیاننامەیان ل سەر دیوارێن جهێن گشتی راسپاردن، بەلاڤکرنا ڤێ بەیاننامەیێ و بەلاڤۆکێن دیتر ل دور رووادنێن بزاڤا بارزان دەنگڤەدانەك مەزن ل باژێرێ مووسلێ هەبوو، د ئەنجامدا حکۆمەتێ ئیسماعیل سەعید دۆسکی، ئەحمەد مستەفا ئامێدی، محەمەد سەعید دۆسکی، محەمەد حەسەن بالەتە، عەلائەدین سەعید ئاکرەیی، مستەفا ئیبراهیم کۆرەمارکی، رەئوف ئەربیلی، محەمەد سالح جبرائیل گرتن و دەستەسەرکری هنارتنە بەغدا و پشتە هەیڤەکێ ژ دەستەسەرکرنێ دادگەهکرن پاشتر ب کەفالەتا باشییا رەوشتان (حسن السلوك) کو دگەهشتە ٥٠٠دیناران بۆ هەریەك ژ وان ئازادکرن[٢].

د سەردەمێ بزاڤا بارزاندا پۆستێ کۆمەلا هیوا ب رێکا رێکخستنا وێ یا مووسلێ دگەهشتە سەرکردێ بزاڤێ مەلا مستەفایێ بارزانی، ل مەها کانوونا یەکەم ١٩٤٣ێ بەرپرسێ رێکخستنا مووسلێ یا کۆمەلا هیوا محەمەد عەبدولقادر ئامێدی هەردو ئەندامێن هیوا سوبغەتوللا ئەمین حەسەن مزووری



**وەصفی عەبدولئیلاهـ ١٩١٣- ١٩٥٨**

و سەعید مەلا عەبدولموحسن راسپاردن پۆستێ كۆمەلەیێ بگەهیننە بارزانی ل گوندێ بێستریێ باكوورێ رۆژئاڤایێ ناحیا مێرگەسوورێ و نامەیێن پێكهاتی ژ گەفان بۆ هندەك ئاغایێن كوردان یێن دڤیا دژی بزاڤێ راوەستن. هەردو هنارتییێن كۆمەلا هیوا شیان بگەهنە گوندێ بێستریێ و پۆستێ كۆمەلێ گەهاندنە بارزانی، پۆستە یێ پێكهاتی بوو ژ چەند پێشنیازەكان و داخوازێن نەتەوەیێن كوردان كو د دەمێ هەر دانوستاندنەكێدا پێشكەشی حكۆمەتێ بكەن ئەگەر حكۆمەت ل بەر هات، زێدەباری ڤانا د پوستەیدا دانەیەك ژ رۆژنامەیا (فتی العراق) مووسلێ هەبوو كو تێدا حكۆمەتا عیراقێ بریاردابوو ب تەرخانكرنا خەلاتەكێ دراڤی بۆ هەركەسەكێ بارزانی ب ساخی یان مری بدەتەدەست.

دەمێ شاندێ كۆمەلێ زڤرینەڤە راپۆرتەكا تێروتەسەل دەربارەی ئەركێ خۆ پێشكەشی كۆمەلێ كر و دگەلدا نامەیەكا بارزانی هەبوو كو پەسەنددكەت وی پوستە ب تەواوی وەرگرتییە، بەرامبەر ئەركێ ڤان دو ئەندامان بجهـ ئینای محەمەد شاهین صوفی (پارێزەر) ژ پێش بەرپرسێ رێكخستنێ ڤە رێز ل هەردویان گرت و مەدالیەك ب سنگێ هەرئێك ژ وانڤە كر. ئەڤ رێورەسمێن رێزلێنانێ ل ژوورا مەلا ئەسعەد شاهین ئیمامێ مزگەفتا (صادق الجلبي) ل جادا (الفاروق) ل تاخێ (باب الجديد)ێ مووسلێ هاتنەگێران[٣].

وەسان دیارە كو دەستەلاتدارێن حكۆمەتێ ب هشیاری زێرەڤانییا لڤین و كریارێن بەرپرسێ لقێ كۆمەلێ ل مووسلێ مامۆستا محەمەد عەبدولقادر ئامێدی و ئەندامێ كۆمەلێ ل ئاكرێ مەلا سەعید دكر و ئێخستبوونە ژێر زێرەڤانیێ، و ڤەكۆلین دگەل یێ داویێ ئانكو مەلا سەعیدی كریوو ب گونەها هندێ كو پۆستێ كۆمەلێ دگەهینتە مەلا مستەفا یێ بارزانی[٤].



**مەجید بەهائەدین**

سەرکەتنێن لەشکەرێن بزاڤا بارزان دەستڤەئینانێن زێدەباری پشتەڤانیا بەرفرەها خەلکێ ل ڤێ بزاڤێ، هاندەر بوون کو حکۆمەت هزرێ ل دیتنەڤا چارەیەکا ئاشتی ل دۆزا کوردی بکەت، ئەڤێ چەندی ژی خۆ د ڤەکرنا دەرگەهێ دانوستاندنان دگەل سەرکردایەتییا بزاڤێ را دیت.

ل رۆژا دوشەمبی ٢١ شباتا ١٩٤٤ێ بارزانی دگەل هندەك هەڤالێن خۆ د رێکا خۆدا بۆ بەغدا گەهشتنە مووسلێ، ل ئۆتێلا دیجلە مێڤانێن حکۆمەتێ بوون، ل جهێ مانا خۆ بارزانی دیدار دگەل چەند ژ ئەندامێن هیوا کرن بێن دەربارەی سەروبەرێ ئالۆزێ کۆمەلا هیوا تێدا دبۆری بۆ ئاخفتین، هەروەسان بیرا وی ل وان پێشنیاز و داخوازان ئیناڤە یێن رێکخستنا مووسلێ یا کۆمەلێ گەهاندینە وی ل گوندێ بێسترێ کو پێکهاتبوون ژ: زمانێ کوردی ببیتە زمانێ فەرمیێ فەرمانگەهێن دەولەتێ ل کوردستانێ، خواندن ل خواندنگەهان ب زمانێ کوردی بیتن، هەموو فەرمانبەرێن کوردستانێ کوردبن، راگەهاندنا لێبۆرینەکا گشتی بۆ گشت گرتیێن سیاسیێن کورد دگەل چەندین داخوازێن دیتر[٥].

ل رۆژا ٢٢ شباتێ بارزانی گەهشتە بەغدا، دیدار دگەل وەصی عەبدولئیلاهـ و سەرۆکوەزیران نوری سەعیدی و چەندین وەزیران کرن، هەروەسان ب هەڤالینیا چەند سەرۆك عەشیرەتێن کورد سەرەدانا یانەی سەرکەوتنی کوردان ل بەغدا کرن و ل وێرێ دیدار دگەل سەرۆکێ یانەیێ مارف جیاوەك کر[٦].

یا گرنگ ل ڤێرێ ئەوە حکۆمەت ل دووڤ داخوازێن بزاڤا کوردی نەهات، بارزانی د رێکا کەرکۆك و هەولێرێ را زڤریڤە، خەلکێ ڤان جهان وەك سەرکردەکێ رزگاریخواز پێشوازی لێکرن، دانوستاندن نەبوونە ئەگەرێ تەناکرنا سەروبەرێ کوردستانێ و دەمێ بارزانی ب مەرەما راکێشانا پشتەڤانیا عەشیرەتان ئەگەر شەری دەسپێکرەڤە مژوولی سەرەدانەکێ ل دەڤەرا بادینان ل ٨ تەباخا ١٩٤٥ێ شەری دەسپێکرەڤە، رێکخستنێن کوردیێن ب نهێنی کاردکر، پشتەڤانیا خۆ بۆ بزاڤێ دیارکر، حزبا شۆرش پشتەڤانیا خۆیا تەواو بۆ شۆرشێ راگەهاند، هندی حزبا رزگاری رۆلەك مەزن د پشتەڤانیا شۆرشێ دا گێرا[٧].

ل داویێا مەها ئەیلوولێ شۆرشگێران دەست ب ڤەکشیانێ بۆ ناڤ سنوورێ ئیرانێ کرن، هێزێن حکۆمەتێ کو خۆفرۆشێن کورد ل پێشیا وان بوون ل ٥ چریا یەکەم ١٩٤٥ێ دەست ب سەر دەڤەرا بارزان دا گرت، شۆرشگێر شیان ڤەکشیانا خۆ بۆ ناڤ سنوورێ ئیرانێ ب پارێزن و ل ١١ چریا یەکەم گەهشتنە ناڤ کوردستانا ئیرانێ، و ل ٢٢ کانوونا دووێ ١٩٤٦ێ بارزانی و شەرڤانێن خۆ کەتنە ژێر دەستەلاتێ کۆمارێ مللیێ دیموکراتیێ کوردستانێ ل مەهابادێ[٨].

هندی پەیوەندی ب هەلویستێ دەڤەرا بادینان ڤە هەی بەری دەسپێکرنا بزاڤێ و دگەرماتیا روودانێن وێ دا، ژێدەر ئاماژە ب وێ چەندێ دکەن کو ئاکرێ د ناڤ جەرگێ رووداناندا بوو، خەلکێ مەلبەندێ ئاکرێ رۆلەك گرنگ د هاریکاری و پشتەڤانیا بزاڤێدا گێرا، دو ژ خەلکێ ئاکرێ سەلمان موسا و مستەفا عەبدوللا رۆلێ خۆ د دەرکەتنا بارزانی ب نهێنی ژ سلێمانیێ و گەهشتنا وی بۆ دەڤەرا بارزان ل ٢٨ تیرمەها ١٩٤٣ێ هەبوو، هەروەسان ئەفسەر میر حاج ئەحمەد ئاکرەیی رۆلەك کاریگەر د بزاڤێدا هەبوو، بەلگەنامەکا دیترا حکۆمەتێ ئاماژە ب وێ چەندێ دکەت کو ئاکرێ و دەوروبەرێن وێ دەڤەرا سەرەکیا دابینکرنا پێدڤیاتیێن شەرڤانێن بارزان بوو، هەتاکو (١٥٠٠) سەرێن پەزی ژ ئاکرێ هنارتبوونە بارزان بۆ خوارنا سێ هزار شۆرشگێران[٩].

د هەمان دەمدا ئاکرێ مەلبەندێ هێرشێن لەشکەرێن حکۆمەتێ بوو بۆ سەر بارزان و دەڤەرا وێ، لیوا پێنجا لەشکەرێ عیراقێ ئاکرێ کربوو بارەگایێ خۆیێ سەرەکی، ڤێ لیوایێ ب هاریکاریا لیوا ئێك کو بارەگایێ وێ ل دینارتێ بوو ژ سەرێ ئاکرێ ڤە هێرش دبرنە سەر چەپەرێن شۆرشگێران ل گەلیێ نەهلێ، دەمێ شۆرشگێرێن بارزان بەرەڤ ئیرانێ ڤەکشیایین ژ خەلکێ ئاکرێ ئەفسەرێ توپهاڤێژ میر حاج ئەحمەد و قازی بەهجەت عەبدولخالق و



سالح عەبدولعەزیز ئاغایێ ئامێدی



عیزەت عەبدولعەزیز

مەلا سلێمان موسا و قادر موسا و خالد شەریف دگەل وان مشەختبوونە ئیرانێ.

پشتی ب داویهاتنا هێرشێن لەشکەری بۆ سەر دەڤەرا بارزان هژمارەکا سەرۆکعەشیرەت و ماقویل و فەرمانبەرێن ئاکرێ برۆسکێن پشتەڤانیێ بۆ هەلویستێ حکۆمەتێ و کریارێن وێ هنارتن[10]. د بەرامبەردا حکۆمەتێ بریارا خەلاتکرنا وان کەسان دا ئەوێن مل ب ملێ وێ ڤە شەرێ شۆرشگێران کری، خەلات ژی دانا مەدالیا رافیدەین ب پلەیا پێنجێ بوو کو دابوو: رێڤەبەرێ ناحیا سۆرچی ئەمین حەسەنکو، هاریکارێ پۆلیسێن ئاکرێ مەحموود عەبدوللا، رێڤەبەرێ ناحیا ئەلعەشائیر ئەلسەبعە حکمەت عارف، شێخ قەیومێ سۆرچی، شێخ رەقیبێ سۆرچی، شێخ ئەحمەدێ، شێخ شەفیقێ سۆرچی و قادر ئاغایێ شۆشی[11].

هندی پەیوەندی ب قەزا ئامێدیێ ڤە هەی، ل پاییزا ١٩٤٤ێ بارزانی سەرا وێ و سەرسنکێ و گوندێ بامەرنێ دابوو، ل بامەرنێ دیدار دگەل شێخ بەهائەدینێ نەقشەبەندی کربوو، شێخی ژێ خواستبوو دەست ژ بەرخودانێ بەردەت و دەست ب رێبازا نەقشەبەندی ڤە بگریت، ژبەرکو سەرۆکعەشیرەت پشتەڤانیێ لێ ناکەن، هەر ل بامەرنێ بارزانی دگەل هژمارەك ژ ئەندامێن کۆمەلا هیوا کۆمبوو[12].

سەرتیپ (العقید) تەها بامەرنی کول سالا ١٩٤٤ێ ئەفسەرێ لەشکەرێ عیراقێ بوو ل لەشکەرگەهێ سوارەتۆکا د بیرهاتنێن خۆدا ڤەدگێریت: رۆژەکێ ژ رۆژا دەمێ ئەو ژ مەشقێ دزڤریڤە مەلا مستەفا ل دەڤەرا سوارەتۆکا بوو، مەرەما وی ژ ڤێ سەرەدانێ پێکئینانا هەڤپەیمانیەکێ بوو ژ عەشیرەتێن دەڤەرێ بۆ بەرسنگگرتنا حکۆمەتێ د دەمێ پێویستدا، سەرهەنگێ روکن (المقدم الركن) عومەر عەلی جێگرێ فەرمانداری لەشکەرگەهێ ل سوارەتۆکا



سالح عەبدولعەزیز و حەجی عەبدوللەتیف عەبدولعەزیز زیندان ١٩٤٧



جەمیل بەهائەدین زیندان ١٩٥١

پێکولا وێ چەندێ کر کو ب مهانەیا مێڤانداریێ بارزانی بینتە د ناڤ لەشکەرگەهیڤە، لێ بارزانی سوپاسییا وی کر و لێبۆرین ژ مێڤانداریێ خواست، هەرچەندە عومەر عەلی ڤیا ب گۆتنا: ئەم لەشکەر مینا عەشیرەتاینە ئەگەر مە نانەك پێکڤە خوار نابیت ئەم خیانەتێ ل هەڤدو بکەین[١٣].

دەمێ عومەر عەلی نەشیای ب هەر رێکەکا هەبیت بارزانی بینتە ناڤ لەشکەرگەهێ ب مەرەما ترساندنا بارزانی و گەفلێکرنێ فەرماندا سەربازێن خۆ خۆنیشادانەکا لەشکەری ب تەقەمەنیێ راستەقینە ب تۆپ و رەشاشان بکەن، بەلێ بارزانی پویتە ب گەفێن وی نەکر[١٤]. عومەر عەلی ژ تەها بامەرنی خواست ب ئەرکێ ئەفسەرێ هەوالگری (ضابط الاستخبارات) رابیت و بەری گەهشتنا بارزانی بۆ بامەرنێ ئەو بچیتە د ناڤ گوندیدا، بەری گەهشتنا بارزانی ب دو رۆژان تەها بامەرنی هاتە ناڤ گوندی، پشتی نیڤرۆیا رۆژا پاشتر شەرڤانێن بارزانی دورێن گوندی گرتن و بارزانی هاتە تەکیا شێخ بەهائەدینی و ئەفسەر عیزەت عەبدولعەزیز ئامێدی دگەلدا بوو، عیزەت عەبدولعەزیزی تەها بامەرنی ب بارزانی دا نیاسین، بامەرنی د بیرهاتنێن خۆدا ڤەدگێریت کو شێخ بەهائەدینی ئامۆژگاری ل بارزانی کرن کو شەرێ حکۆمەتێ نەکەت و دگەل پێکبهێت، بارزانی د بەرسڤا شێخیدا گۆت: ئەم دەسپێشخەرێن شەری نەبووینە، هەموو شەرێن مە دگەل حکۆمەتێ بەرگری بوویە ژ خۆ و شەرەف و کەرامەتا خۆ، هەرچەندە ئەم دزانین کو حکۆمەت یا سەرکەتییە[١٥].

جارەکا دی ل داویا حزیرانا ١٩٤٥ێ بارزانی سەرەدانا دەڤەرا بادینان کر، دگەل ٣٠٠ چەکداران گەهشتە



**شەفیق سەعدوللا**

ئامێدیێ، صالح عەبدولعەزیز ئاغایێ ئامێدی و برایێن وی حەجی تەها و عیزەت هەروەسان ئەحمەدێ حەجی عەبدوللاتیف عەبدولعەزیزی و مستەفا تاهر، محەمەد سەدیق عەلامە و نەعمان ئەمین و یێن دی ل پێشوازیا وی بوون[١٦]، بارزانی ژ ئامێدیێ بەرەف دەڤەرا مزووریان کەتە رێ، ل وێ دەڤەرێ نامەکا ل ٢٢ حزیرانا ١٩٤٥ێ هاتیەنڤیسین ژ ئەنوەر مایی[١٧] گەهشتە دەست، د نامەیێدا مایی هاندانا بارزانی دکر سەرەدانا میرزادەیا کوردێن ئێزدی مەیان خاتونێ و عەبدوللا ئاغایێ شەرەفانی کو هەردوکان بەرهەڤیا هاریکاریێ دگەل وی هەیە بکەت، مایی د نامەیا خۆدا پەسنا بارزانی ب (پەنا و رزگارکەرێ کوردستانا ستەملێکری) کربوو[١٨].

ئارمانجا بارزانی ژ سەرەدانا دەڤەرا بادینان ئەو بوو خەلکێ وێ و عەشیرەتێن وێ بەرهەڤبکەت پشتەڤانیێ ل وی بکەن دەمێ دەست ب بزاڤێ دژی حکۆمەتێ دکەت، ئەو بوو هەموو کەسوکار و نێزیکێن حەجی تەهایێ ئامێدی گەهشتنە رێزێن بزاڤێ و خێزانێن خۆ ژ ئامێدیێ برنە بارزان، بەلێ پرانییا سەرۆکعەشیرەتان دگەل حکۆمەتێ راوەستیان، حەجی تەها عەبدولعەزیزی و برایێ وی صالحی سەرکردایەتییا بەرۆکا بەرگریێ ل بالندا-ئامێدیێ دکر، عیزەت عەبدولعەزیزی، نەعمان ئەمین، داود دیری، داود شاهین و یێن دی ژ خەلکێ ئامێدیێ ل بلێ و هەرنێ و چیایێ پێرسی پشکداری د شەرێن بەرگرییێدا کر، دەمێ ل ٥ێ چریا یەکەم ١٩٤٥ێ بزاڤ هاتییە سەرکوتکرن، پرانییا شەرڤانان چوونە ئیرانێ و دناڤ واندا گەلەك ژ خەلکێ ئامێدیێ بوون[١٩].

هەروەسان بارزانی د دەمێ سەرەدانا خۆدا بۆ دەڤەرا بادینان سەرا گوندێ گەرماڤا ئاغا ل نێزیکی دهۆکێ دابوو، ل وێرێ دگەل سەعید ئاغایێ سەرۆکێ عەشیرەتا دۆسکی کۆمبوون کربوو، د دەمێ ڤەمانا بارزانی ل دەڤەرا دۆسکییان حکۆمەتێ پلانا دەستەسەرکرنا وی دانابوو، بەلێ سەرهەنگ تەها بامەرنی ب رێکا مستەفا ئیبراهیم ئاغایێ کۆرەمارکی بارزانی ل پلانا حکۆمەتێ ئاگادار کربوو، بارزانی ژ دەڤەرێ بەرەف بارزان چوو، دهێتەگۆتن کو ئیسماعیلێ سەعید ئاغایێ دۆسکی دڤیا بکەهیتە بارزانی بەلێ بابێ وی رازی نەبوو، وی ژی ژ قەهرادا خۆ کوشت[٢٠].

دەمێ بزاڤا بارزان هاتییەسەرکوتکرن و بارزانی و شەرڤانێن کورد چووینە ئیرانێ، ژێدەران ئاماژە پێ نەکرییە ژ بلی صاریا حجي مصطفی دۆسکی کەسەك ژ خەلکێ دهۆکێ دگەلدا چووبیت، هەژیە بێتەگۆتن ل تەباخا ١٩٤٦ێ حکۆمەتێ ب سەر مالا ساریایێ دا گرتییە و مالا وێ پشکنیە و د ئەنجامدا پرۆگرامێ پارتییا دیموکراتا کوردی (الپارتی) و دەقێ پەیمانا کوردی (المیثاق الکردي) و دانەیەك ژ رۆژنامەیا کوردستان ئورگانێ پارتییا دیموکراتا کوردستان ئەوا

ل مەهابادێ دهاتەبەلاڤكرن د مالا وێ دا دیتینە و د ئەنجامدا كورێ وێ مەسعوود مەلا سەعید گرتیە و حكۆمەتێ ئەو ب كورێ ساریا جاسۆس ناڤدكر[21].

هندی پەیوەندی ب زاخۆ ڤە هەی، ژ بەر لەزاتییا رووداناں و زڤرینەڤا وی یا بلەز بۆ بارزان ل ٨ێ تەباخا ١٩٤٦ێ بارزانی نەشیا سەرا دەڤەرا زاخۆ بدەت، بەلێ پەیوەندیێن وی د بەردەوام بوون دگەل كەسایەتیێن زاخۆ ژ وان ژی حازم شەمدین ئاغا یێ پەیمان دایە بارزانی كو دژی بزاڤێ نەراوەستیت و ب كریار ژی پەیمانا خۆ بجهـ ئینا دەمێ حكۆمەتێ ئەو داخواز ژێ كری، هەروەسان نامە گوهرین د ناڤبەرا بارزانی و سەرۆكێ عەشیرەتا گولی سادقێ برۆی هەبوون و هەلویستێ وی ژی مینا یێ حازم بەگێ بوو، دگەل ڤێ چەندێ حكۆمەتێ گومان ل وی هەبوون و د سەردەمێ بزاڤێدا هێزێن خۆ ل دەڤەرا زاخۆ كۆمكرن نەكو سادقێ برۆی بگەهیتە بارزانی و پشتی شكەستنا بزاڤێ ژی حكۆمەتێ ئەو ب گونەها پشتەڤانییا بزاڤا كوردی گرت.

هەروەسان ئەندامێن كۆمەلا هیوا بەیاننامەیێن كۆمەلێ ئەوێن د رووداێن بزاڤێدا هاتینەبەلاڤكرن ل دیوارێن زاخۆ هەلاویستبوون، هەرڤان ئەندامان هاریكاری و دراڤ بۆ بزاڤێ كۆمدكرن و سالح یوسفی ژ كەسێن بەرچاف بوو د ڤێ كریارێدا و ئەندامێ كۆمەلێ شەفیق سەعدوللا گەهشتبوو بزاڤێ[22].

ژبەركو پرانییا سەرۆكعەشیرەتان ب تایبەت ل هەردو قەزایێن ئامێدیێ و ئاكرێ رۆلەك د ژناڤبرنا بزاڤێدا هەبوو، هەروەسان وان ئاغا ماقوولێن دەڤەرێ برۆسكێن پشتەڤانیێ و دیاركرنا نەرازیبوونا خۆ ژ كریارێن بارزانی بۆ حكۆمەتێ هنارتن، د بەرامبەردا حكۆمەتێ ئەو ب پارە و مەدالیا خەلاتكرن، هەروەسان مەدالیا رافیدەین دا هەریەك ژ قائیمەقامێ ئامێدیێ فازل نوری و رێڤەبەرێ ناحیا وێ لازار ئیبراهیم و رێڤەبەرێ ناحیا نیروە رێكان كەمال حەسون[23].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عزیز حسن البارزاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٧- ١٣١.

٢. دیار محمد سعید الدۆسكی، مجرد استذكار، مجلة مەتین، العدد١٥- كانون الاول ١٩٩٢ دهوك، ص ٩٨- ١٠٢ ؛ عبدالفتاح علي البوتاني، الحیاة الحزبیة........ ص ٣٢٢.

٣. عبدالفتاح علي البوتاني، الحیاة الحزبیة....... بپ ٣٢٤.

٤. هەمان ژێدەر، بپ ٣٢٤.

٥. بۆ پتر زانیاریان بنێرە: ص مزووری ژوری (صبغەالله مزووری)،ذكریات تأریخیة، مجلة مەتین، العدد ١٦- كانون الثاني ١٩٩٣ دهوك، عزیز حسن البارزاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٣- ١٥٩.

٦. بەرپرسێ رێكخستنا هیوا ل مووسلێ محەمەد عەبدولقادر عەلی ئامێدی ئەرمەغانی د دەمێ خواندنا خۆ ل زانكۆیا ئەمریكی یا بێروتێ دگەل كەسایەتیێ سیاسی و رەوشەنبیرێ كورد نورەدین یوسف زازا (١٩١٩- ١٩٨٨) ئاشنا ببوو، دەمێ بزاڤا كوردی سەركەتی و حكۆمەتێ داخوازا دانوستاندنان دگەل بارزانی كری، زازای ڤیا دیدارەكێ دگەل بارزانی بكەت دا دەربارەی سەروبەرێ كوردان بپەیڤن، ئەرمەغانی ئەو ب رێكا نهێنی ژ سوریێ گەهاندە عیراقێ، بەلێ دەمێ ل تیرمەها ١٩٤٤ێ گەهشتینە ناڤ سنوورێ عیراقێ هاتنەگرتن و تاوانباركرن ب سیخوریێ بۆ بارزانی، سەرەرای مایتێكرنا بارزانی و چەندین

کەسایەتیێن کورد ژ بۆ ئازادکرنا وان بەلێ بۆ دەمێ ١٢ هەیڤان مانە د زیندانێ ڤە. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، محمد عبدالقادر علي الاميدى ١٩٢٣- ١٩٩٢، جندى مجهـول في تأريخ الحركة الوطنية الكوردية، مجلة دهوك، العدد٢١- تشرين الاول ٢٠٠٣ دهوك، ص ١١٤- ١١٩.

٧. عزيز حسن البارزاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٦- ٢٠٧.

٨. بۆ پتر پێزانینان بنێرە، رۆژ ئەرگوشی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠١- ١٠٦.

٩. جمبد شكرى، ژێدەرێ بەرێ، ب پ ٢٢١- ٢٢٩.

١٠. ناڤان د هەمان ژێدەردا بەرپەرێ ٢٢٣ێ بخوینە.

١١. هەمان ژێدەر، بپ ٢٢٣- ٢٢٤.

١٢. رجب جميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٦

١٣. طه مصطفي البامرني (العقيد) مذكرات طه البامرني، دەستنڤیسە ل جەم مالباتا وی پاراستییە، بپ ٢١٢- ٢١٥.

١٤. هەمان ژێدەر، بپ ٢١٣

١٥. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: هەمان ژێدەر، بپ ٢١٦- ٣٧١.

١٦. رجب جميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٨.

١٧. وی دەمی ئەنوەر مایی فەرمانبەرێ فەرمانگەها تەموینێ (ئاهێن خوارنێ) بوو ل شێخان.

١٨. بنێرە دەقێ نامەیێ د: مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية ثورة بارزان ١٩٤٣- ١٩٤٥، (كردستان- ١٩٨٦)، ص ١٣٥- ١٣٦.

١٩. بنێرە ناڤێن وان د: رجب جميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١١- ١١٢ ؛ بپ ٣٦٨- ٣٧١.

٢٠. هلز عثمان ميرو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٨- ٥٩.

٢١. عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن الحركة................ ص ٦٤٦.

٢٢. وصفية محمد شێخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤٠- ٢٤١.

٢٣. بۆ زانینا ناڤێن خەلاتکریان بنێرە: رجب جميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٤- ١١٧ ؛ جمبد شكرى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٣- ١٣٤.

# سەرەدانێن مالباتا شاهی (مەلکی) بۆ دەڤەرا بادینان

پ. د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

کەسایەتیێن مالباتا شاهینی پتر ژ جارەکێ سەرا دەڤەرا بادینان دایە، ئەڤ سەرەدانە ژی تایبەت د وان دەماندا بوو یێن کاودانان پێدڤی دکر، دەمێ دەولەتا ترکیا داخوازا ویلایەتا مووسلێ دکر وان سەرا دەڤەرێ دایە، هەروەسان سەردەمێ سەرهلدانا بزاڤا شێخ ئەحمەدێ بارزانی و بزاڤا ئاسووریان ب مەرەما بنەجهکرنا دەستەلاتێ حکۆمەتێ و هەیبەتا وێ و وەسان دیارکرنێ بۆ کوردان کو حکۆمەت خەمێ ژ مافێن وان دخوت هاتینە دەڤەرێ. ل رادەکێ مالباتا شاهینی بارەگایێن هاڤینی ل زاویتە و سەرسنکێ هەبوون، ژ وان سەرەدانان: سەرەدانا میرێ شوونگرێ شاهی (ولی العهد) غازی دەمێ کوردان نەرازیبوونا خۆ بەرامبەری پەیمانا ١٩٣٠ێ دیارکری، ئەو پەیمانا ئاماژە ب مافێن نەتەوەیێن کوردان نەکری، ئەو بوو ل رۆژا ٢٢ تیرمەها ١٩٣٠ێ سەرا دهۆکێ و زاخۆ دا بۆ تەناکرنا خەلکێ دەڤەرێ ژ وێ نەرازیبوونێ، و هەروەسان ل تەباخا ١٩٣١ێ سەرا دهۆکێ و ئامێدیێ دا و ژ ئالیێ قائیمەقامێ دهۆکێ مەکی سدقی شەریەتی و رێڤەبەرێ ناحیا دهۆکێ عەبدوللا عەزیز ئەفەندی و قائمەقامێ ئامێدیێ ماجد مستەفا و هژمارەکا ئاغایێن دەڤەرێ وەك عومەر و محەمەد ئاغایێ بەرئاشی و فەریقێ تاهر ئاغای و شێخ بەهائەدینێ نەقشەبەندی و کورێ وی شێخ غیاسەدینێ نەقشەبەندی ئەندامێ جڤاتا رهسپیيان (مجلس الاعیان) پێشوازی لێ هاتەکرن. هەژیە بێژین عەلی سەیدو گەورانی[1]، ل ٩ تەباخا ١٩٣١ێ ل سوارەتۆکا سەرەدانا میر غازی کریە و د بیرهاتنێن خۆدا ڤەدگێریت: کو هێزەکا لەشکەری و زرێڤانێن تایبەت د دو ترومبێلێن مەزنێن پری سەرباز و رەشاشدا پارێزڤانییا میر غازی دکرن، دەمێ گەورانی پرسیار ژێ کری ئەڤ هەمووپارێزڤانە بۆ چنە ل دورێن وی.؟ میری ب دەنگەکێ نزم بەرسڤدا و گۆت: تە گوهـ ل شۆرشێن کوردان نەبوویە؟ تە ناڤێ شێخ ئەحمەدێ بارزانی گوهـ لێ نەبوویە؟ ئەڤەنە ئەگەرێ

ڤێ هەموو خۆ پاراستنێ؟ ئەم هێژ یێ ل دەڤەرەکێ هەڤتووخیبە دگەل دەڤەرا بارزان[٢].

شاهـ فەیسەلێ یەکەم پشتی شکەستنا بزاڤا شێخ ئەحمەدێ بارزانی و ب دروستی ل رۆژا ٢٤ تەباخا ١٩٣٢ێ سەرا دەڤەرێ دایە و د رێکا خۆ را د مووسل پاشان دهۆك، سوارەتۆکا، سەرسنك، بێباد، سولاڤێ را بۆریە و ل ٢٤ تەباخێ رێکا ناڤبەرا دهۆك- ئامێدیێ ڤەکریە، شوونگرێ وی میر غازی و هژمارەکا وەزیران و رێڤەبەرێ گشتیێ پولیسان دگەلدا بوون. و ژ ئالیێ هژمارەکا مەزنا سەرۆکعەشیرەت و مەزنێن دەڤەرێڤە پێشوازی و ب هەمان شێوە ژی خاترخواستن لێ هاتەکرن[٣].

ل مەها ئەیلوولا ١٩٣٩ێ شەرێ جیهانیێ دووێ دەسپێکر، خەلکێ کوردستانێ بەری شەری د سەروبەرەکێ ئابووریێ دژواردا دژیان، خەلك د وێ باوەرێدا بوو کو رەنگە پشتگوهڤەهاڤێتن و دووریێچەکا ئابووری ل سەر کوردستانێ هاتیە سەپاندن، لەوما ژی مافەکێ سرۆشتیێ وی خەلکی بوو چاڤێ وی ل گورانکارییەکا نوو بیت، ب مەرەما بەرهەڤیێ بۆ رووداناهەر بزاڤەکێ ل کوردستانێ، حکۆمەتێ دەست ب سیاسەتا تەناکرن و رازیکرنا خەلکێ کوردستانێ کر، ژ وان پێنگاڤێن بۆ ڤێ مەرمێ هاڤێتین ڤەگوهاستنا مالباتا شێخێن بارزان بوو ژ ژێریێ عیراقی بۆ سلێمانیێ ل سالا ١٩٣٩ێ.

هندی پەیوەندی ب دەڤەرا بادینانڤە هەی بەری دەسپێکرنا شەری ب چەند رۆژەکان وەصی عەبدولئیلاهی[٤] ب هەڤالینیا چەند مەزنە بەرپرسەکان سەرا دەڤەرێ دا و دەستەلاتداریا وەسان راگەهاند کو مەرەم ژ ڤێ سەرەدانێ پەیوەندیا راستەخۆیە دگەل خەلکێ ل (باکوور).

ل سپێدەیا ١٥ تەباخا ١٩٣٩ێ میر عەبدولئیلاهـ گەهشتە مووسلێ، و سەرۆکێ جڤاتا نوونەران و رێڤەبەرێ پرۆپاگندە و بەلاڤکرنێ و سکرتێرێ شاهی رەشید عالی گەیلانی ژی گەهشتنە کاروانێ وی، ئاکرێ یەکەمین قەزایا لیوا مووسل بوو یا وەصی عەبدولئیلاهی سەرەدانا وێ کری و سپێدەیا ١٦ تەباخێ گەهشتە وێرێ و ئاغا و مەزنێن دەڤەرێ پێشوازی لێکر، یەك ژ ماقویلێن دەڤەرێ ب ناڤێ مەلا سەدیقی پەیڤەکا ب خێرهاتنێ خواند و وەصی گۆژمەکێ پارەی بۆ کرینا جلکان بۆ خویندکارێن هەژار بەخشی و بەری رۆژئاڤابوونێ کاروانێ وی زڤریڤە مووسلێ.

ل سپێدەیا ١٧ تەباخێ میر عەبدولئیلاهـ دگەل سەرۆکوەزیران نوری سەعیدی گەهشتنە زاخۆ و قائیمەقامێ زاخۆ و هژمارەکا کەسایەتیێن باژێری ل پێشوازییا وان بوون و چەند پەزەك ل بەر پێن وان هاتنەسەرژێکرن. ل ئێڤارا هەمان رۆژی گەهشتنە باژێرێ دهۆکێ و قائمەقامێ دهۆکێ ئەمین بەیرەقدار و سەرۆکێ باژێرڤانیێ عەبدولرەحمان بەکر[٥] و سەرۆکێن عەشیرەتان ژ وانا: سەعید ئاغایێ دۆسکی، حاجو ئاغایێ شەرەفانی و شێخ نوریێ بریفکانی ل پێشوازیێ بوون، دهۆك د وێ شەڤێدا ب رۆناهیێن کارەبێ هاتبوو خەملاندن، وەصی عەبدولئیلاهـ و هەڤالێن خۆ وێ شەڤێ ل مێڤانخانەیا باژێری ئەوا دکەتە سەرگری ل هنداڤ رووباری نڤستن.

ل سپێدەیا ١٨ تەباخێ وەصی عەبدولئیلاهـ و هەڤالێن خۆ گەهشتنە زاویتە و سوارەتۆکا و ل وێرێ قائیمەقامێ ئامێدیێ مەردان بەگ و مەتران فرەنسیس مەترانێ ئەبرەشیا ئەرەدنا و دەوروبەرێن وێ ل پێشوازییا وی بوون، دەمێ کاروانێ وەصی گەهشتیە بێبادێ[٦] ژ ئالیی سەرۆکعەشیرەت و زانایێن ئایینی گرنگترینێن وان شێخ غیاسەدینێ نەقشەبەندی، شێخ مەزهەر خەلیفەیێ شێخێ نەقشەبەندی، مەتران سەرکیس، مەلك خۆشابا، مەلك خیتو، مەتران یاولاها و یێن دیتر پێشوازی لێ هاتەکرن.

ل سپێدەیا ١٩ تەباخێ ل دووف داخوازا فەرماندێ کەمپا بریتانی ل سەرێ ئامێدیێ سپێدەیا ١٩



شاهـ فەیسەلێ دووێ ١٩٣٥- ١٩٥٨

تەباخێ کاروانێ پێکهاتی ژ عەبدولئیلاهی، نوری سەعیدی، رەشید عالی گەیلانی، مەولود مخلص سەرۆکێ جڤاتا نوونەران، عومەر نەزمی وەزیرێ ئابووری و هاتن و چوونێ، دکتور فائق شاکر وەزیرێ ساخلەمیێ (موتەسەرفێ کەرکوکێ ل سالا ١٩٤٠)ێ، قائیمەقامێ ئامێدیێ یونس سەبعاوی، و موتەسەرفێ (پارێزگارێ) مووسلێ تەحسین عەلی چوونە سەرێ ئامێدیێ، پشتی سێ دەمژمێرێن سوارێ ل سەر پشتا دەواران گەهشتنە سەرێ ئامێدیێ و ل وێرێ فەرماندێ کەمپێ گۆتنگهام[٧] و ئەفسەرێن بەریتانی دگەلدا مەتران سەرکیس و مەلك خۆشابا ل پێشوازیا وان بوون، هەژیە بێژین هەموو سەربازێن کەمپێ ئاسووری بوون.

میر عەبدولئیلاهی و هەڤالێن خۆ رۆژا ٢٠ تەباخێ ل سۆلاڤێ بۆراند و سەرۆکعەشیرەتێن هەردو ناحیێن نێروە رێکان و بەرواری بۆ سلاڤکرنێ هاتنە وێرێ، پرانییا وان سنگێ خۆ ب نیشان و مەدالیان خەملاندبوو، کەلحێ ئاغا و محەمەد ئەمین ئاغا ژ سەرۆکێن رێکانییان، رەشید ئاغا ژ سەرۆکێن نێروەییان، سەدیق ئاغا سەرۆکێ عەشیرەتا ئۆرەماری، محەمەد ئاغا سەرۆکێ عەشیرەتا بەرواری ژێری و تۆفیق بەگێ حەجی رەشید بەگێ ژ سەرۆکێن بەرواریان ژ وان بوون یێن هاتینەسەرەدانا میر عەبدولئیلاهێ و هەڤالێن وی.

سپێدەیا ٢١ تەباخێ کاروانێ میر عەبدولئیلاهی بەرەف ئەرەدنا و بامەرنێ کەتە رێ[٨]، ل ئەرەدنا مەتران فرەنسیس و تیپا دیدەڤانییا خواندنگەهـا ئەردنا ل پێشوازیا وان بوون، ل بامەرنێ ژی بەرەف تەکیا شێخ بەهائەدینی چوون کو دەرگەهێ وێ ب کڤانەکا خەملاندی ب ئالایێن عیراقێ هاتبوو نەخشاندن، شێخ بەهائەدین و کورێ وی شێخ غیاسەدین ل پێشوازیا وی بوون، پشتی کو فراڤین ل جەم شێخ بەهائەدینی خواری بەرەف ئەرەدنا زڤرینەڤە و ل وێرێ مەتران فرەنسیسی پەیڤەکا بخێرهاتنێ خواند و تێدا دلسۆزیا خۆ و تیرەیا خۆ بۆ مالباتا شاهی دیارکر ب داخوازا ژینێ درێژ بۆ شاهـ فەیسەلێ دووێ و عیراقێ پەیڤا خۆ ب دداوی ئینا. پشتی وێ پەیڤێ قەشە ئیستیفان هاتەپێش پەیڤەکا تەرخانکری بۆ پەسنا مالباتا شاهینی و مالباتا هاشمی خواند، تێدا هێرش برنە سەر وان یێن جوداهیێ دئێخنە ناڤبەرا کورد و عەرەب و مەسیحی و جوویان ، وی ژی پەیڤا خۆ ب داخوازا ژینێ درێژ بۆ شاهی و میر عەبدولئیلاهی ب داوی ئینا[٩].

سەرەدانێن مالباتا شاهینی بۆ دەڤەرا بادینان و ب مەرەما بۆراندنا دەمێن هاڤینێ و دیارکرنا هەیبەتا دەولەتێ چەندبارە دبوونەڤە، هەر میر عەبدولئیلاهـ ل سالا ١٩٤٨ێ سەرا دەڤەرێ داڤە و شاهـ فەیسەلێ دووێ ژی ل سالا ١٩٥٦ێ سەرا دەڤەرێ دا.

# ژێدەر و پەراوێز:

١. ل سالا ١٩٠٧ێ ل باژێرکێ (السلط) ئوردنێ هاتیبەسەردنیایێ، دەرچوویێ زانکۆیا ئەمریکی یا بێروتێ یە، چەند پلەیێن بلند د دەولەتا شاهینییا ئوردنێ دا وەرگرتینە وەك: سکرتێرێ جڤاتا یاسادانانا ئوردنێ، سکرتێرێ وەزارەتا ناڤخۆیی، قائیمەقامێ قەزا عەجلون، کارداری بالیۆزخانا ئوردنێ ل شامێ، چەندین مەدالیەیێن رێزلێنانێ وەرگرتینە، چەند پەرتووك هەنە، سالا ١٩٩٢ێ وەغەرا داویێ کرییە.

٢. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە: علی سیدو الگەورانی، من عمان الی العمادیة، تقدیم الدکتور سعد ابو دیة، (عمان- ١٩٩٦)، ص ١٦٥- ١٦٦.

٣. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە: مثري العاني، تفاصيل و وقائع زيارة الملك فيصل الاول الى منطقة العمادية، مجلة دهوك، العدد ٢٩- كانون الاول ٢٠٠٥، ص ٧٢- ٨٠.

٤. میر عەبدولئیلاهـ کورێ عەلی ل سالا ١٩١٣ێ ل باژێرێ (الطائف)ێ عەرەبستانا سعودی هاتیبەسەردنیایێ، ل مەکەهێ مەزن بوویە و پشتی دانانا مامێ وی فەیسەل وەك شاهێ عیراقێ ل تەباخا ١٩٢١ێ ئەو ژی ل مەکەهێ ئاکنجی بوو، د ئەنجامێ مرنا شاه غازی ل نیسانا ١٩٣٩ێ ژبەرکو هێژ کورێ وی شاه فەیسەل نەگەهشتبوو ژیێ پێگەهشتنێ، عەبدولئیلاهـ ب ئەرکێ سەمیانیا (وصی) وی رابوو هەتا مەها نیسانا ١٩٥٣ێ، د ئەنجامێ رووادنا شۆرشا ١٤ێ تیرمەها ١٩٥٨ێ میر عەبدولئیلاهـ هاتەکوشتن. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالهادي الخماسي، الامير عبدالاله ١٩٣٩- ١٩٥٨، دراسة تأريخية سياسية، (بيروت- ٢٠٠١).

٥. کەسەکی ب ڤی ناڤێ ل دهۆکێ سەرۆکاتییا باژێرڤانییێ نەکرییە.

٦. حکۆمەتێ د وی سەردەمیدا نیازەك هەبوو بێبادێ ل شوونا ئامێدیێ بکەتە قەزا بەلێ پاشتر وێ ب خۆ ئەڤ چەندە پشتگوهڤە هاڤێت.

٧. فەرماندێ بەتالیونەکێ ژ بەتالیونێن پاسەوانێن فروکخانەیێن ئینگلیزی بوو، بەلێ کەمپ بۆ وان کەسێن سەر ب هێزا ئەسمانی هاتبووڤەکرن ئەو نەخۆشێن پشتی ژ نەخوشخانەیان دەردکەفتن بۆ ڤوناغا تەنابوونێ (فترة النقاهة) دهنارتنە سەرێ ئامێدیێ.

٨. نوری سەعید ژ کاروانی ڤەقەتیا رۆژا ٢٠ تەباخێ بەرەف بەغدا زڤریڤە، پشتی کو شەڤەکێ مایە ل دهۆکێ چوو سێمێلێ و ژ وێرێ ب فرۆکەکێ چوو بەغدا. بنێرە هەمان ژێدەر، بپ ٨٢.

٩. کاروانێ وەصی و هەڤالێن وی ل رۆژا ٢١ تەباخا ١٩٣٩ێ و ل رۆژا ٢٣ تەباخێ سەرا هەولێرێ دا و پاشتر چوونە کەرکوکێ و ل رۆژا پێنجێ چریا دووێ سەرەدانا سلێمانیێ کر، ل ٩ چریا ئێکی ئێکێ سەرەدان ب داویهاتن و زڤرینەڤە بەغدا. بۆ پتر پێزانینان: بنێرە: طالب مشتاق، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦- ٩٦.

# (پەیمانا ١٩٣٠)ێ بریتانی - عیراقی

رەجەب جەمیل رەجب
وەرگێران موحسن عەبدولرەحمان

د هوندرێ وێ برۆسکەیێدا ئەوا هندەك ماقوولێن دهۆکێ بۆ بەرپرسێن عیراقی و بریتانی هنارتی، هەلویستێ وانێ ئاشکرا ل سەر پەیمانا عیراقێ و بەریتانی یا سالا ١٩٣٠ێ دیاردبیت، کو تێدا پشتەڤانیێ ل داخوازیێن نەتەوەپەروەرێن کوردان بۆ سەربەخۆبوویێ دکەن.

نوری سەعیدی وەزارەتا خۆ یا ئێکێ ل (ئادارا ١٩٣٠- - چریا ئێکێ ١٩٣١)ێ پێکئینا، ئەوا کاری گرێدانا پەیمانەك نوو دگەل بریتانیا بۆ رێکخستنا پەیوەندیێ دناڤبەرا هەردو لایاندا پشتی عیراق چوویە د کۆما مللەتاندا ل ١٩٣٢ێ ب ستۆیێ خۆڤە گرتی[1].

دانوستاندنێن فەرمی د ناڤبەرا هەردو لایەنان دا ل نیسانا ١٩٣٠ێ دەستپێکرن و نێزیکی سێ هەیڤان خایاند[2]. د هوندر دا هەردو لایەن گەهشتنەك دارشتنا داویێ بۆ پەیمانێ و ل ٣٠ی خزیرانا ١٩٣٠ێ ژ ئالیێ هەردو لایەنان هاتە واژووکرن[3]، کو پشتی عیراق دچیتە د کۆما مللەتاندا ١٩٣٢ێ بۆ ٢٥ سالان یا کارابیت و ئەڤ پەیمانە ب پەیمانا هەڤالینی و هەڤپەیمانیێ ناڤکر[4].

پەیمانا نوو یا ڤالا بوو ژ ئاماژەکرنێ ب هەر مافەکێ نەتەوەیێ کورد ئەوێن جڤاتا کۆما مللەتان وەکو مەرج بۆ گرێدانا ویلایەتا مووسلێ ب عیراقێ ڤە دانابن، لەورا ئەڤێ پەیمانێ ئۆمێدێن کوردان تێکدان[5].

کارڤەدانا نەتەوەخوازێن کورد بەرامبەر پەیمانا نوو، هندەك ژ رەوشەنبیرێن کورد رابوونا ب پێشکێشکرنا یاداشتان بۆ سکرتاریەتا کۆما مللەتان و مەندوبێ سامیێ بریتانی و حوکمەتا عیراقی، تێدا داخوازا مافێن کوردان و پێکئینانا حوکمەتەکا کوردی ل ژێر چاڤدێریا کۆما مللەتان کر[6].

یا د بابەتی دا بۆ مە گرنگ ئەوە ژمارەکا شێخ و سەرۆك عەشیرەتێن بەهدینان ئەو ژی: شێخ رەقیب سۆرچی، شێخ غەیاسەددین نەقشەبەندیێ بامەرنی، شێخ نوری بریفکانی، ئەدیب محەمەد مستەفا (ال القاضي) ئامێدی(سەرۆکێ باژێرڤانیا ئامێدیێ)، محەمەد حوسەین ئاغا بەرئاشی، تەتەرخان حەجی رەشید بەگ بەرواری و هندەکێن دی، ب ناڤێ عەشیرەتێن گولی و سندی و بەرواری و دۆسکی و هەموو عەشیرەتێن بەهدینان ل نەهی تەباخا ١٩٣٠ێ یاداشتەك بۆ کۆما مللەتان و (دار الأعتماد

البريطاني) ل بەغدا و سەرۆك وەزیرێن عیراقی و جڤاتا تەبابیا بریتانی (مجلس العموم البريطاني) پێشکێشکرن، تێدا ترسا خۆ ژ پەیمانا نوو دیارکرن و پشتەڤانیا داخوازێن خەلکێ سولێمانیێ ب پێکئینانا حوکمەتەکا کوردی یا سەربەخۆ کرن، کو تێدا هاتییە د ناڤبەرا بریتانیا و عیراقێ پەیمانەك نوو هاتییە واژووکرن و هیچ ئاماژەکرنەك بۆ مافێن کوردان نەکرییە و پشتی دو سالان عیراق دێ چیتە د کۆما گەلان دا و ب وێ چەندێ کورد دێ ل ژێر حوکمێ عەرەبان رەزیلبن، لەورا بۆ مە شەرمزارییە وەکو برایێن خۆ ل سولێمانیێ ئەم داخوازا مافێن خۆ نەکەین[٧].

واژووکرنا ڤان ل سەر یاداشتێ ئاماژەدکەتە زانینا وان ب رووداێن وی دەمی رووددان، هەژی ئاماژەپێکرنێ یە کو هندەك واژووکەر ئەندامێن کۆمەلا (پشتیوانی کورد) یا نەتەوەیی بوون[٨]. هەروەها هەژی ئاماژەکرنێ یە کو هندەك ژ واژووکەران ل سەر یاداشتێ پەیوەندییا خۆ ب بابەتی ڤە ماندەلکرن و پێگیرییا خۆ ب ئێکبوونا عیراقێ راگەهاند، رۆژنامەیا زەمان یا عیراقی ب ناڤێ هندەك واژووکەران هەوالێ یاداشتێ ب درەو راگەهاند ژ وان" محەمەد حوسەین ئاغا بەرئاشی، نماتاحالك حەجی رەشید بەگ، (سەرۆکێ باژێرڤانییا ئامێدیێ) ئەدیب غەیاسەددین نەقشەبەندی[٩].

ژ ناڤێن ڤان دیارە هەر د بنەمادا وان ل سەر هەوالێ درەوکرنا د رۆژنامەیا ناڤبری دا واژوونەکربوو، چنکو کەسەك نینە ب ناڤێ نماتا حالك حەجی رەشید بەگ بەرواری و، سەرۆکێ باژێرڤانییا ئامێدیێ ئەدیب مستەفا ئەفەندی بوو، نە ئەدیب غەیاسەددین نەقشەبەندی بامەرنی، چنکو غەیاسەددین نەقشەبەندی ئەندامێ جڤاتا نوونەرێن عیراقێ بوو، و هەتا کو رازی نەبوو پەیمانێ پەسەند بکەت، ژ ئەڤا بووری دیاردبیت دەزگایێن میری رابووینە ب بەلاڤکرنا ڤی هەوالێ درەو ب ناڤێ ڤان کەسان و ئەگەر راست ژی بیت، دهێتە ئالیسەنگرن کو دەزگایێن میری ئەو نەچارکرین، هەلویستێ خۆ بگوهۆرن و ژ داخوازێن نەتەوەیێن کوردی پاشکەزێ بکەن.

هەژی ئاماژەپێکرنێ یە کو عەلائەددین سوجادی ژ زاردەڤێ مەعروف جیاووکی نڤیسییە، کو یێ داویێ ب هەڤالبەندییا ئەفسەرەکێ کورد ب ناڤێ جەمال عارف چوویە سلێمانیێ ژبۆ بەرهەڤکرنا کارەکێ هەڤپشك د ناڤبەرا سۆران و بەهدینان دا ژ بۆ داخوازکرنا مافێن نەتەوەیێن کوردان و وان بریاردا نامەیان بۆ هەموو شێخ و سەرۆك عەشیرەتێن بەهدینان بنڤیسن دا کو ل رۆژا ٢٤ تەباخا ١٩٣٠ێ ل مزگەفتا مەزن یا سولێمانیێ ب بەهانەیا ئاهەنگ گێران ب هەلکەڤتا بوونا پێغەمبەری (س) کۆمببن، و ئەفسەر جەمال عارفي کارێ گەهاندنا نامەیان بۆ دەستێ سەرۆك عەشیرەتێن بەهدینان ب ستۆیێ خۆڤە گرت، ب نهێنییەکا تەمام ئەو نامە گەهاندینە سەرۆك عەشیرەتێن دهۆك و زاخۆ، پاشی بەرەڤ ئامێدیێ چوو و بۆ مێهڤانێ قائیمەقام ماجد مستەفای و دەمێ قایمقام ژێ پرسی بۆچی هاتییە دەڤەرێ راستی بۆ نەگۆت، هینگێ ماجد مستەفا رابوو ب نیشادانا نامەیێن جەمال عارفي داینە سەرۆك عەشیرەتێن بەهدینان، ئەڤجا بۆ دیاربوو کو هندەك سەرۆك عەشیرەتێن بەهدینان نامە داینە دەست دەزگایێن حکۆمەتێ، ئەگەر دۆستینییا ب هێزا ناڤبەرا جەمال عارفي و قایمقامێ بابەت ب بەرئێکڤەئینای نەبا یێ داویێ دا تووشی سزایان بیت، نەمازە ئەو وی دەمی ئەفسەربوو د سوپایێ عیراقێ دا و قائیمەقامی داخواز ژێ کر ل دەڤەرێ کارێن وەها نەکەت[١٠]. ئەگەر مگرتییەکێ بەرچاڤ وەرگرین کو ئاغایێن دەڤەرا بەهدینان ئەو نامە داینە دەست دەسەلاتدارێ، ئەم دوور نابینین کو برۆسکا وان بۆ کۆما مللەتان و پشتەڤانییا وان بۆ خەلکێ سلێمانیێ چێکرنا وان کەسان بوو یێن وی سەردەمی مژوولی دۆزا کوردی.

ل ١٦ چریا ئێکێ ١٩٣٠ێ ب مەرەما باوەری پێدانێ پەیمان ل جڤاتا نوونەران هاتەبەرچاڤکرن[١١]. و پتریا ئەندامێن جڤاتێ باوەری ل سەر دا و تنێ سێزدە ئەندامان ژ سەرجەمێ دەنگدەران کو ٨٨ نوونەربوون رەتکر، و ژ بەرهنگارێن پەیمانێ نوونەرێ قەزا ئامێدیێ

شێخ غەیاسەددین نەقشەبەندیێ بامەرنی بوو[١٢].

هەروەسا شێوازێ حۆکمەتێ د بکارئینانا هێزێ بۆ ژ ناڤبرنا بزاڤا شێخ مەحموودێ بەرزنجی دا ل ئیلولا ١٩٣٠ێ دا رەتکر[١٣]. پشتی رەتکرنا خەلکێ سلێمانیێ بۆ پەیمانێ و داخواز ژ حۆکمەتێ کری لێتێگەهشتنێ دگەل شێخ مەحموودی بکەت و گوهداریا داخوازێن وی بکەت[١٤].

د گەرماتیا ڤان رووداناندا و ب مەرەما کۆنترۆلکرنا سەروبەری جێنشینێ شاهی (ولی العهد) میر غازی بریاردا سەرەدانا دەڤەرێن کوردان ژ وان ژی دەڤەرا دهۆک و زاخۆ بکەت و ل ٢٢ تیرمەها ١٩٣٠ێ ژبۆ تەناکرنا سەروبەری و دلنیاکرنا خەلکێ سەرا هەریەك ژ دهۆك و زاخۆدا، موتەسەرفێ مووسلێ تەحسین عەلی رێڤەبەرێ پۆلیسان حوسامەدین جومعە و نۆشدارێ باژێرڤانییا مووسلێ عەبدولئەحەد عەبدولنور هەڤالینیيا میر غازی دکرن د ڤێ سەرەدانێدا، پشتی روودانێن سلێمانیێ یێن ٦ ئەیلوولا ١٩٣٠ێ[١٥] شاندێن کوردان بەرەف بەغدا چوون، حازم شەمدین ئاغا و شێخ غیاسەدین نەقشەبەندی ئەندامێن ڤان شاندان بوون[١٦].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. غانم محمد غانم الحفو(الدكتور) و عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٢؛ سفانة هزاع اسماعيل حمودي الطائي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٨.

٢.. عبدالرحمن البزاز، المصدر السابق ص ١٤٧؛ احمد رفيق البرقاوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٣.

٣. عبدالرزاق الحسني، تأريخ العراق السياسي الحديث،(بغداد- ١٩٨٩)،ط٧،ج٣،ص ٣١١. بۆ پتر پێزانینان ل سەر پەیمانێ بنێرە: فاروق صالح العمر (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤٣-٣٠٧.

٤. غانم محمد الحفو (الدكتور) و عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٢؛ سروة اسعد صابر (الدكتورة)، كوردستان الجنوبية ١٩٢٦-١٩٣٩ دراسة تأريخية سياسية، (سليمانية- ٢٠٠٦)، ص ١٠٥.

٥. عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، (بيروت- ١٩٧٤)، ط٤، ج٣، ص ٥٩؛ غانم محمد الحفو (الدكتور) و عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٤.

٦. خليل مصطفي عثمان الاتروشي، المصدر السابق، ص ١٣٦؛ للمزيد من التفاصيل عن تلك المذكرات ينظر: عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات... ط٤، ج٣، ص ٥٩- ٦٧ ؛ غانم محمد الحفو (الدكتور) و عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٢- ٣٥.

٧. احمد خواجە، چیمدی، (سلیمانی- ١٩٧١) بەرگی ٣، بپ بپ ٧٩- ٨٠؛ يوسف مالك، الخيانة البريطانية للاشوريين، (امريكا- ١٩٣٥)، ص ٣٥. بۆ دیتنا دەقێ یادداشتێ بنێرە: يوسف مالك، المصدر السابق، ص ٣٥.

٨.. ل بەغدا سالا ١٩٢٧ێ ژ کۆمەلەکا رەوشەنبیرێن کورد وەکو مصطفي شەوقی سەرۆکێ کۆمەلێ و رەشید نەجیب و ئەحمەد خەواجە و هندەکێن دی هاتە پێکئینان، چالاکیێن کۆمەلێ بەرفرەهبوون و لق ل مووسل و هەولێرێ ڤەکرن و رەفیق حلمی سەرۆکێ لقێ مووسلێ بوو. للمزيد ينظر: خليل مصطفي عثمان الاتروشي، المصدر السابق،ص ١١٧- ١٢١.

٩. جريدة الزمان، العدد ٢٤٥ فی ٢/٩/ ١٩٣٠؛ سروة اسعد صابر (الدكتورة)، كوردستان الجنوبية...، ص ص ١١٧- ١١٨؛ نوشيروان مصطفي امين، المصدر السابق، ص ٢٧٢.

١٠. عەلائەدین سوجادی، شۆرەشەکانی کورد وە کورد و کۆماری عیراق، (تاران- ٢٠٠٥)، بپ بپ ١٢١- ١٢٣.

١١. عبدالرزاق الحسني، العراق في ظل المعاهدات،(بيروت- ١٩٨٢)، ط٥، ص ٢٣٢.

١٢. عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات... ط٤،ج٣، ص ص ٨٧-٨٨؛ عدنان سامي نذير، المصدر السابق، ص ٤٤٩؛ سفانة هزاع اسماعيل محمود الطائي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٩.

١٣. بۆ پتر پێزانینان ل سەر ڤێ بزاڤا شێخ مەحموودی ئەوا ب سەرهلدانا ئاوباریك هاتییە نیاسین بنێرە: سروه اسعد صابر (الدكتورة)، كوردستان الجنوبية...، ص ص ١٦٦- ١٩١.

١٤. احمد محمد امين قادر، موقف مجلس النواب العراقي من القضية الكوردية في العراق، (السليمانية- ٢٠٠٧)، ص ١٣٥؛ نوشيروان مصطفي امين، المصدر السابق، ص ١٨٥.

١٥. بەردەرکی سەرای سلێمانی ٦ ئەیلوول ١٩٣٠.

١٦. وصفية محمد شيخو ، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٢٠٧.

# کودەتا بەکر سدقی ١٩٣٦

پ. د عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی
وەرگێران موسەدەق تۆڤی

کودەتا ١٩٣٦ێ کو ب کودەتا بەکر سدقی (١٨٩٠-١٩٣٧)ێ ژی د هێتەناڤکرن یەك ژ گرنگترین روودانێن دیرۆکا هەڤچەرخا عیراقێ، ل ٢٩ چریا ئێکێ ١٩٣٦ێ کودەتایەکا لەشکەری ئەوا ب سەرکردایەتییا فەریق بەکر سدقی (سەرکردێ تیپا دووێ- الفرقة الثانیة) هاتیەکرن داوی ب حکۆمەتا یاسین ئەلهاشمی سەرۆکوەزیرێن عیراقی ئینا و ل شوینا وێ حکۆمەتەکا دیتر ب سەرۆکاتییا حکمەت سلێمان هاتەپێکئینان.

کودەتاکەران حکۆمەتا یاسین ئەلهاشمی ب وێ چەندێ گونەهبار کر کو دەست ب دەڤێ سیاسەتمەدارێن بەرهەلستکاردا گرتییە، و رۆژنامەڤانی ژ کار ئێخستییە و کۆنترۆل ل سەر پەرلەمانی کرییە و بزاڤێن عەشیرەتان ژ ناڤبرینە و سەروبەرێ نە ئاسایی (الأحکام العرفیة) راگەهاندییە و کارێ هندێ دکەت کو سیستەمێ دەسەلاتدارییێ بکەتە سیستەمەك مەلبەندی و دیکتاتوری.

ل بەراهیێ پشتەڤانییەکا مللییا گەرم ل کودەتایێ هاتەکرن، هێز و دەستەکێن سیاسیێن مللی و پێشڤەروو هیڤی ژ کودەتایێ هەبوون، ئەڤە ژی بەروڤاژی بوو دگەل بۆچوونێن هێز و دەستەکێن نەتەوەیێن عەرەبی چ یێن لەشکەری بن چ یێن مەدەنی، ل مووسلێ ب دلخۆشی و خۆنیشادانان ل جادەیێن باژێری پێشوازی ل کودەتایێ کر، شاندەکی ب مەرەما پێشکەشکرنا پیروزباهیێ بۆ حکۆمەتا کودەتایێ ب سەرۆکاتییا مفتیێ باژێری زانایێ ئاینیێ ناڤدار محەمەد حەبیب ئەلعوبەیدی سەرا بەغدا دا و چەند ئاغا و ماقوولێن دەڤەرا بەهدینان ژی د ناڤ ڤی شاندی دا بوون.

گومان تێدا نینە کو ڤێ کودەتایێ کاریگەرییەکا مەعنەویی ل سەر هەستا نوو گەهشتیا نەتەوەییا کوردان هەبوو، ئەڤە ژی تنێ ژبەر وێ چەندێ بوو کو سەرکردێ کودەتایێ د بنیاتدا کورد بوو هەرچەندە خزمەتا دۆزا کوردان د ئارمانجێن وی دا نەبوو، نەتەوەپەروەرێن عەرەبان ژی د وی هزرێ دا بوون کو بەکر سدقی کوردەکێ نەتەوەییێ جودا خوازە و کار بۆ دامەزراندنا دەولەتەکا کوردی دکەت، ئەڤە ژی دبیت ژ ئەنجامێ وێ چەندی بیت کو بەکر سدقی پەیوەندی دگەل هندەك کەسایەتیێن کورد وەك شێخ مەحموودێ بەرزنجی و توفیق وەهبی و یێن دیتر

هەبوون. د راستیدا چ بنیات بۆ ڤێ پرۆپاگندەیێ نەبوو و تنێ ئەو گۆتگۆتكەك بوو دوژمنێن كودەتایێ ب مەرەما دووربێچكرن و ڤەدەركرنا حكۆمەتا كودەتایێ و دیتنەڤا پاكانەیان بۆ كوشتنا بەكر سدقی ل مووسلێ ل ١١ تەباخا ١٩٣٧ی بەلاڤەدكرن[١] . ڤێ پرۆپاگندەیێ دەنگڤەدانا خۆ ل كوردستانێ هەبوو، گرۆڤێ ڤێ چەندێ ژی ئەوبوو كو هندەكان وەسان باوەردكر كو بەلێ بەكر سدقی كار بۆ دامەزراندنا دەولەتەكا كوردی دكر، ژ ڤان ڤەگێرانان یێن پەیوەندی ب دەڤەرا بەهدینان ڤە هەی گوایە: بەكر سدقی پەیوەندی ب عەبدوللا ئاغایێ شەرەفانی ڤە كرییە كو وی دەمی ل شێخان بوو و گۆتیێ: وی ل بەرە دەولەتەكا كوردی دامەزرینیت و عەبدوللا ئاغای ژی بۆ ڤی مەرەمێ دگەل فارس ئاغایێ زێباری و قادر میرانی ئاخفتییە و وان ژی پێشنیازكرییە كو بەكر سدقی ڤی بابەتی دگەل شێخ ئەحمەدێ بارزانی ڤەكەت كو وی دەمی شێخ ئەحمەد ل سرگۆنیێ بوو ل پردێ (ئالتۆن كۆپری)[٢] و شێخ ئەحمەد ژی رازی بوویە ل سەر ڤێ پێشنیازێ[٣].

ئەڤ ڤەگێرانە ب خۆ ڤەگێرانەك كەسۆكییە و نەیا پشتكەرمە ب چ بەلگەنامە و گرۆڤان، لەوما ژی د شیاندا نینە باوەریێ پێ بینین. ئەگەر مكرتییەكێ وەرگرین و بێژین بەلێ وی ب دروستی دڤیا ڤێ چەندی بكەت و دەولەتەكا كوردی دامەزرینیت، بۆچی پەیوەندی ب سیاسەتمەدارێن كوردڤە نەدكر ئەوێن بزاڤ بۆ دەستڤەئینانا مافێن نەتەوەیی یێن كوردان دكرن وەك شێخ مەحموودێ بەرزنجی، رەفیق حلمی، مەعروف جیاوەك، توفیق وەهبی و یێن دی، هەروەسان ئەوێن ژێ هاتییەخواستن كو پەیوەندیێ پێڤە بكەت ژ بلی شێخ ئەحمەدێ بارزانی كو ئەو ژی نە ل وی دەمی ل ئالتۆن كۆپری بوو بەلكی ل نەفیێ ل ژێرییێ عیراقێ بوو هەموو نەخویندەوار و كۆلكە خویندەوار بوون و د هەمان دەمدا ئالیكرێن حكۆمەتا عیراقێ بوون و تنێ عەشیرەتێن وان گوهداریا وان دكرن و چ پەیوەندی دگەل بزاڤا نەتەوەیا كوردی نەبوو، بەلكی ئەو سەرۆك عەشیرەتە پشتەڤانێن مووركرنا پەیمانا ١٩٣٠ێ بوون و هەركەسێ داخوازا دەولەتا كوردی دكر ل دووڤ بۆچوونا وان پشتەڤانێ كۆلونیالیزمێ (ئیستعمارێ) بوو و جوداهی د ناڤبەرا كورد و عەرەباندا دروستدكر[٤].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. بۆ زانینا هەلویستێ كوردان ل سەر كودەتایێ و مژارا نیازا بەكر سدقی بۆ دامەزراندنا دەولەتەكا كوردی بنێرە: الحفو و البوتانی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٣- ٦٦.

٢. شێخ ئەحمەد و مالباتا وی ل سالا ١٩٣٧ێ ئانكو سێ سالان پشتی كودەتایێ هاتبوونە ڤەگوهاستن بۆ پردێ.

٣. بنێرە دەڤێ ڤەگێرانێ ل : محمد اسماعیل محمد، ئینقیلابی بەكر صدقی لە ١٩٣٦/١٠/٢٩ هۆیەكان و

٤. بنێرە: نوشیروان مصطفي امین، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٧٢ ؛ جریدة (فتی العراق) الموصلیة، العدد (٥٤٤/٥٦) اذار ١٩٤١، وێ چەندێ ژی ژبیر نەكەین ل سەردەمێ بەكر صدقی و ل رۆژا ١٩٣٧/٧/٨ێ پێكهاتنا (میثاق) سەعد ئاباد د ناڤبەرا عیراق و تركیا و ئیران و ئەفغانستانێدا هاتبوو مووركرن و ژ ئارمانجێن وێ ژی لێدان و ژناڤبرنا هەر بزاڤ یان سەرهلدانەكا نەتەوەیا كوردی بیت.

# دهۆك د سالێن شەرێ جیهانیێ دووێ دا

وەصفیە محەمەد شێخو
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

## پێشەکی

ئەو دەمێ دکەڤیتە ناڤبەرا وەرگرتنا وەصی عەبدولئیلاهی بۆ ئەرکێ وەصیەتیێ ل سەر تەختێ شاهیێ عیراقێ و دەستپێکرنا شەرێ جیهانیێ دووێ ل ئەیلولا (١٩٣٩)ێ رەنگە تەناهیەکا رێژەیی خۆ ب سەر عیراقێدا گرتبوو، نەمازە دوێ قۆناغێدا دژایەتییا سیاسەتا بریتانیا ب سەروبەرێ سیاسیێ عیراقێ ڤە یێ دیاربوو ، هەر دوی دەمیدا (رەوتا نیشتمانی و نەتەوەیی) و چالاکیێن پرۆپاگندەیێن ئەلمانی ب رەنگەکێ ب هێز وبەرچاڤ ددیاربوون، هەر چەندە بریتانیا و حکۆمەتا سەرۆك وەزیرێن عیراقێ نوری سەعیدی هەموو پێکۆل دکرن کو سنوورەکی بۆ ڤان رەنگە چالاکییان دانیت.

نوری سەعیدی ل (٥) حزیرانا(١٩٣٩)ێ هەلبژارتنێن نوی یێن جڤاتا نوینەران ئەنجامدان و پرانییا جڤاتێ بۆ پشتەڤانییا حکۆمەتا خۆ دەستڤە ئینا ، ل (١٣) حزیرانێ وەصی عەبدولئیلاهی ب خۆ جڤاتا نوو ڤەکر، د پەیڤا خۆ دا ب وێ هەلکەفتێ سیاسەتا گشتییا وەلاتی دیار کر، د وارێ سیاسەتا دەرڤە ژی دا ئەو چەند دیارکر دبەرامبەر کاودانێ ناڤ دەولەتیێ ئالۆز کریارا ئاشتی پیدڤی ب پەیوەندیێن هەڤالینیێ و هاریکاریێ دناڤبەرا دەولەتێن گریدای ب پەیمانا سەعد ئاباد ڤە هەیە[١].

بەرامبەر ئالۆزیا سەروبەرێ ناڤ نەتەوەیی، بریتانیا هەموو بزاڤێن خۆ دکرن کو ئەگەر شەرێ جیهانیێ سەرانسەری رووداڤ[٢]، عیراق یا پابەند بیت ب دەق و ناڤەرۆکێ پەیمانا (١٩٣٠)یڤە، دکۆمبوونا جڤاتا وەزیران یا(٢٥) تەباخا (١٩٣٩)ێ نوری سەعیدی ب ئاشکرایی ڤیانا خۆ دیارکر ئەگەر بریتانیا شەر دژی ئالمانیا راگەهاند عیراق مل ب ملێ بریتانیا بچیتە د شەریدا[٣].

ل رۆژا ئێکێ ئەیلوولا (١٩٣٩)ێ لەشکەرێ ئەلمانیا ب سەر پۆلونیا دا گرت و ئەو وەلات داگیرکر، ل (٣)ی ئەیلوولێ هەریەك ژ فرەنسا و بریتانیا راگەهاند کو ئەو دسەروبەرێ شەری دانە دژی ئەلمانیا، ئەڤە د دەمەکیدا بوو کو هێژ بەرۆکا شەری دناڤبەرا هەردو ئۆردوگایێن (دەولەتێن میحوەر) و (دەولەتێن هەڤپەیمان) بەرفرەهـ نەببوو، دهەمان رۆژدا نوری سەعید ی پەیڤەك خواند و تێدا پێگیریا عیراقێ ب پەیمانا (١٩٣٠)ێ ب تایبەت (بەندێ چوارێ) ژ پەیمانێ کو ئاسانکاریێن هاتن وچوون و گەهاندنێ بۆ بریتانیا



نوری سەعید

دابینکەن راگەهاند، هەروەسان نوری سەعیدی دوور دیت کو عیراق بچیتە دشەریدا بۆ بەرژەوەندیا بریتانیا، بەلێ د راستی دا ئەڤە موناوەرەکا سیاسی بوو ژ ئالیێ نوری سەعیدی ڤە و وی ل رۆژا (٥) ئەیلوولێ پەیوەندیێن دیبلوماسیێن وەلاتێ خۆ دگەل ئەلمانیا برین و وەصی ژی د ڤێ چەندێ دا پشتەڤانیا وی کر و د دەمەکی زوودا نوری سەعیدی نیازا خۆ بۆ پشکداریێ د شەری دا مل ب ملێ بریتانیا ڤە هەتا دووا قۆناغ دیارکر[٤].

یاگرنگ بۆمە ل ڤێرێ کاودانێن کوردستانا باشوورە (عیراق) و ب تایبەت دەڤەرا بەهدینان ( پارێزگەها دهۆك یا نها)، سەرەرای کو شەرێ جیهانی یێ ئێکێ هیڤیێن کوردان تێکدان ژبۆ ئاڤاکرنا قەوارەیێ خۆ یێ سیاسی یێ ئێککرتی، هەروەسا ئەو هیڤی نەمان پشتی پەیمانا سالا (١٩٣٠)ێ و چوونا عیراقێ بۆ ناڤ کۆمەلا گەلان دا، و ل دووڤدا شەرێ جیهانی یێ دووێ ب روودانێن خۆ یێن دژوار و گران ڤە بێتە ئازراندن. کوردان ژ روودان و کارتێکرنا ئەڤی شەری ل سەر عیراقێ بۆ خۆ ب دەلیڤە نە دیت کو مفایەکی ژێ وەرگرن، بەلکو دەلیڤەکا دیتر بوو ژ بۆ دیارکرنا نیازا حکۆمەتێن عیراقی بەرامبەر داخوازیێن کوردا یێن نەتەوایەتی، گەلەك هۆکار هەبوون شینپەنج ل دووڤ خۆرا هێلا بوون د هشیارکرنا هەستا نەتەوایەتیا کوردی د دەمێ ئەڤی شەریدا، وەك بزاڤا مایس سالا (١٩٤١)ێ و شکەستنا وێ ژ ئەگەرێ داگیرکرنا بریتانیا ل سەر عیراقێ کو داگیرکرنەکا لەشکەری یا دووێ بۆ ب درێژاهییا ئەوی ماوەیێ مایی ژ شەری، وئەو قەیرانا ئابووریا بەرتەنگ کو کارتێرکرنا وێ نە تنێ ل سەر عیراقی بوو ، بەلکو ل سەر کوردستانا عیراقێ ژی بوو[٥].

کوردستان تۆشی قەیرانەکا ئابووری یا مەزن بوو، نەخاسمە د سالێن داویێ یێن شەریدا، و گەلەك هۆکار هەبوون کارتێکرن د دروستکرنا ئەڤێ دیاردا دژواردا کرن وەك: لاوازیا بزاڤا بازرگانییا عیراقێ چونکی یا گرێدای بوو ب پارێ ئەستەرلینی و تارادەکی هاوەردەکرن ژ دەولەتێن دەوروبەر یا راوەستیای بوو، هەروەسا وەرزێ چاندنێ ژی یێ بێ سەروبەر بوو، و بەرفرەهەبوونا بیاڤێ شەری و بکارئینانا هاتن و چوونێ بۆ مەرەمێن شەری، زێدەباری بەلاڤبوونا دیاردا رەڤاندنێ و بازارێ رەش و هەڤرکییا نە رەوا د بازاری دا ئەوا هندەك بازرگانێن بێ ووژدان وهندەك فەرمانبەرێن دەولەتێ ئەنجام ددا.

بۆ نموونە رێژەیا ئەو فەرمانبەرێن ژ بەغدا فرێکرینە کوردستانێ (٩٠٪)ێ ژ وان رەگەز عەرەب بوون، و ب خرابی رەفتار دگەل کوردان دکرن و چ پێدڤیێن وان بێی بەرتیل ب جهـ نەدئینان، ئەڤە هەمی بوونە هۆکار هەژاری و برس بەلاڤ بیت و بهایێ کەل و پەلان ژی ژ ئەگەرێ شەری بەرز ببوو[٦]. و خرابیا ئەوێ قەیرانا ئابووری ئەوا کوردستان تۆشبوویێ[٧]. و ل دووڤدا پەیدابوونا هندەك خرابکاریا ئەوێن ژ ئەنجامێ ڤێ دیاردا دژوار دروست بووین و کارتێکرن ل سەر ئێمناهیا ئاکنجیێن کورد کری، بۆ نموونە هاتییە

دیارکرن کو سەروبەرێ ئێمناهیێ ل دهۆکێ یێ خراب بوویە دگەل پەیدابوونا کەسێن چەتە و رێگر سەرەرای هەولێن پۆلیسا ژ بۆ راوەستاندنا چالاکیێن وان، ئەڤە وەك دیاردەك ژ دیاردێن قەیرانا ئابووریا مەزن ل کوردستانێ. بۆ نموونە ل سالا (١٩٤٣)ێ ژمارا تاوانا ل باژێرێ دهۆکێ گەهشتە(١٠٤)، و ل زاخۆ (٨٨)، و ل ئاکرێ (٧٩) تاوانان[٨].

ژ ڤێ گرانییا قەیرانا ئابووری ئەوا کوردستان هەمی بخۆڤەکرتێ دیاردبیت کو جۆرە خەمسارییەك هەبوویە یان دوورپێچەکا ئابووری ل سەر کوردستانێ هاتییە سەپاندن، هەروەسا باندۆرێن شەری نەخاسمە هەبوونا هێزێن رۆسی ل ئیرانێ و ئازراندنا وان بۆ هەستێ نەتەوایەتییا کوردی[٩]، و ژلایەکێ دی ڤە بەری شەرێ جیهانییێ دووێ و د ماوەیێ شەری و ل پشتی شەری رێکخستنێن نەتەوایەتی و سیاسی یێن کوردی پەیدابوون کو دبیاڤێ رەوشنبیری و سیاسی دا هاتنە دامەزراندن، رەوشنبیر و خویندکارێن کورد دەست ب چالاکییان کر و هندەك جاران ژی ب پشتەڤانیا کەسایەتیێن کورد ژ هندەك مالباتێن عەشیرەتی و یێن ئایینی یێن بەرنیاس د دروستکرنا رێکخراوێن سیاسی و جڤاکی ورەوشنبیری یێن نهێنی و یێن ئاشکەرا ب مەرەما ب دەستڤە ئینانا مافێن نەتەوایەتیێن رەوا یێن مللەتێ کورد، هەروەسا روودانێن سیاسی ل عیراقی هاتنە گرێدان ب چالاکیێن وان رێکخستنا ڤە[١٠].

کۆمەکا هۆکاران رێخۆشکەربوون د بەرهەڤکرنا بیاڤێ دروستکرنا وان رێکخستناندا وەك: پێکەهشتنا هەستا نەتەوایەتی ژ ئەگەری بەردەوامییا سیاسەتا حکۆمەتێن عیراقێ بەرامبەر کوردستانێ کو یا پێکهاتی بوو ژ تەپەسەرکرنا نەتەوایەتی و گرتنێ و ڤەگوهاستنا فەرمانبەرێن کورد بۆ هندەك دەڤەرێن دیتر و جوداهی و رەگەز پەرستیێ دناڤبەرا کورد و عەرەباندا، زێدەباری داخبارییا گەنجێن کورد ب هزرێن دیمۆکراسی و پێشکەفتی ئەوێن دەولەتێن هەڤپەیمان داکوکی ل سەر دکر[١١].

هەمی ئەوا بەری نها مە بەحسکری بوویە ئەگەرێ بیاڤەکێ خۆشکەر ژ بۆ پەیدابوونا بەرهەلستکاریێ بۆ حکۆمەتا عیراقێ و سیاسەتا وێ ل هەمی دەڤەرێن کوردی و ژوانا ژی دهۆکێ [١٢]، ب شێوییێن جۆرە و جۆر وەك مانگرتن و خۆنیشادان و سەرهلدانا کو دێ ل داهاتی دا بەحس ل سەر کەین.

بەری ئەم ئاماژە ب شێوەیێن بەرهەلستکارییا کوردی ل دەڤەرا دهۆکێ بکەین، پێدڤیە ئاماژە ب جهێ وێ یێ جوگرافي و ستراتیژی و لەشکەری بکەین چونکی دکەڤیتە سەر سێ گۆشەیا سنوورێ عیراق و سوریا و ترکیا زێدەباری گرنگییا وێ یا ئابووری و مرۆڤی و کارتێکرنا وێ چەندێ ل سەر هەلویستێ وێ ژپێشڤە چوون و گۆرانکاریێن سیاسی یێن عیراقی و عەرەبی د ماوەیێ دناڤبەرا سالێن (١٩٤٣-١٩٥٨) ێ، زێدەباری کو دهۆك و قەزایێن نها ب سەرڤە سەر ب لیوا مووسل ڤە بوون کو ئەوێ ژی هەلویست و رۆلەکێ کارتێکەر هەبوویە ژ وان گۆرانکاریێن مەبەحس ل سەر کری.

## دهۆك دماوەیێ شەرێ جیهانیێ دووێ دا ١٩٣٩ - ١٩٤٥

د سالێن شەرێ جیهانیێ دووێدا زاخۆ کو نها گرنگترین قەزایێن پارێزگەها دهۆکێ یە ژدەڤەرەکا گرنگا بەرگریکرنا بریتانیا بوو ژ عیراقێ، ئەو سەروبەرێ سیاسی یێ ئالۆز یێ کو دەڤەر تێدا دبۆری بریتانیا پالدا تاکو ب لەز پێدڤیێن بەرەڤانیکرنێ ژ عیراقێ دروست بکەت ب تایبەت پشتی ئەوێ سەرکەفتنا سەرکردێ ئەلمانی مارشال روملل (Romel) ل باکوورێ ئەفریقیا ب دەستڤە ئینای و بریتانیا ژێ حێبەتی بووی[١٣]، و ژ ئەگەرێ وێ چەندێ بریتانیا بریاردا جهێن خۆ یێن بەرەڤانیێ پتر ب هێز بێخیت ب هەمی رێکا ل دەولەتێن عەرەبی نەخاسمە ل عیراقێ و ژبۆ وێ چەندێ هێزێن بریتانی رابوون و دەست ب دروستکرنا شیرها و خەندەکێن بەرگریکرنێ ل دەڤەرێن رۆژهەلات و رۆژئاڤایی باژێرێ مووسل کرن، هەروەسا ل هەمان دەم دا رابوون ب کۆلانا هندەك

ئاستەنگێن دیتر یێن بەرەڤانیێ ب دووراتییا (٢٠) میلان ل باكوورێ باژێرێ مووسل و ب تایبەت ل دەڤەرا زاخۆ، كو مفا دیتییە ژهەبوونا هندەك ئاستەنگێن كەڤری و چیایی كو بۆ هێزین بریتانی دبیتە هۆكارەكێ هاریكار ژ بۆ بەرەڤانیكرنێ[١٤]. هەروەسا دهێتە گۆتن كو حازم شەمدین ئاغا گەلەك ژخەلكێ زاخۆ وەك كرێكار ژبۆ كارێن كۆلانا ئەردی بۆ بریتانیا بربوون و هەر ژبۆ وێ چەندێ تاكو دەلیڤێن كاری ژی بۆ وان كەسا پەیداكەت ژبەر وان كاودانێن ئابووری یێن سەخت یێوێ د وی ماوەی دا ب سەر دەڤەرێ دا هاتین[١٥]. دیسان هێزێن بریتانی رابوون ب هندەك مەشق مانورێن لەشكەری، كو پێكهاتی بوون ژ مەشقكرنا لەشكەری بریتانی ل سەر شێوازێ شەرێ مودرن و پێشكەفتی وەك هێرشێن ئێكسەر و ب لەز و خۆ ڤەكێشانا ژنەچاری ب كێمترین زیان[١٦]. هەروەسا (بەتالیونەكا سنووری) ژمارە (١) ل زاخۆ ژ لەشكەرێ عیراقێ ژبۆ بەرەڤانیكرنێ ژ عیراقێ تاكو پشتەڤانییا (تیپا) هەشتا هندی بكەت هاتە پێكئینان[١٧]. دشێین بێژین كو ئەڤ گرنگییا بریتانیا دایە زاخۆ، دزڤریت بۆجهێ وێ یێ سنووری، ستراتیژی و گرنگ و یێ نێزیكی تركیا، ژ بۆ پاشڤەبرنا هەرهێرشەكا ئەلمانی یا نەچاڤەریكری ژلایێ تركیا ڤە ب رێكا زاخۆ.

ژلایەكێ دی ڤە بریتانیا هەول دا خۆ نێزیكی خەلكێ زاخۆ و هندەك كەسایەتی و ریهـ سپیا بكەت ب مەرەما مفا وەرگرتنێ ژ شارەزایی و شیانێن وان ژبۆ ب هێزكرنا هێزێن خۆ یێن لەشكەری دناڤ عیراقێ و ژ دەرڤەدا، وبریتانیا شیا ل سالا (١٩٤٢)ێ هندەك ژ كەسایەتی و خەلكێ زاخۆ بۆ لایێ خۆ بكێشیت و بنە لەشكەر و بچنە دناڤ هێزێن لیڤی یێن بریتانی دا. ئەو ژی : سلێمان حاجی بەدری سندی و رەئووف مەلا حاجی سندی و هندەك كەسایەتیێن دیتر، و چوونا ئەڤان كەسا بوویە ئەگەر گەلەك ژ خەلكێ دەڤەرێ بچنە دناڤ رێزێن لەشكەری لیڤی یێ بەریتانی دا[١٨].

یا كو پتر بوویە ئەگەرێ چوونا گەلەك ژ كوردان بۆ ناڤ هێزێن بریتانی زێدەباری ژمارەكا كەسایەتییا ژ عەشیرەتێن بەرواری و دۆسكیا ئەوێن سەر ب قەزا ئامێدی و دهۆكی ڤە یێن چووینە ناڤ هێزێن لیڤی یێن بریتانی، ئەو پرۆپاگندەیێن بریتانیا بوون یێن بەلاڤدكرن كو ئەو كەسێ خۆ بەخش بكەت بۆ ناڤ هێزێن بریتانی دێ مووچەك دگەل پێشكێشكرنا هندەك هاریكارییێن پێدڤی بۆ هێتەكرن وەك ئازۆقە و جل وبەرگ و گەلەك تشتێن دیتر.

ئێك ژ وان سەربازێن خۆ بەخش كو ل دووڤدا بوو ئەفسەر دناڤ رێزێن لەشكەری لیڤي ب ناڤێ سلێمان حاجی بەدری د بیرهاتنێن خۆدا ڤەدگێریت: ئەم ژ زاخۆ هاتینە ڤەگوهاستن بۆ مووسل، ژ وێرێ بۆ سەربازگەهێن حەبانیێ بۆ مەشقدانێ بۆ دەمێ سێ هەیڤا و ل دووڤدا دهێنە ڤەگوهاستن بۆ قوبرسێ و پاش بۆ فەلستینێ. كوردان نێزیكی حەفت قوول (سریە) پێكدئینان، ئەركێ وان پاراستنا فرۆكەخانێن بریتانی بوو د ماوەیێ شەرێ جیهانیێ دووێ دا. و هەر چەوا بیت پالدەرێ ژیانا سەخت ئەگەرێ سەرەكیێ چوونا گەلەك ژخەلكێ زاخۆ و ب تایبەت تەخا هەژار بوو بۆ دناڤ رێزێن لەشكەرێ لیڤي یێ بریتانی[١٩].

سەرەرای كو شەرێ جیهانیێ دووێ ل ئەیلوولا سالا (١٩٣٩)ێ دەستپێكربوو[٢٠]، بەلێ حكۆمەتا عیراقێ ل دەستپێكا سالا (١٩٤٣)ێ شەر دژی دەوەلەتێن (میحوەر) راگەهاند پشتی دەسەلاتا شاهینی شەر ل شەڤا (١٧/١٦) كانوونا دووێ سالا (١٩٤٣)ێ راگەهاندی، ئەو بوو رۆژنامەیێن مووسلێ برۆسەكێین پشتەڤانیێ یێن قەزایێن سەر ب لیوا مووسلێ بۆ حكۆمەتا نوری سەعیدی سەبارەت راگەهاندنا شەری دژی دەولەتێن (میحوەر) بەلاڤكرن، و هەر سەبارەت ئەڤێ چەندێ ئێك ژ رۆژنامەیێن مووسلێ برۆسەكێین پشتەڤانیێ یێن ریهـ سپی و كەسایەتییێن عەشیرەتێن سەر ب قەزا زاخۆ ڤە بۆ حكۆمەتا نوری سەعیدی و راگەهاندنا وی بۆ شەری دژی دەولەتێن (المحور) بەلاڤكرن. و ژ وان كەسایەتییان: سەرۆكێ باژێرڤانیێ، خۆتبە خوینێ زاخۆ، مەترانێ كلدانییان، رەشید سالح و یوسف شاول ژ ئەندامێن جڤاتا كارگێری، رەمەزان حەجی

ئەحمەد، و نەمرود هورمز ژجڤاتا باژێرڤانیێ. و ژوان سەرۆكعەشیرەتان: رەشید ژ مالا شەمدین ئاغای، نەجیب عەبدی غەزالە و عەزیز یاقو ژ سەرۆكێن هۆزا سلیڤانەیان، و محەمەد حەسو مەزنێ هاجانا و سالح عەبدی ئاغا سەرۆكێ عەشیرەتا سندیا، و حەجی سادق سەرۆكێ هۆزا گۆلیا [٢٢].

سەبارەت هەلویستێ خەلكێ قەزا ئامێدیێ ژ راگەهاندنا شـەری، هندەك ژ ریهـ سپی و كەسایەتی وسەرۆك هۆزا وەك: مفتیێ ئامێدیێ محەمەد شوكری، حەجی تاها عەبدولعەزیز ئاغا ئامێدی، حەجی شەعبان ئاغا ئامێدی، محەمەد ئاغا بەرئاشی و كەلحێ ئاغا تاهر فەتاح رێكانی بروسكە بۆ سەرۆك وەزیرێن عیراقێ فرێكرن وتێدا پشتەڤانیا خۆ بۆ هەلویستێ حكۆمەتا عیراقێ دیاركرن، هەروەسا بەرهەڤیا خۆ ژی بۆ بانگەوازیا حكۆمەتی ژ بۆ بەرڤانیكرنێ ژ وەلاتی ب گیان و سەرماێن خۆ دژی دەولەتێن (میحوەر)دیاركر[٢٣].

وسەبارەت هەلویستێ ئاكرێ و سەرۆك هۆزا ژ ئەڤی شەری هاتیە دیاركرن كو سەرۆك و مەزنێن قەزا ئاكرێ ژمارەكا بروسكا بۆ سەرۆك وەزیرێن عیراقێ یێ ئەوی سەردەمی نوری سەعیدی وەك پشتەڤانی بۆ راگەهاندنا شەری دژی دەولەتێن (میحوەر) و ژ وان بروسكا یێن گەهشتینە بەغدا، برۆسكەیا مەزن و ماقوولێن ئاكرێ: حاجی محەمەد، حاجی عەبدوللا، خەلیل مەلا مەحمود، مستەفا ملا، عبدوللا حاجی صادق، سەعید حاجی شەریف، حاجی جومعە، مەزنێن ئایینی: قەشە یوسف، حاخام ئیسحاق، محەمەد خالد، سیدی خان (سەرۆكێ هۆزا هەركیا)، شێخ قەیوم سۆرچی، شێخ رەقیب سۆرچی (سەرۆكێن عەشیرەتا سۆرچییا)، ئەحمەد رۆڤی، ئەمین ئەحمەد قادر ژ مالباتا عەبدولكەریم سەرۆكێن (العشائر السبعة)[٢٤].

چ تشتەك بەر دەست نینە ئاماژە ب هەلویستێ خەلكێ قەزا دهۆكێ سەبارەت راگەهاندنا حكۆمەتا عیراقێ بۆ شەری دژی دەولەتێن(میحوەر)دیاربكەت، ئەم دشێین بێژین هەلویستێ دهۆكێ یێ جیاواز نەبوویە ژ هەلویستێ قەزایێن مە بەحس ل سەركری چونكی دهۆك بخۆ قەزایەك بۆ سەر ب لیوا مووسلڤە زێدەباری هەبوونا بەرژەوەندیێن كەسایەتی یێن گەلەك ژ ماقوول و كەسایەتیێن وێ دگەل حكۆمەتا عیراقێ وەكی هەمی قەزایێن دیتر یێن مە ل سەر ئاخفتی كو ئەڤە گرنگترین ئەگەر بوون قەزایێن كوردی ئەڤ هەلویستێ پشتەڤانیێ بۆ حكۆمەتا عیراقێ دیاركری، زێدەباری گەلەك ژ وان فەرمانبەر بوون د فەرمانگەهێن حكۆمەتا عیراقێ ل وان قەزایا، لەوا كارەكی سرۆشتی بوویە ڤی هەلویستی وەربگرن.

سەبارت زاخۆ سـەرەرای بەلاڤكرنا رۆژنامەیا ل دۆر پشتەڤانیا ریهـ سپی و ماقوول و سەرۆك عەشیرەتێن زاخۆ بۆ هەلویستێ حكۆمەتا عیراقێ و راگەهاندنا وێ بۆ شەری دژی دەولەتێن (میحوەر) بەلێ ئەڤە وێ چەندێ ناگەهینیت كو هەمی خەلكێ زاخۆ پشتەڤانێن وی هەلویستی بوون بەلكو بەروڤاژی هەڤسۆزییەك و پروپاگەندەیەكا ئەلمانی یا نازی ل زاخۆ هەبوویە ب تایبەت ل نك نەتەوە پەروەر و نیشتمانپەروەران[٢٥]، و ل دۆر ئەڤێ چەندێ دهاتە گۆتن كو پروپاگەندە و چالاكیێن ئەلمانا د وی دەمیدا گەهشتبوونە ناڤ باشووری كوردستانێ و پتر روویێ بریتانیا ل نك خەلكێ كرێت كربوو، و دژی بریتانیا پروپاگەندەیا نازی كارتێكرنەكا ئێكجار زۆر د كویراتییا هەستێ رەوشنبیرا كربوو، و دوان رۆژان دا پتر بەحس ل سەر یەكێتییا هەردو نڤشێن (كوردی و ئەلمانی) و هەلویستێ هێتلەری بوو ژ كوردان، و گەلەك ژ خەلكێ كوردستانی، وەك دەڤەرێن دی یێن هەردو رۆژهەلاتێن ناڤین و دوور یێن ل ژێر دەسەلاتا بریتانیا و فرەنسا ب هیڤی و خۆزی بوون تاكو ئەلمانیا ل بەروكێن شەری سەركەفتنێ بینیت[٢٦].

وەسا دیارە ئەو ئەگەرێن مە بەحس كرین پروپاگەندەكا نازی ل دووڤ دا هەبوویە ل زاخۆ وەكی گەلەك دەڤەرێن دیتر یێن كوردی، و ئەم دشێین بێژین كو هەلویستێ زاخۆ ژ ئەلمانا نە بتنێ ئەنجامێ كارتێكرنا پروپاگەندەیەكا ئەلمانی بوویە، بەلكو ل

زاخۆ هندەك كەس هەبووینە كار بۆ بەرژەوەندیيا سیخوریيا ئەلمانی دكرن ئەوا دەمێ شەرێ جیهانیێ دووێ دا بنگەهەك ل چیایێ (بێخێر)ی هەی[٢٧]، و دبیت ئەڤ چەندە دگەل بۆچوونا ڤەكۆلەرا بگونجیت كو ئەلمانیا ل خزیرانا سالا (١٩٤٣)ێ ژمارەكا كرێگرتی و سیخورا ب رێكا پەرەشۆتا فرێكرینە باشوورێ كوردستانێ، كو ئەڤ كریارە هاتبوو نیاسین ب كریارا (ماموث)[٢٨]، و وەك بەرسڤەك دژی پروپاگندەیەكا ئەلمانی ل زاخۆ رێڤەبەریا پەیوەندیێن گشتی ل مووسل ب سەرۆكاتیيا میجەر روبرت مین رابوو ب پێشكێشكرنا هندەك فلمێن سینەمایێ و ب تایبەت یێن جەنگی ل زاخۆ و مێجەری دگۆت مەرەم ژ پێشكێشكرنا ڤان فلما د وی دەمیدا تاكو هێز و شیان و سەركەفتنێن بریتانیا بۆ خەلكێ دیار بكەن [٢٩]، و ژبۆ كێمركرنا پروپاگندەیەكا ئەلمانی بوو، ژ ئالیيەكێ دی ڤە و پشتی داویهاتنا شەرێ جیهانیێ دووێ هاتیيە راگەهاندن ژ ئەگەرێ شكەستن و خۆ رادەستكرنا ئەلمانیا ل ئەوروپا بۆ دەوەلەتێن هەڤپەیمان ل (٩) گولانا سالا (١٩٤٥)ێ[٣٠]، رۆژنامەیا (فتی العراق) گۆتارەك ب ناڤێ (رۆژا سەركەفتنێ ل زاخۆ بەلاڤكر) و ناڤەرۆكا گۆتارێ دەربرین ژ هەلویست و كەیف خۆشیێن خەلكێ زاخۆ ب هەلكەفتا سەركەفتنا هەڤپەیمانا و شكەستنا ئەلمانیا و هەڤپەیمانێن وێ دوژمنێن مرۆڤایەتیێ دشەری دا دكر[٣١]. هەروەسا باژێرڤانیيا زاخۆ ل سپێدەهیا گۆلانا سالا (١٩٤٥)ێ رابۆ ب گێرانا ئاهەنگەكێ ب ئەڤێ هەلكەفتێ ل هۆلا باژێرڤانیێ و دهاتەگۆتن كو ئەڤ ئاهەنگە ب درێژاهیيا ئەوێ رۆژێ دبەردەوامبوون [٣٢]. و هەرچەوا بیت گێرانا ئەڤێ ئاهەنگێ د رێڤەبەریيەكا حكۆمی دا نە كارەكێ غەریب بوو ب تایبەت ژی ل زاخۆ كو د دەمێ خۆدا پروپاگندا ئەلمانی لێ هەبوویە وەك ل پێش وەخت ل سەری مە ئاماژە پێكری.

## ژێدەر وپەراوێز:

١. ئەڤ پەیمانە ل ٨ تیرمەها ١٩٣٧ێ دناڤبەرا عیراقێ و تركیا و ئیران و ئەڤغانستانێ دا هاتیيە گریدان، بۆ پتر پێزانینا بەرێ خوبدە: عبد الرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، (بيروت ، ١٩٧٤) ، ب ٥ ، بپ ٩٥ - ٩٨.

٢. فاروق صالح عمر (الدكتور)، المعاهدات العراقية – البريطانية واثرها في السياسة الداخلية ١٩٢٢- ١٩٤٨،(بغداد : ١٩٧٧) ، بپ ٣٤٦.

٣. طه الهاشمي، مذكرات طه الهاشمي ١٩١٩- ١٩٤٣ ، (بيروت، ١٩٦٧) بپ ٣١٧.

٤. غانم محمد الحفو (الدكتور)، تطور الحركة الوطنية في الموصل ١٩٤- ١٩٥٨ م ل: موسوعة الموصل الحضارية، (جامعة الموصل: ١٩٩٢) ب ٥ ، بپ٨٩.

٥. غانم محمد الحفو (الدكتور) وعبد الفتاح البوتاني (الدكتور)، الكورد والاحداث الوطنية في العراق خلال العهد الملكي١٩٢١- ١٩٥٨، (دمشق ، ٢٠٠٨) بپ ٨٠.

٦. صديق عثمان محو، العامل الخارجي ودوره في اخماد الانتفاضات الكوردية، دور بريطانيا في اخماد انتفاضتي بارزان الاولى والثانية ١٩٣١ – ١٩٤٥ نموذجا، ناما ماستەرێ یا نە بەلاڤكری، زانكۆیا جیهانی یا زانستیێن ئیسلامی.

٧. غانم محمد الحفو (الدكتور) وعبد الفتاح البوتاني (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ ،بپ ٩٠- ٩١.

٨. بۆ پتر پێزانینا بەرێ خۆ بدە: محمد حازم محمد الجبوري، الاحتلال البريطاني للعراق، دراسة تأريخية في اساليبة ومظاهرة

١٩٤١- ١٩٤٧، ناما ماستەرێ یا نە بەلاڤکری، کولیژا پەروەردێ، زانکۆیا مووسل، ٢٠٠٠،بپ١٤٦.

٩. عزيز حسن البارزاني، الحركة القومية الكوردية التحررية في كوردستان العراق ١٩٣٩- ١٩٤٥، (اربيل ،٢٠٠٢)، بپ٢٥.

١٠. هەمان ژێدەر.

١١. خليل جندي حركة التحرر الوطني في كوردستان الجنوبي ١٩٢٩ – ١٩٦٨ (أراء ومعالجات)، (ستوكهولم: ١٩٩٤)، بپ ٤٨.

١٢. دەمێ ئەم بەحسی دهۆکێ دکەین مەرەم ژێ پارێزگەها دهۆکێ هەمیێ بخۆڤە دگریت ئانکو قەزایێن دهۆك، زاخۆ، سێمێل، ئامێدیێ و ئاکرێ .

١٣. محمد حازم محمد الجبوري، ژێدەرێ بەرێ بپ ٢٢.

١٤. هەمان ژێدەر.

١٥. وصفية محمد شيخو، زاخو في العهد الملكي ١٩٢١- ١٩٥٨، دراسة تأريخية في اوضاعها العامة، ناما ماستەرێ یا نەبەلاڤکری، کولیژا پەروەردێ، زانکۆیا زاخۆ،٢٠١٢،بپ٢١٨.

١٦. محمد حازم محمد الجبوري، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢ .

١٧. هەمان ژێدەر، خشتێ ژمارە (١)، بپ ٢٦ .

١٨. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ٢١٨.

١٩. هەمان ژێدەر.

٢٠. بير رينوفن، تأريخ القرن العشرين، وەرگێران: نور الدين حاگوم، (د.م:١٩٨٠)، بپ ٤٢٩.

٢١. حامد الحمداني، صفحات من تأريخ العراق الحديث الكتاب الاول من الاحتلال البريطاني حتى ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ (د، م، د، ت)، بپ٢٦٨.

٢٢. جريدة (نصير الحق)، ژمارە(١١٦)، ٢٦ کانوونا دووێ ١٩٤٣، بۆ دیتنا دەقێ برۆسکێ بەرێ خۆ بدە: هەمان ژێدەر.

٢٣. هەمان ژێدەر.

٢٤. جمید شکری بابکر ئاکرەیی، ئاکری (عقرة) في العهد الملكي، (اربيل: ٢٠٠٨)،بپ ١٩٥.

٢٥. وهاتییە گۆتن کو هەمی ئەوێن لایەنگەریا ئەلمانیا دکرن ل چایخانا (فەرمان رەشید)ی کۆم دبوون و گوهدانا ئێزگێ دەنگێ بەرلین دکرن.

٢٦. کەمال مەزهەر(دکتور) چەند لاپەریەك لە مێژووی گەلی کورد، (هەولێر: ٢٠٠١)، ب ١، بپ ١٢٠- ١٢١ .

٢٧. وصفيه محمد شخو، ژێدەری بەرێ ، بپ ٢٢٠.

٢٨. بۆ پتر پێزانینا ل دۆر هاتنا خوارێ یا ئەلمانا ب پەرەشۆتێ بەرێ خۆ بدە: وثائق عن الانزال المظلي للألمان في شمال الموصل خلال الحرب العالمية الثانية ل: عبد الفتاح علي البوتاني (الدكتور)، دراسات ومباحث في تأريخ الكورد والعراق المعاصر،(اربيل: ٢٠٠٧)،بپ ٢٢١ ول دووڤدا.

٢٩. بەرێ خۆ بدە: رۆژناما(نصير الحق) ژمارە (٩٦) ٢چريا ئێکێ ١٩٤٢.

٣٠. وصفيه محمد شيخو، ژێدەری بەرێ، بپ ٢٢٠.

٣١. بۆ دیتنا دەقێ گۆتارێ بەرێ خۆ بدە: رۆژناما (فتى العراق) ژمارە (٤٧٤)، ١٤ گولانێ ١٩٤٥.

٣٢. هەمان ژێدەر

# بزاڤا گولان (مایس)ا ١٩٤١ێ

پ. د عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

ئەڤ بزاڤە ب ناڤێ سەرکردەیێ وێ رەشید عالی گەیلانی د هێتەناڤکرن، ناڤبری ب هاریکاریا چەند ئەفسەرێن نەتەوەپەروەرێن عەرەب شیا ل شەڤا ٢/١ گولانا ١٩٤١ێ حکومەتا سەرۆکوەزیران تەها ئەلهاشمی بێخیت، پاشتر کودەتاچییان جڤاتەکا نوینەران یا نوو هەلبژارت و ڤێ جڤاتی عەبدولئیلاهێ وەصی ل سەر شاهـ فەیسەلی ژ وەصیاتیێ ئێخست و ل شوونا وی (ئەلشەریف شەرەف) دانا، هندەك نوینەرێن کورد د ڤێ جڤاتێدا هەبوون و پشکداری د ڤی ئەرکیدا کرن، هەروەسان رەشید عالی گەیلانی وەك سەرۆکوەزیرێن حکومەتا نوو هەلبژارتن، روودانێن سیاسیێن پشتی ڤێ بۆیەرێ هاتین بوونە ئەگەرێ لێکدانێن لەشکەری د ناڤبەرا لەشکەرێ عیراقێ و هێزێن بریتانی دا و ڤان لێکدانان چوار هەفتییان د ناڤبەرا ٢-- ٢٩ گولانا ١٩٤١ێ ڤەکێشا و بوو ئەگەرێ شکەستنا بزاڤا گولانێ و رەڤینا هندەك ژ سەرکردەیێن وێ بۆ ئیرانێ و سێدارەدانا هندەك مەزنە ئەفسەران یێن پشکداری تێداکری[1].

دروشمێ مەزنێن ڤێ بزاڤێ بلندکری رزگارکرنا عیراقێ بوو ژ هەیمەنەتا بریتانی و سەرخوەبوونا وەلاتێن عەرەبی ژ ژێر دەسەلاتێ کۆلۆنیالیزمێ، ڤێ بزاڤێ پشتەڤانییەکا مللیبا بەرچاڤ ل عیراقێ و وەلاتێن عەرەبی دەستڤە ئینا، هندیکە کوردستانا عیراقێ یە پشتەڤانیبا هندەك سەرۆکعەشیرەت و ئاغایێن کورد دەستڤەئینا تایبەت ئەوێن بەرژەوەندیێن وان دگەل دەسەلاتدارێن حکومەتێ.

ل ڤەزا ئاکرێ هژمارەکا زانایێن ئایینی ژ وانا مفتیێ ئاکرێ هیبەتوللا مفتی فەتوا جیهادێ دژی هێزێن بریتانی راگەهاند، رۆژنامەیێن بەغدا ئەڤ فتوایە ل بەربەرێن خوەیێن ئێکێ بەلاڤدکرن، هندەك ژ سەرۆکعەشیرەتان ب تایبەت ئەوێن بەرژەوەندیێن ب هێز دگەل حکومەتێ هەین خۆ دا دگەل حکومەتا گەیلانی و پشتەڤانیبا خۆ بۆ وی و حکومەتا وی دیارکر و بەرهەڤیبا خۆ دیارکر خۆ بەخش پشکداریێ د شەریدا بکەن و شەرێ هێزێن بریتانی بکەن، ژ وانا شێخ قەیومێ سۆرچی خۆبەخشیبا خۆ و عەشیرەتا خۆ دیار کر، هەروەسان ئەحمەد ئیسماعیل ئاغایێ رۆڤی سەرۆکعەشیرەتێ گێژ ل دەڤەرا حەفت عەشیرەتان (عشائر السبعة) خۆبەخشیبا خۆ و هژمارەك مەزن ژ خەلکێ عەشیرەتێ دیار کر،

هەروەسان قەزا ئاکرێ پشکداری د کۆمکرنا بێشاندا بۆ پشتەڤانییا بزاڤی کر، هەژیە بێتەگۆتن نەقیب میر حاج ئاکرەیی رۆلەکێ بەرچاڤ د ڤێ بزاڤێدا هەبوو[٢].

ل قەزا شێخان هەریەك ژ یەزیدخان ئیسماعیل بەگ و عەبدوللا ئاغایێ شەرەفانی و سەعید عەلی بەگی خۆبەخش بەرهەڤییا خۆ بۆ پشکداریێ د بزاڤێدا دیار کر و هەردوییێن بەراهیێ پشتی سەرنەکەتنا بزاڤێ هاتنەگرتن و دوورکرن بۆ ژێریێ عیراقێ.

ل قەزا ئامێدیێ ژی حەجی تەها عەبدولعەزیزی پشتەڤانییا خۆ ب بزاڤێ دیارکر و برووسکەیەك بۆ گەیلانی هنارت تێدا نەرازیبوونا خۆ ل سەر کریارێ وەصی عەبدولئیلاهی دیارکر، هەروەسان کەسێن عەشیرەتێن ئامێدیێ ب مەرەما خۆبەخشکرنێ و هنارتنا وان بۆ بەرۆکێن شەری ب چەکێن خۆڤە چوونە مەخفەرێن پۆلیسان و قائیمەقامی پێشوازی ل وان کر و پەیمان دایێ دەستەلاتدارێن مەزن ل دوور هەلویستێ وانا ئاگادارکەت[٣].

ل دهۆکێ ژی سەعید ئاغایێ دۆسکی پشتەڤانییا بزاڤێ کر و خۆبەخشییا خۆ و هژمارەك مەزن ژ کەسێن عەشیرەتا خۆ بۆ بزاڤێ دیارکر، هەروەسان عەلی ئاغایێ مزووری پشتەڤانییا خۆ بۆ بزاڤێ دیارکر[٤].

ل قەزا زاخۆ حاجی شەمدین ئاغا یێ نوونەر د جڤاتا نوونەراندا پشتەڤانییا خۆ بۆ بزاڤی دیارکر و دگەل شاندێ مووسلێ و بەهدینان چوو بەغدا بۆ پێشکەشکرنا پیروزباهیێ ل رەشید عالی گەیلانی، تشتێ سەیر ل ڤێرێ ئەوە حکۆمەتا عیراقێ د ڤی سەروبەریدا داخواز ژ جوهیێن زاخۆ کر د دەمێ ١٥ رۆژاندا هزار میسقالێن زێری بۆ حکۆمەتێ کۆمبکەن، و جوهیان ژ قایمەقامێ زاخۆ خواست هەفتییەکا دی خۆ ل وان بگرن بۆ کۆمکرنا ڤی گۆژمەی، بەلێ بزاڤا گولانێ بەری داویهاتنا دەمێ دیارکری بۆ کۆمکرنا ڤی زێری ئەو ب خۆ ب داویهات[٥].

یا گرنگ ل ڤێرێ ئەوە کو پرانییا سەرۆکعەشیرەتێن بەهدینان پشتەڤانی ل ڤێ بزاڤێ کرن و بەرهەڤییا خۆ بۆ شەری دژی هێزێن بریتانی دیارکر، و شاند ژ دهۆك و ئامێدیێ و زاخۆ و ئاکرێ و شێخان چوونە بەغدا بۆ پێشکەشکرنا پیروزباهیێ بۆ گەیلانی، ئەڤ هەلویستێ وان ژی نە ژ باوەرییەکا موکمڤە بوو بەلکی دەربرین بوو ژ بەرژەوەندیێن وان دگەل حکۆمەتێ هەین، بەلگە ژی ل سەر ڤێ چەندێ ئەوە دەمێ بزاڤ شکەستی و سەرکردەیێن وێ رەڤینە ئیرانێ و وەصی عەبدولئیلاهـ ل دەسپێکا حزیرانا ١٩٤١ێ زڤریەڤە بەغدا هندەك ژ وان سەرۆکعەشیرەتان ب خۆ برووسکە بۆ عەبدولئیلاهی هنارتن و پیرۆزباهی لێکر ژبەر زڤرینەڤا وی ب سلامەتی بۆ بەغدا و د برووسکێێن خۆ دا پەسنا حکۆمەتا گەیلانی ب حکۆمەتەکا ڤالا (حکومة باطلة) دکر و ژ وان ژی: مظهر النقشبندي سەرۆکعەشیرەتێ نێروە و سالح کەلحێ (سەرۆکعەشیرەتێ رێکان) و ئیسماعیل بامەرنی و شەماشە ئیسحاق (رەئیس عودیشکە) و وەزیر عوسمان ئاغا بەرواری و سەعید دیوالی ئاغایێ دۆسکی و حەجی مەلۆ ئاغایێ مزووری و عەبدوللا بریفکانی و نوری بریفکانی و یێن دی... وەك وان ژی چەند سەرۆکعەشیرەتێن عەرەبان هەبوون[٦].

شکەستنا حکۆمەتا گەیلانی ل ٣١ گولانا ١٩٤٢ێ نیشانا دەسپێکا سەردەمەکێ نوو بوو د سەروبەرێ سیاسیێ عیراقێدا، بریتانیا بۆ جارێ دووێ عیراق داگیرکرەڤە و دەسەلاتێ خۆ ل سەر تەبایی عیراقێ سەپاند، دەسەلاتدارێن بریتانی د رێکا (سازێێن رێنماییکرن و رەوشەنبیری و پرۆپاگەندەیان- - مکاتب الارشاد و الثقافة و الدعایة) کو د رێکا فەرمانگەها پەیوەندیێن گشتی ل بالیۆزخانا بریتانی دهاتنەبرێڤەبرن هژمارەکا کۆڤار و رۆژنامەیان بەلاڤکرن و هەروەو و بێ بەرامبەر ل سەر خەلکی لێکڤەدکرن، هەروەسان نڤیسینگەهەکا پەیوەندیێن بریتانی ل زاخۆ ڤەکرن و رۆژنامە و کۆڤارێن عەرەبی و ئینگلیزی و کوردی بۆ ئینان[٧].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. بۆ زانیاریێن بەرفرەهتر بنێرە: ولید محمد سعید الاعظمي (الدكتور) انتفاضة رشید عالي الكیلاني و الحرب العراقیة- البریطانیة (بغداد- ١٩٨٧).

٢. جمبد شكري، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٧- ١٩٨.

٣. رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٨.

٤. الحفو و البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٩. وصفیة محمد شیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢١٦.

٥. وصفیة محمد شیخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢١٦.

٦. الحفو و البوتاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٩.

٧. طه البامرني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٤- ٢٠٥.

# دەنگڤەدانا سەرهلدانا کانوونا دووێ یا سالا (١٩٤٨)ێ ل دهۆکێ

وەصفیە محەمەد شێخو
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

ل (٢٩) ئادارا (١٩٤٧)ێ وەزارەتا (سالح جەبر)ی هاتە پێکئینان و هەموارکرنا پەیمانا عیراقی - بریتانی یا سالا (١٩٣٠)ێ ل دووڤ بنیاتێ پاراستنا بەرژەوەندیێن هەڤپشك د چوارچوڤێ سیاسەتا وێ یا دەرەکی و دناڤ بەرنامێ وێ دا بوو، و بۆ وێ چەندێ دو شاند هاتنە پێکئینان کو نوینەراتیا هەردو دەولەتان بکەن، زنجیرەکا دان وستاندنێن نهێنی دناڤبەرا عیراق و بریتانیا دا ل هەردو پایتەختان (لەندن و بەغدا) هاتنەکرن[١] د ئەنجامدا ل (١٥) کانوونا دووێ ل سالا(١٩٤٨) پەیمانا عیراقی -- بریتانی یا بەرنیاس ب پەیمانا (پورتسموث) هاتە ئیمزاکرن[٢].

عیراقییان دڤیان پەیمانا سالا (١٩٣٠)ێ بێتە لادان بێی کو پەیمانەکا دیتر جهێ وێ بگریت، لەوما ل دەمێ دەنگ و باسێن وان دانوستاندنێن ل لەندن ئاشکەرا بووین هێزێن نیشتمانی ب بزاڤ وچالاکیێن بەرەفرەهـ رابوون و پارتێن نهێنی و ئاشکەرا هندەك بەیاننامێن هاندەر دەرکرن و ل دووڤدا ژکانوونا ئێکێ کاودان ل بەغدا و گەلەك باژێرێن دیتر یێن عیراقی تێکچوون، تاکو بزاڤا بەرهنگاریا پەیمانا نوی بوویە سەرهلدانەکا جەماوەری و چوویە دیرۆکێ دا بناڤێ (الوثبة) و بوویە ئەگەرێ کەفتنا حکۆمەتا (سالح جەبر)ی ل (٢٧) کانوونا دووێ سالا (١٩٤٨)ێ، و نەهێلانا پەیمانا (بورتسموث) ئەوا دگەل حکۆمەتا بریتانیا مۆرکری[٣].

کوردان ژی رۆل دناڤ ئەڤێ سەرهلدانێ دا هەبوو، و کارتێکرن ل سەر ئەنجامێن وێ هەبوویە و درۆشمێ برایەتییا کورد وعەرەبا گرنگترین دروشمێن ئەڤێ سەرهلدانێ بوو، و هۆکار و منەتا ئەڤێ ئێکگرتنێ بۆ پارتا شیۆعی وپارتا دیموکراتا کوردی (الپارتی)[٤] دزڤرت، کو رۆلەکێ مەزن دگێران پێخەمەت ئازراندنا خەلکێ نەخاسمە ل دەڤەرا کوردی[٥].

زاخۆ ئێك ژوان باژێرێن کوردی یێن گرنگ بوویە و رۆلەکێ بەرچاڤ گێرایە دروودانێن سەرهلدانێ دا چ ل سەر ئاستی زاخۆ بخۆ چ ل سەر ئاستێ بەغدا، و هەلویستی زاخۆ ژسەرهلدانا کانوونا دووێ شاندەك ژ زاخۆ دگەل شاندێ سلێمانیێ و

رانیە ل (٥) شواتی (١٩٤٨)ێ گەهشتە بەغدا ژبۆ بەشداریێ د خۆ نیشاندانێن بەغدا دا، هەروەسا ئەندامێن شاندی سەرەدانا گۆرێن شەهیدێن[٦] (٢٧) کانوونا دووێ (١٩٤٨)ێ کرن[٧]. و ل سەر ئاستی باژێرێ زاخۆ ئەندام و خودان هزرێن شیۆعی ل زاخۆ ب پالدانا پارتا شیۆعی ل سپێدەهیا (٣) نیسانا سالا (١٩٤٨)ێ[٨] ب خۆنیشادانەکێ رابوون، و گرنگترین سەرکردە و رێکخەرێن خۆ نیشادانی: محەمەد عەبدولعەزیز تاهر زاخۆیی یێ بەرنیاس ب (محەمەد عەزو)، حوسنی حەجی رەشید، شەفیق محەمەد سەعدوللا، مەحمود سالح، عیسا حاجی، مەحمود حاج ئەحمەد، رەئووف نەجم قەساب، وسالح حاج رەشید و هندەکێن دیتر. هندەك ژ خۆ نیشاندەران ل دەمێ خۆ نیشادانێ رابوون ب سۆتنا فەرمانگەها پەیوەندیێن بریتانی ل زاخۆ، و هندەکێن دیتر رابوون ب دەستەسەرکرنا ترومبێلەکا بارهەلگرا گەنمی کو خودانێ وێ حازم شەمدین ئاغای بوو و یا ئامادەکری بوو ژبۆ ڤەگوهاستنێ و فرۆتنا وێ ل مووسل و داخوازکرن نەهێتە هنارتن بەلکو بێتە بەلاڤەکرن ل سەر هەژار و خودان پێدڤییان[٩].

هەر چەوا بیت خۆنیشادانا زاخۆ دگوپیتکا ئێککرتنێ دا بوو دناڤبەرا هەمی تەخ و ئۆلێن زاخۆ، مۆسلمان و مەسیحی و جوهیيا ب پێکڤە بەشداری تێدا کربوون، رەوشنبیر و نەخواندەڤانان، پیر و زارۆکان، ژن ومێران، بەشداریا هەمی پێکهاتەیێن ئایینی و نەتەوەیی د خۆنیشادانێ دا رامانا ئەوێ ئێککرتن و پێکڤە ژیانێ یە ئەوا یادا دناڤبەرا ئەوان پێکهاتە سەرەرای گرێدانا بەرژەوەندیا هندەك کەسان ب تایبەت جوهیيا دگەل بریتانیا.

خۆ نیشاندان ژ روویێ خۆ یێ ئاشکەرا دژی پەیمانا (بورتسموث) بوو، بەلێ ژ روویەکێ دی ڤە گەلەك هۆکار ل دووڤ را هەبوون وەك گرانیا بازاری و برس و هەژاریا بەربەلاڤ ل زاخۆ وەکی دەڤەرێن دیتر یێن کوردی وعیراقی[١٠]. و بەلگە ل دۆر ئەڤێ چەندێ ئەڤ هۆزانەیە ئەوا محەمەد عەزۆی دناڤ خۆ نیشاندانی خواندی:

**الشعب ما مات يوما وانه لن يموتا**
**ان فاته يوم نصر ففي غد لن يفوتا**
**ان حرقنا الضحايا يشع منها الضياء**
**ان صدمنا المنايا ولم يرعبنا الفناء**[١١].

هەروەسا خویندکار و رەوشنبیرێن ئامێدیێ ژی رۆلەك هەبوویە دژی پەیمانێ دەمێ بەشداری خۆنیشادانان بووین، ل بەغدا سالح رەشید ئامێدی، خویندکارێ کولیژا یاسایێ بەشداری خۆ نیشاندانا بوو و ل داویێ ژ ئەگەرێ دووڤچوونا دەزگایێن ئاسایشی نەچار بوو بەغدا ب جهـ بهێلیت و بەرەف مووسل ڤە بچیت، و تا پشتی شکەستنا حکۆمەتا سالح جەبری نەزڤریڤە بەغدا، هەروەسا تۆما داوود توما القس کو خەلکێ دەڤەرا بەرواری بالا بوو د وان خونیشاندانان دا بریندار دبیت[١٢]، ژلایەکێ دی ڤە ژمارەکا ئەندامێن جڤاتا نوینەرا وەك نەرازیبوون ل سەر وان پێ رابوونێن حکۆمەتێ ژ بۆ ژ ناڤبرنا خۆنیشاندانان گرتینە بەر دەستکارکێشانا خۆ پێشکێشی سەرۆکاتییا جڤاتێ کرن، ئێك ژوانا نوینەرێ قەزا ئامێدیێ شێخ موسلح الدین نەقشەبەندی یێ بامەرنی بوو[١٣].

بەلێ قەزا ئامێدیێ چ خۆنیشادان نەهاتنە کرن ژبەر دووراتیا جهێ وێ یێ جۆگرافی ژ جهێ روودانا زێدەباری کاودانێن وێ یێن ئابووری و جڤاکێ یێن خراب، هەر ژلایەکێ دی ڤە ئەڤێ پەیمانێ ب شێوەکێ ئێکسەر کارتێکرن ل سەر بەرژەوەندییا وان نەکربوو، و دبیت زۆربەی خەلکێ ئامێدیێ ئاگەهـ ژئەڤێ پەیمانێ و خۆنیشادانێن هەڤدژی وێ نەببوون بتنێ پشتی ماوەکێ درێژ نەبیت، وەکی قەزایێن دیتر یێن کوردی ئەوێن سەر ب لیوا مووسل ڤە[١٤].

## ژێدەر و پەراوێز:


١. عبد الرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، (بغداد: ١٩٨٨)، ب ٧، بپ ٢١١ ول دووڤدا.

٢. پەیمان هاتییە بناڤکرن ب ناڤێ ئەوی بەندەرێ بریتانی یێ کو پەیمان لێ مۆرکری.

٣. بۆ پتر پێزانینا ل دور وان دانوستاندنێن د ناڤبەرا بریتانیا و عیراقێ دا هاتینەکرن ژ بۆ گرێدانا پەیمانێ و ناڤەرۆکا وێ هەروەسا ل دور هەلویستێ هێزێن نیشتمانی و روودانێن سەرهلدانێ بخۆ بەرێ خۆبدە: صدرالدین شرف الدین، سحابە بورتسموث،(بیروت:١٩٨٤)، کمال مظهر احمد، الوثبة دراسة تحليلية لدوافعها ونتائجها، گۆڤارا (کاروان)، ژمارە(٢٣)، تەباخا ١٩٨٤، بپ ١٣٥ ول دووڤدا، عبد الرزاق الهلالي، من حديث الذكريات (سبع سنوات في التشريفات الملكية في العراق)،(بغداد: ٢٠٠٢)،بپ ٥٥ ول دووڤدا.

٤. ب پارتا دیموکراتا کوردی هاتییە نیاسین تا کونگرێ وێ یێ سێێ ئەوێ ل سالا ١٩٥٣ هاتییە گرێدان وپاش هاتییە نیاسین ب پارتا دیموکراتا کوردستانێ، لەوما دێ پارتێ ب وی ناڤی ناڤ کەین یێ کو د وێ قووناغێ دا پێ هاتییە ناڤکرن، و ب (پارتی)هاتییە بناڤکرن ژبەر بکارئینانا کوردان بۆ پەیڤا پارتی یا لاتینی ئانکو رامانا وێ (حزب)، وئەڤە پەیڤەکا نوی بۆ دناڤ کوردان دا لەوما هاتە بکارئینان ژبۆ رامانا پارتی دیموکراتی کوردستان (پارتی دیموکراتی کورد)وتا ئەڤرۆکە ژی ئەڤ پەیڤە یا بەربەلاڤە وەك ناڤێ وێ.

٥. اسماعيل شكر رسول (الدكتور)، اربيل دراسة تأريخية في دورها العسكري والسياسي (١٩٣٩- ١٩٥٨)، (السليمانية: ٢٠٠٥) ، بپ ٢٩٠.

٦. کەمال مەزهەر، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٩٣، مهدی محمد قادر، رۆلی کورد له راپەرینی کانوونی ١٩٤٨ له عیراقدا، کۆڤارا (مێژوو)، ژمارە (١)، زستان ٢٠٠٧، بپ ١٣١- ١٤٥.

٧. عبد الفتاح علي البوتاني (الدكتور)، الحياة الحزبية في الموصل ١٩٢٦- ١٩٥٨، (اربيل :٢٠٠٣)، بپ ٣٣٠.

٨. هاتییە ڤەگوهاستن ژ: عبد الفتاح علي البوتاني (الدكتور)، الحركة القومية الكوردية التحررية، دراسات ووثائق(اربيل: ٢٠٠٤)، بپ١٢٠- ١٢١.

٩. هەمان ژێدەر.

١٠. هەمان ژێدەر.

١١. هەمان ژێدەر.

١٢. رجب جميل حبيب، ئامیدی (العمادية) ١٩٢١- ١٩٧٥ دراسة في التأريخ السياسي، ناما ماستەرێ یا نەبەلاڤکری، کولیژا پەروەردێ، زانکۆیا زاخۆ، ٢٠١١، بپ٧٨.

١٣. عبد الرزاق الحسني، تأريخ الوزارت العراقية، ب٧، بپ٣٠٠- ٣٠١، ماجد حسن علي، الحركة الطلابية الكوردية في العراق ١٩٢٦- ١٩٧٠، ناما ماستەرێ یا نەبەلاڤکری، کولیژا ئادابێ، زانکۆیا سەلاحەدین، ٢٠٠٨، بپ ١٣٠- ١٣١.

١٤. رجب جميل حبيب، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٨.

# سەرهلدانا چریا دووێ ل سالا (١٩٥٢) و دەنگڤەدانا وێ ل دهۆکێ

وەصفیە محەمەد شێخو
وەرگێران: موسلح حەمزە


سویغەتوللا مزووری

ل داوییا سالێن چلان و دەستپێکا سالێن پێنجییان گۆرانکارییێن بلەز ب سەر عیراقێ دا هاتن و کارتێکرنا وێ ل سەر زۆربەی باژێرێن عیراقێ دا هەبوویە، ل سالا (١٩٥٢)ێ سەرهلدانەك ل عیراقێ دروست بوو هاتبوو نیاسین ب سەرهلدانا چریا دووێ[1]، ئەڤ سەرهلدانە دروست ببوو پشتی پارتێن بەرهەلستکار و یێن ئاشکەرا ل (٢٨)چریا ئێکێ سالا(١٩٥٢)ێ ژبۆ بجهـئینانا چاکسازیێن سیاسی و ئابووری یاداشتەك پێشکێشی (وەصی عەبدولئیلاهی)ی کری، بەلێ ژ ئەگەرێ پشتگوهـ هاڤێتنێ ژلایێ دەسەلاتیڤە مانگرتنێن خویندکاران دەستپێکرن، و ل دووڤدا زنجیرەکا خۆنیشادان و روو ب رووبوون دناڤبەرا خۆپیشاندەر و هێزێن پۆلیسان دروستبوون نەخاسمە ل بیستێ و ل بیست و چارێ چریا دووێ، و دئەنجامدا حکۆمەتا (موستەفا ئەلعومەری) هاتەلادان و حکۆمەتەکا لەشکەریيا کاتی ب سەرۆکاتییا سۆپاسالار (نورەدین مەحموود) ل (٢٣) چریا دووێ هەمان سالێ هاتەپێکئینان

و تاكو (٢٩) كانوونا دووێ (١٩٥٣)ێ ڤەكێشا، ڤێ حكۆمەتێ بەرسینگێ هێزێن نیشتمانی گرت و بارێ نە ئاسایی (الأحكام العرفية) راگەهاند و رۆژنامە راوەستاندن[٢].

كورد و ئەندامێن پارتا دیموكرات دگەل پارتا شیۆعی و هێزێن نیشتمانی بەشداری ئەڤێ سەرهلدانێ ببوون[٣]، كارتێكرنا ئەڤێ سەرهلدانی ژ بەغدا گەهشتبوو باژێرێن دیتر یێن عیراقی، وتاكو دەڤەرێن كوردی وەك هەولێر و سلێمانیێ ڤەگرتین[٤]، هەلویستێ دهۆكێ ژی یێ جیاواز نەبوویە، خویندكارێن دهۆكێ بەشداری خۆنیشادان و مانگرتنێن ئەڤێ سەرهلدانێ دا كربوون، دەمێ خویندكارێن دووا ناڤنجییا دهۆكێ خۆنیشادانێن پشتگیری و هەڤسۆزیێ بۆ گشت خویندكارێن عیراقێ كرین سەرەرای پێكولێن پۆلیسا ژ بۆ گرتن و دەستەسەركرنا وان[٥]، زێدەباری هندێ كو رۆلێ هندەك ژ كەسایەتیێن دهۆكێ دئەڤێ سەرهلدانێدا بەرچاڤبوو، ئەو بۆ حكۆمەت رابوو ب هەوەكا بەرفرەهـ ژبۆ گرتنا وان پشتی سەرهلدانێ وەك هندەك ژ رێكخستنێن پارتا دیموكراتا كوردی، پۆلیسا سەر ب خانیێ (سوبغەتوللا مزووری)[٦] داگرت ودەستەسەركر و ژ بۆ ڤەدیتنا بەلاڤۆكێن حزبی خانی و مزگەفتا لێ كاردكر هاتنە پشكنین. وەسا دیارە كو ئەوی پەیوەندی ب سەرهلدانێ ڤە هەبوویە چونكی ئێك ژ ئەندامێن پارتا دیموكراتا كوردی بوو لەوما حكۆمەتێ سەر ب خانیێ وی داگرت و پشكنین كر[٧]، دەسەلاتێ (سالح یوسفي) ل مووسل دەستەسەركر كو ل وی دەمی بەرپرسێ لقا پارتا دیموكراتا كوردی بۆ ل بەهدینان ئەوا بنكەهێ وێ ل مووسل[٨].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. پتر پێزانینا ل دور سەرهلدانا چریا دووێ بەرێ خۆ بدە: جعفر عباس حميدي (الدكتور) ، التطورات السياسية في العراق ١٩٤١- ١٩٣٥،(النجف الاشرف: ١٩٧٦)، بپ٦٦٨- ٧٣٢.

٢. عادل غفور خليل، احزاب المعارضة العلنية في العراق ١٩٤٦- ١٩٥٤،(بغداد:١٩٨٤)، بپ٢٣٧، غانم محمد الحفو(الدكتور) وعبد الفتاح علي البوتاني(الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ،بپ ٩٢.

٣. نوری شاويس، من مذكراتي،(د،م: ١٩٨٥)، بپ٥٩.

٤. عبد الفتاح علي البوتاني (الدكتور)، الحياة الحزبية في الموصل، بپ ٤١٣.

٥. ماجد حسن علي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٢- ١٢٣.

٦. ئیمامێ مزگەفتا (العمري) بوو ل مووسلێ، بەلێ چالاكیێن وی بۆ دهۆكێ دهاتنە هژمارتن.

٧. هلز عثمان ميرو، دهوك ١٩٤٥- ١٩٧٥ (دراسة تأريخية - ميدانية ) ناما ماستەرێ یا نە بەلاڤكری، كولیژا پەروەردێ، زانكۆیا زاخۆ.

٨. عبد الفتاح علي البوتاني، (الدكتور)،الحركة القومية الكوردية ،بپ ١٢٤.

# شەرێ عەرەبا و ئیسرائیلی سالا ١٩٤٨ێ (شەرێ فەلستینێ)

د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

پشتی کو ل رۆژا ٢٩ چریا دووێ ١٩٤٧ێ بریارا دەستەیا نەتەوەیێن یەککرتی ب دابەشکرنا فەلستینێ د ناڤبەرا جوهی و عەربان‌دا دەرکەتی و جوهییان ل رۆژا ١٥ گولانا ١٩٤٨ێ دەولەتا خۆ راگەهاند، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ رووداناشەری د ناڤبەرا هەردو ئالییاندا، عیراقێ چەندین خۆنیشادانێن نەرازیبوونێ ب خۆڤە دیتن و خەلکی د وان خۆنیشادانان‌دا داخوازا جیهادێ و خۆ بەخشینێ بۆ پشکدارییێ د شەری‌دا دژی ئیسرائیلی دکرن.

بازێرێ مووسلێ ب ناڤتێدانا پارێزگارێ وێ خەلیل عەزمی دامەزراندنا چەندین لیژنەیان بۆ پشتەڤانییا خەلکێ فەلستینێ وەك لیژنا کۆمکرنا هاریکارییان، لیژنا خۆبەخشان و لیژنا کڕینا چەکی و هنارتنا وی بۆ فەلستینییان ب خۆڤە دیتن، پتریا وی چەکی ب رێکا چەند کەسەکان ژ دەڤەرا بەهدینان دهاتەکرین و یەك ژ وان کەسان شێخ مەمدوحێ بریفکانی بوو یێ چەك ژ دەڤەرا دهۆکێ دکری و بۆ لیژنا (رزگارکرنا فەلستینێ) ل مووسلێ دهنارت[1]. دەمێ ل نیڤا سالا ١٩٤٨ێ شەری رووداى و یەکەیێن لەشکەرێ عیراقی ل فەلستینێ کەتینە د شەری‌دا، هندەك ژ سەرۆك عەشیرەتێن دەڤەرا بەهدینان ل دووڤ بانگەوازا پارێزگارێ مووسلێ هاتن و بەرهەڤیيا خۆ ب خۆبەخشینێ و چوونێ بۆ شەری ل فەلستینێ دیارکر، ل ئامێدیێ حەجی شەعبان دگەل چەند کەسێن چەکدار ژ مالا خۆ چوونە بازێرێ حلەبێ باشوورێ عیراقێ دا ژ وێری ژی بچنە بەرۆکێن شەری ل فەلستینێ، بەلێ دەمێ ئەو گەهشتینە حلە شەر ب داوی هاتبوو لێ د سەر ڤێ چەندێرا ب (ویساما رافیدەین) ژ ئالیێ حکۆمەتا عیراقی ڤە هاتەخەلاتکرن[2].

ل دهۆکێ ژی دیوالیێ سەعید ئاغای ل رۆژا ١٩٤٨/٥/٣١ێ داخوازنامەیەك بۆ پارێزگارێ مووسلێ بلندکر و تێدا خواستبوو "ئەو ب ٥٠٠ زەلامێن عەشیرەتا خۆڤە ب هەموو چەك و تەقەمەنیێ خۆڤە

خۆبەخش بچنە بەرۆكێن شەری بۆ رزگار كرنا وەلاتێ فەلستینێ یێ پیروز ژ چەنگێن زایونیزما گونەهبار".

پارێزگارێ مووسلێ د بەرسڤا دیوالی ئاغایدا گۆتبوویێ: مە داخوازنامەیا تە ل رۆژا ١٩٤٨/٥/٣١ێ بۆ مە بلندكری خواند كو تە تێدا خواستبوو دگەل پێنج سەد كەسان ژ عەشیرەتا خۆ پشكدارییێ د جیهادێدا بۆ رزگاركرنا فەلستینێ بكەن، ئەڤ هەلویستێ تەیێ جهێ سەرفرازیێ نیشانا بلندییا ئاستێ تە و سەرفرازییا تە و باوەرییا تەیا موكمە ب دۆزەكێ كو نها بوویە ئێك ژ دۆزێن هەرەگرنگێن وەلاتێن عەرەبی ب تایبەت و جیهانا ئیسلامی ب گشتی، خودێ تە سەربێخیت و یێن وەك تە دلسۆز و وەفادار بۆ رێكا خودێ و ئایین و سەرفرازیێ زێدەكەت.

ئەڤە و من داخوازناما تە بلندكرییە بۆ ئالیێن پەیوەندیدار و بێ گومان ئەو دێ ل دووڤ بەرژەوەندییا گشتی تە ل سەر خۆبەخشكرنێ ئاگاداركەن[٣].

حكۆمەتا عیراقێ خۆبەخشینا دیوالی ئاغای و زەلامێن عەشیرەتا وی نە پەژراند هەتا كو مەشق ب وان نەهێتەكرن، ل دۆر ڤێ چەندێ رۆژنامەیا (الأديب) یا مووسلی نڤیسییە: "ژبەر ڤێ چەندێ خۆبەخشییا ئاغای ما حوبرێ ل سەر كاغەزێ، بەلێ گەلۆ ئەڤە دێ بیتە رێگر كو سەرۆكێ دۆسكییان پارەی و چەكی ببەخشیت كو وی زێدە ژێ هەیە، یان خوبەخشینا وی تنێ دێ مینیت خوبەخشینەكا ئاشوپی"؟!![٤].

هەروەسان جەعفەر مستەفا (بێسفكی) سەرۆكێ عەشیرتا همبیان داخوازنامەك بۆ پارێزگارێ مووسلێ بلندكر و وی ژی تێدا بەرهەڤییا خۆ دیاركربوو كو دگەل (١٠٠) زەلامان ژ عەشیرەتا خۆبەخش بچنە شەری ل فەلستینێ، هەروەسان مەحموود ئاغایێ زێباری پێنج تڤەنگێن فرەنسی دانە خۆبەخشان[٥].

هندیكە سەرۆكێن ئاسوریێن بەهدینانن، ل رۆژا ١٥ تەباخا ١٩٤٨ێ ل ئاڤاهیێ پارێزگەها مووسلێ كۆمبوون و بەرهەڤییا خۆ دیاركرن بەرەف فەلستینێ بدەنە رێ بۆ رزگاركرنا وێ ژ چەنگێن زایۆنیزما گونەهبار، نە تنێ ئەڤە بەلكی بانگەوازەك دا هەموو تاگرێن خۆ ل عیراقێ پشكدارییێ د ڤی شەرێ رزگاركرنێدا بكەن، هەروەك د بانگەوازا واندا هاتی: بۆ هەموو كورێن پێكهاتا (ملـە)* ئاشووریێن ئاكنجی ل لیوایێن بەغدا، بەسرا، كەركووك، ئەربیل، ئۆردگایێ حەبانیێ یێن رێزدار مە دڤێت هەوە ئاگاداركەین كو هەموو سەرۆك عەشیرەت و پێكهاتێن ئاسووریان ل دووڤ فەرمانا حكۆمەتا خودان قەدر و ب مەرما دانوستاندنێ ل دۆر پێكئینانا لەشكەرەكێ رێكخستی ژ گەنجێن ئاسووری یێن مەشقپێكری د لەشكەرێ لیڤی دا و یێن دی یێن شیانێن پشكدارییێ د خزمەتا لەشكەریدا هەی و پاشتر دێ مەشق پێ هێتەكرن بۆ بەرگریێ ژ وەلاتێ مە یێ خۆشتڤی ل رۆژا ١٥ تەباخا ١٩٤٨ێ ل مووسلێ كۆمبووینە...

هەریەك ژ سەرۆكێ ئاسووریێن عیراقێ مەلك خۆشابا، مەترانێ بەرواری بالا مار یوالاها، مەترانێ جیلو و بازێ و رێكان مار سەركیس، مەتران بولیگ ێ شەمدینان و مار یوسفي ئەڤ بانگەوازە ئیمزا كربوو[٦].

هەروەسان هاتییەگۆتن كو ئێزدیێن شنگالێ و شێخان ژی د ناڤبەرا خۆدا دانوستاندن دكرن كو هەلویستەكێ وەك یێ ئاسووریان بگرنە بەر.

سەرەرای دەسپێكرنا خۆبەخشیێ بۆ پشكدارییێ د شەریدا ل دەڤەرا بەهدینان، رۆژنامەیا (فتى العراق) د نڤیسینەكا خۆدا ددەت دیاركرن: كو هەلویستێ عەشیرەتێن شەمەر و عەشیرەتێن كوردان هەلویستەك سارە و پشكداری د خۆبەخشیێ و بێشاندا نەكرییە، و رۆژنامەیێ ژ ئاستێ وان عەشیرەتان كێمكرییە و ب وێ چەندێ گونەهباركرینە كو هەستا وانا وەلاتپارێزی یا لاوازە[٧].

ڤی هەلویستی ژ عەشیرەتێن بەهدینان نە دگرت، هەروەكی رۆژنامەیا (الأديب) د نڤیسینەكا خۆدا بەراوردەك د ناڤبەرا هەلویستێ سەرۆكێ عەشیرەتێن دۆسكی یێ ( ژیرانە و خودان غیرەت)

یێ ب ٥٠٠ موجاهیدانڤە (پشتەڤانی ل وەلاتێن خۆیێن عەرەب کری بۆ سەرئێخستنا فەلستینێ) و عەشیرەتا شەمەر یێ هژمارا وان ژ (١٠٠)هزار کەسان دبۆریت و هەتا نها تشتەك وەسان نەبەخشییە، د دەمەکیدا کو یا بەرهەڤە بۆ تۆلەستاندن و هەڤرکیێ ژ برایێن خۆیێن خوینی جیرانێن خۆ ژ عەشیرەتێن ئەلبومتیوت و ئەلجحێش، کو پێدڤی بوو د ڤی دەمیدا سەرۆکێن شەمەران د مەیدانا جیهادێدا بانە و سەرێ وەلاتێ خۆ و سەرێ عەرەبایەتیێ (عروبەتێ) بلندکربا، بەلێ هەلویستێ دیوالی ئاغای هەژی رێز و بلند راگرتنێ یە[٨].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. نوری احمد عبدالقادر، تطور الحركة القومية العربية في الموصل... ص ٢٨١؛ هەروەسان پێشتر خەلکێ قەزایێن ئاکرێ و زێبار و شێخان پارە بۆ دۆزا فەلستینێ بێشکربوون.

٢. رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، پەراوێزا بەریەری ١٣٥.

٣. جريدة نصير الحق، العدد (٥٣٠)، ٨ حزيران ١٩٤٨.

٤. جريدة (الأديب)، العددان (٢٣٢، ٢٤٤)، ٢ حزيران، ٢٦ئ ب ١٩٤٨.

٥. جريدة (نصير الحق)ن العدد (٥٣٠)، ٨ حزيران ١٩٤٨.

* - ملە پێکهاتەکا (طائفة) ئایینیا دیارکری بوو ژ ئالیێ دەولەتێڤە هاتبوو پەژراندن، دەولەتا ئوسمانی ل نیڤا سەدسالیا نوزدێ ل ژێر فشارا بریتانیا پێکهاتا ئاسووری وەك (ملة) پەژراندبوو، ئانکو (ملة) ل ڤێرێ نە مللەتا کوردییە کو ب رامانا نەتەوە (قومیة) دهێت.

٦. بنێرە دەقێ بانگەوازێ ل؛ معن عبدالقادر زكريا، الاشوريون، أثورايي في وثائق الصحافة العراقية، (دهوك،٢٠١٦)، ص ٩٨- ١٠٠، و د پاشبەنداندا.

٧. هاتیەڤەگوهاستن ژ؛ نوری احمد عبدالقادر، تطورات الحركة القومية في الموصل... ص ٢٨٥.

٨. بۆ زانیارییێن بەرفرەهتر بنێرە هژمار (٢٣٢)، رۆژا ٣ حزیران ١٩٤٨ێ هەمان رۆژنامە.

# دانانا شاهـ فەیسەلێ دووێ ل سەرتەختێ شاهینیێ

**پ. د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی**
**وەرگێران: موسەدەق تۆڤی**

شاهـ (مەلك) غازی ل ئێڤاریا رۆژا (٣) نیسانێ سالا (١٩٣٩)ێ ب رووداناکا ترومبێلێ دمریت و ب فەرمی مرنا وی ل سپێدەها رۆژا (٤) نیسانی دهێتە راگەهاندن، و جڤاتا وەزیران بلەز كۆمبوونەك گرێدا (وەسیەتەكا) نڤێسی ژلایێ دەیكا وی ڤە (شاهـ عالیا) هاتە وەرگرتن تێدا هاتییە و دبێژیت شاهـ غازی دڤیا پسمامێ خۆ (عبدولئیلاهی كورێ عەلی) بكەتە (وەصی) ئەگەر هات و تووشی رووداناكی بوو و كورێ وی (فەیسەل) هێشتا یێ بچوویك و هێژ فەیسەل ل ژیێ چوار سالیێ دبیتە شاهـ و (عەبدولئیلاهـ) وەصیەتدار ل سەر دەسەلاتێ، ل (٢) گۆلانا سالا (١٩٥٢) ێ، (فەیسەلێ دووێ ) دگەهیتە ژیێ یاسایی و پێگەهشتنێ ئانكو ل ژیێ هەژدە سالیێ، وسەردەمێ (وەسیەتداریێ) ل (٤ نیسانی ١٩٣٩- ٢ گولانێ ١٩٥٣)ێ ب داویدهێت، ل (٣) گولانێ فەیسەلێ دووێ دەسەلاتا خۆ یا دەستووری وەردگریت و وەك شاهێ عیراقێ دهێتەدانان، و ب هەلكەفتا دانانا شاهی ئاهەنگ ل عیراقێ دهێنەدانان، ل مووسل خەلكەكێ زۆر خرڤە دبن و دروشمێن كەیف و خۆشیێ ڤەدگێرن، سەرۆكاتیا باژێرڤانیێ ژی رادبیت ب دانانا كڤانێن جوانیێ و یەكەیێن لەشكەری ژی ب شێوێ ڤیستەڤال رێپیڤانێ دكەن، دگەل نمایشكرنا (ڤیستەڤالێن خواندنگەهان) ل باژێری، و موتەسەرفیا (پارێزگەها) مووسلێ رابوو ب دانانا مێهڤاندارییێن بەرفەرهێن خوارنێ بۆ خەلكێ هەژار[1]، ب هەمان هەلكەفت ئاهەنگێن وەكهەڤ ل دەڤەرا بەهدینان ژی هاتنەگێران كو دەسەلاتێ ئامادەیی بۆ كربوون، بۆ نموونە ل زاخۆ هێماییێن جوانیی ل فەرمانگەهێن حكۆمی و ل جادا و دەروازێن باژێری دگەل ئالایێ عیراقێ و وێنێن شاهـ فەیسەلی هەلاویستبوون، هەروەسا رێپیڤانەك هاتبوو درۆستكرن بەشداربووییێن وی ژ خویندكار و فەرمانبەر و پۆلیسان و هندەك ژ خەلكێ باژێری بوون، و فەرمانگەها باژێرڤانیێ رابوو ب دابەشكرنا شرناهییا و ئەو رۆژ هاتە هژمارتن ب بهێنڤەدانەكا فەرمی. وەزارەتا كاروبارێن كۆمەلایەتی رێنمایی بەلاڤكربوون تاكو گۆژمەكێ پارەی ل هەر قەزایەكێ بێتە مەزاختن ژبۆ دابینكرنا خوارنێ بۆ هەژار و پەككەفتیا، وبەهرا زاخۆ (٢٠) دینار بوون، و دهێتە گۆتن كو مامۆستایێن زاخۆ و ئامێدیی بەشداری دگەل خویندكاران د ئەوی ڤیستەڤالێ دا كربوو ئەوا ل مووسل هاتییە كرن وەك دەربرینا خۆشیی ب هەلكەفتا دانانا شاهـ فەیسەلێ دووێ[2].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. عبدالفتاح علي البوتاني، صفحات من الذاكرة الموصلية.....بپ٨١- ٨٢.
٢. وصفيه محمد شيخو، ژندەری بەرێ، بپ، ٢٢٥—٢٢٦.

# داخوازیێن خویندكارێن ناڤنجیا زاخۆ سالا ١٩٥٣ێ

وەصفیە محەمەد شێخو
وەرگێران: موسلح حەمزە

دەمێ حوكم هاتییە ڤەگوهاستن و رادەستی شاهـ فەیسەلێ دووێ بووی و سەردەمێ (وەصیەتداریێ) داویهاتی، بزاڤا نشتیمانی هەولدا ب دەلیڤە بزانیت و كار بكەت ژ بۆ چاكسازیێ د سیستەمێ حوكمیدا و جێبەجێكرنا ئازادی و دیموكراسیەتێ و دووبارە زڤراندنا وان خویندكارێن هاتینەدەركرن ژ خواندنگەهێ ژ ئەگەرێ سەرهلدانا چریا دووێ یا سالا ١٩٥٢ێ بۆ خواندنگەهێن وان، و بەردانا گرتیێن زیندانكری.

ل چریا دووێ سالا ١٩٥٣ێ و ل دووڤ داخوازیێن بزاڤا نشتیمانی ژمارەكا خویندكارێن ناڤنجیا زاخۆ د دەستپێشخەر بوون ب هنارتنا هندەك داخوازیا بۆ رۆژنامەیا (صوت الاهالی) زمانحالێ پارتا نشتیمانی یا دیموكرات ئەوا بەرهەلستكار ل وی سەردەمی، ئەڤێن ل خوارێ دەقێ وان داخوازیا نە:

١- نەهێلان و راكرنا تاقیكرنێن بەكەلوریایێ بۆ پۆلێن سیێ ناڤنجی.

٢- دووبارە و ب لەز زڤراندنا هەمی وان برایێن مە ئەوێن ژ خواندنگەهان هاتینە دەركرن و بێ ئاستەنگ، و سالا هاتینەدەركرن ب سالا كەفتنێ نە هێتە هژمارتن.

٣- رێك ل بەر ئازادیێن دیموكراسی وەك ئازادییا دەربرینێ و پارتێن سیاسی وخۆنیشانانێ ....هتد بێتەڤەكرن.

رۆژنامەیا ناڤبری د ژمارا خۆدا یا (٣٥) ل ١٩٥٣/١١/١٥ێ ئەڤ داخوازییە بەلاڤكرن، بێی كو ناڤێن وان خویندكاران یێن ئیمزا ل سەر كری بەلاڤكەت، بەلێ كارگێریا خواندنگەهێ شیا ناڤێن وان ئاشكەرا بكەت و بنیاسیت، ئەوژی ئەڤە بوون:

عەبدولسەلام حەمید ژ پۆلا سیێ، حاجی ئەحمەد سەفەری، سالم نەجم ژ پۆلا ئێكێ، ئەحمەد ئیسماعیل، عەلی حەسەن، غازی عەبدی، حكمەت رەشید، عەلی جەمبەلی ژ پۆلا دووێ.

كارگێریا قۆتابخانێ لیژنەكا ڤەكۆلینێ ب سەرۆكاتییا رێڤەبەر جەمیل رەشید و ئەندامەتیا سالم عەبدولئەحەد و سادق بەهائەدین ئامێدی پێكئینا. لیژنێ بتنێ سۆزنامە ژ قۆتابی و سەمیانێن وان وەرگرتن ژبۆ هندێ تاكو ئەڤ جۆرە كریارە دوبارە نەبنەڤە، ئەو خویندكارێن ئیمزا ل سەر داخوازیان كرین پەشێمانیا خۆ دەربرین وكێشە ب داویهات یا كو ل دووڤ بانگەوازیا پارتێن سیاسی بوویە[1].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. بۆ پتر زانیارییان بنێرە: عبدالفتاح علی البوتانی وثائق عن ... بپ ١٢٤.

# هەلویستێ خەلكێ بەهدینان ژ هەڤپەیمانیا بەغدا ١٩٥٥ێ

پ.هـ. د. شێرزاد زەكەریا محەمەد
زانكۆیا زاخۆ - فاكولتییا پەروەردێ
وەرگێران: سالح سوفي

## پێكئینانا هەڤپەیمانیا بەغدا:

پشتی ب داویهاتنا شەرێ جیهانیێ دووێ ل سالا ١٩٤٥ێ، گوهورین كەتنە سیاسەتا نێڤدەولەتی و هەڤركی ل ناڤبەرا دەولەتێن سەركەڤتی ب ئاوایەكێ بەرچاڤ دیار و رۆهن بوون و ئەڤ دەولەتە ب سەر دوو كەمپان دابەش بوون، كەمپا سۆشیالست ب سەركردایەتیا ئێكەتیا سۆڤیەتی و دەولەتێن ئەورۆپا رۆژهەلات و كەمپا سەرمایەداری ب سەركردایەتیا ئەمریكا و هەڤپەیمانێن وێ یێن دەولەتێن ئەورۆپا رۆژئاڤا، ژ بەركو رۆژ بۆ رۆژێ هەڤركی ل ناڤبەرا وان زێدە و بەرفرەهـ دبوون، هەر ئێك ژ وان كەمپان بۆ مسۆگەركرنا بەرژەوەندیێن خۆ بزاڤ دكرن هێزێن دی یێن جیهانێ همبێز بكەن و جیهانێ بینە ناڤ رێزێن خۆ، هۆسا ئەمریكا و بریتانیا بزاڤ كرن بەرەیەكێ ب هێز ل رۆژهەلاتا ناڤین دژی ئێكەتیا سۆڤیەتی پێك بینن، نەخاسمە ژی پشتی زێدەبوونا مەترسیا كۆمۆنستی ل سەر رۆژئاڤا و سیستەمێ وێ[1].

دەولەتێن رۆژئاڤا (ئەمریكا، بریتانیا، فرەنسا) ژ هندێ ترسییان ئێكەتیا سۆڤیەتی دەستەلاتا خۆ ل ناڤ دەولەتێن رۆژهەلاتا ناڤین پەیدا بكەت، ژ بەر هندێ، بریتانیا ل سالا ١٩٥٠ێ هزرا پێكئینانا رێكخراوا (سەركردایەتییا رۆژهەلاتا ناڤین Middle East Command) كر و ژ بەركو تركیا پێگەهەكێ جوگرافیێ ستراتیژی هەبوو دەولەتێن رۆژئاڤا ئەو وەلات كرە بنگەهەك بۆ چوونا خۆ بەرەڤ دەولەتێن رۆژهەلاتا ناڤین بۆ بەرسینگگرتنا تەماعیێن سۆڤیەتی د دەڤەرێ دا[2]، لێ بزاڤێن پێكئینانا وێ رێكخراوێ سەرنەگرتن، پشتی هنگی دەولەتێن رۆژئاڤا بۆ گەهشتنا وێ ئارمانجێ پەنابرنە بەر ئاوایەكێ دی، هۆسا هزرا هەڤپەیمانیێن دووقولی دگەل دەولەتێن دەڤەرێ و پشكداركرنا دەولەتێن دی د وان هەڤپەیمانییان دا پەیدا بوو[3].

دەمێ نوری سەعید (١٨٨٨-١٩٥٨) ل عیراقێ بوویە سەرۆك وەزیر و كابینا خۆ یا دووێ یا ویزاری (٣ تەباخا ١٩٥٤-١٧كانوونا ئێكێ ١٩٥٥ێ) پێكئینای، گەلەك بزاڤ كر شێوازەكێ (فۆرمۆلەكا) نوویێ هەڤپەیمانییێ پەیدا بكەت ئەڤە ژی ب رێیا

پێکئینانا هەڤپەیمانییەکێ دگەل ترکیا کو ببیتە شەنگستەیەك بۆ هەڤپەیمانییەکا هەرێمیا بەرفرەهـتر ل دەڤەرێ و بریتانیا و ئەمریکا ژی پشکداریێ تێدا بکەن[٤].

مسرێ نەرازیبوونا خۆ ل سەر ڤان پرۆژەیان دەربڕی، ژ بەر هندێ ل رۆژا ١٦ تەباخا ١٩٥٤ێ شاندەکێ مسری ب سەرۆکاتیا وەزیرێ ئیرشادا نەتەوەیی ئەفسەرێ پێشرەو سەلاح سالم نوونەرێ سەرۆك جەمال عەبدلناسر (١٩١٨-١٩٧٠) گەهشتە عیراقێ و ل هاڤینگەها سەرسنکێ یا پارێزگەها دهۆك دگەل نوری سەعید کۆمبوو و هەڤپەیڤین دگەل کرن داکو عیراقێ رازی بکەت نەچیتە ناڤ وێ هەڤپەیمانییا دووقولی یان هەڤپەیمانییەکا دی یا مەزنتر هەتا وێ دەمێ مسر دان وستاندنێن خۆ ل سەر رێککەفتنا دەرکەفتنا هێزێن بەریتانی یا ل ناڤبەرا مسرێ و بریتانیا ب داوی دهێن، لێ نوری سەعید شاندێ مسری وەسا تێگەهاند کو عیراقێ هەلویستێ خۆ یێ تایبەت و پەیوەندیێن خۆ یێن تایبەت دگەل بریتانیا و ترکیا و ئیرانێ هەنە[٥] و نوری سەعید نەشیا مسرێ رازی بکەت بێتە ناڤ ڤان هەڤپەیمانییان[٦].

ل رۆژا ٢٤ شواتا ١٩٥٥ێ عیراقێ و ترکیا پەیمانەکا دووقولی گرێدا[٧]، پاشی عیراقێ ل شوونا پەیمانا ١٩٣٠ێ پەیمانەکا تایبەت دگەل بریتانیا گرێدا بەرامبەری هندێ بریتانیا بێتە ناڤ هەڤپەیمانییا عیراقی ـ تورکی و ئەڤ چەندە ژی ل رۆژا ٥ ی نیسانا ١٩٥٥ێ ب جهـ هات[٨] و پشتی بریتانیا گەهشتییە وێ هەڤپەیمانییێ عیراقێ و ترکیا پێکڤە بزاڤکرن هاتنا هندەك دەولەتێن دی یێن رۆژهەلاتا ناڤین بۆ ناڤ وێ هەڤپەیمانییێ مسۆگەر بکەن، بەرهەمێ ڤان بزاڤان ژی ئەو بوو ل رۆژا ٢٣ ئیلۆنا ١٩٥٥ێ پاکستان و ل رۆژا ٣ چریا دووێ یا ١٩٥٥ێ ئیران بێنە ناڤ وێ هەڤپەیمانییا ناڤهاتی[٩].

ل دووڤ هەڤپەیمانییا عیراقی ـــ تورکی، دەمێ هژمارا ئەندامێن دەولەتێن هەڤپەیمانیێ دگەهیتە چوار ئەندامان و زێدەتر، دڤێت جڤاتەك بۆ دەولەتێن وێ هەڤپەیمانیێ بێتە دامەزراندن، ژ بەر هندێ، ل رۆژا ٢١ چریا دووێ سالا ١٩٥٥ێ کۆنگرێ دامەزرێنەرێ وێ جڤاتێ ل بەغدا هاتەگرێدان و دەولەتێن ئەندام د وێ هەڤپەیمانییێ دا و ئەمریکا وەك چاڤدێر پشکداری تێدا کرن[١٠].

## هەلویستێ کوردان ژ وێ هەڤپەیمانییێ:

هەرچەندە ئارمانجا دیار و راگەهاندی یا هەڤپەیمانیا بەغدا بەرسینگگرتنا تەماعیێن سۆڤیەتی و بەلاڤنەبوونا هزرێن کۆمۆنستی و سۆشیالستی بوو ل دەڤەرا رۆژهەلاتا ناڤین[١١]، لێ ئێك ژ گرنگترین ئارمانجێن وێ یێن نەپەنی ئەو بوو پارچەکرنا کوردستانێ هەر یا بەردەوام بیت و ئەو پارچەکرن بێتە ب موکمکرن و نەتەوێ کورد نەگەهیتە هیڤی و ئومێدێن خۆ[١٣].

کـــوردان گومانەکا مـەزن هەبوو کو هەر رێککەفتنەکا ل ناڤبەرا عیراقێ و سەرکوتکەرێن وێ یێن دیرۆکی ترکیا و ئیرانێ بێتە کرن، پیلانگێرییەکە ل سەر هەبوونا وان یا نەتەوەیی[١٤]، پارتا دیمۆکراتا کوردستانێ (پارتی) نەڕازیبوونا خۆ ژ سیاسەتا دەرڤەیا نوری سەعید و گرێدانا هەڤپەیمانیا بەغدا دەربڕی و دیار کر کو ئارمانجا سەرەکیا وێ هەڤپەیمانییێ بزاڤا نەتەوەییا کوردایە ل عیراقێ و ترکیا و ئیرانێ[١٥] و گەفە ل سەر تەناهی و خۆسەریا گەلان و نەیارییە ل دژی کورد و عەرەب و ئاشتیخواز و گەلێن سەرانسەری جیهانێ و ئارمانجا وێ ب هێزکرنا پاوانکاریا ئیمپریالییە ل سەر رۆژهەلاتا ناڤین و سەخبێرکرن و موکمکرنا وێ ئیمپریالیێ یە[١٦].

ژ لایێ خۆڤە حزبا کۆمۆنستا عیراقێ داخواز ژ هەمی هێزێن نیشتمانی (ژ وانا پارتی ژی) کر خەبات و بزاڤێن خۆ بکەنە ئێك و ل دژی ڤێ هەڤپەیمانییێ راوەستێن و بەرەیەکێ نیشتمانی بۆ ئێخستنا حکومەتا عیراقێ پێك بینن[١٦].

گەلێ کورد بەردەوام دلگرانییا خۆ ژ هەڤپەیمانیا بەغدا و سیاسەتا دەستەلاتدارێن عیراقێ یا دژی مافێن نەتەوەیی و مافێن دیمۆکراتیێن گەلێ

عیراقێ دەربڕیە[١٧]، د ڤی چارچۆڤەی دا خەلكێ زاخۆ نەڕازیبوونا خۆ ژ وێ هەڤپەیمانییێ دەربڕی و كۆمەكا رۆشنبیران (ژ هەردو رەگەزان) و هەر كەسێ ب مەترسی و كاریگەریا وێ هەڤپەیمانیێ حەسیای ئیمزا ل سەر هندەك یاداشتان كرن كو ژ لایێ پارتا كۆمۆنستا عیراقێ ل زاخۆ بۆ ڤێ چەندێ هاتبوونە ئامادە كرن و ژ لایێ بزاڤا پشتەڤانێن ئاشتیێ (حركە انصار السلام) ڤە بۆ هاتبوونە هنارتن[١٨]، پشتی ب داویهاتنا ئیمزایان، ئەو یاداشت بۆ لیژنەیێن ناڤخۆیی یێن پارتا كۆمۆنست ل مووسل هاتنە هنارتن و وێ لیژنەیێ ژی بۆ لایەنێن حكومی یێن ل بەغدا هنارتن[١٩].

ژ لایەكێ دیڤە، كۆمەكا خویندكارێن كورد ل ئەوروپا، ژ وانا خویندكارەكێ خەلكێ زاخۆ كو ئەو ژی سەلاح محەمەد سەعدوللا بوو ئیمزا ل سەر یاداشتنامەكێ (سكالانامەكێ) كرن و ئاراستەی نیكیتا خرۆشۆڤ Nikita Khrushchev (١٩٥٣-١٩٦٤)، سكرتێرێ گشتیێ پارتا كۆمۆنستا سۆڤیەتی كرن و تێدا داخواز كرن كو پێتڤییە پشكەكا كوردی ل ئیزگەیێ مۆسكۆ بێتە ڤەكرن و پشتڕاست كرن كو ئیزگێ كوردی دێ رۆلەكێ گرنگ د ژناڤبرنا پرۆپاگەندا هەڤپەیمانییا بەغدا دا هەبیت[٢٠].

هەڤدەم كۆمەكا رێكخستنێن پارتا كۆمۆنست ل بازێڕێ دهۆك، ژ وانا: تەحسین ئەحمەد بەگێ بەرواری و عەدنانێ برایێ وی ب شەڤ پۆستەر و بەلاڤۆك ل جاددە و مەیدانێن بازێڕی بەلاڤ كرن و تێدا رژێما شاهینی (مەلكی) و هەڤپەیمانییا بەغدا رسوا و شەرمەزار كرن[٢١].

ژ لایەكێ دیڤە، بازێڕڤانییا بـازێـرێ دهۆك ئاهەنگەك ب هەلكەڤتا گرێدانا پەیمانا بەغدا گێڕا و بەرزەحفییەك ب وێ هەلكەڤتێ دانا، لێ ئەو بەرزەحفي بوو ئەگەرێ دلگرانی و تۆڕەبوونا كۆمەكا جەماوەرێ بازێڕی یا ژ هەژاری و نەداریێ دنالین و وی جەماوەری قەستا وێ یانەیێ كر یا بەرزەحفي لێ هاتییە دانان و ب هەمی دەنگێ خۆ هەوار دكرن: (گەلی حەڤك ستووران، حكۆمەتێ ئەڤ بەرزەحفییە بۆ هەوە نە دانایە، بەلكی بۆ مە یێن هەژار و برسییە، گەلی زك مەزنێن حەمەر، مە پتر ماف تێدا هەیە)، ب ڤی ئاوایی بەرپرسێن حكومی یێن بازێڕی پشتەڤانییا خۆ بۆ وێ هەڤپەیمانییێ دەربڕین، لێ هەلویستێ جەماوەری ل دژی هەڤپەیمانییێ بوو و ئیزگەیێ (صوت العرب) ل قاهیرە كاریگەرییەكا دیار وبەرچاڤ ل سەر جەماوەرێ عیراقێ ب گشتی و یێ دهۆك ب تایبەتی هەبوو[٢٢].

ڤەكۆلەر رەجەب جەمیل حەبیب پشتڕاست دكەت كو چ رۆلێ بازێڕێ ئامێدیێ د پشكداریكرنێ وان خۆنیشاندانان دا نەهاتییە دیتن یێن بۆ شەرمەزاكرن و دەربڕینا نەڕازیبوونێ ژ وێ هەڤپەیمانییێ دهاتنە كرن، شرۆڤەیا وی بۆ ڤێ چەندێ ئەوە كو دەڤەر دووری تەوەرێ روودانان بوویە و كاریگەریێن وان روودانان نەگەهشتبوونە وێرێ[٢٣]، هەروەسا دروستە ئەڤ چەندە بۆ ئاكرێ ژی بێتە گۆتن[٢٤].

ب راستی ژی، قەبارێ نەڕازیبوونێ یا دەڤەرا بەهدینان د ئاستی وێ نەڕازیبوونێ دا نەبوو یا دەڤەرێن سلێمانیێ و هەولێر ڤەگرتی[٢٥]، ئەڤە ژی ژ بەر لاوازییا رێكخستنێن (پارتی) و حزبا كۆمۆنست بوو ل دەڤەرا بەهدینان هەكە بێتە هەڤبەركرن دگەل دەڤەرێن وان هەردو پارێزگەهان.

## هەڤپەیمانییا بەغدا پشتی شۆڕشا ١٤ی تیرمەها ١٩٥٨ێ:

كوردێن عیراقێ ب هەلبوونا شۆڕشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ دلخۆش بوون و ب ڤێ هەلكەڤتێ (پارتی) ل رۆژا ١٦ی تیرمەهێ بەیانەك ئاراستەی گەلێ كورد كر و تێدا پشتەڤانییا خۆ بۆ سیستەمێ كۆماری دیار كر و داخواز كر كو پێتڤییە عیراق خۆ ژ هەڤپەیمانییا بەغدا ڤەكێشیت یا ستێركا تیرێن خۆ ل دلێ

نەتەوەیێ کورد گرتی[٢٦].

حکۆمەتا ترکیا گەلەك هەست ب نەڕحەتیێ کر بەرامبەری هەلبوونا شۆڕشێ و عەدنان مەندەریس Adnan Menderes (١٩٥٠- ١٩٦٠) سەرۆك وەزیرێن تورك داخواز ژ ئەمریکا کر رێ بدەتێ وەلاتێ وی هێرشێ بکەتە عیراقێ[٢٧]، وەك پێنگاڤەك ژی بۆ وێ ئنیەتا وەلاتێ خۆ، مۆلەتێن لەشکەری ل ترکیا راگرتن و داخواز ژ ئەفسەران کر قەستا یەکەیێن خۆ یێن سەربازی بکەن و حکۆمەتێ هندەك رێکارێن دی یێن سەربازی ژی ئەنجام دان[٢٨].

ئێکەتیا سۆڤیەتی نەڕازیبوونا خۆ ژ ڤان پێکولێن ترکیا دەربڕی و ل رۆژا ١٨تیرمەها ١٩٥٨ێ یاداشتەك ئاراستەی حکۆمەتا ترکیا کر و هۆشداری دایێ ژ هەر مایتێکرنەکێ د کاروبارێن ناڤخۆیێن عیراقێ دا، ئەڤ هۆشدارییە ژی هاتە دان پشتی هندەك گۆتگۆتك بەلاڤ بووین کو هێزێن ترکیا یێ لەشکەرکێشیێ بەرەڤ بەغدا دکەن بۆ پاراستنا سیستەمێ شاهاتیا بەرێ و هەر د وێ یاداشتێ دا خواز ژ ترکیا کر دەست ژ دوژمنکاریێن خۆ ل دژی عیراقێ بەردەت[٢٩].

پشتی ڤان هۆشداریێن سۆڤیەتی، حکۆمەتا ئەمریکی بڕیاردا ل رۆژا ١٨ تیرمەها ١٩٥٨ێ دگەل حکۆمەتا بەریتانی رێك بکەڤیت و ترکیا نەهێتە هاندان قەستا عیراقێ بکەت، چونکی مەحالە ل بەرامبەری رەئیا گشتیا ناڤدەولەتی بەرەڤانی ژ وێ رێکارا ترکی بێتەکرن، ژ بەرکو وی دەمی دێ ب زەحمەت بیت رێ ل مایتێکرنێن سۆڤیەتی بێتە گرتن کو هاریکاریا رژێما سەربازیا عیراقێ نەکەت[٣٠]، حکۆمەتا ترکیا ژی ل رۆژا ٢٢ تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ بەرسڤا یاداشتا سۆڤیەتی دا و پشتڕاست کر کو بزاڤێن وێ یێن سەربازی چ نینن تنێ بۆ موکمکرنا بەرەڤانیێن خۆنە[٣١].

لڤینێن سەربازی یێن ترکیا ترس ل ناڤ خەلکێ دەڤەرێن توخیبی پەیدا کر نەخاسمە ل ناڤ خەلکێ باژێرێ زاخۆ یا نێزیکی توخیبی، ژ بەر هندێ، جەماوەرێ زاخۆ دەستپێکەرییەك (دەسپێشخەرییەك) کر و قەستا توخیبی کر بۆ پاراستنا وی توخیبی ژ هەر هێرشەکا چاڤەڕێکریا ترکیا بۆ سەر عیراقێ ب رێیا زاخۆ[٣٢].

ل سەر ڤێ چەندێ، (عسمەت دینۆ) کو خەلکێ گوندەکێ توخیبێ زاخۆیە پشتڕاست کر کو لەشکەرێ ترکیا مانۆر و مەشق و راهێنانێن سەربازی ل دەڤەرا سلۆپی دکرن و جەندرمەیێن تورك ل خەلکێ توخیبی و شڤانان دکرنە هەوار و ب (کۆمۆنست) ئانکو دووڤکەڤتیێن پارتا کۆمۆنست ناڤ دکرن!! لێ نەدبوونە مەترسی ل سەر وان[٣٣].

هەلبوونا شۆڕشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ هۆکارێ ئێکلاکەرێ دەرکەڤتنا عیراقێ بوو ژ گیخا (بازنەیا) هەمی ئاوایێن هەڤپەیمانیێن رۆژئاڤا و کۆمەل و خرڤەبوونێن رۆژهەلاتا ناڤین، نەخاسمە ژی هەڤپەیمانیا بەغدا[٣٤] و عیراقێ رۆژا ٢٤ئادارا ١٩٥٩ێ ب فەرمی ڤەکێشانا خۆ ژ وێ هەڤپەیمانییێ راگەهاند[٣٥].

گەلێ کورد ب گەرمی پشتەڤانیا وێ بڕیارا حکۆمەتا عیراقێ کر و ب وێ هەلکەفتێ مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکێ (پارتی) نامەیەك ئاراستەی سەرۆك وەزیر عەبدولکەریم قاسمی کر و تێدا پشتەڤانیا خۆ و گەلێ کورد بۆ وی پشتڕاست کر و پیرۆزباهی ل ڤێ پێنگاڤێ کر و دوپات کر کو ڤێ خۆڤەکێشانێ بەندکێ داویێ یێ ئیمپریالی ل وەلاتێ مە بڕیە و کۆمارا مە یا دیمۆکراتی بنەجە کرییە[٣٦].

پشتی ڤەکێشانا عیراقێ ژ وێ هەڤپەیمانییێ، ئەندامێن وێ هەڤپەیمانییێ ل رۆژا ٢١ تەباخا ١٩٥٩ێ بڕیاردان ناڤێ وێ بۆ رێکخراوا پەیمانا ناوەندی (Central Treaty Organization (Cento بێتە گوهورین و حکۆمەتا عیراقێ رازی بوو بەلگەنامە و نڤیسارێن فەرمی یێن وێ پەیمانێ رادەست بکەت و بۆ ئەنقەرە بارەگەهێ بەرەوەختێ وێ پەیمانێ بێنە ڤەگوهاستن[٣٧].

# ژێدەر و پەراوێز:


١. مؤيد ابراهيم الونداوي، وثائق ثورة تموز ١٩٥٨ في ملفات الحكومة البريطانية، (بەغدا، ١٩٩٠)، بپ ٩، بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە، علاء جاسم محمد الحربي، العلاقات العراقية- البريطانية ١٩٤٥-١٩٥٨، (بەغدا، ٢٠٠٢)، بپ ٤٦ و بەرپەرێن دووڤدا، غانم محمد الحفو، صفحات من تأريخ التكتلات الإقليمية في الشرق الاوسط العراق نموذجا ١٩٤٦-١٩٥٩، (مووسل، ٢٠٠٥)، بپ ١٧ و بەرپەرێن دووڤدا.

٢. احمد نوري النعيمي، السياسة الخارجية التركية بعد الحرب العالمية الثانية، (بەغدا، ١٩٧٥)، بەرپەرێن ٢٢٨-٢٣٠، عبد السلام ابو السعود، حلف بغداد، (قاهيرة، ١٩٥٧)، بەرپەرێن ٧-١٠.

٣. احمد نوري النعيمي، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢٣٢-٢٣٣.

٤. عوني عبد الرحمن السبعاوي، العلاقات العراقية التركية ١٩٣٢- ١٩٥٨، (مووسل، ١٩٨٥)، بەرپەرێن ١٦٨-١٦٩.

٥. غانم محمد الحفو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦.

٦. عوني عبد الرحمن السبعاوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٩.

٧. مؤيد ابراهيم الونداوي، العراق في التقارير السنوية للسفارة البريطانية ١٩٤٤- ١٩٥٨، (بەغدا، ١٩٩٢)، بپ ٢١٠.

٨. جعفر عباس حميدي، التطورات والأتجاهات السياسية الداخلية في العراق ١٩٥٣-١٩٥٨، (بەغدا، ١٩٨٠)، بپ ١٣٠. بۆ هوورکاریيان بنێرە: علاء جاسم محمد الحربي، العلاقات العراقية- البريطانية ١٩٤٥-١٩٥٨، (بەغدا، ٢٠٠٢)، بەرپەرێن ٢٦٥-٢٦٦.

٩. غلام رضا علي بابايي، فرهنگ علوم سياسى، (تەهران، ١٣٦٩ شەمسی)، بەرگێ٢، بپ١٨.

١٠. مؤيد ابراهيم الونداوي، العراق...، بپ ٢١٢.

١١. بۆ هوورکاریيان بنێرە: فكرت نامق عبدالفتاح، سياسة العراق الخارجية في المنطقة العربية ١٩٥٣-١٩٥٨، (بەغدا، ١٩٨١)، بپ ٢٥ و پێن دووڤدا.

١٢. عزيز الحاج، القضية الكردية في العراق التأريخ والآفاق، (بەیرۆت، ١٩٨٥)، بپ١٦٤.

١٣. اوريل دان، العراق في عهد قاسم تأريخ سياسي ١٩٥٨-١٩٦٣، وەرگێرانا: پارێزەر جرجيس فتح الله، (سويد، ١٩٨٩)، بپ٢٤.

١٤. جعفر عباس حميدي، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢٢٩-٢٣٠.

١٥. غانم محمد الحفو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٢.

١٦. مەهدی محەمەد قادر، پێشهاتە سیاسییەکانی کوردستانی عیراق ١٩٤٥-١٩٥٨، (سلێمانی، ٢٠٠٥)، بپ ٣٠٩.

١٧. كاوس قفطان، الحركة القومية التحررية الكردية في كردستان العراق ١٩٥٨— ١٩٦٤، (سلێمانی، ٢٠٠٤)، بەرپەرێن ٤٩-٥٠.

١٨. ئەڤ بزاڤە ل سالا ١٩٥٠ ل عیراقێ هاتییە دامەزراندن و ل سالا ١٩٥٤ ێ کۆنگرێ خۆ یێ ئێکێ ل بەغدا گرێدایە، رژێما شاهاتیيا عیراقێ ئەو بزاڤ وەسا نیشا دا پەردەیەك بیت كۆمۆنست خۆ ل پشت ڤەشێرن، ئینا چالاكیێن وێ و ئەندامبوونا وێ ب تاوان قەلەمدا کو ل دویڤ یاسایێ بێنە سزادان، بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، التطورات السياسية الداخلية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨- ٨ شباط ١٩٦٣، (دهۆك، ٢٠٠٧)، بپ١٥٢.

١٩. وصفية محمد شيخو السندي، زاخو في العهد الملكي ١٩٢١ — ١٩٥٨ دراسة تأريخية في أوضاعها العامة، دهۆك، ٢٠١٤، بپ ٤٦٦.

٢٠. هەر ئەو ژێدەر، بەرپەرێن ٤٦٦- ٤٦٧.

٢١. رجب جميل حبيب، ئامیدی (العمادية) ١٩٢١- ١٩٧٥ دراسة في التأريخ السياسي، (دهۆك، ٢٠١٢)، بپ ١٣٦ دەهمەنا هژمار (٢)؛ هلز عثمان ميرو، دهوك ١٩٤٥- ١٩٧٥ (دراسة تأريخية)، نامەیا ماستەرێیە نەهاتییە بەلاڤ کرن، پشکا دیرۆکێ، زانکۆیا زاخۆ، ٢٠١١، بپ ٤٤.

٢٢. هلز عثمان ميرو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٣.

٢٣. بنێرە پەرتووکا وێ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٦.

٢٤. هەر بۆ نموونە بنێرە: جميد شكرى، ئاكرێ (عقرة) في العهد الملكي، (دهۆك، ٢٠١٢)، بەرپەرێن ١٩٨-١٩٩، ٢١٢.

٢٥. بۆ هوورکارێن هەلویستێ ڤان دەڤەران ژ وێ پەیمانێ بنێرە: سعاد خيري، من تأريخ الحركة الثورية المعاصرة في العراق ١٩٢٠-١٩٥٨، (بەغدا: د.ت)، بەریەرێن ٢٤٣- ٢٧٥؛ إسماعيل شكر رسول، اربيل دراسة تأريخية في دورها الفكري والسياسي ١٩٣٩-١٩٥٨، (سلێمانی: ٢٠٠٥)، بەریەرێن ٣٣٦-٣٣٩.

٢٦. مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحررية الكردية –الكرد وثورة ١٤تموز ١٩٥٨- ١١ ايلول ١٩٦١، چاپا ٢، (بەیروت، ١٩٩٧)، بپ ٣٧.

٢٧. كۆمەكا دانەران، تأريخ الوزارات العراقية في العهد الجمهوري ١٩٥٨-١٩٦٨- ١٤تموز ١٩٥٨- ٧ شباط ١٩٥٩، ڤەوژارتن، نوري عبدالحميد العاني و علاء جاسم محمد الحربي، چاپا ٢، (بەغدا، ٢٠٠٥)، بەرگێ ١، بپ ١٤٠.

٢٨. كۆمەكا دانەرێن سۆڤیەت، تأريخ تركيا المعاصر، وەرگێرانا، هاشم صالح التكريتي، (سلێمانی، ٢٠٠٧)، بپ ٣٩٤.

٢٩. عبد المناف شكر جاسم، العلاقات العراقية السوفيتية ١٩٤٤- ٨ شباط ١٩٦٣، (بەغدا،١٩٨٠)، بپ ٨٨؛ ليث عبدالحسن الزبيدي، ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨ في العراق، چاپا٢، (بەغدا، ١٩٨١)، بەریەرێن ٢١٢-٢١٣.

٣٠. مؤيد ابراهيم الونداوي، وثائق...، بپ ١٨٠.

٣١. عبد المناف شكر جاسم، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٨؛ ليپ عبد الحسن الزبيدي، ژێدەرێ بەرێ، بەریەرێن ٢١٢-٢١٣.

٣٢. وصفية محمد شيخو السندي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٧٦

٣٣. چاڤپێكەڤتنەك دگەل عسمەت دینۆ ل رۆژا ٧ تەباخا ٢٠١٦ێ ل زاخۆ، ناڤبری ل سالا ١٩٣٩ێ ل گوندێ هەڤشنێ ل قەزا زاخۆ ژ دایك بوویە و ئێكە ژ ماقوولێن عەشیرەتا سندی، ل سالا ١٩٥٨ێ سەرباز بوو د ناڤ ریزێن لەشكەرێ عیراقێ دا، پشكداری د شۆرشا ئیلوونێ دا كرییە و نوكە ل زاخۆ ئاكنجییە.

٣٤. غانم محمد الحفو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦١.

٣٥. مجيد الخدوري، العراق الجمهوري، (قوم، ١٣٧٦ شەمسی)، بپ ٢٤٦؛ ماجد عبدالرضا، المسألة القومية الكردية في العراق ١٩٥٨-١٩٧٥، (د.م، ١٩٨٧)، بپ ٨٥.

٣٦. رۆژناما (خەبات)، ژمارە (١)، ٤ نیسانا ١٩٥٩.

٣٧. كۆمەكا دانەران، ژێدەرێ بەرێ، بەرگێ٢، بپ ٢٤٢.

# دهۆك و مانگرتنا گۆشتفرۆشێن مووسل سالا (١٩٥٦)ێ

وەصفیه محەمەد شێخو
وەرگێران: موسلح حەمزە

حکۆمەتا نوری سەعیدی یا سێزدێ ل دەستپێکا حوکمداریيا خۆ زنجیرەکا مانگرتن و نەرازیبوونان ب خۆڤە دیتن، ئەگەرێن وان ژی دزڤرن بۆ لاوازیيا بارێ ئابووری، کرێکار ل پێشییا مانگرتیان بوون، داخوازیێن وان ل دۆر چارەسەرییا ئاریشەیێن ئابووری و زیدەکرنا کرییا وخۆشکرنا کاودانێن کاری بوو[١]، زێدەباری مانگرتنا مووسل ل ئەیلوولا سالا (١٩٥٦)ێ، ل زاخۆ ژی ل (٢٢) شواتێ سالا (١٩٥٦)ێ کرێکارێن باژێرڤانیێ (ئاڤ و ئەلکتریکێ) داخوازکرن رۆژا ئەینی بۆ وان ببیتە رۆژا بێهنڤەدانێ دگەل هژمارتنا کرییا وێ رۆژێ، هەروەسا داخوازکرن دەمژمێرێن کاری ببنە هەشت دەمژمێر (ئەوان نەهـ دەمژمێر و نیڤا کاردکرن) و گەفا مانگرتنێ دکرن ئەگەر داخوازیێن وان نەهێن بجهـئینان، دەمێ رێڤەبەریێ دیتی کرێکار درژدن و د ئێککگرتینە رازیبوو رۆژا ئەینی ببیتە بهێنڤەدان دگەل هژمارتنا کرییا وێ و کێمکرنا دەمژمێرەکێ ژ کاری[٢].

هەروەسا بزاڤا نیشتمانی ل عیراقێ هاندانا مللەتی دکر تاکو ب ژمارەکا مانگرتنا رابن و مەزنترین مانگرتن یا گۆشتفرۆشا بوو ل مووسل[٣]، ئەڤێ مانگرتنی ل دەستپێکێ دناڤ تەخا بازرگانێن پەزی دا ل (٢٨) خزیرانا (١٩٥٦)ێ سەرهەلدا و مانگرتنا گۆشتفرۆشا ل (٣١)ێ تەباخێ وەك نەرازیبوون ل سەر بریارا باژێرڤانیێ ئەوا تایبەت ب بەرزکرنا باجا (سەرژێکەها) ب سەردا هات و ل دووڤدا مانگرتنێ هندەك تەخێن دیتر بخۆڤە گرتن و بلەز ل ٣ ئەیلوولێ باژێرێ مووسلێ ڤەگرت و زۆربەی هێزێن نیشتمانی پشتەڤانی لێکر[٤].

مانگرتن و نەرازیبوونێن باژێرێ مووسل بەرفرەهـبوون کو ل دووڤدا قەزا و ناحیێن لیوایێ ژی بخۆ ڤەگرتن وەك تلەعفەر وشنگال و ئامێدیێ، لەوا پۆلیسێن مووسل راگەهاند کو ئەڤ مانگرتن و نەرازیبوونە بووینە کارەکێ نەسرۆشتی[٥]. دەسەلاتێ رێکێن جۆرا و جۆر بکارئینان ژبۆ ژ ناڤبرن و نەهێلانا ئەڤێ مانگرتنێ پەنا برە بەر هاریکارییا زانایێن ئایینی وەك محەمەد حەبیب عوبەیدی موفتیێ مووسل دەمێ بەیاننامەك دەرکری و تێدا داخواز ژخەلکی کر مانگرتنێ داوی بینن ب هێجەتا کو زیانێ دگەهینتە هەژار و بەلنگازان و د بەیاننامەکا دی دا داخوازکر ل جهێ مانگرتنی سەرەدانا زانایان بکەن[٦].

دهێتە گۆتن دەمێ دەسەلاتێ گەف کرین ژبۆ ئینانا گۆشتفرۆشا ژ دەرڤەی مووسل گۆشتفرۆش نائیف

سەعید جبو ئەندامێ پارتا نیشتمانی یا دیموكرات و ل ژێر داخوازا سەركردەیێن پارتێن سیاسی چوو هەولێر و كەركوك و سلێمانیێ و پاش بۆ قەزایان وەك زاخۆ و شنگال و ئامێدیێ و چاڤپێكەفتن دگەل گۆشتفرۆشان كر و داخواز ژ وان كرن پشتەڤانیا مانگرتنێ بكەن و داخوازا دەسەلاتێ جێ بە جێنەكەن[7].

سەربارەت دهۆكێ، قائیمامێ وێ د راپۆرتا خۆیا ئیداریدا نڤیسییە و دبێژیت (ئاكنجیێن دهۆكێ ل ئەیلوولا (١٩٥٦)ێ پێكولا مانگرتنێ دكرن ب پالدانا هندەك بازرگانێن پەزی ل مووسل بەلێ مە دەرفەت نەدایێ)، وەسا دیار دبیت كو دەسەلات ل دهۆكێ شیایە مانگرتن و خۆنیشادانان قەدەغەكەت و نەهێنە كرن[8].

ل دەمێ لیژنا سەرپەرشتیارا مانگرتنێ ئێك ژ ئەندامێن خۆ ڤرێكرییە نك گۆشتفرۆشێن قەزایێن سەر ب مووسل ڤە و داخوازا پشتەڤانیا مانگرتنێ ژێ كرین، گۆشتفرۆش (نائیف سەعید الحیو) شیا بگەهیتە ئەوان دەڤەرا و چاڤپێكەفتن دگەل گۆشتفرۆشان كر و داخوازا ژێ كر پشتەڤانیا مانگرتنێ بكەن[9]. ل دووڤ گۆتنا ئێك ژ گۆشتفرۆشا ل ئاكرێ دبێژیت ئێك ژ ئەندامێن لیژنا سەرپەرشتیارا مانگرتنێ ل دەڤەرێ داخواز ژ وان كر جهێن كارێ خۆ ب دائێخن و هندەك گۆشتفرۆشا پشتەڤانی لێ كر و جهێن كارێ خۆ دائێخستن[10]. هەروەسا ژێدەر دیار دكەن و دبێژن كو پشتەڤانیا مانگرتنێ گەهشتە بازێرێ ئامێدیێ، دهێتە گۆتن شیوعیێن ئامێدیێ هندەك بەربەست دانا بوونە ل سەر رێكا (ئامێدیێ - - دهۆك) ل نك سۆلاڤێ ژبۆ راوەستاندنا هاتن وچوونا ترومبێلا، ژ ئەگەرێ بریارا حكۆمەتا عیراقێ دەمێ باج گرانكرین، بەلێ جۆرێ باجێ وكیژ سالێ بوو..؟ نەیێ دیارە، بەلێ دیارە مانگرتن بەری شۆرشا (١٤) تیرمەهێ بۆ سالا (١٩٥٨)، بەلێ هاتبوو دوپات كرن كو ژ ئەگەرێ بەرزكرنا بهایێ باجا ژلایێ حكۆمەتێ ڤە مانگرتنێ بازێرێ ئامێدیێ ژێ ڤەكرتبوو[11]. سەبارەت زاخۆ ئەو مانگرتنا دروستبووی نە بتنێ مانگرتنا گۆشتفرۆشان بوویە بەلێ مانگرتنەك بوو هەمی كەرتێن پیشەیی بخۆ ڤە گرتبوون.

ل دۆر ئەڤێ چەندێ ئێك ژ رێكخستیێن مانگرتنا زاخۆ ب ناڤێ (تاها محەمەد تاها جقسی) دبێژیت مانگرتن ل زاخۆ ژ ئالیێ ئەندامێن پارتا شیۆعی و پارتا دیموكراتا كوردستانێ ڤە هاتبوو رێكخستن، ل (٦) ئەیلوولێ دەستپێكرییە و تاكو داویا رۆژا (٩) ئەیلوولا (١٩٥٦)ێ ڤەكێشایە و ببوو جهێ دلخۆشی و پشتەڤانییەكا بەرفرەهـا خەلكێ زاخۆ كو هەمی ئەو تەخێن پیشەیی ل زاخۆ هەبی مانگرتنا خۆ كرن.

مانگرتن دژی وێ سیاسەتا ئابووریا خراب بوو ئەوا قائیمقامێ زاخۆ (سوبحی عەلی) دگەل خەلكێ زاخۆ بكاردئینا[12]. نوینەرێن مانگرتیا وەك: (تاها محەمەد جقسی، حسێن بیتان، عیسا حاجی عیسا، عەبدوللەتیف عەبدوللا عەلی، شێخ موسلح، شێخ زیائەدین، سیروب چاچان، سالم تاها الجوادی، یەحیا دۆسكی، یونس خەلیل كەبابچی، موسا ئال عیسا)، ئەڤان كەسا هندەك داخوازی پێشكێشی قائیمقامیەتێ كرن وەك:

**ئێك:** كێمكرنا كرێیا ئەلكتریكێ ئەوا ژ (١٠) فلسا بوویە (٢٥٠) فلس.

**دو:** لابرنا كرییا ئاڤێ ئەوا ژ (٣) دەرهەما بوویە (٧) دەرهەم د هەیڤێ دا.

**سێ:** لابرنا كرییا ئاڤا ل خوارنگەهـ و چایخانا ژبەر نەبوونا لۆلەك و عەمبار و زەنبەلێن (حەنەفیێن) ئاڤێ دوان جهـان دا.

**چوار:** لابرن و نەهێلانا باجا ل سەر (حەصو و خیزی) ئەوا ب بهایێ (٧٥٠) فلسا، كو ئەڤ باجە ل سەر وی كەسی هاتبوو سەپاندن ئەوێ (حەصو وخیزی) ژ رەخ و رووبێن خابووری ب ڤەگوهێزیت ئەگەر خۆ ئەو بارێ دەواری ژی بیت.

**پێنج:** راكرنا باجا دویكێلێ ئەوا ب گۆژمێ (٧) دەرهەما كو ئەڤ باجە ژ چایخانا وەردگرتن ئەوێن (سەماوەر) تێدا.

**شەش:** راكرنا باجا رادیویێ ئەوا ب كوژمێ(٧٥٠) فلسا كو فەرمانگەها پۆستێ ل زاخۆ ژ هەر كەسەكی ئامیرەكێ رادیویێ هەبا وەردگرت.

**حەفت:** راكرنا باجا دەلالیێ ئەو ژی هەر كەسەكی تشتەك دناڤ بازاری دا فرۆتبا كوژمێ (١٠٪)ێ

ژ بهایێ فرۆتنێ ژێ دهاته وەرگرتن كو ل وى سەردەمی نێزیكى(٢٥) فلسا بوون.

**هەشت،** راكرنا باجا (ئەردى) ئەوا ل سەر خودانێن (دەوارێن كارى) هاتیبە سەپاندن، كو (٣٨) فلس ژ خودانێن هێسترا و (٣٦) فلس ژ خودانێن كەرا دهاته وەرگرتن، هەر كەسەكێ ئەڤ گۆژمە نەبا دا گۆپال یان (خەنجەر) یان چانتێ وى یان هەر تشتەكێ دیتر با وەك بارمتە ژێ وەرگرن تاكو شیابا ئەوێ باجێ بدەت.

**نەهـ** راكرنا باجا ئەردێ جهێن كارى، ئەو ژى ئەو باج بۆ ئەوا دهاتە سەپاندن ل سەر وان تەختێن دارى ئەوێن دوكانداران ل بەر جهێن كارى د داتنان و متایێ خۆ ل سەر بەرچاڤ دكرن ژبۆ فرۆتنێ.

**دەهـ** راكرنا باجا بەكارهێنەرى ئەوا دهاتەسەپاندن ل سەر خودان بەرهەمێن بەكارهێنەر یێن (چاندنێ و ئاژەلى) و ب رێژا (١٠٪)ێ ژ بهایێ فرۆتنا ئەوى بەرهەمی، بۆ نموونە ئەو كەسێ بەرهەمێ خۆ یێ برنجی ل (قەپانێ) یان ل خانێ ب دو دیناران فرۆتبا دو دەرهەم وەك باج ژێ دهاتەوەرگرتن.

مانگرتنێ ل زاخۆ سەركەفتن بدەستڤە ئینا بوو، و قائیمقامی داخوازیێن وان بجهئینابوون، بەلێ پشتی داویهاتنا مانگرتنێ ئەوێن سەرپەرشتیا وێ كرین هاتنەگرتن و دادگەهكرن بەلێ ل دووڤدا ب گەردەننامەكا (كفالة) دراڤی هاتنە بەردان[١٣]. هەر چەوا بیت ل دووڤدا ئەو مانگرتنا نە سرۆشتی ل لیوا مووسل ب داوى هات ب دەركرنا فەرمانەكا شاهینی ل (٢٥) ئەیلوولێ سالا (١٩٥٦)ێ[١٤].

## ژێدەر و پەراوێز:


١. جعفر عباس حميدي (الدكتور)، التطورات والاتجاهات السياسية الداخلية في العراق ١٩٥٣-١٩٥٦،(بغداد:١٩٨٠)، بپ ١٣٨.

٢. سعاد خيري، من تأريخ الحركة الثورية المعاصرة في العراق، ١٩٢٠- ١٩٥٨،(بغداد:د.ت)، ب١، بپ٢٧٦-٢٧٧.خليل جندى، ژێدەرێ بەرێ، بپ٢٠٤،

٣. جعفر عباس حميدى (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١٤١.

٤. غانم محمد الحفو (الدكتور)، جعفر عباس حميدي (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ بپ١٤١.

٥. عبد الرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، ب١٠، بپ٣٨- ٣٩، جعفر عباس حميدي (الدكتور)، التطورات والاتجاهات السياسية الداخلية في العراق، بپ١٤، بۆ پتر پێزانینا ل دور مانگرتنا گوشتفرۆشا ل مووسل بەرێ خۆ بدە: عبد الفتاح علي البوتاني(الدكتور)، وثائق عن اضراب القصابين في الموصل ١- ٨ ايلول ١٩٥٦، گۆڤارا دهۆك، ژمارە(٢٠)،حزيران ٢٠٠٣، بپ ٧٨ ول دووڤدا.

٦. جعفر عباس حميدي (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ١٤٢.

٧. نمير طه ياسين، الاصناف والتنظيمات المهنية في الموصل منذ أواخر القرن التاسع عشر حتى عام ١٩٥٨، ڤەكولینەكا دكتورایێ یە نە یا بەلاڤكریە، زانكۆیا مووسل، ١٩٩٢، بپ ٣٠٣.

٨. هلز عثمان ميرو، ژێدەرێ بەرێ،بپ٤٢.

٩. بۆ پتر پێزانینا بەرێ خۆبدە: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن.....بپ ٦٤٧- ٦٥٣.

١٠. جمید شكرى بابكر ئاكرەیى، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٨.

١١. رجب جميل حبيب،ژێدەرێ بەرێ.

١٢. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرى بەرێ، بپ١٩٨.

١٣. هەمان ژێدەر.

١٤. عبد الرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، ب١٠، بپ٣٨- ٣٩، جعفر عباس حميدي (الدكتور)، التطورات والاتجاهات السياسية الداخلية في العراق، بپ١٤، بۆ پتر پێزانینا ل دور مانگرتنا گوشتفرۆشا ل مووسل بەرێ خۆ بدە،عبد الفتاح علي البوتاني(الدكتور)، وثائق عن اضراب القصابين في الموصل ١- ٨ ايلول ١٩٥٦، گۆڤارا دهۆك، ژمارە(٢٠)،حزيران ٢٠٠٣، بپ ٧٨ ول دووڤدا.

# هێرشا سێ قولی ل سەر مسرێ سالا (١٩٥٦)ێ

وەسفیە مەحەمەد شێخو
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

هەڤسۆزیا مللەتێ کورد دگەل مللەتێ مسری و پشتەڤانی ل داخوازێن وان یێن نشتمانی پشتی شۆرشا ٢٣ تیرمەها (١٩٥٢)ێ دەستپێکریە ئەوا دەسەلاتا شاهینی ل وی وەلاتی هەلوەشاندی و سیستەمێ کۆماری راگەهاندی، و ل دەمێ حکۆمەتا مسری دژی پەیمانا بەغدا سالا (١٩٥٢)ێ راوەستیای ئەوا ئاراستەکری دژی بزاڤا نەتەوییا کوردی ل گشت کوردستانێ. زێدەباری گەفێن ژناڤبرنا ئیمناهیێ و سەربخۆیا گەلان، هەلویستێ کوردان بۆ مسرێ و سەرۆکێ وێ (جەمال عەبدولناسر)ی هاتە پێش ل دەمێ حکۆمەتا مسرێ ل(٢٣) تیرمەهێ خۆمالیبوونا کەنالێ ئاڤێ ئەوێ ب ناڤێ (سویس) راگەهاندی و دئەنجامدا هێرش و دوژمنکاریا سێ قۆلی (بریتانیا و فەرەنسا و ئیسرائیلی) ل (٢٩) چریا ئێکێ ل سالا (١٩٥٦)ێ ل سەر مسرێ دەستپێکری. خۆنیشاندانێن بەرفرەهـ ل عیراقێ هاتنەکرن وەك پشتەڤانی بۆ خۆمالیکرنا کەنالێ سویس و نەرازیبوون و رسواکرنا هێرشا سێ قولێ ل سەر مسرێ، لەوا حکۆمەتا عیراقێ ژ نەچاری خواندنگەهـ و پەیمانگەهـ و کولیژە دائێخستن و بارێ نە ئاسایی (الاحکام العرفية) راگەهاند.

بزاڤا کوردی نەیا دوور بوو ژڤان رووداناـ بەلکو پشکدارییەکا دروست تێدا هەبوویە، دەمێ پارتا شیوعی ل کوردستانێ و پارتا دیموکراتا ئێککرتییا کوردستانا عیراقێ چەندێن خۆنیشادان رێکخستین وەك پشتەڤانی بۆ گەلێ مسرێ، دەسەلاتێ ژمارەکا سەرکردەیێن پارتی دەستەسەرکرن و ژوانا سکرتێرێ لیژنا ناوەندی ئیبراهیم ئەحمەد و عومەر مستەفا و حلمی عەلی شەریف و ب گۆنەهباریا کارکرنێ بۆ پشتەڤانیا مسرێ پێشکێشی جڤات و دادگەهێن (عورفی) کرن، رۆژنامەیا خەبات (رۆژنامەیا پارتی) ل کانوونا ئێکێ سالا (١٩٥٦)ێ گۆتارەك بەلاڤکریە تێدا پشتەڤانیا کوردان بۆ گەلێ مسرێ دژی هێرشا سێ قۆلی دیارکرییە، و د گۆتارێ دا هاتییە کو ب سەرکەفتنا دوژمنێن گەلێ مسرێ دێ مەزنترین زیان گەهیننە کێشا رزگاربوونا کوردستانێ وگەلێ کورد[1].

خەلکێ دەڤەرا بەهدینان ژی بەشداری وان



جەمال عەبدولناسر

خۆنیشادانان بوون ئەوێن ل باژێرێن عیراقی و کوردی هاتینە کرن، ب تایبەت ل مووسل وبەغدا بۆ نموونە: خویندکار ئەحمەد قاسم[٢]، ژ ئامادەیا مەلبەندیا مووسلێ خەلکێ دهۆکێ بوو پشکداری د خۆنیشادانێن وی باژێری دا کر وب وێ هەلکەتێ هەلبەستەك خواند کو دپێشەکیا وێ دا هاتییە:

**اذا قلت حقي قيل انت مجرم**
**بحق البلاط العامر المتصدر**
**ايسكت شعب الرافدين وينطوي**
**وفي النيل شعب يستباد وينحر**
**بني وطني ان الخطوب تفاقمت**
**فثوروا لاسقاط السعيد اليهجر**

ل (٣) کانوونا ئێکێ (١٩٥٦)ێ دهۆکێ خۆنیشادانەکا ب خۆڤە دیت خویندکاران خۆنیشادان رێکخست و خەلکی ژی پشتەڤانی لێ کر.

خۆنیشادان ل رۆژا شەمبی رێکەفتی (٣) کانوونا ئێکێ سالا (١٩٥٦)ێ ژ دوواناوەندیا دهۆکێ(ئامادەیا کاوە یا نها) دەستپێکر، سەرەرای کو رێڤەبەرێ دوواناوەندیێ دەرگەهێن وێ ب فەرمانا دەسەلاتا ناڤخۆیا باژێری گرتن، بەلێ خویندکار (محەمەد تاهر موبارەك) و ب هاریکاریا مامۆستایێ شیۆعی (ئیبراهیم مەجید)ی شیان دەرگەهی وێ ڤەکەن، خۆنیشادان دەرکەت و ل جادێن باژێری گەریان، و گەلەك ژخەلکێ باژێری خۆ دانە دگەل وەك هۆزانڤانی مللی قادر سندۆری، و محەمەد مستەفا محەمەد (محەمەدێ ستیێ)، و ژمارەکا خویندکارێن سەرەتایی، خۆنیشادەرا درۆشمێن پشتەڤانییا مسریێ و رسواکرنا هێرشا سێ قۆلی ل سەر مسرێ بلندکرن، دگەل گازییا هەلوەشاندنا حکۆمەتا (نوری سەعیدی)ی[٣]، بەرچاڤترین بەشداربووین خۆنیشادانی ژ ئەندامێن رێکخستنا پارتا شیۆعی بوون ئەو ژی ئەڤە بوون : محەمەد تاهرموبارەك، رەشید محەمەد مستەفا ئامێدی، محەمەد سالح سویاری، کەمال مەلکو، بەکر عەبدولکەریم و ناجی حەجی حەمید بالەتەی، هەروەسا گەلەك ژ سەربخۆ و نەتەوەخوازێن کورد ژی بەشداری خۆنیشادانێ بوون. ل دووڤدا و ژ ئەنجامێ خۆنیشادانی دەسەلاتێ دەست ب هەوەکا گرتن ودەستەسەرکرنا بەشداربوویێن وێ کر کو ژمارا گرتییان گەهشتە (١٦) خویندکاران ژوانا: محەمەد سالح سویاری، رەشید محەمەد مستەفا ئامێدی و هاتنە رەوانەکرن بۆ دادگەها (عورفي) ل کەرکوکێ، و ژمارەك ژوان هاتنە دادگەهکرن ب زیندانکرنێ بۆ ماوەیێ (٢ - ٣) سالان، هەروەسا دەسەلاتێ (١٣) خویندکارێن ژ دەمێ مایی ژ سالا خواندنێ دەرئێخستن، و هەر کەسەکێ بەشداری یان پشتەڤانی یان ناڤتێدانا خۆنیشادانێ کر بیت ئێخستنە ژێر زێرەڤانییا نهێنی، دیسان هندەك

مامۆستا ژی ژ دووڤچوون و زێرەڤانیێ قورتال نەبوون وەك : ئیبراهیم جەجو یونان، شەفیق پولس، نەبی محەمەد، مەسعود سەعید و ئەحمەد عەبدوللا، و دەسەلاتێ داخوازا ڤەگوهاستنا وان ژ دهۆکێ بو خواندنگەهێن دوور کر.

بەلگەنامێن حکومی، هەر چەند نە هند پشتراستن وێ چەندێ دیار دکەن کو ئەو خەلکی بەشداری و پالپشتیا خۆ نیشاندانێ بووین ئەڤەنە: مستەفا حاجی ئەرگۆشی، محەمەد سالح عەلی رحو، محەمەد سالح موبارەك، عوبەید عەبدولکەریم حەلاق و فازل جادر، و ئەو خویندکارێن رۆلەکێ بەرز درێکخستن و سەرکێشیا خۆنیشادانێ دا هەی بەلگەنامە ناڤێن وان خویندکارێن دووانەوەندیێ دیار دکەن ئەوێن گۆمان ل سەر وان هەی وەك:

١- محەمەد سالح موبارەك
٢- محەمەد سەعید محەمەد
٣- سلێمان عەبدوللا
٤- جەهوەر خالد

| ژ | ناڤێ قوتابی | پۆل و گرۆپ | ناڤ و نیشان |
|---|---|---|---|
| ١ | رەشید حوسەین عەلی | پێنجێ زانستی | دهۆك / گوندێ پێدە |
| ٢ | سلێمان عەبدولا | پێنجێ زانستی | ئامێدیی / بامەرنێ |
| ٣ | مەعسوم ئەنوەر مایی | پێنجێ زانستی | کانی ماسی /گوندی مایێ |
| ٤ | مەنسور عودیشو | پێنجێ زانستی | دهۆك / تاخێ شێلێ |
| ٥ | سەعدەدین سەعید یاسین | پێنجێ زانستی | دهۆك / تاخێ شێلێ |
| ٦ | جەهوەر خالد جەهوەر | پێنجێ ویژەیی | زاخۆ / تاخێ گوندکی |
| ٧ | سەلام محەمەد عومەر | پێنجێ ویژەیی | ئامێدیی / بامەرنێ |
| ٨ | محەمەد سەعید محەمەد | پێنجێ ویژەیی | شێخان / گوندی بریفکا |
| ٩ | محەمەد سالح عەلی موبارەك | پێنجێ ویژەیی | دهۆك / تاخێ شێلێ |
| ١٠ | زەیا هورمز ئنویە | پێنجێ ویژەیی | ئامێدیی / کانی ماسێ |
| ١١ | عەرەفات خانو | سێێ /أ | ئامێدیی / تاخێ سەردەبکێ |
| ١٢ | ناجی مستەفا عەبدولا | سێێ /أ | ئامێدیێ / تاخێ مەیدان |
| ١٣ | میخائیل خۆشابە کرینوماری | سێێ /ب | دهۆك / نەسارا |
| ١٤ | ئیلیا محو قلو | سێێ /ب | شێخان / ئەلقۆش |
| ١٥ | تومە داوود خۆشو | سێێ /ب | دهۆك / تاخێ شێلێ |
| ١٦ | جادر حەمید جادر | سێێ /ب | دهۆك / تاخێ ئیسلام |
| ١٧ | محەمەد سەدیق اوچی | سێێ /ب | دهۆك / تاخێ ئیسلام |
| ١٨ | یونان یونان | سێێ /ب | دهۆك / تاخێ شێلێ |
| ١٩ | محەمەد سادق کندس | سێێ /ج | ئامێدیی / تاخێ سەردەبکێ |
| ٢٠ | عەباس سەید محەمەد یاسین | سێێ/ج | دهۆك / تاخێ ئیسلام[٤]. |

٥- زەیا هورمز

٦- ئیلیا محمو قلو

٧- عورفان خانو

٨- عەباس سەید محەمەد سەید یاسین

٩- فەخری حەمید جادر

١٠- نفیر سەید حەمید

١١- سوهێل نەجم

هەروەسا رێڤەبەریا پۆلیسێن دهۆكێ داخوازكر ئەو خویندكارێن ناڤێن وان ل خوارێ دیاركری بكەڤنە ژێر زێرەڤانیا نهێنیێ، وبێنە رەوانكرن بۆ جڤاتا (عورفی یا لەشكەری) یان بۆ ناڤ رێزێن لەشكەری ئەگەر ب هەركارەكێ نە دجهێ خۆدا یان دژی دەسەلاتێ رابوون:

هەژی گۆتنێ یە كو وەلاتیەكێ خەلكێ دهۆكێ ناڤێ خۆ ئاشكەرا نەكرییە سەبارەت خۆنیشادانێ، نامەك نڤیسییە و هنارتییە وەزارەتا ناڤخۆیی و تێدا هاتییە: ژمارەكا كەسان ل پشت هەلدانا خۆنیشادانێ بوون وەك: رێڤەبەرێ دوواناڤنجیێ جەمیل رەشید ئامێدی و هاریكارێ رێڤەبەریا پۆلیسان، و قائیمقامێ قەزایێ ئەوێ ب ناڤێ شاكر فەتاح ب چاڤێ دلۆڤانی و دلسۆزی بەرێخۆددا خونیشاندانێ، وبەلاڤۆك د ناڤ دوواناڤنجیێ و ژدەرڤە و دیەنجەركان دا دهاتنە بەلاڤەكرن و داخوازا خویندكاران دكر ژبۆ خۆنیشادانێ و درۆشمێن وان گازی بۆ دكر وەك ب هەلوەشێت حكۆمەتا ( نوری سعید)ی و پەیمانا بەغدا و بژیت ئێكگرتنا كورد وعەرەبان، و بژیت جەمال عەبدولناسر و بشكێن داگیركەر، و نڤێسەرێ نامێ ئەڤ خۆنیشادانە ب پیلانەكا پارتا شیۆعی دایە نیاسین وداخواز ژ دەسەلاتێ كر ئەڤ پیلانێن چەپەل بێنە ژ ناڤبرن (بلا بژین ل ژێر سیبەرا هەوە ب ئێمناهی دوور ژ خیانەتكاریێ)[٥].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. الحفو والبوتانی، ژێدرێ بەرێ، بپ ١٠٠-١٠١.

٢. ل دهۆكێ هاتییە سەر دونیایێ و ل مووسلێ مەزن بوویە، ل پەیمانگەها هۆنەرێن جوان یا بەغدا خواندیە، ب مەرەما بەردەوامیدانێ ب خواندنێ چوویە ئێكەتیا سوڤیەتییا جاران، باوەرناما ماستەرێ ل سەر كەڤالێ خۆ (تراجیدیا كەربەلا) وەرگرتییە، بنێرە: عبدالفتاح علی البوتانی، الحیاه الحزبیه في الموصل ٢٠٠٠،بب٤٦٤-٤٦٥، بپ ٤٩٧.

٣. رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ١٤٠-١٤١.

٤. بۆ پتر پێزانینا بەرێ خۆبدە: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن....،بپ٦٢٦- ٦٣٠.

٥. بۆ دیتنا بەلگەنامێن تایبەت ب خونیشاندانێ بەرێ خۆبدە: هەمان ژێدەر، بپ ٦٢٢-٦٣١.

# هەلویستێ دهۆکێ ژ ئێکگرتن وئێکەتییێن عەرەبی

وەسفیە محەمەد شێخو
وەرگێران: موسلح حەمزە

ل ئێکێ شباتا ١٩٥٨ێ هەڤگرتنەك د ناڤبەرا هەردو وەلاتێن سوریا و میسرێ دا هاتەراگەهاندن و د ئەنجامێ وێ هەڤگرتنێدا کۆمارێ عەرەبیێ یەککرتی (الجمهورية العربية المتحدة) هاتەدامەزراندن، خەلکێ کوردستانێ و پارتا وی یا پێشەنگ پارتی دیموکراتی کوردستان پێشوازی ل ڤێ هەڤگرتنێ کر ژبەرکو ئەڤ هەڤگرتنە دژی پەیمانا بەغدا بوو ئەوا ل سالا ١٩٥٥ێ ب مەرەما ژناڤبرنا هەر بزاڤەکا نەتەوەییا کوردی ل عیراقێ و ترکیا و ئیرانێ هاتیەراگەهاندن، ژبەرکو هەڤگرتنا نوو د ناڤبەرا سوریا میسرێ دا مەترسی بوو بۆ سەر دەستەلاتێن شاهینی ل عیراقێ و ئوردنێ لەوما پشتی چەند رۆژەکان هەردویان بلەز هەڤگرتنەکا عەرەبی ب ناڤێ یەکێتییا عەرەبی (هاشمی) د ناڤبەرا عیراقێ و ئوردنێ دا راگەهاندن، ئەو بوو حکومەتا ئەحمەد موختار بابانی ل ١٢ شباتا ١٩٥٨ێ. دەستووری ئێکەتییا عەرەبی یا هاشمی[١]. پێشکێش کر ژبۆ گەنگەشێ و بریاردانێ ل سەر[٢]، ل دووڤدا جڤاتا نوینەران ئەڤ دەستوورە ب پرانییا ئامادەبوویان پەسەندکر کو ژمارا وان (١٤٢) نوینەر بوون وژوانا (١٨) نوینەر ژمووسل بوون[٣]، وەك نوینەرێ زاخۆ(دیدار شەمدین ئاغا) و نوینەرێ ئاکرێ (مەحمود ئاغا زێباری) و نوینەری ئامێدیی (مسلح لدین نەقشەبەندی) و نوینەرێ دهۆکێ (نور محەمەد بریفکانی)[٤].

راگەهاندنا ئێکەتییا عەرەبی نەرازیبوونەکا مللی و گشتی ل سەنتەرێ عیراقێ بخۆڤە گرت ژلی ئەوێن دناڤ تەخا دەسەلاتێ و دووڤەلانکێن وێ دا چونکی ئەو ژلایێ دەزگایێن داگیرکەران ڤە و ب ئاراستەکرنا سیاسەتا پەیمانا بەغدا هاتبوونە پالدان[٥]. سەبارەت کوردان سەرەرای رازیبوونا نوینەرێن دهۆکێ ئەوێن مە ئاماژە ب ناڤێن وان کرین ل سەر پەسەندکرنا دەستووری ئێکەتییا عەرەبی یا هاشمی ئەڤ هەلویستە بتنێ بۆ هندێ بوو تاکو جهێن خۆ یێن پەرلەمانی بپارێزین نە زێدەتر. ئێکەتییا عەرەبی ببوو جهێ مەترسیا کوردێن عیراقێ[٦]، ب تایبەت یا ناڤەندێن نەتەوەیێن کوردان و ببوو جهێ نەرازیبوونا

وان ل زاخۆ، چ ئەندامێن پارتا شیوعی یاعیراقی چ ژی یێن پارتا دیموکراتا کوردستانی کو هەلویستێ وان ژ هەلویستێ پارتێن وان بوویە، شیوعی دژی ئێکەتیا هاشمی بوون ژبەر کو ژ ئارمانجێن ئێکەتیێ گرێدانا ئوردنێ بوو ب پەیمانا بەغدا ڤە و ژبەر کو دبنیات دا پەیمانا بەغدا دژی ئێکەتیا سۆڤیتی بوو لەوا ئەندامێن شیوعی دژی هەر پێنگاڤەکا خراب بەرامبەر ئێکەتیا سۆڤێتی دنەرازیبوون کو رۆژئاڤا پشتەڤانیێ لێ بکەت[7]، هەروەسا پارتا دیموکراتا کوردستان بەیاننامەك دەرکر تێدا نەرازیبۆنا خۆ بەرامبەر ئێکەتیا عیراقی – ئوردنی دیارکر و داخوازا پاراستنا مافێن نەتەوایەتیێن کوردان د ئەڤێ ئێکەتیێ دا کر[8].

دگەل ڤێ چەندێ دەسەلات ل ئامێدیێ شیا ئاهەنگەکا پشتەڤانیێ رێك بێخیت، ئەڤێ ئاهەنگێ دەربرینا هەلویستێ دەسەلاتا ناڤخۆیی دکر، نەدەربرین بۆ ژ راستیا هەلویستێ نەتەوەیێن کورد ل ئامێدیێ[9].

## ژێدەر و پەراوێز:

1. بۆ پتر پێزانینا ل دور ریککەفتنا ئێکەتیا عەرەبی یا هاشمی دناڤبەرا عیراق وئوردنێ دا بەرێ خۆ بدە:جمیل الاورفلي، لمحات من ذكريات وزير عراقي سابق، (بيروت، ١٩٧١)، بپ١٤١-- ١٥٢، جعفر عباس حميدي (الدكتور)، التطورات والاتجاهات السياسية الداخلية في العراق ،بپ ٢٥٩ ول دووڤدا.
2. محاضر مجلس النواب، الدورة الانتخابية السادسة عشرة، الاجتماع غير الاعتيادة لسنة ١٩٥٨، الجلسة(٢)، ١٢ ايار ١٩٥٨،ص ١٢.
3. ئەو ژی ئەڤەبوون: ئیبراهیم ئەلحەمدانی، ئەحمەد عجیل ئەلیاور، تەوفیق المسعانی جەمال موفتی، خزر خدیدە، خەلیل موفتی، عوبدولقادرئەلعانی، محەمەد یونس عەبدوللا، مەحمود زێباری، موسلح نەقشەبەندی، نور مەحمەد بریفکانی، یەحیا قاسم، یوسف رەسام، فەیسەل ئەلدەملوجی متی سەرسەم، مجبل ئەلوەگاع، مەحمەد الجلیلی بەرێ خۆ بدە، محاضرة مجلس النواب، الدورة الانتخابية السادسة عشرة الاجتماع غير الاعتيادي لسنة ١٩٥٨، الجلسة (٤)،١٢ ايار ١٩٥٨، بپ ١٣- ١٤.
4. هەمان ژێدەر.
5. جعفر عباس حميدي (الدكتور)، التطورات والانجاهات السياسية الداخلية في العراق ، ص ٢٦٠-٢٦١.
6. هەمان ژێدەر، عبدالرزاق محمد اسود، موسوعة العراق السياسية (بيروت: ١٩٨٦)،ب٥، بپ ٢٨٩، بۆ پتر پێزانینا ل دۆر هەلویستێ کوردان ژ ئێکەتیا هاشمی بەرێ خۆبدە: غانم محمد الحفو (الدكتور)، وعبدالفتاح البوتاني(الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ بپ١٢٧-١٣١.
7. وصفيه محمد شيخو، ژێدەرێ بەرێ، بپ٢٢١.
8. غانم محمد الحفو (الدكتور) وعبد الفتاح البوتاني (الدكتور)، ژێدەرێ بەرێ ،بپ١٣٠-١٣١.
9. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: رجب جميل حبيب، ژێدەرێ بەرێ، پب٨٤

# نوینەرێن بادینان دجڤاتا نوینەرێن عیراقێ دا (١٩٢٥-١٩٥٨)ێ

د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی

جڤاتا دامەزرێنەرا عیراقی ب ئامادەبوونا شاهـ فەیسەلێ ئێكێ ل (٢٧) ئادارا (١٩٢٤)ێ دەست ب جڤینا كارێ خۆ كر و شاهی گۆتارا دەستپێكرنێ خواند و دویات كر كو ئارمانجا ڤێ جڤاتێ یا پێكهاتییە ژ كۆمەكا كارێن سەرەكی كو پاشەرۆژا عیراقێ تێدا دیار دبیت وەك:

١- پێدڤیاتییا بریاردانێ ل سەر پەیمانا عیراقی - بریتانی یا سالا (١٩٢٢)ێ.

٢- پەسەندكرنا دەستوورێ عیراقی (یاسایا بنیاتی).

٣- دەركرنا یاسا هەلبژارتنا جڤاتا نوینەران.

و نوینەرێن كورد ل دەڤەرا بەهدینان بتنێ دو كەس بوون ئەوژی محەمەد شەمدین ئاغا ژ (زاخۆ) ومحەمەد رەشید تەتەرخان بەرواری ژ (ئامێدیێ) ئەوێ (دەمێ بابەتێ پەسەندكرنا پەیمانا سالا ١٩٢٢ ێ هاتییە بەرچاڤكرن رازیبوون ل سەرنەدای و ژ كۆمبوونێ دەركەتی، هەر چەندە هەموو نوینەرێن مووسلێ رازیبوون ل سەردا. دەستوور هاتە پەسەندكرن سەرەرای نەرازیبوونا كوردان، وحكۆمەتا عیراقی شیا دەسەلاتا خۆ بگەهینتە باشوورێ كوردستانێ (پاشتر كوردستانا عیراقێ)، ل (١٩) تیرمەهێ هێزێن عیراقی ب پشتەڤانییا هێزا ئەسمانییا بریتانی چوونە دناڤ باژێرێ سلێمانیێ. ل كانوونا ئێكێ ل هەمان سال ئالایێ شاهینییا عیراقی ل هەولێرێ و كەركوكێ بلندكرن، هەروەسا جڤات رازی بوو ل سەر یاسا هەلبژارتنا نوینەران، و بریاردان عیراق ل سەر سێ بنكەهێن هەلبژارتنان دابەش ببیت، بەهدینان دگەل بنكەهێ ئێكێ بوو ئەوا مووسل و كەركوك و سلێمانی بخۆ ڤە دگرت، و ل (٢) تەباخێ سالا (١٩٢٤)ێ كارێن جڤاتێ بداویهات، و حكۆمەتێ بریارا ئەنجامدانا هەلبژارتنان ل (١٨) تیرمەهێ سالا (١٩٥٢)ێ دا.

خۆلا ئێكێ یا جڤاتا نوینەران ل (١٦) تیرمەهێ سالا (١٩٢٥)ێ دەستپێكر، و ل (٢٨) كانوونا دووێ ل سالا (١٩٢٨)ێ بداویهات، بەلێ خۆلا داویێ ئانكو یا شازدێ ل گولانا سالا (١٩٥٨)ێ دەستپێكر و ل نەهێ خزیرانێ ب داویهات و كورتترین خۆلا هەلبژارتنان خۆلا (١٤)ێ بوو ئەوا بتنێ ئێك كۆمبوون ل (١٣) تەباخێ ل سالا (١٩٥٤)ێ كری.

د خۆلا ئێکێ دا نوینەرێن بەهدینان سێ کەس بوون:

هیبەتوللا موفتی ژ ئاکرێ، حازم شەمدین ئاغا ژ زاخۆ، نوری بریفکانی ژ دهۆکێ، و ژمارا نوینەرێن مووسل د خۆلا داویێ دا گەهشتنە (٢٠) نوینەران و چوار ژێ ژ بەهدینان بوون ئەوژی ئەڤە بوون: موسلح نەقشەبەندی، حازم شەمدین ئاغا، مەحمود ئاغا زێباری، نور محەمەد بریفکانی، بەلێ ژمارا وان د خۆلا دەهێ دا پێنج نوینەر بوون:

هیبەتوللا موفتی، حاجی شەمدین ئاغا، نور محەمەد بریفکانی، غیاسەدین نەقشەبەندی و سەعید ئاغا دۆسکی.

سێ کەسان نوینەراتییا قەزا ئاکرێ کرن دجڤاتا نوینەرێن عیراقێ دا د ماوەیێ دناڤبەرا (١٩٢٥ ---- ١٩٥٨)ێ ئەو ژی ئەڤە بوون:

هیبەتوللا موفتی و فارس ئاغا زێباری و مەحمود ئاغا زێباری، و ئەڤێن ل خـوارێ دیارکری خۆلێن هەلبژارتنان بوون ئەوێن وان بەشداری تێداکری:

**خۆلێن هیبەتوللا محەمەد سەعید عبدو لرەحمان مفتی بەشداری تێداکری:**

| خۆل | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ١ | ١٦ تیرمەهێ ١٩٢٥---- ٢٨ کانوونا دووێ ١٩٢٨ |
| ٢ | ١٩ گولانێ ١٩٢٨----------- ١ تیرمەهێ ١٩٣٠ |
| ٤ | ٨ ئاداری ١٩٣٣ ----------- ٢٩ نیسانێ ١٩٣٤ |
| ٥ | ٢٩ کانوونا ئێکێ ١٩٣٤-------- ١١ ئاداری ١٩٣٥ |
| ٦ | ٢٢ کانوونا ئێکێ ١٩٣٧ ---- ٢٢ شواتێ ١٩٣٩ |
| ٩ | ١٢ خزیرانێ ١٩٣٩ ---------- ٩ خزیرانێ ١٩٤٣ |
| ١٠ | ٩ چریا ئێکێ ١٩٤٣ --------- ٣١ گولانێ ١٩٤٦ |



هیبەتوللا موفتی ١٨٨٠-١٩٥٥



حازم شەمدین یوسف پاشا شەمدین ئاغا
١٨٩٥ -١٠/١/١٩٥٥

### خولێن فارس محەمەد مستەفا ئاغا زێباری تێدا هاتییە هەلبژارتن:

| خول | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ٧ | ٢٧ شواتێ ١٩٢٧---------- ٢٧ خزیرانی ١٩٣٧ |
| ٨ | ٢٢ کانوونا ئێکێ ١٩٣٧------- ٢٢ شواتا ١٩٣٩ |

### خۆلێن مەحمود محەمەد ئاغا زێباری تێدا هاتییە هەلبژارتن:

| خول | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ١١ | ١٧ ئاداری ١٩٤٧------------- ٢٢ شواتێ ١٩٤٨ |
| ١٢ | ١٢ خزیرانێ ١٩٤٨---------- ٣٠ خزیرانێ ١٩٥٢ |
| ١٣ | ٢٤ کانوونا دووێ ١٩٥٣----- ٢٨ نیسانێ ١٩٥٤ |
| ١٤ | ٢٢تیرمەهێ ١٩٥٤---------- ٣ تەباخێ ١٩٥٤ |
| ١٥ | ١٦ ئەیلوولێ ١٩٥٤----------- ٢٧ ئاداری ١٩٥٨ |
| ١٦ | ١٠ گولانێ ١٩٥٨ ------ ٩ خزیرانێ ١٩٥٨.[1] |

سێ کەسان نوینەراتیبا قەزا ئامێدیێ کرییە دماوەیێ دناڤبەرا (١٩٢٥- ١٩٥٨)ێ و هەر سێ کەس ژئێك مالبات بوون ئەو ژی مالباتا تەکیا بامەرنێ یا نەقشەبەندی بوو، شێخ غیاسەدین بەهائەدین نەقشەبەندی و کورێ وی شێخ عەلی و شێخ موسلح بەهائەدین نەقشەبەندی، ئەڤێن ل خوارێ دیارکری خۆلێن بەشداری تێدا کری.

### خۆلێن شێخ غیاسەدین بەهائەدینی بەشداری تێداکری:

| خول | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ٣ | ٩ گولانێ ١٩٣٠------------ ٥ چریا دووێ ١٩٣٢ |
| ٦ | ٨ تەباخێ ١٩٣٥ ----------- ١٦ نیسانێ ١٩٣٦ |
| ٨ | ٢٣ کانوونا ئێکێ ١٩٣٧ -------- شواتێ ١٩٣٩ |
| ١٠ | ٩ چریا ئێکێ ١٩٤٣ -------- ٣١ گولانێ ١٩٤٦ |

و ل دەمێ شێخ غیاسەدین دمریت کوری وی عەلی ل (٩) چریا ئێکێ سالا(١٩٤٣)ێ جهێ وی دگریت



شێخ نوری مەحەمەد شێخ عەبدولجەبار بریفکانی

و تاکو ل (٣١) گولانێ سالا (١٩٤٦)ێ خۆلا دەهێ ب داوی دهێت. بەلێ ژبەر کو شێخ عەلی دگەل رێکخستنەکا چەپرەودا بەرهەلستکاری حکۆمەتێ کار دکر، حکۆمەتێ ئەو دووبارە نەهەلبژارتە ڤە.

### خۆلێن شێخ موسلح بەهائەدین محەمەد تاهر نەقشەبەندی بەشداری تێداکری:

| خول | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ١١ | ١٧ ئاداری ١٩٤٧------------- ٢٢ شواتێ ١٩٤٨ |
| ١٢ | ٢١ تیرمەهێ ١٩٤٨ ----------٠ تیرمەهێ ١٩٥٢ |
| ١٣ | ٢٤ کانوونا دووێ ١٩٥٣----- ٢٨ نیسانێ ١٩٥٤ |
| ١٤ | ٢٦ تیرمەهێ ١٩٥٤---------- ٣ تەباخێ ١٩٥٤ |
| ١٥ | ١٦ ئەیلوولێ ١٩٥٤---------- ٢٧ ئاداری ١٩٥٨ |
| ١٦ | ١٠ گولانێ ١٩٥٨ ------ ٩ خزیرانێ ١٩٥٨.[2] |



شێخ غیاسەدین نەقشەبەندی

هەروەسا محمد تاهر جەمالەدین نەقشەبەندی ژمالباتا شێخێن بامەرنێ و نوینەرێ مووسل بوو دخۆلا (١٣)ێ دا.

بەلێ نوینەرێن قەزا دهۆكێ د ماوەیێ حوكمێ شاهانی دا: نور محەمەد بریفكانی وسەعید ئاغا دۆسكی و نوری بریفكانی وعوبەیدولا بریفكانی بوون.

**خۆلێن نور محەمەد شێخ محەمەد نوری بریفكانی تێدا هاتییە هەلبژارتن:**

| خۆل | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ١٠ | ٩ چریا ئێكێ ١٩٤٣--------- ٣١ گولانێ ١٩٤٦ |
| ١٣ | ٢٤ كانوونا ئێكێ ١٩٥٣ ----- ٢٨ نیسانێ ١٩٥٤ |
| ١٤ | ٢٦ تیرمەهێ ١٩٥٤ ----------- ٣ تەباخێ ١٩٥٤ |
| ١٥ | ١٦ ئەیلوولێ ١٩٥٤------------ ٢٧ ئاداری ١٩٥٨ |
| ١٦ | ١٠ گولانێ ١٩٥٨------------ ٩ خزیرانێ ١٩٥٨ |

**خۆلێن سەعید ئیسماعیل دێوالی ئاغا دۆسكی تێدا هاتییە هەلبژارتن:**

| خۆل | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ٧ | ٢٧ شواتێ١٩٢٧ ------------ ٢٧ خزیرانێ ١٩٣٧ |
| ١٠ | ٩ چریا ئێكێ ١٩٤٣---------- ٣١ گولانێ ١٩٤٦ |
| ١١ | ١٧ ئاداری ١٩٤٧--------------- ٢٢ شواتێ ١٩٤٨ |

و ل دەمێ سەعید ئاغا ل سەر دەستێ سەلیم مستەفا ئاغا بێسفكی هاتییە كوشتن، كورێ وی دێوالی ئاغا جهێ وی دگریت ئەوێ بەشداری هەردو خۆلێن (١١- ١٢) بووی، هەر ژ (٢٢) شواتێ ١٩٤٨-٣٠ خوزەیرانێ خزیرانێ ١٩٥٢ێ.

**خۆلێن محەمەد نوری شێخ عەبدولجەبار بریفكانی بەشداری تێدا كری:**

| خۆل | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ١ | ١٦ تیرمەهێ ١٩٢٥------٢٨ كانوونا دووێ ١٩٢٨ |
| ٤ | ٨ ئاداری ١٩٣٣ -------------٢٩ نیسانێ ١٩٣٤ |

**خۆلێن عوبەیدوللا نور محەمەد عەبدولقادر بریفكانی بەشداری تێدا كری:**

| خۆل | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ٢ | ١٩ گولانێ ١٩٢٨-------- ١ تیرمەهێ ١٩٣٠ |
| ٣ | ٩ گولانێ ١٩٣٠-------- ٥ چریا دووێ ١٩٣٢ |
| ٦ | ٨ تەباخێ ١٩٣٥-------- ١٦ نیسانێ ١٩٣٦ |
| ٩ | ١٢ خزیرانێ ١٩٣٩-------- ٩خزیرانێ ١٩٤٣ |

بەلێ نوینەرێ قەزا شێخان عەبدوللا ئیبراهیم عومەر شەرەفانی بوو ل هەردو خۆلێن (١٢ — ١٣) دماوەیێ دناڤبەرا (٢١ تیرمەهێ ١٩٤٨-٣٠ تیرمەهێ ١٩٥٢) ێ و (٢٤ كانوونا دووێ ١٩٥٣ - ٢٨ نیسانێ ١٩٥٤) ێ، و نوینەراتییا كوردێن ئێزدی خدر خودیدە ژ



شێخ عەلی غیاسەدین

قەزا شنگالێ د هەردو خۆلێن (١٣- ١٦) دا.

نوینەراتیا قەزا زاخۆ دجڤاتا نوینەرێن عیراقێ دا دماوەیێ دناڤبەرا (١٩٢٥- ١٩٥٨) ێ سێ کەس بوون ژئێك مالبات ئەو ژی: حازم شەمدین ئاغا و حاجی شەمدین ئاغا و دیدار حازم شەمدین ئاغا. و ئەڤێن ل خوارێ دیارکری خۆلێن بەشداری تێدا کرین:

**خۆلێن حازم شەمدین یوسف پاشا شەمدین ئاغا:**

| خول | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ١ | ١٦ تیرمەهێ ١٩٢٥---- ٢٨ کانوونا دووێ ١٩٢٨ |
| ٢ | ١٩ گولانێ ١٩٢٨----------- ١ تیرمەهێ ١٩٣٠ |
| ٥ | ٢٩ کانوونا ئێکێ ١٩٣٤------- ١١ ئاداری ١٩٣٥ |
| ٦ | ٨ تەباخێ ١٩٣٥ ---------- ١٦ نیسانێ ١٩٣٦ |
| ٧ | ٢٧ شواتێ ١٩٣٧ --------- ٢٧ خزیرانێ ١٩٣٧ |
| ٩ | ١٢ خزیرانێ ١٩٣٩------------٩خزیرانێ ١٩٤٣ |

هەروەسا حازم شەمدین هاتە دامەزراندن وەك ئەندام دجڤاتا ریهسپیان (الاعیان) دا دماوەیێ دناڤبەرا (١٩٤٦- ١٩٥٤).

**خۆلێن حاجی محەمەد حاجی شەمدین ئاغای بەشداری تێدارکری:**

| خول | ماوەیێ وێ |
|---|---|
| ١٠ | ٩ چریا ئێکێ ١٩٤٣------ ٣١ گولانێ ١٩٤٦ |
| ١١ | ١٧ ئاداری ١٩٤٧------ ٢٢ شواتێ ١٩٤٨ |
| ١٢ | ١٢ خزیرانێ ١٩٤٨------ ٣٠خزیرانێ ١٩٥٢ |
| ١٣ | ٢٤ کانوونا دووێ ١٩٥٢----- ٢٨ نیسانێ ١٩٥٤ |
| ١٤ | ٢٦ تیرمەهێ ١٩٥٤------ ٣ تەباخێ ١٩٥٤ |
| ١٥ | ١٦ ئەیلوولێ ١٩٥٤------ ٢٧ ئاداری ١٩٥٨ |



سەعید ئیسماعیل دیوالی ئاغا دۆسکی



**دیوالی سەعید ئاغا دۆسکی**

بەلێ دیدار حازم شەمدین ئاغا د خۆلا (١٦) و یا داویێ دا هاتە هەلبژارتن و (٦) کۆمبوونێن ئاسایی هاتبوونەکرن ژ ١٠ گولانێ ١٩٥٨-- ٩خزیرانێ ١٩٥٨ێ، وپێدڤی بوو جڤات کۆمبوونێن خۆ ل کانوونا ئێکێ (١٩٥٨)ێ دەستپێبکەت، بەلێ روودانا شۆرشا ١٤ تیرمەهێ رێك نەدا و ژیانا نوینەراتیێ ل سەردەمێ شاهانی بداویهات.

ژ ناڤێن نوینەرێن بەهدینان و هەلویستێ وان یێ جڤاکی و ئابووری دیاردبیت کو رۆلێ هۆزایەتی کارتێکرنا خۆ بۆ چوونا ناڤ پەرلەمانی هەبوویە، چ ب هەلبژارتن بیت یان ژی ب پەسەندێ، زۆربەی وان ئەگەر هەمی ژی نەبن ژ سەرۆك هۆز وشێخێن رێبازێن ئایینی بووینە، سەرەرای کو وان چ رۆل نەبوویە د خزمەتا کێشا کوردی و خەلکێ دەڤەرێ دا، چونکی ئەو ژلایێ نوینەرێن مووسل ڤە دهاتنە ب رێڤەبرن و فەرمانێن وان بجهـ دئینان بەری و ل دەمێ گرێدانا کۆمبوونا. و کەسەك نەبوویە رکابەریێ دگەل وان بکەت یان ژی بەرامبەر هەلبژارتنا وان خۆ نەرازی کەت. و سەرکەفتنا وان زۆربەی جاران ب رێکا پەسەندکرنێ دچوونە دناڤ پەرلەمانی دا و بۆ چەندین خۆلا. بۆ نموونە (شێخ مسلح) نەقشەبەندی د چەند خۆلا دا ببوو نوینەرێ قەزا ئامێدیێ ب رێکا پەسەندکرنێ وب هێجەتا وێ چەندێ کو چ بەرێزێن دی نەبووینە، ب راستی دەسەلاتێ پشتەڤانی ل وان دکر تاکو حۆکمرانییا خۆ پتر خۆجهـ بکەن[٣]

ل هەلبژارتنێن ٩خزیرانێ سالا ١٩٥٤ێ ئەوا ب هەڤرکی دناڤبەرا بەرێزێن بەرەیا نشتیمانی یا (بەرهەلستکار)[٤]، و بەرێزێن دەسەلاتێ، کەسەك ل بەهدینان نە دوێریا ژ بۆ هەڤرکیێ دگەل بەرێزێن



**عوبەیدوللا نور محەمەد عەبدولقادر بریفکانی**
**١٩٨٣ وەغەرا داویێ کریە**

دەسەلاتێ یێن بەردەوام خۆ بەربژێر بكەت. بۆ زانین هەمی بەربژێرین بەرەی نشتیمانی ل مووسل سەركەفتن ئینان، ئەوژی ئەڤە بوون: عەبدولجەبار جومرد، زەنون ئەیوب، محەمەد سەدیق شەنشەل، محەمەد حەدید[٥].

پارتا دیموكراتا كوردستان پشتەڤانی ل بەربژێرێن بەرەی نشتیمانی د هەلبژارتنێن خزیرانا سالا ١٩٥٤ێ دا كرن، بەربژێرێ پارتی (مەسعود محەمەد) ل كۆیێ شیا سەركەفتنێ دهەلبژارتناندا بینیت. هەروەسا پارتا شیوعی ژی ب رێكخستنێن خۆڤە ل بەهدینان پشتەڤانی لێ كرن. ژ ئەگەرێ سەركەفتنا دەهـ كەسێن بەرهەلستكار (معارض) بۆ دەسەلاتێ، حكۆمەتێ ئەو جڤاتا هەلبژارتی پشتی گرێدانا كۆمبوونا ئێكێ ل ٣ تەباخا سالا ١٩٥٤ێ هەلوەشاند و ژیێ وێ بتنێ هەشت رۆژ بوون. هەلبژارتنێن نوی ل ئەیلوولا سالا ١٩٥٤ێ هاتنە كرن و تێدا هەمی بەربژێرێن دەسەلاتێ سەركەفتن ئینان، یێن بەهدینان ئەڤە بوون: نور محەمەد بریفكانی، مەحمود ئاغا زێباری، شێخ مسلح نەقشەبەندی، حاجی شەمدین ئاغا.



حاجی محەمەد حاجی شەمدین

## ژێدەر و پەراوێز:

١- بۆ پتر پێزانینا بەرێ خۆبدە: رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٤.
٢- جمبد شكری، ژێدەرێ بەرێ، بپ١٨٤- ١٨٥.
٣- رجب جمیل حبیب، ژێدەرێ بەرێ، بپ٥٦- ٥٩.
٤- عبدالفتاح علي البوتاني((نواب بادینان (البرلمان) العراقي ١٩٢٥ – ١٩٥٨)) گۆڤارا دهۆك، ژمارە(١٥) دهۆك كانوونا ئێكێ ٢٠٠١، بپ ٩٥ – ١٠٠، وبەرێ خۆبدە كورتییا ژیانناما هەمی نوینەرێن بادینان ل هەمان ژێدەر، رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ٥٩- ٦٠.
٥- ئەڤ بەرەیە ل ١٢ گۆلانی سالا ١٩٥٤ ژ چەند پارتەكێن ئاشكەرا یێن دەستووردای وقەدەغەكری هاتە پێكئینان ژبۆ بەشداریێ د هەلبژارتنێن نوینەراتیێ و (١٠) ژ بەربژێرێن وان ل سەرانسەری عیراقێ سەركەفتن ئینان.
٦- عبدالفتاح علي البوتاني، الحیاة الحزبیة...، بپ ٤١٤- ٤١٩.

# وەرارێن سیاسی یێن ناڤخۆیی ل عیراقێ و کوردستانێ و کاریگەرییێن وان ل سەر بادینان (١٩٥٨/٧/١٤ – ١٩٧٠/٣/١١)

# وەرارێن سیاسی یێن ناڤخۆیی ل عیراقێ و کوردستانێ و کاریگەرییێن وان ل سەر بادینان (١٤ی تیرمەها ١٩٥٨ - ٨ی شباتا ١٩٦٣ێ)

پ.د. عەبدولفەتاح عەلی بۆتانی
زانکۆیا دهوک - کولیژا زانستێن مرۆڤایەتی
وەرگێران: موسەدەق تۆڤی - سالح یوسف سۆفی

## رێخۆشکرن:

رژێما شاهینی ل عیراقێ ل سەر سێ ستوونێن سەرەکی هاتبوو دانان کو ئەو ژی ئەڤە بوون: کۆنترۆلا بریتانی، دەرەبەگی و بورجوازییا نوو و ڤان هەر سێ هێزان بەرژەوەندیێن هەڤپشك د گەل ئێك هەبوون و ژ لایێ وێ رژێمێ ڤە دهاتنە پاراستن و نەدهێلا چو گوهورین بێنەکرن کاریگەرییەکێ لێ بکەن، ژ بەر هندێ ئەو رژێم نەدشیا دەولەتەکا نوو دامەزرینیت و وەلات ژ لایێ سیاسی ڤە بنەجهـ نەبیت، هەر بۆ نموونە، ب درێژیا سەردەمێ رژێما شاهینییا ژ رۆژا ٢٣ی تەباخا سالا ١٩٢١ێ هەتا رۆژا ١٤ی تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ بەردەوام بووی، ٥٩ وەزارەت و ١٦ جڤاتێن نوونەران هاتبوونە پێکئینان و تنێ ئێك ژ وان دەمێ خۆیێ یاسایی (چوار سال) تمام کربوون و ١٦ جاران حوکمێن سەربازی هاتبوونە راگەهاندن[1].

پشتی شۆرشا گەیلانی (شۆرشا مایس) یا سالا ١٩٤١ێ، حکومەتا عیراقێ سەرکوتکرن و سێدارەدان دژی ئۆپۆزسیۆنێ ب کارئینا، هەروەسا زنجیرەڤانییەکا دژوار دانا سەر خواندنگەهـ و رۆژنامە و پەرتووکان و هەر ژ سالا ١٩٥٤ێ هەتا سالا ١٩٥٨ێ ئەڤ رێکارە زێدەبوون هەتا گەهشتییە وی راددەی پارتێن سیاسی ژ ئەنجامدانا هەر گوهورینەکێ بێ هیڤی ببن، هەروەسا بەرامبەری لاوازییا ئۆپۆزسیۆنا مەدەنی بۆ گەهشتنا دەستەلاتێ یان گوهورینا وێ، لایەنێ سەربازی دەست ب لڤینان کر، بەرهەمێ ڤان لڤینان ژی شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ و نەمانا رژێما شاهینی بوو.

شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ بەرهەمێ هاریکارییا ل ناڤبەرا بەرەیێ ئێکەتییا نیشتمانی (جبهة الاتحاد الوطني) بوو کو ئەڤ بەرەیە ل سالا ١٩٥٧ێ ژ چوار پارتێن: پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ (الحزب الشيوعي العراقي)، پارتا نیشتمانییا دیمۆکراتی (الحزب الوطني الديموقراطي)، پارتا خۆسەرییا عیراقی (حزب الاستقلال العراقي) و پارتا بەعسا عەرەبی یا سۆشیالست (حزب البعث العربي الاشتراكي)

هاتبوو پێكئینان، هەرچەندە پارتا دیمۆكراتیيا كوردستانێ یا ئێكگرتی - عیراق ژ بەر رێگرییێن هەردوو پارتێن خۆسەری و بەعس نەچووبوو د ناڤ ڤی بەرەی دا، لێ چالاكی تێدا هەبوون ئەڤە ژی ب رێیا وان پەیوەندیێن باش یێن دگەل پارتا كۆمۆنیستا عیراقێ و رێكخستنا ئەفسەرێن ئازادیخواز هەبین كو ئەڤا داویێ ل ئادارا سالا ١٩٥٧ێ هاتبوو پێك ئینان و رێبەر (راگر - عەمید) روكن عەبدولكەریم قاسم سەرۆكاتیيا وێ دكر[٢].

دەستەلاتا شاهینی بەردەوام بوو ل سەر سەركوتكرنا كوردان و رێز ل تایبەتمەندی و هیڤیێن وان یێن نەتەوەیی نەدگرت و عەرەبكرنا كوردستانێ ژی هێدی هێدی و بێ ئالۆزی ب رێڤە دچوو، وی سەردەمی لەشكەرێ عیراقێ بەردەوام دژی كوردان دهاتە ب كارئینان و ئێكەمین جار ژی لەشكەر د ڤی بیاڤێ دژی كورداندا دا هاتییە ب كارئینان ل نیڤا سالا ١٩٢١ێ بوو، وی لەشكەری بزاڤێن: شێخ مەحمودێ حەفیدێ بەرزنجی، شێخ ئەحمەدێ بارزانی و مەلا مستەفا بارزانی ل سالا ١٩٤٥ێ سەركوتكرن و حوكمێ سێدارەدانێ دانا سەر یێ داویێ و پشتی كەڤتنا كۆمارێ كوردستانێ یا بازێرێ مەهاباد پایتەختێ وێ بوو نەهێلا ڤەگەرێتە عیراقێ، ژ بەر هندێ، نەچار بوو ل هەیڤا خزیرانا سالا ١٩٤٧ێ خۆڤەكێشیت و پەنایێ ببەتە بەر ئێكەتیيا سۆڤیەتا بەرێ.

هەوا حكۆمەتێ دژی بزاڤا نیشتمانیيا كوردی گەهشتە كوپیتكێ دەمێ ل گولانا ١٩٤٧ێ حوكمێ سێدارەدانێ دانایە سەر شێخ ئەحمەد بارزانی و پاشتر ئەڤ حوكمە كریە زیندان و هێلایە د زیندانێڤە هەتا هەلبوونا شۆرشا ١٤ی تیرمەها ١٩٥٨ێ ل زیندانێ مای و دەمێ ل رۆژا ١٩ خزیرانا سالا ١٩٤٧ێ هەر چوار ئەفسەرێن ئازادیخوازێن كورد سێدارە داین كو ل سالا ١٩٤٥ێ گەهشتبوونە بارزانی و دگەل وی پەنابربوونە كوردستانا ئیرانێ و پاشی خۆرادەستی حكۆمەتا عیراقێ كربوون پشتی كۆمارا كوردستان ل رۆژا ٢٢ی كانوونا ئێكێ یا سالا ١٩٤٦ێ كەڤتی كو ئەو ئەفسەر ژی ئەڤە بوون: عزەت



شێخ ئەحمەد بارزانی

عەبدلعەزیز ئامێدی، محەمەد مەحمود قودسی، خەیرولا عەبدولكریم و مستەفا خۆشناو.

ژ لایێ ئابووری ڤە ژی، پتریيا گەلێ كوردستانێ ل عیراقێ د هەژاری و نەدارییەكا دژوار دا دژیا و ژیارا پتریيا وان ل سەر چاندن و خودانكرنا تەرش و كەوالی بوو و گەلەك ژ وان وەك كرێكار ل بازێران كار دكرن، كێم ژ وان فەرمانبەر بوون و گەلەك كێم دا بینی ئەندامێ خێزانەكێ فەرمانبەر بیت، هەر بۆ نموونە، ل دهۆكێ كو سەنتەر بوو، تنێ هژمارەكا دام و دەزگەهان و سێ خواندنگەهێن دەستپێكی و خواندنگەهەكا دواناوەندی و بنكەهەكێ ساخلەمیێ(مستوصف) و بنكەهەكێ پۆلیسان هەبوون و رێژەیا كوردان تێدا ژ ٥٪ێ نەدبۆری، لێ رێژا دی عەرەبێن مووسل و بازێرێن دی بوون، ئەڤە هەمی ژ بەر بەلاڤبوونا نەخویندەوارییێ و نەبوونا خواندنگەهێن پێدڤی[٣].

رژێما شاهینی ب دلێ پتریيا عیراقییان نەبوو،

گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ ئەو پشتەڤانییا بێ وێنەیا مللی بوو یا بۆ شۆرشا ١٤ێ تیرمەهێ هاتییە کرن و ئەو خۆشحالی بوو یا سەرانسەری دەڤەرێن عیراقێ ڤەگرتی دەمێ ئەو رژێم کەفتی و مەزنە بەرپرسێن وێ هاتینە کوشتن و کورد دلخۆش بوون ب شۆرشێ و پشتەڤانی لێ کرن، هەر بۆ نموونە، هەر ل رۆژا ئێکێ ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێرێ پارتا دیمۆکراتا کوردستانێ(پارتی) برۆسکەیەك بۆ سەرکردایەتییا شۆرشێ هنارت و تێدا پشتەڤانییا پارتێ بۆ شۆرشێ دووپات کر و هیڤی خواست کۆمارا نوو ببیتە دەستپێکرنا سەردەمەکێ نوو بۆ ئاڤاکرنا ئاڤاهیێ پەیوەندییێن عەرەبی ــ کوردی، پشتی وێ برۆسکێ ژی پارتێ بەیانەك ئاراستەی گەلێ کورد کر و تێدا هاتبوو: (حزبێ بریاردا هەمی شیان و هێزێن خۆ بێخیتە بەر دەستێ سەرکردایەتییا شۆرشێ، ئەندام و تاگرێن خۆ وەك فیداکار بۆ کۆمارێ ب کار بینیت)، هەروەسا مەلا مستەفا بارزانی سەرۆکێ پارتێ ل مەنفایا خۆ ل ئێکەتییا سۆڤیەتا بەرێ، برۆسکەیەکا پشتەڤانیێ بۆ عەبدولکریم قاسمێ سەرۆکێ شۆرشێ هنارت و داخواز ژێ کر رێ بدەتێ ڤەگەرێتە عیراقێ.

هەلویستێ شۆرشێ بەرامبەری کوردان و هیڤیێن وان یێن نەتەوەیی هەلویستەکێ ئەرێنی بوو، هەر بۆ نموونە، حکۆمەتا کابینا ئێکێ یا وەزیران کوردەکێ ناڤدار تێدا بوو ب ناڤێ بابا عەلی شێخ مەحمود بەرزنجی، هەروەسا عەقید خالد نەقشبەندی بامەرنی ئەندامێ جڤاتا سەروەریێ بوو کو ئەڤ جڤاتە وەکی سەرۆکاتییا کۆمارێ بوو، هەروەسا فەرمانا ئازادکرنا زیندانییێن سیاسییێن کورد هاتە دان، ژ وانا: شێخ ئەحمەد بارزانی، هۆزانڤانێ ناڤدار عەبدوللا گۆران، دەستووریێ بەروەخت ژی یێ ل رۆژا ٢٧ی تیرمەها سالا ١٩٥٨ێ دەرکەفتی، کورد و عەرەب وەك هەڤپشکێن وەلاتی ل قەلەمدابوون (ماددێ ٣).

هەروەسا حکۆمەتا شۆرشێ، سەرباری نەرازیبوونا وەزیرێ ناڤخۆ عەقید روکن عەبدولسەلام محەمەد عارف و نەتەوەپەرێسێن دی یێن عەرەب، داخواز ژ



عەبدولکەریم قاسم

بارزانی کر ڤەگەرێتە عیراقێ، ئینا ل رۆژا شەشی چریا ئێکێ یا سالا ١٩٥٨ێ گەهشتە بەغدا و وەك قارەمانەکێ نەتەوەیی پەسنێ وی هاتە کرن و ل رۆژا ٧ی وێ هەیڤێ عەبدولکەریم قاسمی پێشوازییەکا دۆستانە لێ کر، هەروەسا بارزانی ژی دلسۆزییا خۆ بۆ رژێما نوو دەربری و هەردوولا پشتراست کرن کو گەهشتینە تێکگەهشتنەکێ ل سەر کاروبارێن پەیوەندی ب هاریکارییا ل ناڤبەرا عەرەب و کوردان ڤە هەین، کو پاشی ڤێ چەندێ رەنگڤەدانا خۆ ل سەر هژمارەکا رێکارێن حکومی هەبوو، ژ وانا: دەستووردانا رۆژنامەڤانییا کوردی و ئێکەمین هژمارا رۆژنامەیا خەبات (النضال) زمانحالێ (پارتی) ب ئاشکەرایی ل رۆژا ٤ی نیسانا سالا ١٩٥٩ێ دەرکەفت و هاتە پێشنیازکرن رێڤەبەرییا (مەعارف) یا کوردستانێ ل وەزارەتا مەعارف (کو نوکە دبێژنێ وەزارەتا پەروەردێ)

بێته دانان، هەروەسا رۆژا ٩ی شواتا سالا ١٩٦٠ێ ژی وەزارەتا ناڤخۆ مۆلەت دا (پارتی).

بەرامبەری ڤێ ژی (پارتی) پشتەڤانییا حكۆمەتا شۆرشێ كر دژی بەرهنگارێن وێ، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ٨ێ ئادارا سالا ١٩٥٩ێ پشكداری د ژ ناڤبرنا بزاڤا كودەتایا عەقید روكن عەبدلوەهاب شەواف دا كر ل باژێرێ مووسل، ل گولانا ١٩٥٩ێ ژی پشكداری د ژناڤبرنا بزاڤا شێخ رەشیدێ لولان دا كر ل دەڤەرا برادۆست، هەروەسا ل سەر داخوازیا عەبدولكەریم قاسمی رازی بوو رێكخراوێن خۆیێن لاوان و پیشەیی هەلوەشینیت و تێكەلی رێكخراوێن پارتا كۆمۆنیستا عیراقێ بكەت كو حكۆمەتێ مۆلەت دابوویێ.

## ئێك: شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ

دشیاندا نینە ل سەر وەرارا رەوشا سیاسی ل دەڤەرا بادینان ل هەردوو سەردەمێن شاهینی و كۆماری ل عیراقێ بێته نڤیسین هەكە رێ بۆ بابەتێ نڤیسینێ ل سەر وەرارێن سیاسی یێن باژێرێ مووسل و رەخ ورووبێن وێ نەهێته ڤەكرن، چونكی دەڤەرا بادینان كو ژ قەزایێن ئاكرێ و شێخان و ئامێدیێ و دهۆك و زاخۆ و دەڤەرێن دی یێن رۆژهەلاتێ رووبارێ دیجلە پێك هاتبوو ژ لایێ كارگێری ڤە سەر ب لیوا (پارێزگەها) مووسلێ بوو، هەروەسا هەتا پشتی دهۆك بوویە سەنتەرێ پارێزگەهێ ژی ل رۆژا ٢٧ی گولانا ١٩٦٩ێ، هەردو قەزایێن ئاكرێ و شێخان و پارچێن دی یێن بادینان هێلانە سەر ب مووسل ڤە بەرۆڤاژی حەزوڤیانا خەلكێ وان دەڤەران، هەروەسا ژ بەركو كورد هێشتا پتریا خەلكێ پارێزگەها مووسل بوون، ئەو باژێر هەر ژ شەرێ جیهانیێ ئێكێ هەتا دەستپێكا سالێن حەفتێ یێن سەدسالا بۆری ببوو سەنتەرێ چالاكیێن سیاسیێن نیشتمانپەروەرێن كوردێن دەڤەرا بادینان، هەر ل وی باژێری رێكخراوێن سیاسی یێن كوردی و عیراقی دهاتنە رێڤەبرن و ئاراستەكرن، ژ وانا چالاكیێن هەردو پارتێن كۆمۆنیستا عیراقێ و پارتا دیمۆكراتا كوردستانێ ل بادینان.

ژ بەر هندێ، پێدڤییە ل پێشیێ ل سەر وەرارا رەوشا سیاسی ل مووسل پشتی هەلبوونا شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ بێته نڤیسین، چونكی وێ رەوشێ كاریگەری و رەنگڤەدانا خۆیا ئەرێنی یان نەرێنی ل سەر ژیان و رەوش و وەرارا سیاسی ل بادینان هەبوو.

سپێدەیا رۆژا دووشەمبی رێكەڤتی ١٤ێ تیرمەها ١٩٥٨ێ ئەندامێن لیژنا بەرەیێ ئێكەتییا نیشتمانی ل مووسل بەیانا ئێكێ یا شۆرشێ ژ ئیزگەیێ بەغدا بهیستن، هۆسا دەمێ خەلكی دەنگ و باسێ هەلبوونا شۆرشێ و كەڤتنا رژێما شاهینی و راگەهاندنا رژێما كۆماری بهیستی، ئێكسەر و هەر ئێك ژ لایێ خۆڤە رژیانە سەر رێك و رێبار و جاددان و رێكخراوێن سیاسی ژی ل ناڤ باژێری دەست ب خۆرێكخستنێ كرن و خۆ بۆ كار وچالاكیێن ئەشكەرا ئامادە كرن، ژ بلی پارتا رزگارییا ئیسلامی (حزب التحرير الاسلامي)، هەمی پارتێن دی پشكداری د خۆنیشاندانێن پشتەڤانییا شۆرشێ دا كرن، لێ كاریگەرییا كارلێكەر یا رێكخستنا پارتا كۆمۆنیستا عیراقی و نەتەوەپەروەرێن عەرەب و پشتەڤانێن سەرۆكێ مسرێ جەمال عەبدلناسر بوو. هەروەسا ژ رۆژا ئێكێ یا شۆرشێ، دو ئاراستەیێن سیاسی یێن ژێكجودا ل مووسل دیار بوون و هەر ئێك ژ وان هزر و ئاراستە و درووشمێن خۆیێن تایبەت هەبوون، ئاراستەیێ ئێكێ یێ نەتەوەیی ل بن پەردا ئایینی و ئەو ژی هێزێن نەتەوەپەروەرێن عەرەبی و ئایینی بوون یێن ژ دل كار دكرن ب زووترین دەم ئێككرتنێ دگەل كۆمارا عەرەبی یا ئێككرتی (مسر + سوریا) بكەن، خودانێن ڤی ئاراستەی ژی حزبا بەعس و بزاڤا نەتەوەپەروەرێن عەرەب و هەتا رادەیەكێ برایێن مووسلمان (اخوان المسلمين) ژی بوون، لێ ئاراستەیێ دووێ، رەوتێ دیمۆكراتی و پارتا دیمۆكراتا كوردستانێ و پارتا ئێكەتییا دیمۆكراتی و پارتا كۆمۆنیستا عیراقی بوون و ڤی ئاراستەی درووشمێ كاركرن سەخمەراتی ئێككرتنێ بۆ ئێكەتییا فیدرالی دگەل كۆمارا عەرەبییا ئێككرتی بلند كر، ب ڤی ئاوایی، هەڤركی و ڤێكنەكرنێن بەردەوام ل ناڤبەرا هەردو ئاراستەیان پەیدا بوون و ل سەر ئارمانجێن هەڤپشك رێك



خەسرەو تەوفیق

نەکەڤتن[٤]، هندەك جاران ئەڤ ڤێکنەکرنە ڤاژی دبوو سەر رەوشا سیاسی یا دەڤەرا بادینان.

ل دەستپێکا شۆڕشا ١٤ ی تیرمەهێ، سەرکردایەتیا رێکخستنا (پارتی) ل مووسل کو ژ لایێ رێکخراوێن پارتی ڤە ل بادینان دهاتە برێڤەبرن، پێکدهات ژ: خەسرەو تەوفیق (بەرپرس)، ئیبراهیم خەلیل ئاکرەیی، ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی، خالد حەسەن یوسفي، سەعید عەبدوللا حەللاق و نوری خەلیل ئیبراهیم (ئەندام)، وێ رێکخراوێ، نەخاسمە ژی بەرپرسێ وێ خەسرەو تەوفیق و سالح روشدی (وێنە)چالاکیێن دیار و بەرچاڤ هەبوون. ئەندام و جەماوەرێ رێکخراوێ پشکداری د وان خۆنیشاندانێن پشتەڤانیکرنا شۆڕشێ دا کرن کو ل هەردوو هەیڤێن تیرمەه و تەباخا سالا ١٩٥٨ێ ژ لایێ هێزێن نەتەوەیی یێن نیشتمانی ڤە هاتبوونە رێکخستن، هەروەسا ئەو رێکخراو شیا جەماوەرێ کوردی و عەرەبی خرڤە بکەت بۆ پێشوازیکرنا شێخ ئەحمەد بارزانی کو ل رۆژا ٢١ێ تیرمەها ١٩٥٨ێ ژ زیندانێ هاتبوو ئازادکرن و ل دەستپێکا تەباخا سالا ١٩٥٨ێ سەرەدانا مووسل کربوو و ببوو مێڤانێ خێزانا عەباوی (ال توحله)، رێکخراوێ ژی ل مالا نوری شاوەیس مێڤانداریا وی کربوو کو وی دەمی ئەندازیار بوو ل رێڤەبەریا ئەشغالێن مووسل، هەروەسا شێخ ژ لایێ شاندێ کوردی ڤە هاتە پێشوازی کرن کو ژ ئاکرێ و زاخۆ و ئامێدیێ و شێخان هاتبوون.

هەروەسا دەمێ شێخی سەرەدانا عەبدولکافي عارفي موتەسەرفێ مووسل کری، خەلك ل وێرێ خرڤەبوو و خەسرەو تەوفیق و سالح روشدی بۆ خرڤەبوویان ئاخڤتن و درووشم گۆتن، ژ وانا: (هەر بژیت هەڤالینیا عیراقی - سۆڤیەتی، پشتەڤانیا ئێکەتیا فیدرالی دگەل کۆمارا عەرەبیا ئێکگرتی دکەین، هەر بژیت ئاشتیا جیهانی، هەر بژیت



ئیبراهیم خەلیل ئاکرەیی ١٩٣٣- ١٩٩٤/٥/٥



عەقید روکن عەبدولسەلام محەمەد عارف

مەلا مستەفا بارزانی)، هەروەسا هندەکێن دی ژی درووشم ب سەرکردێن شۆڕشێ و کۆمارا عیراقێ گۆتن، کۆمۆنیستێن بەرنیاس ژی ل بازێری هاتنە ناڤ خرڤەبوویان و خەلکێ خرڤەبووی هاندا رێپێڤانەکا وەکی خۆنیشادانێ بکەن و وێ خۆنیشادانێ پتریا جاددەیێن سەرەکی یێن مووسل ڤەگرت و درووشم بۆ ئێکەتیا کوردی - عەرەبی و هەڤالینیا سۆڤیەتی دگۆتن.

هەروەسا بەری شێخ ل رۆژا ١٣ی تەباخا سالا ١٩٥٨ ێ ب هەڤالینیا کوردۆ باویل ئاغا و عەبدلوەهاب ئاغایێ رەواندزی و شەوکەت ئاغایێ زێباری و هندەك کەسایەتیێن کورد ژ مووسل دەربکەڤیت، پەیڤەك پێشکێشی جەماوەرێ کورد و عەرەب کر و پشتەڤانیا خۆ بۆ کۆمارا عیراقێ و ئێکەتیا عەرەبی ـ کوردی دەربری، ئامادەبوویان ژی دەست بۆ قوتان و درووشم ب سەکردێن شۆڕشێ و مەلا مستەفا بارزنی و جەمال عەبدلناسر گۆتن[٥].

ل دەستپێکا شۆڕشێ، پارتی و جەماوەرێ وێ ل چایخانا تاگرەکێ پارتی ل تاخێ نەینەوا کۆم دبوون کو ئەو چایخانە نێزیکی مزگەفتا (نەبی یونس) بوو، رێکخستیا پارتی ئەندامێ خۆ نوری خەلیل هنارتە فەرمانداریا (امریە) بنگەهێ مووسل و داخواز ژێ کر سەرەدانا بارەگەهێ وان ل چایخانا ناڤبری بکەن، ئینا ئەفسەرەکێ وی بنگەهی سەرەدانا بارەگەهی کر و ب گەرمی ژ لایێ جەماوەرێ پارتی هاتە پێشوازی کرن.

پشتی بارزانی ڤەگەریایە عیراقێ، چالاکیێن رێکخستیا پارتی ل مووسل زێدە و بەرفرەهـ بوون و شیا ئێکەمین ناوەندا راگەهاندنێ ڤەکەت کو ئەو ژی ڤەکرنا پەرتووکخانەکێ بوو ب ناڤێ (پەرتووکخانا بادینان- مكتبە بادینان) ل جاددا حەلەب (سەعدون) یا ناڤدار و ئەڤ نڤیسینگەهە بوو جهێ دیدارا گەنجێن کورد و بوو سەنتەرەکێ پەیوەندی و پێکگوهۆڕینا زانیارییان، هەر وێ نڤیسینگەهێ وێنەیێن بارزانی ل تاخ و جاددەیێن مووسل بەلاڤدکرن و گەلەك لێ ژێ دهنارتنە قەزایێن بادینان ژی، ئەڤە سەرباری بەلاڤکرنا بەلاڤۆکێن پارتی، نەخاسمە ژی رۆژنامەیا (خەبات) کو مەلا حەمدی عەبدلمەجید ب ڤی کار رادبوو[٦].

رێکخستنا مووسل ئامادەی کۆنگرێ چوارێ یێ پارتی بوو کو ل هەیڤا چریا ئێکێ یا سالا ١٩٥٩ێ هاتبوو گرێدان و هەر ئێك ژ: نوری شاوەیس، سالح یوسفی، سوبغەتوللا مزووری، ناهیدە شێخ سەلام، نوری خەلیل، عومەر حەسەن محەمەد بامەڕنی و نعمان عیسا شێروانی نوونەریا وێ رێکخستێ د کۆنگرەی دا کرن و سەرکردایەتیا رێکخستێ ل بادینان هاتە پێکئینان و نوری سەدیق شاوەیس بوو بەرپرس و هەر ئێك ژ سوبغەتوللا مزووری، خالد حەسەن یوسفی، رەمەزان موحسن ئاکرەیی، نوری خەلیل ئیبراهیم بوونە ئەندامێن وێ رێکخستێ.

هندیکە بادینان ب خۆیە، خەلکێ وێ دلخۆشیا خۆ ل سەر هەلبوونا شۆڕشا ١٤ی تیرمەها ١٩٥٨ێ

دەربڕی و پشتەڤانی لێ کر، هەروەسا جەماوەرێ دەڤەرێ ل هەمی باژێران خۆنیشاندانێن پشتەڤانیکرنا شۆڕشێ ئەنجامدان و ل داوییا هەیڤا تیرمەهێ ب کۆم قەستا بەغدا کرن و پشتەڤانییا خۆ بۆ شۆڕشێ راگەهاندن، عەبدولکەریم قاسمی ژی ل بەرامبەری وەزارەتا بەرەڤانیێ پێشوازییا شاندێن دەڤەرا بادینان کر و ب خێرهاتنا وان کر، لێ سەرۆك عەشیرەتێن کورد ب تایبەتی یێن بەرژوەندی دگەل رژێما شاهینی هەبوون، پشتەڤانییا هەلبوونا شۆڕشێ نەکرن، بەلکی ل دژی وێ راوەستیان، نەخاسمە ژی ل هەردوو قەزایێن ئاکرێ و ئامێدیێ.

وی دەمی بەتالیۆن (فەوج)ەکا لیوا پێنج کو بارەگەهێ وێ ل مووسل بوو، ل نێزیك باژێرکێ ئاکرێ ئاکنجی بوو و ئەڤ بەتالیۆنە و ئەفسەر و سەربازێن وێ هەتا پشتی شۆڕشا ١٤ی تیرمەهێ ژی هەر ل وێ قەزایێ مابوون، هەروەسا ژ بەرکو پتریا ئەفسەرێن وێ نەتەوەپەروەرێن عەرەب بوون، هەڤرکییا سیاسی ل ناڤبەرا وان و رێکخستنیا پارتا کۆمۆنیستا عیراقی و پارتا دیمۆکراتا کوردستانێ دژوار بوو، کەسێ پشتەڤانییا وان ئەفسەران نەدکر ژ بلی هژمارەکا کێم یا سەرۆك عەشیرەتێن وێ دەڤەرێ، هەروەسا دەمێ عەبدولسەلام عارفی ل رۆژا ١٥ی تەباخا ١٩٥٨ێ سەرەدانا مووسل کری، جەماوەرێ ئاکرێ هاتە مووسل بۆ پێشوازیکرنا وی، بەرامبەری ڤێ ژی، ئەفسەرێن بەتالیۆنا سەربازگەها(حامیە) ئاکرێ ئاغا و موختار و ئەوێن دژی پارتی هاندان قەستا بەغدا و مووسل بکەن بۆ پشکداریکرنێ د پێشوازیکرنا عارف دا و ئەو هاندان بۆ دیار بکەن کو ئەو ژ لایێ جەماوەری ڤە ب هێزترن و خودان دەستەلاتترن ل قەزا ئاکرێ.


خەبات
لە ئامانجەکانمان
کشانەوە لە پەیمانی بەغدا

ل گۆرەپانا فرینگەها مووسل ژی، هەر ئێك ژ کۆمۆنیست و پارتییان ژ لایەکی و بەعسی و ئیخوان مووسلمین و بزاڤا نەتەوەپەروەرێن عەرەب و سەرۆك عەشیرەتێن ئاکرێ و تاگرێن وان ژ لایەکێ دیڤە بەرێکانێ ل سەر نیشادانا دەستەلات و ئاستێ جەماوەریا خۆ کرن بەرامبەری عەبدلسەلام عارف، ئەندامێ پارتی مام عەلی سەلیم ل بەرامبەری عارف درووشمێ (ئەی بارزان، ئەم سەربازێن تەینە) گۆت، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ هندێ سەرۆك عەشیرەت گەلەك بتنگژن، گرۆڤە ژی بۆ وێ چەندێ ئەوە کو ل ئیلۆنا سالا ١٩٥٨ێ پتریا ئاغایێن دەڤەرێ ئەرزوحالەك پێشکێشی عەبدولکافی عارف موتەسەرفێ لیوا مووسل کربوو کو ئیمزا پتر ژ ٩٠ کەسایەتیێن دووڤەلانك و تاگرێن وان ل سەر بوو و تێدا داخواز کربوون توخیبەك بۆ

چالاكیێن پارتی و دیارترین ئەندامێن وێ یێن ل ئاكرێ بێتە دانان، هەروەسا ئاماژە ب درووشم و چالاكیێن وان هاتبوو كرن دەمێ پێشوازیا عەبدلسەلام عارف كرین و پرۆپاگەندا وێ چەندێ كرن كو وان جڤین داینە شێخ و سەرۆك عەشیرەتان، هەروەسا د وێ ئەرزوحالێ دا هاتبوو: كۆمەلەك ل ئاكرێ هەیە، چ كار نینە، ژ بلی پەیداكرنا ڤێكنەكرنێ و گەندەلیێ و ئەو ژی ئەڤێن خوارێ نە: عەلائەددین سەعید، هاشم حەجی حەسەن، سەلاح رەشید، خەیرەدین رەشید، شەوكەت حەجی تاهر، عزەت عەبدولخالق و مام عەلی سەلیم و ئەوێن ئەو ئەرزوحال پێشكێشی كری، داخواز ژ حكۆمەتێ كرن ڤەكۆلینێ د سالۆخەت و كاروكریارێن وان دا بكەت و توخیبەكی بۆ دانیت، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ٢٧ی تەباخێ دەستەلاتێ دەست ب ڤەكۆلینێ د رۆلێ ئەندامێن پارتی دا كر و ل مالا ئێك ژ وان بەلاڤۆكەك دیت كو بەری شۆرشا ١٤ تیرمەهێ دەركەڤتبوو، لێ سەرباری هندێ، هەر سێ برا عەبدال و حەمید و محەمەد مەحمود خالد دەستەسەركرن كو بێ داویی ئەندامێ لیژنا ناڤخۆیا پارتی بوو ل ئاكرێ[٧].

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە، ئەفسەرێن نەتەوەپەروەرێن عەرەب ل سەربازگەها ئاكرێ شیابوون دەستەلاتێ رازی بكەن توخیبەكی بۆ چالاكیێن پارتی دانیت، هۆسا، دەستەلاتێ هاشم حەسەن (مامۆستا) ڤەگوهاستە زوممار، شەوكەت تاهر (فەرمانبەر) ڤەگوهاستە گەیارە كو هەردوو وەك سەرێن فەرتەنە و جوداخوازیێ ل قەلەمدابوون، هەروەسا سۆزنامەیێن پاراستنا تەناهی و ئاسایشێ ژ ئەوێن ب (جوداخواز) ناڤدكرن یێن ناڤێن وان ل خوارێ وەرگرتن: عەلائەددین سەعید، مام عەلی سەلیم، سەلاح رەشید، خەیرەدین رەشید، ئەكرەم رەشید، عزەت عەبدولخالق، عەبدولرەحمان عەبدوللا، فائق حەجی شەریف، شوكری عەبدوللا، خدر حەسەن خدر، ئەمین رەشید، محەمەد خالد، مەسعود تاهر، سادق موحسن، سەدیق دەروێش، محەمەد یەحیا موهاجر، عەزۆ محەمەد ئەمین، عەبدولخالق عەلی، فازل عەزۆ، عەبدلرەحمان فندی، ئەمین سالح، یونس محەمەد یاسین، جەمیل حەجی شەریف، فەهمی رەشید، حەفزوللا عەبدولخالق، هەروەسا فەرمانداریا بنگەهێ مووسل داخواز كر سۆزنامەیێن پاراستنا تەناهیێ ژ هەڤدژێن پارتی وەرگرتن، ژ وانا: شێخ ئیبراهیم شێخ باقر، حەجی فائق مستەفا مەلا جبرائیل، جەمیل مستەفا مەلا جبرائیل، حەجی عوبەید خەندان، خەلیل ئیبراهیم چەلەبی و عەونی مستەفا مەلا جبرائیل[٨].

ئەفسەرێن نەتەوەپەروەرێن عەرەب و ئاغا و ئەوێن دژایەتییا بزاڤا نەتەوەییا كوردی ل ئاكرێ دكرن، ب ئەشكەرایی پرۆپاگەندە دژی حكۆمەتا شۆرشێ بەلاڤ دكرن و جڤین ددانە پارتی و بارزانیێ سەرۆكێ وێ و دگۆتن: "كێ دەستووری دابوویێ ڤەگەرێتە ئاخا وەلاتی؟" و هزر و بەلاڤۆكێن حزبا بەعس بەلاڤ دكرن[٩].

تشتێ سەیر ژی ئەوە كو ئەو ئەفسەر ل بەهانەیان دگەریان بۆ دەستەسەركرنا ئەندامێن پارتی، بەهانا وان ژی چالاكیێن وان یێن سیاسی بوون ل سەردەمێ شاهینیێ، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ٢٧ ی تەباخێ ل ناڤ مالێن ئەندامێن پارتی گەریان و ل مالا ئێك ژ وان بەلاڤۆكەك دیت كو بەری شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ دەركەڤتبوو، لێ دگەل هندێ ژی، هەر سێ برا عەبدال و حەمید و محەمەد مەحمود دەستەسەركرن كو بێ داویێ ئەندامێ لیژنا ناڤخۆیا پارتی بوو ل ئاكرێ[١٠]، هەروەسا ل رۆژا ٦ی چریا ئێكێ یا سالا ١٩٥٨ێ راپۆرتەك بۆ رێڤەبەریا هەوالگریا سەربازی نڤیسین و تێدا هاتبوو: كۆمەلەكا نەپەنی ژ رۆشنبیران ب ناڤێ (رزگاری) ل ئاكرێ هاتییە پێكئینان و ئارمانجا وێ دامەزراندنا قەوارەیەكێ خۆسەرێ كوردییە و ئەندامێن وێ ب شەڤ ل خانیێن (كانی زەركێ) كۆم دبن كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێنە: عەلائەددین سەعید، سەلاحەددین رەشید، هاشم حەجی حەسەن، خێری رەشید، محەمەد یەحیا موهاجر، مام عەلی سەلیم.

ل رۆژا ٢٦ی چریا دووێ یا ١٩٥٨ێ، رێڤەبەریا ئەمنا

لیوا مووسل ب گونەهباریێ (جوداخوازیێ) ب دەهان ئەندامێن پارتی ل ئاکرێ ئێخستنە بن زێرەڤانییەکا نەپەنی، هەروەسا داخواز ژ هاریکارێن پۆلیسێن دهۆک، ئامێدیێ و شێخان کر ب ئاوایەکێ نەپەنی زێرەڤانییا دێوالی ئاغا دۆسکی، عەلی غیاسەددین نەقشبەندی، عەبدلعەزیز حەجی مەلۆ بکەن کو ئەو ب بەرپرسێن کۆمەلێ ل دەڤەرێن خۆ ل قەلەمدابوون[11].

ب راستی ژی ئەڤ رێکخستییە ل دەستپێکا سالا ١٩٤٦ ێ ل ئاکرێ هاتبوو پێکئینان، لێ ب داوی هات پشتی پتریا ئەندامێن وێ گەهشتینە ناڤ رێزێن پارتی دەمێ ل رۆژا ١٦ تەباخا ١٩٤٦ێ هاتیە دامەزراندن و پشتی شۆرشا ١٤ ای تیرمەهێ ب ئەشکەرایی کارێن خۆ دکرن.

ل داوییا سالا ١٩٥٨ێ، عەقید یونس زێنەددین فەرماندێ سەربازگەها ئاکرێ داخواز کر دیدارەکێ دگەل لیژنا ناڤخۆیا پارتی[12] بکەت و تێکگەهشتنەک ل ناڤبەرا وان بێتەکرن، لێ هەردولا نەگەهشتنە چو ئەنجامان، ئینا وی ئەفسەری ب گونەهباریا ڤەگوهاستنا دەنگ و باس و زانیاریان سێ ئەندامێن پارتی ژ کارێن وان دوورئێخستن کو ئەو ژی ئەڤە بوون: فائق حەجی شەریف، ئیبراهیم یاسین و فائق ئەحمەد رەشید کو هەر سێیان ل فەرمانگەها پۆستەی کار دکرن، پشتی لادانا وان ژ کاری، لیژنا ناڤخۆیا پارتی داخوازا دیدارەکێ دگەل عەقید روکن عەبدلوەهاب شەواف فەرماندێ بنگەهێ مووسل کر و دیار بوو کو فەرماندێ سەربازگەها ئاکرێ ژ بەر زۆریا وان برۆسکەیێن پشتەڤانیێ تۆرەبوویە یێن ژ ئاکرێ بۆ سەرکردایەتییا شۆرشێ ل بەغدا دهاتنە هنارتن، هۆسا، پشتی هەر ئێک ژ یێن ناڤێن وان ل خوارێ بەرگەریان بۆ کری، هەر سێ بۆ سەر کارێن وان هاتنە زڤراندن: بابا عەلی شێخ مەحمود وەزیرێ ڤەگوهاستنێ (مواصلات)، کەسایەتیێ بەرنیاسێ کورد جەوهەر عەزیز دزەیی ئەڤە ژی پشتی شەواف ل سەر وێ چەندێ رازی بووی[13].

پشتی شۆرشا ١٤ تیرمەهێ، ل دەڤەرا ناحیا هەر حەفت عەشیرەتان (ناحیة العشائر السبعة) (بەردەرەش) ژی وەکی سەرهلدانەکا جۆتیاران دژی ئاغا و مولکدارێن مووسلی هاتە روودان، نەخاسمە پشتی راگەهاندنا چاکسازییا چاندنێ ل رۆژا ٣٠ ی ئیلۆنا ١٩٥٨ێ، جۆتیاران دەست ب چالاکییان کرن و هژمارەکا کۆمەلێن جۆتیاران دامەزراندن کو ئێک ژ وان کۆمەلا برایەتی(الإخاء) بوو و ناڤێ (گرۆپا مللەتی) (جماعة الشعب) ل سەر پشتەڤانێن شۆرشێ هاتە دانان، لێ ناڤێ (گرۆپا ئیمپریالی) (جماعة الإستعمار) ل سەر ئاغا و تاگرێن وان هاتە دانان یێن پشتەڤانییا شۆرشێ نەکرین، هەروەسا دەمێ کورتێ ئێکسەر پشتی شۆرشێ ل دەڤەرێ ب ناڤێ (شەعب شەعبانی) هاتە ناڤکرن، هۆسا، جۆتیارێن هەژار و زانایێن ئایینی پشکداری د چالاکیێن سیاسی دا کرن و مەلا عاسم حەجی یەحیا بەرپرسێ رێکخستنا پارتی یا جۆتیاران/ سەرۆکێ کۆمەلا برایەتی (الإخاء) رۆلەکێ کاریگەر تێدا هەبوو، هەروەسا دگەل وی کۆمەکا جۆتیارێن پارتی ژی د بەرچاڤ بوون، ژ وانا: مەلا عەلی رەسول، ئیبراهیم عەزیز عەبدۆ، یاسین تاها (مام یاسین)، هەردوو برا حەسەن و رەشید سلێمان زاهر، عەزیز محەمەد ئەمین، حەسەن و عەبدوللا خدر حەسکۆ، ئەڤە ب هاریکاریا رێکخستنا ئاکرێ شیان هژمارەکا شاندان پێک بینن و ئەڤ شاندە چوونە بەغدا بۆ پیرۆزباهیکرنێ ل شۆرشێ و ب خێرهاتنا ڤەگەریانا بارزانی بۆ بەغدا ل رۆژا ٦ ی چریا ئێکێ یا سالا ١٩٥٨ێ[14].

هەروەسا چالاکیێن پارتی ل قەزا شێخان ژی بەرفرەهـ بوون، نەخاسمە ل ئەترووش و هەر ئێک ژ ئەندامێن پارتی حەسەن محێ، ئەمین ئەحمەد، جۆتی خدر، سلێمان خەلەف، ئۆسمان عەلی، مەلا خەلیل مشەختی، حسێن بابا شێخ، سلۆ خدر و پتریا قوتابیێن دواناوەندیێ دیار و بەرچاڤ بوون، ئەڤان لەز ل پێکئینانا شاندەکێ مەزن کرن کو پێکهاتبوو ژ شێخ جەلال بریفکی، حەمید عەتاللە، تاهر حەجی یونس، خورشید، محەمەد مووسا و هندەکێن دی یێن گوندێن گەلیێ رمان، دێرکێ، خۆرکێ، ئەتروش، بریفکا، شێخ هەسنا و ئەڤ شاندە چوو بەغدا بۆ

پێشوازیکرنا بارزانی.

هەروەسا خەلکێ قەزا ئامێدیێ ژی دەمێ بەیانا ئێکێ یا شۆرشێ بهیستین دەرکەڤتن و ل بەرامبەری قائیمقامیێ خرڤەبوون و پارتی و کۆمۆنیستان درووشم بۆ پشتەڤانیکرنا شۆرشێ و سەرکردێن وێ گۆتن، کۆمۆنیستان ژی رۆلەکێ بلند د رێکخستنا خۆنیشاندانێ دا هەبوو و سەرکردایەتییا رێکخستنا وان ب هەمی ئەندامێن خۆڤە پشکداری د ئاراستەکرنا جەماوەری دا کرن، ژ وانا: محەمەد زەکی (پارێزەر)، نعمان ئەمین، ئیسماعیل مەحمود، محەمەد مستەفا عەبدلرەحمان و یێن دی.

لێ سەرۆك عەشیرەتێن بەرژەوەندی دگەل رژێما شاهینی هەبوون پشتەڤانییا شۆرشێ نەکرن، بەلکی پەیوەندی دگەل ئێك و دو دکرن داکو خۆ رێك بێخن و هەلویستەکێ ئێکگرتی وەرگرن، هەتا هندەك ژ وان پەیوەندی دگەل دەستەلاتێن ترکیا دکرن داکو ل دەمێ پێدڤی پەنایێ بۆ ترکیا ببەن، ل سەر ڤێ چەندێ، بەلگەنامە ئاماژێ دکەنە هەبوونا پەیوەندییان ل ناڤبەرا کەلحێ ئاغایێ رێکانی، مەحمود ئاغای، ئەحمەد زێباری یێ برایێ وی و عەشیرەتا سوورچی دگەل دەستەلاتێن ترکیا ل قەزا چەلێ (چوقورجا) و هەڤپەیڤین کربوون ل سەر مەسەلا ڤەگەڕیانا بارزانی بۆ عیراقی و دەستدرێژی کربوونە سەر ئەندامێن عەشیرەتا دۆسکی (ژۆری)یا تاگرا بارزانی، و کەلحێ رێکانی و محەمەد ئەمینێ پسمامێ وی خۆ ئامادەکربوون ناڤماليیا خۆ ڤەگوهێزنە ناڤ عەردێ ترکیا[١٥].

ل رۆژا ٢٦ تیرمەها ١٩٥٨ێ ژی فیستەڤالەکا مللی ل باژێرکی هاتەکرن و هژمارەکا لەشکەران لێ ئامادە بوون، فیستەڤال ژ لایێ عەقید نوری شێخ مەعروف هاتە ڤەکرن و د پەیڤا خۆ دا بەحسێ نەرێنی یێن سەردەمێ شاهینی کر، دووڤرا هەر ئێك ژ جێدار(ملازم) هاشم دەبونی، محەمەد زەکی حەسەن، محەمەد مستەفا، ئەحمەد عەلی مامۆستایێ خواندنگا ئامێدیێ، محەمەد شوکری موفتیێ ئامێدیێ، حەننا قەللۆ سەرپەرشتێ ئەبرەشییا کلدانان و خووندکار تارق حەسەن پەیڤێن خۆ ب عەرەبی و کوردی پێشکێش کرن و هەمیان پەسنێ شۆرشێ و براینییا عەرەبی ـــ کوردی کرن و زۆرداریيا سەردەمێ شاهینی پرۆتستۆ کرن، ل داوییا فیستەڤالێ ژی عەقید نوری شێخ مەعروف داخواز ژ خەلکی کر هەر ئێك بچیتە سەر کارێ خۆ و خۆ ئامادە بکەن بۆ ب جهئینانا گازییا حکۆمەتا شۆرشێ کو پێدڤی وانە[١٦].

خەلکێ ئامێدیێ ل رۆژا ٢٧ تیرمەها ١٩٥٨ێ شاندەك پێك ئینا و ڤی شاندی سەرەدانا بەغدا کر بۆ دیتنا سەرکردێن شۆرشێ و پیرۆزباهیکرنا وان ب هەلکەڤتا سەرکەفتنا وێ شۆرشێ و ئەنوەر مایی (ئەنوەر مایی) نڤیسەر و سیاسیێ ناڤدارێ کورد ژی دگەل وی شاندی بوو، هەروەسا خەلکێ ئامێدیێ هژمارەکا شاندێن دی پێك ئینان و چوونە بەغدا بۆ ب خێرهاتنا ڤەگەڕیانا بارزانی و ژ بلی خەلکێ ئامێدیێ، گەلەك خەلکێ دەڤەرێ ژی دگەل وان شاندان بوون، ژ وانا: سالح روشدی (پارێزەر)، عەبدوللا حسێن باپیر، ئەحمەد عەبدللەتیف عەبدلعەزیز، سالح رەجەب، ئەنوەر مایی، ئیبراهیم کۆرەمارکی، ئەحمەد حەجی شەعبان، هورمز نیسان کانی و هژمارەکا ماقویل و ریهسپی یێن نێروە، ژ وانا: حەجی سالح عەبدوللا، قەهار محەمەد، عەتەم سەعداللە[١٧].

فەرە بێژین کو محەمەد عەبدولقادر ئامێدی (ئەرمەغانی) یێ وی دەمی ل کۆمپانیا نەفتا کەرکوك کار دکر ئێك بوو ژ ئەندامێن شاندێ کەرکوك یێ چوویە بەغدا بۆ ب خێرهاتنا ڤەگەڕیانا بارزانی، هەروەسا ل داوییا سالێن چلان و دەستپێکا سالێن پێنجییان ل ل سەدسالا بۆری، مالا وی ل بەغد دیدارگەها کادرێن پارتی بوو و ئەو ب خۆ ژی ل دەستپێکا دامەزراندنا پارتی گەهشتبوو ناڤ رێزێن وێ[١٨].

پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ ل کوردستانا عیراقێ دەستەلاتەکا ب هێز و بەرفرەهـ هەبوو، نەخاسمە ژی پشتی شۆرشا ١٤ێ تیرمەهێ، ژ بەر هندێ پارتی خۆ د هەلویستەکێ بەرتەنگدا دیت کا ئەرێ هاریکاریێ دگەل بکەت یان ژی دژایەتییا وێ بکەت و ژ گۆڕەپانا سیاسییا کوردی لادەت، ئینا بڕیاردا هاریکاری

و هەماهەنگییێ دگەل بكەت و ل رۆژا ١٠ ی چریا دووێ ١٩٥٨ێ هەردوو ل سەر پەیمانا هاریكاریێ رێككەفتن، پاشی ل كانوونا ئێكێ یا ١٩٥٨ێ پارتی چوو ناڤ بەرەیێ ئێكەتیا نیشتمانی (جبهة الاتحاد الوطني) كو لیژنە ل باژێرێن بادینان پێك ئینابوون. هەروەسا ل رۆژا ٢٨ خزیرانا ١٩٥٩ێ پارتی هەتا رادەیەكی ژ لایێ پارتا كۆمۆنیستا عیراقی ڤە هاتە سەركێشی كرن پشتی رازی بووی رێكخراوێن خۆیێن وەكی لاوان و مامۆستایان و ئافرەتان و قوتابییان تێكەلی هەڤكووڤێن وان یێن ل بن كۆنترۆلا پارتا كۆمۆنیستا عیراقی بكەت، بەرۆڤاژی حەزا بارزانی، حەمزە عەبدوللا سكرتێرێ پارتی پەیمانا بەرەیێ ئێكەتیا نیشتمانی ئیمزا كر كو ژ لایێ پارتا كۆمۆنیستا عیراقی ڤە هاتبوو پێشكێش كرن، ڤێجا داكو بارزانی خۆسەریا پارتی بپارێزیت، حەمزە عەبدوللا داخواز كرە كۆمبوونەكێ داكو دەست ژ سیاسەتا تاگریا كۆمۆنیستان بەردەت، لێ وی ب زڤری ئەو داخوازی رەت كر، ئینا بارزانی نەچار بوو وی بلۆك بكەت و پاشی ل كۆنگرێ چوارێ یێ چریا ئێكێ یا ١٩٥٩ێ وی ب ئێكجاری ژ وی پۆستی لادەت و دووبارە ئیبراهیم ئەحمەد وەك سكرتێرێ لیژنا ناوەندی هاتە هەلبژارتن، داویێ ژی وەسا پێدڤی بوو جۆرەكێ دی یێ سەرەدەریێ بێتەكرن، نەخاسمە ژی: ئێك: پشتی پەیوەندی ل ناڤبەرا حكۆمەتێ و پارتا كۆمۆنیست تێك چووین، دوو: پشتی پەیوەندی ل ناڤبەرا پارتا كۆمۆنیست و پارتی تێكچووین و گەهشتینە راددا بایكۆتكرنێ[19].

دەڤەرا بادینان ژی وەكی دەڤەرێن دی یێن كوردستانێ هەڤركی و شەرەنیخ ل ناڤبەرا پارتی و كۆمۆنیستان سەرا نوونەریا كوردان پەیدا بوون، پارتا كۆمۆنیست خودان دەستەلاتەكا بەرفرەهـ و كاریگەر بوو نەخاسمە ل هەردوو قەزایێن ئامێدیێ و زاخۆ، كۆمۆنیستان كۆنترۆل ل سەر سەندیكا و رێكخراوێن پیشەیی و جەماوەری و بەرگری مللی كربوون یێن پشتی شۆرشێ هاتینە پێكئینان، هەرچەندە ژی پەیمانا هاریكاریێ ل ناڤبەرا خۆ ئیمزا كربوون، لێ هەڤركی ل ناڤبەرا هەردو پارتان یا بەردەوام بوو بۆ راكێشانا گەنجان و بەرفرەهـ كرنا دەستەلاتا خۆ، ئەڤ هەڤركییە ل هندەك باژێران بوو شەرەنیخ و ئامێدیێ نموونەیەكا دیار و بەرچاڤ بوو بۆ هەڤركی و شەرەنیخێ ل ناڤبەرا رێكخستنێن هەردوو پارتان.

خەلكێ ئامێدیێ ب كەیف و خۆشی پێشوازیا شۆرشا ١٤ ی تیرمەهێ كر و دەملدەست شاند ژ پارتی و كۆمۆنیستان پێكئینان و ئەڤ شاندە چوونە بەغدا بۆ پیرۆزباهیكرنێ ل سەركردێن شۆرشێ، هەروەسا دەمێ بارزانی ڤەگەریایە عیراقێ، شاندێن پێكهاتی ژ ئەندامێن هەردو پارتان چوونە بەغدا بۆ ب خێرهاتنا وی، لێ ڤێ هاریكاری و گونجانێ گەلەك نەڤەكێشا، بەلكی هێدی هێدی ل باژێری هەڤركی بۆ بەرفرەهـ كرنا دەستەلاتێ ل ناڤبەرا كۆمۆنیست و پارتییان پەیدا بوون، ئەڤ تشتە ژی باش یا دیار و ئەشكەرا بوو دەمێ هێزێن بەرگری مللی هاتینە دامەزراندن و دەمێ رۆژا ١٢ كانوونا ئێكێ ١٩٥٨ێ پرۆسێسا هەلبژارتنا نیڤا ئەندامێن جڤاتا باژێرڤانیێ هاتییە ئەنجامدان، هەروەسا وێ هەڤركیێ هندەك كاروبارێن دی ژی ب خۆڤە گرتبوون.

### أ ـ هەلبژارتنا ئەندامێن جڤاتا باژێرڤانیێ:

هەڤركییا سیاسی و جڤاكی ل ناڤبەرا پارتا كۆمۆنیستا عیراقێ و رێكخستنا پارتا دیمۆكراتا كوردستانێ ل ئامێدیێ، جارا ئێكێ ل دەمێ هەلبژارتنا ئەندامێن نیڤا جڤاتا باژێرڤانیێ ل رۆژا ١٢ كانوونا ئێكێ ١٩٥٨ێ پەیدا بوو، راپۆرتێن قائمیقامیێ ژی دیار دكەن كو پشتی شۆرشا ١٤ تیرمەهێ خەلكێ باژێری ببوونە دو پشك و هەر ئێك ژ وان هەڤركی بۆ بەرفرەهـ كرنا دەستەلاتا خۆ دكر، پشكا ئێكێ محەمەد زەكی یێ كۆمۆنیست (پارێزەر) ب ناڤێ ئێكەتیا لاوێن دیمۆكراتی سەرۆكاتیا وێ دكر و گازینۆیا باژێری كربوو بارەگەهێ خۆ و هژمارا وان ١٥٠ ئەندام بوون، لێ پشكا دووێ ب سەرۆكاتیا سالح روشدی (پارێزەر) ب ناڤێ پارتی بوو، دەمێ هەلبژارتنا

ئەندامێن نیڤا جڤاتا باژێرڤانیێ هاتیە راگەهاندن، پشكا دووێ هەر ئێك ژ: مستەفا عەبدلرەحمان، رەشید ئەحمەد، حسێن ئەحمەد و هندەكێن دی یێن پارتی كاندید كرن و قائیمقامیێ ژی ئەو ب ناڤێ كۆمەلا سەعید حەجی شەعبان ناڤكرن، هەر ئێك ژ محەمەد حەجی خالد و ئیسماعیل مەحمود دیارترین كاندیدێن پشكا ئێكێ بوون و ئەڤێن داویێ ب زۆرینەیا مەزن یا دەنگان د وان هەلبژارتنان دا سەركەفتن، ئینا كۆمەلا سەعید نەرازیبوونا خۆ دەربڕی ب هەجەتا هندێ ئازادی د هەلبژارتنان دا نەبوویە، لێ پشكینەرێ باژێرڤانیێ یێ ڤەكۆلین د وێ مەسەلێ دا كری چ زێدەگاڤی نەدیتن ببنە ئەگەرێ نەرازیبوونێ، ڤێجا كۆمەلا سەرنەكەڤتی دەست ب جڤیندانا ئەندامێن ئێكەتییا لاوێن دیمۆكرات كر و ئاستەنگ ئێخستنە د رێیا كار و چالاكیێن وان دا، لێ سەرباری هندێ، ئەو ئێكەتی شیا ل رۆژا ٣ كانوونا دووێ ١٩٥٩ ێ ب هەلكەڤتا رۆژا جیهانییا ئاشتیێ فیستەڤالەكێ ل گۆڕەپانا قائیمقامیێ رێك بێخیت.

**ب ـ هێزێن بەرگری مللی:**

حكۆمەتێ ل رۆژا ئێكێ تەباخا ١٩٥٨ێ یاسایا بەرگری مللی (المقاومة الشعبية) دەرئێخست داكو هاریكارییا هێزێن لەشكەری و پشكداریێ د پاراستنا ئاساییش و تەناهیێ دا بكەت، هەرچەندە پتریا پارتان ئەندامێن خۆ پالدابوون وەك خۆبەخش بچنە د ناڤ پێكهاتێن وێ هێزێ دا، لێ ب بۆرینا دەمی ئەو هێز بوو رێكخستنەكا كۆمۆنیستیا چەكدار نەخاسمە ژی پشتی عەقید تاها مستەفا بامەڕنی یێ هەڤسۆز دگەل كۆمۆنیستان وەك سەركردێ گشتیێ وێ هێزێ و ئەفسەرێ كۆمۆنیستێ كورد مەهدی حەمید وەك سەركردێ پێكهاتێن وێ ل لیوا مووسل هاتینە دامەزراندن كو هژمارا ئەندامێن وێ هێزێ ل دۆرێن ٧ هزار بەرگریكاران بوو.

ل سەر داخوازییا خەلكێ ئامێدیێ، بامەڕنێ، سەرسنكی، زاخۆ، بەرواری بالا و دۆسكی ژۆری بڕیارا ڤەكرنا سەنتەرێ بەرگری مللی هاتەدان و نەعمان حەجی ئەمین ئامێدی وەك بەرپرسێ وان هێزان ل ئامێدیێ هاتە دامەزراندن، قەشە تۆما داود بەرپرسێ وان هێزان بوو ل ناڤ بەرواری بالا، ل خزیرانا ١٩٥٩ێ ژی ئاهەنگەك ب هەلكەڤتا دەرچوونا ئێكەم پشكا هێزێن بەرگری مللی ل بامەڕنێ هاتە گێڕان و ئاهەنگ ب رێپێڤانەكا بەرگریكاران ل جاددا سەرەكی دەست پێ كر و بەرەڤ جهێ ئاهەنگێ ل ئاڤاهیێ خواندنگەها دەستپێكی ب رێكەڤت، ل وێرێ جێدار داود سلێمان ئەفسەرێ بەرگریكار ب پەیڤەكێ ئاهەنگ دەست پێ كر و پەسنێ رۆلێ هێزێن بەرگری مللی كر و ب گەرمی سوپاسییا هاتنا وەلاتییان بۆ ناڤ رێزێن وان هێزان و چەك هەلگرتنێ كر بۆ پاراستنا كۆماری، پاشی بەرگریكاران سروودا (بمریت ئیمپریالیزم) گۆتن و شانۆگەرییەك ب ناڤ ونیشانێن (الشیوخ بین عهدین) شێخ و ئاغا د ناڤبەرا دو سەردەماندا پێشكێشكرن، هەروەسا عەلی شێخ غیاسەددین نەقشبەندی د پەیڤەكێ دا داخواز ژ بەرگری مللی كر چاڤدێرییا وان كەسان بكەن یێن تەناهییا وەلاتی تێك ددەن، ل داویێ ژی مامۆستایەكی پەیڤا شاندێ گوندێ ئەرەدنا پێشكێش كر[٢٠].

ل پێشییێ ل دەڤەرا بەرواری بالا بەرگری مللی زێدەگاڤی ل سەر خەلكی و ئەندامێن پارتی و لایەنگرێن وێ كر، وان هێزان دەستدرێژی كرە سەر مامۆستا مەعسوم ئەنوەر مایی، عەلی یوسف محەمەد بێدوهی، تەوفیق مەلا سەدیق و عەلی مەلا محەمەد ئەحمەد هەلوەیی و ئەو قوتان و گەفێن كوشتنێ لێ كرن، ئەڤە ژی بوو ئەگەرێ هندێ ل هەیڤا تیرمەها سالا ١٩٥٩ێ خەلكێ دەڤەرێ داخوازێ ژ حكۆمەتێ بكەت ئەو هێز ل وێ دەڤەرێ بێنە هەلوەشاندن، چونكی ببوونە ئالاڤ بۆ بزداندن و ئازراندنێ. بۆ زانین ژی، ل رۆژا ٢٤ی نیسانا ١٩٥٩ێ خەلكێ دەڤەرێ داخواز كربوو هێزێن بەرگری مللی ل دەڤەرا وان بێنە دامەزراندن و ژ بەر ئازراندنێن توركی وەك خۆبەخش چوونە د ناڤ پێكهاتێن زێرەڤانییا توخیبی دا.

ل ئامێدیێ ژی رەوش باشتر نەبوو، بەرگریكارێن مللی ب فەرمی ماف دانە خۆ زێدەگاڤیێ ل سەر یاسا و تەناهیێ بكەن و دەستدرێژی و كرنە سەر وەلاتییان و ئەو دئازراندن، ئەڤە ژی بوو ئەگەرا وێ چەندێ هندەك ئەندامێن پارتی داخوازێ ژدەستەلاتێ بكەن توخیبەكی بۆ رەفتارێ وان دانیت و گازندێن خۆ گەهاندنە عەقید روكن حەسەن عەبود فەرماندێ بنگەهێ مووسل و وی ژی لیژنەیەكا ڤەكۆلینێ ب سەرۆكاتییا ئەفسەر محەمەد محەمەد ئەمین دەربەندی هنارتە ئامێدیێ، دەمێ گەهشتییە وێرێ داخوازا ئامادەبوونا هژمارەكا ئەندامێن پارتی و كۆمۆنیست كر ژ وانا محەمەد زەكی و نعمان ئەمین، هەروەسا دەربەندی گوهداریا دیدەڤانییا پێشكار(موقەددەم) عەبدلحافز بامەرنی ئەفسەرێ سەربازگیرییا (تەجنیدا) قەزایێ كر، لێ دەربەندی ژ بەر ئاسێیی یا رێیا رێكێ نەشیا سەرەدانا بەرواری بالا بكەت، ئینا ب بێتێلێ پەیوەندی ب رەشید تالەبانی رێڤەبەرێ ناحیا نێروە رێكان كر كو ناڤبری كۆمۆنیست و رێنیشاندەرێ فەرماندێ بەرگری مللی بوو ل دەڤەرێ، دەمێ پرسیار ژێ كری ل سەر راستییا وان گازندان دژی بەرگری مللی، تالەبانی گۆت كو ب هزاران پارتی و هژمارەكا دەرەبەگان هێرش كرییە سەر بارەگەهێ وان هێزان و سەنتەرێ ناحیێ.

بۆ دەربەندی دیار بوو كو سەرەدەریا خراب یا تالەبانی و دەمارگیریا وی بۆ پارتا وی ئەگەرێ روودان و بەرفرەهـ بوونا وان ڤێكنەكرنان بوویە[21]، هەروەسا خەلەف متیۆتی رێڤەبەرێ ناحیا كانی ماسێ و شێخ خەلیل باشیكی نڤیسەرێ ناحیێ كو هەردو هەڤالێن پارتا كۆمۆنیستا عیراقی بوون، تەخسیری نەدكرن د پشتەڤانیكرنا كۆمۆنیستان و نخاڤتنا زێدەگاڤیێن وان دا.

پشتی زنجیرەكا دیدار و گەنگەشەیان، هەردوولا (كۆمۆنیست و پارتی) رێككەڤتن كو هەر ئێك ژ وان ب رێژا ٥٠٪ ێ د ناڤ بەرگری مللی دا بێنە وەرگرتن و دەربەندی داخواز ژ فەرمانداریا بەرگری مللی ل مووسل كر تالەبانی ژ فەرمانداریا بەرگری مللی بێتە لادان[22].

فەرە بێژین كو دەستەلاتێ ل مووسل هێزێن بەرگری مللی ل دەڤەرێ هەلوەشاندن بەری ئەو هێز ل تیرمەها ١٩٥٩ێ ل سەرانسەری عیراقێ بێنە هەلوەشاندن، دبیت ژی ئەڤە ب كاریگەریا عەبدلمەجید رەشید بەگێ بەرواری موتەسەرفێ مووسل ب وەكالەت (١٩٥٩/٨/١٧-٣/٢٧) هاتبیتە كرن كو یێ هەڤسۆز بوو دگەل پارتی، یان ژی ژ ترسا ئالۆزیێن دبیت ژ وی هەلویستی پەیدا دبن و كێشەیەكا مەزن ل دەڤەرێ چێ ببیت و نەهێتە كۆنترۆل كرن، ئەڤە ژی ژ بەر سیمایێ عەشیرەتگەریێ یێ دەڤەرێ و نێزیكییا وێ ژ توخیبێ تركیا.

ل چریا ئێكێ یا ١٩٥٩ێ، یوسف محەمەد بێدوهی ڤیا نڤیسینگەهەكێ ب ناڤێ (خەبات) ل گوندێ بێدوهێ ڤەكەت، لێ دەستەلاتا خۆجهی ل دەڤەرێ، ب بەهانا وەرنەگرتنا رازیبوونا لایەنێن بەرپرس رێگری لێ كر.

هەلویستێ خەلكێ قەزا دهۆك ژهەلبوونا شۆرشا ١٤ێ تیرمەهێ وەكی هەلویستێ سەرانسەری باژێرێن كوردی بوو، هۆسا، خەلكێ دهۆكێ ژی دەمێ دەنگ و باسێ هەلبوونا شۆرشێ بهیستی، رژیا گۆرەپانەكێ كو دكەڤتە بەرامبەری ئاڤاهیێ قائیمقامیێ و معاونیا پۆلیسان و فەرمانگەهێن دی، چەندین شەڤ و رۆژان ژ كەیف و خۆشییان دەوات و شەهیان ل وێرێ دكرن و ستوون ل وێرێ دانان داكو كڤانێن سەركەفتنێ یێن خەملاندی ب تاكێن داران پێڤە بكەن[23]، جەماوەری درووشم ب ناڤێ سەركردێن شۆرش و لەشكەری دگۆتن و لافیتە ل جهێن گشتی دهەلاویستن و ل سەر هندەك ژ وان هاتبوو نڤیسین: (هەر بژیت خەباتا هەمی نەتەوەیێن گەلێ عیراقێ، ل سەر كەڤرێ ئێكەتییا عەرەبی - كوردی هەمی پیلانێن ئیمپریالیزم و كەڤنەپەرێسیێ دێ هەرشن، ئەم قارەمانێن دهۆك دئامادەینە بچینە ناڤ رێزێن تیپێن بەرگری مللی)[24]، هەروەسا كۆمەلا بەرەڤانیكرنێ ژ مافێن ئافرەتان برۆسكەیەكا سوپاسیێ بۆ عەبدولكەریم قاسم سەركردێ شۆرشێ هنارت ژ بەر راگەهاندنا وی بۆ



مەلا عەلی برۆشكی

رێدانا بارزانی ڤەگەڕیێتە عیراقێ، کرێکارێن گازینۆیا دهۆك ژی برۆسکەیەك بۆ هنارت و تێدا هاتبوو: پیرۆزباهیێ ل برۆسکەبەرسڤناما وە بۆ ناما برایێ وەیێ ئاشتیخواز، هەڤوەلاتیێ عیراقیێ ئازادیخواز مستەفا بارزانی دکەین داکو ڤەگەڕیێتە ئاخا وەلاتی، کو ڤێ بەرسڤێ کاریگەرییەکا باش د دەروونێ هەمی وەلاتیێن عەرەب و کورد دا هەبوویە(٢٥).

ل دهۆك ژی لیژنەیا پاراستنا کۆماری(٢٦) ب سەرۆکاتیا ناجی محەمەد بالەتەیی یێ کۆمۆنیست بۆ بەرەڤانیکرنێ ژ کۆماری هاتە پێك ئینان و چاپخانا ئەحمەد عەرەب کرە بارەگەهێ خۆ و ئەو چاپخانە بوو دیدارگەها رۆشنبیر و پشتەڤانێن شۆرشێ، هەروەسا شاندەکێ سەربازی کو پێکهاتبوو ژ هژمارەکا ئەفسەرێن ئازادیخوازێن بنگەهێ مووسل گەهشتە باژێری و گۆتار بۆ جەماوەرێ دهۆك پێشکێش کرن و تێدا ئارمانج و پرنسیپێن شۆرشێ شرۆڤە کرن کو وێ شۆرشێ رژێما شاهینی یا سەر ب ئیمپریالیزمێ ژ ناڤبربوو(٢٧).

پشتی شۆرشێ پارتیێن دهۆك چالاك بوون و رێکخستنا پارتی نڤیسینگەهەك ل باژێری ب ناڤێ (نڤیسینگەها خەبات) ڤەکر و ژ لایێ بەرپرسێ رێکخستنێ مەلا عەلی ئیسماعیل بەرۆشکی ڤە دهاتە ب رێڤەبرن و پتریا ئەندامێن پارتێ ل وێرێ بوون، ژ وانا: سەدیق عەلی، سەلاح بەزاز، حەسەن مەحمود بەزاز، مستەفا عەلی ئەفندی، ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی رێڤەبەرێ دواناوەندیا ئامێدیێ، مەسعود سەعید، فەیسەل حەسەن نزارکی و یێن دی، هەروەسا رێکخستنێن پارتی بەرفرەهـ بوون و ناحی و گوندێن وەکی کۆرەمارکێ، مانگێشکێ ژی ڤەگرتن و ب سەدان خەلکێ دەڤەرێ گەهشتنە ناڤ رێزێن پارتێ(٢٨).

هەروەسا کۆمۆنیستێن باژێری ژی چالاك بوون، هەتا وەلێ هاتی دهۆك ببیتە سەنتەرەکێ سەرکردایەتیا رێکخستنێن پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ ل بادینان و کۆمۆنیستێن وەکی: محەمەد بەشیر عەبدوللا، بەکر عەبدولکەریم کۆڤلی، رەشید محەمەد مستەفا ئامێدی، حەسەن حاجی نعمان، داود قادر عەبد، ئەدیب سەعید زاخۆیی و ئەسعەد تەوفیق د دیار و بەرچاڤ بوون(٢٩).

هەروەسا پشتی شۆرشێ وێنەیێن مەلا مستەفا بارزانی وەك سەرۆکێ پارتی و وەك بەرهنگارێ رژێما شاهینی ل دهۆك بەلاڤ بوون، هەرچەندە ژی بارزانی پشتەڤانیا شۆرشێ دکر، لێ دەستەلات ژ بەلاڤبوون و هەلاویستنا وێنەیێن وی ل جهێن گشتی دلگران بووو، هەتا سەرکردایەتیا تیپا دووێ کو بارەگەهێ وێ ل کەرکوك بوو و سەرکردێ وێ راگر روکن(عەمید روکن) نازم تەبەقچەلی بوو و ب نەتەوەپەرێسەکێ عەرەب و ب دژایەتیکرنا بزاڤا ئازادیخوازا کوردی بەرنیاس بوو، ل رۆژا ٢٥ی تەباخا ١٩٥٨ێ و بەری ڤەگەڕیانا بارزانی بۆ عیراقێ نڤیسارەك

دەرئێخستبوو و تێدا فرۆتن و بەلاڤكرن و هەلاویستنا وێنەیێن بارزانی ب ئێكجاری قەدەغە كریوو، هەروەسا ژ بەركو دهۆك ژی سەر ب تیپا دوو بوو، عەبدوللا حەسەن جبۆری قائیمقامێ دهۆك وێنەیێن بارزانی یێن ل جادادان هاتینە هەلاویستن ئینانە خوارێ و گەلەك دژی هەلاویستنا وێنەیێن وی بوو، لێ ئەڤ سەرەدەریا وی جهێ تۆرەبوونا خەلكی بوو[30].

هەروەسا دەستەلاتا خۆجهی وێنەیێن بارزانی كۆم كرن و عەلی حەجی حەسەن خودانێ پەرتووكخانا (السلام) دەستەسەر كر چونكی ١٤ لبێن وێنەیێن وی ل پەرتووكخانا وی دیتبوون و دگەل وان وێنەیان رەوانەی رێڤەبەریا ئەمنا مووسل كر، ژ بەر هندێ، خەلكێ دهۆك برۆسكێن نەڕازیبوون و پرۆتستۆكرنێ بۆ وەزیرێ ناڤخۆ هنارتن، ئینا دەستەلات نەچاربوو وی ئازاد بكەت و وێنەیان بۆ بزڤرینیت[31]، هەر بۆ نموونە، د برۆسكەیەكێ دا كو ژ لایێ ٢٥٠ هەڤوەلاتیێن دهۆك ڤە هاتبوو ئیمزا كرن هاتبوو: (ل وی دەمێ ئەم پێدڤی كۆمكرنا رێزێن خۆ و ژیركرنا بۆریێ ب ئێش وژانین، قاسم محەمەد كۆمیسەر(رێپێدراو ــــ مەئموور)ێ بنكەهێ پۆلیسێن دهۆك ب فەرمانا عەبدوللا جبۆری یێ قائیمقام و سەدیق عومەرێ رێڤەبەریا پۆلیسان فرۆتنا وێنەیێن وەلاتیێ مللیێ عیراقی مستەفا بارزانی ل عەلی حەجی حەسەن خودانێ پەرتووكخانا دهۆك قەدەغە كر و گەف لێ كر وان وێنەیان راكەت، هەكە نە، دێ حەوالەی دادگەها سەربازی كەت، ب بەهانا وێ چەندێ وی فەرمانەك هەیە وێ دەستەلاتێ ددەتێ، ژ بەر هندێ وی كارمەندی و سێ پۆلیسان ب سەر پەرتووكخانێ دا گرت و خودانێ پەرتووكخانێ و وێنە دگەل خۆ برنە مووسل .... ئەم (خەلكێ دهۆك)، ب توندی ڤێ رەفتارێ نە دجهێ خۆدا پرۆتستۆ دكەین و داخوازێ دكەین خودانێ پەرتووكخانێ بێتە ئازادكرن و ڤەكۆلین دگەل بناسكاران بێتەكرن، بۆ زانین ژی، وێنەیێن بارزانی ل هەمی پەرتووكخانەیێن كۆمارا عیراقێ دهێنە فرۆتن و ل بەغدا هاتینە چاپ كرن[32].

هەژی گۆتنێیە كو دەستەلاتا خۆجهیا دهۆك زێرەڤانیا لڤینێن خێزانێن شێخێن بارزان دكر، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ٢٩ ئیلۆنا ١٩٥٨ێ قائیمقامێ دهۆك بۆ موتەسەرفیا مووسل نڤیسی و گۆت: نەزیر و خالدێ برایێ وی كوڕێن شێخ ئەحمەد بارزانی كو ئەحمەد ئیسماعیل ئاغا رۆڤی و عەبدلعەزیز حەجی مەلۆ دگەل وان بوون، ل رۆژا ٢٥ێ ئیلۆنێ سەرا وی داینە، پاشی چووینە زاویتە و ژ وێرێ ژی چووینە گوندێ پێدە و ل رۆژا ٢٦ێ ئیلۆنێ ڤەگەڕیاینە دهۆك و ژ وێرێ قەستا مووسل كرینە و ل دەمێ مانا خۆ ل دهۆك پەیوەندی ب كەسێ نەكرینە[33].

هەروەسا تشتێ دی یێ پەیوەندی ب ڤێ چەندێ ڤە هەی، د نڤیسارا هژمارە ١٤٠٤ یا رۆژا ١٠ ی چریا دووێ یا ١٩٥٨ێ سەركردایەتیا تیپا دو دا هاتییە كو دەهـ رێبەر و ئاغایێن كوردێن تركیا ب دزیڤە هاتینە عیراقێ و ل دهۆك پەیوەندی ب عەبدلعەزیز حەجی مەلۆ و شێخ عەلی غیاسەددین نەقشبەندی كرینە، پاشی هەمی دگەل هندەك كوردێن لیوا مووسل چووینە هەڤلێر داكو پەیوەندیێ ب شێخ ئەحمەد بارزانی بكەن، تیپێ ژی داخواز ژ رێڤەبەرێن ناحیا و معاونیێن پۆلیسان كرییە زیرەڤانیا وان بكەن.

هەروەسا خەلكێ دهۆك شاندەك ب سەرۆكاتیا مەلا عەلی ئیسماعیل بەرپۆشكی بەرپرسێ لیژنا ناڤخۆیا پارتی پێكئینا داكو بچیتە بەغدا بۆ پێشوازیكرنا مەلا مستەفا بارزانی یێ رۆژا ٦ چریا ئێكێ یا ١٩٥٨ێ گەهشتییە وێرێ و هەر ب وێ هەلكەڤتێ چەندین برۆسكە بۆ عەبدولكەریم قاسمی هنارتن و تێدا سوپاسیا وی كرن بۆ رێدانا ڤەگەڕیانا بارزانی.

دەمێ ل رۆژا ٥ چریا دووێ یا ١٩٥٨ێ عەبدولكەریم قاسم، عەبدلسەلامێ جێگرێ خۆ و وەزیرێ ناڤخۆ ژ هەردو پۆستان لادای و ژ بەر دژایەتیكرنا وی بۆ هێزێن دیمۆكراتی و پشتەڤانیكرنا وی یا ئەشكەرا بۆ حزبا بەعس و هێزێن نەتەوەپەروەر و ئیسلامی، ل رۆژا ٨ چریا دوێ یا ١٩٥٨ێ خویندكارێن دواناوەندیا دهۆك د خۆنیشاندانەكێ دا پشتەڤانیا لادانا وی كرن، سەریاری نەڕازیبوونا قائیمقامی ژی، خویندكاران

درووشمێن پشتەڤانیێ بۆ عەبدولکەریم قاسم و مەلا مستەفای گۆتن، دیارترین ئەوێن سەرکێشییا خۆنیشاندانێ کرین ئەڤێن خوارێ بوون: ناجی محمەد بالەتەبی، تەوفیق سەلیم، فوئاد فەتحوللا، سەلاح عەبدوللا، تاهر سەعید و ئەمین سالح و پتریا وان کۆمۆنیست بوون و ئەندامێن ئێکەتییا گشتییا قوتابیێن عیراقێ بوون[٣٤].

پشتی دووبارە پێکئینانا بەرەیێ ئێکەتییا نیشتمانی و چوونا پارتی بۆ ناڤ وی بەرەی، بەرەی چەند لیژنەیەك ل پتریا باژێرێن کوردی پێك ئینان، هەر بۆ نموونە ل دهۆك کو تنێ دو رێکخستنێن سیاسی لێ هەبوون کو ئەو ژی رێکخستنا پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ کو بەرپرسێ وێ محەمەد بەشیر عەبدوللا بوو و رێکخستنا پارتی بووو کو بەرپرسێ وێ مەلا عەلی ئیسماعیل بەرۆشکی بوو، لیژنەیەکا پەیوەندیێ بۆ هاریکاری و رێکخستنا چالاکیێن هەردو رێکخستنێن ناڤبری هاتە پێکئینان و مەلا عەلی ئیسماعیل بەرۆشکی نوونەرێ پارتی بوو د وێ لیژنێ دا، لێ نوونەرێ پارتا کۆمۆنیست عەبدلرەحمان زاویتەیی بوو، پاشی دوو ئەندامێن دی گەهشتنە وێ لیژنێ کو ئەو ژی حسێن نوری کیکی ژ پارتا کۆمۆنیست و سەلاح محەمەد عەلی عومەر ژ پارتی بوو، ئەڤ لیژنە حەفتیێ جارەکێ کۆم دبوو بۆ ڤەکۆلینا ئارێشە و ئاستەنگان[٣٥] و رێکخستنا کار و چالاکیێن سیاسی و هەلویست وەرگرتنەکا هەڤپشك ژ هەر روودانەکا ل دەڤەرێ چێ دبیت.

هاریکاریا هەردو رێکخستنان ژی دیار بوو دەمێ ل رۆژا ئێکی ئەیارا ١٩٥٩ێ ئامادەکاری بۆ ئاهەنگا جەژنا جیهانیا کرێکاران هاتییە کرن، ئەڤە ژی دەمێ گەنجێن هەردو پارتان چووینە گەلیێ زاویتە بۆ ئینان تاکێن کاژا بۆ ئاهەنگگێرانێ ب وێ هەلکەڤتێ، لێ د رێیا ڤەگەڕیانا خۆ دا ل نێزیك گوندێ بادێ ترۆمبێلا وان وەرگەڕیا و ئەڤ روودانە بوو ئەگەرێ مرنا قوتابی سەلاح حەجی عەبدلرەحمان و بریندار بوونا ١٥ قوتابیێن دی، ل ئامێدیێ ژی رێپێڤانەکا ب کۆما بێدەنگ هاتە رێکخستن وەك بەهیداری بۆ (شەهیدی) و بەهیبەکا هەڤپشك بۆ هاتە دانان و باژێرێ دهۆك ب خەم کەڤت[٣٦].

سەرباری گونجان و هاریکاریێ ل ناڤبەرا کۆمۆنیست و پارتییان ل دهۆك، نەخاسمە د مەسەلا هاریکاری و پشتەڤانییا حکۆمەتا شۆڕشێ دا دژی بەرهنگارێن وێ ل ناڤ و ل دەرڤە، لێ هندەك ئارێشە ژی ل ناڤبەرا وان هاتنە رووداندن، هەر بۆ نموونە، رێ ل بەرپرسێ پارتی مەلا عەلی بەرۆشکی هاتە گرتن پەیڤەکێ ل کۆمبوونەکێ پێشکێش بکەت کو عەقید تاها بامەرنی سەرکردێ هێزێن بەرگری مللی لێ ئامادە ببوو، کو د وێ کۆمبوونێ دا عەبدلرەحمان سەلیم زاویتەیی پەیڤەك ب ناڤێ پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ پێشکێش کربوو، ئەڤە سەرباری جوداهییا درووشمێن سیاسیێن ئەندامێن هەردو پارتان ل وێ کۆمبوونێ[٣٧].

هەر چەوان بیت، دشێین بێژین، بەری و پشتی شۆڕشا ١٤ ی تیرمەها ١٩٥٨ ێ پەیوەندی ل ناڤبەرا پارتی و پارتا کۆمۆنیست دباش بوون، هەر ئێك ژ وان جەماوەر و تاگرێن خۆ هەبوون و ل بادینان چو پارتێن دی هەڤرکییا وان نەدکر، کۆمۆنیست ب هژمارە پتر بوون و هوورتر بوون ژ لایێ رێکخستن و چالاکییان ڤە هەتا ڤەگەڕیانا بارزانی بۆ عیراقێ ل رۆژا ٦ چریا ئێکێ یا ١٩٥٨ێ، لێ پشتی هنگی ل سەرانسەری دەڤەرا بادینان تایێ تەرازییا هەڤرکییا سیاسی کەڤتە د بەرژەوەندییا پارتی دا، ئەڤە بەرامبەری داهاتن و پاشداچوونا دەستەلاتا کۆمۆنیستان، نەخاسمە ژی پشتی پارتی ل ئادارا ١٩٦٠ێ مۆلەت وەرگرتی.

رەوشا زاخۆیا پشتی شۆڕشا ١٤ تیرمەهێ ژ رەوشا دەڤەرێن دی یێن کوردی یا جودا نەبوو، ل وی باژێری ژی چەندین رۆژان خۆنیشاندان بۆ پشتەڤانیکرنا شۆڕشێ هاتنەکرن و خەلکێ وێ ب داوەت و درووشمان دلخۆشییا خۆ بۆ هەلبوونا شۆڕشێ و بۆ سەرکردێ شۆڕشێ دەربڕین، دەمێ هاتیە پشتراستکرن ژی کو پەیوەندی ل ناڤبەرا هژمارەکا سەرۆك عەشیرەتێن دژی شۆڕشێ و حکۆمەتا ترکیا هەبوویە بۆ ئەنجامدانا کریارێن تێکدەرانە[٣٨]، خەلکێ قەزایێ وەك خۆبەخش

خۆ توومارکرن بۆ پاراستنا توخیبێ عیراقێ - ترکیا وەك خۆ ئامادەکرن بۆ هەر هێرشەکا ترکیا بۆ سەر عیراقێ[٣٩].

کۆمۆنیستێن بازێری ژی ژ وانا سالم نەجم قەساب، ئیبراهیم محەمەد نەسیم و حاجی ئەحمەد سەفەری د چالاك بوون د کۆمکرنا ئیمزایێن پشتەڤانێن شۆرشێ و هنارتنا شاندەکی دا بۆ بەغدا بۆ پیرۆزباهیکرنێ و ئەو شاند پێکهاتبوو ژ ئەندامێن پارتی ژی و ئەندامێن شاندی ئەڤێن خوارێ بوون: محەمەد سالح قەساب، عەجیل مەحمود (ژ پارتا کۆمۆنیست) و ئۆسمان محەمەد سەعید قازی (ژ پارتی)[٤٠].

هەروەسا خەلکێ قەزایێ چوونە د ناڤ رێزێن بەرگری مللی دا، دبیت ژی زاخۆ بازێرێ ئێکانەیێ بادینان بیت یێ کچێن وێ چووینە د ناڤ رێزێن وان هێزان دا[٤١].

ب راستی رێکخستنا پارتا کۆمۆنیست ژ هەمیان ب هێزتر و بەرفرەهـتر بوو، نەخاسمە ل سەنتەرێ قەزایێ و دیارترین ئەندامێ وێ ئەڤە بوون: حوسنی حەجی رەشید، مەحمود سالح، حکمەت محەمەد سەعداللە و محەمەد عـەزۆ، لێ رێکخستنێن پارتی ل گوند و ناحیا ب هێزتر و بەرفرەهـتر بوو و دیارترین ئەندامێن وی ژی ئەڤە بوون: ئۆسمان محەمەد سەعید قازی، سالح یوسفی، مەلا سالح حاجی بالقۆسی، عەلی هالۆ و نعمان عیسا بارزانی (شێروانی)، و پشتی بارزانی ڤەگەریایە عیراقێ، نەخشەیێ سیاسی ژی ل قەزایێ د بەرژەوەندیا پارتی دا هاتە گوهورین.

لێ ب ئاوایەکێ گشتی پەیوەندی ل ناڤبەرا هەردوو پارتان هەتا سالا ١٩٦٠ێ یا باش بوو، لێ پشتی هنگی ئالۆزی کەڤتنە وان پەیوەندیان نەخاسمە پشتی لێککەڤتن ل ناڤبەرا رێکخستنێن هەردو پارتان ل ئامێدیێ و شەقلاوە و هەریر رووداین، هەتا کو عادل جەلال قائیمقامێ زاخۆ گازندە ژ کریار و رەفتارێن کۆمۆنیستان و کۆنترۆلا وان ل سەر خەلکی دکر[٤٢] و دژایەتیکرن و ئازراندنا وان یا ئەشکەرایی ل سەر بنەمالا شەمدین یا بەرنیاس ل بازێری، هەتا هندەك تاکێن وێ بنەمالێ ژی نەچار بوون ژ زاخۆ دەرکەڤن و قەستا مووسل بکەن.

سەرباری پشتەڤانیا خەلکێ زاخۆ بۆ شۆرشێ و ئامادەبیا وان بۆ بەرەڤانی ژێ کرنێ، لێ دەستەلاتا خۆجهیا قەزایێ رێز ل وی هەلویستی نەدگرت، گرۆڤە ژی بۆ وێ چەندێ، دەستەلاتێ ب لۆژیکا سەردەمێ شاهینی سەرەدەری دگەل هەر چالاکییەکا نەتەوەیی یا کوردی دکر، هەر بۆ نموونە، ل چریا ئێکێ یا ١٩٥٨ێ حسام محەمەد سەعداللە قوتابیێ کولیژا ئەندازێ دەستەسەر کر ب گونەهباریا وێ چەندێ کو نامیلکەیەك ب زمانێ ئنگلیزی ب ناڤێ (کوردستان) و بەیانەکا ئێکەتیا کۆمەلا خویندکارێن کورد ل ئەوروپا ب ناڤێ (گازییەك بۆ کوردان) بەلاڤ کرینە، دەستەلاتێ ئەو تشتێ د وان دا هاتی ب ((پیلانێن ئیمپریالیستێ و بەلاڤکرنا جوداهیێ ل قەلەمدان بۆ پەیداکرنا قەوارەیەکێ جوداخواز ل (باکوورێ عیراقێ)، لێ پشتی ڤەکۆلین هاتیە کرن، دیار بوو کو چو رێکخستنێن سیاسی ل پشت وی کاری نەبووینە، ژ بەر هندێ، حسام محەمەد ب کەفالەتەکا ٢٠٠ دیناری هاتە ئازاد کرن و هەمی لبێن نامیلکەیێ و بەیانێ هاتنە دەستەسەرکرن و ب کارئینانا وان هاتە قەدەغە کرن[٤٣].

ل داویا ڤەکۆلینێ ژی ل سەر هەلویستێ بادینان ژ هەلبوونا شۆرشا ١٤ ی تیرمەهێ، پێدڤییە ئاماژێ بکەینە وێ چەندێ کو گۆتارخوینێن گەرۆکێن ل قەزا و گوندێن بادینان کار دکرن و سەر ب فەرمانگەها ئەوقافا دهۆك بوون، خەلکێ گوندان هاندان پشتەڤانی و گوهداریا شۆرشێ بکەن و خزمەتا ب زۆری (ئیلزامی) بکەن و ژێ نەرەڤن و بگەهنە ناڤ رێزێن پێکهاتێن بەرگری مللی بۆ بەرەڤانیکرنێ ژ رژێما کۆماری و ئایین و وەلاتی و بۆ

دیارکرن کو ئەڤە خێرە و دێ ب خێر بۆ هێتە نڤیسین بۆ پشتراستکرنا ئاخفتنێن خۆ ژی هندەك ئایەتێن قورئانێ و فەرموودەیێن پێغەمبەری دئینان، ئەڤە هەمی ژی ب ئاراستە کرنا رێڤەبەریا ئەوقافا دەڤەرا مووسل دهاتە کرن(٤٤).

## دوو: بزاڤا کۆدەتایا شەواف ل مووسل

بـاژێـرێ مووسل وەسا دهێتە نیاسین کو تێکرەسانەکا پرباوەریا ئایینیا ئیسلامی و هشیاریا نەتەوەیا عەرەبی ل نك خەلكێ وێ هەیە، ژ بەر هندێ، پشتی شۆرشا ١٤ ی تیرمەهێ دو ئاراستەیێن لایەنێن سیاسی ل باژێری پەیدابوون، یێ ئێکێ نەتەوەیی عەرەبی ـ ئایینی (ئیسلامی)یا ئێکەتیخواز بوو کو حزبا بەعس و بزاڤا نەتەوەپەروەرێن عەرەب و پارتا خۆسەریا عیراقی و ئیخوان موسلمین و پارتا رزگاریا ئیسلامی نوونەریا ڤی ئاراستەی دکر، لێ یێ دووێ نیشتمانی ـ دیمۆکراتی ـ هەرێمی بوو کو ژ لایێ پارتا کۆمۆنیستا عیراقی و پارتا نیشتمانیا دیمۆکراتی و پارتا دیمۆکراتا کوردستانێ دهاتە نوونەریکرن.

هەر ژ رۆژێن ئێکێ یێن هەلبوونا شۆرشێ و ب رێیا درووشمێن هەر ئاراستەیەکی بلنددکرن، ڤێکنەکرن ل ناڤبەرا هەردو ئاراستەیان پەیدا بوون، لێ دگەل هندێ ژی، چو لێکدان یان توندوتیژی ل ناڤبەرا تاگرێن هەردو ئاراستەیان نەهاتنە روودان هەتا رۆژا ١٥ تەباخا ١٩٥٨ێ عەبدلسەلام عارف سەرەدانا باژێری کری، ئاها ژ وێ رۆژێ شەرەدەست و ب چەکێن بریندارکرنێ لێکدان و لێککەڤتن ل ناڤبەرا تاگرێن هەردو ئاراستەیان هاتنە روودان، ئەو روودان ل پێشیێ ل جاددان چێ بوون، لێ پاشی چایخانە و تاخ و بازار و خواندنگەهـ ژی ڤەگرتن.

ب دەمەکێ کێم ژی بەری بزاڤا شەواف یا رۆژا ٨ ئادارا ١٩٥٩ێ، نیشانێن پەقینا روودانان د رەوشا مووسل دا هەبوون، چونکی ئەوێن ژ بەر رێکارێن شۆرشێ زیان ڤێکەڤتین و پێگەهـ و سەرمافێن خۆ ژ دەستداین، خۆ نێزێکی ئێك دکرن و داخواز ژ دیندار و سەرۆك عەشیرەتێن عەرەبی و کوردی دکرن بەرهنگاریا حکۆمەتا شۆرشێ بکەن و دژایەتیا پشتەڤانێن وێ بئازرینن و دژایەتیا وان بکەن، بۆ لادانا حوکمێ نوو ژی پەیوەندی ب کۆمارا عەرەبیا ئێکگرتی (مسر + سوریا) و دەستەلاتا ترکیا کرن بۆ ب دەستڤەئینانا پشتەڤانی و هاریکاریێ ژ وان هەردو دەولەتان، ئەڤ لڤینێن وان ژی ل ناڤ و ل دەرڤە دئیشکەرا بوون(٤٥).

لیژنا ناڤخۆیا مووسل یا پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ د بەیانەکا خۆیا رۆژا ١٣ کانوونا دووێ یا ١٩٥٩ێ دا هۆشداری دا و دیار کر کو عەبدلوەهاب شەواف فەرماندێ لیوا پێنج یا مووسل ل بەرە کۆدەتایەکێ ل سەر دەستەلاتێ بکەت و وێ بەیانێ داخواز ژ مللەتی کر دهشیار و چاڤ ڤەکری بن و ب مێرخاسی (روو ب روویێ پیلانگێڕ و دوژمنێن مللەتی ببن)(٤٦).

هەروەسا د راپۆرتەکا ئەمنێ یا رۆژا ١٣ کانوونا دووێ یا ١٩٥٩ێ دا هاتبوو (بۆ زانین، رێڤەبەریا ئەمنا مووسل لایەنگریا لایەنێن نەتەوەپەروەرێن عەرەبی و ئیسلامی دکر بەرامبەری دیمۆکراتخوازان): (رۆژ بۆ رۆژێ تیکا ڤێکنەکرنێ ل ناڤبەرا کۆمۆنیست و پارتییان ژ لایەکی و ل ناڤبەرا نەتەوەپەروەرێن بەعسی و ئیخوان مووسلمین و یێن دی ژ لایەکێ دیڤە یا زێدە دبیت)، وێ راپۆرتێ دیار کر ژی کو پتریا خەلکێ مووسل لایەنگریا لایەنێن نەتەوەپەروەریا عەرەبی دکەن(٤٧).

دەمێ چالاکیا (پیلانگێڕان) زێدە بووی و کۆدەتا نێزیك بووی، لیژنا ناڤخۆیا پارتا کۆمۆنیست ل مووسل ل رۆژا ٢٣ کانوونا دووێ یا ١٩٥٩ێ بەیانەك ئاراستەی جەماوەرێ باژێری کر و هۆشداری دا ژ روودانا وێ بزاڤێ و دزینا دەسکەڤتیێن شۆرشێ، هەروەسا سەرکردایەتیا ناڤخۆیی یا پارتا نیشتمانیا دیمۆکراتی ل مووسل هۆشداری دا بەغدا ژ رەهەندێن وێ لڤینا لیوا پێنج ل بەرە بکەت(٤٨).

د وێ رەوشێ دا پارتا كۆمۆنیستا عیراقی و بزاڤا پشتەڤانێن ئاشتیێ (حركة انصار السلام) ل رۆژا ٦ی ئادارا ١٩٥٩ێ فیستەڤالا پشتەڤانێن ئاشتیێ ل مووسل ساز كر، ب راستی ژی فیستەڤال بێ روودانا چو ئالۆزیان ب رێڤە چوو، لێ دگەل هندێ ژی نەتەوەپەروەرێن عەرەب هندەك ئالۆزی پەیداكرن و كۆمونیست ئازراندن، ئینا لەشكەر ـ ل دووڤ پلانەكێ ـ رژیا سەر جادێن باژێری و ل رۆژا ٧ی ئادارێ هاتن وچوون قەدەغە كر، دەستەلاتێ ژی ٦٠ سەركردێن كۆمۆنیست و پارتی و ١٤ ئەفسەر دەستەسەر كرن كو پێنج ژ وان كورد بوون و سێ ژ وان خەلكێ بادینان بوون كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ بوون: جەمیل محەمەد مستەفا (ژ دهۆك)، رەشید سندی و نوری سەعدالله (ژ زاخۆ) و كۆدەتاچیان هەماهەنگی دگەل عەشیرەتا شەمەر یا عەرەبی و هژمارەكا سەرۆك عەشیرەتێن كورد كربوو، نەخاسمە ل دەڤەرا ئاكرێ داكو هاریكاریێ دگەل وان بكەن.

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەو بوو، بزاڤ ل سپێدەیا رۆژا ٨ ئادارا ١٩٥٩ێ هاتبوو كرن و كۆدەتاچی نەشیابوون كۆنترۆلێ ل سەر باژێری و یەكەیێن لەشكەری یێن لیوا پێنج بكەن، ئینا شەواف ل رۆژا ٩ی ئادارێ هاتە كوشتن و هژمارەكا زۆر یا تاگرێن وی رەڤینە سوریا و دەستەلاتێ ژی یێن مایی گرتن و رەوانەی بەغدا كرن[٤٩].

كورد ل دژی بزاڤا شەواف راوەستیان و پشتەڤانیا حكۆمەتا بەغدا كرن بۆ ژ ناڤبرنا وێ، چونكی سەركەفتنا وێ بزاڤێ د بەرژەوەندیا واندا نەبوو، چونكی پتریا كۆدەتاچییان ئەفسەرێن نەتەوەپەروەرێن عەرەب بوون و هژمارەكا ئاغایێن كوردێن دژی بزاڤا نیشتمانپەروەریا كوردی پشتەڤانی لێ دكرن، ئەڤە سەرباری هندێ كو بەیانەكا ئێكێ یا بزاڤێ یا ڤالا بوو ژ ناڤێ كوردان و مافێن وان یێن نەتەوەیی، هەژی گۆتنێیە وانەبێژ (مدرس)ێ كورد عەبدوللا محەمەد هەولێری كو ئێك بوو ژ سەركردێن كۆمەلا ئیخوان مووسلمین ل مووسل ئەو بەیان وەرگێرابوو و ب زمانێ كوردی ل ئیزگەی خواندبوو[٥٠].

دڤێت وێ چەندێ ژ بیر نەكەین كو دژایەتیا كوردان بۆ بزاڤا شەوافی ل سەر داخوازیا حكۆمەتێ و ل سەر داخوازیا پارتی ژی بوو یا پشتەڤانیا حكۆمەتێ دكر، ئەڤە سەرباری داخوازیا پارتا كۆمۆنیستا عیراقێ و داخوازیا عەقید تاها بامەڕنی سەركردێ بەرگری مللی ل عیراقێ بوو، ڤان گازیان داخواز ژ كوردان دكرن بۆ پاراستنا كۆمارێ، پشكداریێ د بەرسینگگرتنا بزاڤێ و ڤەمراندنا وێ دا بكەن[٥١]. كورد ل دەڤەرا بادینان ژی ل دژی بزاڤ كۆدەتایا شەواف راوەستیان، هەر بۆ نموونە، ل قەزا ئاكرێ ئەفسەرێن سەربازگەها وێ بەری دەستپێكرنا بزاڤێ پەیوەندی ب هژمارەكا سەرۆك عەشیرەتێن دەڤەرێ كرن بۆ مسۆگەركرنا پشتەڤانیا وان، ئینا هژمارەكا ئاغایێن زێباری و مەزنێن سوورچی پەیوەندی ب پێشكار روكن(موقەددەم روكن) عەلی تەوفیق فەرماندێ سەربازگەهێ كرن و رازی بوون هاریكاریێ دگەل بكەن[٥٢].

ل دووڤ وێ پلانا كۆدەتاچییان دانای داكو ئەفسەرێن پشتەڤانێن بزاڤێ پۆستێن گرنگێن لیوا پێنج وەرگرن، پێشكار عەلی تەوفیق ل رۆژا ٢ شواتا ١٩٥٩ێ بۆ سەربازگەها ئاكرێ هاتبوو ڤەگوهاستن، لیژنا ناڤخۆیا پارتی سەرەدانا وی كر و پیرۆزباهی لێ كر ب هەلكەڤتا وەرگرتنا وی پۆستێ نوو ژ لایێ وی ئەفسەری ڤە و داخواز ژێ كر هاریكاری و هەماهەنگیێ ل ناڤبەرا هەردوولا بكەت، لێ هێشتا هەیڤەك نەبۆری، وی ئەفسەری گازی ئەندامەكێ لیژنا ناڤخۆ كر و پرۆپاگەندا وێ چەندێ كر كو لیژنێ ل بەرە خانیێن ئەفسەران گوللەباران بكەت، لێ ئەڤە تشتەكێ راست نەبوو، بەلكی پلانەك بوو بۆ كۆنترۆلكرنا باژێری دەمێ بزاڤ ل مووسل دەست پێ دكەت، گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ ئەوە، پێشكار عەلی تەوفیق رۆژەكێ بەری دەستپێكرنا بزاڤێ هۆشدارییەك ل وێ بەتالیۆنێ راگەهاندبوو وەك رێخۆشكرن بۆ كۆنترۆلكرنا سەربازگەهێ و ئەڤە خۆئامادەكرن بوو بۆ هەر هێرشەكا دبیت پارتی و كۆمۆنیست بكەن دەمێ بزاڤ دهێتە راگەهاندن، ئەو

ب ڤێ چەندێ ب تنێ رانەوەستییا، بەلکی ل ئێڤاریا رۆژا ٧ى ئادارا ١٩٥٩ێ ١٧ پلەدار و سەربازێن پارتی و ١٢ کەسێن دی ژ کۆمۆنیست و پارتی یێن خەلکێ باژێری دەستەسەر کرن کو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ بوون، ژ پارتییان : عەلائەددین سەعید، سەلاحەددین رەشید، سعود تاهر ، مام عەلی سەلیم، عەزیز فازل، سادق مستەفا، ژ کۆمۆنیستان: شاکر عەزیز، سەلاح ئەلحافز، حەمید میرزا، عەبدولکەریم نازۆ، سیرۆب یوسف و عەبدلرەحمان عەبدوللا، ئەڤە هەمی دەستەسەرکرن و رەوانەی مووسل کرن[٥٣].

دەمێ بزاڤ ل سپێدەیا رۆژا ٨ى ئادارا ١٩٥٩ێ هاتییە راگەهاندن، پێشکار (المقدم) عەلی تەوفیق پەیوەندی ب هندەك سەرۆك عەشیرەت و زانایێ ئایینی سەعید عەبدلعەزیز کر و داخواز ژێ کر برۆسکێن پشتەڤانیێ بهنێرن، ئینا هەر ئێکسەر ئامادەبوویان ئەو برۆسکە هنارتن، ل سپێدەیا رۆژا ٩ى ئادارێ دووبارە ل بارەگەهێ سەربازگەهێ ئامادە بوون بۆ دەربرینا هەست و هاریکارییێن خۆ بۆ بزاڤێ و پێشنڤێژ سەعید د پەیڤەکا ئایینی دا بۆ سەربازان عەبدولکەریم قاسم پرۆتستۆ کر و گۆت کو وی ژ پرنسیپێن ئایینێ ئیسلامێ لادایە و حکۆمەت بوویە حکۆمەتەکا خرپایا کۆمۆنیست و نامووس و ئایینێ مە کەڤتینە بەر گەفا مەترسییا کۆمۆنیستێ (شیوعی)[٥٤].

هەروەسا ل سەر داخوازیا پێشکاری، فەرمانبەرێن کارگێری ژی ل سەربازگەهێ ئامادە بوون، کو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ بوون: عەبدلجەبار مەحمود (قائیمقام)، فەتاح مەحمود (جێگر و دادگار)، محەمەد نوری سەلیم (ئەفسەرێ سەربازگیریێ)، مەحمود کەمال قادر (هاریکارێ رێڤەبەرێ پۆلیسان)، مەنسور جەرجیس (رێڤەبەرێ خواندنگەها ناڤنجی) و هژمارەکا دی یا مامۆستایان کو نوونەریا خواندنگەهێن ئاکرێ دکرن و رێڤەبەرێن هەردوو ناحیێن سوورچی (بجیل) و نەهلەی (دینارتە)، پێشکاری ل بەرامبەری وان راگەهاند کو ئەو بوویە حوکمدارێ سەربازی ل قەزایێ و داخواز ژ ئامادەبوویان کر پشتەڤانییا (شۆرشێ) بکەن و دیتن وبۆچوونێن خۆ ل سەر دیار بکەن، لێ هەمیان خۆ بێدەنگ کر، ژ بلی قائیمقامی کو داخواز کربوو پەیوەندیێ ب موتەسەرفێ لیوایێ بکەت بۆ زانینا دیتن و بۆچوونا وی، لێ وی چو بەرسڤ وەرنەگرتن، ئەڤە ژی هندەك پارچەنە ژ وێ راپۆرتا وی ل رۆژا ٩ى ئادارا ١٩٥٩ بۆ موتەسەرفییا مووسل هنارتی: سپێدەیا رۆژا ٨ى ئادارێ پێشکار روکن عەلی تەوفیق هندەك کەس ل ئاکرێ دەستەسەر کرن، ژ وانا: رێڤەبەرێ ئامادەییا ئاکرێ، ژمێریارێ باژێرڤانیێ، وانەبێژێ ئامادەییێ، رێڤەبەرێ خواندگەها دووێ یا ئاکرێ و مامۆستایەك، هەروەسا جهێن گرنگێن باژێری داگیر کرن و هاتن وچوون قەدەغە کر، هەروەسا دەمێ سەعەت چوار و نیڤی ئێڤاریا رۆژا ٨ى ئادارێ بەیانا فەرمی ل ئیزگەی ل سەر پیلانگێرانا عەقید عەبدلوەهاب شەواف ب هاریکاریا دەولەتێن بیانی ل سەر سلامەتییا کۆمارێ هاتییە پێشکێشکرن و فەرمانا خانەنشین کرن و دەستەسەکرنا وی هاتییە دان، گەنجێن ئاکرێ خۆنیشاندانەکا ئاشتیانە وەك پشتەڤانی بۆ رێکارێن حکۆمەتێ ساز کر و دەمێ خۆنیشاندەر گەهشتینە رێیا دچیتە سەربازگەهێ، هندەك سەربازان تەقە ل خۆنیشاندەران کر، د ئەنجامدا ئەنوەر حەجی محەمەد و سدقی محیەددین بریندار بوون و هەردوو بۆ نەخۆشخانا کۆماری یا مووسل هاتنە هنارتن.

سپێدەیا رۆژا ٩ى ئادارێ فەرماندێ سەربازگەهێ دا داخوازا ئامادەبوونا قائیمقامی کر، ئینا حاکمێ سزایێن قەزایێ و هاریکارێ پۆلیسان و کۆمەکا فەرمانبەران دگەل وی چوونە وێرێ، فەرماندێ سەربازگەهێ د پەیڤەکێ دا هێرش کرە سەر رژێما حوکمداریێ و گۆت کو شۆرش دێ وەلاتی ژ وان پاقژ کەت، پاشی ئەفسەر هاشم دەبونی برۆسکەیێن پشتەڤانیێ یێن سەرۆك عەشیرەتێن پشتەڤانێن بزاڤێ خواندن کو ناڤەرۆکا وان ئەڤا خوارێ بوو: (ئەم سەرۆك عەشیرەت سۆزێ ددەینە خودێ کو بەردەوام بین بۆ بجهئینانا ئارمانجێن وە و دێ ب هەمی شیانێن خۆ پشتەڤانیا وە کەین)، قائیمقامی

ژی بزاڤ کر پەیوەندیێ ب موتەسەرفی بکەت، لێ سەرکار(رەقیب)ێ سەربازی رێ نەدا هێلێن تێلەفۆنێ بێنە ڤەکرن، لێ دەمێ بەیانا فەرمی یا ژ ناڤبرنا شەوافی هاتیە بهیستن، تەناهی ل سەرانسەری دەڤەرێن قەزایێ بنەجهـ بوو[55].

دەمێ ل سپێدەیا ٩ی ئاداری بەیانا فەرمی ل سەر کوشتنا شەواف و ژ ناڤبرنا بزاڤێ هاتیە پێشکێش کرن، ورەیێن پێشکار عەلی یونس هەرفین و فەرماندا فەرمانێن وی بێنە هەلوەشاندن و برۆسکەیەکا پشتەڤانیێ بۆ عەبدولکەریم قاسم هنارت، لێ ل بن گڤاشتنێن سەرباز و پارتی و کۆمۆنیستێن خۆنیشاندەر، هاریکارێ وی نەچاربوو جەبلخانا چەکی ڤەکەت کو خۆنیشاندەران کۆنترۆل کربوو، ئینا فەرماندێ سەربازگەهێ و هژمارەکا ئەفسەران بەرەڤ مووسل رەڤین، لێ پتریا وان ب رێڤە هاتنە گرتن و رەوانەی بەغدا کرن، جەماوەرێ ئاکرێ ژی ئەفسەرێن دی یێن نەتەوەپەروەرێن عەرەب دەستەسەر کرن کو نەشیابوون برەڤن و هژمارا وان ١٤ ئەفسەر بوون و رۆژا ١٠ی ئاداری هەمی بۆ کەرکوك هاتنە رەوانە کرن و تنێ ئەفسەرەکێ ب پلا پێشەنگ(نەقیب) ب ناڤێ حسێن عەلوان هاتە کوشتن و تەرمێ وی رادەستی کەس وکارێن وی هاتە کرن[56].

کۆمۆنیست و پارتییان باش دەستێ خۆ دانانە سەر سەربازگەهێ و باژێری و خۆنیشاندانێن پشتەڤانییا شۆرشێ دەرکەڤتن و درووشمێن پشتەڤانیکرنا عەبدولکەریم قاسم و مەلا مستەفا بارزانی و پارتی و پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ و دیمۆکراسیێ و ئاشتیێ بلند بوون، ئاغا ئەوێن هەڤسۆز دگەل شەواف غەوارە بوون و هندەکان ژێ قەستا مووسل کرن، لێ هندەکێن دی ژ لایێ دەستەلاتێ ڤە هاتنە دەستەسەرکرن و ژ دەڤەرێ هاتنە دوورئێخستن، بۆ زانین ژێ، وان چو بزاڤ نەکرن دەمێ شەواف دەست ب بزاڤا خۆ کری، ژ ترسا هندێ جەماوەر دارسیێتێ و دەستێ خۆ لێ بلند بکەت[57].

هەروەسا ژ بەرکو کۆمارا عەرەبییا ئێککرتی ل پشت پلاندانان و هاندانا سەرهلدانا وێ بزاڤا ل مووسل بوو، ئەفسەر و پلەدارێن سەربازگەهێ، پشتی سەرنەکەڤتنا بزاڤێ، برۆسکەیەك ب ئیمزا ٦٦٦ کارمەندان بۆ بالیۆزخانا وێ یا ل بەغدا هنارت و تێدا کریارێن فاشستی پرۆتستۆ کرن یێ کۆمار ئەنجام ددەت و پەیمان دانە خودێ و خۆ بەرەڤانیێ ژ کۆمارا عیراقێ یا دیمۆکراتیا مللی و (رێبەر) عەبدولکەریم قاسم بکەن[58].

لێژنا بەرەیێ ئێکەتیا نیشتمانی ژی ل باژێری بەیانەك ئاراستەی جەماوەرێ ئاکرێ کر و داخواز ژێ کر کاری بۆ پاراستنا کۆمارێ بکەن و ل دۆر رێکخراوێن دیمۆکراتی خرڤە ببن، هەروەسا داخواز ژێ کر گەلەك هشیاری بەرمایکێن پیلانگێر و کەڤنەپەرێس و دەرەبەگان ببن یێن گۆتگۆتکان بەلاڤ دکەن کو ئارمانج ژێ پەیداکرنا ئالۆزی و نەرحەتیێ بە د دەروونێ هەڤوەلاتیان دا و پێکۆلەکە بۆ لادانا شۆرشێ ژ رێبازا وێ یا دیمۆکراتی[59].

لێ تشتێ پەیوەندی ب قەزا شێخان ڤە هەی، ب سەدان چەکدارێن کورد چوون بۆ بەرسینگگرتنا بزاڤا شەواف ل مووسل و تەحسین بەگێ میرێ ئێزیدخانێ رۆژا ١٠ ئاداری برایێ خۆ خێری بەگ ب سەرۆکاتیا هێزەکا عەشیرەتان هنارتە مووسل، ئەو ژی ل شێخان ما و چەکدار ل سەر رێ و رێبار و جهێن مەترسی ل سەر هەبن بەلاڤ دکرن، پاشی ئەو ب خۆ ژی ئێڤاریا وێ رۆژێ دگەل هێزەکێ قەستا مووسل کر بۆ هاریکاریا شەرکەرێن کورد دژی بزاڤا شەواف[60].

هەروەسا خەلکێ ئامێدیێ، ژ بلی هژمارەکا ئاغا و فەرماندێ سەربازگەهێ، خۆ دانە دگەل حکۆمەتێ بۆ بەرسینگگرتنا بزاڤێ و کۆمۆنیست و پارتییان کۆنترۆل ل سەر رەوشێ کرن و قائیمقام و فەرمانبەرێن پشتەڤانێن شەواف دەستەسەرکرن و حەجی تاها عەبدلعەزیز خۆ وەك حوکمدارێ باژێری سەپاند، لێ تشتێ ژ ڤێ گرنگتر وان چو دەستەسەرکری نەکوشتن، بەلکی ب پارێزڤانیا ئەحمەد حەجی عەبدللەتیف رادەستی دەستەلاتێن مووسل کرن، ل

دەڤەرا بەرواری بالا ژی رێکخستنێن پارتا کۆمۆنیست کۆنترۆل ل سەر رەوشا کانی ماسێ یا سەنتەرێ ناحیێ کرن و داخواز ژ پۆلیسێن نەجهێ باوەریێ کرن قەستا مالێن خۆ بکەن[٦١].

هەروەسا سەربارێ رەوشا نەخۆش یا سەقای و بەفرا زۆر یا باری، ب دەهان چەکدارێن پارتی و کۆمۆنیستێن ئامێدیێ قەستا مووسل کرن بۆ ڤەمراندنا بزاڤا شەواف، ژ وانا: موحسن سالح عەبدلعەزیز، ئیحسانێ برایێ وی، کەمال رەشید، نعمان حەجی ئەمین و یێ داویێ بارەگەهەك ل مووسل ڤەکر بۆ تۆمارکرنا ناڤێن خۆبەخشان و محەمەد سالح سویاری، عەگید سەدیق، ئەحمەد حەجی شەعبان، سەعیدێ برایێ وی و زەلامێن وان، شەرکەران ژ دەڤەرا بەرواری بالا، نەخاسمە ژ گوندێ هرۆرێ پشکداری کرن، ژ دەڤەرا بامەرنێ ژی هەر ئێك ژ حەسەن مراد، حەسەنێ ستیێ، سەلمان عەبدوللا، نوری حەسەن چوونە مووسل و ئەنوەر مایی کو وی دەمی ل مووسل بوو و ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی رۆلێ خۆ د خرڤەکرنا پشتەڤانان دا بۆ حکومەتێ هەبوون بۆ بەرسینگگرتنا بزاڤێ، هەروەسا عەقید تاها مستەفا بامەرنی سەرکردێ گشتیێ بەرگری مللی ل عیراقێ، گازیەك ئاراستەی پێشرەو(رائد)ێ کۆمۆنیست مەهدی حەمید سەرکردێ گشتیێ بەرگری مللی ل دەڤەرا باکوور کر داکو شیانێن خۆ بۆ ڤەمراندنا بزاڤێ ب کار بینیت و سەرکردێ وێ دەستەسەر بکەت، هەروەسا ئەحمەد ئەسعەد بامەرنی زاڤایێ تاها بامەرنی/ خودانێ ئۆتێلا (بغداد) ل مووسل خزمەتێن پرپها پێشکێشی کەسانێن دژی بزاڤێ کرن و دەرگەهێن ئۆتێلا خۆ بۆ شەرکەرێن کوردێن بادینان ڤەکربوون و گیانێ خۆ گۆری ڤی هەلویستێ خۆ کر و ناڤبری ل چریا ئێکێ یا سالا ١٩٦١ێ ل جهێ خۆ ب دەستێ هندەك نەتەوەپەرێسێن عەرەب هاتە تیرۆر کرن[٦٢].

لێ ل دهۆك، پشتەڤانیا خەلکێ وێ بۆ حکومەتێ و بۆ بەرسینگگرتنا بزاڤا شەواف توندوتیژی ژێ پەیدا بوو و د وان رووداناندا عەبدوللا حەسەن جبوری و نۆژدار سەعدەددین چەلەبی و کۆمیسەرێ بنگەهێ پۆلیسان قاسم یەحیا خەشاب هاتنە کوشتن، هەرچەندە ژی قائیمقامی پشتەڤانیا خۆ بۆ حکومەتێ و نەرازیبوونا خۆ ژ بزاڤێ دەربڕیبوو، لێ ژ بەر هەلویستێ وی یێ هەڤدژێ بەرێ، هژمارەکا کۆمۆنیست و پارتیان رژدی ل سەر گرتنا وی و هژمارەکا فەرمانبەرێن کارگێری کرن، ژ وانا: مستەفا فوئاد، رەفیق شەفیق، ئەحمەد حەجی حسێن، مامۆستا سلێمان داود سەرحان و مامۆستا فازل حەمید سەراف کرن و هەمی ژی جهێ ل بێنڤەدانێ یا رێڤەبەریا بازێرڤانیێ (ل گازینۆیێ) دەستەسەر کرن.

هەروەسا ب دەهان شەرکەر ب سەرکردایەتیا عەبدلعەزیز حەجی مەلۆ چوونە مووسل بۆ بەرسینگگرتنا بزاڤا کۆدەتایێ و دگەل شەرکەرێن دی یێن بادینان هێزێن خۆ ل تل قوینجق(قاینجۆ) ل نێزیك مووسل ئاکنجیکرن و هندەکان ژی هندەك خانیێن دەڤەرا فەیسەلیێ کرنە بارەگەهێ خۆ و پشکداری د کۆنترۆلکرنا کنارێ چەپێ یێ بازێری دا کرن، ل رۆژا نەهی ئادارا ١٩٥٩ێ ژی عەبدلعەزیز حەجی مەلۆ پەیڤەك بۆ هژمارەکا زۆر یا وەلاتیێن دەڤەرێ پێشکێش کر و تێدا هێرش کرە سەر سەرۆکێ مسری جەمال عەبدلناسر و ئەو ب هاندەرێ بزاڤێ ل قەلەمدا.

مامۆستا عەبدلرەحمان زاویتەیی ژی سپێدەیا رۆژا ٩ی ئادارێ پەیوەندی ب ئەحمەد حەمزە رێڤەبەرێ ناحیا سێمێلێ کر و داخواز ژێ کر ل دهۆك ئامادە ببیت، دەمێ ئامادەبووی قائیمقامی داخواز ژێ کر چارەسەریەکێ بۆ رەوشێ ببینیت، ئینا پەیوەندی ب فەرماندێ بنگەهێ پۆلیسێن دهۆك و قائیمقامێ زاخۆ کر ڤێ رەوشێ چارە بکەت، ژ بەر هندێ قائیمقامێ زاخۆ شاندەکێ ماقوول و زانایێن ئایینی هنارت بۆ بژالەکرنا خۆنیشاندەرێن جهێ بێنڤەدانێ دووریێچ کربوون و هەر وێ سپێدێ هەمی دەستەسەرکری هاتنە ئازاد کرن، ژ بلی قائیمقامی و نۆژداری و کۆمیسەرێ بنگەهێ پۆلیسان، ئێڤاری ژی دەمێ دەنگ و باسێ کوشتنا شەواف گەهشتی،

خۆنیشاندەران بڕیاردا ب سەر ئاڤاهی دا بگرن و هەرسێ دەستەسەرکریان بکوژن، هەرچەندە زانایەکێ ئایینی و هژمارەکا کەسێن بەرنیاس پێکۆل کریوون نەهێلن ئەو هەرسێ کەس بێنە کوشتن، لێ هاتنە کوشتن و تەرمێن وان بۆ مووسل هاتنە هنارتن، دو رۆژان پشتی وی روودانێ، خێزانا قائیمقامی ب پارێزڤانییا نەبی محەمەد جەرگیس و هژمارەکا دی یا چەکداران بۆ مووسل هاتە ڤەگوهاستن.

هەرچەندە حوکمدارێ سەربازیێ گشتی لیوا روکن ئەحمەد سالح العبدی ل رۆژا ٢٤ کانوونا ئێکێ ١٩٥٩ێ نڤیسارەك بۆ رێڤەبەریا پۆلیسێن مووسل نڤیسی بوو و تێدا گۆتبوو: ئەو کریارێن وەلاتییان کرین بۆ سەرکوتکرنا فتنەگێڕیا شەوافێ خایین ل مووسل کو بەری سەعەت ١٢ رۆژا ١٢ ئادارا ١٩٥٩ێ هاتبوو روودان، چ مەرەم پێ نەبوون ژ بلی هاریکاریا دەستەلاتێ بۆ سەرکوتکرنا وێ بزاڤێ، ژ بەر هندێ، بڕیار هاتە دان دووڤچوونێن یاسایی دەرهەقێ وان بێنە راوەستاندن و دەملدەست یێن دەستەسەرکری بێنە ئازاد کرن، لێ ئەڤ بڕیارە ژ وان کەسان ناگریت یێن ل دهۆك ب گونەهباریا کوشتنا قائیمقامی و نۆژداری و کۆمیسەرێ بنکەهێ پۆلیسان هاتینە گونەهبار کرن، کو ئەو ژی ئەڤەنە: عەبدلرەحمان تاهر بادی دۆسکی، رەشید سەعید دۆسکی، ناجی محەمەد بالەتەیی، محەمەد سالح ئیبراهیم، عەبدلرەحمان سەلیم (مامۆستا)، نەبی محەمەد جەرگیس، عەبدوللا حەجی گەرماڤی (مامۆستا)، عەبدلعەزیز محەمەد قازی ، محەمەد مستەفا سۆفي ستی، باپیر مستەفا عەبدلرەحمان، ئەحمەد ئیبراهیم عەلی دەللال، عوبەید کەریم سەلیم حەللاق، حسێن حەجی حەسەن ئاکرەیی (وانەبێژ)، خێری نەشئەت تاهر عەباسی (مامۆستا) و عیسا مەلا سالح مەحمود (سەرباز)[٦٣].

دادگەهێ ژی ل رۆژا ٢٦ی نیسانا ١٩٦١ێ بڕیاردا: عەبدلرەحمان سەلیم، عیسا مەلا سالح و خێری نەشئەت تاهر بێنە سێدارەدان و هەیڤا تیرمەها ١٩٦٣ێ ئەو حوکم ب ئەشکەرایی ل دهۆك ب سەر یێ ئێکێ و دووێ هاتە ب جهئینان، لێ یێ سییێ شیا بڕەڤیتە ئێکەتیا سۆڤیەتییا بەرێ[٦٤] و هەر ئێك ژ: عەبدلرەحمان بادی، حسێن ئاکرەیی، عوبەید حەللاق، محەمەد سالح ئیبراهیم و باپیر مستەفا هاتنە ئازاد کرن و حوکمێن جودا جودا ژی ل سەر هەر ئێك ژ ئەڤێن ناڤێن وان ل خوارێ هاتنە دانان: کارێن گرانێن هەتایی ب سەر عەبدوللا حەجی گەرماڤی، کارێن گران بۆ ماوێ ١٥ سالان ب سەر عەبدلعەزیز محەمەد قازی، کارێن گران بۆ ماوێ ٧ سالان ب سەر رەشید سەعید دۆسکی، و حەبسا شدیای بۆ ماوێ ٦ سالان ب سەر هەر ئێك ژ: محەمەد مستەفا سۆفي ستی، ناجی محەمەد مەحمود بالەتەیی، زیندانکرنا شدیای بۆ ماوێ دوو سالان ب سەر نەبی محەمەد جەرگیس کو پشتی حوکمێ وان ب داوی دهێت، هەمی بۆ ماوێ سالەکێ ل بن چاڤدێریا پۆلیسان بن و هەردوو بێنە نەچارکرن گوژمێ ١٢٠٠ دیناران بدەن وەك قەرەبوو بۆ خێزانا قائیمقامی و کۆمیسەرێ بنکەهی[٦٥].

ب راستی، ئەو تشتێ ل دهۆك وەك زێدەگاڤی ل سەر یاسایێ و تەناهیێ هاتیە روودان، تشتەکێ (عەفەوی) بوو و پلان بۆ نەهاتبوو داڕێتن و جهێ رازیبوون و پشتەڤانییا پتریا خەلکێ بادینان نەبوو، هەتا گەلەك ژ ریهسپی و ماقوولێن دهۆك پێکۆل کرن هەرسێ قوربانییان رزگار بکەن و هەر ئێکێ ژ خۆ بترسیت بپارێزن، هەر بۆ نموونە، سەعید موفتی خانیێ خۆ کربوو پەناگەهەك بۆ هەر کەسێ ترسەك د دلی دا هەی، هەرەوەسا حسێن حەجی حەسەن ئاکرەیی شیانێن خۆ ب کار ئینان رێ ل خۆنیشاندەران بگریت ب سەر گازینۆیێ دا نەگرن، لێ یا ژ خۆ بوو.

هەروەسا د بڕیارا تاوانبارکرنێدا و د دەمێ ڤەکۆلین و گەنگەشەکرنێدا هاتبوو کو خەلکێ جوامێرێ دهۆك یێ (ئەڤ تاوانە) ل قەزا وان چێ بووی، نەڕازیبوونا خۆ ژ وی تشتێ هاتییە روودان دەربڕییە و مخابنییا خۆ ل سەر ئەنجامێ وێ روودانێ دیار کرییە[٦٦].

هەروەسا دەمێ دیدەڤانەکا روودان دیتین ڤیای خرابیێ بگەهینیتە کوردان و پارتی، لیژنا ناڤخۆیا

پارتی ل دهۆك بەرسڤا وێ دا و گۆت: دیدەڤانییا وێ ئاخڤتنەکا چێکری و نەوەیی یە و ئەوێ خرابی کری چ پەیوەندی ب پارتی ڤە نینە، یان ژی دیدەڤانییا وێ مەرەمەك پێ هەیە و درەوە و (پارتا مە چەندین جاران رێنما و شیرەتێن خۆ ئاراستەی ئەندام و لایەنگر و هەمی ئەوێن باوەری ب رێبازا پارتی هەبن کرینە ... بۆ رێزگرتنا سەروەرییا یاسایێ و بنەجهکرنا تەناهی و سیستەمی و هاریکارییا تمام دگەل دەستەلاتێن نیشتمانی ... و هەڤالێن پارتا مە دەمێ پیلانگێڕییا شەواف هاتییە روودان، ب گەرمی و دلسۆزی و ب گیانێ ل خۆبۆرینێ، گازییا رێبەرێ رزگارکەر و هەلکەرێ شۆڕشا ١٤ی تیرمەهێ ب جهـ ئینانینە

کربوو و حەمزە عەبدوللا و سالح یوسفی بوون یێن ب کریار قەزا ب رێڤەدبر، هەتا عەقید سەلمان فەرماندێ سەربازگەها سەربازی ل نك عەبدلکافی عارفێ موتەسەرفێ مووسل سکالایەك ل دژی وان توومار کربوو، هەروەسا دەمێ بزاڤا شەواف روودای، پارتی و کۆمۆنیست بەرەڤ قائیمقامیێ خشیان و دووربێچ کر و داخواز ژ قائیمقام سالم ئەلئەسوەد کر هەلویستێ خۆ رۆهن بکەت، ئینا پشتەڤانییا خۆ بۆ عەبدولکەریم قاسم دەربڕی، لێ دگەل هندێ ژی خۆنیشاندەرێن سالح یوسفی و نعمان عیسای (هاریکارێ نڤیسەرێ نڤیسینان) سەرکێشییا وان دکر و زێرەڤانییا تێلەفۆن و بێتێلێ کرن، ئەڤە ژی




و چەك هەلگرتینە و قەستا مووسل کرینە بۆ ڤەمراندنا دەنگێ کەڤنەپەرێسیێ، و ئیفادێن هۆسا نیشانا وێ کەرێ یە یا د دلێ کەڤنەپەرێسان دا هەی).

لێ ل زاخۆ، پارتی ب تمامی کۆنترۆل ل سەر رەوشێ

پشتی قائیمقامی د برۆسکەیەکێ دا پشتەڤانییا خۆ بۆ حکۆمەتێ دەربڕی[١٧].

دەمێ رادیۆیا بەغدا داخواز ژ عەشیرەتێن کورد کری قەستا مووسل بکەن بۆ بەرسینگگرتنا بزاڤا شەواف، خۆنیشاندەران داخواز ژ قائیمقامی کر

ترۆمبێل و چەکی بۆ دابین بکەت، وی ژ نەچاری ئەو داخوازی ب جهئینا، لێ وی سەرباری هندێ و ب بەهانا وێ چەندێ کو خۆنیشاندەران ل بەرە وی بکوژن، داخوازا پارێزڤانیێ ژ مووسل کر و دەمێ داخوازیا وی نەهاتیە ب جە ئینان، قائیمقامی پەیوەندی ب لیوا روکن عەلائەددین مەحمود موتەسەرفێ هەولێرێ کر، هەرچەندە ژی زاخۆ ژ لایێ کارگێری ڤە سەر ب مووسل بوو، لێ موتەسەرفێ هەولێر ل سەر بەرپرسیاریا خۆ لقەکا(سریەکا) پۆلیسان ب سەرکردایەتیا ئەفسەر محەمەد شێخ رەشید بۆ هنارت و ئەو لق رۆژا ٩ ئادارا ١٩٥٩ێ لڤی و ئێڤاریا وێ رۆژێ گەهشتە زاخۆ، ئەو پۆلیس پارتی بوون و هژمارا وان پازدە پۆلیس بوون و هەمی گەهشتبوونە ناڤ رێزێن خۆنیشاندەران و کەس دگەل قائیمقامی نەمابوو، ژ بلی هاریکارێ وی خەلیل جحێشی و کۆمیسەرێ بنکەهی کو خەلکێ مووسل بوو[٦٨].

پشتی کوشتنا شەوافی و دامەزراندنا عەقید روکن حەسەن عەبود وەك فەرماندێ بنکەهێ مووسل، قائیمقامی پەیوەندی پێ کر، وی دوو فرۆکە هنارتن و هەردوو فرۆکە ل هنداڤی خۆنیشاندەران زڤڕین، هەروەسا پۆلەکا (رەعیلەکێ) زرێپۆشان گەهشتە زاخۆ، ژ بەر هندێ، خۆنیشاندەران خۆ ڤەکێشا، لێ هندەك چەکداران هێرش کرە سەر خانیێ حاجی ئاغایێ بنەمالا شەمدینی کو ل سەرەمێ شاهینیێ پەرلەمانتار بوو، خۆنیشاندەران ترۆمبێل و خانیێ وی[٦٩] سۆتن و بنەمالا شەمدین نەچار بوو قەستا مووسل بکەت.

پشتی ڤەمراندنا بزاڤا شەواف هژمارەکا تەرمێن وان کەسان گەهشتنە زاخۆ یێن چووینە مووسل بۆ بەرسینگگرتنا وێ بزاڤێ، د رێ ورەسمەکێ بەهیداریێ دا و ب ئامادەبوونا قائیمقامی ل گۆرستانێ هاتنە ڤەشارتن، هەروەسا بۆ پاراستنا گیانێ فەرمانبەرێن عەرەب ل بازێری، حەمزە عەبدوللا داخواز ژ قائیمقامی کر وان فەرمانبەران دوور بێخیت، ئینا شەش ژێ



**عەگید سەدیق ئامێدی**

هنارتنە مووسل[٧٠]، پشتی هنگی ژی دیار بوو کو جەلال ئەحمەد سالح خەلکێ ناحیا گولی (باتویفا) کو وەك کرێکار ل مووسل کار دکر، پشکداری د بەرسینگگرتنا بزاڤێ دا کریە و رۆژا ٩ی ئادارێ ب هندەك گوللەیان بریندار بوویە، هەر ژ بەر هندێ بوویە پەککەڤتی[٧١] و ئەفسەرێ زاخۆیی جەمیل سالح درسن ل رۆژا ١٠ ئادارا ١٩٥٩ێ ژ لایێ پشتەڤانێن بزاڤێ ڤە هاتە کوشتن، هەروەسا شێخ جەمال بریفکی و عەمەر یوسف محەمەد (عەمەرێ لەعلێ) ژ وان بوون یێن چووینە مووسل بۆ روو ب رووبوونا بزاڤا شەواف[٧٢]، دیسا وی دەمی سەرباز عسمەت دینۆ بەنستانی رۆلەکێ گرنگ د ڤەگوهاستنا دەنگ وباسێن پلاندانانا بزاڤێ دا هەبوو بۆ رێکخستنا پارتی ل مووسل و پاشی پشکداریکرن د بەرسینگگرتنا وێ بزاڤێ دا و ئەو و عەلی رەمەزان ئەحمەد بێتاسی، ئەنوەر دەروێش زاخۆیی و سەیدۆ حامد چەلکی هەر



**مەلا خەلیل سلێمان ١٩٠٠ - ٢٠٠٧**

ئێك ژ وان ب پێنج سالێن زیندانکرنێ هاتنە حوکم کرن[٧٣].

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە ل دەمێ بزاڤا شەواف و پشتی هنگی ژی چو کارێن توندوتیژی و کوشتنێ ل زاخۆ نەهاتنە روودان، چونکی چەکداران گوهداریا سەرکردایەتیێن خۆ دکرن، هەتا ئەو ئاغایێن ب هەڤسۆزیێ دگەل شەواف هاتینە گونەهبار کرن و پشتی بزاڤێ هاتینە گرتن و بۆ دادگەها سەربازیا کەرکوك هاتینە رەوانە کرن، ژ بەر نەبوونا گرۆڤێن پێدڤی بۆ گونەهبارکرنا وان، هاتنە ئازاد کرن[٧٤].

ژ ئەنجامێن ئەرێنی یێن پشتەڤانیکرنا دەڤەرا بادینان ل حکۆمەتێ بۆ بەرسینگگرتنا بزاڤا شەواف، کۆنترۆلکرنا هەلویستێ سیاسی بوو ژ لایێ رێکخستنێن پارتی و پارتا کۆمۆنیستا عیراقی ڤە ب ئاوایەکێ کاریگەر ل سەر کارگێری و عەشیرەتان ژی، نەخاسمە پشتی پاشداچوونا دەستەلاتا ئاغایان ل دەڤەرێ، چونکی گەلەك ژێ هاتبوونە گرتن یان ژی ل دەڤەرێ نەمابوون و چووبوونە مووسل، تشتێ ژ ڤێ گرنگتر ژی، دەستەلات ل نیسانا ١٩٥٩ ێ رازی بوو رۆژناما (خەبات) زمانحالا پارتی ب ئەشکەرایی ل بەغدا دەربکەڤیت و ل رۆژا ٧ ی گولانا ١٩٥٩ ێ رازی بوو ئێکەمین رۆژنامە ب هەردوو زمانێن عەرەبی و کوردی ب ناڤێ الحقيقة (راستی) ل مووسل دەربکەڤیت و هەردوو ئەندامێن پارتی مەلا ئەنوەر مایی و پارێزەر جەرجیس فەتح الله ب دەرئێخستنا وێ رۆژنامەیێ رابوون، هەروەسا مەلا حەمدی سەلەفي ئێك ژ گرنگترین کارگێرێن وێ بوو[٧٥].

ل داویا ڤێ نڤیسینێ، پێدڤییە هەلویستێ بادینان ژ بزاڤا شەواف بێتە رۆنکرن و ئاماژە ب هندێ بێتە کرن کو حکۆمەت ژ پشتەڤانی و پشتگیریا خۆ بۆ هێزێن سیاسی یێن دەڤەرێ لێڤە دبوو و چالاکیێن وان یێن سیاسی سنووردار دکرن و رێ ددا ئاغایان ڤەگەرێنە دەڤەرێ و رێ ددایێ زێدەگاڤیيان ل سەر وەلاتیيان بکەن، هەتا کوشتنا چالاکڤانێن سیاسی ژی نەخاسمە چالاکڤانێن کۆمۆنیست، پاشی دەستپێکرنا دەستەسەرکرن و راهێلانا گرنگترین کەسانێن پشکداری د بەرسینگگرتنا بزاڤێ دا کرین، هەر بۆ نموونە، ل هەیڤا تەباخا ١٩٥٩ێ عەلائەددین سەعید و هژمارەکا دی یا ئەندامێن پارتی ل ئاکرێ ب فەسادی و ئاخڤتنێن ژ درەوێن ئاغایان، ب گونەهباریا جوداخوازیا کوردی هاتنە دەستەسەر کرن و هاشم حەسەن ئاکرەیی بەرپرسێ لیژنا ناڤخۆیا ئاکرێ (مامۆستا)، بۆ قەزا (علي الغربي) ل لیوا عمارە، عەبدلرەحمان عەبدوللا (مامۆستا) بۆ (قرنە) ل لیوا بەسرا، فەهمی رەشید حەسەن (مامۆستا) بۆ شنگال، فائق حەجی شەریف کۆمیسەرێ بکورێ (بەدالێ) بۆ حللە، ابراهيم یاسین (فەرمانبەرێ پۆستەی) بۆ بەسرا هاتنە ڤەگوهاستن و شوکری عەبدوللا (فەرمانبەر) دەست ژ کارێ خۆ بەردا[٧٦]، ل ئامێدیێ ژی عەگید سەدیق (مامۆستا) و ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی (مامۆستا- مدرس) ژ بەر چالاکیێن سیاسی بۆ عمارە هاتنە ڤەگوهاستن، هەروەسا

ئاغایان ل قەزا ئاکرێ و قەزا شێخان ل تیرمەهـ و تەباخا ١٩٥٩-١٩٦٠ێ دەستدرێژی کرنە سەر جۆتیاران و هندەك ژێ کوشتن[٧٧]، قائیمقام ژی دژی چالاکیێن پارتی راوەستیا و مەلا خەلیل سلێمان خابوور (مشەختی) ئەندامێ لیژنا ناڤخۆ و هژمارەکا ئەندامێن دی یێن پارتی دەستەسەرکرن و بۆ دەمەکێ کورت ل کەرکوك زیندان کرن و ئێکسەر دەمێ ئازاد کرین ژی، دەستەلاتێ ڤەگوهاستنە ناڤەراست و باشوورێ عیراقێ، ژ وانا: مەلا خەلیل مشەختی بۆ ناسریێ، حەسەن محێ بۆ دیوانیێ، نوری حسێن بۆ (علي الغربي) و محەمەد خدر بۆ (شطرة) و ئەو نەهاتنە ئازادکرن هەتا راگەهاندنا لێبۆرینا گشتی یا ئادارا ١٩٦٢ێ[٧٨].

ل ئیلۆنا ١٩٥٩ێ ژی ٢١٠ جۆتیارێن هندەك گوندێن سەرسنگێ ئەرزوحالەك ئاراستەی بەرپرسان کر و داخواز ژێ کرن دەستدرێژیێن باندەکا بەرمایکێن پیلانگێرێن هاریکارێن شەواف راوەستینن، یێن دەلیڤە بۆ پەیدا بووی جارەکا دی ب تەناهی بژین و بزاڤێ دکەن گوندهەباریان ب نیشتمانپەروەرێن دلسۆز ڤەکەن و ڤێ داویێ پەنابرینە بەر دەستدرێژیێ بۆ سەر گوندێن تەنا کو د وان دەستدرێژیان دا ژنەك بریندار ببوو و جۆتیارەك هاتبوو کوشتن)[٧٩].

هەروەسا دەستەلاتێ ل مووسل و ئاکرێ زێرەڤانیا چالاکیێن پارتی دکر، هەر بۆ نموونە د نڤیسارا نەپەنیا هاریکارێ پۆلیسێن ئاکرێ هژمارە ١٨٥ یا رۆژا ١٣ی ئیلۆنا ١٩٥٩ێ دا هاتییە کو هژمارەکا پارتیان، ل پێشیا وان ژی نوری سەدیق شاوەیس ئەندازیارێ ئەشغالێن مووسل سەرەدانا ئاکرێ کرینە و ب شەڤ ل مالا تاهر عەبدلخالق دگەل بەرپرسێ پارتی شەوکەت تاهر نڤیسەرێ لیژنا ئاڤ و کارەبێ کۆمبوویە و هەڤپەیڤینێن وان دنهپەنی و ل سەر کاروبارێن پارتێ و چالاکیێن وێ بووینە، د وێ نڤیسارێ دا هاریکارێ پۆلیسێن ئاکرێ داخواز کر شەوکەت تاهر ژ بەر چالاکیێن وی یێن سیاسی بۆ قەزایەکا دی بێتە ڤەگوهاستن، رۆژا ١٧ی ئیلۆنێ ژی موتەسەرفییا مووسل داخواز ژ قائیمقامێن ئاکرێ و دهۆك و ئامێدیێ کر ئەوێن کۆمەلە و نڤیسینگەهـ ب ناڤێ (خەبات) ڤەکرین حەوالەی دادگەهان بکەن داکو سەرا سەرپێچیێن ل سەر یاسایێ کرین ڤەکۆلین دگەل بێتە کرن[٨٠].

سەرۆك عەشیرەتێن ناحیا(حەفت عەشیرەتان-العشائر السبعة) بەردەرەش ژی شیان مەلا عەلی رەسول پێشنڤێژێ مزگەفتا زەنگەنان ڤەگوهێزنە مووسل و ل وێرێ پێکۆلا کوشتنا وی کرن، هەروەسا شیان ژی دەستەلاتێ رازی بکەن عاسم حەجی یەحیا سەرۆکێ کۆمەلا برایینیا جۆتیاران (جمعية الإخاء الفلاحية) ل دەڤەرێ بۆ باژێرێ کوت بێتە دوورئێخستن کو هەردو ئەندامێن چالاکێن پارتی بوون ل دەڤەرێ[٨١].

ئالۆزبوونا پەیوەندییان ل ناڤبەرا هێزێن سیاسی و حکۆمەتا عەبدولکەریم قاسم پشتی بزاڤا شەواف ژ بەر ڤان ئەگەران بوو: بەرفرەهبوونا دەستەلاتا پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ نەخاسمە ژی دەمێ ل رۆژا ئێکی ئەیارێ ب هەلکەڤتا جەژنا جیهانیا کرێکاران داخواز کری پشکداریێ د حوکمی دا بکەت، پرۆتستۆکرنا بلۆککرنا پارتا نیشتمانیا دیمۆکراتی و چالاکیێن وێ یێن سیاسی ب فەرمانا حکۆمەتێ، داخوازکرنا مافێن خۆیێن نەتەوەیی ژ لایێ کوردان ڤە، لێ ل شوونا دەستەلات ڤێ داخوازیێ بجهـ بینیت، کەڤتە دەڤخۆشیکرنێ دگەل ئاغایێن کوردێن نەیارێن بزاڤا نیشتمانیا کوردی، هەتا ل خزیرانا ١٩٥٩ێ لێبۆرینەك بۆ عەشیرەتێن کوردی دا یێن ل سەر حکۆمەتێ پشتەرێ بووین و پەنابرینە بەر ئیرانێ.

دگەل هندێ ژی و بۆ پاراستنا ئێکرێزیا نیشتمانی و پاراستنا کۆمارێ و رێگرتنێ ل بەرامبەری وان هێزێن دڤێن ئالۆزیا ل ناڤبەرا پارتێن سیاسیێن دیمۆکراتی و حکۆمەتێ بۆ بەرژەوەندیا خۆ ب کار بینن، لیژنا بەرەیێ نیشتمانی ل دهۆك ل داوییا خزیرانا ١٩٥٩ێ بەیانەك دەرئێخست و بەرسڤا گۆتگۆتکێن نەیارێن کۆمارێ دا کو ئارمانج ژێ پەیداکرنا فەرتەنێ و چێکرنا تیکەکێ بوو ل ناڤبەرا پارتێن سیاسی و عەبدولکەریم قاسمێ سەرۆکێ حکۆمەتێ، د وێ بەیانێ دا هاتبوو: (ئەی

جەماوەرێ خەباتکەرێ دهۆکێ. د ڤان رۆژان دا گەلێ مە و کۆمارا مەیا دیمۆکراتی یا بەرهنگاری هەوەکا رێکخستی دبیت ژ لایێ ئیمپریالیستێن ئنگلیز و ئەمریکی و هاریکارێن وان یێن کەڤنەپەرێس و دەرەبەگێن گۆتگۆتکێن درەو بەلاڤ دکەن و نەوەییان ل سەر پارتێن نیشتمانپەروەرێن دلسۆز و رێکخراوێن دیمۆکراتی و جڤاکی چێ دکەن، کو ئارمانج ژ ڤان کریارێن کرێت بەلاڤکرنا فەرتەنێ و تێکدانا ناڤ وەدەنگێ پارتێن نیشتمانپەروەر و سستکرنا پێگەهێ وانە، .... ڤێجا گەلی جەماوەرێ دهۆکێ .. ب کرێکار و جۆتیار و قوتابی و رۆشنبیر و کاسبکار و پیشەکار و بازرگان .. ڤە، بەرەڤ هشیاربوون و ئاگەهداربوونێ و داخوازێ ژ وە دکەین د ناڤ بەرەیێ ئێکەتییا نیشتمانی دا رێزێن خۆ بکەنە ئێك و توخیبەکی بۆ وان گۆتگوتکێن کیندار دانن)[٨٢].

لیژنەیا بەرەیێ نیشتمانی ژی ل ئاکرێ ل خزیرانا ١٩٥٩ێ بەیانەك ئاراستەی جەماوەرێ ئاکرێ کر و تێدا داخواز ژێ کر کاری بۆ پاراستنا کۆمارێ بکەن و ل دۆر رێکخراوێن دیمۆکراتی خرڤە ببن و داخواز ژێ کر دهشیار و چاڤ ڤەکری بن ژ بەرمایکێن پیلانگێرێن کەڤنەپەرێس و دەرەبەگێن گۆتگۆتکێن کیندار بەلاڤ دکەن بۆ پەیداکرنا فەرتەنە و ئالۆزیێ د ناڤ دلێ هەڤوەلاتییان دا و پێکۆلێ دکەن وان ژ رێبازا دیمۆکراتی لادەن[٨٣].

هەروەسا ئێك ژ نیشانێن هاریکارییا هەڤپشك ئەو بەیان بوو یا ل هەیڤا تیرمەها ١٩٥٩ێ کۆمۆنیست و پارتییان ل زاخۆ ب ناڤێ بەرەیێ ئێکەتییا نیشتمانی ل وی بازێری دەرئێخستی، تێدا هاتبوو: (ئیمپریالیست و کرێگرتیێن وان ژ ١٤ی تیرمەها ١٩٥٨ێ وەرە ب هەمی شیانێن خۆ پێکۆلێ دکەن دەستەلات و کۆنترۆلا خۆ بزڤرینەڤە، لێ ئەو هەردەم ب کەڤرێ موکمێ مللەتی (بەرەیێ ئێکەتییا نیشتمانی) کەڤتینە، گەلی جەماورێ زاخۆ .. هوون هەمی د داخوازکرینە دەستکەڤتێن شۆرشا مەیا سەرفەراز بپارێزن .... یا ئەم ژ تارستانێ دەرئێخستینە رۆناهیێ، هوون دداخوازکرینە پتر هشیار و چاڤ ڤەکری بن ژ وان تەپك و داڤێن ئیمپریالست و دووڤەلانکێن وان دانن ...)[٨٤].

دەمێ بوویە سالرۆژا ئێکێ یا هەلبوونا شۆرشا ١٤ ی تیرمەها ١٩٥٨ ێ، جەماوەرێ دەڤەرا بادینان ئاهەنگ ب وێ هەلکەڤتێ گێرا و رۆژناما (الحقیقة) گۆتارەك ب ناڤێ (هەڤوەلاتییەکێ کورد) ب وێ هەلکەڤتێ بەلاڤ کر کو تێدا هاتبوو: (پشتی شۆرشا ١٤ تیرمەهێ، گەلێ کورد ل عیراقێ بوویە هەڤپشکێ برایێ خۆیێ مەزنتر گەلێ عەرەب، دەستوورێ بەروەخت ژی مافێن وی یێن نەتەوەیی و رۆشنبیری بۆ دابین کرینە، لێ مافێن کارگێری، ئەو ژی ل نێزیك دێ هێن)، هەروەسا گۆتارێ داخواز ژ کوردان کر رێزێن خۆ بکەنە ئێك و دهشیار بن بۆ پاراستنا دەستکەڤتێن شۆرشێ و توخیبێن کۆمارێ و بەرسینگگرتنا هەر پێکۆلەکا دهێتە کرن بۆ لادانێ ژ رێبازا دیمۆکراتییا کۆمارێ، یان دەستدرێژیکرنێ ل سەر رێبەرییا عەبدولکەریم قاسم رێبەرێ عەرەب و کوردان[٨٥].

جهێ کەنیێ ژی ئەوە کو هاریکارێ پۆلیسێن قەزا شێخان داخواز ژ قائیمقامێ کربوو نەهێلیت زەلامێن هەردو عەشیرەتێن شەرەفان و زێدك ب چەکێ خۆڤە بێنە ناڤ بازێری بۆ ئاهەنگگێرانێ ب وێ سالرۆژێ، ژ ترسا هندێ نەکو هەردو عەشیرەت لێك بکەڤن چونکی خویندارى ل ناڤبەرا وان هەبوو، ژ بەر هندێ و چونکی وی هێزەکا کێم یا پۆلیسان هەبوو و نەدشیا تەناهیێ بنەجهـ بکەت، ئینا هاریکارێ پۆلیسان داخواز ژ سەرۆکێن هەردو عەشیرەتان کر ئامادە ببن و سۆزنامە پێ دانە داگرتن کو ب چەك ڤە نەهێنە ناڤ بازێری و تەناهیێ بپارێزن، هەروەسا بۆ روو ب رووبوونا هەر تشتەکێ نەکو بێتە روودان، داخواز کر هێزا وی یا پۆلیسان ب هێزەکا پێدڤی بێتە پشتەڤانیکرن بۆ بنەجهکرنا تەناهیێ ل رۆژا ئاهەنگگێرانێ[٨٦].

## سێ: پێکۆلا تیرۆرکرنا عەبدولکەریم قاسم

بەری بزاڤا شەواف یا رۆژا ٨ ئادارا ١٩٥٩ێ ژی، سەرکردایەتییا حزبا بەعس هزرا تیرۆرکرنا عەبدولکەریم قاسم کریوو و ئەو هزر دژڤڕیتە شواتا سالا ١٩٥٩ێ، هەروەسا ئەو تشتێ هاندای حزبا بەعس وێ پێکۆلێ بکەت سەرنەکەڤتنا بزاڤا شەوافی و رێکارێن دەستەلاتێ بوون یێن پێ رێ ل پشکداریا بەعسییان گرتی بۆ پشکداریکرنێ د دەستەلاتێ دا، ژ بەر هندێ، بەعسییان وەسا دیت کو چارەیا ئێکانە تیرۆرکرنا (قاسم)ە[٨٧].

ئێڤاریا ٧ چریا ئێکێ یا ١٩٥٩ێ، ل (رأس القریة) ل جاددا رەشید، ئەنجامدەران ترۆمبێلا قاسمی دابەر شێلکێن گوللەیان دەمێ د وێ جاددێ را ژ وەزارەتا بەرگریێ قەستا ئاهەنگەکا پێشوازیکرنێ دکر ل ئاڤاهیێ شاندێ دیپلۆماسیێ ئەلمانیا دیمۆکراتی، د وێ رووداندنێ دا شۆفێرێ قاسم هاتە کوشتن و زێرەڤانێ وی ب دژواری بریندار بوو و گوللەیەك ب ملێ چەپێ یێ قاسم کەڤت و شۆفێرێ تەکسییەکێ ئەو ڤەگوهاستە نەخۆشخانا کۆچکا (سەلام) و هەتا دەستپێکا کانوونا ئێکێ یا ١٩٥٩ێ ل نەخۆشخانێ ما، دەمێ ژ نەخۆشخانێ ژی دەرکەڤتی، عیراقییان ب وێ هەلکەڤتێ ئاهەنگ گێڕان و ئەو رۆژ ب ناڤێ (رۆژا سلامەتییا رێبەری) ناڤکرن.

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەو بوو کو پێکۆلا تیرۆرکرنێ شوینوارێن کوور د قاسمی و دەروون و فەرمانێن وی دا هێلان، ئەو ب لاوازی و دودل ژ ڤێ پیکۆلێ دەرکەڤت، هەتا وی ژ ترسا دووبارەبوونا پێکۆلا تیرۆرکرنێ ترۆمبێلەکا دژی گوللەیان ب کار دئینا و ئالۆزییا وی یا سیاسی بەرفرەهتر لێ هات و دەست ب خۆ لبەرشرینکرنێ کر دگەل هێزێن نەتەوەپەرەرێن عەرەبی و ئیسلامی یێن دژی خۆ کر و حوکمێ سێدارەدانێ ب سەر وان بەعسییان ب جهـ نەئینا یێن پێکۆلا تیرۆرکرنا وی کرین، ئەڤە هەمی ل سەر کیسێ کۆمۆنیست و پارتیێن پشتەڤانییا وی دکرن[٨٨].

پتریا مەزن یا گەلێ عیراقێ ب عەرەب و کورد ڤە نەڕازیبوونا خۆ ژ وێ پێکۆلا تیرۆرکرنێ دەربڕین و ب دژواری پرۆتستۆ کرن و پشتەڤانییا خۆ بۆ عەبدولکەریم قاسمی دەربڕین، دەمێ ئەو پێکۆل هاتییە کرن ژی، پرۆسێسا ڤاڤارتنا دەنگان بۆ هەلبژارتنا ئەندامێن لیژنا ناوەندیا پارتی دهاتە ئەنجامدان ئەڤە ژی پشتی کارێن کۆنگرێ چوارێ ل بەغدا ب داوی هاتی، د وێ گاڤا ئێکلاکەر دا مەلا مستەفایێ سەرۆکێ پارتی و جەماوەرێ کوردستانێ ب هەمی شیانێن خۆ بەرەڤانی ژ شۆڕشا ١٤ێ تیرمەهێ دکرن[٨٩]، پشتی چەند رۆژەکان ژی بارزانی و هژمارەکا سەرکردێن پارتی سەرا عەبدولکەریم قاسم دان ل نەخۆشخانێ بۆ پشتڕاستبوونێ ژ ساخلەمییا وی، هەر بۆ وێ چەندێ شاندەکێ سەرکردایەتییا پارتی کو پێکهاتبوو ژ ئیبراهیم ئەحمەد سکرتێرێ پارتی و جەلال تالەبانی و سالح یوسفی و عەلی عەبدوللا سەردانا وی کرن و دلسۆزییا خۆ بۆ نووکرن[٩٠].

پێکۆلا تیرۆرکرنا قاسمی کاریگەرییا خۆ ل سەر رێباز و سیاسەتا وی هەبوو بەرامبەری دۆزا کوردی و گەهشتە وێ باوەریێ کو هەلویست و سیاسەتا وی دگەل پارتی و پارتا کۆمۆنیست ئێك بوویە ژ ئەگەرێن پێکۆلا تیرۆرکرنا وی، ئەڤ چەندە ژی بۆ دیار بوو دەمێ بارزانی ل نەخۆشخانێ سەرەدانا وی کری، وی بارزانی پشتگوهڤە هاڤێت و دەست ب ئاخڤتنێ دگەل مێڤانێن دی کر یێن سەرەدانا وی کرین[٩١]، ئەڤە ژی وەك خۆلبەرشرین کرن و دڤخۆشکرنە بۆ هێزێن نەتەوەپەروەرێن عەرەبی و ئیسلامی یێن دژی سیاسەتا وی.

هەروەسا سەرانسەری خەلکێ بادینان نەڕازیبوونا خۆ ژ پێکۆلا تیرۆرکرنا عەبدولکەریم قاسم دەربڕین و ئەو پێکۆل پرۆتستۆ کرن، رێکخراوێن مللی و پیشەیی، نەخاسمەیێن پەیوەندی ب پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ ڤە هەین ل زاخۆ، ئامێدیێ، ئاکرێ، زاخۆ و دهۆك ب دەهان برۆسکە بۆ بەغدا هنارتن و ئەو پێکۆل شەرمەزارکرن، ژ وان رێکخراوان: ئێکەتییا گشتی یا

قوتابیێن عیراقێ، كۆمەلا بەرەڤانیێ ژ مافێن ئافرەتان، كۆمەلێن جوتیاران، لیژنەییێن بەرەیێ نیشتمانی، ئێكەتیا لاوێن دیمۆكرات، پشتەڤانێن ئاشتیێ، دەستەییێن فێركرن و وانەبێژیێ، ئەڤە سەربارى هژمارەكا كەسانێن بەرنیاسێن دەڤەرێ.

ل قەزا ئاكرێ، خەلكێ گوندێ ئەسكى كەلەك و كۆمەلا برایەتی یا جوتیاران ل ناحیا (حەفت عەشیرەتان) و ٢٠٠ ئەندامێن لاوێن دیمۆكرات برۆسكە هنارتن و تێدا پێكۆلا تیرۆركرنێ پرۆتستۆ كرن و سوزدان ئێكرێزیا خۆ ل پشت قاسم بپارێزن داكو كۆمارى ببەنە سەر رێیا ئازادیێ[٩٢].

ل ئامێدیێ ژی، عەقید تاها بامەرنی و كۆمەلا بەرەڤانیێ ژ مافێن ئافرەتان ئەو پێكۆل پرۆتستۆ كرن، هەروەسا ل دۆرێن ٢٠٠ وەلاتیێن زاخۆ ب ناڤێ: هێزێن دیمۆكراتی، كۆمەلا بەرەڤانیێ ژ مافێن ئافرەتان، لیژنا پشتەڤانێن ئاشتیێ، ٣٧ جوتیاران، ٤٦ مامۆستا، سەرۆكێ جڤاتا بازێرڤانیێ، عیسا حاجی، یونس جەمیل، ئیبراهیم حەجی محەمەد، سەعید حەجی ئیسماعیل و مووسا حەجی رەجەب، ئێكەتیا گشتیا قوتابییان، برۆسكە هنارتن و تێدا ئەو پێكۆل پرۆتستۆكرن و ب كارەكێ كرێت ل قەلەمدان[٩٣].

ژ دهۆك ژی، ١٢ وانەبێژان، ٤٣ مامۆستایان، ١٧ هەڤوەلاتیان، كۆمەلا بەرەڤانیێ ژ مافێن ئافرەتان، عەقید جەلال محەمەد بالەتەیی، مووسلح نەقشبەندی (بریكارێ داواكارێ گشتی)، فەرحان سەفەر و خێزانا وی و حەمید بیلال برۆسكە هنارتن و تێدا پێكۆلا تیرۆركرنێ پرۆتستۆ كرن[٩٤].

خەلكێ بادینان و رێكخراوێن سیاسیێن دەڤەرێ بەردەوام بوون ل سەر دووڤچوونا دەنگ وباسێن ساخلەمیا عەبدولكەریم قاسم و ب هەلكەڤتا چاكبوون و دەركەڤتنا وی ژ نەخۆشخانەیێ برۆسكە بۆ هنارتن، رۆژنامەیا خەبات ژی دووڤچوونا وان چالاكی و كەیفخۆشییان كر یێن گەلێ كورد ب ڤێ هەلكەڤتێ كرین، هەر بۆ نموونە ل دهۆك فەرمانبەرەكی ب ناڤێ تۆما خۆشۆ دهۆكی چوارێكا مووچەیێ خۆ وەك بێش ب سەر هەژاران دابەش كر[٩٥] و هژمارەكا خەلكێ بامەرنێ برۆسكەیەك بۆ قاسمی هنارت و تێدا هاتبوو: (ب هەلكەڤتا دەركەڤتنا وە ژ نەخۆشخانێ ب ساخ و سلامەتی، پیرۆزباهیێ ل هەوە و گەلێ مەزنێ عیراقێ دكەین، مرن و سەرشۆری بۆ ئەنجامدەرێن كۆمكوژی و پیلانگێرانان) و ئەو برۆسكە ژ لایێ كەسانێن ل خوارێ هاتبوو ئیمزا كرن: عومەر حەجی ئەحمەد، عەبدوللا خالد و حسێن حەسەن، هەروەسا دەمێ قاسم ل رۆژا ٩ێ كانوونا ئێكێ یا ١٩٥٩ێ ژ نەخۆشخانەیێ دەركەڤتی، ئۆسمان عومەر خودانێ چاپخانا خەبات چا هەروە ب سەر خەلكی بەلاڤ كر و سێ پەز ڤەكوشتن و گۆشتێ وان ب سەر هەژاران بەلاڤ كر، نڤیسینگەها خەبات ژی یا پارتی ل ئامێدیێ ئاهەنگەك ب وێ هەلكەڤتێ گێرا و تێدا ئالایێن عیراقێ و وێنەیێن (عەبدولكەریم قاسم)ی ل بازێری بلندكرن و پەز هاتنە ڤەكوشتن و هەڤوەلاتیان قەستا قائیمقامیی كرن بۆ پیرۆزباهیكرنێ ل قائیمقام جەلال رەشید خۆشناو ب وێ هەلكەڤتێ و ئاهەنگێن هۆسا ل دهۆك و زاخۆ و شێخان ژی هاتنە گێران[٩٦].

## چوار: مۆلەتا پارتی دیمۆكراتی كوردستان (پارتی)

هەمی پارتێن سیاسی یێن عیراقێ هەر ژ هەلبوونا شۆرشا ١٤ی تیرمەها ١٩٥٨ێ چالاكیێن خۆ ب ئەشكەرایی دكرن، بێی هندێ چ دەستوێری هەبن، لێ پارتا كۆمۆنیستا عیراقی ژ هەمی پارتێن دی خودان دەستەلاتتر و بەرفرەهتر بوو، هەتا كو عەبدولكەریم قاسم نەچار بووی پشتا خۆ ب كۆمۆنیستان و جەماوەرێ وان یێ بەرفرەهە گەرم بكەت بۆ پەیداكرنا كەڤەرەكێ جەماوەری و ستوونەكێ داكو خۆ پێ ژ رەوتێ نەتەوەپەروەرێ عەرەبی - ئیسلامی یێ

هەڤدژێ خۆ بپارێزیت.

لێ پارتا ب هێزتر و بەرفرەهتر ل كوردستانێ، پارتا دیمۆكراتا كوردستانێ بوو، نەخاسمە ژی پشتی ل رۆژا ٦ ی چریا ئێكێ یا ١٩٥٨ێ بارزانی ڤەگەڕیایە عیراقێ و پارتی شیا ل رۆژێن ٤-٧ ی چریا ئێكێ یا ١٩٥٩ێ كۆنگرێ خۆیێ چوارێ ب ئەشكەرایی و ب ئامادەبوونا بارزانی ل بەغدا گرێدەت و وی دەمی رێكخستنێن پارتی ل بادینان ل مووسل دهاتنە ب رێڤەبرن و ئاراستە كرن، زانیارێن بەردەست ژی ئاماژە دكەنە وێ چەندێ كو ئەندامێن لیژنا ناڤخۆیا ئاكرێ ئەڤێن خوارێ بووینە: هاشم حەسەن (مامۆستا) بەرپرسێ لیژنێ، مام عەلی سەلیم (فەرمانبەر)، مستەفا عەبدلقادر (كاسبكار)، زەكی كامل (كرێكار)، سەلاحەددین رەشید (كۆمیسەرێ پۆلیسان یێ لادای) و شەوكەت تاهر ئەندامێن لیژنێ بووینە، لێ ئەڤێن خوارێ وەك ئەندامێن لیژنا ناڤخۆیا شێخان هاتینە نیاسین: ئەمین ئەحمەد، حەسەن محێ، جوقی خدر[٩٧]، هەروەسا لیژنا ناڤخۆیا ئامێدیێ ژی ژ ڤان هاتییە پێك ئینان: هورمز نیسان كانی (بەرپرس)، عەبدلرەحمان عەلی، ئیبراهیم عەبدوللا، ئەشرەف عزەت، مەلا تاهر رەشاڤایی، محەمەد رەشید و عارف خالد (ئەندام)[٩٨].

لێ لیژنا ناڤخۆیا زاخۆ پشتی كۆنگرێ چوارێ ژ ڤان هاتە پێك ئینان: عومەر حەسەن بامەڕنی (بەرپرس)، عەلی هالۆ، شێخ جەمالەددین بریفكی، مەلا عەبدلغەنی ئیبراهیم و ئۆسمان قازی (ئەندام)[٩٩]، هەروەسا ئەڤێن خوارێ وەك ئەندامێن لیژنا ناڤخۆیا دهۆك هاتینە نیاسین: مەلا عەلی بەرۆشكی (بەرپرس)، حەسەن مەحمود، حسێن یونس زاویتەیی، میكائیل عەلی ساركی و مستەفا عەلی ئەفندی (ئەندام)[١٠٠].

زانیاری ل سەر پارتیێن پێشەنگ ل دەڤەرا بادینان هێشتا دكێمن، نەخاسمە ژی ئەندامێن لیژنەیێن ناڤخۆیی، بەری كۆنگرێ پێنجێ یێ پارتی كو پشتی مۆلەتدانا پارتی ل رۆژا ٩ شواتا ١٩٦٠ێ و ژ بەر رەوشا كارێ نەپەنی و تێكەلبوونا ناڤێن كۆمۆنیست و پارتییان، نەخاسمە كو سەردەمێ شاهینی خۆ ژ سالا ١٩٥٣ یێ پارتی وەك رووكارێ پارتا كۆمۆنیستا عیراقێ ل قەلەم ددا، دەستەلاتێ ئەندامێن هەردو پارتان ژێكجودا نەدكرن، ژ بەر هندێ، ناڤێن ئەندامێن لیژنەیێن ناڤخۆیی یێن ل سەری هاتین ب تمامی دراست و دروست نینن.

ئەڤە رەوشا پارتی بوو ل مووسل و بادینان ژ لایێ رێكخستنێ ڤە بەری مۆلەتا خۆ ل رۆژا ٩ شواتا ١٩٦٠ێ وەرگریت و كۆنگرێ خۆیێ پێنجێ ل گولانا ١٩٦٠ێ ب ئەشكەرایی ل بەغدا گرێدەت، وەسا دیارە ژی رێكخستن نە (لق)(فرع) بوون، بەلكی هەتا سالا ١٩٦٢ێ (لیژنەیێن ناڤخۆ) بوون و سالح یوسفی سالێن ١٩٤٦-١٩٥٢ێ بەرپرسیيا رێكخستنا وان لیژنەیان و چالاكیێن وان ب ستۆیێ خۆڤە گرتبوو، لێ سالێن ١٩٥٢-١٩٥٦ێ ئیسماعیل محەمەد تاقی ئاكرەیی ئەو بەرپرسی ب ستۆیێ خۆڤە گرتبوو، پاشی مەلا عەبدوللا ئیسماعیل (مەلا ماتۆر) چەند هەیڤەكێن سالا ١٩٥٦ێ بەرپرسێ رێكخستنێ بوو و پشتی وی خەسرەو تەوفیق هەر ژ داوییا سالا ١٩٥٦ێ هەتا چریا دووێ ئێكێ یا ١٩٥٩ێ ئەو بەرپرسی ب ستۆیی خۆڤە گرت و پشتی وی نوری سەدیق شاوەیس هەتا ئادارا ١٩٦٠ێ بوو بەرپرسێ رێكخستنێ، هەروەسا پشتی كۆنگرێ پێنجێ سالح یوسفی بوو بەرپرسێ رێكخستنێ، پشتی وی عەلی عەسكەری ل چریا ١٩٦٠ێ ئەو بەرپرسی ب ستۆیێ خۆڤە گرت و سالا ١٩٦٢ێ ژی وانەبێژ ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی بوو بەرپرسێ لقێ ئێك یێ پارتی و بارەگەهێ خۆ دانا باژێرێ مووسل.

پشتی بزاڤا شەواف و پشتی پێكۆلا تیرۆركرنا عەبدولكەریم قاسم، یێ داویێ بزاڤ كر هێزا گڤاشتنا رەئیا گشتی ل سەر سیاسەتا خۆیا تاكرەوانە سڤك بكەت و شەنگستەیەكی بۆ موكمكرنا حوكمێ خۆ و ب هێزكرنا دەستەلاتا خۆ دانیت، ئینا ل رۆژا ٦ ی كانوونا دووێ یا ١٩٦٠ێ یاسایا كۆمەلان دەرئێخست بۆ رێكخستنا كار و ژیانا حزبی، هەرچەندە ژی یاسا دەركەڤتبوو، لێ پارتێن نەتەوەپەروەرێن عەرەبی داخوازی بۆ وەرگرتنا مۆلەتێ

پێشكێش نەكرن و باشتر زانین بەردەوام بن ل سەر خەباتا خۆیا نەپەنی بۆ گەهشتنا ئارمانجێن خۆ، ل پێشییا وان ژی كۆنترۆلكرنا دەستەلاتێ ب رێیا كۆدەتایێ.

ل رۆژا ٩ كانوونا دووێ ١٩٦٠ێ، چوار پارتان داخوازنامە بۆ وەرگرتنا مۆلەتێ پێشكێشی وەزارەتا ناڤخۆیا عیراقێ كرن: پارتا نیشتمانییا دیمۆكراتی، پارتا دیمۆكراتا كوردستانێ یا ئێككرتی ـــ عیراق و دوو پارتێن كۆمۆنیست كو داخوازناما ئێكێ ژ لایێ زەكی خێری سەعید و یا دووێ ب فەرمانا دەستەلاتێ ژ لایێ داود الصایغ یێ جودابووی هاتبوونە پێشكێش كرن، پاشی ئیخوان مووسلمین ب ناڤێ پارتا ئیسلامییا عیراقێ و پارتا رزگاری (التحریر) و ل رۆژا ١٢ی شواتێ ژی عەبدلفەتاح ئیبراهیم ب ناڤێ پارتا كۆماری (الحزب الجمهوري) داخوازنامەیێن وەرگرتنا مۆلەتێ پێشكێش كرن.

وەزارەتا ناڤخۆ ل رۆژا ٩ شواتا ١٩٦٠ێ مۆلەت دا پارتا نیشتمانییا دیمۆكراتی، پارتا دیمۆكراتا كوردستانێ، پارتا كۆمۆنیست (یا كارتۆنی) ب سەركردایەتییا داود الصایغ، هەروەسا ل رۆژا ٢٦ی نیسانێ مۆلەت دا پارتا ئیسلامییا عیراقی و وەزارەتا ناڤخۆ، ژ بەر چەند ئەگەرەكان، رەت كر مۆلەتێ بدەتە پارتێن دی[١٠١].

تشتێ پەیوەندی ب پارتی ڤە هەی، مەلا مستەفا بارزانی، نوری سەدیق شاوەیس، عومەر مستەفا (عومەر دەبابە)، ئیبراهیم ئەحمەد، سالح یوسفی و پێنج كەسێن دی داخوازی پێشكێش كربوو، پێنجی كەسان پشتەڤانییا خۆ بۆ وێ داخوازنامەیێ دەربرین كو دۆرێن ١٠ ژ وان ژ بادینان بوون، ژ وانا: عەلی حەمدی بێدوهی، سوبغەتوللا ئەمین مزووری، نوری خەلیل، رەمەزان موحسن ئاكرەیی، هورمز نیسان هورمز، مەعسوم ئەنوەر مایی، شەوكەت حاجی تاهر ئاكرەیی و ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی[١٠٢].

ئەو داخوازنامە ژی ب پەیرەو و پرۆگرامەكێ پێكهاتی ژ ٢٣ ماددان هاتە هەڤپێچ كرن و تێدا ئارمانج ل سەر وەكهەڤییا مافان و ڤەكرنا دەلیڤەیان بۆ كوردان د بیاڤێن كارگێری و ئابووری و رۆشنبیری دا هاتبوونە بنەجهـ كرن، هەر بۆ نموونە، د ماددێ ٣ێ دا هاتبوو كو پارت د خەباتا خۆیا سیاسی و شرۆڤەیا خۆ دا بۆ جڤاكی مفای ژ تیۆرا ماركسی ـ لینینی دبینیت، ماددێ ٢١ێ ژی ئاماژە كربوو گەرەنتیكرنا مافێن كێمینەیێن نەتەوەیی ل كوردستانێ، د ماددێ ٢٣ێ دا سۆز هاتبوو دان پشتەڤانییا خەباتا گەلێ كورد ل سەرانسەری دەڤەرێن كوردستانێ بێتە كرن بۆ رزگارییا وان، گرنگترین پەرەگراف ژی د پەیرەو و پرۆگرامی دا ماددێ ٦ شەش بوو كو ئەو ژی كاركرن بوو بۆ بەرفرەهكرنا مافێن نەتەوەیی یێن گەلێ كورد ل سەر بنواشێ ئۆتۆنۆمیێ د چارچۆڤێ ئێكەتییا عیراقی دا[١٠٣].

وەزارەتا ناڤخۆیا عیراقێ رازی بوو مۆلەتێ بدەتە پارتی ئەڤەژی پشتی هژمارەكا ماددێن پەیرەو و پرۆگرامی ژێبرین یان راستڤەكرین، ژ وانا ئەو ماددە بوو یێ پەیوەندی ب ئۆتۆنۆمیێ ڤە هەی و پەیڤا (ئێككرتی) هاتە ژێبرن، پارتی ژی هەتا رادەیەكی ل سەر پتریبا گوهۆرینكاریبان رازی بوو[١٠٤].

ب هەلكەڤتا دەستپێكرنا چالاكیا كارێ ئاشكرا (نەپەنییا- علنی) پارتی، بارزانی سوپاسییا سەرۆكێ حكۆمەتێ كر و پارتی ل رۆژێن ٥-١٠ ی گولانا ١٩٦٠ێ كۆنگرێ خۆیێ پێنجێ ل بەغدا گرێدا و ئەندامێن كۆنگرەی ئەو ماددێن وەزارەتا ناڤخۆ ژ پەیرە و پرۆگرامی ژێبرین دوبارە زڤراندنەڤە، ژ بلی پەیڤا (ئێككرتی) و پەرەگرافا ئاماژێ دكەتە مفاوەرگرتنێ ژ ماركسی - لینینیێ، و هەلبژارتنێن لیژنا ناوەندی هاتنە كرن و هژمارەكا ئەندامێن پارتی ل بادینان سەركەفتن ب دەستڤە ئینان، ژ وانا: سالح یوسفی، هاشم حەسەن ئاكرەیی، ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی و عەلی حەمدی بێدوهی، هەروەسا هەر ئێك ژ عومەر حەسەن، خالد یوسفی، نعمان عیسا و یێن دی پێگەهێن پێشكەڤتی د لیژنەیێن ناوەندی یێن پارتێ دا ب دەستڤە ئینان[١٠٥].

رێكخستنا پارتی ژی ل مووسل ل ئادارا ١٩٦٠ ێ داخواز ژ موتەسەرفییا لیوایێ كر لقەكێ پارتی ل باژێری بێتە ڤەكرن و هەر ئێك ژ ئەڤێن خوارێ ئیمزا



سەبری بوتانی

ل سەر داخوازنامەیێ کرن:

١- سالح عەبدوللا یوسفي (ئەندامێ دەستەیا دامەزرێنەرا پارتی).

٢- سوبغەتوللا ئەمین مزووری (ژمێریارێ ژاندنا مووسل).

٣- رەمەزان موحسن ئاکرەیی (رۆپیڤێ ئێکێ ل بازێرڤانیا مووسل).

٤- نوری خەلیل بامەڕنی (کرێکار).

٥- ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی (وانەبێژ).

٦- خالد حەسەن یوسفي (مامۆستا/ جێگرێ سەرۆکێ سەندیکا مامۆستایان ل مووسل).

٧- سەعید عەبدوللا (سەرتراش/ سکرتێرێ سەندیکا سەرتراشان ل مووسل).

٨- محەمەد ئەمین رەشید (تێبینەرێ تەکنیکی ل کارگەها تەڤنیا حکومی ل مووسل).

٩- مەحمود عیسا (کرێکار).

١٠- رەمزی ئیسماعیل (پارەوەرگر ل بەرژەوەندیا ڤەگوهاستنا خەلکی ل مووسل).

١١- سەعید ئیسماعیل (پۆستەچی).

١٢- فارس نعمان بارزانی (شارەزایێ تەکنیکێ چاندنێ).

١٣- محەمەد نەبی ئیبراهیم (هۆستایێ ئاڤاهیان) (١٠٦).

رۆژا ٢٧ ئادارا ١٩٦٠ێ موتەسەرفي ل سەر مۆلەتدانا لقێ ل مووسل رازی بوو و ئەندام و لایەنگرێن پارتی ل لیوا مووسل د برۆسکەیەکێ دا سوپاسی و رێزگرتنێن خۆ ئاراستەی سەرۆکێ حکومەتێ کرن، د وێ برۆسکا سوپاسیێ دا هاتبوو: (ئەم پێشەنگێن دیمۆکراتی ئەندام و کاندید و لایەنگر و هەڤالێن پارتا دیمۆکراتا



شەوکەت تاهر ئاکرەیی

كوردستانێ، ژ دل سوپاسییا پشتەڤانی و دلسۆزییا هەوەیێن هێزا دكەین ب هەلكەڤتنا رازیبوونا وە ل سەر مۆلەتدانا دامەزراندنا لقێ مووسل، هەروەسا ژ دل سوپاسییا عەبدلمەجید رەشید بەگێ بەرواری بریكارێ وی دەمی یێ موتەسەرفێ لیوا مووسل دكەین بۆ ڤێ باوەرییا دایە لقێ پارتا مەیا تێكۆشەر، دووبارە ب راستگۆیی سۆزێ ددەین ب هەر تشتەكی قوربانیێ بدەین بۆ پاراستنا كۆمارا خۆیا خۆشەڤی و سەركردایەتییا هەوەیا ئاقلمەند، سەركردایەتییا رێبەرێ عەرەب و كوردان)، هەر ئێك ژ ئەڤێن خوارێ ئیمزا ل سەر ڤێ بروسكەیێ كرن: سالح یوسفی، سوبغەتوللا مزووری، هورمز نیسان، عەبدلرەحمان عەلی، نوری مستەفا، ئەشرەف عزەت، ئیسماعیل ئەحمەد ژ ئامێدیێ و محەمەد خدر ژ شێخان[١٠٧].

سەركردایەتییا لقێ پارتی ل مووسل ژ ڤان كەسێن خوارێ هاتە پێك ئینان: سالح یوسفی (بەرپرس)، سالح روشدی، ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی، خالد حەسەن یوسفی و سوبغەتوللا مزووری (ئەندام)، هەروەسا عەلی عەسكەری بوو بەرپرسێ لێژنا ناڤخۆیا مووسل و سەعیدێ حەللاق، عەلی قاسم شنگالی و ئیبراهیم خەلیل ئاكرەیی هندەك بوون ژ ئەندامێن وێ لێژنێ[١٠٨].

دەمێ ب فەرمی مۆلەتا ڤەكرنا لقێ پارتی ل مووسل هاتییە دان، بارەگەهێ وێ ل تاخێ النصر (فەیسەلیێ) ل نێزیكی مزگەفتا محەمەد نەجیب جادر هاتە ڤەكرن، پاشی بۆ ئاڤاهییەكێ مەزن یێ تاخێ نوعمانیێ (دەرگزلیێ) هاتە ڤەگوهاستن و ل دەستپێكا سالا ١٩٦٠ێ ژی بۆ خانییەكێ بچووك یێ نێزیكی جاددا بازارێ كوردان (بازارێ نەبی یونس) ل نێزیك مزگەفتا نۆكەیا (زەكەریا) هاتە ڤەگوهاستن.

هەروەسا پشتی وەرگرتنا مۆلەتێ، رێكخستنا مووسل ل دەمێ ڤەكرنا بارەگەهێ خۆ ئاهەنگەكا مەزن ساز كر و ب سەدان ژن و زەلام و گەنج لێ ئامادە بوون، د وی ئاهەنگێ دا هژمارەكا پەیڤ و هۆزان هاتنە پێشكێش و دەوات هاتنەكرن، وان چالاكییان هەستا نەتەوەیی یا كوردێن مووسل لڤاند و پێچ پێچە قەستا بارەگەهێ پارتی كرن داكو بگەهنە ناڤ ریزێن رێكخستنێن وێ و پشكداریێ د ساخكرنەڤا هەلكەڤێن نەتەوەیی و نیشتمانی دا بكەن.

ل دووڤ توومارێن سالا ١٩٦٠ێ یێن رێڤەبەرییا ئەمنا مووسل ژی (٢٤٦)[١٠٩] كەس گەهشتبوونە لقێ مووسل یا پارتی و پشتەڤانێن وێ گەلەك ژ ڤێ هژمارێ مەزنتر بوو، رێكخستنا پارتی هەمی جوونێن جڤاكی ب خۆڤە گرتبوو و مەلا حەمدی عەبدلمەجید بەرپرسێ رێكخستنا نەپەنی بوو، لێ رێ نەدهاتە دان لەشكەر و پۆلیس و خەلكێ هەردوو عەشیرەتێن گۆیان و ئۆمەرییان یێن رەگەزناما عیراقی وەرنەگرتین بێنە ناڤ ریزێن پارتان، پۆلەوان(عریف) ناسر حەسەن ئەندامێ پارتی هاتە راسپاردن بەرپرسییا رێكخستنا لەشكەری ب ستۆیێ خۆڤە بگریت كو وێ رێكخستنێ رێكخراوێن خۆ ل پترییا یەكەیێن سەربازی ل ناڤ باژێری هەبوون و دیارترین ئەندامێن وێ رێكخستنێ ژی ئەڤێن خوارێ بوون: تەییب مەلا عاسم، سلێمان عەبدولكەریم، رەمەزان عومەر، عەبدلرەحمان گۆران، عەبدلمنعم ئامێدی، محەمەد میكائیل بەرواری، عەلی ئێكمالەیی، عومەر بابیری، تاهر ئەردەنی، سەیدۆ یوسف تەمەر چەلكی، مستەفا تێلی شێخۆ[١١٠].

هەروەسا پارتێ رێكخستنێن خۆ ل پترییا كارگەهـ و كۆمپانییێن حكومی و نەحكومی ل ناڤ باژێری هەبوون، هەر بۆ نموونە، ئەحمەد مەلا عاصم عەبدوللا بەرپرسێ رێكخستنا كارگەها شەكرا مووسل بوو.

فەرە بێژین پارتی رێكخستنەكا بچووك خۆ ل رێڤەبەرییا ئەمنا مووسل ژی هەبوو و هۆزانڤانێ بەرنیاس سەبری بۆتانی بەرپرسییا وێ رێكخستنێ ب ستۆیێ خۆڤە گرتبوو و دیارترین ئەندامێ وێ ژی محەمەد باتێلی بوو و هەردووان پێكڤە ب ئاراستەكرنا پارتێ ل وێ رێڤەبەریێ كار دكرن داكو پۆستەیێ لقێ مووسل ب سلامەتی بگەهیتە بەغدا، و سەبری بۆتانی ب وی ئەركی هاتبوو راسپاردن، لێ

دەمێ مەسەلا وی ئەشكەرا بووی و دەستەلاتێ ئەو دەستەسەر كری، مەلا حەمدی عەبدلمەجید ل شوونێ هاتە دانان، هەروەسا هاتە راسپاردن رۆژانە رۆژنامەیا پارتێ (رۆژنامەیا خەبات) ژ ویستگەهێ ترێنێ وەرگریت و بەلاڤ بكەت و هندەك لبێن وێ بهنێریتە سوریا[111].

ل دەڤەرا بادینان ژی خەلكێ وێ پێشوازییا ڤەكرنا لقێ كرن و ب هەلكەڤتا وەرگرتنا مۆلەتا پارتێ ئاهەنگ گێران و رێكخستنێن وێ ل بازێر و گوندان بەرفرەهـ بوون و لیژنەیێن نوو یێن ناڤخۆیی بۆ سەركردایەتیكرنا رێكخستنێن پارتێ و چالاكیێن وێ هاتنە پێك ئینان، هەر بۆ نموونە، ئەڤێن خوارێ ژ لیژنا ناڤخۆیا ئاكرێ هاتینە نیاسین: مام عەلی سەلیم، فائق حەجی شەریف، عەبدلرەحمان، عەبدوللا، شەوكەت تاهر و یێن دی، هەروەسا لیژنێ رێكخستنەك ل گوندێن ناحیا (حەفت عەشیرەتان- بەردەرەش) هەبوو و ئەندامێن وێ یێن دیار ئەڤێن خوارێ بوون: عاسم حەجی یەحیا، ئیبراهیم عەزیز عەبدۆ، محەمەد سالح قجۆ، مەلا عەلی رەسول، ئیسماعیل حەجی رەزا، یاسین تاها (مام یاسین) [112] و هژمارا پارتییێن ل رێڤەبەریا ئەمنا مووسل هاتینە توومار كرن گەهشتە ١٩٤ ئەندامان .

لیژنا ناڤخۆیا شێخان ژی ژ ئەڤێن خوارێ هاتە پێك ئینان: عەزیز بەرەكات، محەمەد خدر، حەسەن محی، ئەحمەد جەرگیس، مەلا خەلیل سلێمان، زەییا عەزۆز، نوری حسێن و هژمارا ئەوێن گەهشتینە ناڤ رێزێن پارتی زێدە بوو، هەروەسا لیژنێ رێكخستنەك ل ئەترووش هەبوو و بەرپرسێ وێ عابد مستەفا بوو و رێكخستنا ئەترووش ب هەلكەڤتا مۆلەت وەرگرتنا لڤا مووسل برۆسكەیەكا سوپاسی و رێزگرتنێ ئاراستەی سەرۆكێ حكۆمەتێ و بەرپرسان كر و تێدا هاتبوو: (ئەم پێشەنگێن ئەندام و كاندید و لایەنگر و هەڤالێن پارتا دیموكراتا كوردستانێ یا پێشرەو، ب هەلكەڤتا مۆلەتدانا پارتا مە ل مووسل ژ دل و گیان پشتەڤانی و دلسۆزییا خۆ پێشكێشی هەوەیێن هێژا دكەین، هەروەسا سوپاسییا هێژا بریكارێ موتەسەرفێ لیوا مووسل دكەین و دووبارە سۆزێ ددەین ب هەر تشتەكێ مە هەی قوربانیێ بدەین بۆ پاراستنا كۆمارا مە)[113] و هژمارا پارتییێن ل رێڤەبەریا ئەمنا مووسل هاتینە توماركرن گەهشتە ١٤٩ ئەندامان[114].

بەری شۆرشا ١٤ ی تیرمەها ١٩٥٨ێ پارتی گەلەك ئەندام و لایەنگر ل ئامێدیێ نەبوون، لی پشتی ڤەگەریانا بارزانی بۆ عیراقێ و مۆلەت وەرگرتنا پارتێ، هژمارا ئەندامێن پارتی زێدە بوو و رێكخستنێن وێ چالاك بوون و ب دەهان خەلكێ قەزایێ گەهشتنە ناڤ رێزێن وێ، هەروەسا دەمەكێ كێم ژی بەری مۆلەتدانا پارتێ، ئەندامێ پارتی یوسف محەمەد بێدوهی نڤیسینگەهەكا پارتێ ل گوندێ بێدوهێ ڤەكربوو، لێ دەستەلاتا ناڤخۆیی دەستووری نەدایێ[115].

پارتییێن ئامێدیێ دلخۆش بوون دەمێ پارتا وان مۆلەت وەرگرتی و ب ئەشكەرایی چالاكیێن خۆ كرین و چەندین ئاهەنگ ب وێ هەلكەڤتێ هاتنە رێكخستن، هەر بۆ نموونە، رۆژا ١٥ی شواتا ١٩٦٠ێ رێكخستنا پارتی ل گوندێ بێدوهێ ئاهەنگەك ساز كر و چەند پەیڤەك ژ لایێ مەلا عەلی عەبدوللا، هاشم محەمەد كۆمیسەرێ بنكەهێ پۆلیسان، عەبدلحافز ئەنوەر مایی و فاتیما یا خووشكا وی، عەبدوللا حەسەن رێڤەبەرێ خواندنگەها بناڤیێ و ئامادەبوویان سروودا (ئەم پارتینە) پێشكێش كرن و ل داوییا ئاهەنگێ ژی ئاهەنگگێڕان و برۆسكەیەكا سوپاسیێ ئاراستەی سەرۆكێ حكۆمەتێ كرن، ئاهەنگێن هۆسا ل سەرسنكی و بەرواری بالا ژی هاتنە كرن[116].

هەروەكی دیارە ژی د كۆنگرێ پێنجێ یێ پارتی دا سێ كەس ژ دەڤەرا ئامێدیێ بۆ ئەندامەتییا لیژنا ناوەندی هاتبوونە هەلبژارتن كو ئەو ژی ئەڤە بوون: سالح یوسفی (ژ بامەرنێ)، ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی و عەلی حەمدی بێدوهی، هەروەسا هەر ئێك ژ: هورمز نیسان كانی، عومەر حەسەن بامەرنی و خالد یوسفی وەك ئەندامێن لیژنا بلندا چاڤدێریا پارتێ هاتبوونە هەلبژارتن[117].

مۆلەتدانا پارتی ل رۆژا ٩ی شواتا ١٩٥٩ێ و مۆلەت نەدانا پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ، ئێك ژ ئەگەرێن ڤەگەریانا ئالۆزیێ ل ناڤبەرا پارتی و کۆمۆنیستان بوو ل ئامێدیێ، کۆمۆنیستان گەلەك ژ دەستەلات و تاگرێن خۆ ژ دەستدان و دەزگەهێن ئەمن و پۆلیسان خۆ ئامادە دکرن ل هەمی دەڤەرێن عیراقێ راهێلنە ئەندامێن وێ پارتی.

ل وی دەمێ کۆمۆنیستێن ئامێدیێ خۆ ئامادە دکرن ڤەگەڕێنە رێکخستن و کارێ خۆیێ نەپەنی، پارتیێن باژێری خۆ ئامادە دکرن ب هەلکەڤتا مۆلەتدانا پارتا خۆ ئاهەنگەکێ بگێڕن، چو پێ نەڤێت کو ئەڤە دبوو ئەگەرێ کەریڤەبوون و تۆڕەبوونا کۆمۆنیستان، ئینا دەست ب کارێن ئازراندنێ کرن و گونەهباری ئاراستەی فەرمانبەران و کار وکریارێن وان و هژمارەکا ماقوولێن ئامێدیێ کرن وەکی: شێخ مەسعود نەقشبەندی، ئەحمەد و سەعید شەعبان ئامێدی و یێن دی، هەروەسا دەست ب رەخنەگرتنا حکومەتێ کرن و ب لێڤەبوونێ ژ پرنسیپێن شۆرشێ و خۆنێزیککرنێ ژ کەڤنەپەرێس و ئاغایان گونەهبار کر، ڤێجا دەمێ پارتی ل نیڤا هەیڤا ئادارا ١٩٦٠ێ ئاهەنگەك ب هەلکەڤتا مۆلەت وەرگرتنێ رێکخستی و قائیمقام ئەحمەد ئێتمش و فەرمانبەرێن قەزایێ لێ ئامادە بووین، کۆمۆنیستان پێکۆلکرن وێ ئاهەنگێ تێك بدەن و نەهێتە کرن، هۆسا، ل دەمێ ئاهەنگگێڕانێ، مەحمود یاسینێ کۆمۆنیست و هندەك گەنج خۆ کرنە د ناڤ رێزێن ئاهەنگگێڕان و روونشتییان دا و ڤیان ئالۆزی و فەرتەنێ پەیدا بکەن، لێ ئاهەنگگێڕان هاویشی و تەناهی پاراست و هەتا داویێ بەردەوام بوون ل سەر ئاهەنگا خۆ[١١٨].

ئەڤ رەفتارێن نەبابەتیێن کۆمۆنیستان بوو ئەگەرێ پەیدابوونا شەڕەکێ پێکۆتی ل ناڤبەرا وان و پارتییان ل نەورۆزا ١٩٦٠ێ کو ئەو ژی (شەڕێ سیکێ) بوو، چریسکا وی شەڕی هەلبوو دەمێ جرە و شەرەدەڤەك ل ناڤبەرا حەسەن عەبدوللا یێ کۆمۆنیست و سالح مراد یێ پارتی ل سەر رەوشا سیاسی و بناسکارێن پەیدابوونا فەرتەنێ هاتیە روودان، کو د وێ شەرەدەڤێ دا هەر ئێك ژ وان یێ دی ب دەستەکا ژ رێ لادای (الفئة الضالة) گونەهبار دکر، ئینا ئەندام و لایەنگرێن هەر ئێك ژ وان پارتان ژی مایێ خۆ تێ کرن و بوو ئەگەرێ هندێ هەر ئێك دەستدرێژیێ بکەتە سەر یێ دی و لێککەڤتن پەیدا ببیت، هۆسا سەعەت ١٢ی نیڤرۆ ب دار و بەر و ئامیرێن برینداركرنێ شەڕی ل ناڤبەرا هەردولا روودا و نێزیکی چوار دەمژمێران ڤەکێشا و هژمارەکا زۆر یا خەلکی پشکداری د وی شەڕی دا کر، قائیمقامیا ئامێدیێ ژی نەشیا کۆنترۆلێ ل سەر ڤی شەڕی بکەت، ئینا داخوازا هاریکاریێ ژ پۆلیسێن لیوایێ کر، ب ڤی ئاوایی، ترۆمبێلێن چەکدار و هێزا پێدڤی ژ دهۆك و مووسل بۆ ئامێدیێ هاتنە هنارتن و ب زۆری کۆنترۆل ل سەر رەوشێ هاتەکرن[١١٩].

د وی شەڕی دا ١٢ کۆمۆنیست و ١٢ پارتی تووشی برینێن جودا جودا بوون و بریندارێن کۆمۆنیست ئەڤە بوون: جەمیل ماهر، ئیبراهیم ئەحمەد، ئیبراهیم قاسم، ئەحمەد عەلی، ئەحمەد یونس، ئیبراهیم عەلی، مستەفا سەلیم، فاروق عەبدوللا، زوبێر عەلی، نازم سەعید، عەبدلخالق یاسین و حسێن عەبدوللا، بریندارێن پارتی ژی ئەڤێن خوارێ بوون: مراد یونس، مستەفا ئەحمەد، سالح فەتاح، ئەحمەد تاهر، حەسەن ئۆسمان، سالح مراد، محەمەد تاهر حسێن، عەلی حەجی عەبدلرەحمان، ئەحمەد مراد، محەمەد تاهر محەمەد، مستەفا تاهر و ئەحمەد حەجی فەتاح[١٢٠].

هەروەسا ٣٠ پارتی و ٢٨ کۆمۆنیست هاتنە دەستەسەرکرن کو ئەڤێن خوارێ ناڤێن وانە:

## لیستا دەستەسەرکرییێن پارتی:

١- حسێن یاسین خزمەتکار ل فەرمانگەها تووتنێ(انحصار).

٢- عومەر سەلیم قوتابیێ ناڤنجیا ئامێدیێ.

٣- ئیسماعیل حەجی سەلیم/ نالبەند.

٤- عەلی عەبۆش/ کرێکار.

٥- ئەحمەد حسێن/ کرێکار.
٦- محەمەد حەجی سەلیم/ دکاندار.
٧- عەبدوللا حسێن/ دکاندار.
٨- ئەحمەد تاهر/ چایچی.
٩- سالح فەتاح/ کرێکار.
١٠- تەیب محەمەد تەیب/ قوتابیێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
١١- ئەحمەد حەجی فەتاح/ ئالفچی.
١٢- ئەحمەد سەید بەکر/ دکاندار.
١٣- سەلیم عەبدوللا/ خویندکارێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
١٤- مستەفا حەجی عەبدلرەحمان/ کرێکار.
١٥- عەبدلرەحمان حسێن/ کرێکار.
١٦- عومەر محێ/ کرێکار.
١٧- مستەفا ظاهر/ خزمەتکارێ فەرمانگەها تاپۆیێ.
١٨- عەلی حەجی عەبدلرەحمان/ گۆشتفرۆش.
١٩- مراد یونس/ جۆتیار.
٢٠- سالح مراد/ دکاندار.
٢١- ئیسماعیل ئەحمەد/ گۆشتفرۆش.
٢٢- محەمەد سەعدوللا حەجی حسێن/ پەرۆکفرۆش.
٢٣- حەسەن فەتاح/ کرێکار.
٢٤- محەمەد تاهر حسێن قوتابیێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
٢٥- ئەحمەد مراد/ کرێکار.
٢٦- ئۆسمان مەلا سەعید/ کرێکار.
٢٧- حەسەن ئۆسمان/ دکاندار.
٢٨- ئیبراهیم خەلیل ئۆسمان/ کرێکار.
٢٩- زەکی خالد/ قوتابیێ ناڤنجی.
٣٠- محەمەد ئەحمەد/ کرێکار.

**لیستا دەستەسەرکرینێن کۆمەلا ئێکەتیا گەل (کومونیست- شیوعی):**

١- محەمەد سالح حەجی ئەمین/ قوتابیێ کولیژا چاندنێ.
٢- تەیب حسێن/ پەرۆکفرۆش.
٣- ئیبراهیم عەلی/ نالبەند.
٤- مەحمود یاسین/ دکانداریێ گۆمرکێ.
٥- ئەحمەد یونس/ قوتابیێ کولیژێ.
٦- یونس ئەمین/ پەرۆکفرۆش.
٧- محەمەد حەجی خالد/ دکاندار.
٨- عەلی قاسم/ نالبەند.
٩- فەوزی تاهر/ قوتابیێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
١٠- نوری ئەحمەد/ قوتابیێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
١١- ئەحمەد رەشید/ قوتابیێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
١٢ سەعید خالد/ دکاندار.
١٣- قاسم سادق/ کرێکار.
١٤- سەردار یونس/ قوتابیێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
١٥- عەبدلخالق یاسین/ کرێکارێ کارەبا ئامێدیێ.
١٦- حسێن محەمەد/ قوتابیێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
١٧- زوبێر عەلی/ کرێکارێ ئاڤاهیيان.
١٨- محیەددین رەشید/ قوتابیێ ناڤنجییا ئامێدیێ.
١٩- حسێن عەبدوللا/ دارتراش ل ئامێدیێ.
٢٠- مستەفا سەلیم/ دکاندار.
٢١- موحسن سالح/ ملکدار.
٢٢- رەشید غەفور/ پەرۆکفرۆش.
٢٣- نعمان ئەمین/ رێکخەرێ پارتایەتی.
٢٤- عارف حەجی محەمەد/ دکانداریێ گۆمرکێ.
٢٥- محەمەد عەزۆ/ گزیر.
٢٦- ئیسماعیل مەحمود/ خودان کۆگەهـ.
٢٧- مەحمود عەلی قەنتار/ نڤیسەرێ بەرخۆریێ.
٢٨- سەید نەجیب سەید سالح/ پۆستەچی.

د ڤەکۆلینێ دا دیار بوو کو هژمارەکا کۆمۆنیستان ل پشت چێکرنا ڤێ روودانێ بووینە و رۆژەکێ بەری

ئاهەنگێ پلان دانابوون دەلیڤێ نەدەن پارتی ئاهەنگێ ب جەژنا نەوروزێ بکەن، هەرچەندە ژی ڤەکۆلینێ ئەو کۆمۆنیست ب وێ رووداوێ گونەهبار کربوون، لێ قائیمقامیێ بۆ دووبارەنەبوونا رووداوێن هۆسا، داخواز ژ دەستەلاتێ کر ئەڤێن ناڤێن وان ل خوارێ ژ دەڤەرێ بێنە دوور کرن: کۆمۆنیست: (یونس ئەمین، ئیسماعیل مەحمود، محەمەد عەزۆ زاخۆیی، محەمەد حەجی خالد، نعمان ئەمین، پارتی: ئەحمەد حەجی شەعبان، مستەفا عەبدلرەحمان قەساب[١٢١].

هەروەسا پشتی چەند رۆژەکان ژ (شەرێ سیکێ) یەعروب خسرەو هاریکارێ پۆلیسێن ئامێدیێ بۆ قائیمقامی نڤیسی و گۆت: ( ژئەنجامێ چاڤدێریکرنا دوورئێخستیێن ل ئامێدیێ هاتینە ئاکنجیکرن ژ وانا رەزوقی غلیم و نەجم کەرحوت دیار بوو کو هەردوووان پێکۆلدکرن فەرتەنەگێریێ ل ناڤبەرا پارتی و کۆمۆنیستان پەیدا بکەن و ل وی دەمێ کو پشتی شەری دلگرانی ل ناڤبەرا هەردو لایەنان هەبوو، دڤێ رەوشێ دا کەرحوت ل یانا فەرمانبەران ب هاندانا رەزوقی هەوار کر و گۆت: (بکەڤیت کۆمۆنیست) کو مەرەما وی پێ نووکرنا ڤێکنەکرنێ و پەیداکرنا فەرتەنێ و جوداهیێ بوو، ئینا هاریکارێ پۆلیسان داخواز ژ قائیمقامی کر ناڤگینیێ بکەت بۆ دوورئێخستنا رەزوقی ژ ئامێدیێ، چونکی مانا وی جهێ پشتراستبوونێ نەبوو[١٢٢].

هەرچەندە ژی رێکخستنێن پیشەیی و جەماوەری یێن پارتی دگەل هەڤکووڤێن خۆیێن پارتا کۆمۆنیست هاتبوونە تێکەلکرن، لێ کۆمۆنیستێن ئامێدیێ رازی نەدبوون پارتی پشکداریێ د وان رێکخستنان دا بکەن، هەر بۆ نموونە، کۆمەلا بەرەڤانیکرنێ ژ مافێن ئافرەتان (رابطة الدفاع عن المراة)[١٢٣] ل ئامێدیێ کو بەدیعە نەجیب، زاهیدە موختار و فاتیمە عەبدوللا شەهوان بەرپرسیا وێ ب ستۆیێ خۆڤە گرتبوون، داخوازا ئەندامبوونا گەلەک ژنان د وێ کۆمەلێدا رەت کر ژ بەرکو ئەو کۆمۆنیست یان لایەنگرێن پارتا کۆمۆنیست نەبوون، یان ژی چونکی پارتی یان لایەنگرێن پارتی بوون[١٢٤].

ژ روودانێن پشتی شۆرشا ١٤ ی تیرمەها ١٩٥٨ێ دهێتە تێبینی کرن دەستەلاتا ناڤخۆیی ل ئامێدیێ، هەر ژ دەستپێکێ و هەتا دەستپێکا سالا ١٩٦٠ێ تاگریا کۆمۆنیستان کرییە، لێ هەر ژ دەستپێکا شواتا ١٩٦٠ێ هەلویستێ خۆ گوهورییە و تاگریا پارتییان کرییە و ب پارتەکا خودان مۆلەت ل قەلەمدایە، لێ پارتا کۆمۆنیستا عیراقی وەك پارتەکا هەلوەشیای و قەدەغەکری ل قەلەمدایە ژ بەرکو مۆلەت وەرنەگرتبوو، کۆمۆنیستێن ئامێدیێ ژی پشتی (شەرێ سیکێ) ب ڤێ گوهورین و وەرگوهێزێ حەسیان و هەر ژ بەر هندێ ژی چالاکیێن خۆ راوەستاندن، لێ کۆمۆنیستێن بامەرنێ ل سەر چالاکیێن خۆیێن ئەشکەرایی دبەردەوام بوون، هەتا پارە ژی بۆ رێڤەبرنا وان چالاکییان کۆمدکرن و ئەو چالاکی ژ لایێ ئەڤێن خوارێ ڤە دهاتنە ب رێڤەبرن: عەزیز ئۆسمان، عەبدوللا عەبدوللا، نوری سەید حەسەن، محەمەد سالح فەتاح و مستەفا حاجی (مامۆستا)، ئەڤە ژی بۆ ئەگەرێ هندێ حوکمدارێ گشتیێ سەربازی ب بەهانا پاراستنا تەناهیێ، ل خزیرانا ١٩٦٠ێ داخوازا دەستەسەرکرن و دوورئێخستنا عەزیز ئۆسمان ژ دەڤەرێ بکەت[١٢٥].

هەڤرکی ل ناڤبەرا کۆمۆنیست و پارتییان ل ئامێدیێ نە تنێ هەڤرکی یان شەرەنیخەکا سیاسی بوو، بەلکی هندەك ژێ ژ بەر هندەك ئەگەران بوو چ پەیوەندی ب سیاسەتێ ڤە نەبوون، بەلکی ژ بەر نەیاری یان خوونداریيەکا کەڤن بوو ل ناڤبەرا هندەك بنەمالێن هەڤرك یێن دڤیان دەستەلاتا خۆ ل دەڤەرێ بەرفرەهـ بکەن، هەتا هندەك ژ وان بنەمالان چوونە د ناڤ ڤێ رێکخستنێ یان یا هە دا بێی هندێ بەرێ خۆ بدەنە پرنسیپێن وان، بەلکی بۆ ئارمانج و مەرەمێن دی بوو کو بەری شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ د دلێ وان دا بوون و ئەڤ ئارمانجە دووبارە پشتی شۆرشێ دیار بوون، هەتا گەلەکان بۆ دەڤخۆشی و خۆلبەرشرینکرنێ بۆ خێزانێن هەڤرکی دکرن بۆ بەرفرەهـ کرنا دەستەلاتا خۆ، خۆ ددانە دگەل کۆمۆنیست یان پارتییان، هەکە نە، چەوان

دێ شێین شرۆڤە کەین کو هژمارەکا کۆمۆنیستان یان تاگر و هەڤسۆزێن وان دژی ئاهەنگگێرانێ ب جەژنا نەتەوەیی یا نەورۆزێ راوەستێن، یان هەتا ل دژی مۆلەتدانا پارتی راوەستێن، راوەستیانا گەلەك کەسان دگەل پارتی پشتی شۆرشێ، ژ بەر هندێ بوو چونکی ئەو دژی کۆمۆنیستێ بوون وەك پرنسیپەکێ خزمەتا بەرژەوەندیيان وان ناکەت؟!!

یا گرنگ ئەوە هەڤرکیيا خێزانی و سیاسی چو تیك یان برینێن کوور نەئێخستنە شەنگستەیێ جڤاکێ ئامێدیێ کو جڤاکەکێ ئێکگرتی و نەمازە بوو د پێشکەڤتن و گەردەن ئازاکرن و سیمایێ نەتەوەیی ـ چەپگر دا، باشترین گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ، رووداونەکا کوشتنێ یا ب تنێ ژی ژ بەر ئەگەرێن سیاسی و خێزانی ل ناڤبەرا لایەنێن ڤێکنەکەر و هەڤرك نەهاتیە رووداں، ژ بەر هندێ، دووبارەبوونا پێکڤەژیان و ئێکگرتنێ ل ناڤبەرا پێکهاتێن جڤاکێ ئامێدیێ یا ب ساناهی بوو پشتی هەر ڤێکنەکرن و جوداهییەکا هاتیا رووداں.

هەر چەوان بیت، پشتی پارتی مۆلەت وەرگرتی، هژمارا کەسێن ل ئامێدیێ گەهشتینە ناڤ ریزێن پارتی زێدە بوو، هەروەسا ناڤێن کەسانێن گەهشتینە ناڤ ریزێن پارتی د تووماریێن رێڤەبەریا ئەمنا مووسل دا نەهاتینە، لێ دشیاندایە ناڤێن هندەکان بینین، ژ وانا: مەعسوم ئەنوەر مایی، عەلی تەوفیق مایی، خالد یوسف و عارف سەعید[126].

لێ ئەندامێن لیژنا ناڤخۆیی یا پشتی مۆلەتدانا پارتی ئەڤێن خوارێ ژێ هاتینە نیاسین: نوری مستەفا ئامێدی (بەرپرس)، محەمەد رەشید، عەگید سەدیق، حەسەن مستەفا، زەکی حەجی عەبدلقادر، مستەفا موسا، سەدیق عەلی، عارف خالد و مەعسوم ئەنوەر مایی[127].

خەلکێ دهۆك ژی گەلەك دلخۆش بوون ب مۆلەتدانا پارتی و ب شەهیان و ئاهەنگان دەربرین ژ وێ دلخۆشیيا خۆ کرن، هەر بۆ نموونە، ل شواتا ١٩٦٠ ێ نڤیسینگەها (خەبات) ل بازێرێ ئاهەنگەك گێرا و تێدا چەندین پەیڤێن پشتەڤانیێ بۆ سیاسەتا حکومەتێ هاتنە پێشکێش کرن و پشتی مۆلەتدانا لقێ مووسل ژی ل ئادارا ١٩٦٠ێ چالاکیێن پارتی زێدە بوون و لیژنەیا ناڤخۆیی بارەگەهێ خۆ ل خانیێ عەبدوللا رواندزی ل تاخێ شێلێ ڤەکر[128] و ژ ئەندامێن وێ یێن هاتینە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: مەلا عەلی ئیسماعیل بەرۆشکی، مستەفا عەلی ئامێدی، میکائیل عەلی سارکی، محەمەد عەلی سالح، سەلاح محەمەد عەلی، سلێمان گۆیی، ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی و ئەحمەد عەرەب[129]، هەروەسا د زێدەرەکێ دی دا ناڤێن حسێن یونس زاویتەیی و حەسەن مەحمود ژی هاتینە[130].

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە کو پشتی پارتی مۆلەت وەرگرتی، هژمارا ئەوێن دگەهشتنە ناڤ ریزێن پارتی زێدە بوو و ٦٥ ناڤێن ئەندامێن وێ ل رێڤەبەریا ئەمنا مووسل[131] هاتبوونە توومار کرن، ئەڤ هژمارە ژی ب هژمارەکا راست و دروست ناهێتە ل قەلەمدان، چونکی ب دەهان ئەندامێن پارتی ل دەڤەرا بادینان ل نك دەستەلاتێ دبەرنیاس نەبوون، خۆ پشتی مۆلەت وەرگرتنێ ژی.

هەروەسا هەرچەندە وەزارەتا ناڤخۆ مۆلەت نەدابوو پارتا کۆمۆنیستا عیراقێ و ل دووڤ یاسایێ ببوو پارتەکا قەدەغەکری، لێ کۆمۆنیستێن دهۆك دبەردەوام بوون ل سەر چالاکیێن خۆ، هەر بۆ نموونە، سەعید ئەحمەد، عەبدلرەحمان عەبدلرەزاق فەیرۆز د بەردەوام بوون ل سەر داخوازیێن خۆ بۆ ئەندامەتیيا پارتا کۆمۆنیست و هاندانا خەلکی و کرێکاران بۆ ئەنجامدانا کارێن دژی دەستەلاتا ناڤخۆیی، دەمێ هەلبژارتنێن کرێکارێن ئاڤاکرنێ و پرۆژێن پەیوەندی ب ئاڤاکرنێ ڤە هاتینە کرن و لیستا سەر ب پارتی ب سەرۆکاتیيا ئیبراهیم شەریف ب سەر لیستا کۆمۆنیستان ب سەرۆکاتیيا عەبدوللا حەسەن سەرکەڤتی، کۆمۆنیستان خەلك هاندا فەرتەنێ ل ناڤ کرێکاران چێ کەن و ئێك ژ تاگرێن خۆ ب ناڤێ محەمەد راسپارد بچیتە سەندیکا کرێکاران داکو ب هندەك کارێن ئازراندنێ رابیت و دەستدرێژیێ بکەتە سەر عەبدلرەحمان مەلا دەرویش، هەکە پۆلیسان



مەلا حەمدی عەبدلمەجید
١٩٣٢- ٢٠١٢

مایێ خۆ تێ نەکریا و کۆنترۆل ل سەر رەوشێ نەکریا، دا مەسەلە گەلەك مەزن بیت و ئەنجامێن خراب هەبن، لێ پۆلیسان محەمەد عەلی دەستەسەر کر، پاشی عەبدلرەحمان عەبدلرەزاق فەیرۆز و سەعید ئەحمەد دەستەبەری بۆ کر و هاتە ئازاد کرن[١٣٢].

پشتی شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ و ڤەگەریانا بارزانی بۆ عیراقێ، زاخۆ بوو سەنتەرێ سەنگا پارتی و سالح یوسفي و حەمزە عەبدوللا و ئۆسمان محەمەد سەعیدێ قازی رۆلەکێ کاریگەر د بەرفرەهبوونا رێکخستنێن پارتی دا هەبوون، خەلکێ زاخۆ ژی ب هەلکەڤتا مۆلەتدانا پارتی ئاهەنگەك گێرا و رێکخستنێن وێ هەر ب وێ هەلکەڤتێ چەندین برۆسکەیێن سوپاسی و رێزگرتنێ بۆ سەرۆکێ حکومەتێ هنارتن، ئێك ژوان برۆسکەیان برۆسکەیەك بوو ب ناڤێ ١٦٢ ژنان کو سامیە عەبدلمەجید، فاتیمە ئەسعەد و عەدلا محەمەد ژ پێش وان ڤە ئیمزا کربوو و تێدا هاتبوو، (ژ دوورترین دەڤەرا باکوور و ژ بلنداهیا چیایێن سەربلندێن کوردستانێ، ئەم ژن و کچێن کوردستانێ، ئەندام و تاگرێن پارتا دیمۆکراتا کوردستانێ ل قەزا زاخۆ ڤێ هەلکەڤتا خۆش ب دەلیڤە دزانین داکو گەلەك ژ دل و ب گەرمی سوپاسی و رێزگرتنێن خۆ ئاراستەی هەوەیێن هێژا بکەین کو وە مۆلەتدایە پارتا مەیا خەباتێ بۆ ئازادی و دیمۆکراتیێ دکەت داکو خەباتا خۆیا ئەشکەرایی بکەت، ژ دل سۆزێ ددەینە ب سەر و مالێ خۆ قوربانیێ د رێیا پاراستنا کۆمارا خۆ دا بدەین ژ هەر دەستدرێژەکێ خرابکار، ئەی رێبەرێ عەرەب و کورد و هەمی کێمینەیێن دی بۆ پێشڤە، هەر بژیت کۆمارا مە .. بژیت پارتا مەیا خەباتکەر)[١٣٣].

هەژی گۆتنێیە کو زاخۆ ئێکەمین دەڤەرا بادینان بوو گەلەك ژن بگەهنە ناڤ رێزێن پارتی و ل دووڤ توومارێن رێڤەبەریا ئەمنا مووسل، پشتی مۆلەت وەرگرتنێ ١١١٨ زەلام و ژنێن زاخۆ گەهشتبوونە ناڤ رێزێن پارتی[١٣٤].

لێ لیژنا ناڤخۆیا پارتی یا پشتی مۆلەت وەرگرتنێ ل زاخۆ هاتیە پێکئینان ژ ڤان کەسێن خوارێ پێکهاتبوو: نەعمان عیسا بارزانی (بەرپرس)، مەلا سالح بالقوسی، عەلی هالۆ، شێخ جەمال بریفکی، ئۆسمان قازی، سالح حامۆ، عەبدولستار حەجی مووسا، مەلا قاسم ئێمینکی، عەبدلرەحمان حەجی عەلی و مەلا عەبدولغەنی ئیبراهیم[١٣٥].

پێدڤییە ل ڤێرە ئاماژێ بکەینە وێ چەندێ کو ناڤێن ئەندامێن لیژنەیێن ناڤخۆیێن پارتی ل بازێرێن بادینان بەری و هەتا رادەیەکێ پشتی مۆلەتدانا پارتی ژی ل رۆژا ٩ شواتا ١٩٦٠ێ، د هوور نینن و ژ ژێدەرەکی بۆ ژێدەرەکێ دی جوداهی تێدا هەیە و ناهێنە کۆنترۆل کرن، چونکی رێکخستن یا نهێنی بوو هەتا وێ دەمی پارتی مۆلەت وەرگرتی، دەمێ کارێ ئەشکەرایی ژی هەیامەکا کورت بوو و ژ سالەکێ نەدبۆری و



**ئەنوەر مایی**
**١٩١٣-١٩٦٣**

دەستەلاتێ چاڤدێری و زێرەڤانی ل چالاکیێن پارتی دکر و زانیاری ل سەر ئەندامێن وێ کۆم دکرن، ژ ڤێ گرنگتر ژی، وی دەمی پارتی ب خۆ ژی گرنگی نەدابوو دۆکیۆمێنتکرن و توومارکرنا دیرۆکا رێکخستنێن خۆ، هەتا گەلەك پارتیێن پێشەنگ مرین یان شەهید بووین، ژ بەر هندێ، داخوازا لێبۆرینێ دکەین هەکە ناڤێن گەلەك چالاکڤانان نەهاتبن یێن ل سالێن ١٩٤٦-١٩٧٠ یێ رۆلەکێ کاریگەر د چالاکیێن پارتی دا هەبین.

## پێنج: شۆرشا ١١ی ئەیلوول ١٩٦١ێ

کوردان مفا ژ وان مافێن سادە دیت یێن پشتی شۆرشا ١٤ی تیرمەهێ ب دەستڤەئینابن، لێ رەوش ل کوردستانێ گەلەك نەهاتە گوهورین و جهێ رازیبوونێ نەبوو، هەروەسا چاکسازیێن چاڤەرێکری نەهاتن و دەڤەرێن کوردی ب تایبەتی بەرهنگاری سستی و پەنگیانا ئابووری بوون و حکومەتێ چو پرۆژە بۆ چارەکرنا دۆزا کوردی پێشکێش نەکرن، بۆ زانین ژی، پارتی د هەلکەفتێن فەرمی دا و هەر ژ هەلبوونا شۆرشا ١٤ تیرمەهێ و دگەل دەرکەفتنا هژمارەیێن ئێکێ یێن رۆژنامەیا خەبات و ل دەمێ کۆنگرێ پێنجێ یێ پارتی یێ ل گولانا ١٩٦٠ێ هاتیە گرێدان مەسەلا ئۆتۆنۆمیێ بۆ کوردستانێ پێشکێش کربوو.

هەرچەندە ماددێ (٣) یێ دەستووری بەروەخت تێکەهێ ئێکەتیا نیشتمانی موکم کربوو، لێ حکومەتێ ئەو چەند ب جه نەئینا ب ئاوایەکێ سەرڤە سەرڤەیێ بەرتەنگ دا نەبیت و دەستەلاتێ چو گرنگی نەدا وی ماددەی، ئەڤە سەرباری کو ئەڤ ماددەیێ هەڤدژ بوو دگەل ماددێ ٢ کو عیراق ب پشکەك ژ نەتەوێ عەرەب ل قەلەم ددا.

عەبدولکەریم قاسم مۆلەت دا پارتی داکو چالاکیا خۆیا سیاسی بکەت، لێ هەڤدەم ب هەمی رێیان پێکۆل دکر توخیبەکی بۆ چالاکی و رۆلێ وێ دانیت، یان ژی تنێ ببیتە رێکخراوەکا رۆشنبیریا کارێ وێ پشتەڤانیکرنا وی بیت[١٣٦]، پێدڤییە بێژین ژی کو عەبدولکەریم قاسم ژ پێشەنگێن وان بوو یێن ب گۆتن و کریار پێکۆل کرین پارتی ژ بارزانیێ سەرۆکێ وێ جودا بکەت، وی هەردەم پشتراست دکر کو چارەنڤیسێ پارتی ب تمامی ل سەر پەیوەندیا وێ ب بارزانی ڤە راوەستیایە[١٣٧].

هەر چەوان بیت، دگەل نێزیکبوونا داویا سالا ١٩٦٠ێ داخوازێن کوردان رژدتر لێ هاتن و هەلویستێ حکومەتێ ژی رەقتربوو و عەبدولکەریم قاسمی پێکۆل دکر پارتی ژ ناڤ ببەت یان بکێشیتە ئارێشەیەکێ داکو بکەتە بەهانە و پێ دریەکێ لێ بدەت، ئینا کێمتر پویتە ب مەلا مستەفایێ بارزانیێ سەرۆکێ پارتی دکر و پتر پویتە ب ئاغایێن کوردێن نەیارێن بزاڤا

رزگاریخوازا کوردی دکر، هەر بۆ نموونە، دەمێ ل رۆژێن ٥-١٠ی گولانا ١٩٦٠ێ کۆنگرێ پارتی ل بەغدا دهاتە گرێدان، عەبدولکەریم قاسمی ب پرۆپاگەندە و هەوار هەوارەکا مەزن پێشوازیا شاندەکێ ئاغایێن عەشیرەتێن کورد دکر کو دبەرنیاس بوون ب نەیاریکرنا بزاڤا نیشتمانیا کوردی، پارتی ئەڤ کریارا وی دەمی هاتیەکرن ب سڤکاتیکرن ب پارتی و سەرۆکێ وێ ل قەلەمدا[١٣٨]، ل تەباخا ١٩٦٠ێ ژی ب فەرمانا قاسمی هەمی گوژمێ پارەیێ بۆ خەرجیێن بارزانییێن ل نیسانا ١٩٥٩ێ ژ ئێکەتییا سۆڤیەتی ڤەگەڕیاین، رادەستی عەشیرەتێن کوردی یێن نەیارێن وان هاتەکرن[١٣٩].

قاسمێ پەنا برە بەر ئاوایەکێ دی بۆ کێمکرنا سەنگا کوردان و خەباتا وان یا نیشتمانی، ئەڤە ژی دەمێ ب چاڤەکێ سڤك بەرێ خۆ دایە رۆلێ وان د دیرۆکا عیراقێ دا و پرۆپاگەندا وێ چەندێ کر کو وان چو کەسایەتییا نیشتمانییا نەمازە و خۆسەر نینە و پەیڤا کورد ژی چو تێگەهێن نەتەوەیی نینن[١٤٠]، بۆ پشتەڤانیکرنا بۆچوونا خۆ ژی ل تەباخا ١٩٦٠ێ و شواتا ١٩٦١ێ زنجیرەکا گۆتاران د هەردو رۆژنامەیێن (الثورة) و (بغداد) دا بەلاڤ بوون کو سۆروسۆر داخواز دکرن گەلێ کورد د بۆتکا (بوتقە) گەلێ عەرەبی دا بێتە بشافتن و دانپێدان ب مافێن وی یێن نەتەوەیی نەهێتەکرن، فەرە بێژین کو سەرگۆتارێن هەردو رۆژنامەیان دەربرین ژ دیتن وبۆچوونا حکۆمەتێ دکر، ژ بەرکو نڤیسەرێن وان رۆژنامەیان پەیوەندیێن موکم دگەل عەبدولکەریم قاسمی هەبوون[١٤١].

پشتەڤانییا قاسم بۆ ئاغایێن کوردێن دژی بزاڤا نەتەوەیی یا کوردی بوو تشتەکێ ئەشکەرا، هەڤدەم دەستەلاتێ ژی هەوەك کرە سەر سەرکردایەتییا پارتی و دەستەسەرکرنا سالح یوسفی ئەندامێ لیژنا ناوەندی ل رۆژا ١٥ی چریا ئێکێ یا ١٩٦٠ێ نیشانێ دەستپێکا وێ هەوێ بوو[١٤٢].

پارتی شیا وان عەشیرەتان ببەزینیت یێن (قاسم)ی ڤێرا بەردایین و پەنا برە بەر پێشکێشکرنا گازندە و یاداشتان ل سەر رەوشا تێکچوویا کوردستانێ و ل سەر مافێن نەتەوەیی یێن گەلێ کورد، هەر بۆ نموونە، بارزانی داخواز کر ماددێ ٣ یێ دەستووری بەروەخت بێتە ب جهـ ئینان و دەمێ قاسمی ئەو گازندە و یاداشت رەتکرین، بارزانی بۆ نڤیسی و گۆت: (هەکە حکۆمەتا عیراقێ دۆزا کوردی چارە نەکەت، کورد دێ نەچار بن پەنایێ بەنە وێ رێ یا گەلێ جەزائیری پەنا بۆ بری)[١٤٣]، ئانکو کورد دێ چەکی هەلگرن داکو پێ بەرەڤانیێ ژ مافێن خۆ بکەن، هەروەکی گەلێ جەزائیری دژی کۆلۆنیالیزما فرەنسی کری.

قاسمی گەلەك پێنگاڤ هاڤێتن بۆ کێمکرنا سەنگا بارزانی و لاوازکرنا پێگەهێ وی، هەتا وی دەست ب پێکۆلا تیرۆرکرنا بارزانی کر ل بەغدا، هەروەسا بەرامبەری رژدییا قاسم بۆ گوهنەدانا گازندە و ئۆپۆزسیۆنا کوردی یا نەرازی ژ رژێما حوکمێ وی، بارزانی نەچار بوو ل نیڤا ئادارا ١٩٦١ێ ب ئاوایەکێ نەپەنی ژ بەغدا دەربکەڤیت و بچیتە بارزان[١٤٤].

کارڤەدانا حکۆمەتێ ژی ل سەر دەرکەڤتنا بارزانی ژ بەغدا، دەستپێکرنا هەوەکا دەستەسەرکرنێ بوو دژی ئەندامێن پارتی و دائێخستنا پتریا لقێن وێ، ل رۆژا ٢٢ی ئادارا ١٩٦١ێ دەرکەڤتنا رۆژنامەیا خەبات ژی راوەستاند و مۆلەتا پارتێ ڤەکێشا، ئینا ل داوییا هەیڤا گولانێ پارتی قەستا کارێ نهێنی کر[١٤٥].

پارتی دو یاداشت پێشکێشی عبدلکریم قاسم کرن، یا ئێکێ ل رۆژا ٨ خزیرانا ١٩٦١ێ کو سیمایەکێ گشتی هەبوو و پەیوەندی ب رەوشا سیاسیا عیراقێ ڤە هەبوو و تێدا بەحسێ پویتەنەدانا حکۆمەتێ بوو ل سەر داخوازیێن نەتەوەیی یێ گەلێ کورد، یاداشتا دووێ ژی ل رۆژا ٣٠ تیرمەهێ بوو و تێدا تەئکید ل سەر مەترسییا رەوشێ هاتبوو کرن و قاسم ب سیاسەتا (پرتکە و زالبە) ل کوردستانێ هاتبوو گونەهبارکرن و داخواز کربوو هێزێن سەربازی یێن بۆ هندەك دەڤەرێن دەستنیشانکریێن کوردستانێ هاتینە هنارتن بێنە ڤەکێشان و ماددێ ٣ یێ دەستووری بەروەخت بێتە ب جهئینان و ئازادیێن دیمۆکراتی هەبن[١٤٦].

(قاسم)ی نەتنێ هەردو یاداشت رەتکرن، بەلکی

رەتکر پێشوازیا چو شاندێن کوردی ژی بکەت، هەروەسا دەستەلاتێ بارەگەهێ پارتی ل بەغدا دووربێچکر و ئەوێن تێڤە دەستەسەر کرن، ژ بەر هندێ، سەرکردایەتیا پارتی نەچاربوو ب ئاوایەکێ نەپەنی ژ بەغدا دەربکەڤیت و قەستا کوردستانێ بکەت[١٤٧].

ژ بەر رێکارێن دەستەلاتێ، پارتی نەچار بوو ئاوایێ خۆ بگوهوریت داکو (قاسم)ی نەچار ببیت دەست ژ سیاسەتا خۆیا دژی کوردان بەردەت، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ٦ ئیلونێ مانگرتنەکا گشتی ل کوردستانێ رێك ئێخست، لێ ل شوونا هندێ داخوازیێن کوردی ب جە بینیت، قاسم هێزێن خۆیێن چەکدار بۆ لێدانا کوردان ب کار ئینان و وان هێزان ل رۆژا ٩ ئیلونا ١٩٦١ێ دەربەندیخان بومبەباران کر و رۆژا پاشتر هێرشەکا بەرفرەهـ دەست پێ کر، ئینا کورد نەچار بوون ل رۆژا ١١ێ ئیلونێ بەرسڤێ بدەن و هۆسا شۆرشا کوردی دەست پێ کر[١٤٨].

لێ ل دەڤەرا بادینان، دەستەلاتا ناڤخۆیی ل لیوا مووسل هەتا پشتی شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ ێ ژی ب لۆژیکا رژێما شاهینی کار و رەفتار دکر و هەلویستێ دەزگەهێن ئێمناهی و سەربازی و کارگێری بەرامبەری هێڤیێن نەتەوەیی یێن گەلێ کورد و چالاکیێن پارتی نەهاتبوو گوهورین خۆ پشتی پارتی مۆلەت وەرگرتی ژی، هەتا ل هەیڤا تەباخا سالا ١٩٥٨ ێ هندەك ئەندامێن پارتی ل بازێرێ ئاکرێ ب گونەهباریێن سیاسی دەستەسەر کربوون کو دەستەلاتا سەردەمێ رژێما شاهینی پێ گونەهبار کربوون.

دەستەلاتا مووسل، نەخاسمە ژی رێڤەبەریا ئەمنا مووسل، ب راهێلان و گرتنا پارتییان رانەوەستیا، بەلکی ل تیرمەها ١٩٥٩ێ جرجیس فتح الله ئەندامێ پارتی/ سەرنڤیسەرێ رۆژنامەیا الحقیقة ـ راستی دەستەسەر کر و ئەنوەر مایی نەچاربوو قەستا بەغدا بکەت، ل رۆژا ١٨ێ تیرمەهێ ژی ئەندامێ پارتی حسێن سلێمان ب گونەهباریا هەلاویستنا بەلاڤۆکەکا پارتی هاتە دەستەسەر کرن[١٤٩] و ل ئیلونا ١٩٥٩ێ ژی ٣١٠ جۆتیار و خەلکێ هندەك گوندێن سەرسنکی ئەرزوحالەك ئاراستەی بەرپرسان کر دژی باندەکا پێکۆل دکر گونەهبارێن نەرەوا و بێ بنەما ب نیشتمانپەروەران ڤەنیت[١٥٠].

هۆسا شەرێ سار یێ دەستەلاتێ ل مووسل ل سەر پارتی راگەهاندی، بوو نەیارییەکا ئەشکەرایی، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ٦ تیرمەها ١٩٦٠ ێ دەستدرێژی ل سەر مەلا حەمدی عەبدلمەجید هاتەکرن و ناڤبری ب دژواری هاتە قوتان و هەمی رۆژنامەیێن خەبات کو ڤێ بوون هاتنە دراندن و دەستەلاتێ چ پێرابوون بەرامبەری وان نەکرن یێن دەستدرێژی کرینە سەر[١٥١].

تیرۆرکرنێن سالێن ١٩٥٩- ١٩٦١ێ ژ لایێ حزبا بەعس و ئیخوان مووسلمین ڤە دهاتنە رێکخستن گەهشتنە ١٢ ئەندامێن پارتی و نیشتمانپەروەرێن کورد، ژ وانا: ئۆسمان جەهوەر، محەمەد زاخۆیی، عەزیز سەید قادر و ئەحمەد سەعدوللا بامەرنی[١٥٢].

هەروەسا ل نیسانا ١٩٦٠ێ ٥٤٥ هەڤوەلاتیێن قەزا شێخان، ژ وانا ئەندامێن لیژنا ناڤخۆیی یا پارتی ژی، ئەرزوحالەك پێشکێشی عەبدولکەریم قاسمی و لایەنێن پەیوەندیدار کر و تێدا داخواز کرن توخیبەك بۆ تاوانێن کەڤنەپەرێسی بێتە دانان و رێکارێن یاسایی دەرهەڤێ وان بێنە ب کارئینان، نەخاسمە ژی کو رەفتارێن وان جهێ پەسندان و رێزگرتنا ئیزگەهێن نەیارێن کۆمارا عیراقێ بوون[١٥٣].

دەمێ ل رۆژا ٢ ئیلونا ١٩٦٠ ێ هەلبژارتنێن دەستەیا کارگێریا کۆمەلێن جۆتیاران ل لیوایێ هاتینە کرن، دەستەلاتێ کاندیدێن پارتی حەیدەر، دەروێش، حەسەن مەحمود، مەلا تاهر عومەر، فەیسەل حەسەن نزارکی، عەلی هالۆ پشتی قوتان و سڤکاتیپێکرن و گەف لێکرنێ ژ لایێ پۆلیسان ڤە یێن جڤین ددانە کورد و کوردستانێ هاتنە دوورئێخستن، بۆ زانین ژی، ئەوان کاندیدان نوونەریا دۆرێن ٨٠ هزار جۆتیاران دکرن، وەزارەتا ناڤخۆ ژی چو بەرێ خۆ نەدا وێ گازندا لیستێ پێشکێش کری یاکو سەرباری کاندیدان، حاجی سالح، حەسەن عەبود، عومەر سلێمان ئەحمەد،

یەحیا یونس، عەزیز شوی و جنێدی حەسەن ژی ئیمزا ل سەر کربوون[١٥٤].

ل رۆژا ٦ چریا دووێ یا ١٩٦٠ێ ژی میکائیل عەلی سەعید فەرمانبەرێ باژێرڤانیا دهۆك کو ئەندامێ پارتی بوو ل سەر پێشنیازا قائیمقامی بۆ ناحیا شرگات هاتە دوورئێخستن ب گونەهبارییا وێ چەندێ کو ئەو کەسەکێ جوداخوازە و چاپخانا خەبات وەك جهەکێ نەپەنی بۆ کۆمبوونێن خۆ دگەل (جوونەکا تاوانبار) ب کار دئینیت، ژ وانا: مەلا عەلی ئیسماعیل پێشنڤێژێ مزگەفتا موفتی یێ پاشی جهێ ئاکنجیبوونا نەچاری بۆ هاتیە دەستنیشانکرن، ل شرگات ژی میکائیل عەلی ل رۆژا ١٨ نیسانا ١٩٦١ێ هاتە گرتن و بۆ ماوێ (٥) سالان ژ کارێ وی هاتە لادان[١٥٥].

هەروەسا ل رۆژا ١٥ چریا ئێکێ یا ١٩٦٠ێ دەستەلاتێ ل مووسل سالح یوسفي دەستەسەر کر و دەمێ خالد یوسفي بەرپرسیا رێکخستنا پارتی ل باژێری ب ستۆیێ خۆڤە گرتی ئەو ژی هاتە دەستەسەرکرن، ئینا پارتی عەبدوللا ئیسماعیل (مەلا ماتۆر) راسپارد بەرپرسیا رێکخستنا بادینان ب ستۆیێ خۆڤە بگریت[١٥٦]، هەروەسا ئەنوەر مایی ل بەغدا هاتە گرتن و بۆ (قلعة صالح) ل لیوا عمارە هاتە دوورئێخستن، چریا دووێ یا ١٩٦٠ێ ژی پارتی داخواز کر ئەندامێن وێ یێن دەستەسەرکری بێنە ئازاد کرن، ژ وانا: سالح یوسفي، یاسین حەجی ئەحمەد، مەلا عەلی بەرۆشکی بەرپرسێ لیژنا ناڤخۆیا دهۆك، ئیبراهیم یاسین ئەندامێ لیژنا ناڤخۆیا ئاکرێ، فائق حەجی شەریف ئاکرەیی ئەندامێ دەستەیا پشکنین و چاڤدێریێ یا پارتی، هاشم حەسەن ئاکرەیی، عەلی حەمدی بێدوهی، خالد یوسفي و عەبدلرەحمان ئاکرەیی[١٥٧].

ل رۆژا ٢٩ کانوونا دووێ یا ١٩٦١ێ ژی حەیدەر شێخ سلێمان ئەندامێ لیژنا ناڤخۆیا پارتی (ب دەستێ هندەك توخمێن خرابکار و تاوانکار) هاتە تیرۆرکرن هەروەکی رۆژنامەیا خەبات گۆتی و رۆژنامەیێ داخواز ژ بەرپرسان کر ڤەکۆلینەکا بلەز و دادپەروەرانە د وێ

روودانێ بکەن بۆ ئەشکەراکرنا تاوانبارێن تەناهی و رحەتیێ تێك ددەن[١٥٨]، هەروەسا دەستەلاتێ ل شواتا ١٩٦١ێ ب سەر مالا ئەحمەد جەسیم، عەبدلرەحمان جەسیم و عنبەر محمەد ل تاخێ (وادي حجر) ل مووسل دا گرت و هەرسێ دەستەسەرکرن، دیسا رێڤەبەرێ پۆلیسێن مووسل گازی کرە ئەندامێ پارتی مەلا عاسم عەبدوللا و ئەو ئاگەهدار کر کو ژ باژێری دەرکەڤیت، ل رۆژا ٢١ی ئادارا ١٩٦١ێ ژی نەشئەت گەیالی هاریکارێ پۆلیسێن شێخان داخواز کر دگەل حوکمدارێ گشتیێ سەربازی بئاخڤیت بۆ دوورئێخستنا گەلەك ئەندامێن پارتی ژ باژێری ب گونەهبارییا وێ چەندێ کو چالاکیێن یێن سیاسی دکەن، ژ وانا: حەسەن محێ، ئەمین ئەحمەد و جۆقی خدر و د وێ داخوازیێ دا هاتبوو: (ئەو ئەندامێن دیارێن پارتینە و هەبوونا وان و بەلاڤکرنا رێنماییێن پارتێ ژ لایێ وان ڤە ل دەڤەرێ مەترسییا خۆ ل سەر سلامەتییا کۆمارێ و تەناهیێ هەیە، نەخاسمە ژی پشتی ئنیەت و ئارمانجێن ڤێ پارتێ ئەشکەرا بووین) و هاریکارێ پۆلیسان داخواز کر ژ دەڤەرێ بێنە دوورئێخستن سەخمەراتی پاراستنا سلامەتییا تەناهیێ و ئەو (ئانکو پارتی) ب جوونا لادای ژ رێیا راست گونەهبار کر و دیار کر کو ب ئاوایەکێ نەپەنی و ب خۆشخۆشکان کەسانێن نەفس نزم سەردا دبەت[١٥٩].

موتەسەرفییا لیوا مووسل ژی ل رۆژا ١٠ی تیرمەها ١٩٦١ێ داخواز ژ رێڤەبەرییا ئەمنا لیوایێ کر ناڤێن بارزانییێن ل هەردوو کارگەهێن شەکرێ و تەڤنی کار دکەن بهنێریت، وی ژی ناڤێن ١٦ ژ وان هنارتن و ئەو وەك کەسانێن رژد و سەرگەرم بۆ بەلاڤکرنا پرۆپاگەندا کوردی ل قەلەمدان و دیار کر کو ل وێرێ ب ئاوایەکێ هوور و نەپەنی چاڤدێرییا لڤین و پەیوەندیێن وان دهێتەکرن، ل داوییا تیرمەها ١٩٦١ێ ژی هەمی بارزانییێن ل کارگەهێن مووسل کار دکرن ژ کارێن وان لادان کو هژمارا وان ١٠٢ کرێکار و فەرمانبەر و تەکنیکار بوون، ئەڤە ژی ب بەهانا وێ چەندێ کو د سەرژمێرییا ١٩٥٧ێ دا نەهاتینە توومار کرن و وی

دەمی و ژ سالا ١٩٤٧ێ وەرە ل ئێکەتیا سۆڤیەتی بوون، لێ راستیا وێ ئەو بوو کو رێڤەبەریا ئەمنێ ئەو ب پارتیێن ترسناك و سەرگەرم بۆ چالاکیێن پارتایەتی ل قەلەمدابوون، هەروەکی د نڤیسارا رۆژا ٢٦ی تیرمەها ١٩٦١ێ دا هاتی[١٦٠].

سەرباری کو پارتی مۆلەت وەرگرتبوو، لێ هاریکارێ پۆلیسێن زاخۆ بەردەوام بوو ل سەر راهێلان و چاڤدێریکرنا ئەندام و تاگرێن وێ و دەستەسەرکرنا کەسانێن چالاکێن وێ، هەرچەندە ژی لیژنا ناڤخۆیا پارتی ل خزیرانا ١٩٦١ێ[١٦١] هۆشداری دابوویێ، لێ ل دووڤ داخوازیا موتەسەرفیا مووسل، قائیمقامیا قەزایا مووسل ل رۆژا ٢٤ی تیرمەها ١٩٦١ێ ناڤێن پارتی یێن ل ناحیا باشیکێ هنارتن یێن ترسا هندێ هەبوون ببنە مەترسی ل سەر تەناهی و سلامەتیا کۆماری کو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ بوون، عەبدلرەحمان سەید عەلی (کۆمیسەرێ بنکەهێ پۆلیسێن ناحیێ)، شێخ حسێن ئیبراهیم (مامۆستا)، سەبری مراد (مامۆستا)، جومعە حاجی کنجی (مامۆستا)، فائق رەشید بەردەست (مستخدم)ێ ژ کار لادای)[١٦٢].

هەروەسا دەستەلاتێ ل تەباخا ١٩٦١ێ ئیبراهیم محەمەد عەبدوللا بەرپرسێ رێکخستنا سەربازیا پارتی ل مووسل و هژمارەکا دی یا ئەندامێن سەربازێن پارتی ب گونەهباریا کۆمکرنا بێشان بۆ پارتی دەستەسەر کرن[١٦٣].

ل تەباخا ١٩٦١ێ ژی لقێ پارتی ل مووسل هاتە دائێخستن و هەمی ناڤمالیا وێ هاتە دەستەسەرکرن، لێ بەری هنگی هەمی نڤیسار و توومارێن لقێ ب ئاوایەکێ نەپەنی بۆ دهۆك هاتبوونە ڤەگوهاستن، ل رۆژا ١١ی ئیلۆنێ ژی پێزەڤەنگی (فەسادی)یا ئیبراهیم ئەحمەد موختارێ گوندێ بەردەرەش و دەستەکا وی موختارێن گوندێن بەردەرەشا بچووك، کانی هەسپان، کانیلان، محەمەد مستەفا و مستەفا مەولود، هەر ئێك ژ عەلی عەبدوللا (عەلی میشە)، کەریم مەلا عەبدوللا (ژ گوندێ شیڤەرێ)، عەبدلرەحمان مەلا عەبدوللا (ژ گوندێ شیڤەرێ)، حەسەن عەبدوللا (ژ گوندێ ئەسماوە)، ب گونەهباریا ژێیاتیا وان بۆ پارتی و گەریانا وان ل دەڤەرێ بۆ بەلاڤکرنا چەکی و جەبلخانێ ب سەر (باندێن خۆ) بۆ تێکدانا رەوشا تەناهیێ ل دەڤەرێ هاتنە دەستەسەرکرن[١٦٤]، هەروەسا سێ رۆژان پشتی شۆرشێ هژمارەکا ئەندامێن پارتی هاتنە دەستەسەر کرن، ژ وانا: سوبغەتوللا مزووری، مەلا شەمسەددین سەیدخان، مەلا تاهر عەلی رەشاڤایی و هندەکێن دی ... رۆژا ١٨ی ئیلۆنا ١٩٦١ێ ژی عەبدولعەزیز سەید قادر حاجی ئەندامێ پارتی ب ئەشکەرایی ل بەرامبەری دکانا خۆ ل تاخێ فەیسەلیێ ب دەستێ جاشان (چەتێن حکۆمەتێ) هاتە تیرۆر کرن[١٦٥].

هەروەسا ژ بەر هەوا تیرۆرکرن و دەستەسەرکرن و راهێلانێن دەستەلاتێ کرین و د وێ هەوێ دا ب دەهان کادرێن پارتی و لایەنگرێن وێ هاتینەگرتن، پارتی گەلەك یاداشتێن نەرازیبوونێ پێشکێشی عەبدولکەریم قاسم و حاکمێ سەربازێ گشتی کرن و تێدا داخواز کر دەست ژ کریارێن هۆسا بێتە بەردان و و یێن دوورئێخستی بۆ ناڤەراست و باشوورێ عیراقێ هاتینە دوورئێخستن بێنە ئازاد کرن[١٦٦]، لێ دەمێ دەستەلات ل دووڤ وان یاداشت و داخوازیان نەهاتی، مەکتەبا سیاسیا پارتی رێنمانیێن خۆ ئاراستەی ئەندامێن خۆ کرن یێن گەڤا دەستەسەرکرنێ ل سەر هەین بێنە کوردستانێ، هۆسا، گەلەك ئەندامێن پارتی قەستا دەڤەرا بادینان کرن، ژ وانا: مەلا حەمدی عەبدلمەجید سەلەفی، رێکخستیێن پارتی ژی ل دەڤەرێ وەکی رێکخستنێن پارتی ل هەر دەڤەرەکا دی یا کوردستانێ خۆ بۆ شۆرشێ ئامادە دکر.

بەرهەڤیێن پارتی بۆ شۆرشێ ل بادینان، پشتی تێکچوونا پەیوەندیێن وێ دگەل حکۆمەتێ، د نامەگوهورین و نڤیسارێن حکۆمەتێ و راپۆرتێن باوەرپێکریان بۆ حکۆمەتێ دهنارتن دیاردبیت وان راپۆرت و نڤیساران هۆشداری ددانە حکۆمەتێ ژ هەلبوونا شۆرشێ، هەژی گۆتنێیە کو کارگێریا حکومی ل بادینان ئێکەمین لایەن بوو ئاگەهداری

و هۆشداری ژ هەلبوونا شۆرشا کوردی دای، هەر بۆ نموونە، رێڤەبەریا پۆلیسێن دهۆك د نڤیسارەکا خۆیا رۆژا ١٢ ئادارا ١٩٦١ێ دا بۆ رێڤەبەریا مووسل دبێژیت: هندەك گۆتگۆتك بەلاڤ بووینە کو پارتیێن ل دهۆك، شێخان، ئامێدیێ و زاخۆ ل دژی سلامەتیا کۆماری پشتەرێ بووینە و حکۆمەتەکا جوداخواز پێك ئینانە و بەری جەژنێ یان د جەژنێ دا یان ژی پشتی جەژنێ دێ سەنتەرێن قەزایێن ناڤبری داگیرکەن، ژ بەرکو ئەڤ چەندە مەترسییە ل سەر تەناهیێ، هیڤیخوازم فەرمانا پێدڤی بدەن[١٦٧].

هەروەسا رۆژا ٢٠ ئادارا ١٩٦٠ێ کەسەکێ نەنیاس ل دهۆك بۆ رێڤەبەریا ئەمنا گشتی یا بەغدا نڤیسی و گۆت: من دڤێت هەوەیێن رێزدار ئاگەهدار بکەم کو هندەك کەس یێ دژی کۆمارا ١٤ی تیرمەهێ کار دکەن و یێ داخوازا پێکئینانا دەولەتەکا کوردی یا جودا ژ (کۆمارا نەمر) دکەن، وان کەسان پەیوەندی دگەل هەمی لایەنان هەنە و کاری بۆ ب هێزکرنا پارتا خۆ دکەن، هەروەسا گەلەك چالاکیێن دی ژی هەنە دێ ئەشکەرا بن دەمێ هوون وان کەسان دەستەسەر دکەن، هەروەسا خودانێ ڤێ (هەوالدەریێ) ناڤێن هندەك ژ وان کەسێن ب ڤان کریاران رادبن ئینانە، ژ وانا: کورێن عەبدلمەجید رەشید ئاغا ل زاخۆ کو ئەو ب خۆ سەرۆکێ پارتێ یە، هندەك کەس ل گوندێ ئاسیهێ، ژ وانا: عومەر و ئەمین کورێن عەبدلرەحمان، سلێمان رەشید و محەمەدێ کورێ فاتیمایێ و بشار ....، سلێمان حەجی حسێن و دەستەکا وی کو کەس وکارێن وی نە و ل دەمەکێ نێزیك دێ شۆرشا خۆ دژی حکۆمەتێ راگەهینن[١٦٨].

رۆژا ١٣ی تیرمەها ١٩٦١ێ عەبدللەتیف دەراجی موتەسەرفێ مووسل بۆ حاکمێ گشتی نڤیسی: ژ ئاخڤتن و پستپستێن ل دەڤەرێ دهێنە گۆتن دیار دبیت کو ب هەلکەڤتا ١٤ی تیرمەهێ روودانێن نوو ل دەڤەرێن کوردی دێ چێ بن، هندەك گۆتگۆتکێن نەپشتراستکری ژی هەنە کو پارتی و توخمێن فەرتەنەگێرێن ب دووڤ وان کەڤتین و ئێزدیێن پشتەڤانیا وان دکەن، ل دووڤ پلانەکا رێکخستیا پارتیێن هزرا جوداخوازیێ هەین ئەڤرۆ بیت یان سوباهی دێ جودابوونێ راگەهینن، هەروەسا ل دووڤ وان زانیاریێن ب دەست مە کەڤتین، هندەك زەلام ژ گوندان دزە کرینە وان دەڤەرێن دبێژن کو لێکدانێن چەکداری ل ناڤبەرا پارتییان و کوردێن نەیارێن وان یێن ئامادەیا خۆ دەربرین خۆ بدەنە ئالیێ حکۆمەتێ دێ روودەن هەکە روودانەك یان دەستدرێژیەك ل سەر وان هاتە کرن[١٦٩].

هەروەسا نامەیا عەبدولرەحمان دینۆ یێ ژ بەر دەستەلاتێ رەڤی، کو ل رۆژا ١١ی تیرمەها ١٩٦١ێ بۆ حەسەن ئەفندی کۆمیسەرێ بنکەهێ پۆلیسێن سندی هناری رۆناهیێ دئێخیتە سەر رۆلێ ئاغایێن پشتەڤانێن حکۆمەتێ کا چەند حکۆمەت ب خەلکی را بەردایە و چەند رۆلێ خۆ د گورمژاندن و ئالۆزترکرنا رەوشێ دا هەبوویە، د وێ نامەیێ دا هاتییە: برایێ هێژا ... پشتراستبە کو ئەز زەلامەکێ ئاشتیخوازم و حەز ژ خرابی و زیانان ناکەم، لێ رەوش وەسا دخوازیت خۆ ژ وێ حکۆمەتێ بپارێزین یا رێزێ ل کەسانێن ژ مە نزمتر دگریت و دەستدرێژیێ دکەتە سەر مە، ژ بەر ڤان تشتان ئەم یێ خۆ دپارێزین، هەکە نە حکۆمەت حکۆمەتا مەیە و ئەم گوهدارێن وێینە و ئەوێن ڤی ئاگری هەلدکەن ئاغایێن (خایینێن نیشتمان و حکۆمەتێ نە)[١٧٠].

تشتێ جهێ تێهزرینێ ژی ئەوە عەبدللەتیف دەراجی موتەسەرفێ مووسل رۆژا ١٠ ی ئەیلوول ١٩٦١ێ برۆسکەیەك بۆ وەزارەتا ناڤخۆ، سەرۆکاتیا ئەرکانێن لەشکەری، حاکمێ گشتیێ سەربازی و هژمارەکا لایەنێن دی هنارتبوو و تێدا گۆتبوو: گۆتگۆتکێن ب هێز هەنە کو پارتی شەڤا ١١/١٢ی ئیلونێ ل هەمی قەزایێن باکوور دێ پشتەرێبوونا خۆ راگەهینن، ئەم وەسا باوەر دکەین ئەڤ گۆتگۆتکە راست بن، چونکی کریارێن دو رۆژێن بۆری کرین پشتەڤانیا وێ چەندێ

دكەن، وان دوهی رێیا دهۆك - مووسل برینبوو و ئەڤرۆ ژی رێیا مووسل ـ زاخۆ و رێیا مووسل ـ ئامێدیێ برییە، هەروەسا (پشتەرێ) دەڤەرێن ل هنداڤی رێ یێن سەرەكی ل سەرانسەری ڤان دەڤەران داگیر دكەن[171].

چو پێ نەڤێت موتەسەرفێ مووسل د نڤیسار و بڕۆسكەیێن خۆ دا بۆ لایەنێن بلند ل سەر رەوشا بادینان و هەلبوونا شۆرشا كوردی پشتا خۆ ب وان تشتان گەرم دكر یێن ژ دەستەلاتێن ناڤخۆیی دگەهشتنێ، هەر بۆ نموونە، رێڤەبەرێ پۆلیسێن دهۆك، رەوشا رۆژا ٨ی ئیلۆنێ ب رەوشەكا ترسناك ل قەلەمدابوو و گۆتبوو كو خرابكارێن پارتی (كو ب خایین سالۆخ دابوون) بەرفرەهـ بووینە و ل دەڤەرێ (بۆ ترساندنا خەلكی) ب دلێ خۆ كەڤتینە و خەلكی نەچار دكەن بگەهنە ناڤ رێزێن وان، ئەڤ چەندە ب كریار هاتییە كرن و گەلەك كورد گەهشتینێ، ژ بەر هندێ، ئەڤ رەوشە پێدڤی ب چارەكرنەكا رەهـ وریشالی و ئێكلاكەرە بەری ژ دەست دەربكەڤیت[172].

ل دەستپێكا سالا ١٩٦٠ێ روو ب رووبوون دگەل حكۆمەتێ ببوو تشتەكێ بڤێت نەڤێت و هەر ئەڤە بوو یا نڤیسارێن دەستەلاتێ و وان كەسان یێن دەستەلاتێ پشتا خۆ پێ گەرم دكر و نڤیسین و بەلاڤۆكێن پارتی یێن دگەهشتنە رێكخستنێن وێ ل بادینان پشتڕاست دكر، هەر بۆ نموونە ل زاخۆ، دهۆك، ئامێدیێ، ئاكرێ و شێخان دام دەزگەهێن رژێمێ ب فەرمانا دەستەلاتێن بلند سیخوری ل سەر رێكخستنێن پارتی و چالاكیێن وێ دكرن و بـەردەوام ناڤێن كەسێن دگەهشتنە پارتی وەك لیست بۆ رێڤەبەریا ئەمنا مووسل دهنارتن، ئەو نڤیسار دنهێنی بوون و پتریا جاران ب دەستەپەیڤا (ناڤێن كەسانێن گەهشتینە ناڤ رێزێن حزبا پارتی توومار دكەین كو دبنە ترس ل سەر تەناهییا كۆمارێ)، هەر بۆ نموونە، رۆژا ٢٤ تیرمەها ١٩٦١ێ مەحمود خەلیل قائیمقامێ دهۆك ناڤێن (پارتیێن ترسناك) یێن ب مەترسی ل سەر تەناهییا كۆمارێ هاتبوونە ل قەلەمدان، بۆ موتەسەرفییا مووسل نڤیسین كو ئەو ژی ئەڤێن خوارێ بوون: عەبدلواحد حەجی مەلۆ و غازی حەجی مەلۆ (ژ گوندێ پێدە)، سەعدی محەمەد سەعدی و عارف عەبدلعەزیز و سەلیم شێخكی و عەبدوللا ئەحمەد و مستەفا محەمەد سەعدی (ژ زاویتە)، عەبدلستار حەجی قادر (مامۆستایێ دوورێخستی بۆ باشوورێ عیراقێ) و مەلا حەكیم ئەحمەد و ئەحمەد نەبی شۆخە و محەمەد نەبی شۆخە و ئەحمەد محەمەد ئیبراهیم (ژ دهۆك)، محەمەد سالح هێتووتی، میكائیل تاها و تێلی گەردی (ژ ئێكمالە)، فەیسەل سەلیم نزاركی، ئیسماعیل عەبدلرەحمان (ژ كەمەكا)، جەرگیس تاهر و سەدیق مەلا مستەفا و تاهر مەلا مستەفا و محەمەد عەلۆ لەیلێ و مەلا عەلی ئیسماعیل كو هەر پێنجێن داویێ حوكمدارێ سەربازی فەرمانا دەستەسەركرنا وان دابوو و هەتا نڤیسینا ڤێ نڤیسارێ نەهاتبوونە دەستەسەر كرن چونكی رەڤیبوونە چیای و خۆ ل وێرێ ئاسێ كربوون[173].

پارتی ل دەستپێكا سالا ١٩٦١ێ عەبدوللا ئیسماعیل (مەلا ماتۆر) هنارتە بادینان داكو ببیتە بەرپرسێ حزبی و سەربازی ل دەڤەرێ و ئەو شیا هێزەكا هەوارهاتنێ یا پێكهاتی ژ سێ لقا پێك بینیت و هەر لقەكێ فەرماندەیەكی بۆ دامەزرینیت و دەڤەرێن بەرپرسیاریا وان دەستنیشان بكەت كو ئەو لق ژی ئەڤە بوون: لقا مەهاباد بۆ دەڤەرا زاویتە و گوندێن رەخ وچانێن وێ هەتا كنارێ چەپێ یێ رووبارێ دیجلە بەرپرسێ وێ فەیسەل حەسەن سەلیم نزاركی، لقا بارزان بۆ دەڤەرا مزووری و بەرپرسێ وێ حكمەت عابد و لقا دێرسم بۆ دەڤەرا دۆسكی و بەرپرسێ وێ تێلی گەردی بوو[174].

فارس كۆرەماركی ژی دبێژیت كو سالا ١٩٦٠ێ سەركردایەتییا پارتی فەرماندابوو پەل(فصیل)ێن شۆرشگێری ل بادینان بێنە پێك ئینان كو ئەركێ وان

رزگارکرنا ئەندامێن پارتیێ بیت ژ لەپێن دەستەلاتێ و سزادان و تۆلڤەکرن بیت ژ شێخ و ئاغایێن دژی پارتی، ل بەر رۆناهییا ڤان رێنمایان، هێزەکا ٣٠٠ چەکداری ب سەرکردایەتییا وی ل سویارەتیکا وی هاتە پێك ئینان و ئەڤ هێزە چوو دەڤەرا زێبار بۆ پشتەڤانیکرنا بارزانی دژی ئاغایێن وێ دەڤەرێ[١٧٥].

هەر د وی چارچۆڤەی دا، عەمەر یوسف محەمەد (عەمەرێ لەعلێ) دبێژیت: رۆژا ئێکی خزیرانا ١٩٦١ێ، ل دۆرێن ٦٠٠ چەکداران ل هەردوو دەڤەرێن زاخۆ و بەرواری بالا ڤیان بێنە ناڤ هێزێن پارتی (دبیت مەبەستا وی ناڤ هێزێن بارزانی بیت ل دەڤەرا زێبار) لێ ل دەڤەرا نێروە رێکان نامەیەکا بارزانی گەهشتێ کو تێدا داخواز ژێ کربوو ڤەگەرێنە دەڤەرا خۆ، هەروەسا ژ بەرکو هندەك ئاغا و دەرەبەگ ل دەڤەرا سلێڤانەیا هەبوون دژایەتییا پارتی دکرن و کڤاشتن دئێخستنە سەر ئەندام و تاگرێن پارتی، عەمەر یوسف دگەل هێزەکا پێشمەرگی قەستا دەڤەرێ کر و هندەك ژێ گرتن و یێن مایی ژی رەڤینە گوندێن بێجەك؟؟؟ و شکەفتێ کو دکەڤنە رۆژئاڤایێ کنارێ رووبارێ دیجلە و ژ بەرکو ئەوێن رەڤین زەلامێن حکۆمەتێ بوون و دەستەلاتێ هێزەکا سەربازی هنارت بۆ پاراستنا وان، هەرچەندە ژی ئەوێن هەڤسۆز دگەل پارتی، پێشمەرگە شیرەت کربوون چ هێرشان نەکەنە سەر، لێ پێشمەرگەی هێرش کرە سەر هەردو گوندێن ناڤبری، ئینا هێزا سەربازی دگەل ئاغایان نەچاربوون خۆ ڤەکێشن و برەڤنە مووسل و ژ وێرێ ژی ئاغا چوونە تەلەعفەر[١٧٦].

هەروەسا عەبدوللا ئیسماعیل دگەل فەیسەل نزارکی و حکمەت عابد و عەبدلواحد حەجی مەلۆ گەریانەك ل گوندێن دهۆك کرن و بۆ خەلکی سیاسەتا حکۆمەتێ یا دژی مافێن نەتەوەیی یێن گەلێ کورد رۆنکرن و گوندی هاندان چەکی هەلگرن و بچنە ناڤ رێزێن پارتی و پێکهاتێن وێ یێن چەکدار، لێ مانا عەبدوللا ئیسماعیل گەلەك نەڤەکێشا، بەلکی هەر زوی هاتە ڤەگوهاستن و عەلی عەسکەری ئەندامێ لیژنا ناوەندی ل شوونێ هاتە دامەزراندن[١٧٧].

ل رۆژا ١٧ تیرمەها ١٩٦١ێ ژی رێڤەبەرێ ناحیا مانگێشکێ بۆ قائیمقامیا دهۆك نڤیسی و تێدا هندەك چالاکیێن پارتی ل گوندێن رۆژهەلاتێ دهۆك رۆنکرن و گۆت: دەنگ وباس دهێنە گۆتن کو ناحیا مە پشتەڤانییا پارتی دکەت ئەڤە ژی ژ ئەنجامێ گەریانا (هاریکارێن) وان ل گوندان و هاندانا وان بۆ ئەندامەتی و پشتەڤانیکرنا پارتی و بۆ مە هاتییە گۆتن کو خەلکێ گوندێن زڤنگێ، زێوکا کەندالا، بەرۆشکا سەعدین، ئامادەیی یا خۆ دەربڕینە کاری دگەل وان بکەن، هەروەسا پێکۆلەك هەیە گوندێن بێسفکا ژووری و دێرگژنیکێ بکەهنێ، ژ یا بۆری دیار دبیت کو بزاڤا پشتەڤانیکرن و ژێیاتییا پارتی بەردەوامە و ترس ژێ هەیە سەرانسەری گوندێن ناحیێ ڤەگریت، ئەڤە ژی دێ بیتە ئەگەرێ ئێککرتنا وان و دوورکەڤتنێ ژ حکۆمەتێ[١٧٨].

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە کو رێکخستنێن پارتی هەر ژ ناڤەڕاستا سالا ١٩٦١ێ خۆ ئامادە دکر نەکو هێزێن حکۆمەتێ هێرشێ بکەنە سەر کوردستانێ، ژ بەر هندێ پارتی ب رێیا کرینێ دەست ب پەیداکرنا چەکی کر، ل دەڤەرا بادینان کورێن عەشیرەتێن مزووری، گەرگەری، کوردێن ئێزدی، ژ وانا: عەبدلعەزیز حەجی مەلۆ، رەزا فەرەج، عەلۆ ئیبراهیم ترۆکی، سەیدۆ قلی، قاسم حەسون، بۆزی ئەحمەد عەلی، ئیبراهیم رەشۆ، عەلی محەمەد و یوسف تەمەر رۆلەکێ گرنگ دکرن و گەهاندنا چەکی ژ سوریا و دەڤەرێن تەلەعفەر و شنگال و گەیارە دا دیتن بۆ زاخۆ[١٧٩]، هەروەسا سالح مەدینە و محکۆ کۆشکی و حسێن زڤنگی چەك ژ چیایێ شنگال و بەعاج دکرین و د گوونیێن هریێ دا و ب پاسێن رێڤینگان ڤەدگوهاستنە دهۆك و ژ وێرێ ژی دبرنە بارزان[١٨٠].

## روودانێن شۆرشا ١١ ئەیلوولا ١٩٦١ێ ل بادینان ١٩٦١-١٩٦٣

شۆرش ل بادینان و دەڤەرێن دی یێن کوردستانێ ل رۆژا ١١ ئیلۆنا ١٩٦١ێ هەلبوو و بەری ١١ ئیلۆنێ هندەك روو ب رووبوون و لێکدان ل دەڤەرێ دگەل لەشکەر و پۆلیس و داروەدستەکێن دەستەلاتێ جاشان (چەتەیان) چێ ببوون کو ئەڤە ژی وەکی دەستپێکێن شۆرشێ بوون، هەر بۆ نموونە، هەر ژ تیرمەها ١٩٦١ێ هژمارەکا چەکدارێن پارتی خۆ ل چیایێن نێزیکی دهۆك ئاسێ کربوون و حوکمداریێ گشتیێ سەربازی فەرمانا دەستەسەرکرنا وان دابوو[١٨١] و ل دەستپێکا ئیلۆنێ رێکخراوا پارتی ل نێروە رێکان رەشید تالەبانی رێڤەبەرێ ناحیێ کوشت[١٨٢]، ل سپێدەیا رۆژا ٩ ئەیلوول ژی پێشمەرگەی هێرش کرە سەر لقەکا پۆلیسێن هێزا گەرۆك ل رۆژئاڤایێ گوندێ دوتازە و شیان هەمی ئەندامێن وێ بکوژن و دەستەسەر بکەن، ئێڤاریا وێ رۆژێ ژی پێشمەرگەی روو ب روویێ پارێزگار و رێڤەبەرێ پۆلیسێن مووسل و هژمارەکا سەرۆك چەتەیان بوون کو دگەل فەرماندێ لەشکەرێ لیوا ١١ ل دەڤەرا شندۆخا دگەریان، هەروەسا بەری ڤێ روودانێ ژی هێزەکا پێکهاتی ژ ٥٠٠ پێشمەرگەیان ب سەرکردایەتییا محەمەد عەلی خۆجا بەرپرسێ لیژنا ناڤخۆیا زاخۆ لڤی بوو و کۆنترۆل ل سەر گەلیێ زاخۆ و سرتا چیایێ بێخێرێ کربوو و رێیا ل ناڤبەرا زاخۆ و مووسل گرتبوو، سەرکردایەتییا وێ هێزێ ژی بارەگەهێ خۆ دانابوو گوندێ ترکزا سلێڤانەیی یا ل دەربێ گەلیێ زاخۆ، ل سەر ڤێ هێزێ و بزاڤێن وێ عادل نەجیب هاریکارێ رێڤەبەرێ پۆلیسان ل رۆژا ٨ ئیلۆنا ١٩٦١ێ بۆ رێڤەبەرێ ناحیا ئاسیهێ (ناحیا سلێڤانەیی) راپۆرتەك بۆ عەزیز سەلیم رێڤەبەرێ پۆلیسێن دهۆك نڤیسی و تێدا گۆت: (ئەڤ هێزە شەڤا ٨/٧ێ ئیلۆنێ لڤی داکو بگەهیتە بزاڤێن دەستەکێن پشتەرێبوویێن پارتی و ل گوندێن ناحیێ دگەرییت ، ئەز دگەل یێن ل دۆرماندۆری گوندێ ترکزا ئاخڤتم کو پێدڤییە خۆ ڤەکێشن و دگەل بەرپرسێ وان روونشتم، لێ وی دیار کر کو ئارمانج ژ گەریانا وان بۆ کۆمکرنا بێشایە بۆ پارتێ، لێ دگەل هندێ ژی من داخواز ژێ کر بژالە ببن، چونکی ئەڤ کارێ وان دێ بیتە ئەگەرێ تێکچوونا تەناهیێ، ئینا وی بەرپرسی گۆت کو (ئەو کارێ ئەو دکەن داخوازکرنا مافێن نەتەوەیی یێن رەوایێن گەلێ کوردە و ئەو ب ڤێ چەندێ رابووینە چونکی ـ پارتا ئیسلامییا عیراقی ـ بەلاڤۆك بەلاڤ کرینە و تان ل پارتی داینە) و من هندەك عەرەب دگەل دیتن کو دبیت کۆمۆنیستێن رەڤی بن، هاریکارێ پۆلیسان ب ڤی ئاوایی راپۆرتا خۆ ب داوی دئینیت: (ئەو خۆ وەسا دیار دکەن کو یێ کاروبارێن حزبی دکەن، لێ گەریانا وان رێخۆشکرنە بۆ ب هێزکرنا دەستەلاتا کوردی و بۆ بەرسینگگرتنا حکۆمەتێ و پێکئینانا دەولەتا کوردییا خۆسەر ژ عیراقێ، ژ بەر هندێ، ئەڤ چەندە پێدڤی هایژێبوون و ئاگەهدارکربوونا بەرپرسایە)[١٨٣].

پێشمەرگەی نیڤرۆیا رۆژا ١٠ی ئیلۆنێ دەست ب قەدەغەکرنا هاتن وچوونا رێڤینگ و خەلکی د گەلیێ زاخۆ را کر و سەعەت سێی شەڤا ١١/١٠ی ئیلۆنێ چوونە ناڤ بازێرێ زاخۆ، هۆسا، زاخۆ ئێکەمین بازێر بوو شۆرشگێران ئازاد کری و هاریکاریا خەلکی و پۆلیسێن کورد کاریگەرییەکا مەزن هەبوو کو بازێر ب کێمترین زیان بێتە رزگار کرن[١٨٤].

ل رۆژا ١١ی ئیلۆنێ هندەك هێزێن دی پێشرەوی کرن و هەمی کۆپ و بەتەنێن چیایی یێن هنداڤی بازێرێ زاخۆ ستاندن و عەلی عەسکەری سەرکردێ دەڤەرێ گوندێ گەڤەرکێ یێ ل بنیا چیایێ زاوا کرە بارەگەهێ سەرکردایەتییا ئۆپەراسیۆنێن خۆ، ئێڤاریا وێ رۆژێ ژی کارگێرییا حکۆمەتێ ژ ناحیا سێمێلێ خۆڤەکێشا بنکەهێ (مەخفەرا) پۆلیسێن فەیدیێ، پاشی پێشمەرگە چوو ناڤ ناحیا نێروە رێکان، دووڤرا کۆنترۆل ل سەر بنکەهێ پۆلیسێن چەمانکێ کرن و پاشی پتریا هێزان بەرەڤ ئامێدیێ خشیان و ئامێدیێ دوورپێچکرن و چوونە د ناڤ دا و قائیمقام و پۆلیس ل



شەعبان سەعید

نەخۆشخانێ و بارەگەهێ حکومەتێ و باژێرڤانیێ و ل خواندنگەها دواناوەندی دووریێچکرن[١٨٥].

هەروەسا پێشمەرگەی دەڤەرا بەرواری بالا ستاند و رێڤەبەرێ ناحیێ و هەردوو جێگرێن پۆلیسان عەبدلخالق عەبدلعەزیز و عەتا عەجاج دەستەسەرکرن، ئینا شاندێ وەزارەتا پیشەسازیا پێکهاتی ژ ٨ شارەزایێن سۆڤیەتی و هژمارەکا فەرمانبەرێن عیراقی کو ل هەردو گوندێن دویرێ و سەرگیزا ل کانزایان دگەڕیان نەچار بوون ژ دەڤەرێ بچیت، قائیمقامێ ئامێدیێ ژی بۆ موتەسەرفیا مووسل نڤیسی کو شارەزایێن (رۆسی) رۆژا ٢٢ی ئیلۆنا ١٩٦١ێ ب سلامەتی گەهشتینە ئامێدیێ، لێ تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە کو پێشمەرگەی دەست ب سەر عمبارا وی شاندی ل سەرگیزا و دەست ب سەر ٥٠٠ کیلۆگرامێن تەقەمەنیان و نارنجۆکان دا گرتبوو و پێشمەرگەی د هێرشێن خۆ دا بۆ سەر بنکەهێن پۆلیسان مفا ژێ وەرگرت ئەڤە ژی ب هاریکاریا کرێکارێن کوردێن ژ هەردوو گوندێ مایێ و دویرێ یێن دگەل وی شاندی کار دکرن و دیەقاندن وان تەقەمەنییان دا شارەزا ببوون[١٨٦].

پێشمەرگەی ل رۆژا ١٢ای ئیلۆنێ مانگێشکێ (سەنتەرێ ناحیا دۆسکی) رزگار کر و ناجی عەبدولکەریم رێڤەبەرێ ناحیێ و محەمەد سالح ئیسماعیل کۆمیسەرێ بنکەهێ پۆلیسان گرتن، شەڤا ١٢ای ئیلۆنێ ژی سەرسنك و بامەڕنێ و سویارەتیکا کەڤتنە د دەستێ پێشمەرگەی دا و کۆنترۆل ل سەر رێیا گشتییا ئامێدیێ - دهۆك کرن و پێشمەرگە ب درێژاهییا رێکێ و ل کۆپێن چیایان بەلاڤە بوون، ب ڤی ئاوایی، هێشتا سێ رۆژ نەبۆرین، هێزێن شۆڕشێ کۆنترۆل ل سەر پتریا ناوەندێن کارگێڕی یێن بادینان و هەمی بنکەهێن پۆلیسان کرن کو ١٨ ل ئامێدیێ و ١٠ ل زاخۆ و ٧ ل دهۆك هەبوون و پتریا ئاغایێن تاگرێن حکومەتێ ژ دەڤەرێ رەڤین[١٨٧].

لێ مەلا مستەفایێ بارزانی سەرکردێ شۆڕشێ دگەل ٣٠٠ پێشمەرگەیان لڤی بوو و ژ زێ یێ مەزن (زێ یێ بادینان) دەربازی گوندێ ئیسومرە و ژ وێرێ ژی قەستا گوندێ نەقەبێ و گۆسکە کربوو و ل دەڤەرا دینارتە و گەلی زەنتە ل قەزا ئاکرێ کەڤتبوو د شەڕەکی دا دگەل لەشکەری و عەشیرەتێن تاگرێن حکومەتێ و د بومبەبارانا ئاسمانی دا سەرکردەیەکێ پێشمەرگەی ب ناڤێ میرزا ئاغایێ مێرگەسووری هاتبوو کوشتن، بارزانی ل گوندێ شکەفتێ ل چیایێ پیرسی پاشی ل گوندێ سەفتێ بنەجە ببوو و هاتیە گۆتن ژی کو بارزانی ل رۆژا ٧ چریا ئێکێ ل نێزیك گوندێ داویێ بریندار ببوو، د بروسکەیەکا موتەسەرفێ مووسل یا رۆژا ١٠ چریا ئێکێ دا بۆ قائیمقامێ ئاکرێ هاتبوو: مەلا مستەفا بارزانی نۆکە ل گوندێ رێزانە و بزاڤا رادەستکرنا وی دهێتە کرن[١٨٨].

پشتی بۆرینا كێمتر ژ هەیڤەكێ ژ دەستپێكرنا شۆڕشێ ل بادینان، وەرەیێن عەشیرەتێن پشكدار د شۆڕشێ دا هەڕفین، ئەڤە ژی ژ بەر پێشڕەوییا هێزێن حكۆمەتێ و بومبەبارانا ئاسمانی و تۆپبارانا دژوار بۆ سەر چەپەرێن پێشمەرگەی، هەروەسا ژ بەركو هەر سەرۆك عەشیرەتەكی كۆنترۆل ل سەر زەلامێن عەشیرەتا خۆ هەبوو و سەركردایەتییەكا لاواز دكرن، ب ڤی ئاوایی، پشتی دەمەكێ كورت تنێ هژمارەكا كێم یا پێشمەرگەی ل دەڤەرێن زاخۆ، ئامێدیێ، دهۆك و شێخان مان، ل سەر ڤێ چەندێ مەسعود بارزانی دبێژیت: (... ل دهۆك ژی وەكی ل سلێمانیێ هاتیە رووداں، هێزێن عەشیرەتان تەراوبەرا بوون، ژ بلی هندەك هێزێن ب رێكخستنەكا حزبی هاتینە رێكخستن، ڤان هێزان پەنابرنە ناڤ چیایێن رەخ ورووبان، ژ وانا: جەمیل سۆر بامەرنی، حەسەن مراد بامەرنی، ئەحمەد شانە، فارس كۆرەماركی، مالباتا حاجی سادقێ برۆ ژ سەرۆك عەشیرەتێن گولییان، عەلی هالۆ و یێن دی، كو وی دەمی عەلی عەسكەری بەرپرسێ لقێ ئێك یێ پارتێ بوو و ئەو ژی گەهشتە وان ل چیای، لێ ئەڤ شكەستنە ل دەڤەرێن جودا جودایێن كوردستانێ یا بەروەخت بوو)[189].

پێشمەرگە نەجمەددین یوسفی كو وی سەردەمی ل ناڤ وان رووداناں بوو و پشكداری تێدا كریە دبێژیت: (ئەوێن دەست ژ چەكی بەرنەداین ژی جار جارە دهاتنە گوندێن توخیبی لێ دحەیری بوون و گەلەك دبێ ئومێد و بێزار بوون)[190]، هەرووەسا فارس كۆرەماركی كو وی دەمی سەركردێ هێزەكا پێشمەرگەی بوو دبێژیت: (پشتی هێرشا فرۆكان، چەكداران ل رۆژا ١٤ ئیلۆنێ خۆ ژ گەلیێ دهۆك ڤەكێشان و پشتەڤانییا خۆ بۆ حكۆمەتێ راگەهاندن و لەشكەر هەلوەشیا و ل داوییێ كەس دگەل من نەما ژ بلی ١٤ چەكداران كو ئەو ژی كەس وكارێن من بوون، لی پاشی هەلویستێ مە ب هێز كەڤت پشتی تێلی ئێكمالەیی، فەیسەل نزاركی، یوسف میرخان، حەمۆ كەمەكی و ئیسماعیل كەمەكی گەهشتینە مە، ئینا مە قەستا چیایێ مەتینا كر و ژ وێرێ چووینە گوندێ بەهنوونێ ل دەڤەرا گولییان و چووینە مالا حەجی سادقێ برۆ كو هەر ژ دەستپێكێ پشتەڤانییا شۆڕشێ كربوو، رەوش یا ب زەحمەت بوو و داكو زێدەتر شەپرزە نەبین، من سالح مەدینا ئێكمالەیی هنارتنە نك بارزانی داكو دیتن وبۆچوونا وی بزانین، بەرسڤا وی ژی ئەو بوو كو بۆ خۆ بقەتینین هەتا وی دەمێ سەرەدانا مە ل دەڤەرێ دكەت)[191].

هەروەسا مەلا حەمدی دبێژیت كو دەمێ شۆڕش ل بادینان د سەكەراتێ دا بوو، عەلی عەسكەری داخواز ژێ كربوو بچیتە نك بارزانی و داخوازا هاریكاری و هێزێ ژێ بكەت و دیار دكەت كو ل دەستپێكا چریا ئێكێ یا ١٩٦١ێ ل گوندێ سەفتێ یێ زێباریان دگەل بارزانی روونشتییە و بۆ وی گرنگییا زوو ڤێراگەهشتنا رەوشا بادینان رۆنكرییە[192].

بەری بارزانی ل رۆژا ٢١ چریا ئێكێ یا ١٩٦١ێ بگەهیتە دەڤەرا بادینان، حكۆمەت هەر ژ ١١ ئیلۆنێ - ٣ چریا ئێكێ یا سالا ١٩٦١ ێ شیابوو كۆنترۆلێ ل سەر پتریا وان دەڤەران بكەتەڤە یێن پێشمەرگەی كۆنترۆل كربوون، ل رۆژا ١٣ ئیلۆنێ حكۆمەت شیابوو پێشمەرگەی ژ دهۆك دووربێخیت و د راپۆرتەكا رۆژا ٣٠ چریا ئێكێ یا ١٩٦١ێ یا رێڤەبەرییا هەوالگرییا سەربازی دا ل سەر رەوشا دهۆك هاتبوو: (هێرشێن فرۆكان كاریگەرییەكا مەزن د سستكرنا وەرەیێن عەشیرەتێن پشتەرێبووی (یاخیبووی) دا هەبوویە یێن كو خرڤە ببوون بۆ داگیركرنا دهۆك، لێ بژالە بوون و پتریا تاكێن عەشیرەتان خۆ ژ پشتەرێبوویێن (ب راستا) دانەپاش، هەتا نۆكە هندەك ژ وان دگەل هێزێن حكۆمەتێ شەڕێ پشتەرێبوویان دكەن، و پشتەرێبووی ل دهۆك، سەرسنك و ئامێدیێ خۆ دیار ناكەن و نە خودان رەوشەكا دەستنیشانكرینە، ئەو خۆ ل ڤان دەڤەران ڤەدشێرن، هەروەسا عەبدلواحد حەجی مەلۆ و گرۆپا وی كو ١٠٠-١٥٠ چەكداران پێكهاتییە

ل چیایێن نێزیکی زاویتە و هەتا سویارەتیکانە، هەروەسا تێلی گەردی و نێزیکی ٥٠ چەکداران ل بلنداهیێن نێزیکی گوندێ ئێکمالە و ل بلنداهیێن گوندێ سندۆرێ نە و مەلا عەلی ئیسماعیل ژی کو ٥٠ چەکدارێن گۆیی دگەل دانە ل دەڤەرا زاویتەنە، لێ عەلی عەسکەری و حەسەنێ ستیێ و کوڕێن شەعبان (ئامێدی) ل بلنداهیا چیایێن گەلیێ سنجێ نە و نۆکە ئەو دەڤەر یا دهێتە پاقژ کرن ، هەر د وێ راپۆرتێ دا هاتییە: (بێی پێکئینانا مەفرەزا و نەچارکرنا پشتەرێبوویان بۆ خۆرادەستکرنێ، دشیاندا نینە رێیا ئامێدیێ - دهۆك بێتە گەرەنتیکرن، هەروەسا خەلکێ گوندان گوندێن خۆ دهێلن و دچنە دەڤەرا مووسل و پتریا خەلکێ دەڤەرا دهۆك و سویارەتیکا ب ئاوایەکێ بەرچاڤ پەزێ خۆ دفرۆشن.

هەروەسا ناڤێن فەرمانبەر و بەردەستك و مامۆستا و خووندکار و سەرکردەیێن خەلکی ئەوێن پشکداری د (پشتەرێبوون و تێکدەریێ) دا کرین د وێ راپۆرتێ دا هاتینە توومار کرن و پێشنیازکرییە فەرمانبەر و مامۆستا و بەردەستك ژ کارێن وان بێنە لادان و هەمی ئەوێن پشکداری د (پشتەرێبوونێ) دا کرین بێنە دەستەسەرکرن و ڤەکۆلین دگەل بێتە کرن و حەوالەی دادگەهان بێنەکرن و ملك و مالێ وان بێتە دەستەسەرکرن[١٩٣]، ژ وانا یێن بەر ڤێ بڕیارێ کەڤتین و ژ کارێن وان هاتینە لادان و دەستەسەر کرن ئەندامێ پارتی تەلعەت رفعەت فەتاح کۆمیسەرێ بگۆڕا (بەدالا) فەرمانگەها پۆستە و برۆسکا دهۆك بوو ب گونەهباریا وێ چەندێ کو بگۆڕ کربوو هێلینەك بۆ پارتییان و گوهڤەچنینا پەیوەندیێن تێلەفۆنی و ئەشکەراکرنا وان پەیوەندییان و ناڤبری ل رۆژا ١٦ ئیلۆنا ١٩٦١ێ هاتە دەستەسەرکرن - دبیت ژی ئەو ئێکەم کەس بیت دهێتە دەستەسەرکرن - و بۆ جڤاتا عورفییا سەربازیا بەغدا هاتە هنارتن، پاشی ل گرتیخانا ناوەندییا بەسرا هاتە زیندانکرن و ل رۆژا ٢٨ی ئیلۆنا ١٩٦١ێ ژ پۆستێ وی هاتە لادان[١٩٤].

هەروەسا د بیرهاتنێن فارس کۆرەمارکی دا هاتییە: هندەکان خۆرادەستی حکۆمەتێ کرییە و ب راسپاردا شێخ مەسعود نەقشبەندی بەر لێبۆرینێ کەڤتینە، لێ ئەو تووشی بێهیڤییەکا دی بوون دەمێ رادیۆیا بەغدا ل رۆژا ٨ ی چریا ئێکێ برۆسکەیەکا لایەنگرییا شێخ ئەحمەد بارزانی بۆ عەبدولکەریم قاسم بەلاڤ کری[١٩٥].

فەرە بێژین کو سادقێ برۆ ئێك بوو ژ ئاغایێن کوردێن کێمێن د نەخۆشترین رەوش دا پشتەڤانییا شۆرشێ کرین، مەسعود بارزانی ژی شەهدەیی یێ ل سەر رۆلێ وی یێ جوامێرانە ددەت و دبێژیت: (ب زەحمەتە بۆ من رۆلێ حەجی سادقێ برۆ سەرۆکێ عەشیرەتا گولی ل بەرچاڤ نەگرم، چونکی هەمی سالۆخەتێن جوامێری و مێرانی و راستگۆیی و پەیمان پاراستنێ ل نك ڤی مرۆڤی هەبوون و پشتەڤانییەکا رەها ل بارزانی دکر ب سەر و مالێ خۆ د خزمەتا دۆزا کوردی دا بوو و گەلەك ب دلفرەهی پێشوازیا هێزێن شۆرشێ دکر .... وی سۆزا خۆ ب جە ئینا و د شەڕ وهنگامێن سالا ١٩٦٢ ێ دا کوڕێ خۆ (مەسعود) وەك شەهید پێشکێش کر)[١٩٦].

شەعبان سەعید کو وی دەمی پێشمەرگە بوو دبێژیت کو ئەو و ل دۆرێن ٦٠ پێشمەرگەیێن دی پشتی خۆڤەکێشانێ پەنا برینە بەر سادقێ برۆ و داخواز ژێ کرینە ژیارا وان دابین بکەت هەتا وی دەمێ بارزانی دگەهیتە وێ دەڤەرێ و وی ژی ئەرکێ خۆ ب جە ئینایە، هۆسا، ئەو بوویە پەناگەهـ بۆ پێشمەرگەیێ خۆڤەکێشایە دەڤەرێ ب وێ هیڤییا بەردەوامی ب شەڕی بێتە دان دەمێ بارزانی دگەهیتە دەڤەرێ، سادقێ برۆ باشترین هاریکار و پەناگەهێ پێشمەرگەی بوو، هەتا گەلەك ژ خەلکی و پێشمەرگەی و کوڕێن عەشیرەتان وەك رێزگرتن بۆ خۆراگری و مێرخاسییا وی، شیاین خۆ ل دەڤەرێ راگرن[١٩٧]، راپۆرتێن دەستەلاتا ناڤخۆیی ژی ل زاخۆ وی هەلویستێ وی پشتراست دکەن، هەر



بۆ نموونە، رۆژا ٥ ی چریا ئێکێ یا ١٩٦١ێ عەلی سلێمان بهار[١٩٨] رێڤەبەرێ ناحیا گولی راپۆرتەك نڤیسییە و تێدا دبێژیت: پۆلەوان سەباح فەرید فەرماندێ بنکەهێ پۆلیسێن چەلکێ و تێبینەرێ بێتێلێ پشتی ب سلامەتی گەهشتینە سەنتەرێ ناحیێ تەئکید کرینە کو سادقێ برۆ یێ ل گوندێ بەهنوونێ ئاکنجی بووی، هژمارەکا زەلامێن خۆ هنارتینە بارزان بۆ زانینا هەلویستێ بارزانی و دەنگ وباسێن خۆش ژ بارزانی ئینانینە کو دڤێت بەرگریێ بکەت و خۆ رادەست نەکەت و دێ هێزەکا پێکهاتی ژ ١٠٠ بارزانییان دگەل تۆپەکێ دێ گەهینیتە سادقێ برۆ بۆ زڤڕاندنا سەنتەرێ ناحیا گولی و بازێرێ زاخۆیێ دەستەلاتێ ل رۆژا ٢٠ی ئیلۆنا ١٩٦١ێ دووبارە کۆنترۆل ل سەر کری[١٩٩].

د نڤیسارەکا رۆژا ١٣ی چریا ئێکێ یا ١٩٦١ێ یا قائیمقامیا زاخۆ دا هاتییە: هژمارەکا موختارێن گوندان حەز دکەن پشتەڤانیا حکومەتێ بکەن، لێ ئەو ژ سادقێ برۆ دترسن کو گەفێن دژوار ل وان دکەت هەکە تشتەکێ وەسا بکەن، هەروەسا پشتی دەستەلات ڤەگەریایە زاخۆ وی گەف ل هندەك موختاران کرییە یێن پشتەڤانیا دەستەلاتێ کرین و بێی ئاگەهداریا وی ئەو چەند کرین، وان موختاران پشتراست کرن کو هێشتا پتریا خەلکێ دەڤەرێ ل بن فەرمانا وی نە و گوهداریا وی دکەن، قائیمقامی د وێ نڤیسارێ دا ژ ترسا سادقێ برۆ داخواز کر ب زووترین دەم هژمارا هێزێن ل زاخۆ هەین دو هند بێنە زێدەکرن و پڕچەك کرن و ب هزاران گوونیێن ئاخێ بۆ چێکرنا چەپەران بێنە دابین کرن[٢٠٠].

هەروەسا ژ بەر هەلویستێن نیشتمانپەروەرێن سادقێ برۆ و پشتەڤانی و دلسۆزیا وی بۆ شۆڕشێ، دەڤەرا زاخۆ، نەخاسمە ژی دەڤەرا گولییان ب درێژاهیا سالێن شۆڕشا ئیلۆنێ هەر یا خورت و چالاك بوو و هەتا پشتی مرنا وی ژی ل سالا ١٩٦٧ێ هەر یا وەسا بوو[٢٠١].

ل ڤێرە تشتێ گرنگ و بۆ رزگارکرنا هەلویستی و بەری دەم ب سەرڤە بچیت بارزانی سەرکردێ شۆڕشێ دەستپێکەری کر و رۆژا ٢١ی چریا ئێکێ یا ١٩٦١ێ ب سەدان پێشمەرگە بەرەڤ بادینان، ب دروستی ژی بەرەڤ دەڤەرا عەشیرەتا نێروە لڤاندن کو وی دەمی وێ عەشیرەتێ هەر زوو و دەملدەست پشتەڤانیا خۆ بۆ شۆڕشێ دەربڕی بوو و زەلامێن وێ ب چەك و مالێ خۆ گەهشتبوونە شۆڕشێ، هەروەسا هندەکێن دی ژی ژ عەشیرەتێن گۆران، مزووری ژێری، بەرواری بالا و ئامێدیێ ل گوندێ سیدا گەهشتنە بارزانی و دگەل چوونە دەڤەرا نێروە کو ل وێرێ هێزێن پێشمەرگەی هاتبوونە رێکخستن و هەر ئێك ژ ئەڤێن ناڤێن وان ل خوارێ ب ڤی ئاوایی هاتبوونە راسپاردن: محەمەد ئەمین میرخان و حاجی بیرۆخی و حسۆ میرخان دۆلەمەری و عیسا سوار (عیسێ سوار) سەرکردایەتیا ٢٥٠ پێشمەرگەیان بکەن و بۆ هەر ئێك ژ وان دوو هاریکار ل دەڤەرێن دی

هاتنە دانان و بارزانی ئەسعەد خۆشەوی وەك هاریكار ل نك خۆ هێلا و هێزەكا دی ب سەركردایەتیا عەزیز محەمەد دۆلەمەری بۆ پاراستنا بارزانی هاتە ژێكرتن[٢٠٢] و بارزانی كۆمەكا فەرمان و راسپاردان ل ناڤ ریزێن پێشمەرگەی بەلاڤ كرن كو یێن ژ هەمیان گرنگتر ئەڤێن خوارێ بوون:

١- خۆ دوورئێخستن ژ چوونا ناڤ گوندان ب هەر بەهانەیەكا بیت ژ ترسا هندێ نەكو ئەو گوند تووشی هێرشێن ئاسمانی ببن.

٢- تالانكرنا هەر تشتەكی قەدەغەیە و نابیت چو تشت ب زۆری ژ گوندیان بێتە ستاندن.

٣- گوهداریكرنا فەرمانێن ژ سەركردایەتیێن وان دەردكەڤن بێ خۆنەرازیكرن و بێ دوودلی.

٤- زەعی نەكرنا كەل وپەلێن شەری و ئابووریكرنەكا تمام د جەبلخانە و تەقەمەنییان دا.

٥- باش خۆ پاراستن ژ تۆپباران و بومبەبارانێ.

٦- باش دەستنیشانكرنا خالێن لاوازێن دوژمنی و پاشی ئەنجامدانا هێرشێ.

٧- كوشتن و ئێشاندنا ئێخسیری و سڤكاتیپێكرن ب هەمی ئاوایان قەدەغەیە.

٨- پێدڤییا هاریكاریێ ل ناڤبەرا هەمی كۆمێن هێزان و دەستپێكەریكرن بۆ هاریكاریا هەر هێزەكێ بۆ هێزەكا دی یا پشكدار د شەر و هنگامەكێ دا، پێدڤییە ژی شەرێن پارتیزانی ب كۆمێن بچووك بێن بەلاڤە بێنە كرن بۆ كێمكرنا قەبارێ زیانێن پێشمەرگەی بۆ نزمترین ئاست[٢٠٣].

ل رۆژا ٢٤ی چریا ئێكێ یا ١٩٦١ێ بارزانی ب هێزێن خۆ یێن ژ رووبارێ زێ یێ بادینان دەرباز بووین بەرەڤ دەڤەرا بەرواری بالا و كانی ماسێ و گوندێن تروانش، بێدوهێ، سەرەرۆ، دشێشێ، بالۆكا و سەرزێری لڤین، لێ موحسن بەگێ بەرواری و چەتەیێن وی رێكری ل پێشمەرگەی كر یێن شیاین وی بشكێنن و نەچار بكەن بەرێڤەی توخیبێ تركیا ببیت و پاشی دەستەلاتا تركیا ئەو زڤراندنە عیراقێ، ل داوییا چریا ئێكێ ژی پێشمەرگەی كانی ماسێ ستاند و ب تمامی كۆنترۆل ل سەر دەڤەرا بەرواری بالا كر، مەسعود بارزانی هەلویستێ خەلكێ بەرواری بالا ژ شۆرشێ ب هەلویستەكێ جوامێرانە ل قەلەم ددەت، كو دەڤەرا ڤێ عەشیرەتێ دەمەكی وەكی بارەگەهێ گشتیێ سەركردایەتیا شۆرشێ بوو[٢٠٤].

ل گوندێ دشێشێ ل دەڤەرا بەرواری بالا بارزانی ڤیا بزانیت كا شەركەرێن وی و خەلكێ دەڤەرێ چەند دئامادەنە قوربانیێ بدەن، ئینا وەسا خۆ دیار كر كو دێ كوردستانێ هێلیت و دێ قەستا سوریا كەت و راگەهاند كو هەر كەس یێ ب دلێ خۆیە دگەل وی بهێت یان ژی خۆرادەستی حكۆمەتێ بكەت، ئارمانجا بارزانی ژ ڤێ چەندێ، سەرباری موخل وبێژینگكرنا شەركەرێن خۆ و ئێكلاكرنا كەسانێن دودل بوو كا ئەرێ دێ شەری كەن یان ژی دڤێن خۆرادەستی دەستەلاتێ بكەن، بۆ ل بەربەرزەكرن و مژوولكرنا هێزێن حكۆمەتێ ژی بوو، لێ پتریا پێشمەرگەی باشتر دیتن دگەل بارزانی بن، ئینا وی ئەو د لڤێن (سریێن پێشمەرگەیان)دا رێكخستن و بەرەڤ رۆژئاڤایێ بەرواری بالا لڤی، پاشی قەستا سرتا چیایێ مەتینا كر و پشتی هێزەكا چەتان شكاندی، هێزێن وی ل گوندێ زێوا پیرمووس ل نێزیك بامەرنێ بنەجهـ بوون[٢٠٥].

هەژی گۆتنێیە بێژین كو مەسەلا پەنابرنا بارزانی بۆ سوریا، د نڤیسارێن حكومی دا دەنگڤەدانا خۆ هەبوو، هەر بۆ نموونە، دەستەلاتێ راگەهاند كو بزاڤا (پشتەرێبوونێ) هاتیە ژ ناڤبرن، هەتا فەرماندا هەمی یەكێن خۆیێن سەربازی ژ بلی ئەوێن ل سەربازگەهێن بنەجهـ، ڤەگەرینە بارەگەهێن خۆ، هەروەسا گۆتگوتكێن جودا جودا ل سەر چارەنڤیسێ بارزانی هاتنە ڤەگێران، ژ وانا: (ئەو چوویە سوریا، ب دژواری بریندار بوویە)[٢٠٦].

عومەر یوسف ژی وەسا دبینیت كو حكۆمەتا



ئەحمەد شانە ۱۹۲٤ - ۲۰۰٤

عیراقێ ب رێیا سیخوڕ و راسپاردێن خۆ گوتگوتکەک بەلاڤ دکر کو بارزانی یێ خۆ ڤەدکێشیتە سوریا و ئارمانج ژ ڤێ گوتگوتکێ لاوازکرنا ورەیێن پێشمەرگەی بوو[۲۰۷]، لێ ب راستی بارزانی هاتبوو بادینان نەکو دابچیتە سوریا، گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ، ئێکسەر دەمێ گەهشتییە دەڤەرا نێروە و بەرواری بالا دەست ب رێکخستنا هێزێن خۆ کر و رێنمایێن خۆ ل ناڤ پێشمەرگەی بەلاڤکرن و گوتگوتکا بەلاڤ بووی کو دێ پەنایێ بەتە دەرڤەی عیراقێ، تنێ بۆ ل بەر بەرزەکرنێ بوو، ژ بەرکو حکومەتێ ژی حەز دکر ژ عیراقێ دەرکەڤیت دەست ب بەلاڤکرنا وێ (گوتگوتکێ) کر داکو کاریگەریێ ل سەر ورەیێن کوردان بکەت، نەخاسمە ژی ل سەر ورەیێن پێشمەرگەی.

پاشی ل داوییا چریا ئێکێ یا ۱۹٦۱ێ بارزانی قەستا دەڤەرا دۆسکییان کر و ل گوندێ مەمانێ گازی مەلا حەمدی عەبدلمەجید سەلەفي کر و ئەو راسپارد بچیتە کوردستانا سوریا و هندەك نامە رادەستی وی کرن داکو بگەهینیتە حاجۆ ئاغایێ هەڤێرکی و قەدری جەمیل پاشای و مەکتەبا سیاسییا پارتا دیمۆکراتا کوردی ل سوریا و تێدا داخواز ژێ کر پشتەڤانی و هاریکارییا شۆرشێ بکەن و ل ئەوروپا بانگەشێ بۆ وێ شۆرشێ بکەن[۲۰۸].

بارزانی ژ دەڤەرا دۆسکییان بەرەڤ رۆژئاڤا لڤی و ژ گوندێن بادێ، گەرماڤا، خازیاڤا، قەشەفرێ، گرفیل، مەرینا و باڤیا دەرباز بوو و شەش رۆژان ل ئەرمشتێ بنەجە بوو، پێشمەرگەی د رێیا خۆدا شەڕ ولێکدان دگەل چەتە و بەتالیۆنەکا پۆلیسێن گەڕۆك کرن و پشتی شیاین وان بشکێنن، پێشەنگا هێزێن بارزانی گەهشتە داوییا دەشتا سلێڤانەیی یا ل نێزیك توخیبێ سوریا و حکومەت ژی ل وێ باوەرێ بوو کو ب راستا بارزانی یێ قەستا سوریا دکەت، ژ بەر هندێ هێزێن خۆ ل سەر توخیبێ وی وەلاتی کۆم کرن[۲۰۹].

عەبدولەتیف دەراجی موتەسەرفێ مووسل د بروسکەیەکا خۆیا رۆژا ۲۸ چریا ئێکێ یا ۱۹٦۱ێ دا بۆ لایەنێن بلند دبێژیت: بارزانی قەستا رۆژئاڤا کرییە، هێزێن خۆ ژ وان گوندێن ستاندین ڤەکێشاینە و دو ئێخسیرێن خەلکێ گوندێ هێسێ ژی بەردابنە و ئێك ژ وان ئێخسیران گۆتییە: بارزانی داخواز ژ حکومەتا ئێرانێ کرییە ئەو وەك پەنابەر بێتە وەرگرتن، لێ داخوازا وی هاتییە رەت کرن، هەر بۆ وێ چەندێ پەیوەندی ب حکومەتا ترکیا، لێ وێ ژی ئەو داخوازی رەت کرییە، ژ بەر هندێ قەستا سوریا کرییە.

موتەسەرفي داخواز ژ دەستەلاتێ کر هێزێن خۆ کۆم بکەت بۆ ئێخسیرکرن و ژ ناڤبرنا پێشمەرگەی، هەروەسا داخواز ژ هێزا ئاسمانی ژی کر ب گەڕیانێن ئاسمانی زانیاریان کۆم بکەن و کوردێن پشتەڤانێن حکومەتێ بۆ دەڤەرێ بێنە ڤەگوهاستن[۲۱۰].

لێ فارس کۆرەمارکی وەسا دبینیت کو بارزانی دڤیا خۆ ژ روو ب رووبوونێن سەربازی دگەل حکومەتێ

دووربێخیت، ئینا عەگید سەدیق و عەبدلرەحمانێ كومیسەرێ پۆلیسان هنارتنە تركیا و مەلا حەمدی هنارتە سوریا بۆ داخوازكرنا پەنابەریا سیاسی و هەردو حكۆمەت ل سەر وێ داخوازیێ رازی بوون ب مەرجەكی ل سەر توخیبی چەكێ خۆ رادەست بكەن، كۆرەماركی پێڤە دچیت و دبێژیت: لێ بارزانی پشتی چەند حەفتیێەكان مایە ل بادینان ئەو هزرا خۆ گوهۆری، چونكی جەماوەرێ نێروە و دەڤەرێن دۆسكی و مزووری و بەرواری ژێری و ژووری ل دۆر سەركردایەتییا وی خرڤە ببوون[211].

ئەحمەد عەبدوللا شانە هرۆری ژی كو ئێك بوو ژ پێشمەرگەیێن دگەل بارزانی قەستا توخیبێ سوریا كرین دبێژیت: بارزانی ل جهەكێ نێزیكی توخیبێ سوریا گۆتارەكا كاریگەر بۆ مە پێشكێش كر و تێدا هەلویستێ حكۆمەتێ ژ مافێن نەتەوەیی یێن گەلێ كورد و پشتەڤانییا وێ بۆ دوژمنێن بزاڤا كوردی وپێكۆلێن وێ بۆ كۆنترۆلكرنا كوردستانێ ب رێیا وان دوژمنان و جۆرێ مافێن رەوایێن گەلێ كورد شرۆڤە كرن و بارزانی د گۆتارا خۆ دا شەركەر هاندان بەرسینگێ وان هێزێن حكومی بگرن یێن قەستا كوردستانێ دكەن و گۆتارا خۆ ب ڤی ئاوایی ب داوی ئینا: (دڤێت بەرسینگێ هەر دەستدرێژییەكێ بۆ سەر نەتەوەیێ مە بگرین و مافێن خۆ ب دەستڤە بینین)[212].

گەهشتن و پێشرەوییا بارزانی بۆ دەڤەرا دهۆك، پێشمەرگەیێن خۆ ڤەشارتین و ل چیایان بەلاڤە بووین هاندان بلڤن و دەست ب چالاكیێن خۆ بكەنەڤە، هەر بۆ نموونە، برۆسكەیێن حكۆمەتێ یێن رۆژێن ١٢- ١٥ چریا دووێ یا ١٩٦١ێ ئاماژە كرینە وێ چەندێ كو پێشمەرگەی هێرش كرییە سەر گوندێ ئێكمالە و كۆنترۆل ل سەر كرییە و ل چیایێ كەمەكا بنەجهـ بووینە و رۆژا ١٤ چریا دووێ شیاینە كۆنترۆلێ ل سەر گەلیێ زاویتە بكەن و چەتەیان رژدی كرینە ڤەگەرێینە گوندێن خۆ ژ ترسا وێ چەندێ نەكو پێشمەرگە كۆنترۆلێ ل سەر بكەن، هەروەسا پێشمەرگە چووینە ناڤ گوندێ ئیردا و حسۆ قادر، سالح حاجی و خالد ئێكمالەیی كو ژ سەرۆكێن پشتەڤانێن حكۆمەتێ نە دەستەسەر كرینە و پێشمەرگە وەك (باند) یێ ل دەڤەرا دهۆك دگەرێین، قائیمقامێ دهۆك ژی ل رۆژا ١٤ی چریا ئێكێ پشتراست كر دەڤەرا ل ناڤبەرا مانگێشكێ و دهۆك ل بن كۆنترۆلا پێشمەرگەیە و لڤا پۆلیسان ل مانگێشكێ هاتییە ڤەقەتیان و تەوارێ چوون بێی ڤەكرنا گەلیێ زاویتە ناهێتەكرن، عەشیرەتێن پشتەڤانێن حكۆمەتێ ژی خۆ ل بەر نەگرتینە و خۆڤەكێشاینە.

هەر وێ رۆژێ قائیمقامی پشتراست كر كو هێزێن حكومی ل سویارەتیكا و مانگێشكێ و سەرسنكی هاتینە ڤەقەتیان و مەترسی ل سەر هەیە و بێی ڤەكرنا رێكێ ناهێنە رزگاركرن، ل رۆژا ١٥ ی چریا ئێكێ ژی پێشمەرگە ل گەلیێ زاویتە خرڤەبوو و كۆپێن چیایێن هنداڤی گەلی كۆنترۆل كرن و ل گوندێ تلخشفێ دگەل چەتەیێن شێخ جەلال بریفكی كەڤتنە د شەرەكی دا، پاشی خۆڤەكێشانە چیایێن دورەرەش یێن دچنە چیایێ ئەلكویش (ئەلقۆش)[213].

بۆ روو ب رووبوونا چالاكیێن پێشمەرگەی ژی ل بادینان، ل رۆژا ٢١ی چریا دووێ یا ١٩٦١ێ ل دیوانا لیوا مووسل ناوەندا ئۆپەراسیۆنان هاتە پێكئینان، هەروەسا هێزەكا سەربازیا مەزن كو ٨٠٠ چەتەیێن كورد پشتەڤانی لێ دكر هاتە پێكئینان بۆ لێدانا پێشمەرگەی ل ئاكرێ، دهۆك، زاخۆ و ئامێدیێ و ئەڤ هێزە ب (هێزا تەمبیكرنێ) هاتە ناڤكرن و ڤێ هێزێ هەر ژ رۆژا ٢١ی چریا ئێكێ هەتا ٥ ی كانوونا ئێكێ یا١٩٦١ێ هێرش كرە سەر سێمێلێ، چیایێ سپی، گەلیێ زاخۆ، زاویتە و گوندێن قەرقور، بالقۆسێ، شێزێ، گەرماڤا، هاجەركێ، چەم جهان، گرفیل، كواشێ، باڤیا و گوندێن چیایێ بێخێرێ و پێشمەرگە شیا بەرسینگێ هێرشا وێ هێزێ بگریت و نەشیا

خۆ ل بەر پێشمەرگەی بگریت، ئینا گوندێ ترکژا سۆت و ل رۆژا ٢٨ی چریا دووێ خۆڤەکێشا، ل رۆژا ٥ی کانوونا ئێکێ ژی د پێکۆلا خۆ دا سەرنەکەفت و نەشیا گەلیێ زاویتە کۆنترۆل بکەت[٢١٤].

وەکی هەرجار دەستەلاتێ ل رۆژێن ٧ و ٢٣ ی کانوونا ئێکێ هژمارەکا قوتابیێن دواناوەندییا شێخان ب گونەهبارییا پەسنکرنا بارزانی و گەفکرنێ ل سەر رێڤەبەری و هژمارەکا قوتابی یێن گوندێ بریفکا یێن پشتەڤانێن حکۆمەتێ دەستەسەرکرن، ژ وان یێن هاتینە دەستەسەرکرن: حسێن بابە شێخ، مستەفا حەسەن محێ، سلۆ خدر، حازم قاسم، عەزیز محەمەد، سلێمان خەلەف، لقمان عەلی، عەبدلقادر رەشید، حسێن عەبدلرەحمان و موسا عەبۆ حەسەن و ئەو حەوالەی جڤاتا عورفی کرن[٢١٥]، کو هەمی پارتی نەبوون، بەلکی هندەك ژ وان کۆمۆنیست بوون.

پشتی بارزانی ژ ورەیێن پێشمەرگەی و ئامادەییا وان بۆ شەرکرنێ و ژ راگەهاندنا پشتەڤانییا پتریا خەلکێ دەڤەرێ بۆ شۆرشێ پشتراست بووی، فەرماندا هێزێن خۆ بەرەڤ رۆژهەلات بەرەڤ دەڤەرا زاویتە بلڤن کو ل وێرێ لەشکەر و چەتە کۆم ببوون، هێزێن بارزانی ل دەستپێکا کانوونا ئێکێ یا ١٩٦١ێ بەرەڤ دەڤەرا دۆسکییان و گوندێن دەرگەلا شێخا و گلناسکێ، پاشی بەرەڤ بێشێنکێ و کەربلێ لڤین، ل رۆژا ١٠ی کانوونا ئێکێ ژی هێزێن وی سەرسنکێ و گەلیێ زاویتە کۆنترۆل کرن، هەروەسا دەمێ هێزێن حکومی پێکۆل کری رێیا سەرسنکی ڤەکەت و دووبارە داگیر بکەت، پێشمەرگەی ل رۆژا ١٢ی کانوونا ئێکێ یا ١٩٦١ێ ل دەڤەرا ناڤبەرا گوندێ کەڤلەسنێ و لۆمانا بەرسینگێ وان گرت و شکاند و حکۆمەت نەچار بوو داخوازا دان وستاندنان بکەت[٢١٦].

بارزانی ل زڤستانا ١٩٦٢ێ ل دەڤەرا ئازادکریا بەرواری بالا بنجەهـ بوو، ل رۆژا ١٣ی شواتێ ژی ژ نشکێڤە و ب ئاوایەکێ گەلەك نەپەنی فەرماندا هێزێن خۆ بلڤن و ئەو هێز کرنە دو پشك، پشکا ئێکێ قەستا ئەترووش کر و یا دووێ ژی قەستا دەڤەرا بەرگارەی کر ل دەڤەرا ئامێدیێ، ل رۆژا ١٤ ی شواتێ هێزا ئێکێ شیا بچتە ناڤ گوندێ سیارێ و تاگرێن حکۆمەتێ یێن ل وی گوندی خۆرادەست کرن و دەستکەڤتیێن پێشمەرگەی ٨٠ تڤەنگ بوون، هەروەسا ل سپێدەیا رۆژا ١٥ی شواتێ چوونە ناڤ گوندێن: رەبەتکێ، نسرا، کانیکا، ملبرکێ، شکێران و گەڤەرکێ، هەروەسا هێزا دووێ ژی پێشرەوی کر و چوو ناڤ گوندێن شەمکان و تلان، بلان، باسڤرێ، ئازەخ، هرماشی، مێرسیدا، کوخێ و شێخکا، هەروەسا رۆژا ٢٢ی شواتێ هندەك هێزێن دی هەردو گوندێن بیجکا ژووری و بیجکا ژێری ل ناحیا سلێڤانەیی کۆنترۆل کرن و پاشی پێشمەرگەی قەستا مرێبا و گوندێن رەخ وچانێن وێ کر، ژ وانا: گرزەنگل، کەڤرەسۆر، خرابە، کمێ، لێ نەشیا مرێبا کۆنترۆل بکەت یا ل رۆژا ٨ ئادارا ١٩٦٢ێ هاتبوو دووریێچکرن کو ئەڤ دووریێچکرنە ل دووڤ پلانا بارزانی و رێنماییێن وی نەبوو و پێشمەرگەی ئێك ژ سەرکردێن خۆ ژ دەستدا کو ئەوژی محەمەد ئەمین میرخان بوو و ناڤبری ب دژواری بریندار بوو، هەروەسا ژ بەرکو حکۆمەتێ ب هەلکەفتا جەژنا رەمەزانێ، ل رۆژا ٧ ئادارێ لێبۆرینەکا گشتی بۆ هەر پێشمەرگەیەکی دابوو یێ خۆرادەست دکەت و فرۆکان بەیانا لێبۆرینێ ل دەڤەرێ بەلاڤ کربوو، بارزانی فەرماندا محەمەد ئەمین میرخان رادەستی دەستەلاتێ بێتەکرن، ژ بەرکو شیانا چارەکرنا وی نەبوو، ئینا ناڤبری بۆ نەخۆشخانا کۆماری یا مووسل هاتە ڤەگوهاستن، لێ ب دەستێ کوردێن جاشێن حکۆمەتێ هاتە تیرۆر کرن[٢١٧].

شەڤا ١٦/١٥ی ئادارا ١٩٦٢ێ ژی پێشمەرگەی هێرش کرە گوندێ بریفکا یا تاگرا دەستەلاتێ، ئەڤە ژی پشتی کۆنترۆل ل سەر گوندێن دۆستەك، سەلاحیە، کانی گولانێ، ئوشیان، سیتەك، تلخشڤا

ژووری و ژێـری[218] و رۆژا ٢٣ی ئاداری پێشمەرگە شیا ب سەر گوندێ بریفكا دا بگریت، لێ ئەتریش كەڤتە د دەستێ شۆڕشگێڕان دا پشتی پۆلیسێن هێزا گەرۆك هاتیە شكاندن و ل وێرێ دەستكەڤتێن پێشمەرگەی ٦٠ تڤەنگێن پۆلەندی بوون[219].

ل داوییا ئاداری ژی بارزانی بەرەڤ قەزا ئاكرێ لڤی و گەهشتە گەلی زەنتە و ل چیایێ دۆستەك بنەجە بوو، پێشمەرگەی كۆنترۆل ل سەر زەنتە و ناحیا دینارتە (نەهلە) و سەرێ ئاكرێ كر، ب هاتنا هەیڤا گولانێ دەڤەرا بادینان كەڤتە د لەپێ شۆڕشێ دا ژ بلی باژێر و سەنتەرێن خەلك تێدا، شۆڕشگێڕان خۆ ژ كۆنترۆلكرنا وان دوور ئێخست داكو گیانێ خەلكێ وان ژ تۆپباران و بومبەبارانێ بێتە پاراستن، ئەڤا خوارێ ژی ئامارەكە ب زیانێن پێشمەرگەی و لەشكەر و چەتان د شەڕ و هنگامێن ناڤبەرا ١١ی ئیلۆنا ١٩٦١ێ هەتا ٣٠ی نیسانا ١٩٦٢ێ دا ل دەڤەرا بادینان هاتینە روودان: پێشمەرگە: ٤٠ شەهید و ٧٨ بریندار، لەشكەر و چەتە و پۆلیس: ١٢٢٥ كوشتی، ١٤٥٠ بریندار و ١٣٢٦ ئێخسیر كو پاشی هاتبوونە ئازاد كرن[220].

هەروەسا بەری بارزانی ل رۆژا ٢١ گولانا ١٩٦٢ێ ژ بادینان بچیت، ئەسعەد خۆشەوی وەك سەركردێ گشتی بۆ بادینان دامەزراند و هەر ئێك ژ بێن خوارێ ژی وەك سەركردێن سەربازی بۆ دەڤەرێن ل بەر ناڤێن وان دامەزراندن: عیسا سوار بۆ دەڤەرا زاخۆ، عەلی خەلیل خۆشەوی بۆ دەڤەرا دهۆك، مەلا شنی قورتاس بۆ دەڤەرا ئاكرێ، حسۆ میرخان دۆلەمەری بۆ دەڤەرا شێخان[221].

هەروەسا بارزانی هاریكار بۆ سەركردێ هەر دەڤەرەكێ دامەزراندن، ژ وانا: عەلی هالۆ هاریكارێ عیسا سوار، فارس كۆرەماركی هاریكارێ عەلی خەلیل، غازی حەجی مەلۆ و هورمز مەلك چكۆ و عومەر ئاغایێ دۆلەمەری و شوكر عەبدال هاریكارێن حسۆ میرخان دۆلەمەری و ئەڤ پێكهاتێن سەربازی ب ناڤێن دەڤەرێن ل بن كۆنترۆلا وان ناڤكرن، رەوش ب ڤێ رێزبەندیێ ما هەتا سالا ١٩٦٤ێ و سیستەمێ لەشكەرێ عیراقێ ل سەر پێكهاتێن پێشمەرگەی هاتە پراكتیك كرن، ئینا (لواء، فوج، سرية، فصائل) ب ناڤێن كوردی (هێز، بەتالیۆن، لق، پەل) هاتنە دانان و دەمێ بارزانی ژ بادینان چووی، هژمارا هێزێن پێشمەرگەی ژ پێنج هزاران پتر بوو[222].

## ناڤدارترین شەڕ و ئۆپەراسیۆنێن شۆڕشا ئیلۆنێ ل بادینان (١١ی ئیلۆنا ١٩٦١-٨ی شواتا ١٩٦٣ یێ)

د وێ هەیاما سەری دا گەلەك شەڕ و ئۆپەراسیۆنێن بچووك و مەزن ل دەڤەرا بادینان هاتنە روودان و كاریگەریا خۆ ل سەر رێچكێن شۆڕشێ هەبوون و شۆڕش ڤەگوهاستە قووناغێن نوو و پێشكەڤت و شەنگستەیێن وێ بنەجە كرن و ئەو دوودلی ڤەرەڤاند كو ل نك هندەكان ل سەر چارەنڤیسێ شۆڕشێ هەبوو، ژ وان شەڕێن ئێكلاكەر ژی د دیرۆكا شۆڕشێ دا ل بادینان شەڕێن لۆمانا - كەڤلەسنێ، گەلیێ قەنتارا (چالۆك)، گەلیێ زاخۆ و ئۆپەراسیۆنا عێن زالە بوون.

### یەك- شەڕێ لۆمانا ـ كەڤلەسنێ:

پشتی شەڕێ زاویتە یێ ل رۆژا ٥ و ٦ كانوونا ئێكێ هاتییە روودای كو پێشمەرگەی لەشكەر و چەتە تووشی شكەستنەكا مەزن كربوون و كۆنترۆل ل سەر سەرسنكێ و گەلیێ زاویتە و رەخ وروویێن دهۆك كربوو، بارزانی ل گوندێ مەمانێ بنەجهبوو، لێ پێشمەرگە و سەرلق ل گوندێن باگێرا، ساركێ، لۆمانا و كەڤلەسنێ بەلاڤە ببوون و دەمێ بارزانی ل گوندێ ئەلكیشكێ بوو، دەنگ وباسەك گەهشتێ كو دەستەلات یا هێزێن خۆ كۆم دكەت داكو هێرشەكا بەرفرەهـ بكەت بۆ ڤەكرنا رێیا سەرسنكی و دووبارە

داگیرکرنا دەڤەرێ[٢٢٣].

رۆژا ١٢ کانوونا ١٩٦١ێ هێزەکا پێکهاتی ژ لقەکا زرێپۆش و هێزا لقەکا پیادەیا بەتالیۆنا سێ یا لیوا ١١ و کەتیبەکا تۆپخانە و بەتالیۆنەکا پۆلیسان و بەتالیۆنا سێ یا لیوا ئێکێ یا پۆلیسان دگەل ٢٠٠ کوردێن تاگرێن حکۆمەتێ، ب سەرکردایەتیا عەقید بەشیر ئیبراهیم فەرماندێ بەتالیۆنا سێ یا لیوا ١١ ژ دهۆك بەرەڤ ئامێدیێ لڤی[٢٢٤] و رێپیڤانا لەشکەری ژی ب ئاوایێ کاروانێ تاکانە بوو[٢٢٥].

دەمێ ئەو دەنگ و باس گەهشتی، دەملدەست بارزانی دگەل سەرکردەیێن لڤا کۆمبوو بۆ دانانا پلانەکێ بۆ بەرسینگگرتنا وێ هێرشێ، پلانێ ژی وەسا خواست پێشمەرگە ل بەتەنێن چیا و بلنداهییان و هەردو رەخێن جاددێ بەلاڤە ببن و چەپەرێن خۆ دانە دەڤەرا ناڤبەرا سیارەتیکا و گوندێ باگێرا کو دهاتە پێشبینی کرن هەر ژ مێرگا درێژ هەتا باگێرا سەری ببیتە مەیدانا شەری، هەرەسا بریار هاتە دان بهێلن هێزێن حکۆمەتێ یێن ژ زاویتە دهێن پێشرەویێ بکەن هەتا پێشیا وان دگەهیتە دەڤەرا مێرگا درێژ و ل وێرێ تەقە لێ بکەن.

سەعەت نەهی سپێدەیا رۆژا ١٢ی کانوونا ئێکێ کو رۆژەکا سڕوسەرما و مژ بوو و بارانەکا بۆش دباری، پێشیا کاروانێ هێزێن حکۆمەتێ گەهشتە چەپێن مێرگا درێژ، ئینا پێشمەرگەی ژ هەردو رەخێن جاددێ تەقە لێ کر و شەڕ گەرم بوو، سەعەت دەهـ و نیڤ فرۆکێن شەڕکەر هاتنە ئاسمانێ دەڤەرێ و دەست ب بومبەبارانێ کرن، لێ بومبەبارانێ چ کاریگەریا خۆ نەبوو، چونکی چو نەدهاتە دیتن و مژێ دەڤەر ڤەگرتبوو، ژ بەر هندێ، بۆ فرۆکەڤانان ب زەحمەت بوو سەرباز و پێشمەرگەی ژێکجودا بکەن، ئینا وان بومبەباران راوەستاند و تنێ ل هنداڤی ئاسمانێ شەرگەهێ دگەریان کو ئەو شەڕ هەتا سەعەت چواری ئێڤاری یێ بەردەوام بوو و تێدا ب سەدان سەرباز هاتنە کوشتن و بریندار کرن و ئێخسیر کرن و ئێخسیر کو هژمارا وان ل دۆرێن ٣٣٠ ئێخسیران بوون بۆ گوندێ گوندك نەبی هاتنە ڤەگوهاستن و ل وێرێ ئازادکرن، ژ بلی چوار ئەفسەران کو ئێك ژ وان ب پلا پێشکار (مقدم) بوو و هەر چوار بۆ شکەفتەکا گوندێ قومرێ ل بەرواری بالا هاتنە ڤەگوهاستن و بهارا ١٩٦٣ یێ هاتنە ئازادکرن.

د وی شەری دا پێشمەرگەی ٨ زرێپۆش و ٣٧ ترۆمبێل سۆتن و دەستکەڤتی ژی ئەڤێن خوارێ بوون: ٥٠٠ تڤەنگ، ١٢ تۆپێن هاون، ٤ تڤەنگێن ژ جۆرێ فیکەرس، ٧ تڤەنگێن ژ جۆرێ برنۆ، ٩ دەزگەهێن بێتێل، ل دۆرێن ١٨٥ نارنجۆکان، ١٨ دەبانجە، ٢١ دووربین، ٢٨ تڤەنگێن ژ جۆرێ ئسترلنگ، ٦١ دەبانجێن رۆناهیێ، سەرباری ب هزاران گوللە و گووللە تۆپ و ئالاڤ و کەرەستەیێن نۆژداری[٢٢٦].

لێ زیانێن پێشمەرگەی هەشت شەهید و ١٩ بریندار بوون[٢٢٧]، ل رۆژا ١٣ی کانوونا ئێکێ ژی هێزەکا لەشکەرێ عیراقێ دەست ب لڤینێ کر بۆ رزگارکرنا کارمەندێن پشتەڤان یێن سەرگەلەیا ئەندازێ (رعیل الهندسة) و لڤا پۆلیسان یێن نەشیاین رۆژا ١٢ ی کانوونا ئێکێ خۆڤەکێشن، لێ ئەو هێز نەشیا ل سەر پێشڕەویا خۆ بەردەوام بیت، ئینا دگەل ٣ سەرباز و ١١ پۆلیسان ڤەگەریا دهۆك و چارەنڤیسێ یێن مایی نەهاتە زانین، رۆژا ١٤ی کانوونا ئێکێ ژی چوار پۆلیس و فەرماندێ بنکەهێ پۆلیسێن سیارەتیکا دگەل ١٨ پۆلیسان گەهشتنە دهۆك، هەرووەسا ل رۆژا ١٦ی کانوونا ئێکێ سەرکردێ تیپا چوار سەرا سەربازگەهها فەیدیێ دا بۆ گەنگەشەکرنا چەوانییا ژ ناڤبرنا شۆرشا کوردی[٢٢٨].

پشتی ڤی شەری، حکۆمەت نەچار بوو داخوازا دان وستاندنان دگەل شۆرشا کوردی بکەت و بۆ ڤێ چەندێ ژی ب رێیا شێخ ئەحمەدێ بارزانی بەرگەڕیان کر و پرا بەریانکێ ل سەر رێیا گشتییا ل ناڤبەرا سیارەتیکا و ئاشاوا وەك جهەك بۆ دیدارا بارزانی دگەل دان وستاندنکارێ حکومی عەقید روکن حەسەن عەبود فەرماندێ لیوا پیادەیا یازدە هاتە دەستنیشان کرن.

ب راستی، حکۆمەتێ نەدڤیا دان وستاندنان بکەت، بەلکی پلان دانابوو ب فرۆکان جهێ دان

وستاندنان بومبەباران بكەت دەمێ عەبود دیدارێ دگەل بارزانی دكەت و هەردوان پێكڤە بكوژیت، بارزانی ب مەترسییا چوونێ بۆ پرا بەریانكێ حەسیا و پشتی گەنگەشەكرنێ دگەل دەستەیێن پێشمەرگەی، جهێ دیدارێ دگەل عەبود هاتە گوهورین و بۆ سەرسنكێ هاتە ڤەگوهاستن[229].

سپێدەیا رۆژا ١٧ی كانوونا ئێكێ كو ژڤانا دیدارێ بوو، بارزانی ژ بامەرنێ قەستا سەرسنكێ كر و ل وێرێ دو سەركردێن پێشمەرگەی كو ئەو ژی عەلی عەسكەری و عەلی شەعبان بارزانی بوون هنارتنە پرا بەریانكێ داكو حەسەن عەبود ب گوهورینا جهێ كۆمبوونێ بۆ سەرسنكێ ئاگەهدار بكەن و داخواز ژێ كرن و ل ترۆمبێلا وان سویار ببیت و ترۆمبێلا خۆ ل وێرێ بهێلیت كو دەزگەهەكێ پەیوەندیكرنێ دگەل فرۆكان (مجس جوي) تێدا بوو، ل سەرسنكێ حەسەن عەبود پێكۆل كر بارزانی رازی بكەت كو خۆرادەست بكەت بەرامبەری گەردەن ئازاكرنا وی[230]، لێ نیڤ سەعەتێ پشتی دەستپێكرنا كۆمبوونێ ل كۆچكا ئەندازیاری ل پشت ئۆتێلا بەری ل سەرسنكێ، دو فرۆكەیان ل دۆرێن سەعەت ١٢ی نیڤرۆ پرا بەریانكێ بومبەباران كرن و پێشمەرگە عەبدلعەزیز حەمێ هاتە كوشتن و بارزانی ژی كۆمبوون دگەل عەبود راگرت و ڤەگەریا بامەرنێ و ژ وێرێ ژی چوو دەڤەرا بەرواری بالا و هەتا شواتا ١٩٦٢ێ ل وێرێ ما.

لێ حكۆمەتێ، پشتی د پلانا خۆ دا بۆ تیرۆركرنا بارزانی سەرنەكەڤتی، ل رۆژا ١٧ی كانوونا ئێكێ ب گونەهباریا وێ چەندێ كو بێی ئاگەهداریا بەرپرسان پەیوەندی ب بارزانی كرییە، حەسەن عەبود ڤەگوهاستە وەزارەتا بەرەڤانیێ و راگر عەلی ئەلعاملی ل شوونێ دامەزراند[231] و رۆژا ١٨ی كانوونا ئێكێ فرۆكان دەڤەرێن بامەرنێ و چیایێ مەتینا و زێوا شێخ پیراමووس و گەلەك گوندێن دی یێن دەڤەرێ بومبەباران كرن و زیانێن مەزن گەهاندنە ملك و مالێ گوندییان، ئەڤە سەرباری كوشتنا گەلەك ژ وان، وەكی هەرجار، دەستەلاتێ پشتی حەفتییەكێ دەست ب هەوەكا دەستەسەركرنێ ل دەڤەرێ كر و

د وێ هەوێ دا ب گونەهباریا هاریكاریكرنێ دگەل پێشمەرگەی ٤٥ پارتی و هەڤسۆزێن شۆرشێ دەستەسەر كرن و ڤەگوهاستنە مووسل و ژ وێرێ ژی برنە حللە و دوو سالان پشتی هنگی هاتنە ئازاد كرن، هەروەسا گوندێن كەڤلەسنێ، لۆمانا، ساركێ، گوندكا و ئەلكیشكێ هاتنە سۆتن[232].

د نڤیسارا موتەسەرفێ لیوا مووسل دا یا رۆژا ١٧ كانوونا ئێكێ بۆ وەزارەتا ناڤخۆ هنارتی هاتییە: دووبارە پشتەرێبوویان ل هەردو دەڤەرێن دهۆك و ئامێدیێ ب هێزتر ژ بەرێ دەست ب چالاكیێن خۆ كرینە، ئەڤە ژی بوویە ئەگەرێ هندێ مەزنترین هێزا پۆلیسێن گەرۆك دگەل هێزێن سەربازی بێنە ب كارئینان بۆ ژ ناڤبرنا (پشتەرێبوویان). موتەسەرفییا مووسل پێشنیاز كر فەرمانبەرێن كوشتی و بریندار و خەلكێ تاگرێ حكۆمەتێ ب ڤی ئاوایێ خوارێ بێنە قەرەبوو كرن: فەرمانبەرێ كوشتی (٥٠٠) دینار، فەرمانبەرێ بریندار (١٥٠) دینار، پۆلیسێ كوشتی (١٠٠) دینار، پۆلیسێ بریندار (٥٠) دینار، وەلاتیێ كوشتی (١٠٠) دینار و وەلاتیێ بریندار (٣٠) دینار[233].

هەروەسا هەر ژ رۆژا ١٩ی كانوونا ئێكێ یا ١٩٦١ێ هەتا ١٧ی ئادارا ١٩٦٢ێ هێزێن حكۆمەتێ گەلیێ قەنتارا و سویارەتیكا داگیركرن و رۆژا ٦ی كانوونا دووێ ژی هێزەك ب ناڤێ (هێزا ئامێدیێ و كانی ماسێ) هاتە پێك ئینان بۆ بەرەڤانیكرنێ ژ ئامێدیێ و چاڤدێریكرنا بزاڤێن پێشمەرگەی، ل رۆژا ١٩ی كانوونا دووێ ژی هێزێن حكومی چوونە ناڤ بامەرنێ و ل رۆژا ٢٥ ی شواتێ هێزێن پێشمەرگەی هێرش كرنە سەر چەپەرێن پۆلیسان ل گەلیێ زاخۆ و شیان كۆنترۆلێ ل سەر هەردوو رەخێن و راستێ و چەپێ یێن گەلی بكەن[234].

## دو- شەرێ گەلیێ قەنتارا (چالۆك):

دەمێ پێشمەرگەی گوندێ بریفكا دوورپێچكری و وەك خۆ ئامادەكرن بۆ گەهشتنا هەر هاریكارییەكا حكومییا پێشبینیكریا دوورپێچكریان داخواز كری، بارزانی كو بارەگەهێ وی ل نێزیكی ئەتریش بوو، فەرماندا پێشمەرگەیێ ل هەردوو دەڤەرێن زاویتە

و سویارەتیکا روو ب رووین هێزێن حکومی ببن یێن بەرەڤ زاویتە دلڤن و قەستا بریفکا دکەن، دەمێ دەنگ و باس هاتین کو لەشکەرێ حکۆمەتێ دێ ژ سەرسنکی بەرەڤ زاویتە لڤیت، پێشمەرگەی شەڤا ١٨/١٧ی ئادارا ١٩٦٢ێ ب سەرکردایەتییا خەلیل خۆشەوی بووسەیەك ل گەلیێ قەنتارا دانا و دەمێ هێزێن حکومی هاتینە ناڤ گەلی، هێزێن پێشمەرگەی ژ هەردو لاڤە هێرش کرە سەر، ئینا شەپرزەیی و شەپلین کەڤتە ناڤ رێزێن هێزێن حکومی و هەر ئێك بۆ لایەکی دڕەڤی و سەعەت دەهی سپێدەیا رۆژا ١٨ی ئادارێ، فرۆکێن شەڕکەر و هەلیکۆپتەرێن سەربازی گەهشتنە ئاسمانێ دەڤەرێ و دەست ب هێرشان کرن، هەروەسا دەملدەست هێزەکا سەربازی ب سەرکردایەتییا عەقید مەجید سەبع ئەلعەبوسی لڤی و گەهشتە گەلی و دگەل گەهشتنا ڤێ هێزێ و بومبەبارانا فرۆکان، پێشمەرگە هەتا سەعەت سێی ئێڤاری ل سەر شەڕکرنێ یێ بەردەوام بوو، سەعەت پێنجی ئێڤاری هێزێن حکومی ژ وێرێ چوون، ئەڤە ژی پشتی ب ترۆمبێل و هەلیکۆپتەران کوشتی و برینداریێن خۆ ڤەگوهاستینە دهۆك و مانگێشکێ.

زیانێن هێزێن حکومی د ڤی شەڕی دا ٢٧ کوشتی بوون کو دوو ژ وان ئەفسەر بوون و ئێك ژ وان موحسن ئبلیش خەلکێ مووسل بوو، هەروەسا ٣٥ بریندار ژی هەبوون، ئەڤە ژ بلی زیانێن دی یێن چەك و ترۆمبێلان، لێ زیانێن پێشمەرگەی ٣٥ کوشتی و ٢٠ بریندار بوون ل دووڤ بەلگەنامەیێن حکومی کو زێدە پێڤەنایە بۆ سڤککرنا قەبارێ وێ شکەستنا تووشی هێزێن وێ بووی[٢٣٥]، لێ هژمارەکا پێشمەرگەیێن پشکدار د وی شەڕی دا پشتڕاست دکەن کو وان تنێ دو پێشمەرگە ژ دەستدابنە و ٩ بریندار بووینە و دەستکەڤتی ژی: ٢ تفەنگێن برنۆ، ٥ تفەنگێن ژ جۆرێ سترلنگ، ١٥ تفەنگێن ئنگلیزی، ٣ دەبانجە، دەزگەهەکێ بێتێل و تبابەکا مەزن یا تەقەمەنی و کەل وپەلێن سەربازی بوون[٢٣٦].

سەرکەفتنا پێشمەرگەی ل گەلیێ قەنتارا ب دەستڤەئینانا دەنگڤەدانەکا بەرفرەهـ ل سەرانسەری کوردستانێ هەبوو، وێ سەرکەفتنێ ورەیێن پێشمەرگەی بلند کرن، نەخاسمە ژی ل بادینان، پێشمەرگەی دووریێچکرنا خۆ ل سەر بریفکا موکمتر لێ کر هەتا ئەو گوند ل رۆژا ٢٧ ئادارا ١٩٦٢ێ کەڤتییە د دەستێ پێشمەرگەی دا، هەڤدەم دەستەلاتا ناڤخۆیی ل دهۆك تووشی حێبەتیبوون و هستیریابێ ببوو، پێشمەرگەی رێیا زاویتە ژی گرت، لێ پۆلیسان و ئینزیباتێن سەربازی ب چویڤان هێرش کرنە سەر خەلکێ دهۆك یێن رژیاینە سەر جادەیێن سەرەکی یێن بازێری بۆ بەرێخۆدانا ترۆمبێلێن تەرمێن سەربازێن کوشتی و بریندار هەلگرتین و پۆلیسان هەوەکا دەستەسەرکرنێ ئەنجامدا و ل دۆرێن ٢٠ کەسان گرتن و برنە گرتیخانا (الفضیلیة)یا بەغدا، ژ وانا: نەعمۆ سەمەد (کاسبکار)، محەمەد سالح محەمەد عەلی عومەر (خودانێ چایخانێ)، مکائیل عەلی سارکی، خەلیل یوسف مراری (کاسبکار)، مووسا عیسا صوری (پەڕۆکفرۆش)، حەسەن مەحمود حەسەن (پەڕۆکفرۆش)، محەمەد سەلمان بەرواری، مەلا عەبدولحەکیم، حەسەن بێکەس، مەلا عاسم عەبدوللا، رەشید مەلا عاسم، محەمەد حەجی موبارەك، تەوفیق زاویتەیی، ئەحمەد ئاڤدەل و پتریا وان ژ بنەمالێن پارتییێن بەرنیاس بوون ل نك دەستەلاتێ[٢٣٧].

هەروەسا د برۆسکەیەکا قائیمقامێ دهۆك دا یا رۆژا ٢١ ئادارا ١٩٦٢ ێ بۆ موتەسەرفییا مووسل هاتییە: (پشتەرێ) هاتینە ناڤ هەردوو گوندێن زێوە و بێسفکێ و ناحیا سێمێلێ و دێ پێشڕەویێ بەرەڤ کێڤلا کەن و سەنتەرێ ناحیا سێمێلێ ژی گەفا مەترسیێ ل سەر هەیە و هندەك ژ وان پێشڕەوی کرینە گەلیێ قەنتارا بۆ جارەکا دی لێدانا کاروانێ سەربازی دەمێ د وێرێ را دەرباز دبیت، هەر وان ب سەرکردایەتییا عیسا سوار گوندێن بانەصۆرێ و باخرنیف و لیناڤا داگیر کرینە[٢٣٨].

هەروەسا رۆژا ٢٢ی ئادارێ بزاڤا نەتەوەپەروەران ل

مووسل پشتی ڤەشارتنا تەرمێ جێدار موحسن ئبلیش، بەیانەك دەرئێخست و تێدا شۆرشا کوردی و بارزانیێ سەرکردێ وێ و عەبدولکەریم قاسم پرۆتستۆ کرن، ل دووڤ وێ بەیانێ، وێ شۆرشێ رەگەزێن نەتەوەپەروەرێن د ناڤ رێزێن لەشکەری دا کرینە ئارمانجا خۆ[٢٣٩].

### سێ- شەرێ گەلیێ زاخۆ:

رێکخستنا پارتی ل یەکەیێن سەربازیێن ئاکنجی ل زاخۆ، بەردەوام دەنگ وباسێن لڤینێن لەشکەری ل دەڤەرێ دڤەگوهاستنە بەرپرسێ لیژنا ناڤخۆیی یا پارتی و وێ لیژنەیێ ژی دگەهاندنە عیسا سوارێ سەرکردێ دەڤەرێ، ل ئادارا ١٩٦٢ێ پێشمەرگەی کۆنترۆل ل سەر گەلەك چەپەرێن حکومی ل گەلیێ زاخۆ و ناحیا سلێڤانەیی (ئاسیهێ) کربوون و خۆ ل گوندێ ترکژا و گەلیێ قەلەما ئاسێ کربوون، ل ڤێ دەڤەرێ نامەیەکا بلەز ژ لیژنا ناڤخۆ گەهشتە عیسا سوار کو بەتالیۆنەکا سەربازی ب سەرکردایەتیا عەقید مەجید سەبع ئەلعەبوسی دێ ژ شێخان قەستا باتیفا کەت بۆ پێکگوهورینا بەتالیۆنا ل وێرێ، ژ بەر بەرتەنگیا دەمی دشیاندا نەبوو ل گەلی شەر دگەل وێ هێزێ بێتەکرن، لێ بریار هاتەدان سپێدەیا رۆژا ئێکی نیسانا ١٩٦٢ێ روو ب روویێ بەتالیۆنا باتیفا ببن دەمێ خۆ ژ باتیفا ڤەدکێشیت و د گەلی را دەربازی شێخان دبیت، بۆ ڤێ چەندێ ژی بەرهەڤی و پێرابوون هاتنە کرن و پلانەك بۆ روو ب رووبوونا وێ بەتالیۆنێ هاتە دانان، کورتیا وێ ژی ئەوە کو پێشمەرگە بووسەیەکێ بۆ دانیت و ب درێژاهیا گەلی پێشمەرگە گەلەك ب نهێنی ب تاکێن دارا خۆ ڤەشێرن و تەقە ل کاروانێ بەتالیۆنێ نەهێتە کرن هەتا وی دەمێ ب تمامی دهێتە ناڤ گەلی و پێشمەرگەیێن ل داوییا گەلی ل نك بنکەهێ پۆلیسێن سێجێ بنەجهـ بووین بەری هەمیان تەقێ ل پێشیا کاروانی بکەن کو ئەو ژی ترۆمبێلا فەرماندێ بەتالیۆنێ پێشکار (مقدم) عەبدولکەریم شنداله و هاریکارێ وی مەحمود عەبدوللا و ترۆمبێلا دەزگەهێ پەیوەندیێ یە، پێدڤییە ژی پێشمەرگە پشتی شەرێ چەپەرێن خۆ و گەلی بەرنەدەن، بەلکی ئەو چەند پشتی تاریبوونێ بیت، داکو نەبنە ئارمانجێن ئاشکەرا بۆ فرۆکان و بۆ کێمکرنا مەترسی و کاریگەریا بومبەبارانا ئاسمانی، هەروەسا بریار هاتە دان، پشتی شەر گەرم دبیت، کۆمەکا پێشمەرگەی بچیتە سەر جاددێ و تێکەلی سەربازان ببیت.

ئێکەمین کارێ پێشمەرگەی کری، برینا تێلا تێلەفۆنا ل ناڤبەرا زاخۆ و مووسل بوو، ل سپێدەیا ئێکی نیسانا ١٩٦٢ێ پێشییا کاروانێ بەتالیۆنا دو یا لیوا سێ گەهشتە گەلی کو ژ ٣٥ ترۆمبێل و ٤ زرێپۆش و ٥ ترۆمبێلێن جێپ یێن تایبەت ب ئەفسەران دگەل ٢ ترۆمبێلێن پیکاپ کو ترۆمبێلا فەرماندێ بەتالیۆنێ و ترۆمبێلا دەزگەهێ پەیوەندیکرنێ ل پێشیێ بوو پێکدهات، ئێکسەر دەمێ پێشیا کاروانی گەهشتییە داوییا گەلی، ژ هەردوو رەخان ڤە تەقە ل کاروانی دەست پێ کر، ل پێشیێ هاریکارێ فەرماندێ بەتالیۆنێ بریندار بوو کو ب پلا پێشکار بوو، فەرماندە ژی ب دژواری بریندار بوو لێ شیا خۆ رزگار بکەت و خۆ بگەهینیتە بنکەهێ پۆلیسێن سریجێ.

وێ هێرشا نشکاڤەیی بەتالیۆن شەپرزە کر، ژ بەر هندێ سەرباز و ئەفسەرێن وێ نەشیان بچنە د چەپەران دا و بەرەڤانیێ ژ خۆ بکەن، ئینا گەلەك ژ وان نەچار بوون خۆ رادەست بکەن و شەر ب کێمتر ژ سەعەتەکێ ب سەرکەفتنا پێشمەرگەی ب داویهات و پتریا سەرباز و پلەدار و ئەفسەرێن وێ بەتالیۆنێ هاتنە کوشتن و بریندار کرن و خۆرادەست کرن.

سەعەت دەهی سپێدێ چوار فرۆکە هاتنە ئاسمانێ دەڤەرێ و دەست ب بومبەبارانا گەلی و پێشمەرگەی کرن و ئەو هێرش هەتا چواری ئێڤاری یا بەردەوام بوو، هەروەسا بەتالیۆنا ئاکنجی ل زاخۆ ژی د هەواری هات و دەست ب تۆپبارانا دەڤەرێ کر، دەمێ بوویە تاری ژی پێشمەرگەی خۆڤەکێشا، ئەڤە ژی پشتی ئامیرێن مایی یێن بەتالیۆنێ سۆتین و دەستکەڤتی ژی کو چەك و تەقەمەنی بوون ب دەواران ڤەگوهاستنە گوندێ بێتاسێ[٢٤٠].

زیانێن بەتالیۆنێ ئەڤێن خوارێ بوون: ٧٥ كوشتی چوار ژێ ئەفسەر بوون، بریندارب‌وونا ٥٨ سەرباز و ئەفسەران دو ژێ ئەفسەر بوون، ١٨٨ ئێخسیر هەشت ژێ ئەفسەر بوون، سۆتنا ٢٧ ترۆمبێلێن مەزن و ٥ جێپ و ٢ پیكاپان. دەستكەڤتیێن پێشمەرگەی ئەڤێن خوارێ بوون: ٤ تۆپێن هاونێن ٣ گرێ و ١٠ گرێ، ٦ تڤەنگێن ژ جۆرێ فیكەرس، ١٥ برنۆ، ٨٥ رەشاشێن سترلنگ، ١٤٥ نارنجۆك، ٨٥ بومبەیێن دووكێلێ و ٢٥ دەبانجە ، ١٨٢ تڤەنگ، ١٨ دووربین، ٦٥ دەبانجێن رۆنكرنێ، ئەڤە سەرباری تبابێن مەزن یێن عەتادی، هەروەسا پاشی سەربازێن ئێخسیركری هاتنە بەردان و ژ بلی ئەفسەرێن ئێخسیركری، لێ زیانێن پێشمەرگەی د وی شەری دا ٣ كوشتی و ٤ بریندار بوون[٢٤١].

لێ كارڤەدانا حكۆمەتێ وەكی هەرجار ئەنجامدانا هەوەكا دەستەسەركرنێ بوو و ل رۆژا ٣ ی نیسانێ دەست ب دەستەسەركرنا ئەندامێن پارتی و هەڤسۆزێن وێ و هەر دكانداره‌كی بوو یێ رۆژا ئێكی نیسانێ دكانا خۆ دائێخستی، ژ وانا: جەمیل یونس محەمەد، جاسم عەبدی بنیامین، حازم حەسەن حەجی، ئەحمەد رەشید عەبدی، حەجی حەسەن حەسەن، سەعید حاجی، محەمەد حەجی یونس، سەدیق عارف عەلامە، كری رەشید كرتۆ، موحسن حەجی محەمەد قاسم. هەروەسا ئەڤێن خوارێ ژی هاتنە گرتن: رەمەزان محەمەد تاهر (كرێكار)، رەجب ئەمین یاسین (پنیدۆز)، سەلیم عابد سالح (پەرۆكفرۆش)، سیرۆپ یوسف سەركیس (پەرۆكفرۆش)، سەبری عەبدوللا یەعقوب (كرێكار)، شاهین نەبی ئیسماعیل (كرێكار)، عەبدلعەزیز مەحمود سەید مووسا (كرێكار)، عەلی عەبدوللا ئۆسمان (كرێكار)، شوكر ئەحمەد مەحمود (كرێكار)، موحتەرەم شەمسەددین حەجی خدر (كرێكار)، محەمەد عەلی مستەفا (مامۆستایێ ئایینی)، شوكر ئەحمەد محەمەد (كرێكار)، محەمەد، محەمەد عارف عەلامە (خودانێ نانپێژیێ)، عەبدلعەزیز تاهر (محەمەد عەزۆ) (خودانێ ئۆتیخانێ)،عەبدالاحد یوسف زێرۆ (خودانێ مەكینا ئاری) و هەمی ب وێ چەندێ هاتنە گونەهباركرن كو پشكداری د روودانێن (پشتەرێبوون و تێكدانێ) و بەلاڤكرنا پرۆپاگەندێن كیندار دا دژی تەناهی و سلامەتیا كۆمارێ كرینە و رۆژا هێرشكرنا سەر بەتالیۆنێ ل گەلیێ زاخۆ، بۆ پەیداكرنا فەرتەنە و ئالۆزیێ ل ناڤ بازێری دكانێن خۆ دائێخستینە، هەرچەندە ژی دەستەلاتێ چو دیدەڤان نەبوون زانیاریان ل سەر دەستەسەركریان بدەن بۆ دیاركرنا گونەهێن ب وان ڤە هاتینە نساندن، ژ بەركو خەلكێ زاخۆ هاریكاری دگەل نەدكر، لێ دەستەلاتێ ئەو ئازاد نەكرن ژی[٢٤٢].

هەروەسا دەستەلاتێ ل رۆژا ٢٣ نیسانا ١٩٦٢ێ ل مووسل و ب هەوالدەریا هەر ئێك ژ محیەددین ئەحمەد موختارێ گوندێ بەردەرەشا بچووك، عاسم ئەمین ئاغا (ژ گوندێ دارەتوو) و یوسف ئیبراهیم ژ ناحیا (حەفت عەشیرەتان - بەردەرەش) ئەڤێن خوارێ دەستەسەركرن: محیەددین شلی (پەرۆكفرۆش)، غەفور خدر (پەرۆكفرۆش)، خدر عەبدوللا حاجی (دەرمانۆكفرۆش- عطار)، جەرگیس حەجی ئەحمەد (كرێكار)، حسێن ئۆسمان و محەمەد ئۆسمان (شۆفێرێن راستڤەكرنا رێیان ل فەرمانگەها ئەشغالێ)، قادر حاجی و یونسێ كورێ وی (خودان عەلوە)، ئیبراهیم و ئۆسمان و تەوفیق حەمە سۆر (خودانێن چایخانێ)، یاسین خدر و سالح و فارس ئەحمەد رۆڤی (ئاكنجیێن هەڤلێر)، كاكل خدر (پەرۆكفرۆش)، محەمەد حاجۆ ئۆسمان سێكانی (پەرۆكفرۆش) و هەمی ئاكنجیێن هەردوو تاخێن نەبی یونس و فەیسەلیێ (النصر)ن و ب گونەهباریا وێ چەندێ هاتینە گرتن كو هندەك كارێن وەسا كرینە دبیت ببنە ئەگەرێ لاوازكرنا مەزناهی و سەنگا حكۆمەتێ و تانلێدانا هێزێن چەكدار و هاریكاریكرنا (پشتەرێبوویان) ب رێیا كرینا چەك و جەبلخانەیێ، ئەڤە سەرباری هەبوونا وان ل مووسل مەترسییە ل سەر عەشیرەتێن تاگرێن حكۆمەتێ یێن هاتینە بازێری[٢٤٣].

لێ كارڤەدانا پێشمەرگەی ل سەر ڤان پێرابوونێن



عەزیز ئەترووشی، ١٩٦٩/٥/٢٥ هاتییە شەهیدکرن



عەزیز ئاکرەیی

حکومەتێ ل زاخۆ و مووسل ئەنجامدانا هێرشەکێ بوو، ل رۆژا ٢٩ گولانا ١٩٦٢ێ پێشمەرگەی هێرش کرە سەر بەتالیۆنا باتیفا و ئاڤگەنیێ و ئەو بەتالیۆن دووریێچکر و فەرماندێ وێ عەقید روکن عەبدلمەجید سەبع ئەلعەبوسی هاتە کوشتن[٢٤٤] و پێشمەرگەی دووریێچکرن ل سەر نەراکر هەتا هاریکارێن سەربازی ب سەرکردایەتییا راگر (عمید) روکن ئیبراهیم فەیسەل ئەلئەنساری فەرماندێ لیوا پێنج گەهشتیێ[٢٤٥].

پشتی شکەستنا هێزێن خۆ ل گەلیی زاخۆ و باتیفا، دەستەلاتێ پێکۆلکر سادقێ حەجی برۆ سەرۆکێ عەشیرەتا گولییان ل سەر خۆرادەستکرنێ رازی بکەت و خۆ بدەتە ئالیێ حکومەتێ، حکومەت ب هاریکاریا ئاغایێن تاگرێن خۆ شیا تۆما ریس مەترانێ زاخۆ رازی بکەت بچیتە نك سادقێ حەجی برۆ داکو وی رازی بکەت پشتەڤانیا خۆ بۆ حکومەتێ رابگەهینیت، وەسا دیارە ژی ئاغا و دەستەلاتێ دڤیان دوو چووچکان ب بەرەکی بکوژن، یا ئێکێ خۆ ژ مەترانی رزگار بکەن چونکی ل وێ باوەرێ بوون پێشمەرگە دێ مەترانی (ب خایین) ل قەلەم دەن و دێ وی گرن و کوژن، یا دووێ ژی، هەکە ئەڤە هاتە روودان، عیراق و دەولەتێن رۆژئاڤایی دێ هەمی جیهانێ کەنە نەیارێن شۆرشا کوردی و دێ ب بزاڤەکا ئایینی یا دەمارگیر و پاشکەڤتی ل قەلەم دەن، لێ شۆرشێ ئەڤ دەلیڤە بۆ وان نەهێلا، بەلکی رێز ل مەترانی گرت دەمێ رۆژا ١٨ گولانا ١٩٦٢ێ هاتییە دەڤەرا رزگارکری و ٤٠ رۆژان وەك میڤان ل نك خۆ هێلا و رۆژا ٦ تیرمەها ١٩٦٢ێ رێدایێ ڤەگەرییتە زاخۆ، ئەڤە ژی پشتی بۆ رۆنکری کو ئەو کارێ ئەو پێ رادبیت مەترسی تێدا هەیە ژ بەرکو کەسەکێ ئنیتەپاقژە[٢٤٦].

هەروەسا ژ کارڤەدانێن دی یێن دژی شۆرشێ د ڤێ قووناغێ دا، گونەهبارکرنا جۆتیاران بوو ل بادینان،

نەخاسمە ژی ل دەڤەرا ئاکرێ، ل دەمسالا دروینێ جۆتیار ب پشتەڤانیکرنا شۆرشێ هاتنە گونەهبار کرن، ئەڤە ژی بەهانەیەك بوو بۆ دەستەسەرکرنا وان و بۆ هندێ دا سەرۆکێن جاشان (چەتان) دەست ب سەر بەرێ واندا بگرن، وەسا دیارە ژی بەرپرسێن مووسلێ های ژ ڤێ چەندێ هەبوون، گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ ئەوە کو سەرۆکاتییا دەستەیا تایبەتا ڤەکۆلینێ ل بنگەهێ مووسل داخواز ژ حاکمێ گشتیێ سەربازی کربوو دەستەلاتێ بدەتێ جۆتیارێن ب وێ بەهانا هاتینە دەستەسەرکرن بێنە ئازاکرن و پشتی دەمسالا دروینێ ڤەکۆلین دگەل بێتە کرن[٢٤٧].

هەروەسا سەرکەفتنێن پێشمەرگەی ل ناڤبەرا ١١ ئیلۆنا ١٩٦١ێ هەتا خزیرانا ١٩٦٢ێ بۆ ئەگەرێ هندێ دەستەلات بەرفرەهترین هەوێن دەستەسەرکرنێ دژی پارتی و هاریکار و هەڤسۆزێن شۆرشێ ل باژێر و گوندێن کوردی ئەنجام بدەت و ٢٠٦ کەس ل دەڤەرا بادینان گرتن و ملك و مالێ ڤەگوهاستی و نەڤەگوهاستیێ گەلەك یێن گەهشتینە شۆرشێ دەستەسەرکرن کو هژمارا وان ل بادینان ل دۆرێن ١٦٢ کەسان بوو، ئەڤە سەرباری لادانا قوتابی و فەرمانبەر و کارمەندێن ل دام ودەزگەهێن دەولەتێ کار دکەن و ڤەگوهاستن و دوورئێخستنا وان بوو بۆ ناڤەراست و باشوورێ عیراقێ[٢٤٨].

بەرامبەری ڤێ چەندێ، پشتی وێ بەیانا پارتی ل نیسانا ١٩٦٢ێ ئاراستەی هێزێن چەکدارێن عیراقی کری و داخواز ژێ کری بکەهنە هێزێن پێشمەرگەی، ل تیرمەها سالا ١٩٦٢ێ ب سەدان سەرباز و هژمارەکا ئەفسەران گەهشتنە ناڤ ریزێن شۆرشێ، ژ وانا: عەقید روکنێ تۆپخانێ عەزیز رەشید ئاکرەیی، جێدارێ (ملازم) تۆپخانێ عەزیز مەجید ئەترووشی، پێشرەو (رائد) بەکر عەبدولکەریم حەوێزی، ل رۆژا ٥ ی تیرمەهێ ژی وان ئەفسەران گازییەکا دەستنڤیس ئاراستەی ئەفسەر و سەربازان کر و هاندان بکەهنە شۆرشێ و دەستەلاتێ ئەڤ گازییە ل دهۆك دیت[٢٤٩].

ل رۆژا ١١ای تەباخێ ژی جێدار (معاون شرطة) عەبدلوەهاب ئەترووشی دگەل گەلەك پۆلیسێن قەزا چوارتە و ل چریا دووێ جێدار حەسەن بارزانی و ل رۆژا ٣٠ ئادارا ١٩٦٣ یێ ئێکەمین ئەفسەرێ کورد کو ئەو ژی مەجید بابەکر پیرمووس بێدوهی بوو ل گوندێ شاوریکێ پەیوەندی ب بارەگەهێ ئەسعەد خۆشەوی کر کر[٢٥٠].

دەستەلاتێ خێزانا عەزیز ئاکرەیی و هژمارەکا کەس وکارێن وی گرتن، تشتێ گرنگ ژی ئەوە کو پشتی بۆرینا کێمتر ژ سالەکێ ل سەر دەستپێکرنا شۆرشێ، هژمارا پێشمەرگەی گەهشتبوو دۆرێن ١٥ هزار شەرکەران[٢٥١].

ل ڤێرە فەرە بێژین کو سەرکەفتنێن پێشمەرگەی و بنەجهبوونا رەوشا شۆرشێ ل تیرمەها ١٩٦٢ێ، رۆژنامەڤانێ ناڤدارێ ئەمریکی دانا ئادەمز شمیدت هاندا بکەهیتە بنکەهێ و بارەگەهێن شۆرشا کوردی و ئەنجامدانا دیدارەکێ دگەل سەرکردێ وێ و پەرتووکەکێ ب ناڤێ (گەریانەك بۆ نك مێرخاسان) دانیت کو پێ خەلاتێ (جۆرج پۆلك) یێ رۆژنامەڤانییا ئەمریکی وەرگرتییە کو ئەڤ خەلاتە پێشکێشی باشترین ریپۆرتاژا سالێ دهێتەکرن یا د کاودانێن ترسناك دا دهێتە ئامادە کرن.

ئادەمز ل تیرمەها ١٩٦٢ێ ب رێیا زاخۆ هاتە کوردستانێ و دیدار دگەل عیسا سوار و مەلا حەمدی عەبدلمەجید کر و رۆژا ٢١ی تیرمەهێ دیدار دگەل ئەسعەد خۆشەوی سەرکردێ دەڤەرا بادینان کر و ل دۆرێن هەیڤەکێ ل دەڤەرێن رزگاریێن کوردستانێ ما، پاشی دەرباز بوو سۆران و ل وێرێ دیدارا بارزانی کر و پشتی ٤٦ رۆژان مایە ل دەڤەرێن رزگارکری، هەر د وێ رێکێ را ڤەگەریا سوریا و لبنان، هەروەسا ئەو تشتێ وی د رۆژنامەڤانییا ئەمریکی دا نەخاسمە ژی د رۆژناما نیویۆرك تایمز دا بەلاڤکری، کاریگەرییەکا مەزن بۆ دانەنیاسینا شۆرشا کوردی هەبوو[٢٥٢].

## چوار- کریارا لێدانا زالگەها (المجموعة الثقافية) ل مووسلێ

سەرکردایەتیا دەڤەرا بادینان پشتی کو رەزامەندیا سەرکردایەتیا شۆرشێ وەرگرتی هزر ل وێ چەندێ کر چەند کریارەکێن لەشکەری ل هندەك دەڤەر و جهێن بەرچاڤ و دووری بەرۆکێن شەری و بنکەە و بارەگایێن شۆرشێ بکەت، مەرەم ژ ڤێ چەندێ ئالوزاندنا دەستەلاتداران و تێکەهاندنا وان کو دەستێ پێشمەرگەی دگەهیتە هەر ئارمانجەکێ وان بڤێت، ب تایبەت ژی ئەو ئامانجێن گرنگیا خۆ یا سیاسی و ئابووری هەی و داکو سەرنجا خەلکەکی راکێشنە جەم چالاکیێن شۆرشێ و وان پرۆپاگندەیێن حکۆمەتێ ب نەوەی بدەرێخن یێن دگۆتن شۆرشگێر د دەڤەرێن دوورە دەست و کووراتیا گەلییان و جهێن سەختێن چیایی ڤەدەربووینە و ژناڤبرنا وان تنێ پرسگرێکا دەمییە و ئەڤرۆ نە سۆبەهی دێ هێنە ژناڤبرن.

بۆ بجهئینانا ئارمانجێن ئاماژەپێکری سەرکردایەتیا دەڤەرا بادینان جهێ کۆمپانیا نەفتێ ل عەین زالە کو کۆمەکا شارەزایێن بیانی ژی تێدا کاردکر دەستنیشانکر و ئارمانجێ دیتر ژی زالگەها (المجموعة الثقافية) بوو ل مووسلێ، ئەڤ زالگەهە دکەڤتە ب رەخ دەرگەهێ سەرەکیێ زانکۆیا مووسلێ ئەڤە ب خۆ ئارمانجەکێ بەرچاڤ و جهێ دەنگڤەدانێ بوو د دەمێ ئەنجامدانا کریارێدا ب تایبەت کو سەرباز و دەرەجەدارێن (الانضباط العسكري) ل ڤێ زالگەهێ گەلەك ب خرابی سەرەدەری دگەل رێڤینگان دکر و نە دهێلا پێدڤیاتیێن خۆ یان کەرەستێن خوارنێ دگەل خۆ ژ مووسلێ بیننە بادینان.

سەرباز و دەرەجەدارێن ڤێ زالگەهێ بەردەوام زێدەگافی ل سەر وان رێڤینگان دکر یێن ژ بادینان دهاتنە مووسلێ و ب دژواری سەرەدەری دگەل شوفێران دکر و ترانە و یاری پێدکرن، یا هێژ گرنگتر جڤین ددانە کوردان و هێمایێن نەتەوەیێن کوردان، ئەڤ زێدەگافی و زماندرێژیە دگەهشتنە سەرکردێن پێشمەرگەی ل گوندێ خورکێ یێ نێزیکی دهۆکێ، و ب مەرما دانانا سنوورەکی بۆ ڤێ زێدەگافیی و سەرەدەریا دژوار بریار هاتەدان هێرشەکێ بکەنە سەر ڤێ زالگەهێ و ئەوا د شیاندا بیت بەرامبەر سەرباز و دەرەجەدارێن وێ بکەن، بۆ ئەنجامدا ڤێ کریارێ دەستەکەکا پێکهاتی ژ ١١ پێشمەرگان ب سەرۆکاتیا غازیێ حەجی مەلۆی و هرمزێ مەلك چکوی هاتنەهەلبژارتن، ڤێ دەستەکێ ل رۆژا ئێکێ چریا ئێکی ژ خورکێ بەرەڤ گوندی بەنداوایا ل نێزیکی ئەلقوشکی دا رێ، ل وێرێ پەیوەندی ب بەرپرسێ رێکخستنێن پارتی ل ئەلقوشی (عەبد جبرائیل رەزوقی) و هەڤالێ پارتی حەبیب صادق شەدا کر و ب هاریکاریا وان پلانەك بۆ لێدانا زالگەهێ هاتەدانان، هەردو ناڤبریان ترۆمبێلەکا لاندروڤەر بەرهەڤکر و د رێکا ئاخێ را پێشمەرگە ڤەگوهاستنە جهێ پێدڤی پشتی کو وایەرێن تەلەفونێن ناڤبەرا مووسل و تلکێفێ برین، ئەو بوو دەمژمێر ١٢ شەڤا ٦ چریا ئێکێ ١٩٦٢ێ بەرەڤ زالگەهێ چوون، ل وێرێ یەك ژ سەربازێن ترومبیلا وان راوەستاند و داخوازا ناسنامەیان ژێکر، دەملدەست هرمزێ مەلك چکوی بەری تڤەنگا خۆ داێ و کوشت، پێشمەرگە ژ ترومبێلێ پەیا بوون شیان ٦ سەربازان بکوژن و دووان ژی بریندار بکەن و چوونە د خیڤەتا وانڤە دەست ب سەر هەر تشتەکێ تێدا هەی ژ چەك و تەقەمەنی گرت و بلەز بەرەڤ وی جهی زڤرنەڤە یێ ژی هاتین و بێی کو زیانەك ب وان بکەڤیت گەهشتنە ئەلقوشێ و ژ وێرێ گەهشتنە بارەگایێ خۆ ل گوندێ خورکێ.

ڤێ کریارا مێرخاسانە ترس و لەرز و ئالۆزی ئێخستە دناڤ رێزێن دەستەلاتدارێن ناڤخۆیی ل مووسلێ و ئەڤە ب کێمکرنا سەنگا خۆ و سەنگا زالگەها مووسلێ دا زانین، د کارڤەدانێن بەرامبەری ڤێ کریارا پێشمەرگەی رێکخستنا حزبا بەعس ل مووسلێ بەیانەك بەلاڤکر و تێدا ئەڤ (کریارا چەکداری) گونەهبار کر و حکۆمەت ب خیانەتێ و کەمتەرخەمیێ د بەرهەنگاریا بزاڤا گۆمان لێکری ل باکووری تاوانبار کر[٢٥٣].

## پێنج- کریارا لێدانا کۆمپانیا نەفتێ ل عەین زالە

پشت ی ئەو سەرکەتنا پێشمەرگەی ل شەرێ گەلیێ زاخۆ دەستڤەئینای، سەرکردێ مەیدانیێ دەڤەرا زاخۆ عیسا سواری ژ بارزانی خواست هێزەکا تایبەت بۆ گرتنا کۆمپانیا نەفتێ ل عەین زالە بێتەپێکئینان، پشتی کو ڕەزامەندی وەرگرتی ب ئەو پەری نهێنی بەرهەڤی هاتنەکرن، پشتی کو ب بەرفرەهی ڤەکولین ل دوور هەموو ئالیێن ڤێ کریارێ هاتینەکرن بریار هاتەدان دەست پێ بێتەکرن، سەرکردێ گشتیێ دەڤەرا بادینان عیسا سوار بۆ سەرکردایەتییا ڤێ کریارێ دەسنیشانکر.

سەرکردایەتییا دەڤەرێ مژوولی ڤەکولین و خرڤەکرنا پێزانینان بوو ل دوور جهێ عەین زالە کو (١٥ - ٢٠کم) ژ نێزیکترین دەڤەرا چیایی یێ دوورە و پێدڤی ب ٨ - ١٠ دەمژمێرێن پییانە داکو بگەنە نێزیکترین بنگەهێ پێشمەرگەی، دگەل ڤێ چەندێ رووبارێ دیجلە ئاستەنگە د رێکا هاتن و چوونا پێشمەرگەیدا و دڤێت ئەڤ کریارە د دەمەکێ گونجای و دیاریکریدا بێتەئەنجامدان و دەمدلدەست دەست ب خۆ ڤەکێشانێ و دوورکەتنێ ژ وان دەڤەران بکەن داکو خۆ ژ روو برووبوونەڤێ دگەل هێزێن حکۆمەتێ دووربگرن و دهەمان دەمدا ژی خۆ ژ بۆمبابارانا فرۆکان ب پارێزن کو چ گومان تێدا نەبوو فرۆکە دێ هێنە هنداڤ دەڤەرێ و دێ بۆمبابارانا هەر جهەکی کەن یێ پێشمەرگە لێ هەی.

ب هووراتی و گرنگی ڤەکولین ل دوور ڤان هەموو بۆچوونان دهاتەکرن داکو چ ئاستەنگ و گرێك نەمینن بنە ئەگەرێ ئالۆزیان یان سەرنەکەتنا کریارێ، ب تایبەت زەحمەتیا چاوانیا دەربازبوونێ ژ رووبارێ دجلەی د چوون و هاتنێدا کو دڤیا بوو ئەڤ دەربازبوونە شەڤاندن (خوضأ)بیت نەك ب مەلەڤانیان.

خوشبەختانە د مەها ئەیلوولا ١٩٦٢یێدا دو پۆلیسێن کورد کو ل کۆمپانیا عەین زالە کار دکرن گەهشتنە رێزێن شۆرشێ، ئەو دووە ژی عەریفێ



عەلی هالۆ

پولیسان حەمە سور بەرزنجی و مستەفا فەرەج شوانی بوون، عیسا سوار وەك دبێژن: ل ئەسمانی ل ژێدەرەکێ وەك وان دگەریا لێ ل سەر ئەردی کەتنە بەردەستێ وی، عیسا سواری ل بارەگایی خۆ ل گوندێ بێزۆهی ب گەرمی پێشوازییا وان کر و هەموو جورە پرسیار ل دوور نهێنی کولان و کون و قولاچکێن کۆمپانیایێ ژ وان کرن، وان ژی بەرهەڤیا خۆ دیارکر بۆ پشکدارییێ د وێ کریارا پێشمەگایەتیێ یا کو ل بەر بوو بێتەکرن، ئەو بوو هەردو پولیس هنارتنە جەم سەرکردێ گشتیێ دەڤەرا بادینان ئەسعەد خوشەڤی ل گوندی (گەرمکی) دەڤەرا بەرواری ژووری، پشتی وی ژی پرسیار ل دوور سروشت و توبۆگرافیا .دەڤەرێ ژ وان کرین، پاشتر بۆ هەمان مەرەمێ راوێژ دگەل عیسا سوار و پێشمەرگەیێن دیتر کرین، ڕەزامەندی هاتەدان بۆ ئەنجامدانا کریارێ[٢٥٤].

ل بەر رۆناهیا پێزانین و زانیارێن سەركردایەتیا دەڤەرا بادینان كۆمكرین، مفا وەرگرتن ژ هۆنەرێ لێدانا ژ نشكەكێڤە (عنصر المباغتة) بەری هەر تشتەكی یێ بەرچاڤبوو، ژبەركو یا دیار بوو كو هێزا دوژمنی ژ ئالیێ هژمارێ و چەكیڤە ژی چەند جاركی تەمەت هێزا پێشمەرگەیە، ژ بەر ڤێ چەندێ و بەری ئەنجامدانا ڤێ كریارێ ب چەند رۆژەكان گۆتگۆتكەك بەلاڤكرن گوایە پێشمەرگەی دڤێت هێرشێ ببەتە سەر چەند جە و بنكەهێن حكۆمەتێ ل بازێرێ دهۆكێ، هەروەسان شەڤا ئەینی ١٠ چریا ئێكێ ١٩٦٢ بۆ ئەنجامدانا ڤێ كریارێ هاتەدەسنیشانكرن بەركو د شەڤێن ئەینیاندا زۆربەی سەرباز و دەرەجەدارێن هێزا پاراستنا كۆمپانیا دچنە سەرەدانا كەسێن خۆ یان دچنە مووسلێ بۆ دابینكرنا پێدڤیاتیێن خۆ.

بریار هاتەدان ئێڤارا رۆژا چوار شەمبی ٩ چریا ئێكێ بەرەڤ عەین زالە بدەنە رێ، دگەل تاری شەڤكێ هێزا پێكهاتی ژ (٣٠٠) پێشمەرگەیان ب سەركردایەتیا عیسا سواری د دەشتا سلێڤانەییان را بەرەڤ رووبارێ دجلەی دچوون بێی كو خۆ ل گوندان دیار بكەن، شەڤا ١٠/٩ ئەو هێزە مانە ل گوندێ كلیكا پشتی كو ئەو گوندە ژ گوندێن دەوروبەران ڤەدەر كری، پاشتر دگەل دەركەتنا تاریا شەڤا ١١/١٠ چریا ئێكێ ئەو هێزە بەرەڤ عەین زالە چوون، بەری كو ژ رووباری دەرباز ببن ئەو هێزە ل سەر سێ دەستەكان هاتەدابەشكرن و ئەركێ هەریەك ژ وان هاتەدیاركن، ئەو ژی:

١- دەستەكا عیسا سواری (سەركردە) ئەركێ وێ لێدانا دەرگەهێ سەرەكیێ كۆمپانیێ و كۆنترۆلكرنا وی بوو.
٢- دەستەكا هاشم مێروزی، ئەركێ وێ لێدانا پشكا ژێری یا كۆمپانیێ بوو.
٣- دەستەكا عەلی هالۆی: ئەركێ وی زڤرین ل دوور جهێ كۆمپانیێ و لێدانا بنكەهێن زێرەڤانیێ ب تایبەت ئەوێن ل سەر رێكا دچیتە مووسلێ بوو.

هەر ل وی جهی عیسا سواری د پەیڤەكێدا ژ پێشمەرگەی خواست ب هشیاری و مێرخاسانە ئەركێ خۆ بجهـ بینن، ژبەركو سەركەتنا ڤێ كریارێ دێ هەموو پرۆپاگندەیێن حكۆمەتێ ب نەوەیی دەرێخیت دەمێ دگۆتن كو سوپایێ وان بەرخوەدانا كوردان ب داویئینایە، زێدەباری ڤێ چەندێ سەركەتنا ڤێ كریارا پێشمەرگایەتیێ دێ دەنگڤەدانەكا باش د بەرژەوەندیا شۆرشێدا هەبیت.

دەمێ پێشمەرگە ژ رووبارێ دجلەی دەربازبووین هەردو پولیس حەمە سور و مستەفا فەرەج ل هیڤیا وان بوون داكو رێكێ و ئارمانجێ وان كو نێزیكی (١,٥-٢كم) ب پێیان یێ دووریوو نیشا وان بدەن، پشتی كو تێلێن سیمدارێن دوورێن جهێ كریارێ برین هێرشێ دەمژمێر ١٢ شەڤێ دەسپێكر، د هەمان شەڤدا ب مەرەما ئالوزاندن و سەر لێ شێواندنا حكۆمەتێ پێشمەرگەی ل دهۆكێ چوار بنكەهێن حكۆمەتێ گوللەبارانكرن.

پشتی شەرەكێ گران دگەل مەفرەزا ئەمنێ پێشمەگەی دەست ب سەر وی جهیدا گرت و هەموو هێزا پارێزڤانیا وی جهی و رێڤبەرێ بریتانیێ كۆمپانیایێ دیرك دانكورت و ئەندازیارێ عیراقی و هژمارەكا دیترا شارەزایێن بیانی ب ئەسیری گرتن، پاشتر مژوولی دەستبسەرداگرتن و كۆمكرنا دەسكەفتان ژ چەكی و تەقەمەنی و هەر تشتەكێ مفا ژێ بێتەوەرگرتن بوون و بەری ڤەكشیانێ ژی هەموو ئەو ترۆمبێل سۆتن داكو دەستەلات بۆ راهێلانا وان مفای ژێ وەرنەگریت.

دەمژمێر سێی سپێدی د رێكا سەنتەرێ ناحیا زمار را ب درێژیا وێ جادا عەین زالە و زمار دگەهینتە هەڤ پێشمەرگە بەرەڤ جهێن خۆ ڤەكشیان، پشتی كو تاكە شەهیدێ خۆ شاهین شێخۆ[٢٥٥] كو نە دكارین دگەل خۆ ببەن د ناڤ خیزیرا ڤەشارتی ل جهەكێ دكەڤیتە بەرامبەری گوندێ كاڤل درێژ دەربازی ئالیێ رۆژهەلاتیێ رووبارێ دجلەی بوون، هند بوو هەتا ژ رووباری دەربازبووین فرۆكە ل ئەسمانێ دەڤەرێ دەركەتن، پێشمەگەی ژی بلەز خۆ د ناڤ نهال و كەلشتەیێن عەردیدا ڤەشارت، هەروەسان چەند یەكەیێن لەشكەرێ عیراقی گەهشتنە عەین

زالە و ب نشانا وان تشتان یێن پێشمەرگەی هاڤێتینە سەر رێكێ دووڤ شوون پێیێن وان كەتن.

پێشمەرگەیێن خۆڤەشارتی رۆژا ١١ چریا ئێكێ ل وان جهان بۆراند و زێرەڤانیا یەكەیێن لەشكەرێ عیراقی دكرن، دەمێ بریار دای بەرەف بارەگایێن خۆ ڤەكشییێن ئەسیرێن خۆ ژ فەرمانبەر و زێرەڤانان ئازادكرن و رێڤەبەرێ كۆمپانیێ و هژمارەكا ئەندازیار و شارەزایان دمەفرەزا ئاسایشێ ب مەرەما ڤەكۆلینێ دگەل خۆ برن. هەروەسان داكو پەیوەندیێ ب رێكخراوێن جیهانیڤە بكەن و وان ب ئەسیركرنا وی كەسی ئاگادار بكەن و بۆ مەرەمێن دەنگڤەدانا دەنگ و باس و سیاسەتا شۆرشا كوردستانێ ل سازیێن راگەهاندنا جیهانی مفای ژێ وەرگرن، د هەمان دەمدا دەستەلاتێ حكۆمەتێ بێنەناچاركرن بەرامبەری ئازادكرنا زیندانیێن سیاسییێن كورد بێنەئازادكرن.

هێزا پێشمەرگەی نێزیكی دەمژمێر ئێكێ شەڤا ١٢ چریا ئێكێ گەهشتنە گوندێ باستكێ ل سەر رێكا گشتیا ناڤبەرا سێمێلێ و زاخۆ، بەردەوامی ب چوونا خۆ دا هەتا گەهشتینە گوندێ باڤیا و پاشتر گەهشتینە بارەگایێ خۆیێ سەخت ل گەلیێ دولا، ل رۆژا ١٣ چریا ئێكێ رێڤەبەرێ كۆمپانیایێ و ئەندازیارێ عیراقی هاتنەهنارتن بۆ بارەگایێ ئەسعەد خوشەڤی و وی ژی فەرماندا ببەنە بارەگایێ بارزانی كو وی دەمی ل سیدەكان بوو، د ئەنجامدا ل دووڤ داخوازا وان رادەستی ئیرانێ كرن.

ئەنجامێن ڤێ كریارا شۆرشگێرانە كوشتنا هاریكارێ (معاون)ێ بنكەهێ پولیسان و ١٢ پولیسان و بریندار بوونا نێزیكی ١٢ كاركەرێن كۆمپانیێ و سۆتنا عومبارا نەفتێ و گهوركا تەلەفونان و سۆتنا ٨ ترۆمبێلان بوو، دەسكەفتێن پێشمەرگەی ژی د ڤی شەریدا ٣٢ تڤەنگ و رەشاشەك و ٦ دەبانجە و دو رەشاشێن برێن و دو كامیرە و گەلەك كەرەستەیێن نوشداری و ئەسیركرنا ٧٢ كرێكار و فەرمانبەرێن كۆمپانیێ بوو، ئەوێن پشتی داویهاتنا كریارێ هاتینەئازادكرن.

كارڤەدانا حكۆمەتێ بەرامبەر ڤێ كریارێ ئەو بوو كو دگەل رۆژهەلاتی فرۆكان دەست ب ئاگربارانا دەڤەرێ كر و چەند بەتالیۆنەك (سریة)ێن هێزا پەیادە ١١بەرەف گوندێن كوردان چەم زراڤ، كێلكێ، ئاڤتەحلێ، كاڤلدرێژ، باستكا بنی و هندەك گوندێن دی هاتن و هەرچەندە وان ب باشی دزانی كو پێشمەرگە نەماینە ل وی جهی لێ دەست ب پشكنینا وان گوندان كرن و دەستەلاتدارێن ناڤخۆیێن دەڤەرێ ژی گەلەك ژ خەلكێ وان گوندان ب گونەها هاریكاری و هەڤسووزیێ دگەل شۆرشا كوردستانێ گرتن و ژ كارێن وان دەرێخستن[٢٥٦].

هەروەسان لەشكەرێ حكۆمەتێ و ٤٠٠ جاشان ل ٢٤ چریا ئێكێ ١٩٦٢ێ هێرشكرنە سەر دەڤەرا زێبارا رۆژئاڤایێ زاخۆ و گوندێن سلكا، خراب دارێ، باكرما، جەم كوركی بەراڤا ژووری و درناخێ، پێشمەرگەی ب باش نەزانی كو شەری دگەل ڤێ هێزا لەشكەری یا پشتگەرم ب چەند دەبابەكان بكەن و باشتر زانی بەرەف رۆژئاڤای ڤەكشیێن، لەشكەر و جاشێن حكۆمەتێ گوندێن چەمزراڤێ بەردای و بەغلوجەیا ژێری و صوریا پشكنین بەلێ چ تشتەكێ وان دڤیا بەرچاڤێن وان نەكەت، هەروەسان ل رۆژا ٢٩ چریا ئێكێ لەشكەرێ حكۆمەتێ بەرەف گوندێن كەمونە و چەمبەرەكات ل ئالیێ چەپێ یێ رووبارێ دجلەی هەاتن و دەست بسەر وان كەلەك و بەلەماندا گرت یێن بۆ بەرژەوەندیا خەلكێ دەڤەرێ و پێشمەرگەی مفا ژێ دهاتە وەرگرتن، و ل رۆژا ٤ چریا دووێ هێزەكا لەشكەرێ حكۆمەتێ ب پشتەڤانیا دەبابە و فرۆكان هێرش برە زنجیرا چیایێ بێخێری و دەڤەرا زێبارات و گوندێ بەراڤا ژووری، ل ڤێرێ هێزەكا پێشمەرگەی ب سەركردایەتیا هاشم بارزانی و حەجی قادر شەهبازی بەرسنگێ وان گرت، هەرچەندە فرۆكە و دەبابە و تۆپان هەلویست د بەرژەوەندیا هێزا حكومتێدا گۆهارت بەلێ سەرەرای ڤێ چەندێ ژی ئەڤ هێزە بەرەف ئەو جهێ ژێ هاتین ل ژێریێ گەلیێ زاخۆ ڤەكشیان. ل رۆژا ٢٥ كانوونا ئێكێ هێزێن حكۆمەتێ هیرشەكا سەحوسوكرنێ (غارە استطلاعیة) بەرەف ئبراهیم خەلیل گوندێ

(باجوکە)بر و دەڤەرێن ژێر کونترۆلا پێشمەرگەی ل باکرمێ تۆپبارانکرن و ئەڤ کریارە دژی پێشمەرگەی ل بێتاسێ و ترکژا ژی دوبارە بووڤە[257].

سەرکەتنا کریارا عەین زالە دەنگڤەدانەکا باش کاریگەر ل سەر ئاستێ ناڤخۆیی و جیهانی هەبوو، ب سەدان ژ پێشمەرگەی و خەلکێ زاخۆ هاتنە گەلیێ دولا بۆ دیتن و پێشوازیا وان پێشمەرگەیان ئەوێن پشکداریا ڤێ کریارێ کرین و بهیستنا قارەمانیا وان د ڤێ کریار یدا و دیتنا ئەسیران و دەسکەفتان و نووچەیێ ڤێ کریاری بوو رۆژەڤا جڤین و رووناشتنان، د هەمان دەمدا ورەیا پێشمەرگەی بلندکر و حزبێن سیاسیێن عیراقێ ئازراندن، حزبا بەعسا عیراقێ سەرکەتنا ڤێ کریارێ زڤراندەڤە بۆ کەمتەرخەمیا حکۆمەتی و د بەیانەکێدا کو ل ٢٤ چریا ئێکێ بەلاڤکری حکۆمەت ب خیانەتێ گونەهبارکر و داخوازا لادانا وێ و سزادانا کەسێن خەمسار کر[258].

سەرکردێ لەشکەرێ بەرنیاسێ عیراقی سەعد حەمو (یێ تلەعفری) ل دوور ڤێ کریارێ دبێژیت: ل شەڤا ١١/١٠ چریا ئێکێ ١٩٦٢ نێزیکی ٢٥٠ پشتەرێبوویان (عصاە) هێرش ئینا سەر سازیێن نەفتێ ل عەین زالە باکوورێ رۆژئاڤایێ مووسلێ کو بیرێن نەفتێ ژی لێ هەنە، پولیسان بەرسنگێ وان گرت لێ ئەو شیان دەست ب سەر کۆمپانیا ناڤبریدا بگرن و مارکتێن وێ تالانکرن و بەرەف رۆژهەلاتێ دجلەی ڤەکشیان، هێزەکا لەشکەریا پێکهاتی ژ پەیادەیان و مەفرەزەکا نۆژداری دووڤ وان کەتن بەلێ کەسەك ژێ نەدیت، هەروەسان سەعید حەمۆ دبێژیت: ڤێ کریارێ شیانێن مرۆڤی یێن بهێز پێدڤێن، ئەو شیان د شەڤەکێدا دو جاران (هاتن و چوون) ژ رووبارێ دجلەی دەرباز ببن و ڤێ کریارێ دو رۆژ و شەڤەکان ڤەکێشایە[259].

هەروەسان (العمید الرکن) عەبدولکەریم فەرحان (پاشتر ببوو سەرکردی تیپا (فرقا) ئێکی) د نڤیسیت: شۆرشگێرێن کوردان هێرشکا وێرەکانە و سەرکەتی برە سەر عەین زالە ل باکوورێ رۆژئاڤایێ مووسلێ کو بیرێن نەفتێ لێ هەنە[260].

هەروەسان سازیێن راگەهاندنا جیهانی ژی ب شروڤەکرن و ئافتن ل سەر گرنگی ب ڤێ کریا پێشمەرگەی دا، هندەکان پشکەك ژ بەرنامێن خۆ تەرخانکرن بۆ پەیڤینێ ل دوور مێژووا کوردان و خەباتا وان سەخەرات دەسکەتنا مافێن وانێن نەتەوەیی، هەروەسان هندەك گۆتگۆتك پەیدا بوون کو هندەك ژ کۆمپانیێن نەفتێ یێ ل رێکەکێ دگەرێن دا کو پەیوەندیێ دگەل شۆرشا کوردستانێ بکەن سەخمەرات پاراستنا بەرژەوەنیێن وان و ئیمتیازێن وان یێن نەفتێ ل عیراقێ. هەروەسان رۆژنامێن جیهانی نووچەیێ رادەستکرنا رێڤەبەرێ کۆمپانیێ بۆ ئیرانێ و پەیوەنیدا وی ژ ئیرانی را دگەل خێزانا وی بەلاڤکر، د هەمان دەمدا ڤێ کریارێ باندۆرەکا نەرێنی کرە سەر سەنگا حکۆمەتا عیراقێ و هاندەر بوو کو رۆژنامەڤانێن بیانی داکو ئاگادار بن ل سەر سەروبەرێ شۆرشا کوردستانێ و نەخوشیێن کورد تێدا دژین سەرەدانا کوردستانێ بکەن[261].

یا گرنگ د ڤێ مژارێدا ئەوە ژ ئەنجامێ وان سەرکەتنان یێن پێشمەرگەی دەستڤەئینان سەروبەر ل بادینان سەقامگیر بوو و ئەڤ چەندە هەتا ب داویهاتنا دەستەلاتداریا عەبدولکەریم قاسمی ل ٨ شباتا ١٩٦٣ێ یا بەردەوام بوو، گوند و دەڤەرێن گوندان مانە ل ژێردەستەلاتێ شۆرشێ و لەشکەرێ عیراقێ ژی دەستەلاتداری ل سەنتەرێن کارگێری دکر، هەتا کو ئەو رێکێن حکۆمەتێ بۆ هاتن و چوون پێدڤیاتیێن خوە مفا ژی وەردگرت بەردەوام ل ژێر کاریگەری و بویسەیێن پێشمەگەیدا بوون، ژ بەر ڤان دو ئەگەران پێشمەرگەی ژی خۆ ژ چوونە ناڤ بازێران و کۆنترۆلکرنا وان دووردگرت: پاراستنا خەلکێ مەدەنی ژ هێرشێن ئەسمانی و تۆپبارنکرنێ، هەروەسان داکو حکۆمەت بەرپرس بیت ژ دابینکرنا قویت و پێدڤیاتیێن ژیانێ بۆ خەلکێ بازێران هندی کو ئەڤ بازێرە ب رەنگەکێ راستەوخۆ و نە راستەخۆ مینا بازارێ شۆرشێ بوون بۆ دابینکرنا ئەو کەرەستە و پێدڤیاتیێن دەڤەر و گوندێن ژێر دەستەلاتێ شۆرشێ پێدڤی دبوونێ[262].

وەك بەلگە ل سەر سەقامگیریا سەروبەری ل دەڤەرا بادینان ب تایبەت پشتی کریارا عەبن زالە ئەوە کو کو ژ بلی شەرەکی کو ل دەڤەرا چیایێ مەقلوبی ل نێزیکی دێرا مار مەتی روودای ڤێ دەڤەرێ هەتا ٨ شباتا ١٩٦٣ێ چ شەرێن دی ب خۆڤە نەدیتن، هندی پەیوەندی ب شەرێ ئاماژەپێکریڤە هەی هێزەکا پێشمەرگەی ب بەرپرسیا سەعید نەباخی ل دێرا مار مەتی ئالیێ چەپێ چیایێ مەقلوبی هەبوو، قەشێن دێرێ ئەڤ هێزە د حەواند و خزمەتا وان دکر، ژبەرکو ئەڤ هێزە نێزیکترین هێزا پێشمەرگەی بوو بۆ باژێرێ مووسلێ بریار هاتەدان ب هەڤکاریا ناڤبەرا لەشکەرگەهێ سۆپایێ عیراقێ ل مەندان و جاشێن کورد ئەڤ هێزا پێشمەرگەی بێتە ژناڤبرن و دوورکرن ژ وی جهی.

پێشمەرگە یوسف سەعدو ئەمین (یوسف ترك) کو یەك ژ پێشمەرگەیێن ناڤ وێ دێرێ بوو دبێژیت: ل مەها کانوونا دووێ ١٩٦٣ کوردەکێ ئێزدی ژ بەعشیقە هاتە دێری و سەعید نەباخی ئاگادار کر کو سۆبەهی سپێدێ لەشکەرێ عیراقێ و جاش ژ سێ بەرۆکانڤە دێ هێرشێ ئینن سەر سەر دێرێ، هێرشا ئێکێ دێ ژ باشویك و بارزانێ بەرەف سەرێ چیای هێت و یا دیتر ژ رۆژئاڤای بەرەف دێرێ هێت و یا دیتر دێ ژ رۆژهەلاتی لەشکەرگەهێ مەندانڤە هێت. ب کریاری وێ سپێدەیێ هێرشێ ب تۆپبارانا لەشکەرگەهێ مەندان بۆ سەر دەڤەرا خازری دەسپێکر، پاشتر ژی فرۆکان دەست ب ئاگربارانا دەڤەرێ کر و پاشتر ژی هێرشا زەمینی دەسپێکر، هێرشبەر ژ ئالیێ بەرامبەری مووسلێ یێ چیایی بەرەف سەرێ چیای هاتن، پێشمەرگەی کو بویسە بۆ وان ل وێرێ ڤەدا بەرسنگێ وان گرت، ب ناچاری بەرەف پاش زڤرینەڤە و گەلەك کوشتی ل پاش خۆ هێلان، چوار کلاشینکوف و رەشاشەکا دکتریوف دگەل هندەك تەقەمی د ڤی شەریدا دەست پێشمەرگەی کەتن. دبیت ئەڤە دوا شەر بیت ل سەردەمێ عەبدولکەریم قاسمی یێ ل کودەتا ٨ شباتا ١٩٦٣ێ ب داویهاتی ل دەڤەرا بادینان روودای[263].

عیراقێ و کوردستانێ د ڤێ قوناغێدا گەلەك روودان و گۆهرینێن سیاسی یێن ناڤخۆیی ب خۆڤە دیتن کو هەر هەموویان راستەخۆ و نە راستەوخۆ کاریگەریا خۆ ل سەر رەوشا بزاڤا نەتەوەییا کوردی و پێڤاژوویا شۆرشا کوردی ل کوردستانێ و دناڤ وی دا ل بادینان هەبوو، ل رۆژا ٨ شباتا ١٩٦٣ێ ژ ئەنجامێ کودەتایەکا لەشکەریا خوینەلو ب سەرکردایەتییا حزبا بەعس رژێما عەبدولکەرم قاسمی ب داویهات و عەبدولسەلام محەمەد عارف وەك یەکەمین سەرۆککۆمارێ عیراقێ هاتەدانان، بەلێ گەلەك پێڤە نەچوو ل ١٨ چریا دووێ ١٩٦٣ عەبدولسەلام ل سەر بەعسیان ژی قولپی، دەمێ ل رۆژا ١٣ نیسانا ١٩٦٦ێ عەبدولسەلام مری برایێ وی عەبدولرەحمان عارف ل شوینا وی دانان، ل سەردەمێ ئەڤێ داویێ کوردستانێ دەمەکێ ب تەنایی و ئارامییەکا رێژەیی ب خۆڤە دیت، بەلێ ل ١٧ تیرمەها ١٩٦٧ێ ژ ئەنجامێ کودەتایەکا لەشکەری حزبا بەعس دەستەلات گرتەڤە دەست. ڤان گورانکارییێن سیاسییێن ناڤخۆیی جار ب ئەرێنی و جار ژی ب نەرێنی باندۆرا خۆ دکرە سەر پێڤاژویا شۆرشا کوردان، ئەو شۆرشا حکۆمەتێن یەك ل دووف یەك ناچار دبوو کو دانوستاندنا دگەل سەرکردایەتییا وێ بکەت، د دەمێ دانوستاندن و پێکهاتنێن شەر راگرتنێدا رەنگە تەناهییەکا ب نیگەرانی و گوماناوی ب خۆڤە د دیت و د ئەنجامدا شەری دەسپێدکرەڤە، یا گرنگ ل ڤێرێ ئەوە حزبا بەعس ژ ترسێن هندێدا نەکو دەستەلات ژ دەستان دەرکەڤیتەڤە هەروەك ل ١٨ چریا دووێ ١٩٦٣ێ روودای ناچار بوو ل ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ دەستەلاتێ ئوتونومی بۆ کوردستانێ ب پەژرینیت، ب ڤێ چەندێ ژی پارتی شیا نیڤەکێ ژ دروشمێ خۆیێ مەلبەندی ((دیموکراسی بۆ عیراقێ و ئوتونومی بۆ کوردستانێ)) بجهبینیت. د ڤێ پشکێدا دێ ڤەکۆلینێ دەربارەی دیرۆکا سیاسی ل دەڤەرا بادینان و گونجانا وێ دگەل پێڤاژوویا گشتیا وان روودان و بۆیەرێن سیاسی کەین ئەوێن عیراقێ و کوردستانێ ب خۆڤە دیتین.

# وەرارێن سیاسی یێن ناڤخۆیی ل عیراقێ و کوردستانێ و کاریگەرییێن وان ل سەر بادینان ٨ شباتا ١٩٦٣ - ١١ئادارا ١٩٧٠

## ئێك: کودەتا ٨ شباتا ١٩٦٣ێ

حزبا بەعسا عەرەبی شیا ل رۆژا ٨ شباتا ١٩٦٣ د ڤێ کودەتایێدا دەستەلاتی بگریتە دەست، د هەمان رۆژا ٩ شباتێدا کو کودەتاچیان عەبدولکەرم قاسم تێدا کوشتن پلا لەشکەریا عەبدولسەلام عارفي بۆ پلا (مشیر)یێ بلندکر وەك یەکەم سەرۆککۆمارێ عیراقێ و سەرکردێ گشتیێ هێزێن چەکدار دامەزراندن، هەروەسان کەسایەتیێ بەعسی ئەحمەد حەسەن بەکر وەك سەرۆکوەزیران و بەرپرسێ ئێکێ یێ حزبا بەعس ل عیراقێ عەلی صالح ئەلسەعدی وەك جێگرێ سەرۆکوەزیران و وەزیرێ ناڤخۆیی راگەهاندن و بەعسییان جهێن سەرەکی د جڤاتا وەزیراندا گرتنەدەست و ڤێ جڤاتێ دو وەزیرێن کورد فوئاد عارف و بابا عەلیێ شێخ مەحموودی ب خۆڤە گرتن، د هەیڤێن بەراهیێ یێن کودەتایێدا بەعسی مژوولی نەهێلانا هەڤرك و نەیارێن خۆ بوون ب تایبەت شیوعییان کو دژایەتییا خۆ بۆ کودەتایێ راگەهاندبوو.

حزبا بەعس هەر ژ دامەزراندنێ ل ٧ نیسانا ١٩٤٧ ل شامێ وەك خودانا هزرەکا نەتەوەییا عەرەبییا رەگەزپەرست دهاتەنیاسین، دامەزرێنەرێ وێ میشێل عەفلەق ل ژێر باندۆرا هزرڤانێن نازییان بوو و باوەری ب وێ چەندێ هەبوو کو عەرەب دسەر هەمو ملەتێن دی رانە[٢٦٤]. هزر و بیرێن وێ د دەستوورێ بەعسییاندا د دیاربوون ئەو دەستوورێ کوردستانا عیراقێ و سوریێ و خەلکێ وێ ب پشکەك ژ وەلات و نەتەوەیێ عەرەبان دادنیاسین، ل سەرڤی بنیاتی بوو بەیاننامە و بەلاڤۆکێن حزبا بەعس ل عیراقێ ب یەکجاری بوونا ملەتێ و مافێن وی یێن نەتەوەیی پشتگوهڤە هاڤێتبوون هەروەك کورد ل عیراقێ نەبی، هەر ئەڤ حزبە ژی د دەمێ خۆدا دژی ب ئەندامبوونا پارتی د بەرەیێ یەکێتیا نیشتمانیا عیراقی (جبهة الإتحاد الوطني)دا راوەستیا بوو، ئەو بەرەیێ ل شباتا ١٩٥٧ێ هاتیەدامەزراندن[٢٦٥].

یەکەمین بەیاننامێ حزبا بەعس(ا عیراقی) دەربارەی دۆزا کوردان بەلاڤکری ئەو بوو ئەوا ژ ئەنجامێ دەسپێکرنا شۆرشا کوردستانێ ل ئەیلوولا ١٩٦١ێ بەلاڤکری کو تێدا هاتبوو: هندەك هزرێن رەگەزپەرستیێن گومانلێکری ل باکوورێ عیراقێ پەیدا بوون ب درەو ب ناڤێ کوردان و بەرژەوەندیێن وان داخوازا پارچەکرنا خاکێ عیراقێ دکەن، دەستەلاتێ (قاسم)ی ب مەرەما لێدانا چەمکێ نەتەوییێ عەرەبی ناڤتێدانا ڤان هزران دکەت، هەروەسان بەیاننامێ هوشداری دابوو کەسێن کورد(ێن دلسۆژ) کو دووڤ کەسان نەکەڤن یێن داخوازا پارچەکرنێ و جودابوونێ دکەن و دووڤ سەرکردێن گومان لێکری نەکەڤن[٢٦٦].

هندیکە عەبدولسەلام عارف بوو، یێ بەرنیاس بوو ب وێ چەندێ کو دژی هەر کوردەکی یە و ب هەلویستێن دژایەتییا گەلێ کورد و بزاڤا وی یا نەتەوەیی یێ ناڤدار بوو، ژ دەسپێکا شۆرشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ دژی زڤرینەڤا بارزانی بوو بۆ عیراقێ، دەمێ شێخ ئەحمەدێ بارزانی ب مەرەما پێشکەشکرنا سوپاسیێ ژ بەر ئازادکرنا وی ژ زیندانێ

پشتی شۆرشێ سەرەدانا وی کری عەبدولسەلامێ گۆتێ: ئەڤە (٢٠٠) سالە کورد ل عیراقێ، هوونێ ل بەتەنەکێ و ئەمێن ل بەتەنەکێ[٢٦٧]، و بێی هیچ هەلکەفتەك دەست ب گەفان ل کوردان کر ئەگەر دەست ب هەر بزاڤەکێ بۆ داخوازا مافێن خوێێن نەتەوەیی بکەن، د هەمان دەمدا یێ رشد بوو کو چ جاران پەیڤا کورد یان کوردستان ژ دەڤێ نەدەرکەڤیت و ل شوونێ دگۆت برایێن مە ل باکوورێ عیراقێ إخواننا في شمال العراق)[٢٦٨].

ب ڤێ چەندێ پێشبینی نەدهاتەکرن کو حزبا بەعس و حکۆمەتا نوو و عەبدولسەلام عارف هەلویستەکێ ئەرێنی بەرامبەری مافێن نەتەوەیێن کوردان بگرنە بەری، هەرچەندە سەرکردایەتیا شۆرشێ ل رووداناکودەتایێ ئاگاداربوون و هەتا ئاستەکی ژی تێدا پشکداربوون ئەو ژی بەرامبەر دەستڤەئینانا مافێ ئوتونومی بۆ کوردستانێ، کودەتایێ روودا و شۆرشا کوردستانێ ژی پشتەڤانی لێکر هەرچەند چ رۆلەك تێدا نەبوو، لێ حزبا بەعس ژ ڤانا خۆ بۆ بجهئینانا مافێ ئوتونومی خۆ دا پاش[٢٦٩]. هەروەسان حزبا بەعس پشتی د کودەتا ٨ شباتێدا دەستەلات گرتییە دەست هەلویستێ وێ یێ نەرێنی بەرامبەری شۆرشا کوردستانێ دژوار تر لێهات.

رازیبوونا سەرکردایەتیا شۆرشا کوردستانێ ب هاریکاریا حزبا بەعس ب مەرەما ژ ناڤبرنا دەستەلاتێ عەبدولکەریمی ئەنجامێ پێدڤیاتیا پێشمەرگەی ب بێنڤەدانەکێ بوو و ئەنجامێ وان کاودانێن دژوار بوون یێن د قوناغا شەریدا ب سەر وان هاتین، هەروەسان چاڤەرێی وان داخوازان بوون یێن کو دشیاندابیت د سەردەمێ نوودا دەستڤەبهێن، هەر ب ڤی رەنگی ژی ل هیڤیێ بوون ئەو دووریێچا ئابووریا دژوار ئەوا ژ ئەیلوولا ١٩٦١ ێڤە ل سەر کوردستانێ هاتیەسەپاندن بێتەراکرن.

پشتی ٨ شباتا ١٩٦٣ێ شەر ل کوردستانێ راوەستیا، دەلیڤەکا باش هاتەپێش بۆ دەسپێکرنا دانوستاندنێن چارەسەرکرنا دۆزا کوردی، حکۆمەتێ ژی ب رەنگەکێ فەرمی ئارەزوویا خۆ بۆ دانوستاندنان دگەل سەرکردایەتیا شۆرشا کوردستانێ دیارکر، د هەمان دەمدا سەرکردایەتیا شۆرشێ ژی رەزامەندیا خۆ ل سەر ڤێ چەندێ دیارکربوو، ل دووڤ داخوازا حکۆمەتێ ل رۆژا ١٨ شباتێ شاندێ دانوستاندنکارێ کوردستانێ ب سەرۆکاتیا جەلال تالەبانی و ئەندامەتیا هەریەك ژ سالح یوسفي و لوقمان مەلا مستەفا بارزانی و عەگید سدیق گەهشتە بەغدا، دگەل یەکەمین روونشتنا شاندێ شۆرشێ دگەل حکۆمەتێ دەمێ جەلال تالەبانی چەمکێ ئوتونومی وەك چارەسەری ب دۆزا کوردی بەرچاڤکری، ئەڤ داخوازە هاتەرەفزکرن و سەرۆك شاندێ حکۆمەتێ عەلی سالح ئەلسەعدی گۆت کو ئەو نە دگەل ئوتونومی یە، بەلکی دگەل بجهئینانا هندەك مافێن رەوشەنبیریە بۆ کوردان و ئەگەر کورد ب ڤێ چەندێ ژی رازی نەبن دێ حکۆمەت هێزێ بەرامبەری وان بکارئینیت، د ڤێ روونشتنێدا ئەلسەعدی پارتی ب وێ چەندێ گونەهبار کر کو هاریکاریا شیووعییان دکەت و ئەو حەواندینە[٢٧٠].

پشتی چەند گەرەکێن دانوستاندنان حکۆمەتێ ل شوونا ئوتونومی سیستەمێ نە مەرکەزیا کارگێری بەرچاڤکر، نە مەرکەزیا کارگێری شێوازەکە ژ شێوازێن کارگێری و چ پەیوەندی ب مافێن نەتەوەییڤە نینە، هەروەسان شاندێ کوردی ڤەجنقی دەمێ دیتی کو حکۆمەت یا رشدە ل سەر دوورکرنا کەرکۆکێ و خانەقینێ و دەڤەرێن دیترێن کوردی ژ (کارگێریا نە مەرکەزیا کوردی)[٢٧١].

## دوو: کۆنگرێ مللی ل کۆیێ:

پشتی چەندین بەیاننامە و داخویانیێن مەزنە بەرپرسێن حکۆمەتێ، سەرکردایەتیا شۆرشێ ڤیا هزر و بۆچوونێن تەڤایی پێکهات و جوینێن خەلکێ کوردستانێ دەربارەی دوا دانوستاندنان بزانیت، ئەو بوو پتر ژ ٥٠٠ کەسایەتیان بێی بەرچاڤوەرگرتنا ئایین یان نەتەوە یان ژیاتیا وان یا سیاسی گازی کرن ل رۆژا ١٨ ئادارا ١٩٦٣ێ ل کۆیێ ئامادەبن، (٢٦) کەسایەتی ژ بادینان ئامادەبوون، ژ وانا میر تەحسین بەگ میرێ

ئێزدییان، سلێمانێ حەجی بەدری، محەمەد تاهرێ حەجی سادقێ بڕۆی، عەبدولواحدێ حەجی مەلۆی، رەشیدێ سەعید ئاغایێ دۆسکی، ئەحمەدێ حەجی شەعبانی یێ ئامێدی، تێلی گەردی دۆسکی، عەلی حەمدی بێدوهی، فاروقێ سەعید بەگی، یوحەنا تەلۆ مەرگەهی، ئەحمەد جەرجیسێ ئەترووشی، سەلمانێ حەجی مەحموودێ بامەرنی، شێخ جەلالەدینێ بریفکانی، رەمەزان موحسن ئاکرەیی، قەشە پۆلس بێداری، سالح نەرمو، مەلا عەلیێ رێکانی، بەهرام ئاڤدەل نێروەیی و مارگرێت جورج دۆری[٢٧٢].

نێزیکی (٢٠٠٠) دو هزار کەس ژ وانا ژی (١٦٥) نوونەرێن لقێن پارتی گەهشتنە کۆیێ، بەلێ هەرهەموویان ب دروستی پشکداری د کۆنگرەیدا نەکر یێ کو چوار رۆژان (١٨- ٢١ ئادارێ) ڤەکێشای، دانوستاندن و گفتوگۆیێن ب بەرفرەهی دەربارەی وان خالێن سەرەکی بوو یێن سەرکردایەتیا شۆرشێ بۆ کۆنگرەی بەرچاڤکرین و ئەوان ژی پەیوەندی ب مافێن گەلێ کوردڤە د چوارچوڤێ ئوتونومی بۆ کوردستانێ دا هەبوون، داخوازێن کۆنگرەی ژ ئالیێ لیژنەکا پێکهاتی ژ (٣٥)کەسان هاتنەدارشتن، دکۆنگرەیدا پێکهاتن ل سەر شاندێ شۆرشێ بۆ دانوستاندنان ب سەرۆکاتیا جەلال تالەبانی ئەندامێ مەکتەبا سیاسیا پارتی و ئەندامەتیا هەریەك ژ سالح یوسفي، هاشم حەسەن ئاکرەیی، عەگید سدیق ئامێدی، عەبدولحسەین فەیلی، حەبیب محەمەد کەریم، بابەکر پشدەری، شێخ حسێنێ خانەقا، مەسعوود محەمەد، رەشید عارف، محەمەد سەعید خەفاف، شاخەوان نامق، مستەفا عەزیز و شەوکەت ئاکرەیی هاتەکرن و رۆژا ٣٠ ئادارێ وەك ژڤانێ سەرەدەنا شاندی بۆ بەغدا هاتەدەسنیشانکرن[٢٧٣].

ئامادەبووی و پشکدارێن کۆنگرەی دگەل خەلکێ کۆیێ پشکداری د ئاهەنگا جەژنا نەورۆزێدا کر ئەوا ل بەرمابەری یانەیا فەرمانبەران هاتیەگێران، د ڤێ ئاهەنگێدا شاعرێ ناڤدار هەژاری موکریانی هەلبەستا خۆ یا ناڤدار (کاوەی مەزن) خواند[٢٧٤].

ب هەلکەت رۆژنامەڤانێ فرەنسی (فرانسوا گزاڤین لوڤان) د وان رۆژاندا ل کۆیێ بوو و راپۆرتەکا بەرفرەهـ و وێنەدار ل سەر کۆنگرەی بەرهەڤکر و د رۆژناما (لوموند)ا پڕ تیراژدا بەلاڤکر[٢٧٥].

کۆنگرە دەسکەفتەکێ مەزنێ شۆرشێ بوو، یەکەمین جار بوو ل ژێر دەستەلاتێ وێ کۆنگرەکێ ب ڤی رەنگی دهێتەگێران کو نوونەرێن پرانییا خەلکێ کوردستانا – عیراقێ پشکداریێ تێدا بکەن، بارزانی کو ل رۆژا ١٤ ئادارێ گەهشتبوو کۆیێ گرنگی ب چارەسەرکرنا وان پسگرێکان یێن د ناڤبەرا سەرۆکعەشیرەتان و وان و کادرێن پارتی دا هەی، هەروەسان بارزانی ل هەڤدونێزیکبوون و دگەل هەڤگونجانا ناڤبەرا ئامادەبوویی و پشکدارێن کۆنگرەی ب دەلیڤە بۆ سەرکەتنا بریارەکێ کو تێدا هاتیە: ئەرکێ عەشیرەتێن کوردانە ئەوێن هاریکاریا حکۆمەتێ دکەن هاریکاریا سەرکردایەتیا شۆرشێ بکەن، ئەگەر ئەڤە ژی پێ چێنەبوو دەست ژ هاریکاریا حکۆمەتێ بەردەن[٢٧٦].

شاندێ کوردیێ هەلبژارتی ل رۆژا ٣٠ ئادارێ گەهشتە بەغدا، پشتی چەند رۆژەکان ژ گەهشتنا شاندی ل ٤ نیسانێ قانوونا جڤاتا نیشتمانی بۆ سەرکردایەتیا شۆرشێ (المجلس الوطني لقيادة الثورة) هاتەراگەهاندن، ئەڤە مینا دەستوورەکی بوو هەرچەندە ب قانوون هاتبوو ناڤکرن و هاتەراگەهاندن کو ژ ٨ شباتا ١٩٦٣یڤە ئەڤ دەستووره ب کار پێکری دهێتەنیاسین، یا گرنگ ل ڤێرە د ڤی دەستووریدا چ ئاماژەپێکرنەك ب کوردان و مافێن وان یێن نەتەوەیی ل عیراقێ نەهاتبووکرن[٢٧٧].

هندیکە حکۆمەتە هەر د بنیاتدا ب پرۆژێ ئوتونومی رازی نەبوو و ب داخوازەکێ ناڤکر کو د شیاندا نینە بێتەبجهئینان، و پەیڤدارێ فەرمیێ وەزارەتا ئیرشادی (راگەهاندنێ) پەسنا پرۆژەی ب پرۆژەیەکێ جوداخوازانە و بزاڤەك بۆ دامەزراندنا ئیسرائیلێ دووێ ل باکوورێ عیراقێ ناڤکر[٢٧٨].

د راستیدا حکۆمەتێ ب نهێنی کار بۆ ژناڤبرا لەشکەریا دۆزا کوردی دکر[٢٧٩] ب تایبەت ژی پشتی

کو ل ٨ ئادارا ١٩٦٣ حزبا بەعس ل سووریێ دەستەلات گرتییەدەست، چ گومان ل سەر ڤێ نیەتا حکومەتێ نەما دەمێ حکومەتێ بەرێ یەکەیێن پترێن لەشکەری دایە کوردستانێ و ل ٢٠ گولانێ دووریێچا ئابووری ل سەر کوردستانێ سەپاندی، پشتی سەرنەکەتنا دانوستاندنان ل نیڤا مەها حوزەیرانێ حکومەتێ پرۆژێ سیستەمێ نەمەرکەزیێ کارگێری ل عیراقێ راگەهاند و چ تشتەکێ پەیوەندی ب ئوتونومی ڤە هەی تێدا نەبوو، دەمێ حکومەتێ رێ دایە شاندێ کوردی بزڤریتەڤە کوردستانێ بۆ گفتوگۆکرنێ ل سەر پرۆژەی ل رۆژا ٩ حوزەیرانێ ئەو شاندە کو د زڤرینەڤێ بۆ کوردستانێ دا بوون ل بەغدا دەستەسەرکرن کو ژ سالح یوسفي، عەگید سەدیق، شاخەوان نامق، عەبدولحسەین فەیلی، مستەفا عەزیز، مەسعوود محەمەد، شێخ حسێنێ خانەقا، سەمەد محەمەد و بابەکر پشدەر بوون، هەموو ئەڤ شاندە ب دژواری هاتنەئەشکەنجەدان و ئێشاندن و د ئەنجامدا دفنا سالح یوسفي و دەستەك و پەراسییەکا وی شکاندن و د هەمان دەمدا خێزانا وی ل زاخۆ گرتن و برنە زیندانا مووسلێ[٢٨٠].

ب هوشدارییەکا حکومەتێ بۆ شۆرشگێران کو د دەمێ ٢٤ دەمژمێراندا چەکێ خۆ دانن، ل ١٠ حوزەیرانێ شەری ل کوردستانێ دەسپێکرەڤە[٢٨١]. راگرێ روکن (عمید رکن) سەعید فەتحی ئەلصەقلی وەك فەرماندارێ گشتیێ لەشکەرێ دەڤەرا باکووری هاتەدانان، هەژیە بێتەگۆتن ئەڤە یەکەمین جار بوو ئەڤ پلەیە دهێتەدانان کو بارەگایێ وی کەرکووك بیتن[٢٨٢].

## سێ: بنکەیێن چەکدارێن (الانصار) حزبا شیوعیا عیراقی ل بادینان

دەمێ ل ١١ ئەیلوولا ١٩٦١ێ شۆرشا کوردستانێ دەسپێکری شیوعیان پشکداری تێدا نەکر، بەلێ دژی شەری ل کوردستانێ راوەستیان و داخوازا چارەسەرەکا ئاشتیانەیا دۆزا کوردی کرن، خۆنیشادان کرن و تێدا پشتەڤانی ل مافێن نەتەوەیێن گەلێ کورد دکرن، د ئەنجامێ وان هەلویستاندا حکومەتێ گەلەك ژ



**هەژار موکریانی ١٩٢١- ١٩٩١/٢/٢١**

شیوعیان گرتن و هاڤێتنە د زینداناندا[٢٨٣].

د ئەنجامێ کودەتایا ٨ شباتێدا و بەرگریا شیوعییان ژ دەستەلاتێ عەبدولکەریم قاسمی، کودەتاچیان بەیاننامە هژمار (١٣) راگەهاند و تێدا فەرمانا قرکرنا شیوعییان دابوو، د ئەنجامدا سەدان شیوعی ژ باژێرێن جوداێن عیراقێ ب ناچاری گەهشتنە ریزێن شۆرشا کوردستانێ، بەلێ ب مهانا هندێ کو حزبا وان هەتا هەرفتنا عەبدولکەریم قاسمی بەرگری ژ رژێما وی کربوو گەلەك ژ وان ل دەڤەرا سلێمانیێ هاتنەکوشتن و گرتن و ژ چەککرن.

دەمێ ئەڤ نووچەیە گەهشتینە سەرکردایەتییا شۆرشێ بارزانی گەلەك ژ ڤێ چەندێ نەرازی بوو و فەرماندا ئەو گرتی دەملدەست بێنەئازادکرن و وەك پێشمەرگەیێن دی بێنە چەکدارکرن، د برووسکەکێدا کو ل رۆژا ١١ شباتێ بۆ بارەگا و بنکەهێن پێشمەرگەی و مەکتەبا سیاسی هاتیەهنارتن هاتییە: دڤێت رێز ل شیوعییان بێتە گرتن و رێکێ بدەنێ بارەگا و



کۆمبوونەکا پێشمەرگەی

بنگەهێن خۆ ڤەکەن، ئەو د ئازادن بێنە کوردستانێ، دڤێت ب هەمان چاڤێ ل پێشمەرگەیان دنێرن ل وان ژی بنێرن هەروەك پێشمەرگەی پێدڤیاتیێن وان د هەموو واراندا بێنەدابینکرن[٢٨٤].

د وان دانوستاندناندا یێن د ناڤبەرا ١ نیسان- ١٠ حوزەیرانا ١٩٦٣ێ هاتینەکرن، بەعسییان داکوکی ل سەر وێ چەندێ دکر کو دڤێت شیوعییان رادەست بکەن، لێ بارزانی ب توندی دژی ڤێ داخوازێ بوو، پاشتر داخواز کرن وان ژ کوردستانێ دەرێخن لێ ب هەمان شێوە دژی ڤێ داخوازێ ژی بوو[٢٨٥]. گەلەك ژ شیوعیێن کورد و عەرەب و ترکمان و مەسیحی پەنا ئینا بەر چیایێن نێزیکی ئەلکویشێ و دهۆك و زاخۆ، ل شێخان سەرکردێ شۆرشێ ل دەڤەرا شێخان حسومیرخان بەرەف پێش هات و ل چیایێ مەقلوبی سەقامگیر بوو و بارەگایێ خۆ دانا دێرا مار مەتی، ئەڤە ژی هاریکار بوو گەلەك ژ شیوعیێن رێکخستنێن مووسلێ و دەوروبەرێن وێ پەنا بینە وی جهی، ژ وانا مووسلح جەلالی سکرتێرێ لیژنا ناڤخۆیا مووسلێ و عادل عەلی صبحە و حەسەن ئاکرەیی و ئەمین زەنگەنە و هژمارەکا شیوعیێن نەلەعفەر و گوندێن گوبە، رەشیدیێ و شریخان نێزیکی مووسلێ[٢٨٦].

هەرهوسان گەلەك ژ شیوعیێن ئامێدیێ زاخۆ و ئالیگرێن وان گەهشتنە رێزێن شۆرشێ ژ وانا: سەردار (عەقید) جەلال بالەتە و جیدار (ملازم) رەشید سندی و سەردار تەها مستەفا بامەرنی، ئەڤێ داوییێ گەهشتە بارەگایێ سەرکردایەتییا شۆرشێ و بوو ئێك ژ کەسایەتیێن نێزیکی بارزانی، هەروەسان محسن سالح عەبدولعەزیز ئامێدی، غازی محەمەد نەجیب، ئەحمەدێ حەجی فەتاحی، عەلامە ئەفەندی، محەمەد سەدیق، ئیبراهیم عەبدولرەحمان، ئەحمەد عەبدوللا، توما داود، محەمەدێ حەجی خالدی، عەلی شێخ غیاسەدینێ نەقشەبەندی و محەمەد سالح میرزا سواری[٢٨٧].

هندیکە زاخۆیە پێشمەرگەی ل گوندێ (هڤشن) پێشوازی ل هژمارەکا شیوعییان کر، پاشتر عیسا

سواری پەیوەندی ب وانڤە كر و خانییەك ل گوندێ لیڤۆ كو پرانییا گوندی ژی شیوعی بوون تەرخانكر، بەرچاڤترینێن وان شیوعییان ئەحمەد مەحموود جەزراوی، یونس جەمیل، سالم نەجم، حوسنیێ حەجی رەشیدی، عەبدویێ نەجار، حسین پیتانی، رەمزی جەوهەر، سالحێ حەجی رەشیدی و مەجید جەزراوی بوون، پاشتر سەركردێ دەڤەرا بادینان ئەسعەد خۆشەڤی پێشنیازەك دا وان كو پەیوەندیێ ب بنكەهێ ئالیگرێن شیوعی (انصار الشیوعیین) بكەن ئەوێ ل دەڤەرا شێخان هاتیەدامەزراندن[٢٨٨].

دەڤەرا ئەلقوش بوو پەناگەیەكا سەرەكیا وان شیوعییان یێن ژ بەغدا و باژێرێن دیترێن عیراقێ رەڤین، پاشتر پرانییا وان ل گوند و چیایێن نێزیكی دهۆكێ د چەند بنكەهەكاندا خرڤەبوون وەك: گوندێ نسری، گەلیێ قەیسەریێ، گوندێ كانی زێوكێ، گوندێ سلان، دێرا رەبان هرمزی ل هنداڤ ئەلقوشێ، بەلێ ژ ئەنجامێ ناكوكیێن ناڤبەرا توما توماسی و مووسلح جەلالی یێ ب (ئەحمەد سورانی) دهاتەنیاسین ئەڤ شیوعیە بوونە دو كۆم، كۆمەك ب سەرۆكاتیا توما توماسی بارەگایێ وان ل دێرا رەبان هرمزی بوو، كۆما دیتر ب سەرۆكاتیا مووسلح جەلالی بارەگایێ وان ل گوندێ پیرموس- قەیسەریێ بوو، هژمارا هەردو كۆمان نێزیكی ١٩٣ كەس بوو، ژ شیوعیێن بادینان ئەوێن ناڤێن وان هاتینەنیاسین: رەشاد محەمەد بالەتە، ئیبراهیم یاسین ئیسلام بامەرنی،عەبدولغەنی عەلی یەحیا، ئەمین زەیبان، ئەحمەد سەدیق ئامێدی، ئەمین سالح بامەرنی، ئەمین عەبدوللا مزووری، ئیستقلال بەدرخان، توران عەبدولكەریم، حسین جومعە ئاكرەیی، حسێن شیخكی، خودێدا ئەسمەر، سەلیم ئەحمەد بەندی، سلێمان حسنكی، سەیفەدین نەشئەت، سەلاح قازی، سەدیق ئاكرەیی، عیزەت سەعید ئامێدی، عەبدولمەجید حەمید قازی، عوبەید كەریم سەلیم حەلاق، عادل ئاكرەیی، ناجی بالەتە، یەلدا گورگیس، محەمەد سالح خاتون نزاركی و عیدو سەلیم رەشید. ل نیڤا مەها تەمووزێ هەریەك سەردار (عەقید) جەلال بالەتە و نڤیسكار و رۆژنامەڤان حافز قازی گەهشتنە بارەگایێ قەیسەریێ، جەلال بالەتەی راسپاردەكا رەسمی ژ بارەگایێ بارزانی دگەل خۆ ئینابوو كو بەرپرسیا عەسكەرییا وی بارەگای بگریتەدەست[٢٨٩]. د دەمەكیدا كو حسێن ئەلنەجەفی بەرپرسێ سیاسیێ بارەگای بوو[٢٩٠].

گرنگتر چالاكیا شیوعییان ل بادینان دەری دەسپێكرنەڤا شەری ل ١٠ حوزەیرانا ١٩٦٣ێ بزاڤا وان بوو ل ٢٣ شباتا ١٩٦٣بۆ دەست بسەرداگرتنا لەشكەر گەهێ غەزلانی بوو ل مووسلێ، پاشتر بەرەف پێشڤە چوون بۆ بەغدا و كەركوكێ و ئێخستنا حكومەتا بەعسییان هێز خۆ ل سەر پییان رانەگرتی، بریار هاتە دان تیپا (لیوا) ١٤ل لەشكەرگەهێ فەیدیێ ل دهۆكێ سەركردایەتییا ڤێ كریارێ بەرەف مووسلێ بچیت، شیوعیێن بادینان هاتنەراسپاردن ل میحوەرێن ئەلقوش و شێخان پشتەڤانییا ڤێ كریارێ بكەن، لێ هەر زوو ڤێ كریارێ شكەستن خوار و ئەفسەرێ بەرپرس ژێ ل دهۆكێ هاتەگرتن، هەروەسان بەرپرسێ رێكخستنا لەشكەری بنیامین یوسف و ئیسماعیل میكائیل محەمەد[٢٩١]. و چەند سەربازەك و چەند كەسەكێن سڤیل ژ وانا: محەمەد عەبدولكەریم ئامێدی و محەمەد بەكۆ هاتنەگرتن و ل تیرمەها ١٩٦٣ هاتنەگوللەبارانكرن، هەروەسان عەبدوللا ناسر، حەمید ماهر و مامۆستایەكێ مەسیحی ژ وان گرتیان بوون و ب (١٠) سالێن زیندانێ هاتنە سزادان[٢٩٢].

## چوار: دەسپێكرنەڤا شەری

سەركردایەتییا شۆرشێ باوەری ب حكومەتا بەعسییان نەبوو و دزانی كو ئەو یێ پلانێ دگێرن هەردەمێ دەستەلاتێ وان سەقامگیر بوو دەست ب شەری بكەنەڤە، بەردەوام پەیوەندی دگەل وان سەرۆكعەشیرەتێن كوردان دكرن یێن دژی شۆرشێ و چەك و پارە دانێ، لەوما شۆرشێ ژی بەرهەڤیێن خۆ بۆ

بەرسنگرتنەکا دی دگەل حکۆمەتێ دکرن، بۆ نموونە ل دهۆکێ پێشمەرگەی د ڤێ قوناغا دانوستاندناندا هندەك دەسکەفت دەستڤەئینان، کۆنترۆل ل سەر چەندین گوند و جهێن گرنگ مینا گەلیان و سەرێن رێکان و کۆمتێن چیایێن دکەڤنە هنداڤ رێکێن هاتنوچوونێ وەك گەلیێ دهۆکێ کرن، ب رەنگەکی گەف ل باژێری و بارەگایێ تیپا لەشکەرێ لیوا (١٤) دکرن هەروەك فەرماندێ لەشکەر (فرقا) ئێکێ عەبدولکەریم فەرحان ب خۆ ڤی چەندێ پشتراست دکەت[٢٩٣]. زێدەباری ڤێ چەندێ پێشمەرگەی هزر ل داگرتنا قەبارەکێ کەرەستێن خوارنێ کربوو و گەلەك ژ خەلکێ دەڤەرێ ژی گەهشتبوونە هێزێن پێشمەرگەی.

ژ بەرهەڤیێن شۆرشێ بۆ قوناغا نوویا بەرگریێ کرین، چەند گۆهرینەکێن سڤك بوون د دەڤەرێن لەشکەریێن پێشمەرگەیدا و بەرپرسێن لەشکەری ل دەڤەرا بادینان وەك ل ژێری:

١- کەرتێ ئاکرێ و شێخان ب سەرکردایەتیا حسو میرخان دۆلەمەری.

٢- کەرتێ دهۆك، ب سەرکردایەتیا عەلی خەلیل خوشەڤی.

٣- کەرتێ ئامێدیێ ب سەرکردایەتیا سەر لەشکەرێ بادینان ئەسعەد خوشەڤی.

٤- کەرتێ زاخۆ، ب سەرکردایەتیا عیسا سوار وەسان هاتەدانان کو بارەگایێ کارگێریا گشتی ل بێتواتە بیت و عەلی شەعبان بەرپرسێ وێ بیت[٢٩٤].

هندی پەیوەندی ب حکۆمەتێڤە هەی ل رۆژا ١٤ شباتا ١٩٦٣ێ راگر (عەمید) عەبدولکەریم فەرحان وەك سەرکردێ لەشکەرێ (فرقا) ئێکێ کو بارەگایێ وێ ل مووسلێ دامەزراند و دەستەلاتێ حوکمداریێ لەشکەری (الحاکم العسکري) دانێ، ئەو ب شەرێ شۆرشا کوردی ل بادینان راسپارد، هەروەسان ل رۆژا ٢٢ نیسانێ سەرکردێ بەعسی مەدحەت ئیبراهیم جومعە ل شوونا عەبوللەتیف ئەلدەراجی وەك موتەسەرف (پارێزگار)ێ مووسلێ دامەزراند[٢٩٥].

عەبدولکەریم فەرحانی دەربارەی سەروبەرێ لەشکەریێ پێشمەرگەی و یەکەیێن لەشکەرێ (فرقا)یا سوپایێ عیراقێ ل بادینان نڤیسیە: هەلویستێ یەکەیێن لەشکەرێ عیراقێ نە جهێ باوەریێ بوو، مۆرالا وان یا نزم و نەرازیبوون یا بەرچاڤ بوو، ب تایبەت ژی پشتی وان کریارێن پێشمەرگایەتیێ ل زالگەها (المجموعة الثقافية) یا مووسلێ و کۆمپانیا نەفتێ ل عەین زالە و دەست بسەرداگرتنا زنجیرا چیایێ ئاکرێ و نەشیانا سوپایێ عیراقێ بۆ دەرێخستنا وان ژ وی چیای[٢٩٦].

عەبدولکەریم فەرحان پێڤەدچیت و دبێژیت: بەرۆکا لەشکەرێ (فرقا)ئێکێ گەلەکا بەرفرەهـ و گرنگ بوو، ژ سنوورێ سوریێ هەتا رووبارێ زێیێ مەزن و ژ باشووری ژ مووسلێ هەتا سنوورێ ترکیا ڤەدگرت، جهێن گرنگ و ستراتیژی مینا عەین زالە، گەیارە، زاخۆ، دهۆك، شێخان، ئاکرێ و شنگال ب خۆڤە دگرتن زێدەباری گەلیێن گرنگ و ستراتیژی مینا گەلیێ زاخۆ و دهۆك و سیارەتیکا و ئەڤ میحوەرە درێژترین میحوەر بوو و پتر ژ هەموویان ژی دکەتە بەر گەفێن[٢٩٧] شۆرشا کوردی.

لەشکەرێ ئێکێ ژ سێ تیپان (لیوایان) پێکدهات، بۆ ب هێزکرنێ تیپەکا پۆلیسێن گەرۆك و پێنجی دەبابە و ب سەدان جاشێن کورد دابوونە دگەلدا، عەبدولکەریم فەرحانی سەر ژنوو ئەڤ جاشە رێکخستبوونەڤە و ناسنامەیێن کەسایەتی دابوونێ[٢٩٨]. پاشتر فەرمانەك ب گۆهارتنا ناڤێ وان ژ (الشرطة الغير نظامية) بۆ (فرسان صلاح الدين) دەرێخست، گوایە ب ناڤێ سەرکردێ کورد سەلاحەدینێ ئەیوبی ناڤکرن، ئەڤ فەرمانە ژی ب مەرەما بلندکرنا مۆرالا وان بوو و بەرسڤەك بوو بۆ کوردان کە ب جاش ناڤدکرن، پاشتر کرێگرتیێن عەرەب ب (فرسان الولید) ل دووڤ ناڤێ سەرکردێ

عەرەبی (خالد بن ولید) ناڤکرن، پاشتر سێ دینار وەك دەرمالەیێن خوارنێ ل سەر مووچەیێ وان زێدەکرن و کرنە پازدە دینار، پاشتر چەند (لقەك) سریەك ژ کەتیبا دەبابا دانە دگەل کەرتێن زاخۆ و دهۆك و ئامێدیێ دا ب مەرەما تۆپبارانکرنێ مفای ژێ وەرگرن[٢٩٩].

هەروەسان عەبدولکەریم فەرحانی ب مەرەما زانینا ئاریشە و پێدڤیاتیێن وان و بلندکرنا مۆرالا سەرباز و ئەفسەران د دەمێ دەسپێکرنەڤا شەری سەردانا یەکەیێن لەشکەرێ ئێکێ ل دەڤەرێن جودابێن بادینان (زاخـۆ، ئامێدیێ، سەرسنکێ، سوارەتووکا، مانگێشکێ، دهۆك، ئاکرێ، شێخان و مرێبا) کر و ناڤێن هندەك ژ بارەگایێن لەشکەری گۆهارتن بۆ نموونە ناڤێ بارەگایێ (قاعدة غزال) ل باکوورێ گەلیێ زاخۆ کرە (قاعدة عنتر)[٣٠٠].

ب مرەما دابینکرنا کۆنترۆلەکا باش ل سەر دەڤەرێن دەشتێ یێن دکەڤنە د ناڤبەرا ناحیا بەردەرەش (العشائر السبعة) بازێرێ ئاکرێ، قائیمەقامێ قەزا ئاکرێ حەسەن مەجید ئەلخەزرەجی نڤیسارەك بۆ موتەسەرفێ مووسلێ هنارتیە تێدا هاتیە: عەدەتێ سالانەیێ عەشیرەتێن گەرۆکە (هەرکی و سوورچی) هەر سال د ڤی وەرزیدا بچنە زۆزانان ل دەڤەرێن سنووریێن عیراقێ و ئیرانێ، ئەڤ عەشیرەتێن بهێز خودانی نێزیکی (٢٠٠٠) چەکدارانە و ژ عەشیرەتێن ئالیگر و دلسۆژێن کۆمارێ عیراقێنە ، ئەڤ عەشیرەتە تەواوی وان گوندێن ڤالا ڤەدگرن یێن دکەڤنە دناڤبەرا پرا مەندان و سەنتەرێ قەزایێ و بوونا وان ل دەڤەرێ هێزەکا مەزنە بۆ دەولەتێ و ب هیچ رەنگەکی د شیاندا نینە ڤالاهیا ڤێ هێزێ پر کەینەڤە، ئەگەر وەك سالێن چوویی ئەڤ عەشیرەتە دەڤەرێ بەردەن و بچنە زۆزانان سەروبەر دێ گەلەك بەرەڤ خرابیێ چیت و دێ دەڤەر مینتە ڤالا و بیتە زەمینا چاك و هاریکار بۆ چالاکیێن پارتییان، ئەڤە ژی دێ باندۆرەکا خراب کەتە سەر هێزا سوپایێ عیراقێ ل دەڤەرێ و دێ خۆ بەرامبەری کاودانەکێ دژوار و بەلاڤبوونا هێز و شیانێن خۆ بینیت و ب ناچاری دێ مژوولی زێرەڤانی و پاراستنا جادا گشتی بیت یا کو دێ هەردەم ل ژێر گەفێن هێرشێن پارتییان بیت، ژ بەر ڤێ چەندێ و ب مەرەما دابینکرنا تەناهی و پاراستنا جادا گشتی یا ناڤبەرا مەندان و بازێرێ ئاکرێ و ب مەرەما خورتکرنا هێزا دەولەتێ یا نها ل دەڤەرێ هەی و داکو دەلیڤە ل بەر پارتییان نەمینیت هاتنوچوونێ ل وان گوندێن ڤالا بکەین یێن هەرکی لێ دژیان یان دەست بسەر وان گوندانـدا بگرن، هیڤیە رازیببن کو نەهێلن ئەڤ عەشیرەتە بەرەڤ زۆزانێن خۆ بچن کو رێکا چوونا وان د گردمامك و سەرکەڤرۆکێ ل ناحیا سۆرچی و بەردەرەش (العشائر السبعة)را دبۆریت و ژ پرا کەلەکا یاسین ئاغای ل قەزا مووسلێ دەرباز دبن[٣٠١].

موتەسەرفێ مووسلێ داخوازا قائیمەقامێ ئاکرێ بجهئینا و ب دروستی نەهێلا عەشیرەتا هەرکی کو هەموو زەلامێن وێ ژ وان بوون یێن ب (فرسان صلاح الدین) هاتینەناڤکرن بەرەڤ زۆزانێن خۆ بچیت، و ب مەرەما ئاکنجیکرنا هەردەما ڤێ عەشیرەتێ د ناڤبەرا مەندان و ئاکرێ دا موتەسەرفێ مووسلێ ٢٥ گوندێن ئەحمەد ئاغایێ رۆڤی سەرۆکعەشیرەتێ گێژ دانە وان[٣٠٢]. زێدەباری ئەگەرێن ئاماژە پێکری د نڤیسارا قائیمەقامیدا، دبیت ئەگەرێ دیتر ژی ئەو بیت کو موشیر ئاغایێ رۆڤی برایێ ئەحمەد ئاغایێ رۆڤی ژبەر ناکوکیا ناڤبەرا عەشیرەتا گێژ و هەرکی فەرمانا گرتنا وی ژ ئالیێ حکۆمەتێ ڤە دەرکەتبوو وی ژی دگەل هندەك زەلامێن عەشیرەتا خۆ ژ دەسپێکا شۆرشا کوردستانێ ڤە پەنا بربوو بەر شۆرشێ.

ب ئامانجێ بهێزکرنا هەلویستێ سەرکردێ لەشکەرێ ئێکێ عەبدولکەریم فەرحانی، گەلەك ژ مەزنە بەرپرسێن لەشکەرێ عیراقێ سەرەدانا وی کرن دا ئەو ب خۆ پێدڤیاتیێن لەشکەرێ ئێکێ (فرقة الاولى) بزانن و هەلسەنگاندنا هەلویستێ لەشکەری ل دەڤەرا بادینان بکەن، ژ وانا: هەریەك

ژ راگرێ روکن (العمید الركن) سەعید قەطان، راگرێ روکن عەبدولجەبار شەنشەل، عەلی سالح سەعدی، جێگرێ سەرۆكۆماری عەبدولسەلام عارف و وەزیرێ بەرگریێ سالح مەهدی عەماش سەرەدانا بارەگایێ لەشكەرێ ئێكێ كرن، هەروەسان هاریكارێ سەرۆك ئەركانێن سوپایێ عیراقێ عەقید خالدمەكی ئەلهاشمی سەرەدانا بارەگایێ لیوا ١٤ ل دهۆكێ كر. یا ژ ڤێ هێژ گرنگتر سەرۆكۆمارێ سوریێ (امین الحافظ) داخوازا دیدارێ دگەل عەبدولكەریم فەرحانی ل دەڤەرا سنووری تەل كوچەك- رەبیعە كر، ئەڤ دیدارە هاتەكرن و تێدا ئاخفتن ل دوور هەلویستێ لەشكەری هاتەكرن و سەرۆكێ سوریێ بەرهەڤیا خۆ بۆ هاریكاریا عیراقێ د كریارا ژ ناڤبرنا شۆرشا كوردستانێ دا دیار كر ئەگەر شەری دەسپێكرەڤە، هەروەسان (امین الحافظ)ی بەرهەڤیا خۆ دیاركر بۆ دابینكرنا پێدڤیێن بلەزێن لەشكەرێ ئێكێ و كونترۆلكرنا خالا سنووریا پێشیابویرێ كو سنوورێ سوریێ و عیراقێ و تركیا دگەهینت هەڤ. پشتی ڤێ دیدارێ ب چەند رۆژەكان ب مەرما زانینا سەروبەرێ توبۆگرافیێ دەڤەرێ و دەڤەرێن سنووری هژمارەكا ئەفسەرێن سوری د ناڤ واندا سەركردێ مەیدانیێ دەڤەرا جزیرێ سەرەدانا رەبیعە كرن، پاشتر عەبدولكەریم فەرحانی ژی ب هەڤالینیا وان سەرەدانا قامیشلو و دەڤەرێن سنووریێن سوریێ و عیراقێ كر. دوا كریارا بهێزئێخستنا لەشكەرێ ئێكێ پێكئینانا تیپا (لیوا) پەیادەیا یا ١٨ بوو د دەمەكێ كورتدا و لڤاندنا وێ بوو دا چەپەرێن خۆ ل كەرتێ شێخان بگریت، ب ڤی رەنگی و ل دووڤ عەبدولكەریم فەرحانی هێزا لەشكەرێ ئێكێ ل زێدەهیێ داو سەروبەرێ وێ ل باشیێ دا و هەڤسەنگیا وێ گەهشتە ئاستێ بەرفرەهیا وێ دەڤەرا ئەو ژێ بەرپرس[٣٠٣]. ب تایبت ژی ل دەڤەرا بادینان.

## گرنگترین شەر و روودانێن شۆرشا ئەیلوولێ ل بادینان ١٠ حزیرانا ١٩٦٣- ١٠ شباتا ١٩٦٤ێ

ل رۆژا ٢٠ گولانا ١٩٦٣ فەرمانا حاكمێ لەشكەریێ گشتی ب سەپاندنا دوورپێچا ئابووری ل سەر كوردستانێ دەركەت و ل رۆژا ١٠حزیرانێ ب فەرمی شەر هاتەراگەهاندن و ئێزگێ بەغدا دەقێ بەیانەكێ بەلاڤكر تێدا شۆرشا كوردان ب خودانا هزرا جوداخوازیێ گونەهبار كر و پەسنا شۆرشێ ب (( كەڤنەپەرست و ئالیكرا ئیمپریالیزمێ و هاریكارا شیوعییان)) كر،هەروەسان ئاگەهداریەك دا پێشمەرگەی كو د دەمێ ٢٤ دەژمێراندا دەست ژ چەكی بەردەن و خۆ رادەستێ دەولەتێ بكەن[٣٠٤].

سەركردایەتییا گشتییا هێزێن چەكدارێن عیراقێ بەری هەر تشتەكی بریاردا هەموو وان گوند و دەڤەران ئەوێن كو دێ گریت ڤالا كەت ژ خەلكێ وێ و وی خەلكی ڤەگوهێزیتە كۆمەلگەهێن مەزن كو ب مەرەما خرڤەكرنا خەلكێ گوندێن بادینان هاتبوونە چێكرن[٣٠٥]. د هەمان دەمدا گەفێن مرنێ ل هەموو گوندیان كربوون ئەگەر هاریكاریا پێشمەرگەی بكەن و ئەگەر پێشمەرگە ڤەحەواندن دێ گوندێن وان هەرفینن، پاشتر ژی رادیویا بەغدا خەلاتەكێ دراڤی ب گۆژمێ ١٠٠ هزار دولاران بۆ هەركەسێ بارزانی بكوژیت راگەهاند[٣٠٦].

لەشكەرێن (فرقێن) ئێك و دو و پێنجێ سوپایێ عیراقێ زێدە باری هێزا ئەسمانی و تۆپخانە و ب هزاران جاشێن كورد پشكداری د شەریدا دژی كوردان كر، ئەڤ سێ لەشكەرێن ئامازەپێكری ل سێ بەرۆكان كەتبوونە شەرێ پێشمەرگەی، بەرۆكا ئێكێ د ناڤبەرا خانەقین و سلێمانیێ و یا دووێ ژ رەواندزێ بەرەف سنوورێ ئیرانێ و بەرۆكا سێێ ل دەڤەرا بادینان بوو بەرەف سنوورێ تركیا كو ژ گرنگترین بەرۆكان

بوو و ل بەربوو بلەز بگەهینە سنوورێ تركیا داكو هێزێن پێشمەرگەی ل دو دەڤەرێن ژهەڤ ڤەقەتیای ژێكدووربكەن، ئانكو بكەنە دو پشك دەڤەرا سوران و دەڤەرا بادینان، پاشتر بزاڤا ژ ناڤبرنا هەردویان یەك ل دووڤ یەك بێتەكرن[٣٠٧].

ئەڤ هێرشە ژ هێرشێن بەری خۆ د جودابوون، پتر ژ یێن بەری خۆ ب خوینرشتن و كوشتنا كوردان ناڤداربوون و د بەرنامێ واندا بوو د دەمێ دو سێ هەفتیان ب یەك جاری پێشمەرگەی ژ ناڤببەن و ب رەنگەكێ زێدە د ڤان شەراندا بۆمبایێن ناپالم و هەموو جورێن چەكی بكاردئینان، ب رەنگەكێ بەرچاڤ سیاسەتا قركرن و ژ ناڤبرنێ بەرامبەری كوردان گرتبوو بەر و سەركردێن لەشكەرێن عیراقێ دەستەلاتێ بێ توخیبێ كوشتن و قركرن و بۆمبابارنكرن و سوتن و دزین و تالانكرنا گوندان هەبوو، زێدەباری ڤێ چەندێ و ب مەرەما ژ ناڤبرنا پارتی ب بەرفرەهی دەست ب گرتنا تەباییا ئەندام و رێكخستیێن پارتی ل گوند و بازێران كربوو[٣٠٨].

ل رۆژا ١٠ حزیرانێ شەری ب هێرشێن ئەسمانیێن ل دووڤ یەك بۆ سەر گوندێ بارزان دەسپێكر، فەرمان بۆ بەرهەڤیێ بۆ هێرشەكا سەرانسەری دەركەتن، وەزیرێ بەرگریێ عیراقێ سالح مەهدی عەماشی راگەهاند ((كو ئەوا لەشكەرێ عیراقێ نها ئەنجامددەت تنێ سەیرانەكا نیشتمانییە))[٣٠٩].

هندیكە دەڤەرا بادینانە، پێشمەرگەی پشتی ٨ شباتا ١٩٦٣ێ و د دەمێ دانوستاندناندا سەرەرای سەرەرای نەرازیبوونا دەستەلاتدارێن حكۆمەتێ بارەگایێ خۆ ژ گوندێ شاورێكێ ئینابوو گوندێ پیرومەرا نێزیكی دهۆكێ و ب درێژیا چیایێ بێخێری ژ گەلیێ دهۆكێ هەتا قەشەفرێ ئێخستبوو ژێر دەستەلاتێ خۆ[٣١٠]. و دەمێ شەری دەسپێكرییەڤە ئەسیر و بارمتە ل گەلیێ دهۆكێ پێكدگۆهارتن، ئەڤ كریارە هاتەراوەستاندن و ل هەمان رۆژا ١٠ حزیرانێ یەكەیێن لەشكەرێ عیراقێ و جاشێن كورد ب سەركردایەتییا عەبدولكەریم فەرحانێ هێرشكرە سەر گرێ باسێ و شیان ل رۆژا ١٢ حزیرانێ گەلیێ دهۆكێ بگرن[٣١١] گوندێن گرێ قەسروكێ و قارقارئاڤا و سندوورێ و بادێ سوتن[٣١٢] هەروەسان گوندێ مەسیحیان قەشەفرێ (مار یەعقوب) سوت ب ئێكجاری خرابكر ب تایبەت دێرا گوندی كو ئێك ژ بارەگایێن پێشمەرگەی بوو و گەلەك ژ كورێن گوندی گەهشتنە رێزێن شۆرشا كوردستانێ[٣١٣].

ل رۆژا ١٢ حزیرانێ هێزێن لەشكەرێ سوریێ ب سەركردایەتییا عەقید (فهد الشاعر) ب مەرەما هاریكاریا هێزێن عیراقێ دژی شۆرشا كوردستانێ هاتنە دناڤ خاكێ عیراقێدا، ئەڤ هێزە د پێكهاتی بوون ژ ٤٠٠٠ سەربازان دگەل بارەگایێ لیوایێ و یەكەیێن پشتەڤان و خزمەتگوزاری و بەتالیونەكا دەبابێن سڤك و بریار هاتەدان بكەڤنە ژێر دەستەلاتێ لەشكەرێ ئێكێ[٣١٤]. ڤان هێزێن سوری بارەگایێ خۆ دانا دەڤەرا ئاسهێ سەنتەرێ ناحیا سلێڤانەیی یا وی سەردەمی و نێزیكی بارەگایێ تیپا ئێكێ یا سۆپایێ عیراقێ بوو، ئەڤ هێزێن سوری ب (قوات یان لیوا یرموك) هاتنەناڤكرن، بەلێ ئەڤ هێزێن سوری د یەكەمین پێشڤەچوونا خۆدا بۆ جێگیربوونێ ل دەڤەرێ كەتنە بەر ئاگرێ چەكێن پێشمەرگە یێن ل چیایێ سپی، ژبەر نە شارەزاییا یەكەیێن هێزێن سوری ل دەڤەرێ ب مەرەما ب ساناهیكرنا سەروبەری ل بەر وان و ئاشناكرنا وان ب فەرمان و راسپاردەیێن لەشكەری ل بارەگایێ هەریەك ژ وان یەكەیان ئەفسەرەكێ پەیوەندیێ یێ عیراقێ هاتەدانان[٣١٥].

یەكەمین كریا لەشكەریا هێزێن سوری ئەنجامدای هێرشەك بوو بۆ سەر گوندێ بالقوسێ دەمەكێ هندەك پێشمەرگە چووینە دناڤ گوندیدا، د ڤێ كریارێدا هێزێن سوری ئەفسەرەك و جێگرێ ئەفسەرەكی و حەفت سەرباز ژ دەستدان و ب ناچاری ڤەكشیانە بارەگایێ خۆ و هێزەكا پێكهاتی ژ دەبابە و سۆپا و جاشان د هەوارا وان چوون[٣١٦].

سەرکردایەتییا لەشکەرێ ئێکێ هێزێن خۆ ل دهـۆك، ئاکرێ، زاخـۆ، سیارەتووکا و ئاسـهێ کۆمکرن، سەرکردێ لەشکەرێ ئێکێ ب مەرەما بلندکرنا مۆرالا وان هێزان سەردەنا وان کر و ژێ خواست سڤکەهێرشان (الغارات) ببەنی سەر دەڤەرێن دورماندورێن خـۆ[٣١٧]. ل رۆژا ٢٢ حزیرانا ١٩٦٣ێ یەکەیەکا پێشمەرگەی هێرشەك برە سەر بارەگایێ لقێ (مقر السریة) هێزێن سەر ب لەشکەرێ ئێکێ ڤە ل دەڤەرا بەریانکا بامەرنێ و هندەك زیان گەهاندنێ، د بەرامبەردا فرۆکان گەلەك ب دژواری دەڤەر و چیایێ مەتینی بۆمبابارنکرن، د ڤێ بۆمبابارنکرنێدا فەرماندەیێ یەکەیا پێشمەرگەی ئەنوەر مایی شەهید بوو[٣١٨].

ل رۆژا ٢٦ حزیرانا ١٩٦٣ێ هێزێن حکۆمەتێ هێرشەکا بەرفرەهـ کرە سەر بنکەهێن پێشمەرگەی ل چیایێ مەقلوبی، سەرکردێ پێشمەرگەی ل دەڤەرێ بریار دا هێزێن خۆ ڤەکێشیتە دەڤەرا شمکان ل سەر چیایێ بێخێری، هەڤدەم دگەل ڤێ ڤەکشیانێ هێزێن حکۆمەتی دەست ب سەر ئێسفنێ دا گرت و ئەو رێکا کو بریار بوو پێشمەرگە تێدا دەرباز ببیت کونترۆلکر، ب ڤەکشیانا حسومیرخانی ژ چیایێ مەقلوبی ئەلقوش کەتە بەرۆکا بەراهیێ یا شەریدا دگەل هێزێن حکۆمەتێ و کرێگرتیێن کورد[٣١٩].

هێزێن سوپایێ سوریێ پشکداری د وێ پلانێدا کر یا سوپایێ عیراقێ ب مەرەما ژناڤبرنا پێشمەرگەی ل قەزا زاخۆ داناى، ئەڤ پلانە یا پێکهاتیبووو ژ هێرشێ بۆ سەر چوار بەرۆکان:

١- تەوەرێ ئاسهێ، گرشینی، باوەردێ، سێڤدنجنی، هەڤشین، چەم زراڤی، بەغلیوبجێ، صوریا، مشارا، تیسانا، باجدێ، پێشیابوێرێ و دێرەبوینێ.

٢- تەوەرێ ئاسیهێ بەرەف چیایێ سپی ژ ئالیێ قادیا، کولێ، خەربە نورێ، گر گەلی، میرگەسورا، کروینیێ، دێرەبوینێ.

٣- تەوەرێ کەرفرینێ ب درێژیا چیایی هەتا دێرەبوینێ.

٤- تەوەرێ سەلکا، خرابدارێ، خێلەخێ، شیناڤا و هێتیتیان.

پێشمەرگەی بەرسنگێ ڤێ هێرشیان گرت کو ب پشتەڤانییا فرۆکێن جەنگی و دەبابە دهاتەکرن و هژمارەکا زۆرا کرێگرتییێن ناڤخۆیی ل پێشیا هێزێن حکۆمەتێ بوون و ب دەنگی بلند هاواردکرن (لا اله الا الله) هەروەك ئەو موجاهید بن و پێشمەرگە کافر داخواز ژ پێشمەرگەی دکرن خۆ بدەستڤە بدەن.[٣٢٠]

دەڤەرا بادینان د قوناغا ناڤبەرا ١٠ حزیرانا ١٩٦٣- ١٠ شباتا ١٩٦٤ گەلەك شەر و لێکدانێن مەن و بچویك ب خۆڤە دیتن، تێدا زیانێن مەزن گەهشتنە هێزێن حکۆمەتێ و زیانێن حکۆمەتێ ل ئاستەکی بوون ل کانوونا دووێ ١٩٦٤ێ داخوازا دانوستاندنان بکەت و ل ١٠ شباتا ١٩٦٤ێ شەری ب راوەستینیت، ل ژێری گرنگترین شەرێن ڤێ قوناغا شۆرشا ئەیلوولێ نە ل دەڤەرا بادینان.

### ئێك: شەرێ سەرێ ئاکرێ

پشتی کودەتا ٨ شباتا١٩٦٣ێ لەشکەرێ عیراقێ هەموو هزرا خۆ دابوو سەر بەرۆکا ئاکرێ و چیایی پێرسی ب نیازا وێ چەندێ کو بگەهیتە بارزان و د وێ باوەرێدا بوو ب گرتنا بارزان دێ شۆرش ب داوی هێت، دو لەشکەرێن عیراقێ و ب هزاران جاش بڤی ئەرکی راسپاردبوون، ئەنجامدانا پلانا ڤێ هێرشێ ب سەرپەرشتییا وەزیرێ بەرگریێ وی سەردەمی سالح مەهدی عەماش و سەرۆکئەرکانێ لەشکەرێ عیراقی تاهر یەحیای بوو، سەرۆککۆمار عەبدولسەلام عارفی ژی بەردەوام ب مەرەما بلندکرنا مۆرالا هێزێن خۆ سەرەدەنا بەرۆکێن شەری دکر.

پشتی هەموو بەرهەڤی هاتینەکرن ل شەڤا ١٥/١٤ حزیرانا ١٩٦٣ێ هێرشێ ب ئاگر بارانەکا دژوارا بنکەهێن هێزێن پێشمەرگە ل چیایێ پێرسی دەسپێکر، ل سپێدەیا ١٥ حزیرانێ پۆل پۆل فرۆکێن

شەرکەر ئەو جهە بۆمبابارانکرن، پاشتر سۆپایێ عیراقێ دگەل هزاران جاشان دەست ب هێرشێ کر و پێشمەرگە ناچار بوون بەرەف چیایێ پێرس ڤەکشیێن و بارزانی ب خۆ هاتەدەڤەرێ و جهێ خۆ ل هنداڤ گوندێ سەفتی گرت، هەر ل وێرێ ژی ژ ئەنجامێ دژواریا ئاگربارنێ ساچمەکێ ژێ گرت[٣٢١].

بارزانی پلانا بەرگریێ ژ چیایێ پێرسی دانا، سەرکردێ بەرۆکا پێشمەرگەی ل دەڤەرێ مەلا شنی قرتاس گازی کر و بریار دا پێشمەرگە چەپەرێن بەرگریی ل کۆمتێن چیایێ پێرسی ب هێز بێخیت و هێزەکا پێشمەرگەی دگەل عومەر ئاغای بهنێرنە دەڤەرا شوشێ ل رۆژئاڤایێ ئاکرێ دا ژ پشتڤە ل هێزێن دوژمنی بدەن و هێزەکا دی بچیتە گەلیێ زەنتێ دا ل ئالیێ رۆژهەلاتیڤە ل دوژمنی بدەن و مەترسیێ بێخنە سەر رێکێن هاتنوچوونا وی و ب ڤێ‌چەندێ ژی دا فشار ل سەر چیایێ پێرسی سڤك ببیت[٣٢٢].

ل رۆژا ٢٥ حزیرانێ هێرشێ لەشکەرێ حکۆمەتێ بۆ سەر چیایێ پێرسی دەسپێکر، هێزا پێشمەرگەی ئەوا ب سەرکردایەتیا عومەر ئاغای کەتنە بەر هێرشێ بەلێ ئەو شیان بەرسنگێ وێ بگرن، عومەر ئاغا د ڤی شەریدا بریندار بوو و هرمزێ مەلك چکوی ل شوونا وی سەرکردایتیا پێشمەرگەی گرتە دەست و شیان ل دەڤەرا شوشێ بەرخۆدانێ بکەن و نەهێلن هێزێن حکۆمەتێ بەرەف پێش بچن، بەلێ ل پێرسی پشتی کو هێزێن هێرشکەر بەرەف پاش زڤرینەڤە دست ب تۆپبارانادەڤەرێ کرن و د ئەنجامێ ڤێ تۆپبارانێدا ل رۆژا ٢٢ حزیرانێ مەلا شنی هاتەشەهیدکرن[٣٢٣].

هێزێن حکۆمەتێ پشتی سێ هێرشان بێ هیڤیبوون کو سەرکەتنەکێ‌دەستڤەبینن، د بەرامبەر پێشمەرگە ژ کۆمتێن چیا بەرەف دانگا چیان هاتن و چەپەرێن خۆ ل وێرێ دانان، هەتا داوییا تیرمەها ١٩٦٣ێ سەروبەر ل بەرۆکا ئاکرێ ب ڤی رەنگی ما[٣٢٤]. ل ٢٥ تیرمەهێ هێزەکا پێشمەرگەی ب سەرکردایەتیا حالی دۆلەمەری چوو د ناڤ کووراتیا دەڤەرا سویرچیاندا و گەهشتە گوندێ سوسنئاڤا گوندێ شێخ توفیقێ یەك ژ سەرۆکعەشیرەتێن سویرچیان و ئەو هەردو کورێن وی ب وێ مەرەمێ هەلویستێ خۆ بەرامبەری شۆرشێ بگۆهرن گرتن و ئینانە دەڤەرا بارزان، بەلێ ئەڤ بزاڤە یا بێ ئەنجام بوو[٣٢٥].

ب رەنگەکێ گشتی هێزێن حکۆمەتێ چەپەرێن خۆ ب درێژیا بەرۆکا ئاکرێ گرتن و چ هێرش نەکرن، چالاکیێن وان مانە ب هیڤیا هێرشێن فرۆکان بۆ سەر بەرۆکێن پێشمەرگەی و گوندێن دکەڤنە د بەرۆکێن پشتێ یێن شەریدا[٣٢٦] د هەمان دەمدا هێزێن حکۆمەتێ سەربازگەهەك دانا دەشتا بیرا کەپرا و هێزەکا (لیوایەکا) لەشکەری دگەل ٢٠٠٠ جاشان دانانە تێدا و هێزێن دیتر بەرەف دهۆك و زاخۆ ڤەکشاندن.

د بەرامبەر نە شیانا هێزێن حکۆمەتێ کو بەرسنگێ پێشمەرگەی بگرن و ب مەرما دیتنەڤا جهێ پێیەکی بۆ کوردێن ئالیگرێن حکۆمەتێ ل دەڤەرا ئاکرێ و چاندنا توڤێ ناکوکی و نەڤیان و فتنێ د ناڤبەرا عەشیرەتێن دەڤەرێدا، پشتی کو هەیی و نەیی و پەزێ وان تالانکری ٢٠ خێزانێن ئالیگرێن شۆرشێ ل نەهلێ ناچارکرن ژ وێرێ بچن و مالێن خۆ بهێلن، د هەمان دەمدا هاریکاریا محێ دینێ هەرکی یەك ژ مەزنە سەرۆکجاشێن دەڤەرا ئاکرێ کر کو دەست ب سەر (٢٥) گوندێن ناحیا بەردەرەش دا بگریت و خەلکێ وان ژێ دەرێخیت و جاشێن خۆ ل شوونا وان ئاکنجی بکەت[٣٢٧].

هندی پەیوەندی ب ڤێ مژارێڤە هەی ل هاڤینا ١٩٦٣ حکۆمەتێ چەند ئەندامێن شاندێ دانوستاندنان یێ شۆرشێ ئەوێن ل ٩ حزیرانا ١٩٦٣ێ گرتین ئازادکرن، ئەو ژی هەریەك ژ مەسعوود محەمەد، شێخ حسێنێ خانەڤا، صەمەد محەمەد و بابەکر پشدەری بوون ئازادکرن و راسپاردن نامەیا حکۆمەتێ بگەهینە هندەك سەرۆکعەشیرەتێن کورد و مەکتەبا



شەریفێ سوفی ئەحمێ ١٩٢٤- ١٩٨٥/٢/٩

سیاسیا پارتی و تێدا ئارەزوویا حكۆمەتێ دیاركریوو كو ئەو حەز دكەت بێی بارزانی دانوستاندنان دگەل وان بكەت[٣٢٨].

## دوو: شەرێ چیایێ مەتینی

دەمێ حكۆمەتا بەعسیيان گەهشتیيە وێ باوەرێ كو ئەو ب تنێ نكاریت شۆرشا كوردستانێ ژناڤ ببەت، هەوارا خۆ بەر وان دەولەتێن دیتر ئەوێن كوردستان د ناڤبەرا خۆدا دابەشكری، تایبەت تركیا و ئیرانێ و هەڤپەیمانێن وان د هەڤپەیمانییا سەنتودا و داخوازا هاریكاریێ ژ وان كر، دەزگەهێ گوهداریێ (جهاز الانصات)یێ شۆرشێ ل رۆژا ٢ تیرمەها ١٩٦٣ برووسكەكا حكۆمەتێ وەرگرت، د دەقێ وێ دا هاتیە:

بۆ لەشكەرێ ئێكێ سەرەكی، لەشكەرێ دووێ سەرەكی هژمار: ٣٤٧٨/ نهێنی رۆژ: ١٩٦٣/٧/٢

(( دگەل دەستەلاتدارێن تركیا و ئیرانێ پێكهاتین هاتییەكرن كو ب مەرەما زێرەڤانیكرنا خرڤەبوونێن خائینان د ناڤ خاكێ عیراقێدا رێك بێتەدان فرۆكێن تركی و ئیرانی ژ سنووری دەرباز ببن و بگەهننە خیچا ناڤبەرا سەرسنكێ- ئاكرێ- رەواندزێ.

هیڤیە هەموو یەكەیێن سۆپایێ عیراقێ ل دەڤەرا كریارێن لەشكەری بێنەئاگاداركرن كو بەرهەنگاری فرۆكێن تركی و ئیرانی نەبن، د دەمەكێ نێزیكدا دو ئەفسەرێن پەیوەندییان دێ گەهن، یەك ژ لەشكەرێ تركی و یێ دی ژ لەشكەرێ ئیرانێ، یێ ئێكێ دێ ل مووسلێ بیت و یێ دی دێ ل كەركۆكێ بیت، هەریەك ژ وان دێ ئامیرەكێ بێ تەلێ دگەل دو كارێكەران دگەل خۆ ئینیت ب مەرەما دابینكرنا هەڤكاریێ دگەل یەكەیێن مە)) [٣٢٩].

ب كریار ژی دەستەكا هەڤكاریا هەڤپشك (ئیرانی تركی عیراقی) ب سەرۆكاتییا رێڤەبەرێ چالاكیێن لەشكەرێن عیراقی سوبحی عەبدولحەمید و ل ژێر چاڤدێرییا وەزیرێ بەرگریێ سالح مەهدی عەماش هاتەپێكئینان[٣٣٠]. د ڤێ كریارێدا عیراقێ هاریكارییەكا بەرچاڤ ژ وەرگرتنا پێزانینێن لەشكەری و زێرەڤانیا ئەسمانی و عەردی دەستڤەئینا، د هەمان دەمدا هەریەك ژ بریتانیا و ئیسپانیا و پاكستان هاریكاریێن لەشكەری ژ چەكی و تەقەمەنی دانە عیراقێ و هەردو دەولەتێن یەمەن و جەزائیرێ پشتەڤانییا عیراقێ د بزاڤا ژ ناڤبرنا شۆرشا كورداندا كر. ئەڤ كریارا لەشكەری ب كریارا (دیجلە) هاتەناڤكرن[٣٣١] و ئارمانجێ وێ ژناڤبرا ئێكجارییا شۆرشێ بوو.

داكو حكۆمەتێن تركیا و ئیرانێ و هەڤپەیمانیا سەنتو دژی شۆرشا كوردان هاندەت، عەبدولسەلام عارفی د داخۆیانیەكێدا راگەهاند كو هێزێن عیراقێ یێ شەرێ ئیمپریالیزمی و كافران و شیوعییان دكەت كو هەموویان هەڤپەیمانییەك دژی عیراقێ گرێدایە،

هەروەسان پێشبینی کر بوو کو د دەمەکێ نێزیکدا دێ داویێ ب شۆرشا کوردی ئینن[٣٣٢].

هێرشا حکۆمەتێ بۆ سەر کوردستانێ ژ سێ تەوەرانڤە بوو، تەوەرێ ئێکێ ژ ئامێدیێ- زاخۆ بوو، بۆ ڤێ مەرەمێ هەڤکاریەك د ناڤبەرا هەردو حکۆمەتێن عیراقێ و ترکیا دا هاتبوو کرن کو ناڤتێدانا هندەك عەشیرەتێن بادینان یێن نێزیکی سنووری بکەن کو دەڤەرێن خۆ بەردەن و پەنای ببەنە بەر دەڤەرا هەکاری ل ترکیا زەلامێن وان عەشیرەتان ل گەلیێ هەلیلێ یێ نهالا تیارێ کۆمکرن ب وێ مەرەمێ کو ڤان زەلامان چەکدار بکەن و د دەمێ شکەستنا هێزێن پێشمەرگەی و ڤەکشیانا وان بەرامبەری هێرشێن هێزێن عیراقێ و سوریێ ژ پشتڤە ل هێزێن پێشمەرگەی بدەن، ئەڤ هەڤکارییە دگەل سەرۆکجاشان ئەوێن ل مووسلێ ئاکنجی هاتبووکرن و هژمارەك ژ وان ب ڤێ مەرەمێ چووبوونە ئەنقەرە و هەکاری.

شۆرشا کوردستانێ هەست ب مەترسیا هاندانا ڤان عەشیرەتان دژی وێ کربوو، لەوما ژی دەملدەست یەك ژ باوەرپێکریێن خۆ ب ناڤێ شەریف ئەحمەد توڤی یێ ناڤدار ل دەڤەرێ ب (شەریفێ صوفی ئەحمێ) هنارتە وێ دەڤەرێ یا کو ئەڤ عەشیرەتە لێ هاتینەکۆمکرن داکو وان رازی بکەت پشتەڤانیێ ل شۆرشێ بکەن و یان چ نەبیت دژایەتیا وێ نەکەن، بەلێ سیخور و کرێگرتیێن حکۆمەتا عیراقێ ل وی جهی شیان وی ل چریا دووێ ١٩٦٣ێ بگرن رادەستی حکۆمەتا ترکیا بکەن و وێ د رێکا سوریێ را رادەستی حکۆمەتا عیراقێ کر، پاشتر سەرکردایەتیا شۆرشێ شێخ سلێمانێ بارزانی هنارتە جەم سەرکردایەتیا هێزێن ترکی ل سنووری ئەو ژ ئەنجامێن دژایەتیکرنا شۆرشا کوردستانێ و ئاگادار کرن ئەگەر بەردەوامیێ ب ڤێ چەندێ بدەن ئەڤە دێ شۆرش شەری ئینتە د ناڤ خاکێ ترکیا، سەرکردایەتیا شۆرشێ دزانیت ئەو چ دبێژیت و وێ دزانی کو پرانیا گوند و عەشیرەتێن ژێریێ رۆژهەلاتێ ترکیا هەڤسوز بوون دگەل شۆرشێ و هاریکاریا وێ دکر[٣٣٣] زێدەباری وێ چەندێ کو سەدان ژ کوردێن کوردستانا ترکیا پێشمەرگە بوون[٣٣٤].

پشتی کو لەشکەرێ ئێکێ یێ سۆپایێ عیراقێ بێ هیڤی بووی ژ وێ چەندێ کو پێشکەتنەکێ ل میحوەرێ ئاکرێ- بارزان دەستڤەبینیت، لەشکەرگەهەك (سەربازگەهەك) ل دەڤەرا بیرا کەپرا دامەزراند و دورێن وی ب مینان چاندن و ب پەرژانێن سیمدار گرتن و چەند یەکەیێن لەشکەرێ خۆ ڤەکێشانە ئامێدیێ و دهۆکێ و زاخۆ و هێزێن خۆ ب تیپا یەرموك یا لەشکەرێ سوری بهێزکر و ل ٢٠ تەباخا ١٩٦٣ێ دەست ب هێرشێ بەرەف چیایێ مەتینی کر، لەشکەرێ عیراقێ گەهشتە مانکێشێ و گوندێن د رێکا خۆدا: بەندا/ کورێمێ، بەرۆشکا سەعدونی، ملهمبانێ و دێرگژنیکێ سوتن و کاڤلکرن، ل ٢٧ تەباخێ بەرەف سیارەتۆکا کەتە رێ و هێرش برە سەر هەردو گوندێن سوارێ و سپیندارێ، ل ٢٨ تەباخێ ل فرۆکەخانا بامەرنێ جێگیربوون و هێرشێ بۆ سەر چیایێ مەتینی ژ چوار تەوەرانڤە دەسپێکر ئەو ژی: سەرێ ئامێدیێ و بامەرنێ و کانی بەلاڤێ و سەرسنکێ بۆ ئەرەدنا. هەرچەندە پێشمەرگە ل کانی بەلاڤێ شیان رێکێ ل بەر هێرشێ بگرن، بەلێ دوژمن شیا سەرێ ئامێدیێ داگیربکەت، ل ١٦ ئەیلوولێ هێزێن سەرکیێن لەشکەرێ عیراقێ ژ فرۆکەخانا بامەرنێ بەرەف کۆمتێ چیایێ مەتینی چوون و گەهشتنە گوندێ دەرگەلا موسا بەگێ، سەرکردێ هێزا پێشمەرگەی ل ڤی جهی جەمیل توفیق بامەرنی یێ ناڤدار ب (جەمیلێ سۆر) هاتەشەهیدکرن و پێشەنگێن هێزێن حکۆمەتێ گەهشتنە بنارێن گابنێرکێ[٣٣٥].

لەشکەرێ عیراقێ و سوریێ ب هاریکاریا جاشێن کورد ل ٣١ ئەیلوولا ١٩٦٣ێ د دەمێ هێرشا خۆدا بۆ سەر چیایێ مەتینێ بەرۆکەکا دی

یا شەری بەرەف دەڤەرا بەنستان ڤەکر، بارەگایێ پێشمەرگەی ب سەرکردایەتییا سەلمان خورشید سندی ل گوندێ هەورێزکێ بوو، هێزێن حکومەتێ مل ب ملێ رووبارێ هیزلی و ب رەخ گوندێن: چەم مشکو، دورنەخێ، وارسۆرا، رەبەتکا ملا کیزاڤێ بەرەف هەورێزێ کەتنە رێ و کەتنە د شەرەکیدا دگەل هێزێن پێشمەرگەی و ڤی شەری نێزیکی نەهـ دەمژمێران ڤەکێشا و پێشمەرگە شیان ڤێ هێرشێ یا پێکهاتی ژ بەتالیونەکا هێزێن عیراقی و هێزەکا سوری و ب سەدان جاشان بشکێنن، ١٤ سەربازێن سوری دگەل فەرماندێ بەتایونەکا عیراقی هاتنەکوشتن و دو سەرۆکجاش ژی بریندار بوون، ئەڤ شەرە د شۆرشا ئەیلوولێدا ب شەرێ ملا کیزاڤێ دهێتە نیاسین[٣٣٦].

سەرەدەریا هێزێن عیراقێ و سوریێ دگەل خەلکێ ڤان دەڤەرا سەردەریەکا دژوار و خراپبوو، هەرگوندەکێ دگوهشتنێ دسوت و تالاندکر، هێزێن سوری هێژ خرابتر خەلکێ گوندی ناچاردکرن ئەو ب خۆ گوندێ خۆ بسۆژن، ئەڤ زولم و ستەمکارییە بۆ ئەگەرێ هندێ کاودانێ ئابووریێ خەلکێ نەخوش ببیت و گەلەك ژێ مشەختبوونە زاخۆ یان بەرەڤگوندێن ژێر دەستەلاتێ پێشمەرگەی کوچکرن[٣٣٧].

فەرماندێ لەشکەرێ ئێکێ یێ عیراقی عەبدولکەریم فەرحان خۆ هەلدکێشیت و شانازیێ ب سەرکەتنێن هێزێن خوە دکەت و دبێژیت: تنێ دو رێك ل سەر شۆرشگێران دڤەکری بون، یان ڤەکشیێن خۆ ژ وێ دووریێچێ دەربازیکەن یان بەرسنگێ هێزێن مە گرن و کو ب هژمارێ و شیانێن چەکی و تەقەمەنی ژ وان بهێزتربوون، ئانکویا ڤێ چەندێ ژی ڤرکرن و گرتنا وان بوو، چەتان د ڤی شەریدا گەلەك پەز و مالات و چەك دەستخۆڤە ئینابوو، عەدەت وەسان بوو کو شێخ یان سەرۆك (مەرەم پێ سەرۆکجاشە) دەست



هیلیکوپتەرەکا عیراقی یا کەتیە جیایێن کوردستانێ سالا ١٩٦٣

ب سەروان دەسکەفتاندا بگریت و وی هندەکژی ب سەر ئالگرێن خۆ (جاشێن خۆ)دا دابەشدکر، گەلەك جاران پشتی شەرێن مەزن بهایێ گوشتی ل بازارێن مووسلێ ئەرزان دبوو، ئەڤە ژی ئەنجامێ فروشتنا وی پەزی و مالاتی بوو یێن ژ گوندێن کوردان دهاتەدزین و تالانکرن[٣٣٨].

هەردو سۆپایێن عیراقی و سوری و ل پێشیا وان ژی ب هزاران جاشێن کورد پرانییا بارەگا و بنگەهێن پێشمەرگەی داگیرکرن، رەشبینیێ خۆ ب سەر گەلەکاندا گرت، باوەری نەما، هەروەك پێشمەرگەکێ پشکدار د رووداناندا ڤەدگێریت: رۆژەکا رەش بوو[٣٣٩]. گەلەك ژ خەلکێ وان گوندان ناچار بوون ئەگەر تنێ بۆ رویمەتی ژی بیت ئالیگری و پشتەڤانییا خۆ ب حکۆمەتێ راگەهینن، هندەکان ژ وان ب تایبەت موختارێن گوندان برووسکێن پشتەڤانیێ بۆ حکۆمەتێ لێدان کو شیایە (( بزاڤا مەلا مستەفایێ بارزانی ... و هاریکارێن وی شیوعیێن خائین...)) ژناڤببەت، د هەمان دەمدا دەمێ هێزێن حکۆمەتێ ب سەرکردایەتییا عەمید خەلیل جاسم ئەلدەباغ[٣٤٠] هاتینە د ناڤ ئامێدیێ دا گەلەك ژ خەلکێ وێ گرتن و زێدەگاڤی ل سەر مالێن وان کرن و ناڤمالیێن وان تالانکرن[٣٤١]. هەژیە ل ڤێرێ بێژین فرۆکێن شەرکەرێن عیراقی د دەمێ بۆمبابارانا پێشمەرگەی ل شەرێن ئاکرێ چیایێ مەتینی ل مەهێن تیرمەه و تەباخا ١٩٦٣ێ چەند جارەکان زێدەگاڤی ل سەر سنوورێ ترکیا کرن و گوندێن کوردیێن ترکیا بۆمبارانکرن[٣٤٢]. پشتی ڤی سەروبەرێ هاتیەپێش و لاوازییا کەتە بەرخۆدانا پێشمەرگەی شاعیرێ ناڤدار ئەحمەدێ نالبەند نەدڤیا ل ژێر دەستەلاتێ حکۆمەتێ و کرنگرتیێن وێ بژیت لەوما ل داویا ئەیلوولا ١٩٦٣ێ باشتر زانی خۆ بکوژیت[٣٤٣].

ژ ئەنجامێ ڤێ شکەستنا هێزێن پێشمەرگەی و گرتنا چیایێ مەتینی بریار هاتەدان پێشمەرگە دژە هێرشەکا گشتی بکەت و (٤٠٠)پێشمەرگەیێن فیداکار سویندخوار هەتا مرنێ بەردەوام بن ژ پاکژکرنا چیایێ مەتینی ژ هێزێن دوژمنی، ل ٤- ٥ مەها چریا ئێکێ فەرماندێ پێشمەرگەی عیسا سوار و هاریکارێ وی عەلی هالۆی فەرماندا دەست ب هێرشێ بکەن، شەرەکێ مەزن روودا و ب چەکێ سپی کەتنە ناڤ هەڤدو ب تایبەت ل نێزیکی رەبیعا دەرگەلا موسا بەگێ، د ڤی شەریدا محەمەدێ کورێ عیسا سوار و تاهر محەمەد سەعودنێ بریفکی و شێخ سدیقێ دەرگەلی ژ پێشمەرگەی شەهید بوون، بەلێ سۆپایێ حکۆمەتێ نەشیا چیایێ گابنێرکی بگریت و دەمێ بۆ رۆژا دووێ بزاڤا خۆ دوبارەکرییەڤە ڤێ جارێ ژی شکەست و ب ڤێ چەندێ ژی بەرۆکا دوژمنی شکەست دەست ب رەڤێ کرن هەتا چووینە ناڤ فرۆکەخانا بامەرنێ، شکەستنا لەشکەر و جاشێن دوژمنی ل چیایێ گابنێرکی بوو ئەگەرێ شکەستنا وان ل تەڤایی تەوەرێن چیایێ مەتینی، ب ڤی رەنگی پێشمەرگەی د شەڤ و رۆژەکاندا هەموو ئەو جهە ئازادکرن یێن دوژمنی د (٤٥) رۆژاندا گرتین[٣٤٤]. هەژیە بێژین عیسا سوار، عەلی هالۆ، سلێمانێ حەجی بدریا و فارس کورەمارکی ژ دیارترین سەرکردێن شەرێ گابنێرکی بوون[٣٤٥].

پشتی کو سۆپایێ عیراقێ و هەڤکارێن وی ل چیایێ مەتینی شکەستین هەموو عومبارێن خۆ یێن ئەرزاقی و چەکی سوتن و ب سەدان تەمێن کوشتیان ل گۆرەپانا شەری ل پاش خۆ هێلا، د ڤی شەریدا تیپا (لیوا) ١٨ ب یەکجاری پویچ بوو و زیانێن مەزن گەهشتنا تیپا فەهدولشاعری[٣٤٦]. سەروبەر گەهشتە ئاستەکی سەرۆکۆمارێ عیراقێ عەبدولسەلام محەمەد عارف ب خۆ سەرەدانا فەهدولشاعری ل لەشکەرگەهێ وی ل دەڤەرا زاخۆ بکەت[٣٤٧]. هندیکە زیانێن پێشمەرگەینە د ڤی شەریدا (٣٦) شەهید و (٧٨) بریندار بوون، بەلێ دەسکەفتێن پێشمەرگەی دو تۆپ و (٤٠٠) تڤەنگ و (١٥) رەشاش و چەندین سندوقێن

تەقەمەنی و پێدڤیاتییێن دیتر بوون[٣٤٨].

ژ ترسێن هندێ نەکو لەشکەرێ شکەستی رەڤیێ حکۆمەتێ بەرەف بامەرنێ زۆرداریێ ل خەلکێ گوندێن ناڤبەرا ئامێدیێ و دهۆکێ بکەت، عیسا سواری فەرماندا فارس کۆرەمارکی دگەل هێزەکا پێشمەرگەی بچیتە دەڤەرێ و گوندێ بەندا کرە بارەگایێ سەرەکیێ خۆ و دو بارەگایێن سەرب ویڤە ل گوندێن زڤنگێ و زێوکا کەندالان دانان، کۆرەمارکی د بیرهاتنێن خۆدا ڤەدگێریت کو: د ڤی دەمیدا عەبدولواحدێ حەجی مەلۆی و مەحموود چەمانکی دگەل هندەك ژ پێشمەرگەیان گەهشتنە رێزێن حکۆمەتێ، ب ڤێ چەندێ ژی دربەکێ گران ل هێزێن پێشمەرگەیدا ل دەڤەرا شێخان[٣٤٩]. د راستیدا پرانییا بەرپرس و سەرکردێن پێشمەرگەی ژ دەڤەرا مزووریان هەتا رووبارێ خازری ژ وان ئاغایان بوون یێن د ناڤبەرا سالێن ١٩٦٣- ١٩٦٦ێ خۆ رادەستی حکۆمەتێ کرین.

هێزێن لەشکەریێن عیراقێ و سوریێ نەشیان، وی ئارمانجی بجهبینن کو بکەهنە سنوورێ ترکیا عیراقێ و دەڤەرێن ژێر دەستەلاتێ شۆرشێ ژێکجودابکەن و بکەنە دو دەڤەر و پێشمەرگەی ژ هەڤجودا بکەن، کرێکرتییێن کورد و خێزانێن وان ئەوێن چووینە دەڤەرا هەکاری بوونە بارگرانی ل سەر حکۆمەتا ترکی، لەوما حکۆمەتا ترکی ئەو هەموو خرڤەکرن و برنە دەڤەرا وانێ و ژ وێرێ ب هەڤکاری دگەل حکۆمەتا عیراقێ و سوریێ ب رێکا بدلیسێ، سێرتێ، شەرنەخێ و جزیرێ برنە دەڤەرا عەیندیوارێ ل سوریێ و ژ وێرێ ب رێکا دێرکێ و خانکێ و پێشیابویرێ ژ رووبارێ دجلەی دەربازبوون ل رۆژا ٥ چریا دووێ ١٩٦٣ێ گەهشتنە زاخۆ، پاشتر پرانییا وان هاتنە باژێرێ مووسلێ و گەهشتنە رێزێن چەتان.

هەژیە بێژین هندەك ژ وان ئەوێن د دەمێ هێرشا حکۆمەتا عیراقێ بۆ سەر چیایێ مەتینی و دەڤەرا بەرواریان ب ناچاری دەربازبووینە ناڤ ئاخا ترکیا چ پەیوەندی ب وان عەشیرەتانڤە نەبوو و زڤرینەڤە سەر جهێن خۆ، لێ دەستەلاتی ب هاندانا حکۆمەتا ترکیا هندەك ژ وان گرتن ژ وانا: ئەحمەدی مەلا تەیبی (مامۆستا) و کەمال یا مولکی (مامۆستا)، یێ ئێکێ ب سالەکێ زیندان هاتنە حوکمدان و یێ دو یێ ژبەرکو شیوعی بوو ب (١٢) سال و (٦) هەیڤان زیندان هاتەحوکمدان، هەردو ژی د دەمێ ڤەکۆلینێدا ل زاخۆ و مووسلێ ب دژواری هاتنە ئەشکەنجە دان[٣٥٠].

وەك عەدەتێ وێ یێ هەرجار ب مەرەما پەردەپوشکرنا شکەستنێن خۆ دەستەلاتداریا عیراقێ ب هاریکاریا جاشەکوردان دەستدا وێرانکرن و سۆتنا پتر ژ (٢٠) گوندێن دەڤەرا سلێڤانەییان یا سەر ب زاخۆ و بەریۆمێ وانێ چاندنێ سۆت و هەیی نەبێن وان تالانکرن جوبانیێ، ئاڤزریك، کێلکێ، کولێ و باغلوجە ژ وان گوندان بوون یێن بەر ڤێ کریارا دوژمنکارانە کەیتن[٣٥١].

## سێ: کریارێن لەشکەریێن پێشمەرگێن شیوعی و چالاکیێن وان

پرانییا شیوعیێن پشتی کودەتا ٨ شباتا ١٩٦٣ گەهشتینە ناڤ شۆرشا کوردستانێ ل بارەگایێن خۆ ل گوندێن نسریێ، گەلیێ قەیسەریێ، پیرموس، کانی زێوکێ و شلان خرڤەبووین ژ خەلکێ بادینان و باژێرێ مووسلێ و دەوروبەرێن وێ بوون ب تایبەت ترکمانێن گوندێن رەشیدیێ و گوبە و ئەلقازیە و شریخان بوون، هێزا هەر بارەگایەکی ژ پێنجی چەکداران پێکدهات ئەو ژی د لێکڤەکریبوون ل سەر مەفرەزە و دەستەکێن شەرکەرێن لڤۆك[٣٥٢]. ئەڤ مەفرەزەیە کو ب سەرکردایەتییا هەریەك ژ موسلح جەلالی و توما تۆماس بوون شیان د دەمەکێ کورتدا خۆ ب خەلکێ دەڤەرێ بدەنە نیاسین، ئەڤە ژی بەرهەمێ وان هێرشان بوو یێن وان دکرنە سەر کاروان و رەبیعە و بنکەهێن سۆپایێ عیراقێ و جاشان و



**توما توماس**

د ڤان كریاراندا شیان چەندین پارچەیێن چەكی و هندەك تەقەمەنی و زەخیرە و پێدڤیاتیێن دی دەستخۆڤە بینن، ئەڤ دەسكەفتە ژی پاشتر بوون هاریكار بۆ بهێزكەتنا شیانێن شیوعییان و یا پتر ژی هاریكاریا بهێزبوونا وان كری خەلكێ ئەلقوش و گوندێن كوردان ب تایبەت یێن ئێزدییان كو رۆلەكێ ویرەكانە د هاریكاری و پشتەڤانیا واندا دگێرا و ئەو كەسێن دگەهشتنە ریزێن پێشمەرگێن شیوعی د حەواندن و ب سلامەتی دگەهاندنە بارەگایێن وان و چەك و تەقەمەنی و پێویستیێن وان دابیندكرن[٣٥٣].

پێشمەرگێن شیوعی ب هەڤكاری دگەل پێشمەرگێن پارتی ب تایبەت هێزا هرمزێ مەلك چكوی ل دەڤەرێ چالاكی دكرن، هێزا ئامازەپێكری ژی ژ ١٦٠ پێشمەرگەیان پرانیا وان ئێزدی و ئاسووری بوون پێكدهات و بنكەهێ وان ل گوندێسیتكی بوو ل پشت چیایێ ئەلقوش[٣٥٤]. ئەڤانا ژی ب فەرمانا غازیێ حەجی مەلۆی و برایێ وی عەبدولواحدی چالاكی دكرن كو بارەگایێ وی ل گوندێ خۆركێ بوو، د شیاندایە ب كورتی بێژین پرانیا كریارێن پێشمەرگایەتی یێن شیوعییان ئەنجامددان ب هەڤكاریا هرمزێ مەلك چكوی بوون كو ئەڤە گرنگترینێ وان كریارانە:

١- پشكداری د شەرێ شۆش و شەرمنا ل٢٦ حزیرانا ١٩٦٣

٢- شەرێسەرێ چیایێ ئەلقوش ل ٣٠ حزیرانا ١٩٦٣

٣- شەرێ گوندێ خربەصالح ل١٦ تەباخا ١٩٦٣

٤- شەرێ گوندێ نەمریكێ ل ٢٣ تەباخا١٩٦٣

٥- شەرێ گوندێ بیبان ل ٢٧ ئەیلوولا ١٩٦٣

ئەڤ كریارە برامانەكا دروست شەر نەبوون بەلكی مینا شەرێن پارتیزانی شەرێفروشتن و بویسەڤەدان و سڤكە هێرش بوون بۆ سەر هندەك ئارمانجێن دیاركری، ل گوندێ مەمان مەفرەزەكا پێشمەرگێن شیوعی دەمێ د گوندی را بۆرین كەتنە كەمینەكێ و پێشمەرگێ شیوعی فوئاد شەمعون دیشا هاتەكوشتن و یەكەم پێشمەرگێ شیوعی بوو ل دەڤەرا بادینان دهێتە شەهیدكرن[٣٥٥]. هندیكە شەرێ شۆش و شەرمنە گەلەك ژ پێشمەرگەیێن حزبا شیوعی ژ وانا یوسف زرا ئەلقوشی، هرمز خوشابا، كوریال یوسف، فوئام شەمعون و یێن دی پشكداری تێدا كر[٣٥٦].

دەمێ ل رۆژا ٣٠ حزیرانا ١٩٦٣ێ هێزێن لەشكەرێ عیراقێ و جاشان ب مەرەما لێدانا بارەگایێن پێشمەرگەیێن شیوعی بەرەف چیایێ ئەلقوشێ هاتین شەرێ ناڤدار ب شەرێ سەرێ چیایێ ئەلقوشێ روودا، ئەوێن ل رۆژا ١٧ تیرمەهێ بەرسنگێ ڤێ هێرشێ گرتین ب سەركردایەتییا توما توماسی بوون و مێرخاسانە بەر سنگێ دوژمنی گرت،دەبابە و تۆپان پشتەڤانی ل هێرشا دوژمنی دكر، دو پێشمەرگەیێن شیوعی (هرمز جركو و كوریال

ئۆراها) هاتنەشەهیدکرن هژمارەکاسەرباز و جاشان د ڤی شەریداهاتنە کوشتن و بریندارکرن، ل سپێدەیا ٩ێ تیرمەهێ ب مەرەما گرتنا شیوعییان و خێزانێن وان هێزەکا گاردێن نەتەوەیی (الحرس القومي)[٣٥٧] هاتنە ئەلقوشێ، دەملدەست دگەل هاتنا وان بۆ ناڤ بازێرکی دو وەلاتیێن سڤیل کوشتن و زۆرداری ل هندەکێن دی کرن و هندەك ژی بریندارکرن، د ئێڤارا هەمان رۆژێدا حکۆمەتی ب هاریکاریا تۆپان و فرۆکان هێرشەکا دی ئینا سەر چیایێ ئەلقوشێ، لێ ڤێ جارێ ژی هێزا حکۆمەتێ شکەست و چەند زیان ژ کوشتی و بریندااران دان، د ڤی شەریدا شیوعییان ژی چەند شەرڤانێن خۆ ژ دەستدان ژ وانا بۆترس هرمز، شەمو سەعید و کەریم یەلدا[٣٥٨].

ل شەرێ گوندێ خەربە سالح ئەوێ دکەڤیتە سەر ئالیێ رۆژ هەلاتی یێ رووبارێ دیجلەی ب دووراتیا ٢٠ کیلومەتران ژ فەیدیێ مەفەرەزەکا شیوعییان هێرش برە سەر هێزەکا جاشان ل نێزیکی گوندی، شیان گەلەکان ژێ بکوژن و بریندااربکەن و چەند چەکەکان و هندەك تەقەمەنی دەستڤەبینن، د دەمێ ڤەکێشانێدا پێشمەرگەیێ شیوعی عەبدولقادر سەعید مزووری هاتنەکوشتن[٣٥٩].

گوندێ نەمریکێ کو نها کەتیە بەر سکرێ مووسلێ بەردەوام ژ ئالیێ هێزێن حکۆمەتێ و جاشانڤە دهاتەتالانکرن، ئەڤ گوندە دکەفتە د سنوورێ چالاکێن پێشمەرگەیێن شیوعیێن دەڤەرا ئەلقوشێ و بنگەهێ وان ل (سبکی) بوو د ناڤبەرا ئەلقوش و فەیدیێ دا، شیوعییان ب هاریکاریا هێزا هرمزێ مەلك چکوی بریاردان ل رۆژا ٢٧ تەباخا ١٩٦٣ێ هێرشێ ببەنە سەر گوندی، پشتی شەرەکێ دو رۆژێ گەلەك سەرباز و جاش هاتنەکوشتن و چەند



ئەحمەد جەزراوی ١٩٣٥- ٢٠٠٩



سەیفەدین نەشئەت

پارچێن چەکی و هندەك تەقەمەنی و کەرەکێ پەزی دەستخۆڤە ئینان، بەلێ د ڤی شەریدا چوار شەرڤانێن شیوعی ژ وانا حەسەن حەمادی ئەلبەیاتی و ئەلیاس خدر هاتنەکوشتن[٣٦٠] و پێنج ژی بریندار بوون، پشتی چەند رۆژەکان ژ ڤی شەری هرمزێ هێرش برە سەر بنگەهێ ساخلەمیێ ل ناحیا تلکێفێ و ب مەرەما چارەسەرکرنا برینداران دەرمانێن بنگەهی ب دو برومبێلان برنە گوندێ سیتکی.

دەمێ هێزەکا جاشان بەرەڤ گوندێ بیبان یێ ناڤبەرا ئەلقوش و شێخان هاتینەپێش، مەفرەزەکا پێشمەرگەیێن شیوعی بەر سنگێ وێ هێزێ گرت، د ڤی شەریدا هژمارەکا سەرباز و جاشان هاتنەکوشتن و ئەسیرکرن و پێشمەرگەیێ شیوعی حەمید ئەلیاس خەنو ب برینداری کەتە دەست جاشان و ڤەگوهاستنە مووسلێ، پشتی ئەشکەنجا دانێ ئینانە ئەلقوشێ و ل وێرێ ل سێداری دان[٣٦١].

هەژیە بێژین حکۆمەتا کودەتا ٨ شباتا ١٩٦٣ ل بەرچاڤێن خەلکی و ل جهێن گشتی بەرهەلستکارێن خۆ ل جهێن وان ل سێدارێ ددان، هەروەك ل رۆژا ٢ تیرمەها ١٩٦٣ێ هەریەك ژ عەبدولرەحمان سەلیم عەبدولرەحمان مزووری (مامۆستا) و عیسا مەلا سالح بەرامبەری قائیمەقامیا دهۆکێ ل سێدارێ داین و خەلك ناچارکرین بەرێ خۆ بدەنێ، ب هەمان شێوە ل ٢٧ئەیلوولا١٩٦٣ێ بەرامبەری دێرا مار قەرەداغ ل ژێرێ باژێرکێ ئەلقوشێ حەمید ئەلیاس خەنو ل سێدارێ دای و گاردێن نەتەوەیی (حرس القومي) هندەك ژ خەلکێ ناچارکرن بەرێ خۆ بدەنە سێدارەدانێ پاشتر ژی تەرمێ وی دانە دەست باژێرڤانییا تلکێفێ[٣٦٢] ئەڤە یەکەم جار بوو ب بەرچاڤێن خەلکیڤە ل ڤان دو باژێران کریارێن سێدارەدانێ دهێنەئەنجامدان. خەلکێ دەڤەرێن مزووریان ب دەست سەروبەرەکێ ئابووریێ بەرتەنگ و دژوار دنالین، حافز قازی کو د وی سەردەمیدا ل دەڤەرێ بوو دبێژیت: سەروبەرێ پێدڤیاتی و نەبوونیێ ل سەر روویێ خەلکی یێ دیاربوو، گازندە ژ کێمیا خوارنێ و نەبوونا دەرمانان دکرن، کێمترین پێدڤیاتیێن بەردەوامیدانێ ب ژیانێ ل نك وان نەبوون ((من هەست ب ئێشا وی خەلکی ژ دەست نەبوونیێ دکر، خەلکەکێ مەرد و خۆراگربوو)[٣٦٣].

ئەگەرێ ڤێ بەرتەنگیا ئابووری ژی سەرکردەیێن بەرۆکێن شەری بوون ئەوێن دەست ب سەر هەر تشتەکیدا گرتی یێ ل دەڤەرێ هەی ، د دەمەکیدا خوارنا سەرەکیا پێشمەرگەی نان و چا بوو[٣٦٤].

وەسان دیارە گازندەیێن خەلکێ دەڤەرێ و پێشمەرگەی گەهشتبوونە بارزانی، لەوما ژی ل دەسپێکا تەباخا ١٩٦٣ێ هەژارێ موکریانی راسپاردبوو دووڤچوونا ڤان گازندەیان بکەت و رێکا چارەسەریێ بۆ ببینیت و ئەگەر پشکەکا کێم ژی بیت چارەسەرکەت، هەژاری جهێ خۆ ل گوندێ بالەتە هندەك جاران ژی ل گوندێ خۆرکێ گرت، بەلێ بەری کو ئەرکێ خۆ ئەنجام بدەت هاتە گازیکرن بۆ بارەگایێ بارزانی، لەوما ئەو و رەشاد بالەتە دگەل چەند چەکدارەکان و (٨) بارێن فیشەکان بەرەڤ بارزان چوون[٣٦٥].

دووریێچا ئابووریا رژێمێ پشت ی کودەتا ٨ شباتا ١٩٦٣ێ ل سەر کوردستانێ سەپاندی و زێدەباری سوتنا گوندان و مولك و زەڤیێن چاندنێ باندۆرەکا مەزن کربوو سەر ژیان و ژیارا خەلکێ دەڤەرێ، ژ بەر ڤێ چەندێ و چەندین ئەگەرێن دژوار سەرکردایەتیا شۆرشێ داخواز ژ عەقید جەلال بالەتەی کر هندەك دەخل و دانی و جلکان و تەقەمەنی و فیشەکان و دەرمانان بۆ پێشمەرگەی ب تایبەت ئەوێن بەرگری ژ بەرۆکا چیایێ پێرسی دکر دابین بکەت، بۆ فیشەك و تەقەمەنیێ عەقید جەلال بالەتەی نامەیەك بۆ مەزنترین سەرۆك چەتەیێن دەڤەری دێوالیێ سەعید ئاغایێ دۆسکی هنارت و ژێ خواست هندەك فیشەکێن رووسی بۆ پەیدابکەت، ئەحمەد مەحموود جەزراوی دگەل مەفرەزەکا بچووکا شیوعییان ب

سەرپەرشتیا سەیفەدین نەشئەت ئامێدی ئەڤ نامەیە برە دهۆکێ، پشتی چەند رۆژەکان چەند بارەکێن فیشەکێن داخوازکری گەهشتنە بنگەهێ قەیسەریێ[٣٦٦].

هندی پەیوەندی ب دابینکرنا دەخل و دانی و جلکان و دەرمانانڤە هەی، حافز قازی دبیرهاتنێن خۆدا دبێژیت: وی و عەقید جەلال بالەتەی ب شەڤێ سەرەدان چەند دەڤەرکێن ژێر دەستەلاتێ حکۆمەتێ کر و پەیوەندی ب چەند هەڤالەکانڤە کرن و داخوازێن خۆ گەهاندنێ، پشتی دو رۆژان بارێن ئاری و هژمارەکا کارتونێن دەرمانان دگەل چەند سندوقەکێن فیشەکێن برنۆیان بەرەف دەڤەرا پێرسی کەتنە رێ، بەلێ (( بۆ چارەسەرکرنا ئاریشا جلکان د گەریانێن مەیێن شەڤێدا مە ژ هەڤالان خواست ماکینەکا دروارێ دگەل چەند توبەکێن قوماشێ خاکی بۆ مە پەیداکەن))، هەر هند بوو هەتا ماکینا دروارێ و قوماش گەهشتی خانما سارە هەڤژینا هەڤالێ مە یوسف ئەلقوشی پێشمەرگەکێ حزبا شیوعی بوو، دشکەفتێڤە دەست ب دروارەکا بلەز و چەلەنگا جلکێن خاکی کر و رۆژانە (٥-٦) دەستێن جلکان ئامادە دکرن و ((مە ژی هەر چەند رۆژەکان جارەکێ بارەکێ جلکان د هنارتە بەرۆکێن پێشمەرگەی)) [٣٦٧].

داکو ئەو دەخل و دانێ گەهشتی و هەیی ب رەنگەکێ دروست و دادپەروەرانە ب سەر خەلکێ دەڤەرێدا بێتەدابەشکرن ب فەرمانا بارزانی لیژنەکا ئابووری بۆ ڤێ مەرەمێ ژ هەر یەك ژ: جەلال بالەتە، حافز قازی، فەرەج عەبدال، ئەحمەد بارزانی و ئێك ژ کورێن عەبدی ئاغایێ زێدکی هاتەپێکئینان و ب ڤی رەنگی پێدڤیاتیێن هەرە گرنگێن ژیانێ گەهشتنە خەلکێ دەڤەرێن رزگارکری. [٣٦٨].

ل دەسپێکا چریا ئێکێ ١٩٦٣ێ هێرشەکا بەرفرەهـ کرە سەر دەڤەرا مزووری و بەرەف میحوەرێن خورکێ و ئەترووش هاتن و بنگەهێن شیوعییان ل ئەترووشێ و دەڤەرێن دیتر گرتن، جەلال بالەتە و حافز قازی و جەلال قازی بەرەف گوندێ بێبادێ ل دەڤەرا بەرواری ژێری ڤەکشیان کو ببوو جهێ خرڤەبوونا پێشمەرگەی، پاشتر پەل (فصیل)ەکێ شیوعیان گەهشتنە وێرێ و بارەگایەك بۆ خۆ ل وێرێ ڤەکرن[٣٦٩].

حافز قازی د بیرهاتنێن خۆدا د وێ باوەرێدایە کو ئەگەرێ ڤێ شکەستنێ هندەك بەرپرسێن بەرۆکێن شەری بوون یێن کارێ لیژنا ئابووریا ئامارە پێکری زیان گەهاندینە بەرژەوەندیێن وان، لەوما ژی بێی کو فیشەکەکێ ب هاڤێژنە دوژمنی بەرەف پاش ڤەکشیان و بەرۆکێن شەری بەردان هەتا دوژمن گەهشتیە ئەترووش، ڤێ خیانەتێ باندۆرەکا دەروونیا مەزن کرە سەر پێشمەرگەی و ئەڤە ژی بۆ ئەگەرێ هندێ گەلەك ژ پێشمەرگەیان دگەل خێزانێن خۆ بەرەف دەڤەرێن سنووری ڤەکشیێن[٣٧٠].

یا کو پتر پشتەڤانیا بۆچوونا حافز قازی دکەتئەوە کو هەریەك ژ: مەحموود ئاغایێ چەمانکی و عەبدولواحدێ حەجی مەلۆی دگەل ئالیکرێن خۆ ل مەها چریا دووێ ١٩٦٣ێ پشتی شەرێ چیایێ مەتینی گەهشتنە حکۆمەتی[٣٧١].

فارس کورەمارکی د بیرهاتنێن خۆدا دبێژیت: چوونا هەردو ناڤبریان بۆ ناڤ رێزێن حکۆمەتێ دربەکی گران بوو ل پێکهاتا هێزێن پێشمەرگەی کەتی ل بەرۆکا شێخان و ئەسعەد خوشەڤی ژێ خواست بلەز د هەوارا حسو میرخانێ سەرکردێ بەرۆکا شێخان بچیت، ئەو ژی بلەز دگەل ١١٠ پێشمەرگەیان چوونە بارەگایێ حسو میرخانی ل گوندێ بیکیات، دیت کارگەریا دەرکەتنا وان ژ ناڤ شۆرشێ ل رووبێ وی دیارە و تنێ (٢٠) پێشمەرگە ماینە دگەلدا پرانیا وان ژی سەرپەل (سەرقول) بوون وەك: فەرەج عەبدال، حەسەن زاویتەیی، عەبدوللا شکەفت هندی، حەسەن حەجی عیسو، یوسف عەلی، سولتام سیاری، وەیسی بانی، حیتۆ بالەتەیی و خالدێ

عەمەر ئاغای، کورەمارکی د بەردەوامیا ڤەگێرانێن خۆدا دبێژیت: گەهشتنا مە د دەمەکێ باشدا بوو، سەروبەر رزگارکر، بۆ هاندان بۆ وان پێشمەرگەیان یێن قەستا مالێن خۆ کرین بزڤرنەڤە بارەگایێن خۆ و ب ڤێ چەندێ ژی پشتگەرمبووین ئەگەر بکەڤینە هەر شەرەکی دگەل حکۆمەتێ[٣٧٢].

هەرچەندە هێزێن حکۆمەتێ جهێن خۆ ل دەڤەرێ ب تایبەت ل ئەترووشێ قاهیمکربوون، رەبیعە و خەندەك و چەپەرێن خۆ ب باشی کولابوون، لێ هێزێن پێشمەرگەی ب سەرکردایەتیا حسو میرخانی و ساکو کالنجیێ بارزانی و فەرەج عەبدالی شیان د چەند رۆژەکاندا دەست ب سەر دەڤەرێدا بگرنەڤە پشتی کو زیانێن باش گەهاندینە لەشکەر و جاشێن حکۆمەتێ[٣٧٣]. و پێشمەرگە ژ بیبادێ بەرەف پێش چوون هەتا گەهشتینە بنگەهێ قەیسەریێ، ئەو ژی پشتی هێزێن دوژمنی د رێکا خۆرا رامالین[٣٧٤].

ل داویا مەها چریا ئێکێ ١٩٦٣ێ ژ ئەنجامێ ناکوکیان ددگەل موسلح جەلالی سەرا دەستەلاتی عەقید جەلال بالەتە ژ دەڤەرێ دەرکەت و چوو بارەگایێ بارزانی، هەژیە بێژین موسلح جەلالی ب درێژیا ژیێ خۆیێ سیاسی ب عەشقا دەستەلاتی و خۆ ب مەزن زانینێ هاتیە نیاسین هەکە ئەڤ چەندێ ببیتە ئەگەرێ شەری ژی[٣٧٥].

هەروەسان پێشمەرگەیێن شیوعی ب هاریکاری و هەڤکاریا هێزا هرمزێ مەلك چکوی د دەمێن جودا جودایێن ڤێ قوناغێدا چەندین کەمین ل بەر هێزێن حکۆمەتێ ڤەدان و ل چەند جهان کەتنە شەر و لێکدانان دگەل لەشکەر و جاشێن حکۆمەتێ کو گرنگترینی ڤان لێکدانان ئەڤە بوون:

١- ب سەرکردایەتیا ئەمینێ عەبدوللایێ مزووری هێرشەك برنە سەر بنگەهێ پۆلیسان ل تلسقفێ و دەست دانا سەر گەلەك چەك و فیشەکان و دو پولیس ژی گرتن.

٢- هێرشەك بۆ سەر سەریەکا لەشکەرێ حکۆمەتێ ل دەوروبەرێن شێخان و دەست ب سەرداگرتنا ترومبیلەکا چەکی و ب دیلگرتنا دو سەربازان پاشتر هەردو ئازادکرن.

٣- هێرش بۆ سەر رەبیعا جاشان ل سەرێ گرێ سۆری و ناچارکرن کو برەڤن و جهێن خۆ بەردەن.

٤- هێرش بۆ سەر بنگەهێن جاشان ل (چاپانگین) دەوروبەرێن گوندێ مرێبا و ئەو ناژی ناچارکرن جهێن خۆ بەردەن[٣٧٦].

وەك کارڤەدانەك بەرامبەر وان بویسەیان و هێرشان یێن دهاتنە سەر یەکەیێن لەشکەرێ عیراقێ ل قەزا شێخان ب تایبەت ل دەڤەرا مرێبا عەبدولکەریم فەرحانێ سەرکردێ فرقا ئێکێ ل ١٧ چریا دووێ ١٩٦٣ێ ژ سەرۆکئەرکانێ فرقێ و رێڤەبەرێ تۆپخانا وێ خواست هێزەکا هەڤسەنگ ژ سەرباز و جاشان و بەتاریەکا تۆپان و رووماڵەکا ئەسمانی بێنەبەرهەڤکرن داکو هێرشەکێ ببنە سەر دەڤەرێن دکەڤنە ژوورێ گوندێ مرێبا، ل سپێدەیا ١٨ چریا دووێ ڤێ هێزێ و دگەل واندا رێڤەبەرێ تۆپخانێ وەك راوێژ کار دارێ و د ئێڤارا هەمان رۆژدا زڤرینەڤە پشتی کو چەند گوندەکێن دیارکری ل دەڤەرێ تۆپبارانکرین[٣٧٧].

سەرەرای ئەو کاودانێ بەرتەنگێ ژ ئەنجامێ شەری د ناڤبەرا ١٠ حزیرانێ- ١٨ چریا دووێ ١٩٦٣ کوردستان تێدا دژیا، بەلێ سەرکردایەتیا شۆرشێ ئالیێ راگەهاندنێ پشتگوهڤە نەهاڤێتبوو، د سەر وان هەمیوو کاودانێن دژوارێن شەرێ چەکداری و هێرشێن درندانە بۆ سەر کوردستانێ سەکردایەتیا شۆرشێ شیا یەکەمین ئێزگەی د دیرۆکا بزاڤا رزگاریخوازا کوردیدا ل ٢٠ تەباخا ١٩٦٣ێ ب ناڤێ دەنگێ کوردستانا عیراقێ (صوت کردستان- العراق) دامەزرینیت، ئەڤ ئێزگەیە چاکترین ئامرازێ پەیوەندیێ بوو دگەل خەلکێ کوردستانێ و گەهاندنا نووچەیێن شۆرشێ بۆ وی خەلکی و خەلکێ تەڤایی جیهانێ. ژ دەسپێکا دامەزراندنا وێ هەتا پێکهاتنا

١١ێ ئادارا ١٩٧٠ێ چەندین کەسان ژ خەلکێ بادینان د ڤی ئێزگەیدا کار کرییە ژ وانا: سالح یوسفی، نوری محەمەد ئەمین ئەترووشی، ئەکرەم رەشید ئاکرەیی، شەوکەت ئەحمەد ئاکرەیی، محەمەد سالح ئاکرەیی، دکتور سەدیق ئەترووشی، شێخ عەلی غیاسەدین نەقشەبەندی، ئەحمەد جەزراوی، دکتور حەمید ئاکرەیی، ئەکرەم عیزەت ئامێدی، محەمەد ئەمین ئاکرەیی (ئاغوك) و هندەکێن دی[٣٧٨].

ل مەها تەباخا ١٩٦٣ ل دووڤ پێشنیازا توما توماسی حافز قازی و هەژاری موکریانی ب هاریکاریا گەنجێن بنکەهێ دێرا رەبان هرمزی ل چیایێ ئەلقوش بەلاڤۆکەك ب ناڤێ (صوت الانصار) د دوازدە بەرپەرێن (فولسکاب)دا بەلاڤکر، هژمارا دانەیێن وێ کو ب دەستی دهاتەنڤیسین گەهشتە (٣٠) دانەیان و ل سەر بارەگایێن پێشمەرگەی دهاتەبەلاڤکرن، ناڤەرۆکێ وێ ل دور روودانێن بەرۆکێن شەری و تاوان و کارێن دوژمنکارانە یێن رژێمی بەرامبەری خەلکێ کوردستانێ بوو زێدەباری گوتار و شرۆڤەکرنێن سیاسی ب مەرەما بلندکرنا ئاستێ رەوشەنبیریێ خەلکێ دەڤەرێ و پێشمەرگەی. بریار بوو ئەڤ بەلاڤۆکە هەیڤێ دو جاران بێتەبەلاڤکرن، بەلێ ب هژمارا ئێکێ ب داویهات ئەو ژی ژبەر چوونا هەژاری بۆ بارەگایێ بارزانی[٣٧٩].

## چوار: کودەتا ١٨ چریا دووێ ١٩٦٣ێ:

دەستەلاتداریا حزبا بەعس ل بەغدا پتر ژ (٩) هەیڤ و (١٠) نەڤەکێشا، ل مەها چریا ئێکێ ١٩٦٣ێ هەڤرکیێ د ناڤبەرا سەرکردایەتیا وێ دا سەرهلدا، د دەمەکێ کورتدا ئەڤ هەڤرکییە بۆ ناکوکییەکا دژوار د ناڤبەرا دەستەکا عەلی سالح ئەلسەعدی و ئەحمەد حەسەن ئەلبەکری دا، ئەڤ چەندە ژی هاندەر بوو سەرۆکۆمار عەبدولسەلام عارف ل ١٨ چریا دووێ دەستەلاتی بگریتەدەست و بەعسییان بدەرێخیت و ژ حوکمداریێ دوور بێخیت، شەرێ حزبا بەعس یێ ئەو پەری هۆڤانە بەرامبەری گەلێ کورد و نەشیانا وان بۆ ژناڤبرنا بزاڤا کوردی، زێدەباری پرسگرێکێن ناڤخۆیی یێن وان بخۆ، گرنگترین ئەگەرێن کەتنا حکۆمەتا کودەتایا ٨ شباتا ١٩٦٣ێ بوون.

سەرکردێ فرقا ئێکێ یا لەشکەرێ عیراقێ ل مووسلێ عەبدولکەریم فەرحانی ئاگەه ژ کودەتایێ هەبوو و یێ پشکدار بوو دگەلدا، ئەو د وێ باوەرێدا بوو کو شۆرشا کوردان مەزنترین ئاریشەیە بەرسنگێ حکۆمەتا کودەتایێ بگریت، لەوما ژی ئەو د وێ باوەرێدا بوو ب چ رەنگەکی خۆ ب لاواز دیارکرنەکێ یان خەمساریەکێ یان ئاسانکاریەکێ بەرامبەری شۆرشا کوردان نیشانەدەن.

هندی پایوەندی ب هەلویستی ل مووسل ڤە هەی ل سپێدەیا ١٨ چریا دووێ گاردێن نەتەوەیی باژێر کونترۆلکر، هوشداری دان و دەست ب کریارێن دژ کرن، ئەڤە ژی هێز بەیانا ئێکێ یا کودەتایێ ب هاریکاریا لەشکەری و پولیسان نەهاتیە راگەهاندن، ب مەرەما بەرسنگگرتنا بەعسییان فەرماندێ فرقێ ب تەلەفونێ پەیوەندی ب کەرتێ دهۆکێ ڤە کر و ژ فەرماندێ لیوا (١٤) ل دهۆکێ عەمیدێ روکن تەها محەمەد ئەمین خواست چەند تانکەکان (دەبابەیەکان) بلەز بهنێریتە مووسلێ، ل ئێڤارا ١٨ چریا ئێکێ تانك گەهشتنە ناڤ باژێری و د هەمان دەمدا دو مودەریعەیێن ژ کەرتێ شێخان هاتین گەهشتنە بارەگایێ فرقێ، د بەرامبەر گاردێن نەتەوەیی پەیوەندی ب فەهدولشاعر سەرکردێ هێزێن سووری کر کو بێتە هاریکاریا وان، بەلێ سەرکردایەتیا فرقێ پشتی کو پێرابوونێن بلەز گرتینە بەر شیان سەروبەری کونترۆل بکەن و گاردێن نەتەوەیی و ئالیگرێن وان ژ چەك بکەن، و ل ٢١ چریا دووێ سەرکردێ فرقا ئێکێ وەك وەزیرێ ئیرشاد (راگەهاندن)ێ هاتەدامەزراندن[٣٨٠].

عەبدولسەلام عارف ب دوژمناتیەکا روو ب روو بەرامبەری بزاڤا نەتەوەیا کوردی هاتبوو نیاسین، پتر ژ گەلەکێن دی سەرگەرمێ دەسپێکرنەڤا شەری بوو ل ١٠ حزیرانا ١٩٦٣ێ و ژ وان کەسان بوو یێن هاندانا ژ ناڤبرنا یەکجاریا بزاڤا کوردی دکرن، لێ سەرەرای ڤێ چەندێ ل رۆژێن بەراهیێ یێن کودەتایێ وەسان

راگەهاند کو یێ بەرهەڤە بۆ پێکهاتنێ دگەل کوردان، ب مەرەما دیارکرنا نیازپاکیا خۆ داخواز ژ حکۆمەتا سوریێ یا بەعسی کر لەشکەرێ خۆ یێ ب ناڤێ (لیوا یەرموک) ژ بادینان ڤەکێشیت،[381] ب کریار ئەو لیوایە ل دەسپێکا کانوونا دووێ ١٩٦٤ێ هاتەڤەکێشان[382]. د راستیدا عەبدولسەلام عارف ژ وێ چەندێ دترسیا کو بەعسی مفای ژ وێ لیوایێ وەرگرن بۆ زڤرینەڤێ بۆ سەر دەستەلاتی، ژ ئالیەکێ دیڤە حکۆمەتا عیراقێ پلان بۆ وێ چەندێ دارشتبوو کو لەشکەرێ مصری پشکداریێ د شەرێ شۆرشا کوردی دا بکەت، ئەڤە ژی د سەرەدانا وەزیرێ دەرڤە صبحی عەبدولحەمید بۆ قاهیرە ل ٩ کانوونا ئێکێ ١٩٦٣ێ دیار بوو دەمێ د ڤێ سەرەدانێدا ژ مصرێ خواستی هێزێن خۆ ڤرێکەتە عیراقێ بۆ کونترۆلکرنا سەروبەری[383]. ب هەر رەنگەکێ هەبیت عەبدولسەلام عارفي ل ٢٨ چریا دووێ بەیاننامەیەك ئارستەی گەلێ کورد کر تێدا هاتیە: داخوازێ ژ هەموو وان کەسان دکەین یێن بێن چەك دژی حکۆمەتێ و لەشکەری هەلگرتی یان کریارەك کری کو ببیتە ئەگەرێ تێکدانا ئارامی و تەناهیێ دەسپێشخەریێ بکەن و خۆ و چەکێ خۆ رادەستی حکۆمەتێ بکەن و ئەز پەیمانێ ددەم کو دێ ژ وان خوش بم. هەژیە بێژین بەری ڤێ بەیاننامەیا خۆ رابگەهینیت بەرامبەری سەرۆکێن جاشان سویند خواربوو کو د دەمێ هەفتیەکێدا دێ (پشتەرێبوونا کوردی) ژ ناڤبەت[384].



ئەحمەد جەرجیس ١٩٣٩ - ١٩٨٣

پشتی کو چ بەرسڤەك ژ گەفێن خۆ وەرنەگرتی، بەردەمی دا شەری دژی شۆرشا کوردستانێ، ب مەرەما بهێزکرنا مورالا لەشکەرێ خۆ عەبدولسەلام ب خۆ سەرەدانا کوردستانێ کر و ل دەسپێکا کانوونا ئێکێ ١٩٦٣ێ ل سلێمانیێ راگەهاند کو: ئە و رێکێ نادەت دەولەتا سەهیونیا دووێ ل سەر خاکێ عەرەبان بێتەدامەزراندن و ئەو ب چ رەنگان رێکێ نادەت ئوتونومی بدەنە کوردان[385]. و پشتی کێمتر ژ هەیڤەکێ سەرۆکاتیا دادگەها لەشکەریا لەشکەرێ ئێکێ (٦٦) گرتیێن سیاسیێن پارتی ئەوێن ل تەباخا ١٩٦٣ێ هاتینەگرتن بۆ دەمێن جودا جودا ب زیندانێ سزادان کو پرانیا وان ژ خەلکێ دەڤەرا بادینان بوون، ژ وانا: محەمەد خدر ئوسمان ئێزدی، شەوکەت ئاڤدەل عەبدولکەریم، میرخان محەمەد ئەمین میرخان، حسێن حەجی بابە شێخ، اوغز عەلی، یوسف بنیامین یوسف، عائیشا محەمەد عەبدوللا ستی، محەمەد عەلی یونس (تۆڤی)، عەلی محەمەد میری، بۆزی ئەحمەد عەلی، عیسا محەمەد خدر و صالح حامد عەلی[386].

د دەمەکیدا کو عەبدولسەلام د خوری و گەف دکرن و فشار دئێخستنە سەر سەرکردایەتیا شۆرشا کوردستانێ داکو بێ مەرج چەکێن خۆ دانن و خۆ رادەست بکەن، د ڤی دەمیدا پێشمەرگەی چالاکانە درێن خۆ ل لەشکەرێ عیراقێ دادان، ل سەر جادەیا دهۆك- مووسلێ هێرش دبرنە سەر رەبیعە و کاروانێن لەشکەری و دەست ب سەردا دگرت، ل داوییا چریا دووێ ١٩٦٣ێ هێزا هرمزێ مەلك چکوی سێ بویسە

ل بەر هێزێن لەشكەری سوری كو بەتالیۆنەكا وان ل گوندێ دلبێ و ئالوكا بوو ڤەدان و زیانێن مەزن و بئێش گەهاندنێ، وەك بەرسڤدانەك ل سەر ڤان بویسەیان هێزێن لەشكەرێ سوری یێن ل ئالوكا ب هاریكاریا بەتالیونەكا عیراقی كو بارەگایێ وێ نێزیكی دهۆكێ (فرۆشگەها مازی یا نها)بوو هێزێن خۆ بەرهەڤكرن دا تولا خۆ ژ پێشمەرگەی ڤەكەن.

ل ئێڤارا رۆژا ٣٠ چریا دووێ ئێكێ ١٩٦٣ێ هرمزێ مەلك چكوی داخواز ژ هاریكارێ خۆ شەعبان حەسەن محو ئێتویتی كر هێزەكا پێشمەرگەی بەرهەڤ بكەن دا كو بویسەكێ ل بەر وێ هێزا حكۆمەتێ ئەوا بریارە ژ مووسل بەرەف دهۆكێ بهێت ڤەدەن، ل ئێكێ كانوونا ئێكێ هێزەكا پێشمەرگەی دگەل پێشمەرگەیێن حزبا شیوعی بویسا خۆ ل نێزیكی گوندێ ئالوكا ڤەدا، د هەمان دەمدا سەركردێ ڤێ كریارێ هرمزێ مەلك چكوی ژ خەلكێ گوندێ باختمێ خواست هێزەكا چەكدار وەك یەدەك بۆ دەمێ پێدڤی ئامادەبكەن.

هێزێن پێشمەرگەی بویسا خۆ ل هەردو ئالیێن جادێ ڤەدا، دەمێ كاروانێ هێزا حكۆمەتێ كەتیە د سنوورێ بویسێدا، ژ هەردو ئالیانڤە ئەو گوللە بارانكرن، (٢٤) سەرباز و ئەفسەر هاتنەكوشتن و (١٤)ژی هاتنەكوشتن، دەست بسەر (٦) ترومبێلێن لەشكەریێن مەزن (زیل) و (٣٥) تڤەنگان و (٦) دەبانجە و رەشاشەكا فیكەرس و گەلەك دەبانجێن رۆناهیێ و بۆمبێن دوكێلێ و قەبارەكێ فیشەكاندا هاتەگرتن. هێزێن سوری یێن ل ئالوكا هەر زوو د هەوارا كاروانێ حكۆمەتێ هات، بەلێ پێشمەرگە ب دەسكەت و ئەسیرێن خۆ ڤە زوو بەرەف چیایێ زاوا ڤەكشیان، د دەمێ ڤەكشیانێدا هرمزی ژ هاریكارێ خۆ خواست بچیتە گوندێ كەلەبەدرێ و ئەو ب خۆ ژی دگەل شەش پێشمەرگەیان زڤرینەڤە جهێ بویسە لێ ڤەدای و ئەو شەش ترۆمبێلێن (زیل)سوتن، بەلێ د دەمێ ڤەكشیانێدا بۆ نهالەكا نێزیكی چیایێ زاوا كەتنە بەر گوللەیێن بویسەكا هێزێن دوژمنی و د هەمان دەمدا هێزەكا مغاویران

(سەربازێن تایبەتێن مەشقپێكریێن حكۆمەتێ-یان كوماندوس) ژی گەهشتنە وی جهێ و شیان هرمزی و پێنج پێشمەرگەیێن وی یەك ژ وان حەنا عودیشو ئاكرەیی بوو بكوژن، ب هاتنا تاریا شەڤێ پێشمەرگەی كوشتیێن خۆ راكرن و ل گوندێ سینا ڤەشارتن، و تەرمێ پێشمەرگەیێ شەشێ ب ناڤێ حەسەن لوینی گراڤی ژ بێت شەباب- ئەلكێ یا باكوورەێ كوردستانێ‌كەتە دەست هێزێن لەشكەرێ سوری و ب مەرەما ترساندن خەلكێ و بەلاڤكرنا سەهما خۆ ددلێ خەلكێ دەڤەرێدا بۆ دەمێ دو رۆژان ب پرا ئالوكا ڤە هەلاویستن. پشتی شەهیدبوونا هرمزێ مەلك چكوی پسمامێ وی (طلیا شمعون) سەركردایەتیا هێزا گرتەدەست[٣٨٧].

## پێنج: پێكهاتنا راوەستاندنا شەری:

هندیكە عەبدولسەلام عارف بوو باوەری ب شەر راوەستاندنێ و دانوستاندنان دگەل سەركردایەتیا شۆرشا كوردستانێ و بجهئینانا داخوازێن وێ نەبوو، بەلێ شۆرشێ ئەو ناچار كربوو هەلویستێ خۆ دەربارەی شەری ل كوردستانێ بگۆهریت، ژبەركو گەهشتبوو وێ باوەرێ كو لەشكەرێ وی نكاریت هێزا پێشمەرگەی ژناڤببەت، ژ ئالیێ دیڤە وی باش دزانی كو بنیاتێ دەولەتا وی ل سەر هاتیەئاڤاكرن بنیاتەك لاوازە، ژبەر ڤێ چەندێ وی دڤیا ب رێكا شەر راوەستاندنێ دەستەلاتێ خۆ قاهیم بكەت و دوژمنێن خۆ ب تایبەت بەعسییان و ئالیگرێن وان ژ ناڤببەت، ب ڤی رەنگی ناچار بوو دانوستاندنان بكەت، هەرچەندە بارزانی ژی باوەری ب وی نەبوو و هەردەم ب (عدو السلام) ئانكو دوژمنێ ئاشتیێ ناڤدكر، لێ ئەو ژی ژبەر وی سەروبەرێ ئابووری جڤاكیێ دژوار بەرتەنگێ شۆرش تێدا دژیا رازی بوو دانوستاندن بێنەكرن، زێدەباری ڤێ چەندێ پێشمەرگە ژی پشتی ئەو هەموو شەرێن دژوارێن دگەل هەردو رژێم و لەشكەرێن عیراقێ و سوریێ كرین پێدڤی ب بیهنڤەدانەكێ بوو.

یا گرنگ ئەوە پەیوەندیێن ئاشكرا و نهێنیێن د دەمێ دو هەیڤاندا د ناڤبەرا هەردو ئالیاندا هاتینەئەنجامدان

ب پێکهاتنا شەر راوەستاندنێ یا ١٠ شباتا ١٩٦٤ێ ب داویهات، ئەڤ پێکهاتنە تنێ مناوەرەك و رێك بوو بۆ هەردو ئالیان کو مفای ژ دەمی وەرگرن، ل جەم ئالیێ کوردی پێکهاتن راگەهاندنەکا دەسپێکی بوو هەروەك بارزانی پەسنا وێ کری، هەرچەندە تێدا بریار ل سەر هندەك مافێن نەتەوەیێن کوردان هاتبوو دان، بەلێ پرانیا هەرنەهـ بەندێن پێکهاتنێ ل دور چارەسەریا ئەنجام و ڤەرێژێن شەری بوون، نە ل دور چارەسەریا دۆزا کوردان بوون وەك پرسگرێکەك سیاسی نەتەوەیی[٣٨٨].

پشتی راوەستیانا شەری کوردان هندەك دەسکەفت دەستڤەئینان ژ وانا: ل ١٢ شباتێ ڤەکێشانا لەشکەرێ خۆ ژ کوردستانێ راگەهاند، ل ١٤ شباتێ ئەوێن مایی ژ شاندێ کوردییێ دانوستاندنان هاتنە ئازادکرن کو بەروڤازی دگەل هەموو بنەمایێن رەوشتی و سیاسی هاتبوونەگرتن ئەو ژی هەریەك ژ: سالح یوسفي، شاخەوان نامق، عەبدواحسێن فەیلی، عەگید سەدیق و مستەفا عەزیز بوون، هەروەسان چەندین کەسێن دی ژ زیندانیێن سیاسیێن کورد هاتنەئازادکرن، ناڤدارترینێ وان ئەفسەرێ تۆپخانێ عەقید عەبدولرەحمان قازی (خەلکێ دهۆکێ) بوو، هەروەسان گەلەك ژی زڤراندنەڤە سەر کارێن وان، سەرژنوو ئاڤاکرنەڤا ئەو دەڤەرێن کوردستانێ ئەوێن ژ ئەنجامێ شەری هاتینەخرابکرن و راکرنا دوورپێچا ئابووری ل سەر کوردستانێ ژ بەندێن ڤێ پێکهاتنێ بوون، د ڤێ قوناغا شەر راوەستاندنێدا کۆنگرێ شەشێ یێ پارتی هاتەگرێدان و جڤاتا سەرکردایەتییا شۆرشا کوردستانێ هاتەدامەزراندن[٣٨٩].

چەندین کەسایەتیێن نیشتمانیێن عیراقی پشتەڤانی ل ڤێ پێکهاتنێ کر، ل سەر ئاستێ دەرڤە ژی هەریەك ژ یەکێتیا سوڤیەتی و کۆمارێ عەرەبیێ یەککرتی و جەزائیرێ پشتەڤانیا پێکهاتنێ کر و پێشوازی لێکر[٣٩٠].

خەلکێ بادینان پێشوازی ل پێکهاتنێ کر، ل ١٨ شباتا ١٩٦٤ێ ب دەهان شاندێن خەلکێ سەرەدانا بارەگایێ هێزا دهۆکێ کرن و ب هەلکەفتا جەژنێ و راگەهاندنێ پیرۆزباهی ل ئامر هێزی و بەرپرسێن پارتی کرن، ل ٢ ئادارێ لێژنا ناوچا دهۆکێ داخوازا کۆمبوونەکا بەرفرەها فەرماندێن پێشمەرگەی و کادرێن پارتی ل گوندێ گەلنازکێ کرن، د کۆمبوونێدا بەرپرسێ لێژنێ ئیبراهیم ئاکرەیی داکوکی ل سەر گرنگییا ب سەروبەرکرنا رێزێن پێشمەرگەی و بهێزکرنا رێکخستنێن پارتی د دەمێ دانوستاندن و شەر راوەستاندنێدا کر، هەروەسان ل رۆژا ٣ ئادارێ هژمارەکا زۆرا خەلکێ دەڤەرێ سەرەدانا ئامر هێز عەلی خەلیل خوشەڤی ل گوندێ شاوریکێ کرن و ل وێرێ بریار ل سەر دامەزراندنا لێژنەکا بلند یا پێکهاتی ژ نوونەرێن حزبێ و پێشمەرگەی ب سەرۆکاتیا ئامر هێزی بۆ ب رێڤەبرن و سەرکردایەتییا دەڤەرێ دان، هەر د ڤێ قوناغێدا چەندین شاندێن دەڤەرێ ژ زاخۆ، ئامێدیێ، شێخان، ئاکرێ و دهۆکێ سەرەدانا بارەگایێ بارزانی ل سەنگەسەر کرن و پێگیریا خۆ ب رێبازا وی و سەرکردایەتییا وی دیارکرن[٣٩١].

## شەش: پەیدابوونا دوبەرەکییێ د ناڤ پارتی دیموکراتی کوردستان دا:

مورکرنا پێکهاتنا شەر راوەستاندنێ ل ١٠ شباتا ١٩٦٤ێ ژ ئەنجامێ بۆچوون و شەرۆڤەکرنێن جودا بۆ ناڤەرۆکێ وێ بۆ ئەگەرێ دروستبوونا ئالوزی و دوبەرەکیێ د ناڤ رێزێن پارتی دا، پرانیا ئەندامێن مەکتەبا سیاسی و لێژنا مەرکەزیا پارتی ل پێشیا وان ژی ئیبراهیم ئەحمەدێ سکرتێرێ پارتی دژی پێکهاتنێ بوون ژ بەرکو ل دووڤ بۆچوونا وان کێمترین داخوازێن شۆرشا کوردان دەستەڤەئینانە و بارزانی ب وێ چەندێ گونەهباردکر کو دەست ژ داخوازێ مافێ ئوتونومی بەردایە، و حکومەتێ ژی لبەر نینە دۆزا کوردی چارەسەر بکەت و مەرەما وێ ژ ڤێ شەر راوەستاندنێ تنێ کوشتنا دەمی یە. د راستیدا هەموو ئەڤ چەندە ژ بارزانی لبەر بارزانی د ڤەشارتی نەبوون، بەلێ مەرەما وی یا سەرەکی ژ ڤێ پێکهاتنێ دانا بێهنڤەدانەکێ بوو بۆ کوردان و پێشمەرگەی و

داکو د ڤێ دەلیڤێدا هندەك پێدڤیاتیێن لەشکەری و مەدەنی دەست خوڤە بینن[٣٩٢]. و هەرچەندە وی باوەری ب عەبدولسەلام عارفي نە بوو بەلێ ئەوێ ناچار بوو ڤێ پێکهاتنێ مووركەت، و بەلگە ژی ئەوە کو بارزانی ب خو دەربارەی عەبدولسەلامی دگوت: من چ هیڤیەك ب دانوستاندنان ب عەبدولسەلامێ شوڤێنی نینە و من باوەری نینە کو ئەو دێ مافێن نەتەوەیێن کوردان دەت لێ کاودانێ مەیێ گران و دژوارە و زەخیرێ مە یێ کێمە و چەکێ مە نەیێ باشە، ژبەر ڤان ئەگەران ئەم پێویستی سەردەمەکێ بێهنڤەدان و تەناهیێ ینە[٣٩٣]. و ئەڤ پێکهاتنە تنێ شەر راوەستاندنەك بوو و نە پێکهاتنا ب رامانا پێکهاتنەکا دروست کو پێکهاتن پێ دهێنەنیاسین و تنێ ئەڤە تەکتیکەك بوو[٣٩٤].

ئەوێن د ڤێ قوناغێدا ژ پارتی جودابووین د ناڤبەرا ٤- ٩ نیسانا ١٩٦٤ێ کۆنفرانسەك ل ماوەت گرێدا و بارزانی و رێکخستنێن پارتی ل دەڤەرا بادینان گازی نەکرنە کونفرانسێ، گفتوگو ل دور بەندێن پێکهاتنێ کرن و بریاردان دژ راوەستن ژبەرکو ئیعتیرافە ب شکەستنا شورشێ، یا پتر بوویە جهێ مەترسیێ وانا بارزانی ب وێ چەندێ گونەهبارکر کو یا خو بدەست حکومەتێ ڤە بەردای و یێ کار بو ب داوییانا شورشێ دکەت و هوسان ژی ئەو دبیتە مەترسێ ل سەر حزبێ و ژبەر ڤێ چەندێ ژی بریارا سرکرنا (تجمید)دەستەلاتێ وی و چالاکیا وی یا حزبی دان[٣٩٥].

حکومەتا عیراقی ئەو دوبەرکیا د ناڤبەرا پارتی دا دروستبووی بو خو ب دەلیڤە و مهانە دیت کو داخوازێن شورشا کوردان بجهـ نەئینیت، و عەبدولسەلام عارفي ب رەنگەکی سەرەدەری دکر هەروەك چ رێزێ بو هەستا نەتەوەییا کوردان نەدانیت و ئەو د وێ باوەرێدا بوو کو کورد تنێ پێدڤی ب ئاڤەدانکرنا باکووری (اعمار الشمال) هەنە، تنێ چارەسەرییا وی پێشنیازدکر هەلگرتنا درووشمێ برایینیا موسلمانان (الإخوة الإسلامية) وەك بنیاتەك بو پەیوەندیێن ناڤبەرا کورد و عەرەبان ل عیراقێ، پشتی چەند روژەکان ژ پێکهاتنێ عەبدولسەلام عارفي راگرێ ئەرکانان (العميد الركن) عەبدولعەزیز عوقەیلی ناڤدار ب کەرب و کینا وی بەرامبەری کوردان وەك سوپاسالارێ لەشکەرێ عیراقێ دامەزراند، و ب نهێنی هاتە راسپاردن ب بەرهەڤیێ بو ژناڤبرنا یەکجاریا شورشا کوردان، ئەڤە ب خو نیشانا هندێیە کو سەروککومار نەیێ رشد بوو ل سەر چارەسەرکرنا دوزا کوردی، و دیار بوو کو چ رێزەکێ ل هەستا نەتەوەیی و وەلاتپارێزیا کوردان ناگریت دەمێ ل روژا ٢٢ ئادارا ١٩٦٤ مەدالیا ژناڤبرنا پشتەرێبوونێ ل باکووری (نوط قمع العصيان في الشمال) دایە چەند ئەفسەر و سەربازەکێن عیراقێ یێن مێرخاسییا خو دیارکری د شەریدا دگەل شورشا کوردان، د بەیاننامەیا حکومەتێ ب وێ هەلکەفتێ راگەهاندی هاتییە: "ژ بەر وان قارەمانیا یێن یەکەیێن لەشکەرێ مەیێ هێژا ل باکوورێ خوشتڤی د کریارا ژناڤبرنا پشتەرێبوونا چەتەیێن خائین و پاکژکرنا خاکێ مەیێ خوشتڤی ژ چنگێن جوداخوازێن کرێگرتیێن کولونیالیزمێ نیشادای پێدڤی هاتەدیتن مەدالیەکا نوو ب ناڤێ (مەدالیا ژناڤبرنا پشتەرێبوونێ بێتە دانان)[٣٩٦].

هندیکە دەستوورێ نوویە ئەوێ ل ٢٩ نیسانا ١٩٦٤ێ هاتیەراگەهاندن ب یەکجاری دوزا کوردی پشتگوهڤە هاڤێتبوو و خەلکێ عیراقێ ب پشکەك ژ ئومەتا عەرەبی دابوونە نیاسین، ئانکو مادێ ٣ ژ دەستوورێ ٢٧ تیرمەها ١٩٥٨ هاتبوو ژێبرن، لەوما ژی پارتی ئەڤ دەستوورە ئەگەر بێتە بەراوردکرن ب دەستوورێ ٢٧ تیرمەها ١٩٥٨ێ ب دیکیومێنتەکا پاشڤەروو بەرامبەری کوردان ناڤکر[٣٩٧]. بارزانی ئیعتیراف ب کونفرانسێ ماوەت و بریارێن وی نەئینا و ب کارپێنەکری دا نیاسین ژ بەرکو چ نوونەراتییەکا سەروکێ پارتی تێدا نەبوو، وەك کارڤەدانەك بەرامبەری ڤی کونفرانسی و سیاسەتا حکومەتێ بەرامبەری کوردان داخوازا گرێدانا کونگرێ شەشێ یێ پارتی کر، ب مەرەما بەرهەڤیێ بو کونگرەی ل روژا ٥ گولانا ١٩٦٤ێ سالح یوسفي سەرا دهوکێ

دا و ب مەرەما کۆمبوونێ دگەل عەلی خەلیلی بەرەف مانگێشێ چوو و ژ وێرێ چوو گوندێ پیرۆمەرا، کۆمبوونەکا بەرفرەها پێشمەرگەی و کادرێن پارتی ل وێرێ هاتەگرێدان، د کۆمبوونێدا سەروبەرێ ناڤخۆییێ شۆرشێ هاتەشرۆڤەکرن و داکوکی ل سەر گرنگیا گرێدانا کۆنگرەیێ پارتی هاتەکرن، سالح یوسفي د پەیڤا خۆدا داکوکی ل سەر هەڤگرتنا رێزێن کوردی و هاریکاریا هەڤدو و کۆمبوون ل دوور سەرکردایەتیا بارزانی کر، وەك بەرسڤەك ژی بۆ کۆنفرانسێ ماوەت یێ داخوازا ئامادەنەبوونا کادرێن پارتی یێن دەڤەرا بادینان نەکری، ل رۆژا ١١ گولانێ ب ئامادەبوونا رەمەزان ئاکرەیی و ئەحمەد جەرجیس نوونەرێن لیژنا بەرهەڤیێ بۆ کۆنگرەی هەلبژارتنێن لیژنا ناوچەی ل پیرۆمەرا هاتنەکرن، ل داویا حزیرانا ١٩٦٤ێ نوونەرێن بادینان ب مەرەما پشکداریێ د کۆنگرەیێ شەشێدا چوونە قەلادزێ[٣٩٨].

د ناڤبەرا ١- ٩ تیرمەها ١٩٦٤ێ کۆنگرە ل قەلادزێ هاتەگرێدان، نوونەرێن هەموو لقێن پارتی تێدا پشکداربوون، تنێ ئەوێن ژ پارتی جودابووین ب مهانا هندێ کو کۆنگرەکێ نە شەرعیە تێدا ئامادەنەبوون، هەرچەندە لیژنەکا پێکهاتی ژ عەبدوامەجید ئەترووشی، بەهزاد محەمەد حەسەن بالەتە، عەلی خان سندی و هندەکێن دی ب مەرەما رازیکرن وان بۆ ئامادەبوونێ د کۆنگرەیدا چوونە ماوەت لێ وان هەلویستێ خۆ نەگۆهارت[٣٩٩].

د کۆنگرەیدا کۆمەکا بریاران هاتنەدان، ژ وانا: دوبارە هەلبژارتنەڤا بارزانی وەك سەرۆکێ پارتی، رازینەبوون ل سەر زڤرینەڤا کارگێریا نا ڤخویی یا حکۆمەتێ بۆ دەڤەرێن رزگارکری، هنارتنا بیرئانینەکێ بۆ حکۆمەتێ تێدا داخوازا حوکمێ ئوتونومی بۆ کوردستانێ بێتەکرن، هەروەسان کۆنگرەی کۆنفرانسا (ماوەت) وەك کریارەکا نە شەرعی گونەهبارکر، هەروەسان بریارا دەرێخستنا (١٤) کەسان ژ ئەندامێن مەکتەبا سیاسی و لیژنا مەرکەزیا پارتی ئەوێن ژ پارتی جودابووین دا[٤٠٠].

د ڤی کۆنگرەیدا حەبیب محەمەد کەریم وەك سکرتێرێ پارتی هاتەهەلبژارتن، ژ کادرێن پارتی یێن بادینان هەریەك ژ هاشم حەسەن ئاکرەیی و عەلی شنگالی بۆ ئەندامەتیا مەکتەبا سیاسی سالح یوسفي، نعمان عیسا، عەگید سەدیق، عەزیز ئاکرەیی و رەمەزان ئاکرەیی بۆ ئەندامەتیا لیژنا مەرکەزی هاتنە هەلبژارتن، هەروەسان هەریەك ژ فارس کورەمارکی و سەبری بۆتانی و مەلا سالح حاجی وەك ئەندامێن لیژنا بلندا چاڤدێری و پشکنینێ هاتنەهەلبژارتن[٤٠١].

سەرکردایەتیا نوویا پارتی داخواز ژ جودابوویان کر ئێزگە و چاپخانە و مولکێن دی یێن پارتی یێن ددەستێن واندا رادەستی پارتی بکەن، دەمێ ب ڤێ داخوازێ رازینەبووین، پێشمەرگەی هێرش برە سەر دەڤەرا ماوەت، د ئەنجامدا سەرکردایەتیا جودابوویان دگەل (٤٧٠) کەسان ژ ئالیگرێن خۆ پەنا برە بەر



مام عەلی سەلیم

ئیرانێ، ئیرانێ ژی سەرەرای نەرازیبوونا بارزانی پێشوازی ل وان کر و پشتەڤانیا هەلویستێ وان کر، ئەڤە ژی ژ بەر هندێ بوو کو ئیران دژی پێکهاتنا ١٠ شباتا ١٩٦٤ێ [٤٠٢] بوو، پشتی هەیامەکێ چەندین کەسان ناڤبژیڤانی کر ب مەرەما لێبۆرینا وان و رازیبوون ل سەر زڤرنەڤا وان، ئەو بوو ل مەها تیرمەهـ و تەباخا ١٩٦٥ێ زڤرینەڤە کوردستانێ ژ بلی ئیبراهیم ئەحمەدێ سەرکردێ هەرە مەزنێ جودابوویان.

پشتی کۆنگرەی ئەندامێن لقان و لیژنێن ناوچێن پارتی هاتنەهەلبژارتن، نعمان عیسا بوو بەرپرسێ لقێ ئێك و بەرپرسیا وی هەتا سالا ١٩٧١ێ یا بەردەوام بوو، ژ ئەندامێن لقی یێن هاتینەنیاسین: رەشید عارف، ئەحمەد جەرجیس، عەبدولمەجید، سێ کەسێن دی ژ ئەترووش و هندەکێن دی [٤٠٣]. هندیکە مووسلە سەقایەکێ بێ باوەریێ ب هەڤدو ب سەر ئەندام و لایەنگرێن پارتی دا گرت، ئەرکێ لیژنا ناوچەی یا بەری درووستبوونا دو بەرەکیێ ب داویهات و بەرپرسێ وێ رەشید ئەترووشی بەری کۆنگرەی گەهشتە شۆرشێ و رەمەزان ئاکرەیی جهێ وی گرت، محمد محەمەد (ابو خلیل)، محەمەد عەبدوللا چیچو ئاکرەیی و محەمەد ناصر گۆیی ژ ئەندامێن هاتینەنیاسین یێن لیژنێ بوون، پشتی دروستبوونا دوبەرەکیێ چ لیژنە نەمانە ل مووسلێ، هەتا ل ئەیلوولا ١٩٦٤ێ لیژنا نوو ب بەرپرسیا مەحموود گۆران و ئەندامێن ناڤێن وان هاتینەزانین ئەحمەد محەمەد و محەمەد ناصر هاتەڤەدامەزراندن، ل داویا چریا دووێ مەحموود گۆران گەهشتە ناڤ شۆرشێ و ل داویا ١٩٦٤ێ لیژنا نوو مستەفا ئیبراهیم خوخێ هەسنی (ژ گوندێ تل ابو ظاهر) و ئەندامەتیا ئەحمەد محەمەد، بەشیر حاجی کۆرێ، سلێمان سەید حاجی هەسنی و نوفیق گۆران هاتەپێکئینان، ژ ئەگەرێ پەیوەندیکرنا هندەکان ب رێزێن شۆرشێ و ڤەکێشانا هندەکان ژ ترسێن گرتنێ ڤێ لیژنێ ژی بۆ دەمەکێ درێژ بەردەوامی ب کارێ خۆ نەدا [٤٠٤].

ل دەسپێکا سالا ١٩٦٥ێ هاشم یونس ئەترووشی بەرپرسیا لیژنا ناوچا مووسلێ وەرگرت و هەریەك ژ زەیا هرمز (فەرمانبەر)، مەلا سالح باقوسی، حاجی جاسم زاخۆیی (بەقال)، ئوسمان گۆیی (پۆلیسێ خانەنشین)، فەتحی حەدیدی (ابو عبید) و محەمەد تاهر گـۆران ئەندامێن لیژنێ بـوون و ئەندامێ لیژنا مەرکەزیا پارتی عەبدولمەجید ئەترووشی سەرپەرشتیا رێکخستنێن پارتی ل مووسلێ دکر [٤٠٥].

ل ئامێدیێ لیژنا ناوچەی ژ یوسف محەمەد بێدوهی (بەرپرس){پاشتر گەهشتە جودابوویان} و ئەندامەتیا نەجمەدین یوسفي، مەلا ئەحمەد ئیسلام دوتازایی، تەیب محەمەد عەبدوللا ئەلکیشکی، سەید سالح عەبدولخالق، حەسەن ئەحمەد حەجی شەعبان، سالح محەمەد بناڤی، لازار ئەسخریا، عەلی عوبەیدوللا مایی و محێ دین عومەر گراڤی هاتەپێکئینان [٤٠٦].

ل دهۆکێ لیژنا ناوچەی ژ فارس کورەمارکی (بەرپرس) و ئەندامەتیا میکائیل عەلی سارکی، مەلا عەبدولحەکیم بناڤی، سەعید ئەمین، حەسەن مەحموود بەزاز، عەبدولکەریم فندی، مەلا قاسم کوچەر، محەمەد حەسەن عەبۆ، مستەفا مەرینی، یوسف میرخان و محەمەدێ مەلا شەهابی هاتەپێکئینان [٤٠٧].

ل زاخۆ لیژنا ناوچەی ژ شەعبان سەعید محەمەد (بەرپرس) و ئەندامەتیا مەلا عەبدولغەنی ئیبراهیم، مەلا عەبدولکەریم سوفي، حاجی سادق برۆ گولی، سانیا عەبدولمەجید، عەلی خان حاجی حامد، سەبری بۆتانی، مەلا تەها بۆسەلی و ئیسماعیل حەجی بەدری هاتەپێکئینان، بارەگایێ لیژنێ ل گوندێ بێتاسێ بوو و ئەڤ لیژنەیە هەتا سالا ١٩٦٦ێ یا بەردەوامبوو [٤٠٨].

هندیکە ئاکرێ بە ژ ئەندامێن لیژنا ناوچەی یا وێ قوناغێ هەریەك ژ: محەمەد شەریف، ناجی سەبری، حەمید عەبدوللا، مستەفا سەید موئمین، مام عەلی سەلیم و محەمەد حسکو هاتینەنیاسین،



ب هەمان شێوی ل شێخان ژ ئەندامێن لیژنا ناوچەی یا وێ قوناغێ هەریەك ژ: عەلی جوقی، حسێن بابا شێخ، سلو خدر، ئوسمان عەلی، حەسەن حەجی عیسا سپینداری و مەلا خەلیل (مشەختی) هاتینەنیاسین.

ب هەر رەنگەکێ هەبیت ژهەڤجوودابوون کەتە دناڤ رێکخستنێن پارتی یێن دەڤەرا بادینان ژی، لێ نەیا خوەدی باندۆر بوو، گەلەك ژ ئەندامێن پارتی و پێشمەرگەی خۆدانە دگەل جودابوویان، ژ وانا: ئەحمەد عەبدوللا ئامێدی، عەلی حەمدی بێدوهی، ل ئامێدیێ ژی هژمارەکا نە کێما ئالیگرێن جودابوویان هەبوون، ژ وانا: عومەر حەسەن بامەرنی ئەندامێ لیژنا چاڤدێری و پشکنینا بلندا پارتی، زێدەباری هەموو ئەندامێن لیژنا ناوچا ئامێدیێ ژ بلی مەعسوم ئەنوەر مایی ئەو ژی نوری مستەفا (بەرپرسێ لیژنی)، عارف خالد، حەسەن مستەفا، عەبدولرەحمان عەلی، زەکی حەجی قادر، محەمەد رەشید ئیبراهیم و کادرێ پارتی سەدیق عەلی، پرانییا ئەندامێن لیژنێ خۆ ل مالێن خۆ بێ دەنگکر و خۆ ژ کارێ پارتایەتی دوورگرت و زڤرینەڤە سەر کارێن خۆیێن فەرمانبەریێ، پشتی کۆنگرەیێ شەشێ یوسف ئەحمەد بێدوهی ژی گەهشتە جودابوویان[٤٠٩] ل دهۆکێ ژی هندەك ژ ئەندامێن پارتی خۆ دانە دگەل جودابوویان، ژ وانا: سەلاح محەمەد عەلی عومەر، میکائل تەها، عارف بادی، محەمەد حەسەن عەبو، محەمەد مەلا شەهاب، ئەحمەد عەرەب، رەشیدێ سەعید ئاغای و تێلی گەردی[٤١٠]. فارس کورەمارکی د بیرهاتنێن خۆدا ڤەدگێریت: ئامر هێزێ دهۆکێ عەلی خەلیل ئەز گازیکرمە گوندێ چرانێ، ل وێرێ گۆتە من ئیبراهیم محەمەد ئاکرەییێ بەرپرسێ لیژنا ناوچا دهۆکێ یێ گەهشتییا جودابوویان و پتریا پێشمەرگەیێن پارتی و سەرقۆلێن پێشمەرگەیان ژ بلی حەمۆ کەمەکی یێن داینەدگەل خۆ، بارزانی ژ وی خواستیە

وی بكرن و دەستەسەركری ڤرێكەنە جهم وی[٤١١]. كورەماری د بەردەوامیا ڤەگێرانا خودا دبێژیت: وی تنێ (١٠)پێشمەرگە دگەل خو برن، ژبەركو پرانیا ئەوێن خو داینە دگەل ئاكرەیی ب ئەگە رێ هندێ بوویە كو ئەو بەرپرسێ لیژنا ناوچەی بوویە نە ژ بەر هندێ كو ئەو ئالیگرێن تالەبانی (مەرەم پێ جودابوویانە)بوون، هەروەسان گەلەك ژ وانا كەس و نیاسێن من بوون وەك میكائیل تەها و كەریم فندی و یێن دی و ئەو چوو د بنگەهێ وانڤە ل خواندنگەها پیرۆمەرا و ئیبراهیم ئاكرەیی ژی دگەل وان بوو، ئەو ب تنێ دگەل هندەكان ژ وان روونشت و سەروبەر بو شروڤەكر و گوتە وان ئەو بو گرتنا ئیبراهیم ئاكرەیی هاتیە وێرێ، د ئەنجامدا هەموو رازیبوون ژ بلی میكائیل تەهای و حەفزوللا باجلوری، وان ب باشتر ددیت ئیبراهیم ئاكرەیی ب خو بچیتە بارەگایێ مەكتەبا سیاسی و ئەو وی رادەستی بارزانی بكەن، لێ ئەو ژی ژ هەلویستێ خو پاشگەزبوونەڤە، ب ڤی رەنگی من ئیبراهیم ئاكرەیی گرت و هنارتە بارەگایێ عەلی خەلیلی ل گوندێ شاوریكێ[٤١٢]. ئیبراهیم محمەد ئاكرەیی گەلەك نەما دگەل جودابوویان، پشتی دەمەكی دگەل كومەكا كادران و هندەك چەكی ب ناڤبژیڤانیا هاشم ئاكرەیی بەرپرسێ لقێ ئێك زڤریڤە ناڤ ریزێن پارتی، بەلێ پاشتر هاتەتیرورکرن و بوو ئێك ژ قوربانیێن دوبەركیێ[٤١٣] .

هندی پەیوەندی ب وان كەسانڤە هەی یێن ل ئاكرێ و شێخان و زاخو گەهشتینە جودابوویان ل هەر ئێك ژوان باژێران ژ (٥-١٠) كەسان نەدبوری، پرانیا وان ژی پاشتر زڤرینەڤە ریزێن پارتی.



هژمارەكا پێشمەرگەیێن شورشا ئەیلوولێ

**حەفت: دامەزراندنا جڤاتا سەركردایەتییا شۆرشێ ل كوردستانا عیراقێ**

د ناڤبەرا ئادارا ١٩٦٤- ئادارا ١٩٦٥ێ پێكگۆهارتنا نامە و بیرئینانان و سەرەدانان د ناڤبەرا سەركردایەتییا شۆرشا كوردان و حكۆمەتێ یا بەردەوام بوو، داخوازێن كوردان پێكهاتبوون ژ هەموار كرنا دەستووری كو ئاماژە ب مافێ كوردان ب دەستەلاتەكێ ئوتونومی بێتەكرن، كەركووك و خانەقین و باژێرێن دی بكەڤنە د ناڤ سنوورێن كوردستانێدا، رازیبوون ل سەرندێ كو زمانێ كوردی زمانێ رەسمی بیتن ل كوردستانێ و عیراقێ، تەرخانكرنا پشكەكێ ژ داهاتێ نەفتێ بۆ كوردستانێ، مانا هێزێن پێشمەرگەی و هەلوەشاندنا پێكهاتێن جاشان، دانانا كەسەكێ كورد وەك جێگرێ سەرۆكۆماری و زڤراندنڤا وان عەرەبان ئەوێن ل گوندێن كوردان هاتینەئاكنجیكرن بۆ سەر جهێن ژێهاتین. سەركردایەتییا كوردی باوەر ییەكا موكم هەبوو كو حكۆمەت داخوازێن وان بجهـ نائینیت. پشتی سەرەدانەكا شاندێ حكۆمەتێ بۆ بارەگایێ بارزانی ل ماوەت بارزانی راگەهاند: وان دانەیەك ژ قورئانێ بۆ من كرییە دیاری، و سویند خواریە كو ئەو دێ مافێن كوردان ل عیراقێ بجهـ ئینن، بەلێ ئەز سویند ب قورئانێ دخۆم ئەو باوەریێ ب مافێن مە نائینن، من گۆتە وان هەوە گرێكەك بەرامبەری كوردان هەیە، پەیڤا كوردستان ژ دەڤێ هەوە درناكەڤیت و هوون ب باكوورێ عیراقێ (شمال العراق) ناڤدكەن دێ چاوان باوەریێ ب مافێن كوردان ئینن[٤١٤].

حكۆمەتێ دڤیا ب مژوولبوونێ ب پێكگۆهارتنا نامە و بیرئینان و سەرەدەنان مفای ژ دەمی وەرگریت دا كو دەستەلاتێ خۆ ل كوردستانێ بهێز بێخیت، ل مەها چریا رەنگە دوور پێچەك ئێخستە سەر كوردستانێ، هەروەسان وەزیرێ ناڤخۆیی فەرمانەك دەرێخست كو قەدەغەیە پێشمەرگە بێنە د ناڤ باژێراندا و ئەگەر بەروڤاژی فەرمانێ سەرەدەری كرن بێنە گرتن[٤١٥].

هندی پەیوەندی ب بادینانڤە هەی حكۆمەتێ ئەو مالێن ب زۆری ژ دینارتە دەرێخستین نەزڤراندنەڤە، هەروەسان رازینەبوو (٢٥) گوندێن ل ناحیا حەفت عەشیرەتان بۆ خودانێن وان بزڤرینتەڤە، سەرۆكێن جاشان دەست ب پەیوەندیێ دگەل سوریێ و حزبا بەعس و ئەوێن ژ پارتی جودابووین كر دا كو شەری دەسپێبكەنەڤە[٤١٦]. ل رۆژا ٢٨ نیسانێ دەمێ جیدار (ملازم) عەزیز ئەترووشی ل شێخان سەرەدانا مالا خۆ كری هاتەگرتن، هەروەسان جاشان دو ژ ئەندامێن پارتی ل مووسلێ كوشتن، هەروەسان دەست ب قەدەغەكرنا پێشمەرگەی كرن كو سەرەدانا كەسوكارێن خۆ بكەن ب تایبەت ل ئاكرێ و هندەك ژ جاشان زێدەگاڤی كرە سەر گوندێ بەندا ل مانكێشی[٤١٧].

هەروەسان حكۆمەتێ پرانییا زیندانی و گرتیێن سیاسیێن كورد ئەوێن د ناڤبەرا ١٩٦١- ١٩٦٣ێدا هاتینەگرتن ئازادنەكرن، هەرچەندە بریارا ئازادكرنا وان ل ئادارا ١٩٦٣ێ دەركەتبوو ئەڤە ژی نیشانا نیازخرابیا حكۆمەتێ بوو، هەروەسان رێڤەبەریا هەوالگیریا لەشكەری (مدیرية الاستخبارات العسكرية) ل مووسلێ ل ٢ ئیلوولا ١٩٦٤ێ كۆنگرەك ب سەرۆكاتیا پێشكارێ روكن (مقدم الركن) عەبدولكەریم شەنداه گرێدا، ناڤبری فەرماندا زانیاری ل دوور لڤینێن پارتییان بێنەكۆمكرن و هندی د شیاندا بیت كار بێتەكرن سەخمەرات بەرفرەهكرنا ناكوكییا ناڤبەرا جودابوویان و بارزانی و ناڤ و ناڤونیشانێن ئەندامێن پارتی بێنەدەسنیشانكرن داكو دەمێ پێدڤی دبنێ دەملدەست وان بگرن[٤١٨]. هەروەسان سەركردایەتییا لەشكەرێ چوارێ (فرقة الرابعة) بۆ هەمان مەرەم ژ موتەسەرف (پارێزگار)ێ مووسلێ (وی چاخی شاكر مەحموود ئەلسامەرائی بوو) ناڤێن هەموو ئەندامێن پارتی یێن مووسل و بادینان یێن تومارکری ل رێڤەبەریا ئەمنێ دەمێ هێز پارتی یا مولەتدای و كار ل وان جهان دكر بۆ وان بهنێرن، ئەو بوو (٢٨) لیستێن ناڤێن پارتی ل مووسل، ئاكرێ، شێخان، دهۆك، زاخۆ بۆ هنارتن، ئەو ژی ئەڤەنە:

ژ بەرپرسێن رێكخستنێن پارتی كو ل بەری

| | | | |
|---|---|---|---|
| ٢٤ | عەبدولرەحمان سەید عەلی | کومیسیەر | مووسل |
| ٢٥ | شێخ حسێن ئیبراهیم | مامۆستایێ سەرەتایی | مووسل |
| ٢٦ | سەبری موراد | مامۆستایێ سەرەتایی | مووسل |
| ٢٧ | جومعە حاجی کنجی | مامۆستایێ سەرەتایی | مووسل |
| ٢٨ | فائیق رەشید | خزمەتکار | مووسل |
| ٢٩ | مەلا مەحمود یوسفی | | بەعشیقە |
| ٣٠ | مەلا حەیدی کویی | | بەعشیقە |
| ٣١ | ئیبراهیم رەشید | | بەعشیقە |
| ٣٢ | عومەر میرانی | | بەعشیقە |

بەرامبەری بێ رویمەتکرنا مافێن نەتەوەیێن کوردان ژ ئالیێ حکۆمەتێڤە و زێدەگاڤیێن وێ ل سەر پارتی و کادرێن پارتی و زیرەڤانی و چاڤدێریا بەردەوام ل سەر هەر چالاکیەکا سیاسی یا کوردی، د هەمان دەمدا ژ ئەنجامێ بێ باوەریا بارزانی ب حکۆمەتێ و بەرپرسێن وێ هەرچەندە بارزانی هەردەم دگەل دگەل دانوستاندنان بوویە دا بۆ هەموویان بسەلمینیت کو حکۆمەت نە یا رشدە ل سەر بجهئینانا مافێن کوردان و چارەسەرییەکا ئاشتیانەیا دۆزا کوردی، ژ بەر ڤان ئەگەران و ب مەرەما بجهئینانا بریارێن کۆنگرێ شەشێ یێ پارتی بریار هاتەدان جڤاتا سەرکردایەتییا شۆرشێ بێتەدامەزراندن، ب مەرەما بەرهەڤیان بۆ دامەزراندنا ڤێ جڤاتێ د ناڤبەرا ٢٨-٢٩ ئەیلوولا ١٩٦٤ کۆنگرەیەکێ مللی ل باژێرکێ قەلادزێ هاتەگرێدان و چەندین کەسایەتیێن جڤاکی سیاسی و لەشکەری ژ هەموو ئالیێن کوردستانێ تێدا ئامادەبوون داکو سەروبەری ل کوردستانێ هەلسەنگینن و نوونەرێن مللەتی بۆ پشکداریێ د جڤاتێدا هەلبژێرن، ل دەسپێکا مەها چریا ئێکێ بۆ هەمان مەرەم کۆمبوونەکا دی ل رانیە هاتەگرێدان، تێدا ب بەرفرەهی دووڤچوونا سەروبەری و دەسکەفتێن شۆرشێ هاتەکرن و ل ٤ێ چریا ئێکێ ١٩٦٤ێ بریارا دامەزراندنا جڤاتا سەرکردایەتییا شۆرشێ کو ببیتە بلندترین دەستەلاتێ شۆرشێ هاتەدان.

جڤات ژ ئەندامێن لیژنا مەرکەزیا پارتی و سەرکردێن لەشکەری و سەرۆکعەشیرەت و نوونەرێن پێکهاتێن ئایینی هاتەپێکئینان، میر تەحسین سەعید بەگی نوونەراتیا ئێزدییان دکر، (الاب) خوری پۆلس ژ کلدانان و مار یولاها ئەندراوس (مەترانێ بەرواری) نوونەراتییا مەسیحیان دکرن، زێدەباری ڤانا چەندین کەسایەتیێن بادینان ژ پێشمەرگەی و رێکخستنێن پارتی ئەندامێن جڤاتێ بوون، ژ وانا:.... هاشم حەسەن و رەمەزان موحسن (ژ ئاکرێ)، سالح یوسفی، عەگید سەدیق ئامێدی، گورگیس مەلك چکو، رەشید سندی، عیسا سوار، حسو میرخان، عەلی خەلیل و سلێمانێ حەجی بەدریا ئەندامێن جڤاتێ بوون(٤١٩).

زێدەباری ئەرکێ رێڤەبرن و سەرکردایەتییا کریارێن لەشکەریێن پێشمەرگەی ڤێ جڤاتێ کو بارزانی وەك سەرۆکێ خۆ هەلبژارتبوو، چەندین ئارمانجێن دیتر دابوونە بەر سنگێ خۆ ژ وانا: سەروبەرکرنا ژیانا ئابووری و کارگێری و جڤاکی ل دەڤەرێن رزگارکریێن کوردستانێ. بۆ ڤێ مەرەمێ ل ٩ چریا ئێکێ ١٩٦٤ێ پێنج لیژنە: لیژنا لەشکەری، لیژنا دارایی، لیژنا کارگێری، لیژنا دادوەری و لیژنا دەستووری پێکئینان،

چەندین کەس ژ دەڤەرا بادینان ئەندام بوون د وان لیژناندا، ژ وانا: عەزیز رەشید ئاکرەیی، هاشم حەسەن، شەوکەت (ژ ئاکرێ) و سلێمانێ حەجی بەدریا و رەشید سندی (ژ زاخۆ) و عەبدولوەهاب ئەترووشی و عەقید تەها بامەرنی[٤٢٠].

یەکەم پێنگاڤا جڤاتا نوو دامەزراندی هاڤێتی پێشکەشکرنا بیرئینانەکێ (یاداشتەکێ) بوو بۆ حکۆمەتێ ل ١١ چریا ئێکێ ١٩٦٤ی دەربارەی مافێن نەتەوەیێن کوردان، بیرئینان یا مۆرکری بوو ژ ئالیێ بارزانی ڤە، عەگید سەدیق و شەوکەت ئاکرەیی ئەڤ بیرئینانە دگەل خۆ برە بەغدا، تێدا رەخنەکا دژوار ل حکۆمەتێ هاتبووگرتن کو ل دووڤ داخوازێن مللەتێ کورد نەهاتینە و داکوکی ل سەر هندێ هاتبووکرن کو کورد پێگیرن ب دەستەڤەئینانا مافێ ئوتونومی و هەموارکرنا دەستووری[٤٢١].

دەمێ حکۆمەتێ ئەو بیرئینان پشتگوهڤە هاڤێتی، جڤاتا سەرکردایەتییا شۆرشێ دەست ب دامەزراندنا کارمەندێن کارگێری و دارایی و دادوەری ل دەڤەرێن رزگارکری کر، هندی پەیوەندی ب بادینانڤە هەی، فەرقودێ کارگێری ب ڤی رەنگی هاتەدانان:

١- عەبدوللا حەجی بەدریا، قائیمەقامێ زاخۆ، دەمێ هاتیەڤەگوهاستن مەلا سالح حەجی سلێڤانەیی کو رێڤەبەرێ ناحیا باتووفا و ئەندامێ لقێ ئێك بوو جهێ وی گرت.

٢- نەجمەدین یوسفي، بەرپرسێ لیژنا ناوچا ئامێدیێ، قائیمەقامێ ئامێدیێ.

٣- ئەحمەد جەرجیس ئەترووشی، ئەندامێ لقێ ئێك، قائیمەقامێ دهۆکێ.

٤- مەجید جەرجیس ئەترووشی، ئەندامێ لقێ ئێك، قائیمەقامێ شێخان

هندیکە رێڤەبەرێن ناحیان بوون ب ڤی رەنگی هاتنەدەسنیشانکرن:

١- شەعبان سەعید، ئەندامێ لیژنا ناوچا زاخۆ، رێڤەبەرێ ناحیا سندی (شەرانش).

٢- مەلا سالح حەجی سلێڤانەیی، رێڤەبەرێ ناحیا گولی (باتووفا).

٣- مەلا حەیدەر ئەحمەد، رێڤەبەرێ ناحیا سلێڤانەیی (ئاسهێ).

٤- عەلی جوقی، رێڤەبەرێ ناحیا ئەترووش.

٥- محەمەد حەسەن محەمەد بالەتە، رێڤەبەرێ ناحیا نەهلێ (دینارتە).

٦- فاروق سەعید بەگ، رێڤەبەرێ ناحیا ئەلقوش.

٧- یوسف میرخان، رێڤەبەرێ ناحیا زاویتە.

٨- فارسێ حەجی حەسەنی، ئەندامێ لیژنا ناوچا دهۆکێ، رێڤەبەرێ ناحیا مانگێش.

٩- میکائیل عەلی سارکی، ئەندامێ لیژنا ناوچا دهۆکێ، رێڤەبەرێ ناحیا سێمێلێ.

١٠- حەسەنێ حەجی شەعبانێ ئامێدی، ئەندامێ لیژنا ناوچا ئامێدیێ، رێڤەبەرێ ناحیا سەرسنکێ.

١١- مەلا ئەحمەد ئیسلام نێروەیی، ئەندامێ لیژنا ناوچا ئامێدیێ، رێڤەبەرێ ناحیا بەرواری بالا.

١٢- یوسف محەمەد بێدوهی، ئەندامێ لیژنا ناوچا ئامێدیێ، رێڤەبەرێ ناحیا نێروە رێکان (بێبۆ)[٤٢٢].

وەك بجهئینانا بریارێن جڤاتێ چەند خالەکێن گۆمرکێ هاتنەڤەکرن، وەك نموونە خالا گۆمرکێ ل دەڤەرا (هەرفتە) ل قەزا زاخۆ، هندیکە وارێ ساخلەمیێ یە، ژبەر کێمیا نوشداران د ناڤ شۆرشێدا شۆرش ناچاربوو پشتگەرما فەرمانبەرێن ساخلەمیێ و برینپێچان و هەرکەسەکێ هندەك زانیارێن نوشدارێ هەبن بیت، چەندەك ژ ڤان کەسان ل دەڤەرا بادینان د ڤێ قوناغێدا ناڤداربوون و جهێ خۆ د خزمەتا خەلکێدا د وارێ نوشدارییێدا گرت، ژ وانا حەسیب مەنصور زولفا ئەلقوشی، موش عیدوش موشێ نەخوشخانەکا مەیدانی ل گوندێ قومرێ یێ دەڤەرا بەرواری برێڤەدبر، ب مەرەما پرکرنەڤا ڤێ ڤالاهیێ شۆرشێ چەند خولەکان نوشدارێ ڤەکرن[٤٢٣]. هەروەسان ئیشو ئوراهای ل دەڤەرا دینارتێ و ئیبراهیم بەرخۆی و بێن دی د ڤی واریدا رۆلێ

خۆ گێرا، هەتا سالا ١٩٦٧ێ ل سەرانسەری دەڤەرێن رزگارکرینێن سەر ب بادینانڤە چ دکتور لێ نەبوون، هەتا د ڤێ سالێدا نوشدار سەعید قرمزی گوبراك (دکتور شڤان) و هوشیار (دکتور فایق) گەهشتینە رێزێن شۆرشێ هەردو ژی ژ باکوورێ کوردستانێ بوون[٤٢٤].

هندی پەیوەندی ب کاروبارێن پەروەردە و فێرکرنێ ڤە هەی ل سەرانسەری دەڤەرێن رزگارکری سێ رێڤەبەریێن پەروەردێ هەبوون، ژ وانا رێڤەبەریا پەروەردا دهۆکێ دگەل هێزا زاخۆ بوو و شەفیق محەمەد سەعدوللا رێڤەبەرێ وێ و محەمەد عەبدوللا هاریکار بوون، سەرەرای کاودانێن سەخت و دژوار هەتا ئاستەکی فێرکرن یا بەردەوام بوو دا کو نەخویندەواری پتر ل ناڤ خەلکی بەلاڤنەبیت، چەند خولەك ل سەر ئاستێ شۆرشێ بۆ بەرهەڤکرنا مامۆستایان هاتنەڤەکرن و ل پاییزا ١٩٦٨ێ (پەیمانگەها مامۆستایێن شۆرشێ) هاتەڤەکرن و چەند کەسەکان ژ دەڤەرا بادینان پشکداری د ڤێ پەیمانگەهێدا کر و پاشتر بوونە مامۆستا ل خواندنگەهێن دەڤەرێن رزگارکریێن کوردستانێ[٤٢٥].

هندی پەیوەندی ب سەروبەرێ دادوەریێ و دادگەهانڤە هەی زانایێن ئایینی ب ڤی ئەرکی هاتبوونە راسپاردن، کوردستان ل سەر چەند دەڤەرەکێن دادوەری هاتبوو لێکڤەکرن، ل هەر دەڤەرەکێ دادگەهەکا مەدەنی و ئێکا شەرعی هاتبوونەدانان، ژ ڤان دادگەهان: دادگەها شەرعی ل دەڤەرا زاخۆ و دهۆکێ مەلا عەلی بەرۆشکی دادوەر (حاکم)ێ وێ بوو، دادگەها دەڤەرا ئامێدیێ مەلا ئەحمەد ئیسلام نێروەیی دادوەرێ وێ بوو، هەروەسان خوری پۆلس بێداری بەرپرس بوو ژ دۆزێن پەوەندی ب مەسیحیانڤە هەی ل سەرانسەری دەڤەرێن رزگارکری[٤٢٦].

بارزانی ب ئەرکێ سەکردێ گشتیێ هێزێن پێشمەرگەی رادبوو، عەقید نوری مەلا مەعروف سەرۆکئەرکان بوو، ب مەرەما سەرژنوو رێکخستن و دابەشکرنا پێشمەرگەی، هێزێن پێشمەرگەی هەر ژ زاخۆ هەتا خانەقینێ ل سەر سێ پشکان هاتبوونە دابەشکرن، هەر دەڤەرەکێ لەشکەرەك (فرقە) بۆ هاتبوو دانان، بادینان دەڤەرا لەشکەرێ ئێکێ بوو ب سەرکردایەتیا ئەسعەد خوشەڤی، ل بەراهیێ ژ سێ هێزان پێکدهات، هێزا زاخۆ ب سەرکردایەتیا عیسا سوار، هێزا دهۆکێ ب سەرکردایەتیا عەلی خەلیل، هێزا شێخان و ئاکرێ ب سەرکردایەتیا حسو میرخان دولەمەری و پاشتر هێزا ئامێدیێ ب سەرکردایەتیا سەلیم ئەسعەد خوشەڤی هاتەدامەزراندن. هەروەسان دو سەرکردەیان ژ دەڤەرا بادینان سەرکردایەتیا لەشکەرێ دووێ و سێێ ل دەڤەرێن بالەك، دەشتا هەولێرێ، چیایێن سەفین و قەرەداغ و سووورداش و دەڤەرێن سلێمانیێ و کەرکووك و گەرمیان هەتا دگەهیتە خانەقینێ دکرن، ئەو دو سەرکردەیە ژی پێشکارێ روکن (موقەدەمێ روکن) عەزیز ئاکرەیی و (جێدار ملازم) رەشید سندی بوون، هەروەسان هەلبەستڤان سەبری بۆتانی بەرپرس بوو ژ سازیێن پەیوەندیێ (أجهزة الأتصال) و بێ تەلێن شۆرشێ[٤٢٧].

ل مەها ئەیلوولا ١٩٦٨ێ پێکهاتێن هێزێن پێشمەرگەی ب ڤی رەنگی هاتنەرێکخستن: مەفرەزە ژ (٢- ٥) پێشمەرگەیان، دەستە ژ (٩- ١١) پێشمەرگەیان ، پەل (٣٠) پێشمەرگەیان ، لق ژ (١٠٠- ١٢٠) پێشمەرگەیان ، بەتالیون ژ ٤٠٠- ٥٠٠ پێشمەرگەیان ، هێز ژ (١٥٠٠- ٢٠٠٠) پێشمەرگەیان و لەشکەر ژ (٥٠٠٠- ٦٠٠٠) پێشمەرگەیان پێکدهاتن، هەموو سێ لەشکەر بوون سۆپایێ شۆرشگێرێ کوردستانێ پێکدئینان، بارەگایێن وان ل بادینان و بالەك و قەرەداغ بوون، هژمارا لەشکەرێ کوردستانێ بەری ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ گەهشتبوو (٣٠) هزار پێشمەرگەیان ژ ١٢ (هێزان) پێکدهات، ژ وانا هێزێن زاخۆ، دهۆك، ئامێدیێ، ئاکرێ و شێخان، هەروەسان چەند بەتالیونەکێن سەربەخوە هەبوون سەر ب چ هێزانڤە نەبوون، بەلکی راستەخوە سەر ب پشکا لەشکەریا جڤاتا سەرکردایەتیا شۆرشێ ڤە بوون، ئەرکێ وان بوو ب هندەك کریارێن لەشکەری یێن تایبەت و جوری رابن[٤٢٨]. سەرکردایەتیا لەشکەرێ

كوردستانێ راستەخۆ گرێدایی بارزانی بـوو، و چەند ئەفسەرێن كوردێن لەشكەرێ عیراقێ یێن گەهشتینە رێزێن شۆرش دگەل بارزانی بوون ئەو ژی عەقید تەها بامەرنی، عەقید عەبدولرەحمان قازی و پێشكارێ روكن (المقدم الركن) عەزیز ئاكرەیی و ئەفسەرێ پولیسان شێخ رەزا گۆلانی[٤٢٩].

## هەشت: مانگرتنا گشتی ل كوردستانێ و دەسپێكرنەڤا شەری

دەستەلات ل سەر سیاسەتا خۆیا دژی شۆرشا كوردی و ئازراندنا (پارتی) هەر یا بەردەوام بوو، هەتا ئەڤ زێدەگاڤییا وێ گەهشتە پێشمەرگەی ژی و دەست ب كرینا وژدانان و بەرفرەهكرنا دەرزا ڤێكنەكرنێ ل ناڤبەرا جودابوویان و بارزانی كر و چەندین رێ یێن دی بۆ لاوازكرنا شۆرشێ ب كار ئینان، دەستەلاتێ هاریكاری پێشكێشی وان دكر و ئەو دژی سەركردایەتییا بارزانی هاندان، ئەڤە سەرباری ب جهـ نەئینانا چ داخوازیێن كوردان، ئەڤێن خوارێ ژی هندەكن ژ وان پێرابوونێن دوژمنكارییێن دەستەلاتێ بۆ لاوازكرنا شۆرشا كوردی ب كار ئینایی:

ل رۆژا ٧ چریا ئێكێ ١٩٦٤ێ دەستەلاتێ ١٥ پێشمەرگە دەستەسەر كرن دەمێ د مووسل را دەرباز بووین هەرچەندە وان پێشوەخت دەستویری وەرگـرتـبـوون[٤٣٠]، كارڤەدانا سەركردایەتییا پێشمەرگەیێ بادینان ژی ئەو بوو عیسا سوار هژمارەكا هێرشان بكەتە سەر سەربازگەهەكا لەشكەری ل دەڤـەرا سندییان و فەرماندێ سەربازگەهێ عەقید یەحیا رەجەب و نەهـ پۆلیس و سێ ئەندازیارێن ئەلمانی یێن رێیا ستراتیژی چێ دكرن دەستەسەر بكەت وەك تۆلڤەكرن بۆ دەستەسەركرنا وان پێشمەرگەیان[٤٣١].

حكۆمەتێ نە تنێ عەرەبكرن بۆ دژایەتیكرنا شۆرشا كوردی ب كار ئینا، بەلكی ژ وێ چەندێ ژی دەرباز بوو و پرۆپاگەندا هندێ دكر كو هژمارەكا عەشیرەتێن كورد عەرەبن، بۆ ڤێ چەندێ ژی عەبدلسەلام عارف پێكۆلا عەرەبكرنا عەشیرەتێ كورد كر ب رێیا زڤراندنا بنەكۆكا وان بۆ عەرەبان داكو ژ پشكداریكرن و هەڤسۆزیكرن و پشتەڤانیكرنا شۆرشا كوردی بێنە دوورئێخستن، وی پەرتووكەك دەرئێخست و تێدا پێكۆل كر ناڤكرنا هندەك عەشیرەتان بگەهینیتە بنەكۆكا عەرەبی، هەر بۆ نموونە، پرۆپاگەندا وێ چەندێ كر كو (مزووری) د بنەكۆكا خۆ دا ژ هۆزا (مضر) یا عەرەبییە و كورد كەسانێن بیانینە هاتینە ناڤ نەتەوێ عەرەبی و دڤێت د ناڤ بۆتكا نەتەوێ عەرەبی دا بێنە حەلكرن و نەمینن[٤٣٢]، هەروەسا ژ بەركو كوردێن ئێزدی لایەنگر و هەڤسۆز بوون دگەل شۆرشا كوردی و پشتی رێككەفتنا ١٠ شواتا ١٩٦٤ێ هێز و چالاكیا پارتی و ئاستێ جەماوەریا وێ ل شنگال باش دیار بووی، هەتا خدر حەسون كو ئێكە ژ سەرۆك عەشیرەتێن هەسكان و عومەر داود كو ئێكە ژ سەرۆك عەشیرەتێن مهركان ل رۆژا ٢٠ تەباخا ١٩٦٤ێ درووشم بۆ بارزانی و پارتی دگۆتن، ژ بەر هندێ، دەستەلاتێ، نەخاسمە ژی پشتی زێدەبوونا چالاكییا سیاسی یا كوردی ل دەڤەرا شنگال، ب رژدی هزرا عەرەبكرنا دەڤەرێ و دوورئێخستنا وێ ژ دەستەلاتا پارتی دكر، ئینا میرەكێ كوردێن ئێزدی ب ناڤێ (بایەزید ئیسماعیل عەبدی ئەلئومەوی) راسپارد ب ڤی كاری رابیت و نڤیسینگەهەك بۆ وی ب ناڤێ نڤیسینگەها ئەمەوی (مكتب الاموي) ل جاددا رەشید ل بەغدا ڤەكر و ناڤێ هیمدارێ بزاڤا عەرەبییا بەنی ئومەییە (مؤسس الحركة العربية في بني أمية) ل سەر خۆ دانا و دیار كر كو ئێزدی ژی عەرەبن و ژ نەتەوێ خۆ بەرزە بووینە، ل رۆژا ٧ ی چریا دووێ یا ١٩٦٤ ێ ژی نامەیەك بۆ عەبدلسەلام عارف نڤیسی و تێدا هاتبوو كو وی نڤیسینگەهەك بۆ چالاكییا نەتەوەیی ل بەغدا ڤەكرییە و ناڤێ باب وباپیرێن وان یێ ئومەوی بۆ ئێزدییان زڤراندییە ئەو ئومەوی یێن هەرێما ئەندەلوس ل سەر (وەلاتێ مەیێ عەرەبیێ مەزن) زێدە كری، هەر د وێ نامەیێ دا دبێژیت كو وی خۆبەخشێن ئومەوی (فرسان) پێشكێش كرینە بۆ هاریكاریا (لەشكەرێ مەیێ قارەمان ل باكوورێ وەلاتی) چونكی ئەو هێزەكا عەرەبی نە ل

باكوورێ وەلاتی و فێرسێن ئازادی و سۆشیالست و ئێكەتیێ نە، ل داوییا نامەیا خۆ داخواز ژ بەرپرسان كرییە هاریكاریا بزاڤا وی یا عەرەبی بكەن بۆ زڤراندنا ٢٠٠ هزار وەلاتیێن رێ لێ بەرزە، بۆ نەتەوە و رەسەناتییا وان یا عەرەبی.

هەروەسا بەری ڤێ نامەیێ، رۆژا ١٨ ی چریا ئێكێ یا ١٩٦٤ ێ نامەیەكا دی یا هۆسا بۆ سەروك كۆمارێ مسرێ جەمال عەبدلناسر هنارتبوو و تێدا پشتراست كربوو كو وی هەمی چالاكیێن دژی نەتەوەپەروەریا عەرەبی ژ ناڤبرینە ئەڤە ژی ب رێیا دەڤەرێن بنەمالا ئەمەوی یا دەڤەرا باكوورێ عیراقێ ب هەرێما باكوورێ (سوریا)ڤە گرێ ددەت، هەروەسا تێدا دیار كربوو كو ئارمانج ژ داخوازییا وی ئامادەكرنا عەشیرەتێن بنەمالا ئەمەویەنە ب ئەركێن خۆ یێن نەتەوەیی رابن و كۆلۆنیالیێ ژ ناڤ ببەن و پشتەڤانییا لەشكەرێن عەرەبی بكەن بۆ ژێبرنا ئسرائیل ژ نەخشەیێ عەرەبی[٤٣٣].

رێڤەبەریا پۆلیسێن باژێرێ مووسل ژی دەست ب چاڤدێریكرنا ئەندامێن پارتی و چالاكیێن وان كر، وێ رێڤەبەریێ ل رۆژا ٧ ی كانوونا ئێكێ یا ١٩٦٤ ێ نڤیسی: رەشید هادی خودانێ ئۆتێلا (قصر الشام) ب رێیا برایێ خۆ محەمەد هادی كو دگەل (پشتەرێیان) بوو پەیوەندیێن بەردەوام دگەل پارتی هەنە، هەروەسا حاجی فەقی سەربازێ دەرێخستی بەردەوام دچیتە مالا عەبدلسەلامێ برینپێچ ل جاددا (زهور) تاخێ (نوعمانیێ) كو ئێكە ژ پارتیێن چالاك و دەرمان داینە (پشتەرێیان)، لێ ئەحمەد محەمەد، حامد محەمەد، مەحمود محەمەد و محمود حەجی محەمەد كو ئاكنجیێن تاخێ رەشیدیێ نە ب چەكێ خۆڤە گەهشتینە (پشتەرێیان)، زەكی مستەفا و ناجی یێ برایێ وی ژی گرۆپەكا هەوالگریا پارتی پێك ئینانە، سەید غازی خودانێ چایخانێ ل جاددا (زهور) ئێكە ژ پارتیێن چالاك و خەلەكا پەیوەندیكرنێ یە ل ناڤبەرا پارتی یێن ل مووسل و بارەگەهێ وێ پارتێ، هەروەسا سالح ئەمین ژ گوندێ بێسفكێ ل دهۆك پەیامنێرێ حزبییە، عەسكەر ناجی شەهباز ژی كو خەلكێ گوندێ كورەماركێ یە و نڤیسەرە ل بەرژەوەندییا هاڤینگەهێ و گەشت وگوزارێ دگەل هەمی كەس وكارێن خۆ پارتییە و پەیوەندیێن ئێكسەر دگەل رەشید هادی هەنە [٤٣٤].

هەروەسا دەستەلاتێن مووسل چاڤێن خۆ ژ چالاكیێن وان دنڤاندن یێن ژ پارتی جودابووین و ئەو هاندان دەرزا ڤێكنەكرنێ ل ناڤبەرا هەردو لایەنان بەرفرەهێ بكەن، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ئێكی كانوونا ئێكێ یا ١٩٦٤ ێ جودابوویان بەیانەك ب ناڤێ لیژنا ناڤخۆیا پارتی ل مووسل دەرێخست و تێدا هێرش كرنە سەر بارزانی و ب وێ چەندێ گونەهبار كرن كو یێ بزاڤێ دكەت شۆرشا كوردی ب داوی بینیت، وێ بەیانێ سەركردایەتییا (پارتی) ب گرۆپەكا كێم و هەلپەرێس ناڤكر و داخواز ژ كوردان كرن بگەهنە لیژنا وان[٤٣٥]، هەر وان جودابوویان ل رۆژا ٢٨ ی كانوونا ئێكێ یا ١٩٦٤ ێ گازییەك ب ناڤێ (گازییا ئافرەتێن كوردستانێ) ب زمانێ كوردی دەرێخست و تێدا هێرشكرنە سەر بارزانی و ئەو ب خیانەتێ گونەهبار كر و دیار كرن كو ئەو ل دژی حەزوڤیانا كوردان راوەستایە و بوویە ئەگەرێ شەڕ راوەستاندنێ و هیڤی و تێكۆشانێن گەلێ كوردستانێ بەرزە كرینە [٤٣٦].

قوتابیێن كورد ژی ل مووسل و دهۆك لیژنەیەكا ئامادەكار بۆ ئێكەتییا قوتابیێن كوردستانێ پێك ئینابوو بۆ روو ب رووبوونا چالاكیێن جودابوویان، وێ لیژنێ ل رۆژا ٢١ ی كانوونا ئێكێ یا ١٩٦٤ ێ بەیانەك دەرێخست و ل دهۆك و مووسل و زاخۆ بەلاڤ كر و تێدا هێرش كرنە سەر جودابوویان و ئەو ب لادای و رێ بەرزە و رەڤۆك ل قەلەمدان، وێ بەیانێ داخواز ژ قوتابیێن كورد كر ل دۆر ئێكەتییا خۆ كۆم ببن و نەهێلن چ (گرۆپ) ل دەرڤەی ئێكەتیێ كارێ خۆ بكەن[٤٣٧].

لیژنا ئامادەكارا ئێكەتییا قوتابیێن كوردستانێ ل بادینان بەردەوام بوو ل سەر هاریكاری و پشتەڤانییا شۆرشا كوردی، هەر بۆ نموونە، بەیانەكا وێ كەڤتبوو دەستێ پۆلیسێن زاخۆ كو ل تیرمەها ١٩٦٥ ێ هاتبوو بەلاڤ كرن و سەرا وێ سێ قوتابی گرتن كو دوو ژ

وان قوتابیێن دواناوەندییا زاخۆ بوون و مالێن وان ژی پشكنین[٤٣٨].

رەوش وەلێ هات ل هیڤییا وێ چریسكێ بیت یا شەڕ پێ دهێتە هەل دبیت، ڤێجا بەرامبەری خۆئاسێكرنا حكۆمەتێ بۆ بەرسڤ نەدانا داخوازیێن شۆڕشا كوردی پشتی سالەك ب سەر رێككەڤتنا هەردوولا دەربازبووی و پێكۆلا هێزێن وێ بۆ پێشڕەویكرنێ بەرەڤ دەڤەرێن ئازادكری و ئازراندنێن چەتەیێن وێ، بەرامبەری ڤان هەمی كریار و ئاراستەیێن هاتینە گۆتن، سەركردایەتییا شۆڕشێ بەرسڤا وێ دا و دووبارە هندەك دەڤەرێن گرنگ كۆنترۆل كرن، هەروەسا مەكتەبا سیاسییا پارتی ل رۆژا ١٩ی كانوونا دووێ یا ١٩٦٥ێ بڕیاردا مانگرتنەكا سیاسییا گشتی ل رۆژا دەهی شواتا ١٩٦٥ێ ساز بكەت وەك نەڕازیبوون بەرامبەری ب جهـ نەئینانا رێككەڤتنا ١٠ی شواتێ یا سالەك ب سەر ئیمزاكرنا وێ ڕا دەرباز بووی و بڕیار هاتە دان ئەڤ مانگرتنە هەمی بیاڤێن ژیانێ ڤەگریت و ٢٤ سەعەتان یا بەردەوام بیت.

رێكخستنێن پارتی ل مووسل و بادینان ب چالاكی كار بۆ سەرئێخستنا مانگرتنێ كرن و فەرماندا ئەندامێن پارتی یێن ل ئامێدیێ ل رۆژا ٦ی شواتێ ل دێرێ ئامادە بن، رۆژا شەشی هەیڤێ ژی لافیتە ل ناڤ ئامێدیێ ل جهێن گشتی هەلاویستن و ژ وان درووشمێن ل سەر هاتینە نڤیسین ئەڤێن خوارێ بوون:

١- داخوازا ئۆتۆنۆمیێ بۆ گەلێ كوردستانێ دكەین.
٢- بژیت پارتا دیمۆكراتا كوردستانێ.
٣- داخــوازێ دكەین دەملدەست چەتە بێنە هەلوەشاندن.
٤- داخوازێ دكەین یەكەیێن لەشكەری ڤەگەڕێنە بنگەهێن خۆیێن ئاسایی.

هەروەسا لافیتە ل سەر رێیا گشتیا ل ناڤبەرا ئامێدیێ و بامەڕنێ ژی هاتنە هەلاویستن و رۆژا ٩ی شواتێ پارتییان داخواز ژ خودانێن هەمی دكان و جهێن بازرگانی كرن دەرگەهێ جهێن خۆ دابێخن و خەلكێ ئامێدیێ ژی ل دووڤ وێ داخوازێ هاتن و جهێن وان یێن بازرگانی هەتا رۆژا ١٠ هەیڤێ دائێخستی بوون.

شەڤا ٩/١٠ ی شواتێ لافیتە ل سەرسنكی هاتنە هەلاویستن و پێشمەرگەی جهـ و ئاڤاهیێن جودا جودایێن وێرێ كۆنترۆل كرن و ژ وان درووشمێن ل سەر وان لافیتان هاتینە نڤیسین ئەڤێن خوارێ بوون:

١- بژیت جڤاتا سەركردایەتییا شۆڕشا كوردستانێ - عیراقێ.
٢- داخــوازێ دكەین عەشیرەتێن عەرەبی ژ سەر گوندێن كوردان بێنە راكرن و كورد ڤەگەڕێنە سەر گوندێن خۆ.
٣- داخــوازا لێبۆرینا گشتی بۆ هەمی زیندانیێن سیاسی ل عیراقێ دكەین.
٤- داخوازێ دكەین حوكمێ سەربازیێ زۆردارانە بێتە هەلوەشاندن.
٥- سەرفەرازی و نەمری بۆ شەهیدێن ئازادیخوازێن كوردستانێ.

رۆژا ١٠ ی شواتێ ژی پێشمەرگەی ئۆتێل و كۆچكا كۆماری (كو بەرێ ناڤێ وێ قەسرا مەلكی بوو) ل سەرسنكی ستاند و رێیا هاتن وچوونێ بڕین، لێ ل سیارەتیكا خۆنیشاندانەكا چەكدارانە ل سەر رێیا گشتی ل دەڤەرا كۆرەماركێ كەڤتە رێ و لافیتە هەلگرتن و مانگرتن راگەهاند، هەروەسا درووشمێن مانگرتنێ ل جهێن دیار و بەرچاڤ ل دەستپێكا گوندێ بامەڕنێ و ل سەر مزگەفتان بلندكرن و داخواز كرن چەتە بێنە هەلوەشاندن و مرن بۆ دوژمن و هێزێن رەشێن پێكۆلێ دكەن شەڕی ل سەر گەلێ كوردێ ئاشتیخواز بسەپینن[٤٣٩].

هەروەسا لیژنا ناڤخۆیا دهۆك ل رۆژا ٢٨ی كانوونا دووێ بەیانەك ئاراستەی هەمی رێكخستنان كر و تێ دا داخواز كر مانگرتن بێتە سەرئێخستن و رێ بێتە دان هەر كۆمەل یان هێزەكا نیشتمانی پشكداریێ د مانگرتنێ دا بكەت و كاری سەخمەراتی وێ بكەت ب مەرجەكی كارێ هەمیان ل دووڤ وان

درووشمان بن یێن د وێ بەیانێ دا هاتین، وێ بەیانێ داخواز ژ لیژنە و رێکخستن و ئەندامێن پارتی کر کۆمبوونێن جەماوەری ل دەڤەرێن ئازادکری رێك بێخن بۆ شرۆڤەکرنا ئارمانجێن شۆڕشی و دادپەروەریا دۆزا گەلێ کورد و شرۆڤەکرنا ئارمانجێن (پارتی)، داخواز کر ژی رۆژا ١٠ی شواتێ درووشمێن خۆنیشاندانێ ل جهێن بەرچاڤ و گشتی ب ئاوایەکێ بەرفرەهـ بێنە هەلاویستن[٤٤٠].

ل مووسل ژی پارتییان درووشمێن مانگرتنێ یێن ب ئامیرێ رۆنیۆیێ هاتینە دەرئێخستن ب دیوارێن دەڤەرا نەبی یونس و دەرگەهێ پۆلیسێن وێ دەڤەرێ ڤە کرن کو تێدا داخواز ژ کوردان هاتبوو کرن پشتەڤانیا مانگرتنێ بکەن بۆ: (مافێن نەتەوەیی یێن گەلێ کوردستانێ، ب داوینانا حوکمێ سەربازی، زڤراندنا وان کەسان یێن ژ کارێ وان هاتینە لادان و هەلوەشاندنا چەتەیان، بۆ دیمۆکراتیێ)، هەروەسا ئەڤ درووشمە ژی هەبوون: (بژیت برایینیا عەرەبی - کوردی - تورکمانی، بژیت ئێکبوونا هێزێن نیشتمانی، بکەڤیت کۆلۆنیالی و پیلانگێرانێن وێ)، هەروەسا زیندانیێن سیاسی یێن کورد ل گرتیخانا مووسل ژی مانگرتن راگەهاند و بۆ ماوێ رۆژەکێ خوارن نەخوارن وەك نەرازیبوون ل سەر ب جە نەئینانا رێککەڤتنا ١٠ی شواتا ١٩٦٤ی[٤٤١].

لێ کارڤەدانا حکۆمەتێ ئەو بوو رۆژا ١١ی شواتێ وەزیرێ ناڤخۆ سوبحی عەبدلحەمید نامەیەکا ئاژراندنێ ئاراستەی بارزانی بکەت و تێدا حکۆمەتێ داخوازێن شۆڕشێ رەت کربوون کو یێن ژ هەمیان گرنگتر ئەڤێن خوارێ بوون: داخوازیا بڕیاردانێ ل سەر ئۆتۆنۆمیێ بۆ کوردستانێ، داخوازیا هەلوەشاندنا پێکهاتێن چەتەیان) و فەرماندایێ خۆ بۆ دەستەلاتا ناوەندی بچەمینیت داکو دووبارە یاسایا رژێمێ ڤەگەڕێتە کوردستانێ[٤٤٢].

سیاسەتا ئاژراندنێ یا حکۆمەتێ بەرامبەری



هژمارەکا پێشمەرگەیێن شۆرشا ئەیلوولێ دگەل ئامر هێز عیسا سوار

شۆڕشا کوردی هەر یا بەردەوام بوو، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ۲۷ی شواتا ۱۹٦٥ێ عەبدلسەلام عارف پێشوازیا سەرۆکێن چەتەیان کر یێن پشتەڤانیا خۆ بۆ وی و ئێکەتیا عەرەبی دەربرین، هەروەسا وەزیرێ بەرەڤانیێ ژی راگەهاند کو پتریا مەزن یا سەرۆك عەشیرەتێن کوردی لایەنگری و پشتەڤانیا خۆ بۆ حکۆمەتێ و نەڕازیبوونا خۆ ژ کریارێن (گرۆپا تێکدەر) دەربڕینە، هەروەسا بۆ دانانا هوورکاریێن داویێ بۆ هێرشکرنە سەر کوردستانێ، رۆژا ۲۸ی ئادارێ عەبدلسەلام عارف سەرەدانا یەکەیێن سەربازی یێن ل زاخۆ و دهۆك کر[٤٤٣].

حکۆمەت یا رژد بوو ل سەر بجهـ نەئینانا داخوازیێن شۆڕشا کوردی و پێکۆل دکر حەزوڤیان و مەرجێن خۆ ل سەر بسەپینیت، هێزێن حکۆمەتێ بەردەوام ب ئازراندنا پێشمەرگەی رادبوون هەتا جارەکێ پێشمەرگەی روو ب رووبوون دگەل کری و بوویە ئەگەرێ کوشتنا هژمارەکا ئەفسەر و سەربازان، هەرچەندە ژی بارزانی ئەو روودان پرۆتستۆ کربوو، لێ حکۆمەتێ ئەڤ روودانە کرە بەهانە و رۆژا ٦ی نیسانا ۱۹٦٥ێ شەرەکێ سەرانسەری ل سەر کوردستانێ راگەهاند و ل پێشیێ هێرش کرە سەر بازێرێ سلێمانیێ، ب ڤی ئاوایی، سەرۆژنوی شەڕ ل کوردستانێ هاتە رووداں[٤٤٣]، ل رۆژا ١٦ی نیسانا ۱۹٦٥ێ ژی جڤاتا سەرکردایەتیا شۆڕشا کوردی بەیانەك ب ناڤێ (بەیانەك بۆ هەمی برایێن مە یێن کورد ل کوردستانا عیراقێ) و تێدا هاتبوو: بەرەڤانیکرن ژ خاك و ماف و ئارمانج و هیڤیێن مە، نە ب تنێ ئەرکێ لەشکەرێ شۆڕشگێڕێ کوردستانێ یە، بەلکی ئەرکێ پیرۆزێ هەر کوردەکێ شەرەفمەندە و لێدانا دوژمنێ زۆردار ل پێش هەمی ئەرکێن وەیە بۆ بەرەڤانیکرنێ ژ شەرەف و کەرامەتا وە، ب پشتبەستن ب وی تشتێ مە گۆتی، بڕیار هاتە دان:

١- هەر کوردەکێ بەرسینگێ دوژمنی بگریت (ئەو دوژمن چ لەشکەر یان چەتە بیت) هەمی دەستکەڤتی دێ بۆ وی بن، ژ بلی چەکێ گران و دەزگەهێن بێتێلی.

٢- هەمی ملك ومالێ ڤەگوهاستی و نەڤەگوهاستی یێ کەسانێن شەرەف و وژدانا خۆ فرۆتینە حکۆمەتا زۆرداریێ دژی گەلێ خۆ دکەت، دێ هێنە دەستەسەرکرن و عەردێ وان ژی دێ ب سەر وان جۆتیاران دا هێتە دابەشکرن یێن ل وێرێ ئاکنجی بووین[٤٤٥].

هێزێن حکومی د دژایەتیکرنا شۆڕشا کوردی دا سیاسەتا عەردێ سۆتی (سياسة الارض المحروقة) ب کار ئینا، بۆ ژ ناڤبرنا وێ شۆڕشێ ل دۆرێن ٤٠-٥٠ هزار سەرباز و ب هزاران چەتە هاژۆتنە مەیدانا ئۆپەراسیۆنێن شەڕی هەر ژ زاخۆ بگرە هەتا دگەهیتە خانەقین، هەر د چارچۆڤێ ڤێ سیاسەتێ دا گوندێن کوردان سۆتن، نەخاسمە ژی ل دەڤەرێن چەمچەمال، تووزخورماتوو، کفری، شوان، بالیسان، قەرەداغ، دۆسکی، سلێڤانەیی، پێنجوین و شێخان، هەروەسا ب دەهان خێزانێن دەڤەرا زاخۆ ژ جهێن وان ڤەگوهاستن و ٢٥ گوندێن دەڤەرا سلێڤانەیی سۆتن، پشتی هەمی ملك ومالێ گوندیان پویرە و تالان کری[٤٤٦].

هەروەسا دەستەلات ل سەر سیاسەتا عەرەبکرنێ بەردەوام بوو نەخاسمە ژی ل مووسل، کەرکووك، قەزایێن خانەقین و شێخان، رۆژنامەیا (خەبات) ل خزیرانا ۱۹٦٥ێ ئاماژە کرە وێ چەندێ کو حکۆمەت ڤەکۆلینێ دکەت کا ئەرێ دشیاندایە دەڤەرا سلێڤانەیی بێتە عەرەبکرن، ئەڤە ژی ب رێیا ئینانا عەشیرەتێن عەرەبێن دەڤەرا جزیرێ یا لیوا مووسل بۆ وێ دەڤەرێ[٤٤٧].

سەرکردایەتیا لەشکەرێ عیراقێ پێکۆل کر مفای ژ خالێن لاوازێن د ناڤ شۆڕشا کوردی دا وەرگریت و ڤێ جارێ ل بەرەیێن شەڕی یێن دەڤەرێن کەرکوك و سلێمانیێ هێرش کر ژ بەر لاوازیا هەلویستێ پێشمەرگەی ل وێرێ چونکی پتریا هێزا جودابوویان ل وێرێ بوو[٤٤٨].

## دیارترین شەڕ و ئۆپەراسیۆنێن سەربازی و روودان ل بادینان

**(٢ی نیسانا ١٩٦٥ێ هەتا رۆژا ٢٩ی خزیرانا ١٩٦٦ێ)**

لەشكەری دەمەكێ كورت بەری دەستپێكرنەڤا شەڕی ل رۆژا ٢ی نیسانا ١٩٦٥ێ دەست ب ئۆپەراسیۆنێن سەربازی كر و ل رۆژا ئێكێ ئادارا سالا ١٩٦٥ێ یەكەیەكا سەربازی پێكۆل كر گەلیێ شێخادی (لالش) ل دەڤەرا شێخان كۆنترۆل بكەت، لێ ب دژواری روو ب رووبوون دگەل هاتەكرن، ژ بەر هندێ شاكر مەحمود سامەرائی پارێزگارێ مووسل پەیوەندی ب سالح یوسفی نوینەرێ بارزانی ل مووسل كر رێ بێتە دان لەشكەر رەبیەكا خۆ دانیتە كۆپا چیایێ ل هنداڤی گەلی، ڤێجا داكو چ روو ب رووبوون نەهێنە روودان و بۆ بەردەوامبوونا دەلیڤا ئاشتیێ، یوسفی ل سەر وێ چەندێ رازی بوو، هەڤدەم هێزەكا دی یا لەشكەری شیا هەردو كۆپێن چیایێن ل هنداڤی گەلیێ دهۆك كۆنترۆل بكەت، هەروەسا بۆ پاراستنا گیانێ هەڤوەلاتیێن سڤیل پێشمەرگەی خۆ ژ ناڤ بازێری ڤەكێشا و نیڤرۆیا وێ رۆژێ فرۆكان دەست بومبەبارانكرنا گوندێ پیرۆمەرا كر، ئێڤاری ژی عەلی خەلیل خۆشەوی فەرماندا بەرۆكا شەڕی ل هەردوو رەخێن رێیا چێكریا (گرێ عەمێ، گەرماڤا، سپیرێز، چیایێ پیرۆمەرا، باجلۆر) بێتە رێكخستن، رۆژا شەشێ ئادارێ كۆمەكا كادرێن پارتی و پێشمەرگەی هاتنە ناڤ دهۆك بۆ زانینا رەوشا بازێری و دووبارە سەروبەركرنا كاروباران و خەلەكێن رێكخستنێ، ل رۆژا ١٤ی ئادارێ ژی كۆمەكا دی قەستا دەشتا سیتەك و فەیدەیێ كر و سەرەدانا بارەگەهێ پارتی و بارەگەهێ پارتا كۆمۆنیست ل دێرا رەبەن هورمز و گوندێ بۆزان كر و گەهشتە دەڤەرا باقاق بۆ زانینا رەوشا دەڤەرێ و شرۆڤەكرنا نووترین پێشهاتان[٤٤٩].

ل رۆژا ٢٥ی ئادارێ هێزێن حكومەتێ بەرەڤ گرێ قەسرۆكا پێشڕەوی كرن، لێ بەرهنگاری بەرگریا پێشمەرگەی بوون و نەشیان پتر پێشڤە بهێن، هەرچەندە ب هاریكاریا چەتەیان كۆنترۆل ل سەر كۆپێن چیایێ سپیرێزی كربوون، هەروەسا پشتی دەستپێكرنەڤا شەڕی ل رۆژا ٢ی نیسانێ، لەشكەری هێرش كرە سەر چیایێ دهۆك، لێ پاشی خۆ ڤەكێشا سەربازگەها خۆ، پشتی بەرهنگاری بەرگریا پێشمەرگەی بووی و گەلەك ژێ هاتینە كوشتن و چەك و جەبلخانە و خیڤەت دەستەسەر كرین [٤٥٠] و لەشكەر و چەتە بەرەڤ دەڤەرێن ئازادكری لڤین، د بەرامبەر دا، پێشمەرگە ب سەركردایەتیا عەلی خەلیل و فارس كۆرەماركی قەستا كۆپا بیكستێر كر بۆ زانینا لڤینێن وان هێزێن حكومەتێ[٤٥١].

وەسا دیارە پێشمەرگەی ژی كێشەیا كێمیا گەنمی هەبوو، چونكی هێشتا دەمێ دروینێ نەهاتبوو، ئینا ئەسعەد خۆشەوی داخواز ژ فارس كۆرەماركی كر، خۆ بگەهینیتە دیوالی ئاغایێ دۆسكی داكو دگەل گەنگەشێ بكەت و گەنمی بدەتە شۆڕشێ، هۆسا، فارس كۆرەماركی ب هەڤالینیا عەبدلرەزاق گەرماڤی (هاریكارێ ئامر هێزا دهۆك) و محەمەد حەسەن عەبۆ (كو پشتی سالا ١٩٩١ێ رێڤەبەرێ پۆلیسێن زاخۆ بوو) ل گوندێ حەوشكێ یا ب رەخ چیای ڤە دگەل دیوالی ئاغا كۆمبوو و دیوالی ل سەر وێ داخوازێ رازی بوو بەرامبەری هەلوەشاندنا بڕیارا دەستەسەركرنا عەردێ وی یێ چاندنێ ل دەڤەرێن ئازادكری[٤٥٢].

د وێ كۆمبوونا دگەل دیوالی ئاغای هاتیە كرن، رێككەڤتنەك د بەرژەوەندیا شۆڕشێ دا ل دەڤەرا دهۆك كرن و وی سۆزدا ب هەمی ئاوایان هاریكاریا شۆڕشێ بكەت و ب رێژا ١٠٪ ێ باجا ل سەر بەرێ چاندنێ یێ دەڤەرێن نەئازادكری كۆم بكەت كو ل ڤێ دەڤەرێ بلندترین رێژا دەخل ودانی دهاتە بەرهەمئینان، بۆ دووڤچوونا ب جهئینانا وێ رێككەڤتنێ ژی لیژنەیەكا ئابووری ب سەرۆكاتیا فارس كۆرەماركی و ب ئەندامەتیا میكائیل ساركی

و قەیسەر مەنسور سێجی هاتە پێك ئینان، ژ وێ لیژنەیێ ژی سێ لیژنەیێن دی هاتنە پێك ئینان و ژ لایێ نەعمۆ سەمەد و حامد حاجی جانگیر و خالد قەساری ڤە دهاتنە رێڤەبرن و كارێ وان كۆمكرنا باجێن بەر و دەرامەتێ چاندنێ بوو ئەڤە ژی پشتی مەفرەزێن پێشمەرگەی خەلك ل سەر وێ چەندێ ئاگەهدار كری، دێوالی ئاغا ژی داخواز ژ گوندیيان كر كو پێتڤییە د ڤی بیاڤی دا هاریكاریا پێشمەرگەی بكەن و بریار هاتە دان بەرهەمێ وەك باج هاتییە وەرگرتن بۆ گوندێ سێجێ و ژ وێرێ ژی بۆ دەڤەرێن ئازادكری بێتە ڤەگوهاستن، هەروەسا ژ بەر كێمیيا وێ باجا دهاتە وەرگرتن، بریار هاتە دان بۆ پركرنا وێ كێمیێ تەنەكا گەنمی ب نیڤ دیناری ژ خەلكێ دەڤەرێن ئازادكری بێتە كرین كو وان ژی ژ دەڤەرێن نەئازادكری دكرین، هۆسا، ل داویيا وەرزێ دروینێ یا سالا ١٩٦٥ێ، پێشمەرگە ل دهۆك بۆ خودانێ ٢٠ هزار تەنەكێن گەنمی[٤٥٣].

دێوالی ئاغا داكو گومانا هاریكاریێ دگەل پێشمەرگەی ل نك دەستەلاتێ ژ خۆ دووربێخیت و راپۆرتێن هەوالگرێن د ڤی بیاڤی دا دگەهشتنە حكۆمەتێ ب نەوەیی دەربێخیت، جارەكێ داخواز ژ فارس كۆرەماركی كر سندۆقەكا گوللەیێن برنۆیێ و تبابەكا ئاهێن خوارنێ یێن توركی بدەتێ، پێشمەرگەی ژی داخوازیيا وی ب جهـ ئینا، ئارمانجا دێوالی ئاغا ژ ڤێ چەندێ ئەو بوو بۆ حكۆمەتێ دیار بكەت كو پێشمەرگە پێدڤی هاریكاریا وی نینە، چونكی تەقەمەنی و ئاهێن خوارنێ ژ تركیا و ئیرانێ بۆ دهێن[٤٥٤].

هەروەسا ل گولانا ١٩٦٥ێ، سوپا و چەتە و پۆلیسێن گەرۆك ژ مانگێشكێ بەرەڤ چیایێ دێرگژنیكێ پێشرەوی كرن، لێ ئەو هێز تووشی شكەستنێ بوون و گەلەك تەرمێن خۆ هێلان و سێ چەتە هاتنە گرتن و ب دەهان ژێ بریندار بوون كو ئێك ژ وان بەرپرسێ چەتان بوو[٤٥٥]، تەباخا ١٩٦٥ێ ژی لەشكەری و چەتەیان هێرشكرنە سەر چەپەرێن پێشمەرگەی ل دەڤەرا باكرمان ل قەزا ئاكرێ، لێ زیانێن مەزن ڤێكەڤتن و پێشمەرگە شیان بچنە ناڤ سەربازگەها باكرمان و گەلەك سەرباز و چەتەیان بكوژن، ئەڤە سەرباری دەستەسەركرنا تبابەكا چەك و تەقەمەنییان، پشتی چەند رۆژەكان ژی، رێ دانە ژن و هندەك چەتەیان تەرمێن خۆ ببەن[٤٥٦].

هەروەسا دەستەلاتێ هندەك پێرابوونێن دی ژی بۆ دژایەتیا شۆرشا كوردی ل دەڤەرا بادینان كرن، ژ وانا: ل رۆژا ٢٨ی خزیرانا ١٩٦٥ێ هەمی پارتیێن هاتینە گرتن و د گرتیخانا مووسل ڤە بوون و هاتبوونە حوكمدان و پشتی رێككەڤتنا ١٠ی شواتا ١٩٦٤ێ نەهاتبوونە ئازاد كرن، بۆ گرتیخانەیێن بەسرا و ناسریێ و كۆت ڤەگوهاستن كو هژمارا وان ل دۆرێن ٨٧ گرتییان بوو و پتریيا وان خەلكێ بادینان بوون، داكو سەرەدانا وان بۆ كەس وكارێن وان ب زەحمەت بكەڤیت و نەشێن پەیوەندیێ پێ بكەن، ٦٦ ژ وان ل رۆژا ٥ تەباخێ هاتبوونە گرتن و ل رۆژا ١٨ی چریا دووێ یا ١٩٦٤ێ ب حوكمێن جودا جودا هاتبوونە حوكمدان[٤٥٧].

هەروەسا دەستەلاتا خۆجهیيا مووسل هەوەكا دەستەسەركرنێ دژی ئەندامێن پارتی دەست پێ كر و ل خزیرانا ١٩٦٥ێ شیا بەرپرسێ لیژنا ناڤخۆیی هاشم ئەترووشی و هەمی فایلێن وی دەستەسەر بكەت، ئەترووشی نەشیا خۆ ل بەر ئەشكەنجەدانێ بگریت و رێكخستنێن سەربازی و مەدەنی یێن پارتێ ئەشكەرا كرن، ژ بەر هندێ گەلەك ئەندامێن پارتی و هەمی ئەندامێ لیژنا ناڤخۆیی هاتنە گرتن و ل كەتیبا ئەندازیاری ل سەربازگەها غەزلانی هاتنە دەستەسەركرن، ژ وان یێن هاتینە گرتن ئەڤێن خوارێ بوون: حەجی محەمەد ئوسمان سێكانی و هەردوو كورێن وی مەهدی و زوهدی، حەجی جاسم زاخۆیی، سەید ئیبراهیم محەمەد، هەردو برا سابر و سادق، مەلا عەبدالله مەلا محەمەد ئەمین، مەحمود حەجی چەتۆ، حەیدەر حەجی حەیدەر سەعەتچی و هندەكێن دی و پشتی گرتی هاتینە ئەشكەنجەدان، ل داویيا چریا ئێكێ یا ١٩٦٥ێ هاتنە ئازاد كرن[٤٥٨].

هەروەسا رۆژا ٢٩ی خزیرانێ موتەسەرفیيا لیوا مووسل داخواز ژ قائیمقامیيا قەزا زاخۆ كر ناڤێن

خودان ترۆمبێلێن پیکئاب و جیّپ و لاندرۆڤەر یێن ل قەزایێ بدەتێ کو هژمارا وان ١٢ کەس بوون و ئاکنجیێن زاخۆ و دێرەبوونێ و باستکێ بوون، ئەو ژی ئەڤێن خوارێ بوون: ئیسماعیل رەمەزان سێرانی، محەمەد سلێمان، عەگید عەگید، مەحمود ئیسماعیل سندی، مووسا داود، تۆما داود، رەجەب دەروێش، فاروق محەمەد قاسم، لەزگین محەمەد، سلێوە یۆنان (وەغەر کرییە)، میرزا یونس و نوئێل کەریم، ئارمانج ژ داخوازکرنا ناڤ و ناڤونیشان و جۆرێن ترۆمبێلێن وان بۆ چاڤدێریکرنا وان و وەرگرتنا سۆزنامێ ژ وان بوو داکو پێشمەرگەی نەڤەگوهێزن و هاریکاریا وان نەکەن[٤٥٩].

وەسا دیارە ژی ل ئاگربەستا ناڤبەرا ١٩٦٤/٢/١٠-١٩٦٥/٤/٢ێ دەستەلاتێ ل قەزا ئامێدیێ چاڤدێریا چالاکیێن ئەندامێن پارتی و هاریکارێن وان دکر، گرۆڤە ژی بۆ وێ چەندێ، ئێکسەر ل دەمێ دەستپێکرنەڤا شەڕی، دەستەلاتێ دەست ب لڤینان کر بۆ دەستەسەرکرنا وان، هەر بۆ نموونە ل رۆژا شەشێ گولانا ١٩٦٥ێ ٢٢ کەس هاتنە گرتن و رەوانەی دادگەها ئاسایشا دەولەتێ کرن ب بەهانا وێ چەندێ کو هاریکاریا پێشمەرگەی کرینە، هەروەسا ل رۆژا ٢ێ خزیرانێ موتەسەرفییا لیوا مووسل داخواز ژ قائیمقامیا ئامێدیێ کر ناڤێن وان خانەنشینان پێشکێش بکەت یێن گەهشتینە شۆڕشا کوردی کو هژمارا وان ١٨ خانەنشین بوون[٤٦٠].

ل زاخۆ ژی دەستەلاتێ گڤاشتن دانانە سەر خێزانا سالح یوسفی و کەس وکارێن وی کو یوسفی رازی بکەن دەست ژ شۆڕشێ بەردەت و ڤەگەڕێتە زاخۆ، دەمێ دەستەلات ژ ڤەگەڕیانا وی بێ هیڤی بووی، هاڤینا سالا ١٩٦٥ێ خێزانا وی دوورئێخستە قەزا شرگات و هەڤژینا وی کو مامۆستا بوو ژ کارێ وێ لادا هەرچەندە وێ ب تنێ زارۆیێن خۆ ب خودان دکرن[٤٦١].

دەستەلاتێ پەنابرە بەر رێیەکا دی بۆ دژایەتیکرنا پێشمەرگەی ل بادینان کو ئەو ژی رێیا تیرۆرکرنێ بوو، هەر بۆ نموونە، ل پاییزا ١٩٦٥ێ رێڤەبەریا هەوالگریا سەربازی ل بەغدا بەرنامەیەك دانا ناڤێ وێ کرە پلانا خۆشتڤی (الخطة العزيزة) بۆ تیرۆرکرنا ئەندامێن پارتی و پێشمەرگەیێن چالاك، ل بادینان ئەوێن ئەو پلان ژێ دگرت و گوژمێن مەزن یێن پارەی بۆ کوشتنا وان هاتبوونە تەرخان کرن ئەڤێن خوارێ بوون: فارس کۆرەمارکی، کەریم فندی، سەعید ئەمین، محەمەد حەسەن عەبۆ (ژ دهۆك)، شەعبان سەعید، عەلی هالۆ (ژ زاخۆ)[٤٦٢]، ئەحمەد جەرگیس، مەجید جەرگیس (ژ شێخان)، نەجمەددین یوسفی، عەلی عەبدالله (ژ ئامێدیێ)[٤٦٣]، ئەوێن هاتینە راسپاردن ژی ب تیرۆرکرنێ رابن ئەڤێن خوارێ بوون: قائیمقامێ دهۆك، شێخ سەدیق بریفکی، تاهر حەجی یونس دێرکی (هەردوویێن داویێ سەرۆك چەتە بوون)، حەبەش زاوی نڤیسەرێ ناحیا زاویتە[٤٦٤]، لێ تشتێ گرنگ ئەوە ئەو نەشیان وێ پلانێ ب جهـ بینن چونکی ئەوێن بڕیارا تیرۆرکرنا وان هاتییە دان ل دەڤەرێن جودا جودا بوون و ل دەڤەرەکێ دبنەجهـ نەبوون، هەروەسا دەستەلات ل شواتا ١٩٦٥ێ شکەستن د تیرۆرکرنا عەلی هالۆ دا دیتبوو و فارس کۆرەمارکی ژی گەهشتبوو بارەگەهێ بارزانی.

بۆ دانانا گڤاشتنان ژی ل سەر پێشمەرگەی داکو خۆ رادەست بکەن و نەهێلن گەنج بگەهنە شۆڕشێ، سەرکردایەتیا تیپا چوار و سەرکردایەتیا هێزا مەیدانێ یا کاروبارێن مەدەنی بڕیاردان خێزانێن وان کەسێن ل مووسل گەهشتینە شۆڕشێ بۆ دەڤەرێن ئازادکری بێنە دەرئێخستن داکو ژ لایێ ئابووری ڤە ببنە بارگرانی ل سەر شۆڕشێ، چونکی دەرئێخستن ژ وان گەنجان و کەسان نەدگرت یێن دشیان چەکی هەلگرن، بەلکی ژ زارۆك و دانعەمران دگرت[٤٦٥].

بەرگری و خۆڕاگریا کوردی یا ب هێز بەرامبەری هێرشێن سەربازێن عیراقێ بوو ئەگەرێ وێ چەندێ پلانێن حکۆمەتێ دانایین ب جهـ نەهێن و ڤێکنەکرنێن دژوار ل ناڤبەرا لەشکەری پەیدا ببن، ل داویێ ژی بوونە ئەگەرێ وێ چەندێ سەرۆك وەزیر تاهر یەحیا ل رۆژا ٦ی ئیلۆنا ١٩٦٥ێ دەست ژ کارکێشانا خۆ پێشکێش بکەت، ئینا عارف



هژمارەکا پێشمەرگەیێن کوردستانێ

عەبدولرەزاق هاتە راسپاردن حکۆمەتەکا نوو پێك بینیت، لێ ڤێ حکۆمەتێ تنێ ١٠ رۆژان ڤەکێشا و رۆژا ١٥ی ئیلۆنێ سەرۆکێ وێ حکۆمەتێ پێکۆل کر رژێما حوکمێ عەبدلسەلام عارف ژ ناڤ ببەت، لێ کۆدەتا بەرهنگاری شکەستنێ بوو و ل رۆژا ٢١ی ئیلۆنا ١٩٦٥ێ دکتۆر عەبدلرەحمان بەزاز حکۆمەتا خۆیا ئێکێ (١٩٦٥/٩/٢١-١٩٦٦/٤/١٨)ێ پێك ئینا، هەروەسا ژ بەرکو بەزاز کەسەکێ مەدەنی بوو و ئێکەمین مەدەنی بوو پشتی شۆڕشا ١٤ تیرمەها ١٩٥٨ێ حکۆمەتێ پێکدئینیت و هەردەم ل دژی چارەیا سەربازی بوو دۆزا کوردی و دگەل پشکدارکرنا کوردان د حوکمی دا بوویە، ڤێجا داکو شەڕ دژی شۆڕشا کوردی بەردەوام بیت، عەبدلسەلام عارف ئێك ژ نەیارترین نەیارێن کوردان و بزاڤا وان یا نەتەوەیی بوو و داخواز دکر دۆزا کوردی ب هێزا چەکی بێتە چارە کرن کو ئەو ژی لیوا روکن عەبدلعەزیز عکێلی بوو ل سەر سەرۆك وەزیری سەپاند ببیتە وەزیرێ بەرەڤانیێ د حکۆمەتا وی دا، عکێلی ژی ئێکسەر دەمێ پۆستێ خۆ وەرگرتی بەردەوام دەست ب راگەهاندنان کر و دگۆت: (نیشانێن پێکئینانا ئسرائیلا دووێ ل باکوورێ عیراقێ ل ئاسۆیێ یێ دیار دبن)، کو ئارمانجا وی ژ وان راگەهاندنێن ئازرینەر بۆ ئینانا بەهانەیان بوو بۆ بەردەوامبوونا شەڕی و بەردەوامبوونا پێکۆلێن بۆ ژ ناڤبرنا دۆزا کوردی دهێنە کرن[٤٦٦].

عەبدولرەحمان بەزاز دژی هەر چارەیەکا ئاشتیانە بوو بۆ دۆزا کوردی و پێکۆل دکر دان وستاندنان دگەل سەرکردایەتیا شۆڕشێ بکەت، لێ عەبدلسەلام عارف رازی نەبوو شەڕ بێتە راوەستاندن و ل وێ باوەرێ بوو لەشکەر دێ شێت شۆڕشا کوردی ژ ناڤ بەت، هەتا وی ب خۆ ژی ئامادەییا خۆ دەربڕی پشکداریێ د شەڕی دا بکەت بۆ بلندکرنا ورەیێن یەکێن سەربازی[٤٦٧]، ژ بەر هندێ، ئۆپەراسیۆنێن لەشکەری و شەڕولێکدان ل بادینان دبەردەوام بوون، هەر بۆ نموونە، ل رۆژا ٤ ی چریا ئێکێ لەشکەری بەرەڤ دەڤەرا سپنەی ل ئامێدیێ پێشڕەوی کر، لێ پاشڤە ڤەگەڕیا و پێشمەرگەی هەتا رەخ ورووبێن فرینگەها بامەرنێ راهێلایێ کو سەربازگەها لەشکەری ل وێرێ بوو[٤٦٨].

دەمێ هێزێن حکۆمی نەشیاین جهێن نوو یێن دەڤەرێن رزگارکری داگیربکەن، سەرکردایەتیا لەشکەری ل مووسل پلان بۆ ئەنجامدانا ئۆپەراسیۆنەکا سەربازییا مەزن دانا و ناڤێ وێ کرە (ئۆپەراسیۆنا بیڤەلەرز) بۆ ژ ناڤبرنا پێشمەرگەی ل قەزا دهۆك، کو ئەو ئۆپەراسیۆن ژ دەڤەرا مانگێشکێ دەست پێ بکەت و بەرەڤ گوندێ شاوریکێ پێشڕەوێ بکەت کو بارەگەهێ عەلی خەلیل خۆشەوی ئامر هێزا دهۆك لێ بوو، وێ هێرشێ رۆژا ١٠ چریا ئێکێ ١٩٦٥ێ ژ سەربازگەها دهۆك و دوریانا کەڤلەسنێ ـ مانگێشکێ دەست پێکر و هێزێن حکۆمەتێ ژ سێ تەوەرێن خوارێ ڤە پێشڕەوی کرن:

١- مانگێشکێ ــ زێوکا عەبۆ ــ شاوریکێ.

٢- مەمانێ ــ کەمەکا ــ بابوخکێ ــ شاوریکێ.

٣- چیایێ دێرگژنیکێ ــ بێسفکێ ــ بانەسۆرێ، شاوریکێ(٤٦٩).

هەروەسا بۆ هاریکاریکرنێ د بەرسینگگرتنا هێرشێ دا، سەرکردایەتیا شۆرشا کوردی هەردو ئەفسەر نەوزاد سالح خۆشناو و تارق محیەددین دگەل دو تۆپێن ١٢٠ ملم هنارتنە بارەگەهێ ئەسعەد خۆشەوی بۆ تۆپبارانکرنا هندەك بنکەهێن لەشکەری و هەردو تۆپ بۆ شاوریکێ ڤەگوهاستن و ل گەلیێ دێرگژنیکێ هاتنە دانان، لێ ب کارئینانا وان کاریگەرییا خۆ نەبوو، ژ بەرکو ئارمانجێن خۆ باش نەدهنگاڤتن(٤٧٠)، سەرباری بەرگریا پێشمەرگەی و گەهشتنا هێزێن پشتەڤان ژ هێزا زاخۆ، هێزێن حکۆمەتێ شیان بگەهنە چیایێ دێرگژنیکێ ــ بێسفکێ و دەوروبەرێن گوندێ شاوریکێ و چەتەیان گوندێن بێسفکێ و بێشینکێ و کەمەکا و زێوکا عەبۆ سۆتن، هەروەسا ل رۆژا ١٤ی چریا ئێکێ یا ١٩٦٥ێ پێشمەرگەیێن دەڤەرا دهۆك ب پشتەڤانیا کۆمەکا پێشمەرگەیێن هێزا زاخۆ ب سەرکردایەتیا عیسا سوار شیان پێشڕەوییا هێزێن حکۆمەتێ راوەستینن و هێرشێ بکەنە سەر و بشکێنن و پاشڤە ببەنە مانگێشکێ، د وێ هێرشێ دا پێشمەرگەی سەرلقەك ژ دەستدا و هژمارەکا دی برینداربوون(٤٧١).

لێ ل دەڤەرا زاخۆ، ل رۆژا ٢٧ی چریا ئێکێ هێزێن حکۆمەتێ هێرش کرە دەڤەرا لیڤێ دەملدەست هێزێن پێشمەرگەی ب سەرکردایەتیا عەلی خەلیل خۆشەوی هاتنە بەرۆکا شەری بۆ پشکداریکرنێ د بەرەڤانیکرنا دەڤەرێن ئازادکری دا، کو لەشکەری هندەك پێشڕەوی ل تەوەرێن خوالش ــ بێتاسێ ـ دۆلا کربوو، ل رۆژا ٣٠ی چریا ئێکێ ژی لەشکەری پێکۆل کر باڤیا و کەلا ئەرمشتێ داگیر بکەت، لێ نەشیا و شکەست و خۆڤەکێشا ئاسیهێ سەنتەرێ ناحیا سلێڤانەیی ل سەر جاددا گشتییا ل ناڤبەرا مووسل ـ زاخۆ(٤٧٢).

پشتی شکەستنا هێرشێن هێزێن حکۆمەتێ، پێشمەرگەی ل رۆژا ١٠ی چریا دووێ یا ١٩٦٥ێ دەست ب رێکخستنا هێرشێ ل سەر وان هێزان کر و پەل(فصیل)ێن پێشمەرگەیێن ئامێدیێ و دهۆك و هێزا زاخۆ پشکداری تێدا کرن و شیان ب شەڤ بچنە ناڤ ئامێدیێ، لێ ژ بەر شاشییەکا سەربازی خۆ ڤەکێشان پشتی د تۆپبارانەکێ دا چەندین کوشتی داین(٤٧٣).

ل داویا پاییزا ١٩٦٥ێ هێزێن حکۆمەتێ و چەتەیان هێرشەکا بەرفرەهـ ژ چەندین تەوەران ڤە ژ گەلیێ زاخۆ بەرەڤ بلنداهیێن برجین و ژ تەوەرێ بێزهێ و باتاسێ و ژ تەوەرێ گرێن رۆژهەلاتێ زاخۆ یێن دبێژنێ دوازدە ملان کر، لێ هێزا زاخۆ و هێزا دهۆك و پشکەکا هێزا ئامێدیێ ب سەرکردایەتیا سەلیم ئەسعەد ب چەکێ سڤك و تۆپەکا ١٢٠ ملم یا ئێکەمین جار هاتییە ب کار ئینان بەرسینگێ وێ هێرشێ گرت، نەجمەددین یوسفی کو پشکداری د وێ شەڕی دا کربوو دبێژیت: خەلکێ گوندێن دەردۆرێن تەوەرێن هێرشێ ژ بەر زۆری و دەستدرێژیێن وان هێزان یێن ئەو گوند تالان دکرن دسۆتن، گوندێن خۆ هێلان و رەڤین، ئەڤە سەرباری کو وان هێزان زەلام دکوشتن و نەچار دکرن چەکی هەلگرن و شەڕێ شۆرشێ بکەن و هەروەسا ژ بەرکو هێزێن هێرشکەر ب هژمارە و چەکێن خۆ زێدەتر بوون، پێشمەرگە نەشیا وێ

هێرشێ بشکێنیت یان هەتا براوەستینیت ژی، ئینا وان هێزان هەتا بارەگەهێ عیسا سوار و بارەگەهێن دی یێن پێشمەرگەی ژی سۆتن(٤٧٤).

شەر ژ زاخۆ و ئامێدیێ و دهۆك بۆ قەزا شێخان هاتنە ڤەگوهاستن و رۆژا ئێکی کانوونا ئێکێ یا ١٩٦٥ێ هێزێن حکۆمەتێ هێرش کرنە سەر دەڤەرا مزووری ژێریان و ل دەشتێن گوندێن سیتەك و کانی گولانێ و خورکی پێشرەوی کرن، لێ ژ تەوەرێن هێتووت و ئێمینکێ بەرهنگاری بەرگرییەکا دژوار بوون، ل رۆژا ١٢ی کانوونا ئێکێ ژی وان هێزان هێرش کرنە سەر گوندێ پێدە، لێ نەشیان چ پێشرەویێ بکەت(٤٧٥).

ل رۆژا ١٤ ی کانوونا ئێکێ یا ١٩٦٥ ێ هاریکاریێ ئەمنا دهۆك د نڤیسارەکێ دا دیار کر کو عیسا سوار دگەل ٢٥٠ چەکداران ژ دەڤەرا بێزهێ و ئەسعەد خۆشەوی دگەل ٢٠٠ چەکداران ژ دەڤەرا دۆسکی چووینە و هەردو گەهشتینە غازی حەجی مەلۆ و ئارمانجا وان لێدانا هێزێن چەکدارە دەمێ پێشرەویێ دکەن و وان دو تۆپێن (٢) گرێ و تۆپەکا (٣) گرێ هەنە، هەر د وێ نڤیسارێ دا هاتییە: پێشمەرگەی نەخۆشخانەیەك دانایە گەلیێ زرهەوا یێ نێزیکی گەلیێ هارۆنە د چارچۆڤێ قەزایێن دهۆك و زاخۆ دا و وان دو نۆشدار هەنە یێ ئێکێ مووسا عەودیشۆیە کو دبێژنێ نۆشدارێ نشتەرگەر و یێ دووێ ژی (ئیبراهیم)ە، هەروەسا خەلیل خۆشەوی گەلیێ ناڤبری ب شەڤ دکەتە بارەگەهێ خۆ و ب رۆژ ژی دچیتە گوندێ دەرگەلا شێخا، شەڤا ١٤ ی کانوونا ئێکێ ژی پۆلەوان سلێمان سەعید و هەجەر مستەفا و ئەحمەد حەجی شەعبان دگەل ٣٠٠ چەکدارێن ل دەڤەرا بەرواری دلڤن بۆ لێدانا هێزێن چەکدار(٤٧٦).

شەڤا ٢٧/٢٦ێ یا کانوونا ئێکێ، پێشمەرگەی ل بنگەهێ پۆلیسێن فەیدیێ دا و رۆژا ١٤ی کانوونا دووێ یا ١٩٦٦ێ ژی هێزێن حکۆمەتێ و چەتەیان ژ تەوەرێ گەرماڤا محەمەد ئاغای بەرەڤ قەشەفرێ و ژ تەوەرێ شاخکێ بۆ داگیرکرنا چیایێ سپی پێشرەوی کرن، عەلی خەلیل فەرماندێ پێشمەرگەیێن دهۆك ژی هاتە دەڤەرێ و ئەلندا رۆژا ١٥ی کانوونا دووێ بەرسینگێ وان هێزێن حکۆمەتێ گرتن و شکاندن(٤٧٧).

رۆژا ١٠ی ئادارا ١٩٦٦ێ ژی عیسا سوار بریاردا هێرشێ بکەتە سەر بنگەهێ لەشکەرێ ل دێرەبوونێ، ل پێشیێ شەڤا ١٤/١٣ وێ هەیڤێ پێشمەرگەی دەست ب تۆپبارانێ کر، پاشی بەرەڤ بنگەهی پێشرەوی کرن و ستاند و فەرماندێ وێ ب بریندار ئێخسیر کر، لێ سەرباز رەڤین هەتا هندەك ژ وان ژ رووبارێ دیجلە ژی دەربازبوونە لایێ سوریا و ١٠ سەرباز و ٣٠ کرێگرتییێن عەرەبێن ب ناڤێ (فرسان الولید) هاتنە ئێخسیر کرن و هەمی چەك و جەبلخانە و دەزگەهێن پەیوەندیکرنێ یێن بنگەهی هاتنە دەستەسەر کرن(٤٧٨).

دهێتە تێبینی کرن ژی کو هەر ژ نیسانا ١٩٦٥ هەتا ئادارا ١٩٦٦ێ جۆرەکێ هاریکاری و هەماهەنگیا بلند ل ناڤبەرا هێزێن پێشمەرگەی ل بادینان هەبوویە و ڤێ چەندێ ژی کاریگەرییەکا ئەرێنی د رێڤەچوونا ئۆپەراسیۆنان دا هەبوویە و پێشمەرگەی گەلەك سەرکەڤتن ب دەستڤەئینانە.

حکۆمەتێ نەخشەیێ پلانەکا سەربازی بۆ ژناڤبرنا شۆرشا کوردی دانا و ناڤێ وێ کرە (توكلنا على الله) و رۆژا ١٥ی نیسانا ١٩٦٦ێ وەك ژڤان بۆ ب جهئینانا پلانێ هاتە دەستنیشان کرن، لێ هاتە پاشئێخستن ژ بەر کەڤتنا فرۆکەیا عەبدلسەلام عارف و مرنا وی ل رۆژا ١٣ی نیسانێ و دامەزراندنا عەبدلرەحمان عارفێ برایێ وی ل رۆژا ١٦ی نیسانێ وەك سەرۆك کۆمارێ عیراقێ ل شوونا وی، کو راگەهاندبوو د هەمی بیاڤان دا دێ ل سەر سیاسەتا برایێ خۆ ب رێڤە چیت، وی ل رۆژا ١٦ی نیسانێ دکتۆر عەبدلرەحمان بەزاز راسپارد دووبارە حکۆمەتێ پێکبینیت، ئینا بەزاز ل رۆژا ١٨ی نیسانێ حکۆمەت پێکئینا و پۆستێ وەزیرێ ناڤخۆ وەرگرت، هەروەسا پشتی نەشیای پۆستێ سەرۆك کۆماریێ وەرگریت، عەبدالعزیز عگێلی رەت کر پشکداریێ د وێ حکۆمەتێ دا بکەت کو تێدا وەزیرێ بەرەڤانیێ بوو، ئینا بەزاز لیوا شاکر مەحمود شوکری ل شوونێ دامەزراند کو وەك ئەفسەرەکێ نەرمێ دهاتە نیاسین(٤٧٩).

ل سەر هەلویستێ عەبدلرەحمان عارف ژی ژ دۆزا کوردی، وی ئەو نەیاری دگەل کوردان نەبوو وەکی وێ یا برایێ وی بەرامبەری کوردان هەبوو، لێ دگەل هندێ ژی، خۆ نەدداپاش ژ گەفکرنێ ل دژی شۆرشا کوردی، هەر بۆ نموونە ل رۆژا ١٨ی نیسانێ راگەهاند کو بارزانی جوداخوازێ ئێکانەیێ کوردە، ل رۆژا ١٩ی نیسانێ ژی پێشوازیا کۆمەکا چەتەیان کر و ئەو پشتراست کرن کو حکومەتێ ل بەر نینە دان وستاندنان دگەل بارزانی بکەت و داخواز ژێ کر کومەلێن خۆ ئامادە بکەن بۆ دەستپێکرنەڤا شەری[٤٨٠].

تشتێ گرنگ د مەسەلێ دا ئەوە، حکومەتێ ل رۆژا ٢ی گولانا ١٩٦٦ێ دەست ب بجهئینانا پرۆسا (توکلنا علی الله) کر کو پێك دهات ژ ئۆپەراسیۆنێن سەربازیێن بەرفرەهێن ئارمانجا وان داگیرکرنا بارەگەهێن سەرکردایەتیا شۆرشا کوردی و ژێکڤەکرنا دەڤەرێن کوردی بوو بۆ دو پشکان و برینا پەیوەندیێ بوو ل ناڤبەرا وان، لێ سەرکردایەتیا شۆرشێ ئەو هێرش شکاند و ل رۆژا ١٢ی گولانێ مەزنترین سەرکەڤتن د شەرێ هندرین دا ب دەستڤەئینا و هێزێن حکومی و ب هزاران چەتە نەچار کرن پاشڤە ڤەگەرێن[٤٨١].

هەروەسا ل گولانا ١٩٦٦ێ وەرارێن ترسناك د رێزێن شۆرشا کوردی دا هاتنە روودان دەمێ سەرکردایەتیا جودابوویان ژ وانا جەلال تالەبانی و عەلی عەسکەری و حلمی عەلی شەریف ئەوێن ل تیرمەهـ و تەباخا ١٩٦٥ێ ڤەگەریاینە ناڤ رێزێن شۆرشێ، بریاردابن ژ رێزێن وێ دەرکەڤن و ل داوییا کانوونا دووێ یا ١٩٦٦ێ بگەهنە حکومەتێ، د وان رەوشێن بەرتەنگ دا وێ سەرکردایەتیێ بریاردا چەکێ حکومەتێ دژی شۆرشا کوردی هەلگریت، ل هەیڤا گولانێ ژی کۆمەکا لەشکەرێن ژ شۆرشێ پشتەرێ بووین گەهشتنە وان، ژ وانا: پێشەنگ کەمال موفتی، پێشرەو محەمەد ئەمین فەرەج و هندەکێن دی یێن ل قەلادزێ و بنگرد و شوان و دەڤەرێن دی سەرکردایەتیا پێشمەرگەی دکرن و هژمارا پێشمەرگەیێ گەهشتیە وان ل دۆرێن ٢٠٠٠ هزاران بوون، ئەڤ تشتە وی دەمی هاتە

رووودان دەمێ پێشمەرگە روو ب روویێ بەرفرەهترین هێرشا حکومی دبوو ل هندرین و زۆزك، هەرچەندە ژی سەرکردایەتیا شۆرشێ شیا بوو ب سەر ڤی هەلویستی دا زال ببیت، لێ ڤی کارێ وان کاریگەری ل سەر هەبوو و حکۆمەت هاندا هێزێن خۆ کۆم بکەت بۆ ژ ناڤبرنا شۆرشێ[٤٨٢]، ژ بەر هندێ، ئەو د بەلاڤۆکێن شۆرشا ئیلۆنێ دا ب (چەتەیێن ١٩٦٦)ێ هاتینە نیاسین، نەخاسمە ژی پشتی چەکێ حکۆمەتێ هەلگرتین و دگەل لەشکەری و چەتەیان دژایەتیا شۆرشێ کرین.

نێزیکی ٣٠٠ پێشمەرگەیێ بادینان ب سەرکردایەتیا فارس کۆرەمارکی و ب هاریکاریا عەبدلخالق سپینداری و مستەفا نێروەیی و عسمەت دینۆ پشکداری د شەرێن هندرین و زۆزك دا کربوون و وان رۆل د شکاندنا هێزێن حکۆمەتێ دا هەبوو[٤٨٣].

ل سەر چالاکیێن وان یێن ل دەڤەرا بادینان ژ پارتی جودابووین و چەکێ حکۆمەتێ هەلگرتین بۆ دژایەتیکرنا شۆرشێ ل سالا ١٩٦٦ێ، ژ بەر کێمیا هژمارا وان چ کاریگەریا خۆ نەبوون، هەر بۆ نموونە، ل دەڤەرا ئامێدیێ هێزەکا پێشمەرگەی کو ل بن فەرماندارییا سدقی حەجی شەعبان ئاغا بوو و بارەگەهێ وێ ل گوندێ دێرێ ل باکوورێ ئامێدیێ بوو، ل نیڤا گولانا ١٩٦٦ێ ژ هێزا ئامێدیێ پشتەرێ بوو و ئالۆزی ئێخستە ناڤ رێزێن پێشمەرگەی، لێ هێزا ئامێدیێ و هێزا شێخان هاریکاریا ئێك کرن و ئەو ژ دەڤەرێ دەرئێخستن، ئینا خۆڤەکێشانە ناڤ ئامێدیێ کو لێژنا ناڤخۆیا پارتی ل ئامێدیێ یا پشتەڤانیا جودابوویان دکر رۆلێ خۆ د پشتەرێبوونا وێ هێزێ و بەرپرسێ وێ سدقی حەجی شەعبان دا هەبوو[٤٨٤].

جودابووی ژ ئامێدیێ چوونە گوندێ بادێ و دگەل لایەنگر و پشتەڤانێن خۆ خرڤەبوون، ژ وانا: رەشید ئاغایێ دۆسکی، تێلی ئێکمالەیی و عەلی حەجی شەعبان و هەماهەنگی و هاریکاری ل ناڤبەرا وان و لیوا ١٤ یا لەشکەرێ عیراقێ ب فەرمانداریا (نذیر الطالب) یا رۆهن و ئەشکەرا بوو، پێشمەرگەی

بزاڤ كر وان رازی بكەن ژ مەمانێ دەركەڤن و دێوالی ئاغایێ دۆسكی ژی مایێ خۆ د ڤێ مەسەلێ دا كر لێ یا بێ مفا بوو، فارس كۆرەماركی ژی بەحسێ وێ چەندێ دكەت كو وی دەمی وی مۆلەت وەرگرتبوو و ل گوندێ كەلا شخۆ یێ ئاكنجی بوو، لێ وی ب هەماهەنگی دگەل نعمان عیسا بەرپرسێ لقا ئێك یا پارتی دەست ب دژایەتیكرنا جودابوویان كر، بۆ ڤێ چەندێ ژی هەر ل گوندێ كەمەكا گەهشتنە ئێك و پلانەك دانا داكو هێرشێ بكەنە مەمانێ كو ل دۆرێن ٣٠٠ چەكداران لێ هەبوون، گوند ژ هەمی لایان ڤە دووریێچكر، لێ پشتی سەرنەكەڤتنا دەستكاتییا دێوالی ئاغای و پشتی رێككەڤتنێ دگەل برایێ وی رەشید ئاغای، پێشمەرگەی ب سەركردایەتییا فارس كۆرەماركی و پۆلەوان (عەریف) سلێمان و مەمۆ ئیبراهیم هێرش كرە جودابوویان یێن بێی بەرگری كرن رەڤینە گوندێ كورێت گاڤانا و قارقاراڤا و ئێكمالە، كو ئەڤ گوندە ژی د ڤالا بوون و د چارچۆڤێ دەڤەرێن ئازادكری دا بوون، د وێ هێرشێ دا جودابوویان ٤ چەكدارێن خۆ ژ دەستدان كو یێ ژ هەمیان دیارتر تێلی گەردی بوو[٤٨٥]، پشتی هنگی سدقی ئەحمەد و دەستەكا وی خۆڤەكێشانە ئامێدیێ و بارەگەهێ خۆ دانا گوندێ بێبادێ و هەتا رۆژا ١١ی ئادارا ١٩٧٠ێ تەقە كرن ل ناڤبەرا هەردوولا هەبوو كو حكۆمەتێ ل گوندێ قارقاراڤا كۆم كربوون، لێ پاشی پتریا وان ڤەگەریانە ناڤ رێزێن پارتی[٤٨٦].

ڤەرە بێژین دو ژ دیارترین سەركردێن جودابوویان ل بادینان كو ئەو ژی ئەحمەد عەبداللە ئامێدی و عەلی حەمدی بێدوهی بوون و ئەندامێن لیژنا ناوەندیا پارتی بوون، د شەرێ ناڤخۆیی دا بوونە قوربانی.

## نەهـ : رێككەڤتنا ٩ خزیرانا ١٩٦٦ێ و كۆنگرێ ٧ ێ پارتی

شكەستنا هێزێن حكۆمەتێ بەرامبەری خۆراگریا پێشمەرگەی ل شەرێ هندرین ــ زۆرك رەوشا سیاسی و سەربازی ل عیراقێ سەروبن كر و وەرگوهێزەك د پەیوەندیێن كوردی ــ حكومی دا پەیداكر و كاریگەری ل سەر شەرەنیخا سەربازی ــ مەدەنی هەبوو د بەرژەوەندیا وەلاتیێن سڤیل دا یێن داخواز دكرن دۆزا كوردی ب ئاوایەكێ ئاشتیانە بێتە چارەكرن، ژ بەر هندێ، عەبدلرەحمان بەزاز دەملدەست راگەهاند كو حەز دكەت دان وستاندن و ئاشتیێ دگەل سەركردایەتییا شۆرشا كوردی بكەت، ب ڤێ چەندێ ژی وی بەری سەركردێن سەربازی نەخاسمە ژی بەری عەبدلعەزیز عگێلی راكر یێن دگۆتن كو دشێن ب هێزا چەكی شۆرشا كوردی ژ ناڤ ببەن، بەزاز ل رۆژا ١٥ خزیرانێ راگەهاند كو یێ ئامادەیە دانپێدانێ ب مافێن نەتەوەیی یێن گەلێ كورد بكەت.

پشتی نێزیكی هەیڤەكێ ژ پەیوەندی و سەرەدانان، هەردوولا ل رۆژا ٢٩ی خزیرانا ١٩٦٦ێ گەهشتنە رێككەڤتنەكێ و وەك بەیان ل ئێزگەیێ عیراقێ هاتە خواندن، ئەو رێككەڤتن ژ ١٥ ماددان پێكهاتبوو و سێ ژ وان دنەپەنی بوون، ل دووڤ وێ (بەیانێ) حكۆمەتێ دانپێدان كر كو نەتەوێ كورد نەتەوەیەكێ سەرەكییە ل عیراقێ زمانێ كوردی ژی ب رەخ زمانێ عەرەبی ڤە زمانەكێ فەرمییە ل دەڤەرێن كوردی و كوردان د پەرلەمانێ نوو دا و د ناڤ لەشكەری و بیاڤێ دیپلۆماسی دا ل دووڤ رێژەیا خۆ نوونەرێن خۆ هەبن، لێ ماددەیێن نەپەنی، ئێك ژ وان ماددەیێ ئێكێ بوو و ل دووڤ وی ماددەی حكۆمەت رازییە لیوایەكا (پارێزگەهەكا) نوو ب ناڤێ لیوا دهۆك بێتە دانان و هەمی قەزا و ناحیێن كوردی یێن لیوا مووسل سەر ب وێ لیوایا نوو بن[٤٨٧].

هەرچەندە (بەیان) یا مژەوی بوو و ل ئاستێ هیڤیێن كوردان نەبوو، لێ بارزانی پشتەڤانی لێ كر و ل وێ باوەرێ بوو كو ئەڤە تنێ شەر راوەستاندنەكا كورتە بۆ دەم بۆراندنێ و خۆئامادەكرنێ بۆ شەرەكێ نوو، یا ژ ڤێ گرنگتر ژی، وی هەست ب ترسناكییا هندێ كر حكۆمەت جودابوویان پڕ پارە و چەك بكەت و ببیتە ئەگەرێ هندێ رەوشا كوردستانێ كمباختر لێ بهێت و شەرێ ناڤخۆیی هەل ببیت، كو ئەڤە بوو یا حكۆمەتێ حەز دكر بێتە رووددان، گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ، حكۆمەت یا بەردەوام بوو ل سەر

هاریکاریا ئەوێن ژ شۆرشا کوردی و پارتی جودا بووین، هەتا پشتی بارزانی ل سەر وێ (بەیانێ) رازی بووی ژی، حکۆمەتێ ئەو ژ چەك نەکرن و هەتا پشتی دەرکەڤتنا بەیانێ ژی شەر دگەل دکرن، ئەڤ پێرابوونە بوون یێن بارزانی پالداین بێژیت کو ئەو ژ ڤێ (بەیانێ) یێ رازی نەبوو و ب (بەیانەکا لاواز) ل قەلەم بدەت، کو ب راستی ئەڤە شەر راوەستاندنەکا کورتە و نە رێککەڤتنە[488].

لێ دگەل هندێ ژی، (ئەڤ بەیانە) پێنگاڤەك بوو بۆ توخیبدانا مایتێکرنێن بەغدا (ناوەندی) د کاروبارێن پارێزگەهێن کوردی دا و دبوو رێخۆشکرنەك بۆ هەمی دان وستاندنێن دووڤـرا دهێنە کرن و پارتی شیا کاریگەریا جودابوونا ل سالا ١٩٦٤ێ بەرهنگاری وێ بووی سنووردار بکەت و ل رۆژێن١٥-٢٠ی چریا دووێ یا ١٩٦٦ێ ب ئازادانە کۆنگری خۆیێ ٧ێ ل گەلاڵە گرێ بدەت.

وەکی هەرجار، سیاسەتا حکۆمەتێ بوو ئەگەرێ ئالۆزبوونا پەیوەندیێن وێ دگەل شۆرشا کوردی، حکۆمەتێ ب جهێنانا وێ (بەیانێ) بلۆك کر و هژمارەکا مەزن یا زیندانیێن سیاسیێن کورد ئازاد نەکرن و بەردەوام بوو ل سەر هاریکاری و پشتەڤانیا جودابوویان و پێکهاتێن کرێگرتیێن کورد نەهەلوەشاندن یێن بارزانی ب شەنکستەیێ هەمی دەردەسەریان ل قەلەم دان، هۆسا، ئالۆزی بوونە ئەگەرێ پەیدابوونا شەر ولێکدانان ل ناڤبەرا لەشکەری و پێشمەرگەی، ڤێجا داکو رەوش کمباختر لێ نەهێت، رۆژا ٢ی چریا ئێکێ یا ١٩٦٦ێ شاکر محەمەد شوکری وەزیرێ بەرەڤانیێ سەرەدانا بارزانی ل گەلاڵە کر و عەبدلعەزیز عگێلی ڤیا وان رەوشێن ئالۆز د بەرژەوندیا خۆ دا ب کار بینیت و جارەکا دی شەری ل دژی کوردستانێ رابگەهینیت، وی د پەیڤەکا خۆ دا ل کۆمبوونەکێ یا ل رۆژا ٢١ چریا ئێکێ ١٩٦٦ێ ل کۆچکا کۆماری هاتیە گرێدان داخواز کر کو پێدڤیە یا وی ب (پشتەرێبوونا بارزانی) ناڤکری بێتە سەرکوتکرن و پێدڤیە ب هێزا چەکی شۆرشا کوردی بێتە ژ ناڤبرن، لێ سەرباری ڤێ داخوازیا عگێلی، حکۆمەتێ دزانی کو دشیاندا نینە کێشە ب رێیا سەربازی بێتە چارەکرن و رۆژا ٢٨ی چریا ئێکێ سەرۆك کۆمار عەبدلرەحمان عارف سەرەدانا بارزانی کر و ل دیانا دگەل کۆمبوو، کو ئەڤە ژی ئێکەمین دیدار و سەرەدانا سەرۆکێ دەولەتا عیراقێ بوو دگەل بارزانی، ئەڤ سەرەدانە ژی بوو ئەگەرێ دلگرانی و تۆرەبوونا مەزنە سەرکردەیێن سەربازی و وەك ژ بەردانان و سڤکاتی بۆ خۆ ل قەلەم دان، ل پێشییا وان ژی سەرۆك وەزیر ناجی تالب[489].

ژ بۆ ڤەکۆلینا ڤی هەلویستی و ل بن سیبەرا ڤێ رەوشێ و ڤان وەرارێن سیاسی، پارتی ل رۆژێن ١٥-٢٠ی چریا دووێ یا ١٩٦٦ێ کۆنگرێ خۆیێ ٧ ێ ل گەلاڵە گرێدا و ٢٤٥ نوونەر ئامادەی کۆنگرەی بوون، ژ وانا ١٠٠ نوونەرێن لقا ئێك کو بارەگەهێ وێ ل بادینان بوو و تێدا ئەڤێن خوارێ ئەندامەتیا لیژا ناوەندی ب دەستڤە ئینان: سالح یوسفی بۆ جارا ئێکێ بوو ئەندامێ مەکتەبا سیاسی، شەوکەت ئاکرەیی، نعمان عیسا، ئەحمەد جەرگیس و عەبدلمەجید ئەترووشی، هەروەسا نەجمەددین سەعید یوسفی بۆ ئەندامەتیا لیژنا بلندا چاڤدێرێ و پشکنینێ سەرکەڤتن ب دەستڤەئینا و کۆنگرەی هەمی ئەوێن پشتی سالا ١٩٦٤ێ ژ ناڤ رێزێن پارتی دەرکەڤتین دەرئێخستن، کو ئێك ژ وان عەگید سەدیق بوو[490].

ل ئادارا ١٩٦٧ێ ژی سەرکردایەتیا نوو بریاردا کو پێدڤییە رۆژنامەیەك ب زمانێ عەرەبی ل بەغدا ب ئاوایەکێ ئەشکەرا بێتە دەرئێخستن داکو ببیتە زمانحالێ پارتی بۆ دەربرینا هیڤی یێن نەتەوەیی یێن گەلێ کورد و ببیتە پێکوهورەك بۆ پەخشێ ئیزگەیێ (دەنگێ کوردستانا عیراقێ) یا شۆرشێ ل دووڤ رێککەڤتنا ٢٩ی خزیرانا ١٩٦٦ێ پەخشێ وێ راوەستاندنی، هۆسا، ئێکەمین هژمارا رۆژنامەیێ ب ناڤێ (التآخي) ل رۆژا ٢٩ی نیسانا ١٩٦٧ێ دەرکەڤت کو سالح یوسفی سەرنڤیسەر وێ بوو و شەوکەت ئاکرەیی ژی ئێك بوو ژ ئەندامێن دەستەکا نڤیسەرێن رۆژنامەیێ، هەرچەندە ژی رۆژنامە ب ئەشکەرایی دەردکەڤت، پارتی بەردەوام بوو ل سەر دەرئێخستنا

رۆژناما خۆیا (ناڤخۆیی) ئانكو رۆژناما خەبات (النضال) ب هەردو زمانێن كوردی و عەرەبی.

نعمان عیسا ئەندامێ لیژنا ناوەندی بەرپرسیا لقا ئێك یا پارتی ب ستۆوێ خۆڤە گرت كو بارەگەهێ وێ ل گوندێ گلناسكێ ل دەڤەرا دهۆك بوو و رەشید عارف ئەترووشی، مەلا سالح بالقۆسی، مەلا عەلی بەرۆشكی و شەعبان سەعید ژی وەك ئەندامێن لقێ هاتینە نیاسین.

ل مووسل ژی، رێكخستنا پارتی شیا دووبارە لیژنا ناڤخۆیی پێك بینیت پشتی ئەو لیژنە ب داوی هاتی دەمێ ل خزیرانا ١٩٦٥ێ ئەندامێن وێ هاتینە گرتن، لیژنا نوو ل رۆژا ١٥ چریا دووێ ١٩٦٥ێ ژ ڤان هاتە پێك ئینان: مستەفا خۆخێ بەرپرسێ لقێ، تاهر سەلیم، ئۆسمان گۆیی، محەمەد ئەمین (جانۆ)، حسێن حسێن گۆیی، عائشە محەمەد عەبدواللایێ ستیێ ئەندامێن لیژنێ بوون[٤٩١].

مستەفا خۆخێ گەهشتە شۆرشێ و پشتی وی ژی بەشیر حاجی كۆری گەهشتێ، هۆسا لیژنە ما بێ بەرپرس، ژ بەر هندێ، نعمان عیسا بەرپرسێ لقا ئێك فەرماندا لیژنەیەكا نوو ب رێیا محەمەد ناسر بێتە پێكئینا كو وی دەمی گەهشتبوو شۆرشێ، ئینا فاروق ئاكرەیی راسپارد، لێ وی داخوازا لێبۆرینێ كر ژ بەركو قوتابی بوو، ئینا عەبدولرەحمان تاهر (ابو عوف) كو فەرمانبەر بوو ل رێڤەبەریا پەروەردەیا مووسل ئەو بەرپرسیاری ب ستۆوێ خۆڤە گرت و ژ ئەندامێن لیژنێ یێن هاتینە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: ئەحمەد محەمەد، حسێن حسێن، پاشی هەر ئێك ژك فاروق محەمەد حەسەن، فاروق مەحمود ئاكرەیی، محەمەد ئەمین (جانۆ)، عەبداللە تەمەر، سەبری محەمەد عەزیز، حەیدەر سەعەتچی و ئەحمەد عەبدال و ئەڤ لیژنە بەردەوام بوو هەتا ١٣ شواتا ١٩٧٠ێ یێ[٤٩٢] و هەر د وێ هەیامێ دا عەبدلرەحمان تاهر، حسێن حسێن و محەمەد ئەمین (جانۆ) تووشی گرتنێ بوون و ئەحمەد محەمەد و ئەحمەد عەبدال بێ سەروشوون بوون[٤٩٣].

پشتی كۆنگرەی، ریكخستنا مووسل شیا دەست ب چالاكیێن خۆ بكەتەڤە و رێكخستنا پشتەڤانا سەركردایەتیا بارزانی ڤەژینیت و د ڤی بیاڤی دا ئەڤێن خوارێ د دیار و بەرچاڤ بوون: تاهر شێخ عەبدلغەفور شوشی، نوری عەباس شنگالی، فاروق مەحمود، عوبەید عەبدلرەحمان ئاكرەیی، مستەفا خۆخێ، نوری ئەترووشی، هەروەسا چالاكیا قوتابیان ژی زێدە بوو كو بەرپرسێ وان فاروق مەحمود بوو نەخاسمە ژی پشتی ل چریا ئێكێ یا ١٩٦٧ێ زانكۆیا مووسل هاتییە ڤەكرن، ئەوێن رۆلەكێ بەرچاڤ د وان چالاكیان دا هەبوو ئەڤێن خوارێ بوون: رۆژ نوری شاوەیس (كولیژا ئەندازیاری)، ئازاد بەرواری (كولیژا زانستان)، شێركۆ دهۆكی و شەوكەت یەعقوب بامەرنی (كولیژا ڤیتێرنەری)، نوری كەریم خان ئاكرەیی و نەجمەددین كەریم (كولیژا نۆژداری) و هندەكێن دی[٤٩٤].

هەروەسا هەر ئێك ژ ئەڤێن خوارێ د چالاكیێن جەماوەری دا ددیار بوون: عابد ئەترووشی، ئەحمەد سەعدون دۆسكی، مەهدی حەجی محەمەد سێكانی، ئەحمەد مەلا عاسم، مەلا ئیبراهیم سپینداری، ئیبراهیم قادر گۆران، ئەحمەد دەروێش ئاكرەیی، فەیسەل گۆران[٤٩٥].

هەروەسا پۆستێ رێكخستنا مووسل بۆ بارەگەهێ لقا ئێك ل دهۆك و بۆ شێخان و ئاكرێ دهاتە ڤەگوهاستن ئەڤە ژی ب رێیا هندەك باوەرپێكریێن نەپەنی، ژ وانا: بەدریە عەبدولرەحمان دەیكا ئەندامێ پارتی محەمەد جاسم، عائیشە محەمەد عەبدوللا، مەلا ئەحمەد گۆران، محەمەد قەرۆ و مەلا ئیسماعیل كو ل ئاكرێ بوو [٤٩٦].

ل سالا ١٩٦٧ ێ ژی لقا ئێك یا پارتی فەرماندا رێكخراوەكا ئافرەتان یا سەر ب پارتی ل مووسل بێتە پێكئینان و ئەحمەد محەمەد ب وی كاری هاتە راسپاردن و ب ناڤێ رێكخراوا (خیشك) هاتە ناڤكرن و ژ هژمارەكا شانەیان پێك دهات و هژمارا ئەندامێن وێ ل ناڤبەرا ٦٥-٦٧ ئەندامان بوو و بەرپرسێن وان شانەیان ژی ئەڤە بوون: بەدریە عەبدلقادر حەمدی سەرباری ڤی كاری پۆستە ژی ڤەدگوهاست، عائیشە

محەمەد عەلی هەسنیانی، عائیشە هەڤژینا محەمەد گەردی، عائیشە باگردانی، حەربیە ئەحمەد جینی ئۆمەری هەڤژینا ئاڤدەل رێكانی، عائیشە حەسەن جبی ئۆمەری و هەڤژینا ئەحمەد عەبدال ژ بەردەڕەش. هەروەسا ل سالا ١٩٦٩ێ پێشنیازەك بۆ هەلوەشاندنا وێ رێكخراوێ هاتە بلند كرن و رازیبوون بۆ وێ هەلوەشاندنێ هاتە وەرگرتن و دوو هەیڤان بەری هەلوەشاندنێ مستەفا خۆخێ ببوو بەرپرسێ وێ رێكخراوێ و تنێ هندەك ئەندامێن وێ بۆ ڤەگوهاستنا پۆستەی هێلان كو ئەو ژی بەدریە عەبدولقادر و عائیشە حەسەن جبی بوون[٤٩٧].

هەژی گۆتنێ یە كو رێكخستنا پارتی ل مووسل ب پلا ئێكێ پشتا خۆ ب تەخا رێنجبەر و هەژار یا كرێكار و كاسبكارێن كوردێن مشەختبوویێن گۆیی و ئۆمەری و مزووری و گۆران گەرم دكر، ئەڤە سەرباری هژمارەكا قوتابی و فەرمانبەر و مامۆستایان[٤٩٨]، ئەڤ پێكهاتە ژی ژ ناڤێن پارتیێن توومارکری ل نك رێڤەبەریا ئەمنا موسل دیار دبیت دەمێ ل رۆژا ٩ێ شواتا ١٩٦٠ ێ مۆلەتا پارتی هاتییە دان[٤٩٩].

لێ ل قەزا ئاكرێ، پشتی كۆنگرێ ٧ ێ ئەڤێن خوارێ وەك ئەندامێن لیژنا ناڤخۆ هاتینە نیاسین: محەمەد شەریف كۆسە (بەرپرسێ لیژنێ)، ناجی سەبری، حەمید عەبدوللا، مستەفا سەید موئمن، محەمەد عەسكۆ، مستەفا عەبدلقادر، مام سەلیم عەلی و ئیبراهیم عەزیز عەبدۆ (ئەندامێن لیژنێ)، هەروەسا حكمەت مەلا عەزۆ، رەمەزان عەلی، عەباس سەدیق، سەدیق ئیسماعیل و مام سمایل چالاكڤانێن پارتی و ل بەردەڕەش ژی شانەیەكا حزبی یا چالاك ژ ئیبراهیم عەزیز عەبدۆ، ئیسماعیل رەزا، حسێن چیچۆ و ئەحمەدێ فەراش هاتە پێكئینان[٥٠٠].

بەرپرسێ لیژنێ لیژنا ناڤخۆیا شێخان ژی پشتی كۆنگرەی عەلی جۆقی بوو و ئەندامێن وێ یێن هاتینە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: حسێن بابە شێخ، عەلی بالەتەیی، سلۆ خدر، ئۆسمان عەلی (بەفرۆ)، حەسەن حەجی عیسا سپینداری، مەلا خەلیل مشەختی، جندۆ ئۆراها، ئەڤە سەرباری حسۆ میرخان و مەلا تاهیر رەشاڤەیی[٥٠١].

هەروەسا ل چریا ئێكێ یا ١٩٦٦ێ لیژنا ناڤخۆ ل قەزا ئامێدیێ هاتە پێك ئینان و هەتا تیرمەها ١٩٧٠ یێ ل سەر كارێ خۆ یا بەردەوام بوو و نەجمەددین یوسفی بەرپرسێ وێ بوو و ئەندامێن وێ یێن هاتینە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: مەلا ئەحمەد ئیسلام دوتازایی، تەیب محەمەد عەبداللە كیشكی، عەلی عوبەیداللە مایی، سەید سالح عەبدلخالق، جەعفەر محەمەد ئەحمەد توڤی، ئەحمەد عەبداللە بێدوهی، جەعفەر عەلی هرۆری و محەمەد سەدیق نێروەیی[٥٠٢].

لیژنا ناڤخۆیا دهۆك هاتە پێك ئینان و میكائیل سارکی بەرپرسێ لیژنێ بوو و ئەندامێن وێ یێن هاتینە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: سەعید ئەمین، حەسەن محەمەد بەزاز، مەلا قاسم كۆچەر، مستەفا مێرینی، یوسف میرخان، عەبدولكەریم فندی و محەمەد حەسەن عەبۆ و ل هاڤینا ١٩٦٨ێ دووبارە ئەو لیژنە هاتە پێكئینان و ژ لەزگین سندۆری (بەرپرسێ لیژنێ) و ئەندامێن وێ ژی ئەڤێن خوارێ بوون: حەسەن محەمەد بەزاز، قەهار ئیبراهیم، سەدیق خالد، رەجەب محەمەد هێتووتی، عەزیز محەمەد سەلمان، فازل حەسەن و عومەر ئێمینكی پێكهات و ل ناڤبەرا سالێن ١٩٦٦-١٩٧٠ێ بارەگەهێ وێ ل گوندێن پیرۆمەرا و شاوریكێ و گلناسكێ بوو[٥٠٣].

ل زاخۆ ژی لیژنا ناڤخۆ هاتە پێك ئینان ومەلا عەبدولكەریم سۆفی بەرپرسێ لیژنێ بوو و ئەندامێن وێ یێن هاتینە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: شەعبان سەعید محەمەد، عەلا عەبدلغەنی ئیبراهیم، مەلا تاها بۆسەلی، مەلا حەسەن حەجی سادقێ برۆ، عەلی خان حەجی حامد، ئیسماعیل حەجی بەدری، یۆسف تلۆ و عومەر یوسف و بارەگەهێ وێ ل گوندێ بێتاسێ بوو و ل رۆژا ئێكێ گولانا ١٩٦٧ێ دووبارە هاتە پێك ئینان و شەعبان سەعید محەمەد بەرپرسیا وێ ب ستۆوێ خۆڤە گرت و ئەندامێن وێ یێن هاتینە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: مەلا عەبدلغەنی ئیبراهیم، مەلا عەبدولكەریم سۆفی،

خەلیل حاجی، مەلا یوسف كرێت، حەبیب كەلەش، عەلی خان حەجی حامد، عومەر یوسف و بارەگەهێ وێ بۆ باتیفا هاتە ڤەگوهاستن، هەروەسا ل رۆژا ٢٥ ی ئادارا ١٩٦٨ێ دووبارە هاتە پێك ئینان و خەلیل حاجی بەرپرسیا وێ ب ستۆوێ خۆڤە گرت ئەندامێن وێ یێن هاتینە نیاسین ئەڤێن خوارێ بوون: مەلا تاها بۆسەلی، ئۆسمان قازی، مەلا عەبدولكەریم سۆفی، مەلا عەبدلغەنی ئیبراهیم، حەبیب كەلەش، مەلا یوسف كرێت، عەلی خان و عومەر یوسف، هەروەسا ل رۆژا ١٥ ی گولانا ١٩٦٩ێ مەلا تاها بۆسەلی بوو بەرپرسێ لیژنێ و مەلا حەسەن ئاڤدەل وەك ئەندام ل شوونا خەلیل حاجی هاتە دانان و ئەڤ لیژنە هەتا رۆژا ئێكی ئیلۆنا ١٩٦٩ێ ل سەر كارێ خۆ یا بەردەوام بوو و ل رۆژا ٥ ی ئیلۆنێ ئۆسمان قازی بوو بەرپرسێ وێ و شەفیق محەمەد سەعداللە وەك ئەندام ل شوونا مەلا حەسەن ئاڤدەل هاتە دانان و ئەڤ لیژنە هەتا رۆژا ١٨ ی ئیلۆنا ١٩٧٢ێ ل سەر كارێ خۆ یا بەردەوام بوو[٥٠٤].

پشتی دەست ژ كاركێشانا كابینا ویزاریا ناجی تالب، پەیوەندی ب ئاوایەكێ مەزن ل ناڤبەرا حكومەتێ و شۆرشا كوردی ئالۆز بوون و ژ بەر هەلویستێ دەمارگیریێ سەركردەیێن لەشكەری و هاندانا وان یا زێدە بۆ جودابوویان بۆ دژایەتیكرنا شۆرشا كوردی عەبدلرەحمان عارف ب خۆ پۆستێ سەرۆك وەزیریێ وەرگرت، عارف ل رۆژا ١٠ ی گولانا ١٩٦٧ێ كابینا خۆ یا ویزاری پێك ئینا و سێ كوردێن سەربخۆ یێن ناڤێن وان ل خوارێ وەزیر بوون د وێ حكومەتێ دا: لیوایێ خانەنشین فوئاد عارف جێگرێ سەرۆك وەزیری/ وەزیرێ ئاڤەدانكرنێ، ئەندازیار ئیحسان شێرزاد وەزیرێ بازرگانی و ئەشغالێن گشتی و موسلح نەقشبەندی (بامەرنی) وەزیرێ داد. ل سەر رێككەفتنا ٢٩ ی خزیرانێ ژی د پەیرەوێ وێ حكومەتێ دا هاتبوو كو پێدڤییە چاڤدانەكا تەڤاڤ ب كارێن باكوور بێتە دان و تەناهی بۆ دەڤەرێن وێ بێتە زڤراندن[٥٠٥].

لێ رۆژناما (التأخي) رەخنە ل پێكهاتا وێ كابینا ویزاری و پەیرە و پرۆگرام و پێكیرینەكرنا وێ ب رێككەفتنا خزیرانێ گرت، چونكی حكومەتێ ب راستا ل بەریوو ل هاڤینا ١٩٦٧ێ هێرشێ بكەتە كوردستانێ، لێ ژ بەر ترسناكییا رووداناں ل بەرەیێ عەرەبی ـ ئسرائیلی ل گولان و خزیرانێ بوو ئەگەرێ وێ چەندێ ئەو هێرش نەهێتە كرن و حكومەتێ خۆ وەسا دیار دكر كو حەز دكەت رێككەفتنا ٢٩ ی خزیرانا ١٩٦٦ێ بێتە ب جهـ ئینان[٥٠٦].

لێ ل بادینان، گوندێن كوردی یێن ل ناحیا (بەردەڕەش ژ لایێ چەتەیان ڤە هاتینە كۆنترۆل كرن، هەمی بۆ خودانێن وان نەهاتنە زڤراندن، هەرچەندە ملكدارێ وان مشیر ئیسماعیل ئاغایێ سەرۆكێ عەشیرەتا گێژ (گۆران) پشتی رێككەفتنا ئاگربەستا رۆژا ١٠ ی شواتا ١٩٦٤ێ ڤەگەریابوو دەڤەرێ و جارەكا دی پشتی دەستپێكرنەڤا شەڕی ل رۆژا ٦ ی نیسانا ١٩٦٥ێ نەگەهشتبوو ناڤ شۆڕشا كوردی[٥٠٧].

ل بهارا سالا ١٩٦٧ێ ژی چەتەیان ل ئاكرێ، ژ ئەگەرێ شەڕەدەڤەكێ یا بوویە ئەگەرێ كوشتنا زەلامەكێ وان، ئاگربەردانە گوندێ زێوكە (كو نۆكە د چارچۆڤێ بازێركی دایە) و حەفت كەسێن خەلكێ گوندی ل بەرچاڤێن دەستەلاتێ كوشتن، ژ وان یێن هاتینە كوشتن ئەڤێن خوارێ بوون: شاكر عەبداللە، عەبدلرەحمان بەكر (قوتابی)، مامۆستا محەمەد حەجی شەریف كو هاتە كوشتن و تەرمێ وی ب دووڤ ترۆمبێلێ ڤە هاتە ڕاخراندن و سڤكاتی پێ هاتە كرن، قولو و برایێ وی و هندەكێ دی، ئەڤ رووادانە بوو ئەگەرێ دەربەدەربوونا ب سەدان ئاكنجیێن وی گوندی و پەنابرنە دەڤەرێن ئازادكری[٥٠٨].

هەر ژ بەر وێ رووادانێ، رێكخستنا پارتی ل ئاكرێ تووشی ئیفلیجبوونێ بوو و كۆما ژێ مای ژی پەیوەندی دگەل پارتی ل مووسل هەبوون، ژ وانا: رەمەزان (نانپێژ)، سەدیق ئیسماعیل (دكاندار)، حكمەت مەلا عەزۆ (نڤیسەر ل قائیمقامیا ئاكرێ)، ناجی سەبری (فەرمانبەر)، محەمەد شەریف كۆسە (فەرمانبەر ل دادگەهێ)، بەكر زێوكی، مەلا ئیسماعیل (شۆفێر)، محەمەد قەرۆ (شۆفێر)، سەید مستەفا موئمن (برنپێچێ سەربازی)، شەریف شەنگۆ، سابر

رەشید، مستەفا سەلمان زێوكەیی و حەجی عیسا محەمەد شەریف زێوكەیی[٥٠٩].

ل دەستپێكا سالا ١٩٦٨ێ ژی، غازی حەجی مەلۆ ل دەڤەرا شێخان، ب هاریكاریا رژێمێ ژ شۆرشێ ڤاری بوو و ڤێ چەندێ رەوشەكا ترسناك ل دەڤەرێ پەیدا كر نەخاسمە ژی پشتی هێزێن پشتەڤانێن حكۆمەتێ هاتینە وێرێ، لێ هێزێن بەرگریێ نەچار كر ژ دەڤەرێ دەركەڤیت[٥١٠].

رێكخستنا قوتابییان ژی ل مووسل بەرهنگاری ئێكەمین درب بوو دەمێ ئامادەكاری بۆ ئاهەنگا نەورۆزا ١٩٦٨ێ دهاتنە كرن ئەڤە ژی دەمێ دەستەلاتێ لیستەك ب ناڤێن هندەك قوتابییان ل پشكا ناڤخۆیی یا زانكۆیێ ل دەڤەرا فەیسەلیێ دەستەسەركری، ئینا دەستەلاتێ هەر ئێك ژ ئازاد نەجیب بەرواری، جەرگیس حەسەن و رۆژ نوری شاوەیس گرتن و پاشی هاتنە ئازاد كرن پشتی چ دانپێدان نەكرین[٥١١].

كوردێن كرێگرتی ژی (ئانكو چەتە) دەست ب چالاكی و هەڤرویشبوونێ ب پێشمەرگەی كرن و هێرش دكرنە سەر چەپەرێن وان بووسە ل بەر ڤەددان و دەست ب رێ برینان كرن[٥١٢].

هەروەسا ل خزیرانا ١٩٦٨ێ هەردو وزیرێن كورد (هەردو نوونەرێن شۆرشا كوردی) وەزیرێ كاروبارێن باكوور عەبدلفەتاح شالی و وەزیرێ باژێرڤانییان و ئەشغالێ ئیحسان شێرزاد دەست ژ كاركێشانێن خۆ پێشكێشكرن وەك نەرازیبوون بەرامبەری گرنگینەدانا حكۆمەتا تاهر یەحیا (١٠ی تیرمەها ١٩٦٧ – ١٧ی تیرمەها ١٩٦٨ێ) ب دۆزا كوردی[٥١٣].

ل هەیڤا خزیرانێ، لێژنا ناوەندیا پارتی كۆمبوونەك گرێدا و د راپۆرتا كۆمبوونێ دا هاتبوو: هەمی گرۆڤە ئاماژێ دكەنە وێ چەندێ كو حكۆمەت سیاسەتا دەم بۆراندنێ دگەل شۆرشا كوردی ب كار دئینیت و كاری بۆ دەستپێكرنەڤا شەری دكەت، ژ بەر هندێ، دڤێت پێشمەرگە[٥١٤] یێ هشیار و ئامادە بیت بۆ روو ب رووبوونا هەر هێرشەكا دبیت بێتەكرن و ب دژواری بەرسڤا هەر دەستدرێژییەكێ بدەت، ب راستی ژی پێشمەرگە ل رۆژا ١٣ی نیسانا ١٩٦٨ێ شیا حەنەش حەمود ئەلیاوەر سەرۆكێ عەشیرەتا تەی (طي) ل دەشتا هەڤلێر بكوژیت كو ئێك بوو ژ كرێگرتیێن عەرەب، ئەو هاتە كوشتن چونكی كرێگرتیێن وی دەستدرێژی كربوونە سەر گوندێن كوردان و ئەو گوند پویرە و تالان كربوون، بەرامبەری ڤێ روودانێ حكۆمەتێ ژی كارڤەدانا خۆ هەبوو و وەزارەتا بەرەڤانیێ بەیانەك دەرێخست و تێدا هێرشەكا دژوار كرە سەر پێشمەرگەی، هەر وێ رۆژێ لیوا سێ هێرش كرە سەر چەپەرێن پێشمەرگەی ل دەشتا هەڤلێر، ل رۆژا ١٥ی نیسانێ ژی شەڕ و لێكدان ل ناڤبەرا هەردوولا گەرم بوون و پێشمەرگەی بەتالیۆن دووریێچ كر و رۆژا ١٨ی نیسانێ ژی لەشكەر تووشی شكەستنێ بوو و خۆ ژ دەڤەرێ ڤەكێشا پشتی ب دەهان كوشتی و بریندار داین[٥١٥].

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە، رەوش ل ناڤبەرا حكۆمەتێ و شۆرشا كوردی گەهشتە رادەیا نێزیكی بایكۆتكرنێ و هەردوولا خۆ بۆ گەڕەكا نوویا شەری ئامادە دكر، د وێ هەیامێ دا، ئانكو ل رۆژا ١٧ی تیرمەها ١٩٦٨ێ كۆدەتایەك چێ بوو و حوكمێ عەبدولرەحمان عارف هاتە لادان.

### دەهـ : كۆدەتایا ١٧ تیرمەها ١٩٦٨ێ و دەستپێكرنەڤا شەڕی

لاوازیا عەبدولرەحمان عارفی و سەرنەكەڤتنا وی د كۆنترۆلكرنا رەوشێ دا و نەمانا باوەریێ ل ناڤبەرا حكۆمەتێ و سەركردایەتیا شۆرشا كوردی، هەتا رادەیەكا وەسا حكۆمەتێ بەحسێ دۆزا كوردی نە دكر و هەمی ئەو لێژنە بلۆك كرن یێن بۆ ب جهئینانا رێككەڤتنا ٢٩ی خزیرانێ هاتینە پێكئینان، ئەڤ ئەگەرە و هندەكێن دی بوونە ئەگەرێ وێ چەندێ حزبا بەعس ب هاریكاریا مەزنە ئەفسەرێن لەشكەری دەلیڤەیەكێ بۆ خۆ ببینیت كۆدەتایەكا سەربازی ل رۆژا ١٧ی تیرمەها ١٩٦٨ێ بكەت و دەستێ خۆ دانیتە سەر حوكمی و عەبدلرەحمان عارف دووربێخیتە دەرڤەی وەلاتی و ستوونێن حوكمێ وی دەستەسەر بكەت، ژ وانا: تاهر یەحیا، عەبدولكەریم فەرحان

و عەبدلعەزیز عکێلی، هەروەسا ئەحمەد حەسەن بەکر ژی وەك سەرۆك کۆمار دامەزرینن.

بەعسییان سۆزدا دۆزا کوردی چارە بکەن و (بەیان)ا ٢٩ ی خزیرانێ ب جهـ بینن و داخواز ژ پارتی کرن پشکداریێ د حکۆمەتا نوو دا بکەت، لێ وان بۆ ئازراندنا وی، دو ژ کۆمەلا جودابوویان ل سەر کابینا خۆیا ویزاری زێدە کرن، ژ بەر هندێ پارتی هەردوو کاندیدێن خۆ موحسن دزەیی و ئیحسان شێرزاد ڤەکێشان.

بەعسییان د رۆژانێن ئێکێ یێن کۆدەتایا خۆ دا پێکۆلکرن حوکمێ خۆ ب ئاوایەکێ نوو نیشا بدەن کو نەوەکی حوکمێ وان یێ ٨ ی شواتا ١٩٦٣ یێ بیت، هەتا وان دانپێدان ژی ب شاشیێن حوکمێ خۆ یێن وی دەمی کرن و پێکۆل کرن خۆ نێزیکی پارتا کۆمۆنیستا عیراقی بکەن کو بەری هنگی بزاڤا ژ ناڤبرنا وێ کربوون، هەتا ئادارا ١٩٦٩ێ ژی چ شەر و هنگام ل ناڤبەرا حکۆمەتێ و شۆرشا کوردی نەهاتبوونە روودان، لێ ڤێ جارێ بەعسییان سەرکردایەتییا جودابوویان و چەکدارێن وان بۆ بەرژەوەندییا خۆ ب کار ئینان و ب پارە و چەکی هاریکارییا وان کرن بۆ دژایەتیکرنا شۆرشا کوردی، ژ بەر هندێ، وی دەمی هەتا نیسانا سالا ١٩٦٩ێ گەلەك شەر و لێکدان ل ناڤبەرا جودابوویان و پێشمەرگەی، هندەك جاران ژی ب رێکەڤت روو ب روو بوون دگەل لەشکەرێ عیراقێ ژی دهاتنە روودان[٥١٦].

ل ئەیلوولا ١٩٦٨ێ حکۆمەتا بەعس دان وستاندنێن کارتۆنی دگەل شۆرشا کوردی راوەستاندن و روویێ خۆیێ ب راستا ئەشکەرا کر و کریارێن خۆیێن سالا ١٩٦٣ یێ دووبارە کرن، ئەڤە ژی دەمێ دەست ب ئامادەکارییان بۆ دەستپێکرنەڤا شەری کری، نەخاسمە ژی دەمێ ل کانوونا دووێ یا ١٩٦٩ێ پێکۆلا گرتنا سالح یوسفی کری یێ کو گەهشتبوو بەغدا داکو سوپاسنامەیەکا بارزانی بگەهینیتە سەرۆك کۆماری و وەزیرێ بەرەڤانیێ حەردان تکریتی ژ بەر هەلویستێ وان یێ جوامێرانە بەرامبەری مالئاڤاییا داویێ یا شێخ ئەحمەد بارزانی ل رۆژا ١١ ی کانوونا دووێ و ڤەگوهاستنا تەرمێ وی ب فرۆکەیەکا هەلیکۆپتەر بۆ بارزان، هەرچەندە ژی یوسفی شیابوو خۆ رزگار بکەت، لێ ئەو پێکۆل پشکەك بوو ژ پلانەکا سەرانسەری، گرۆڤە ژی بۆ وێ چەندێ، حزبا بەعس دەست ب گرتنا هەر ئێکی کر یێ گومان ل سەر هەی پەیوەندی دگەل شۆرشا کوردی هەبووینە[٥١٧] و دەرگەهێن هەڤپەیڤینان دائێخستن و نەهێلان رۆژناما (التآخي) دەرکەڤیت و شەرێ دووبارە ل ئادارا ١٩٦٩ێ هاتنە دەست پێکرن، وەکی هەر جار، بەعس دەست ب سیاسەتا عەردێ سۆتی کر و ڤێ جارێ ئەو چەك ب کار ئینا یێ ژ لایێ جڤاکێ نێڤدەولەتی ڤە یێ قەدەغەکری بوو، وەکی بومبەیێن ناپالم و ترشێ کبریتیك، ئینا زەڤیێن گەنمی سۆتن داکو برس ل کوردستانێ بەلاڤ ببیت[٥١٨].

ڤێ جارێ ژی پتریا شەرێن مەزن ل دەڤەرێن سلێمانیێ و کەرکوك و هەڤلێر هاتنە روودان، چونکی هێزەکا کاریگەر یا جودابوویان ل وێرێ هەبوو و حکۆمەتێ پشتا خۆ پێ گەرم دکر بۆ دژایەتیکرنا شۆرشا کوردی، دیارترین شەر و ئۆپەراسیۆنێن ل وان دەڤەران هاتینە روودان، ئۆپەراسیۆنا لێدانا دام ودەزگەهێن نەفتا کەرکوك (بابا گورگور)، ئۆپەراسیۆنا شاخۆلان، شەرێ شارەزوور، شەرێ هەلەبجە ل گولانا ١٩٦٩ێ کو د یا داویێ دا سەرکردێ دەڤەرێ جێدارێ پێشمەرگە عەزیز ئەترووشی هاتبوو کوشتن، شەرێ دوکان، شەرێ گرتك، شەرێ پیرەمەگرۆن و شەرێ سووارداش بوون[٥١٩].

لێ ل بادینان، پتریا شەران ل دەڤەرێن شێخان و قەزا ئاکرێ هاتنە روودان و بارگرانیا بەرگریکرنێ ژی کەڤتە سەر ملێن حسۆ میرخان دۆلەمەری فەرماندێ هێزا دەڤەرێ، ل زڤستانا ١٩٦٩ێ دەنگ وباس گەهشتنە بارەگەهێ هێزێ کو لەشکەری هژمارەکا خەلکێ گوندێ پیریۆب یێن هەڤسۆز دگەل شۆرشێ دەستەسەر کرینە و چەتە دێ گەهنە مریبا، ئینا ب شەڤ پێشمەرگەی ب سەر پیریۆب دا گرت و کۆنترۆل ل سەر کر و ١٠ چەتە ب چەك ڤە دەستەسەر کرن، سپێدەیا رۆژا پاشتر ژی،

فرۆکان دەست ب بومبەبارانا دەڤەرێ کر، نەخاسمە ژی گوندێن تلان، بلان، بیرێ، باسڤرێ، مێرسیدا و توسب کو خەلکێ وان ژ بەر بومبەبارانێ گوندێن خۆ بەردابوون[٥٢٠].

ل بهارا ١٩٦٩ێ هێزەکا هەڤپشك یا پارتیزانێن کۆمۆنیست و پێشمەرگە ب سەرکردایەتییا تۆما تۆماس شیا بوون کۆنترۆلێ ل کورێ کۆخیێ بکەن و شیابوون بەرسینگێ لەشکەری و چەتەیان بگرن دەمێ پێکۆل کرین هێزا شێخان و ئاکرێ ل گوندێ باسڤرێ کۆنترۆل بکەن[٥٢١].

بۆ ب جهئینانا بەندا ئێك یا نەپەنی ژ رێککەڤتنا ٢٩ی خزیرانا ١٩٦٦ێ، جڤاتا ب ناڤێ جڤاتا سەرکردایەتییا شۆرشێ (مجلس قیادة الثورة) رۆژا ٢٧ گولانا ١٩٦٩ێ مەرسوومەك دەرئێخست بۆ پێکئینانا پارێزگەها دهۆك ژ قەزایێن خوارێ: دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ، ئاکرێ دگەل ناحیا ئەترووش (مزووری) کو ئەڤ ناحیە ب ئاوایەکێ بەروەخت گرێدایی قەزا شێخان بیت و قەزا ئاکرێ ژی گرێدایی لیوا مووسل بیت هەتا وی دەمێ ئەگەرێن کارگێری نەمینن[٥٢٢]، لێ حکۆمەتێ قەزا ئاکرێ ب پارێزگەها دهۆك ڤە گرێ نەدا و رۆژا ٢٩ی تیرمەها ١٩٧٩ێ ژی راپرسییەکا (ریفراندۆمەکا) کارتۆنی ل وێرێ کر کا ئەرێ خەلکێ وێ دڤێن ئاکرێ هەر سەر ب مووسل ڤە بیت یان ژی ب پارێزگەها دهۆك ڤە بێتە گرێدان، ئەنجام ژی ل دووڤ حەزوڤیانا سەرۆك عەشیرەت و چەتە و تاگرێن حکۆمەتێ (بەلێ) بوو بۆ مووسل و ئەو قەزا و ناحیا ئەترووش ب دهۆك ڤە نەهاتنە گرێدان پشتی سەرهلدانا ئادارا ١٩٩١ێ نەبیت.

حکۆمەتێ ژی ل رۆژا ئێکێ چریا ئێکێ یا ١٩٦٩ێ عەگید سەدیق ئامێدی وەك ئێکەم پارێزگارێ دهۆك دامەزراند و خەلك ژی ل بەرامبەری رێڤەبەریا پۆلیسێن دهۆك خرڤەبوون بۆ پێشوازیکرنا پارێزگاری کو ئامادە بوو و پەیڤەك پێشکێش کر و تێدا دامەزراندنا پارێزگەهێ ل وان پیرۆز کر[٥٢٣].

ل هاڤینا ١٩٦٩ێ و دگەل هێرشا هاڤینێ یا لەشکەری و چەتان بۆ سەر پێشمەرگەی ل بادینان، رێکخستنا پارتی ل مووسل بەرهنگاری هەوەکا گرتنێ بوو و چەندین ئەندام و تاگرێن وێ هاتنە دەستەسەر کرن، ژ وانا: نوری کەریم خان ئاکرەیی، مەلا ئیبراهیم سپیندارى، عەبدلرەحمان تاهر بەرپرسێ لیژنا ناڤخۆ، سەید محۆ کیکی، عەبدوللا سلێڤانی، ئۆسمان گولی، حەیدەر سەعەتچی، هەردو ئەندامێن لیژنا ناڤخۆ فاروق محەمەد و محەمەد ئەمین (جانۆ) و هەمی بۆ گرتیخانا (قصر النهاية) یا ناڤێ وێ ب خرابی چووی هاتنە ڤەگوهاستن و ل وێرێ بەرهنگاری ئەشکەنجەدان و گەف لێکرن و سێدارەدانێ بوون، لێ فاروق محەمەد ئاکرەیی ئەندامێ لیژنا ناڤخۆ شیا خۆ ڤەشێریت پاشی بچیتە هەڤلێر و پاشی ل سەنتەرێ ناحیا بەردەرەش خۆ ڤەشێریت کو ل وێرێ مستەفایێ برایێ وی وانەبێژێ خواندنگەها ناڤنجییا بەردەرەش بوو، فاروق محەمەد دبێژیت کو وی دەمی نامق رەقیب سوورچی رێڤەبەرێ ناحیێ بوو و عەبدوللا ئیسماعیل مەعروف فەرماندێ کرێگرتیێن باژێرکی بوو، لێ هەردووان چاڤێن خۆ ل چالاکی و هەبوونا وی ل مالا برایێ وی دنقاندن و هەر ل بەردەرەش دەست ب پەیوەندیێن خۆیێن حزبی کرییەڤە و پەیوەندی ب چالاکڤانێن حزبی ل بارەگەهێ خۆ و ل دەڤەرا بەردەرەش و مووسل و پاشی دگەل دەڤەرا شێخان کرییە[٥٢٤].

ژ وان شەر و ئۆپەراسیۆن و رووداێن هەر ژ تەباخا ١٩٦٩ هەتا ١١ی ئادارا ١٩٧٩ێ هاتینە رووداین و هەژی بەحسکرن و توومارکرنێ بن ئەڤێن خوارێ نە:

**١- شەرێ دەڤەرا شەمکان:**

سرتا چیایێ خێرێ ل دەڤەرا شەمکان و گوندێن دکەڤنە بنیا وی چیای، ژ وانا: بلان، تلە، بیرێ، باسڤرێ، مێرسیدا، سەرکاف، مێرگەبی، گڤارا، خورتا مەزن و خورتا بچووك، دەکان، نیرۆك و هەتا گەلیێ ئیسماوا، پەناگەهـ و بارەگەهێن پێشمەرگەی بوون ل دەڤەرا شێخان، ژ بەر هندێ، حکۆمەتێ ب هاریکاریا چەتەیان بریاردا کۆنترۆل بکەت و پێشمەرگەیێ ل وێرێ ژ ناڤ ببەت.

عەبدلجەبار ئەلئەسەدی سەرکردێ تیپا چوار ل مووسل بریاردا پلانەکا سەربازی دانیت بۆ پێشرەویکرنێ بەرەڤ دەڤەرێ و ب سەرداگرتنا وێ، ل پێشیێ دگەل ستوونێن تیپا خۆ سەح وسوپیا دەڤەرێ کر داکو باش هەر تشتەکی ژێ تۆپۆگرافیا وێ بزانیت و ب سەرۆکاتیا خۆ ژوورەکا بچووك یا ئۆپەراسیۆنان ل گوندێ مرێبا پێك ئینا و دو بەتالیۆنێن پیادە، دگەل بەتالیۆنەکا مغاویران، دگەل هژمرەکا کەتیبێن تۆپێن چیایی و چوار فرۆکەیێن شەرکەر و پتر ژ هزار چەتەیان بۆ هێرشێ ئامادە کرن[٥٢٥].

ب کورتی، ئارمانجا پلانا هێرشکرنێ ئەو بوو ل پێشیێ گوندێن گرەمیری، گڤارا، خورتا هەتا گوندێ دەکان کۆنترۆل بکەن، لێ هەکە کۆنترۆلکرنا وان گوندان گیرۆ بوو، هێرشێ ل تەوەرێ باکرمان ـ ئیسماوا ـ دەست پێ بکەن و هەلباسکی چیایێ خێرێ ببن و بگەهنە دەکان و بگەهنە هێزێن دی یێن ل وێرێ[٥٢٦].

وەك خۆئامادە کرن ژێ بۆ بەرسینگگرتنا ڤێ هێرشێ، حسۆ میرخان فەرماندا تەیمور عەبدال شێخکی فەرماندێ بەتالیۆنا چوار بەرپرسیا ڤێ هێرشێ ب ستۆوێ خۆڤە بگریت، ئینا وی پێشمەرگە ل دەڤەرێن گرنگ و هەستیار بەلاڤکرن و تۆپەکا ١٢٠ ملم ل سەر چیایێ خێرێ بۆ تۆپبارانکرنا خرڤەبوونێن لەشکەری و چەتەیان دەمێ پێشڤە دهێن دانان، هەروەسا داخواز ژ خەلکێ گوندێن ناڤبری کر هەردەمێ شەری دەست پێکر گوندێن خۆ بەردەن و قەستا دۆل و نهال و شکەفتان بکەن، حسۆ میرخان ژی چوو گوندێ شکەفتێ بۆ سەرکردایەتیکرن و رێڤەبرنا شەری، هەژییە بێژین ژی کو سەرکردایەتیا پێشمەرگەی ل وێ باوەرێ بوو هێرش ژ تەوەرەکی ب تنێ ڤە بێتەکرن، کەسێ هزرا تەوەرێ دووێ نەدکر کو لەشکەر و چەتە دێ ژ باکرمان ـ ئیسماوا بەرەڤ دەڤەرێ پێشڤە هێن[٥٢٧].

ل رۆژا ١٤ تەباخا ١٩٦٩ێ هێرشێ ب تۆپبارانەکا دژوار ژ مرێبا و باکرمان بۆ سەر چیایێ خێرێ و گوندێن بنیا وی چیای دەست پێ کر، ئینا خەلك نەچار بوو گوندێن خۆ بەردەن، پشتی تۆپبارانێ بومبەبارانا فرۆکەیان دەست پێ کر، پاشی لەشکەری پێشرەوی کر و ئێڤاری گەهشتە گوندێ گرەمیری و هێزێن هێرشکەر ئەو گوند کرە بنگەهێ دانانا تۆپ و نێرینگەها خۆ، لێ ئەو هێز ژ بەر تۆپبارانا پێشمەرگەی نەشیان وی گوندی ژ دەست نەدەن[٥٢٨].

## ٢- گوشتارا گوندێ دەکان:

هەروەسا ئێڤاریا ١٨ی تەباخێ لەشکەری و چەتەیان ژ تەوەرێ باکرمان ـ ئیسماوا هێرش کرە گوندێ دەکان و ژ رووبارێ خازری دەربازبوون بەرەڤ چیایێ خێرێ و گەهشتنە دەکان، لێ دیتن گوند یێ ڤالایە ژ خەلکێ وێ یێ پشکەکا وان قەستا شکەفتەکا مەزن یا نێزیکی گوندی کرین، دەمێ لەشکەر و چەتەیان گوهـ ل هەوار و قیژینا ژن و زارۆیێن د شکەفتێ ڤە بووی، دەست ب تەقەکرنێ کرن و کەپرێن ل بەر دەرێ شکەفتێ سۆتن، ژ بەر زیانێن ڤێ کەڤتین و بۆ تۆلڤەکرنا وان زیانان، سپێدەیا رۆژا ١٩ی تەباخێ[٥٢٩]، دار و پووش وپەلەخ ل بەر دەرێ شکەفتێ کۆم کرن و ئاگربەردانێ، ئینا شکەفت تژی دووکێل بوو، ئەو ژی ل دووراهیێیەکێ راوەستیان داکو نەهێلن کەس ژ شکەفتێ دەرکەڤیت، یێ بزاڤ کری خۆ رزگار بکەت ژی، دهاتە گوللەباران کرن، هۆسا ٧٤ ژن و زەلام و زارۆك ب سۆتن و خەندقینێ ب دووکێلێ ڤرکرن، پلاندانەرێ ڤێ تاوانێ عەبدولجەبار ئەسەدی بوو و یێن ئەو تاوان ب جهـ ئینایێن سەرباز و چەتە بوون.

دەمێ دەنگ وباسێن ڤێ تاوانێ گەهشتینە بارزانی، دەملدەست داخواز ژ ئەسعەد خۆشەوی کر تۆلا وان قوربانییان ڤەکەت، ئینا ل رۆژا ٣٠ی چریا ئێکێ تیپا (لەشکەرێ) بادینان شیا دربەکا ب هێز ل لەشکەری و چەتەیان بدەت و وان نەچار بکەت خۆ ژ دەڤەرێ ڤەکێشن[٥٣٠].

سەرکردایەتیا شۆرشا کوردی پەیوەندی ب دەستەیا نەتەوێن ئێکگرتی کر و هوورکارێن وێ تاوانێ بۆ ڤەگێران و گەلەك رۆژنامەڤانێن بیانی و

شاندەکێ خاچا سۆر گەهشتنە دەڤەرێ و سەرا شکەفتێ دان [٥٣١].

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە، هێزێن حکۆمەتێ و چەتەیان ل هاڤین و پاییزا سالا ١٩٦٩ێ ب هەمی هێز و شیانێن خۆ پێکۆل کرن هێزا (شێخان - ئاکرێ) ژ ناڤ ببەن، لێ سەرنەکەڤتن و پشتی سەرنەکەڤتنێ ژی پێکۆل کرن بەرۆکێن نوو ڤەکەن داکو بگەهنە بارەگەهێ هێزێ ل شکەفتێن دەڤەرا بەرواری ژێری [٥٣٢].

ژ وان پێشمەرگەیێن ل دەڤەرا شێخان رۆلەکێ کاریگەر و پێگۆتی د بەرەڤانیکرن و بەرگریکرنێ دا هەبووین و ل بەر سینگێ هێزێن حکۆمەتێ راوەستیاین ئەڤێن خوارێ بوون: تەیمو و نوری و شوکر و فەرەج کورێن حەجی عەبدال شێخکی، تیتان سالح کۆخی، تلیا ...، یوسف سەعدۆ ئەمین (یوسف تورك)، دەرویش ئیسماعیل بارزانی، سلێمان عیسا میتکی، شەعبان چالی زێباری، رەسول عومەر دەکانی، محەمەد ناسر گۆیی، پۆلەوان حەسەن بەرواری، یوسف دیزا سەید حاجی، رەمەزان زۆزانی، عەبدولکەریم ئانیتۆسی و ... هتد [٥٣٣].

### ٣- کوشتارا صۆریا:

ئەڤ گوندە دکەڤیتە رەخێ چەپێ یێ رووبارێ دیجلە و سەر ب قەزا زاخۆیە و چەند کیلۆمێترەکان دووری گوندێ پێشابیرێ یا نێزیکی توخیبێ سوریایە، وی دەمی نێزیکی ٢٠ خێزانێن جۆتیار لێ دئاکنجی بوون و پتریا وان فەلە (مەسیحی) بوون، صۆریا ئێك بوو ژ گوندێن پشتەڤان و لایەنگرێن شۆرشا کوردی و گەلەك خەلکێ وێ گەهشتبوونێ و هەردەم ژی پێشمەرگە دحەواندن و ئاهێن خورنێ ددانێ، ژ بەر هندێ، دەستەلاتێ ب کێمی سێ جاران ئاگربەردابوو وی گوندی، وەك سزادان بۆ خەلکێ وێ یێ پشتی هەر وێرانکرنەکێ دووبارە گوندێ خۆ ئاڤا دکرن، لێ د جارا چوارێ دا ئەو کوشتار هاتە روودان [٥٣٤].

ل دووڤ گۆتنا وان کەسێن ئەو روودان دیتین: سپێدەیا رۆژا سێ شەمبی رێککەڤتی ١٦ی ئەیلوولا ١٩٦٩ێ، کاروانەکێ ترۆمبێلێن لڤا (سریا) دو یا بەتالیۆنا سێ یا تیپا چوار کو پێکهاتبوو ژ دو زرێپۆشان و چوار ترۆمبێلێن زیل یێن سەربازی یێن سەرباز هەلگرتبوون دگەل دو ترۆمبێلێن جێپ یێن سەرکردایەتیێ ژ سەربازگەها ناحیا سلێڤانەیی (ئاسیهێ) بەرەڤ پێشابیرێ دلڤین بۆ پێککگوهورینا لڤا ل وێرێ و دەمێ ئەو کاروان د گوندێ صۆریا را دەرباز بووی، خەلکێ گوندی بۆ خۆپاراستنێ ژ بەلا وان وەسا خۆ دیار کر کو یێ پێشوازیێا وان دکەت، ئینا ئاڤ و فێقی پێشکێشی سەربازان کرن کو بەری هنگی سەرەدەرییێن خراب ژ وی لەشکەری دیتبوون.

پشتی بێنڤەدانەکا کورت، ئەو کاروان ژ گوندی دەرکەڤت و قەستا گوندێ بەغلۆجە کر، لێ د رێ دا و ل جهەکێ دبێژنێ ملا خویکێ ل نێزیك صۆریا، مینەك ل بن ترۆمبێلەکا زیل پەقی و هژمارەکا سەربازان بریندار بوون و ترۆمبێل هاتە سۆتن، ژ بەر هندێ، کاروان راوەستیا و فەرماندێ وێ جێدارێ ئێکێ یونس عەتار باشی پەیوەندی دگەل بارەگەهێ بەتالیۆنێ کر و ب وێ رووداندێ ئاگەهدار کر یا چ زیانێن گیانی ژێ چێ نەبووین و دیار کر کو دێ ل سەر رێڤەچوونا خۆ بۆ بەغلۆجە و پێشابیرێ بەردەوام بیت، لێ دەمێ دەست ب ڤاندنا کاروانی کری، هاریکارێ وی ئەفسەرێ بەعسی عەبدولکەریم محەمەد جحێشی نەرازیبوونا خۆ ژ دەستپێکرنەڤا رێڤەچوونێ دەربری و پرۆپاگەندا وێ چەندێ کر کو خەلکێ گوندێ صۆریایە یێ ئەو مین چاندی، ژ بەر هندێ، دڤێت ڤەگەرینە گوندی و دەرسەکێ بدەنێ چ جاران ژ بیر نەکەن، هیڤی و داخوازیێن سەرلقی و پلەداران چ مفایێ خۆ نەبوون کو بێتە رازیکرن ژ بەرکو چ گرۆڤە نەبوون خەلکێ گوندی پەیوەندی ب وێ رووداندێ ڤە هەبیت، ئینا جحێشی دگەل دو ترۆمبێلێن زیل یێن تژی سەرباز ڤەگەریا گوندی و ئەو ژی ل ترۆمبێلەکا جێپ ژ جۆرێ واز سوار بوو و ل وێرێ پتریا خەلکێ گوندی ژ ژن و زەلام و زارۆیان دگەل موختارێ گوندی خەمۆ مرۆکیل گەزنەخی ل بیستانەکێ نێزیکی گوندی کۆم کرن و پشتی جحێشی جڤین داینە

كوردان و خەلكێ گوندی، داخواز ژێ كر ئەوێ ئەو مین چاندی دانپێدانێ بكەت، هەكە نە، دێ هەمیان كوژیت بەری ژ گوندی دەركەڤیت.

قەشە حەننا یەعقوب نەجار[٥٣٥] مووسلی قەشەیێ گوندێ ئاڤزوریكێ یێ هاتیە صۆریا بۆ رێ ورەسمەكا ئایینی، پێكۆل كر لەشكەری هاویش بكەت و هیڤی كر خوون نەهێتە رێتن چونكی خەلكێ گوندی چ پەیوەندی ب روودانێ ڤە نەبوویە، لێ لەشكەری تەقە لێ كر و كوشت، موختار ژی دەمێ پێشڤە هاتی داكو تێككەهشتن ل ناڤبەرا وان چێ ببیت، ئەو ژی كوشت، پاشی رەشاشا خۆ ئاراستەی هەمی وان كەسان كر یێن ل بەرامبەری راوەستیاین و سەربازێن وی ژی نەدهێلا كەس بزاڤا رەڤینێ بكەت، پاشی فەرماندا سەربازێن خۆ وی جهی بسۆژن داكو چ بریندار رزگار نەبن، پاشی چوونە مالێن گوندی داكو ئاگری بەردەنێ و هەر ژن و زارۆیەكێ د رێیا خۆ دا ببینن بكوژن.

پاشی جحێشی قەستا سەنتەرێ ساخلەمیێ یێ ئاسیهێ كر و كریارا خۆ بۆ گۆت و فەرماندا وان چ بریندارێن وی گوندی چارە نەكەن ژ بەركو (پشتەرێ نە)، ژ بەر هندێ، بریندار هەتا رۆژا ١٧ی ئەیلوولێ بێ چارە كرن مان، ئینا خەلكێ گوندێ ئاڤزوریكێ د هەوارا صۆریا چوون و دگەل هژمارەكا خەلكێ بەغلۆجە چوونە زاخۆ داكو دەستكاتیێ (واستەیی یێ) ل نك ماقوولێن وێ بكەن و مایتێكرنێ بكەن و كێشەیا برینداران چارە بكەن، پشتی وەرگرتنا رازیبوونێ ل رۆژا ١٨ی ئەیلوولێ ٢٢ بریندار بو نەخۆشخانەیا كۆماری یا مووسل هاتنە ڤەگوهاستن.

د ڤێ تاوانا جحێشی دا ٣٧ كەس هاتنە كوشتن و خەلكێ گوندێن ئاڤزوریكێ و چەمزراڤ و مشارا و بەغلۆجە هەمی كوشتی ب كۆم د دو چالان دا ڤەشارتن (یێن مەسیحی د گۆڕەكی و یێن موسلمان د گۆڕەكێ دی دا) كو هەردو گۆڕێن ب كۆم ببوونە مەزارگەهـ بۆ خەلكێ گوندێن سلێڤانەیی، هەتا وی دەمێ ل سالا ١٩٨٥ێ كەڤتینە بن ئاڤا سكرێ مووسل.

پشتی بۆرینا چوار رۆژان ل سەر وێ تاوانا مەترسیدار، بەتالیۆنا سێ ب سەركردایەتیا پێشكار ئەحمەد ئیسماعیل هەوەكا بەرفرەهـ كر بۆ تێكەڕیان و پشكنینا گوندێن ئاڤزوریكێ، تیسانا و مشارا و گەف ل خەلكێ وان هاریكاریا پێشمەرگەی نەكەن، هەكە نە، چارەنڤیسێ وان دێ وەكی چارەنڤیسێ خەلكێ صۆریا بیت، فەرە بێژین كو كوشتارا صۆریا ترس ولەرز ئێخستبوو دلێ گوندیێن دەڤەرێ، هەتا گەلەك ژ وان گوندێن خۆ بەردابوون و رەڤیبوونە چیا و دۆلا و نهالان، ژ وانا خەلكێ گوندێ دێرەبوونێ ژی، چونكی فەرمان هاتبوو دان هەر گوندەكێ پێشمەرگە بچنە د ناڤ دا بێتە سۆتن[٥٣٦].

هەردو تاوانێن دەكان و صۆریا كوردستان هژاند و رۆژنامە و دەزگەهێن راگەهاندنێ یێن دەرڤەیی و ناڤخۆیی بەحسێ وان تاوانان كرن، هەر بۆ نموونە، دەنگ وباسێ كوشتارا صۆریا ب هژمارەكا زمانان ل ئیزگەیێ شۆڕشێ (دەنگێ كوردستانا عیراقێ) هاتە بەلاڤ كرن، ئدریس بارزانی ژی هەشت رۆژان پشتی وێ تاوانێ، ب رێیا كادرێ پارتی یۆنان هورمز كو ئەو ب خۆ ژی خەلكێ وی گوندییە و گەهشتبوو شۆڕشێ، ٥٠٠ دینار وەك هاریكاریەكا بلەز بۆ خەلكێ صۆریا هنارت[٥٣٧].

مەلا مستەفا بارزانی سەركردێ شۆڕشێ ژی ل رۆژا ١٥ ی چریا ئێكێ یا ١٩٦٩ یاداشتەكا پرۆتسۆكرن و رسواكرنێ ل دۆر كوشتارا هەردو گوندێن دەكان و صۆریا بۆ سكرتێرێ گشتیێ نەتەوێن ئێككرتی هنارت[٥٣٨].

هەر ژ بەر تاوان و كوشتارێن خەلكێ كوردستانێ، نەخاسمە مەسیحییێن ل صۆریا و جهێن دی یێن بادینان ل بن سیبەرا حوكمێ بەعس (٨ی شواتێ ـــ ١٨ ی چریا دووێ یا ١٩٦٣ و ١٧ی تیرمەها ١٩٦٨ێ ـــ ١٦ی ئەیلوولا ١٩٦٩ێ) تووشبووینێ، بارزانی ل چریا ئێكێ یا ١٩٦٩ ێ یاداشتەكا دی ئاراستەی ناوەندێن نێڤدەولەتی كر و تێدا رۆناهی ئێخستە سەر دەردەسەریێن مەسیحییان و سەركوتكرنا ل دژی وان دهێتە ب كار ئینان ژ بەر هەڤسۆزی و پشكداریا

وان دگەل شۆڕشا كوردی، ئەڤێن خوارێ ژی هندەك نموونەیێن وان زێدەگاڤییانە یێن د وێ یاداشتێ دا هاتین:

١- ل تیرمەها ١٩٦٣ێ بەعسییان هەشت مەسیحیێن باژێڕكێ تلكێفێ ب ئەشكەرایی و ل گۆڕەپانا گشتی سێدارەدان و خەلكێ وی باژێڕكی نەچاركرن سێدارەدانا وان ببینن و ئەو قەشەیێن تەرمێن وان ڤەشارتین ژی گرتن و چەند هەیڤەكان ل مووسل هاتنە زیندانكرن و رۆژانە تووشی ئەشكەنجەدان و قوتانێ دبوون.

٢- دەستەلاتا بەعسییان روفائیل شوریز سەرۆكێ بلندێ دێرێن كلدانێن كاسۆلیكێن جیهانێ دەستەسەركر و ب حەواندن و هاریكاریكرنا پێشمەرگەی گونەهبار كر و حەوالەی دادگەها سەربازیكر و حوكمێ سێدارەدانێ ل سەر هاتە دانان و وی دەمی هاتە رزگاركرن دەمێ پاپای ل رۆما مایتێكرن كری و سەرۆك كۆمارێ بەرێ یێ لبنان فوئاد شەهاب دەستكاتی بۆ كری، ئینا ئەو حوكم ب حوكمێ هەتاهەتایی دگەل كارێن ب زەحمەت هاتە گوهۆڕین[٥٣٩].

٣- ل سالا ١٩٦٣ێ مەتران تۆما ریس یێ ٨٠ سالی سەرۆكێ قەشەیێن زاخۆ و دەوروبەرێن وێ هاتە گرتن و ل گرتیخانا مووسل زیندان كر و ملك و مالێ وی ژی هاتە دەستەسەر كرن و بەعسییان وی دەمی ئازاد كر دەمێ زانی ل گرتیخانێ دێ گیانێ خۆ ژ دەست دەت، ب راستی ژی چەند رۆژەكان پشتی ئازادكرنێ وەغەرا داویێ كر.

٤- مار شلیتا مەترانێ ئامێدیێ هاتە گرتن و ل مووسل هاتە زیندان كرن.

٥- دێرا رەبەن هورمز و مار یاقۆ و دێرێن ئەردەنا و قەشە جەرجیس ل شێزێ و دێرێن شەرانش، ناڤ كەندالا، لێڤۆ، مەهمەدیێ، بەغلۆجە، مێزێ و دویرێ، پیركە، بێبادێ ل سالا ١٩٦٣ یێ هاتنە شەلاندن و تالان كرن و هەمی هاتنە سۆتن و كاڤلكرن، هەروەسا ئەبرەشیا كلدانیا ئامێدیێ و دێرا وێ هاتنە تالان كرن و هەر تشتەكێ تێڤە هاتە پەلخاندن و پەرتووكخانا ئەبرەشیێ كو خودانا خۆ و ٥ هزار پەرتووكێن دەستنڤیس و چاپكری بوو هاتە سۆتن.

٦- ل رۆژا ٢٨ی تیرمەها ١٩٦٩ێ ب سەدان سەرباز و چەتەیان ب سەر دەرگەهێ دێرا (السیدة) یا ئەلكویش دا گرت و هێرش كرنە سەر رەبەنان و رەبەن دەنۆ ئەلقوشی هاتە كوشتن و كولۆخێ قەشە عەبدالاحد تووشی شكەستنێ بوو و سەرێن هندەكێن دی ژی بریندار بوون، ئەڤە سەرباری بریندارب‌وونا هندەكێن دی ب گوللە و قەمان، پاشی ناڤمالیا دێرێ كو پارە و چەك بوون دزین، ئەڤە هەمی هاتە كرن چونكی وان هاریكاریا پێشمەرگەی دكرن.

جڤاكێن مەسیحی ل عیراقێ، نەخاسمە ژی ئەوێن ل دەرڤەی دەڤەرێن كوردستانێ، بەردەوام تووشی گەفێن وەكی چارەنڤیسێ صۆریا دبن[٥٤٠].

پشتی شەڕێ شەمكان و ژ بەر بەرگریا پێشمەرگەی، حكومەتا بەعس نەشیا چارچۆڤێ ئۆپەراسیۆنێن خۆ ل بادینان بەرفرەهـ بكەت و ل داویا سالا ١٩٦٩ێ ئۆپەراسیۆنێن وێ تنێ ل دەردۆرێن رێ یێن گشتی و بەرفرەهكرنا هێرشێن ئاسمانی بوون هەتا داویا سالا ١٩٦٩ێ، دبیت ژی شەڕێ داویێ یێ پێشمەرگەی ل داویا وێ سالێ ئەو شەڕ بیت یێ ل دەردۆرێن ئامێدیێ ل سەر چیایێ بالوول هاتیە كرن، كو د وی شەڕی دا پێشمەرگەی ب سەركردایەتیا عیسا سوار سێ رەبیێن ل هنداڤی ئامێدیێ ستاندبوون و لەشكەر نەچار كربوو خۆ ژێ ڤەكێشیت[٥٤١].

ل داویا سالا ١٩٦٩ێ بەعسییان زانی كو تایێ تەرازیا شەڕی یێ د بەرژەوەندیا شۆڕشا كوردی دا شۆڕ بیت، نەخاسمە ژی پشتی شەڕێن شارەزوور و دوكان و پیرەمەگرون و سووورداش[٥٤٢] و سەركەڤتنا پێشمەرگەی ل بادینان ب سەرداگرتنا گەلەك بنگەهـ و چەپەرێن لەشكەری و چەتەیان، ئەڤە هەمی بوونە ئەگەرێ بلندبوونا ورەیێن پێشمەرگەی و زێدەبوونا شیانێن وان یێن شەڕكرنێ، هەتا ل هژمارەكا دەڤەران ژ رەوشا بەرەڤانیكرنێ بەرەڤ رەشا

هێرشکرنێ چوون هەروەکی د شەرێ چیایێ بالوول دا هاتیە روویدان، سەرکردایەتیا شۆرشا کوردی ژی هزرا دانانا پلانان کر بۆ کۆنترۆلکرنا هندەك بنکەهێن گرنگ و هەستیار، دەمێ ئامادەکاری بۆ ب جهئینانێ تمام بووین، ل ئەیلوولا ١٩٦٩ێ نیشانێن داخوازیا حکۆمەتێ بۆ دان وستاندنان دەست پێ کرن، چونکی بەعسی پشتی شکەستنێن ئێك ل دووڤ ئێکێن لەشکەری و بنەجهبوونا هێلێن بەرۆکێن شەرێ د بەرژەوەندیا شۆرشگێرێن کورد دا، گەهشتنە وێ باوەریێ کو چارەسەریا سەربازی تشتەکێ مەحالە و بەردەوامبوونا شەری چ مفایێ خۆ نینە و دێ پاشەرۆژا رژێما وان ئێخیتە د مەترسیێ دا هەروەکی ل رۆژا ١٨ی چریا دووێ یا ١٩٦٣ یێ هاتیە روودان.

بارزانی چ باوەری ب بەعسیان نەبوو، ژ بەر هندێ رازی نەبوو دان وستاندنێ دگەل وان بکەت، ل پێشیێ بەعسیان سۆزدا رێککەڤتنا ٢٩ی خزیرانا ١٩٦٦ ێ ب جهـ بینن، لێ سەرکردایەتیا شۆرشا کوردی ئەو چەند رەت کر، چونکی دەم هاتبوو گوهورین و وێ رێککەڤتنێ چ مفایێ خۆ دگەل پێشهات و وێ قووناغا سەرکەڤتیا شۆرشێ نەبوو یا شۆرشێ بری[٥٤٣]، لێ رزگارکرنا کوردستانێ ژ دووریێچا ئابووری و ژ شەرێ ناڤخۆیی پشتی جودابوویێن سالا ١٩٦٤ێ گەهشتینە حکۆمەتێ یا چەك ددایێ، ئێك بوو ژ ئەگەرێن رازیبوونێ ب ئەنجامدانا دان وستاندنان.

تشتێ گرنگ د مەسەلێ دا ئەوە، ل رۆژا ٢٤ی چریا ئێکێ یا ١٩٦٩ێ کەسایەتیێ بەرنیاس عەزیز شەریف هەڤالێ دلسۆزێ بارزانی ژ لایێ حکۆمەتێ ڤە هاتە هنارتن و گەهشتە بارەگەهێ سەرکردایەتیا شۆرشێ و ئەو دگەل بارزانی و مەکتەبا سیاسییا پارتی کۆمبوو و ب ئاوایەکێ دەستپێکی رێککەڤتن هاتە کرن بۆ دەستپێکرنا دیالۆگێ، پشتێ ڤێ چەندێ، بەعسییان ژی زمانێ خۆیێ دفنبلندیێ گوهوری و دانپێدان ب هێزا شۆرشێ و نوونەریا وێ یا ب راستا کر بۆ هیڤیێن نەتەوەیی یێن گەلێ کورد، پشتی دان وستاندنێن دویر و درێژ و چەندین ئاستەنگ کەڤتینە درێ دا ل رۆژا ١١ی ئادارا ١٩٧٠ێ ئیمزا ل سەر وێ رێککەڤتنەکێ هاتە کرن و تێدا بەعس برپار ل سەر ئۆتۆنۆمیێ بۆ کوردستانێ دا، کو ئەڤ رێککەڤتنە ژی دەرگەهەك بوو بۆ سەردەمەکێ نوویێ پەیوەندییان ل ناڤبەرا حکۆمەتا عیراقێ و سەرکردایەتیا شۆرشا کوردی[٥٤٤].

## ژێدەر و پەراوێز

١. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: لیث عبدالحسین الزبیدي. ثورة ١٤ تموز في العراق، چاپا ٢ (بەغدا، ١٩٨١) بپ ٢٠ و یێن پشتی وێ.

٢. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني (الدکتور)، العراق دراسة في التطورات السیاسیة الداخلیه، ١٩١٤ تموز - ٨ شباط ١٩٦٣ (دمشق، ٢٠٠٨) بپ ٣٣ و بپ پشتی وێ.

٣. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: دیار محمد سعید الدۆسکی. لو لم تکن ثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، لکنا الیوم أسوء وضعا من کورد الاجزاء الاخری من کوردستان، کۆڤارا (مەتین)، هژمارە (١٢٦)، دهۆك، تیرمەها ٢٠٠٢ ێ.

٤. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. الحیاة الحزبیة في الموصل ١٩٢٦-١٩٥٨، (اربیل، ٢٠٠٣)، بپ ٤٤٠-٤٤٤.

٥. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني (الدکتور). صفحات من الذاکرة الموصلیة، مجموعة مقالات و مواضیع عن تأریخ الموصل القریب (دهوك، ٢٠١١)، ص ٢٤٩-٢٥٢.

٦. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة، ملاحظات تأریخیة و دراسات أولیة (اربیل، ٢٠٠١) ، ص ٥٤٩-٥٦٥.

٧. بنێره ئەرزوحالا د: (عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق ... بپ ٤٢٥-٤٢٦) دا.
٨. بۆ هووركارێن رەوشا سیاسی ل ئاكرێ بەری شۆرشا ١٤ تیرمەهێ بنێره: هەمان ژێدەر، بپ ٤٠٦ - ٤٣٦.
٩. خليل ابراهيم حسين. الصراع بين عبدالكرم قاسم و الشيوعيين و حلفائهم و ناظم الطبقجلي و القوميين، موقف الفرقة الثانية عند اعلان الثورة في: كركوك، اربيل، عقرة (بغداد ، ١٩٨٨)، ص ٢٧٣.
١٠. محمد صالح ئاكرەیی. (لواء الشرطة) (تعقيب حول ملف ئاكرێ)، مجلة دهوك، دهوك ٤، دهوك، ێب ١٩٩٨، ص ٩٩.
١١. بۆ هووركاریان بنێره: عبدالفتاح علی البوتانی. وثائق عن ....، بپ ٤١٩-٤٣٨.
١٢. ژ بەركو هژمارەكا زۆر یا هەڤوەلاتیيان ل ئاكرێ د گەهشتنە ناڤ ریزێن پارتی، پارتی پلا رێكخستنا خۆ ل وێرێ ژ (رێكخراو) بلند كره (لیژنا ناڤخۆیی) و ئەڤ ئەندامێن وێ هاتینە نیاسین: هاشم حەسەن (بەرپرس)، زەكی كامل و محەمەد مەحمود و یێن دی (ئەندام)، بنێره: محمد صالح ئاكرەیی. ژێدەرێ بەرێ. بپ ٩٩.
١٣. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن ....، ص ٤٢١.
١٤. بۆهووركاریان بنێره: عبدالفتاح علي البوتاني، الحركة القومية الكوردية التحررية، دراسات ووثائق (اربيل، ٢٠٠٤) ، بپ ٢٢٩-٣٤.
١٥. بۆ هووركاریان بنێره: رجب جميل حبيب، ئامێدی (العمادية) ١٩٢-١٩٧٥، دراسة في تأريخ السياسي (دهوك، ٢٠١٢) بپ ١٥٠-١٥٢.
١٦. رجب جميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٢-١٥٣.
١٧. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٤-١٥٥. یوسف صبری و دلۆڤان مستەفا، بۆ ئازادییا وەلاتی، بیرهاتنێن مستەفا نێرۆەیی، ب١(دهۆك، ٢١٢)، بپ ١٤.
١٨. بۆ هووركاریان بنێره: عبدالفتاح علي البوتاني. (محمد عبدالقادر علي الاميدی ١٩٢٣-١٩٩٢)، جندي مجهول في تأريخ الحركة الوطنية الكوردية)، كۆڤارا دهوك، هژماره (٢١)، دهۆك، چریا ئێكێ ٢٠٠٣، بپ ١١٤.
١٩. بۆ هووركاریان بنێره: عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، موقف الاحزاب السياسية العراقية من القضية الكوردية ١٩٤٦-١٩٧٠، (دهوك، ٢٠٠٧)، بپ ٩٧-١٠١.
٢٠. بۆ هووركاریان بنێره: رجب حميل. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٤-١٩٦.
٢١. بۆ هووركاریان بنێره: محمد محمد امين دربند فقرەیی، مذكرات، تقديم كمال مظهر احمد (الدكتور)، (سلێمانیێ، ٢٠٠٧)، بپ ١٩١-١٩٤.
٢٢. هەر ئەو ژێدەر، بەریەرێ ١٩٣، عبدالفتاح علي البوتاني ((نبذة عن الحياة السياسية في اميدی (العمادية)، ١٤ تموز ١٠٥٨-ايلول ١٩٦٠))، مجلة K21، العدد المزدوج (٢،٣)، اربيل، ٢٠٠٨، بپ ٧٣١-٧٣٥.
٢٣. ديار محمد سعيد الدوسكي، ژێدەرێ بەرێ.
٢٤. هلز عثمان ميرو. دهوك ١٩٤٥-١٩٧٥، دراسة تأريخية ـــ ميدانية، رسالة ماجستير غير منشورة، جامعة دهوك، ٢٠١١، بپ ٤٥-٤٦.
٢٥.رجب جميل. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٤.
٢٦. هەر ل رۆژا ئێكێ یا شۆرشێ پارتا كۆمۆنیست د بەیانەكا خۆ دا داخواز كربوو ئەڤ لیژنە بێتە پێكئینان بۆ زێرەڤانیكرنا ئەوێن تاگرێن شۆرشێ نینن و ئەندامێن وێ ژێ وەكی ئەندامێن بەرگری مللی بوون.
٢٧. هلز عثمان ميرو، هەر ئەو ژێدەر، بپ ٤٥-٤٦.
٢٨. بۆ هووركاریان بنێره: فارس كورەماركی. مذكرات فارس كورەماركی سيرة نضال مع البارزاني، تقديم و تعريب الدكتور جاسم الياس مراد (دهوك، ٢٠٠٢) بپ ٣٠-٣١.
٢٩. هلز عثمان ميرو، هەر ئەو ژێدەر، بپ ٨٩-٩١.
٣٠. هاشم عبدالرزاق صالح الطائي. ثورة الموصل القومية ١٩٥٩، دراسة تأريخية، رسالة ماجستير قدمت الى كلية الاداب/ جامعة الموصل، الموصل، حزيران ١٩٩٩، بپ ١٣٥.
٣١. كتاب امرية موقع الموصل، العدد (١٢٨) في ٢٨ اب ١٩٥٨، (ل نك نڤيسەرییە).
٣٢. بۆ دەقێ وێ نەرازیبوونێ یان یاداشتێ بنێره، عبدالفتاح علي البوتاني. الحركة القومية الكوردية، ٢٠٠٠، بپ ٥١٥.
٣٣. كتاب قائمقامية قضاء دهوك، العدد(٣٧١٣) في ٢٩ ايلول ١٩٥٨ (ل نك نڤیسەری هەیە).
٣٤. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق ... بپ ٦٢٢-٦٣٦.

٣٥. هلز عثمان میرو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٤.
٣٦. جريدة الحقيقة – راستی (الموصلية)، هژمارە (١)، ٧ ی گولانا ١٩٥٩ ێ.
٣٧. هلز عثمان میرو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٤-٩٥.
٣٨. بۆ زانیارینێن پتر بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق ... بپ ٨٠.
٣٩. وصفية محمد شيخو السندي، زاخو في العهد الملكي ١٩٢١- ١٩٥٨، دراسة تأريخية في اوضاعها العامة (دهوك،٢٠١٤)، بپ ٤٧٤-٤٧٦.
٤٠. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٤٧٦، سعيد الحاج صديق الزاخويي، زاخو الماضي والحاضر دراسة تأريخية أجتماعية سياسية اقتصادية شاملة - )دهوك، ٢٠٠٩)، بپ ١٤٠-١٤١.
٤١. سعيد الحاج صديق الزاخويي. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٢.
٤٢. عمار علي السمر. شمال العراق ١٩٥٨-١٩٧٥، دراسة سياسية (بيروت، ٢٠١٢)، بپ ١٧٥-١٧٦.
٤٣. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق ... بپ ٦٥٤-٦٦٢.
٤٤. بنێرە راپۆرتێن گۆتارخوون و گۆتارێن وان ل گوندێن سەرادایێن و ل تەباخ و ئەیلوولا ١٩٥٨ ێ بۆ کۆمیسەرێ ئەوقافا دهۆك هاتینە هنارتن، د ڤی ژێدەری دا: کوڤارا دهۆك، هژمارە (٣٣)، دهۆك، کانوونا ئێکێ ٢٠٠٦، بپ ٥٥-٦٢.
٤٥. بۆ وان پەیوەندیيان بنێرە: الشيخ محمود الصواف. من سجل ذكرياتي (القاهرة، ١٩٨٧) بپ ٢٥٠ و بپ پشتی وێ، هەروەسا بنێرە دەقێ ناما ( الصواف) یا بۆ جەمال عەبدلناسر هنارتی د بپ ٤٤٦-٤٥٣ ێ دا. بۆ پەیوەندیێن ئاغایێن کوردێن بەرهنگارێن حکومەتا شۆرشێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق ... بپ ٨٠، رجب جميل. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥١-١٥٢.
٤٦. بنێرە دەقێ وێ بەیانێ: عبدالفتاح علي البوتاني. العراق: دراسة في التطورات السياسية ... بپ ٤٠٥.
٤٧. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٤٠٤.
٤٨. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٤٠٩.
٤٩. بۆ هوورکاریيان بنێرە: هەر وی ژێدەری، بپ ٤٠٠- ٤١٤، هاشم عبدالرزاق الطائي، ژێدەرێ بەرێن ١٢٠-١٢٨.
٥٠. هاشم عبدالرزاق الطائي، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٩٥، هەروەسا بنێرە دەقێ بەیانێ ل بەرپەرێن ١٠٣-١٠٥.
٥١. بۆ هوورکاریيان بنێرە: نوری عبدالحميد العاني (الدكتور) و علاء جاسم الحربي (الدكتور)، تأريخ الوزارات العراقية في العهد الجمهوري ١٩٥٨-١٩٦٨، ج٢، ٧ شباط ١٩٥٩-١٣ تموز ١٩٥٩ـ ط٢، (بغداد، ٢٠٠٥) ، ص١٤٢- ١٤٥.
٥٢. بۆ ناڤێن وان بنێرە: هاشم عبدالرزاق الطائي. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٥ و پاشبەندا ١٤، وزارة الدفاع محاكمات المحكمة العسكرية العليا الخاصة، ج ١٣ (بغداد، ١٩٦٠) بپ ٣٠.
٥٣. بۆ هوورکاریيان بنێرە: خليل ابراهيم حسين. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٧ و ییێن پشتی وێ.
٥٤. هەمان ژێدەر، بپ ١٧٩.
٥٥. بۆ دەقێ وێ راپۆرتێ بەرێ بدە: خەليل ابراهيم حسين، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨٨-٢٩١.
٥٦. هەمان ژێدەر، بپ ٢٨٤-٢٨٧.
٥٧. بۆ هوورکاریيان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن ... بپ ٤٢٣.
٥٨. بۆ دەقێ بروسکێ بنێرە رۆژنامەیا الحقيقة ـــ راستی ـــ هژمارە (٣) یا گولانا ١٩٥٩ ێ.
٥٩. هەمان ژێدەر: هژمارە (١٣)، ٢٨ ی خزیرانا ١٩٥٩ ێ.
٦٠. هەمان ژێدەرـ هژمارە (٢١)، یا ٢ ی تەباخا ١٩٥٩ ێ.
٦١. رجب جميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٩.
٦٢. هەمان ژێدەر، بپ ١٥٩-١٦٢.
٦٣. بۆ هوورکاریيان بنێرە: هلال ناجي. حتى لا ننسى، فصول من مجزرة، الموصل، ج٢ (بغداد، ١٩٦٣)، بپ ٨١.
٦٤. هلز عثمان میرو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٠-٥١.
٦٥. بۆ هەلویستێ دهۆك ل دۆر بزاڤا شەواف و راستیيا رووداێن ل باژێری هاتینە روودان و حوکمێن دەرهەقێ گونەهباران دەرکەڤتین، بنێرە: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٠- ٩٩.
٦٦. بنێرە: رۆژناما خەبات، (ايضاح حول حوادث دهوك)، هژمارە ١٨١ یا ٦ ی ئادارا ١٩٦٠ ێ دا.
٦٧. خليل ابراهيم حسين. بپ ٢٦٤.

٦٨. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢٦٤.
٦٩. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢٦٦.
٧٠. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢٦٥.
٧١. ئەرزوحالەكا رۆژا ١٩٥٩/٥/١٧ ێ یا بۆ عەبدلكەریم قاسم هاتییە هنارتن (ل نك نڤیسەرییە).
٧٢. ژیان عەمەر، قەهرەمانێ چوار سنورا شەهید عەمەرێ لەعلێ (دهۆك، ٢٠٠٥)، بپ ١٨.
٧٣. عصمت دینو، مذكرات عصمت دینو البنستاني السندي سیرة مناضل في ثورة ایلول الكوردیة ١٩٥٩- ١٩٩١، (دهوك، ٢٠٠٩)، ص ٢٩-٣٥.
٧٤. سعید الجاج صدیق الزاخویی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤١-١٤٢.
٧٥. بۆ هووركاری و پێداچوونا ناڤەرۆكا هژمارەیێن رۆژنامەیێ و چەوانییا دەركەڤتنا وێ بنێرە، عبدالفتاح علي بوتاني (الدكتور)، جریدة الحقیقة - راستی، اول جریدة عربیة كوردیة في مدینة الموصل، (دهوك، ١٩٨٨).
٧٦. بۆ هووركاریان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق ... بپ ٤١٩-٤٤٧.
٧٧. بنێرە: رۆژنامەیا الحقیقة – راستی، هەردوو هژمارەیێن (١٨-٢٤) یێن رۆژێن ٢٢ و تیرمەها ١٩٥٩ێ و ٣ ێ نیسانا ١٩٦٠ێ.
٧٨. نوزاد ملا خلیل مشەختی، كامیران ابراهیم مشەختی، (بەرهەڤكرن)، دیوانا مەلا خەلیل مشەختی، بەرگێ ئێكێ، (دهۆك، ٢٠١٢)، بپ ٢٣-٢٤.
٧٩. رۆژنامەیا (اتحاد الشعب)، هژمارە ٢٠٢ یا ٢٠ێ ئیلونا ١٩٥٩ێ.
٨٠. عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن ... بپ ٤٣٥-٤٣٦، (نڤیسارا موتەسەرفیێ ل نك نڤیسەری هەیە).
٨١. عبدالفتاح علي البوتاني، الحركة القومیة الكوردیة ... بپ ٢٢٩-٢٤٩.
٨٢. بۆ دەقێ وێ بەیانێ بنێرە: جریدة الحقیقة – راستی، هژمارە ١٤، ٢ ێ تیرمەها ١٩٥٩ێ.
٨٣. هەمان ژێدەر، هژمارە ١٣، ٢٨ێ خزیرانا ١٩٥٩ێ.
٨٤. بۆ دەقێ وێ بەیانێ بنێرە، هەمان ژێدەری، هژمارە ١٥، ٥ ێ تیرمەها ١٩٥٩ ێ.
٨٥. بۆ دەقێ گۆتارێ بنێرە صفحة جدیدة للتأریخ الكوردی بعد ثورة ١٤ تموز، رۆژنامەیا الحقیقة – راستی، هژمارە ١٧، ١٣ ێ تیرمەها ١٩٥٩ێ.
٨٦. نڤیسارا هاریكاریا پۆلیسێن شێخان، هژمارە (٣/١٤٨) یا رۆژا ٨ ێ تیرمەها ١٩٥٩ ێ (ل نك نڤیسەری هەیە).
٨٧. ل سەر هووركاری و پلانا تیرۆركرنێ بنێرە: فؤاد الركابي، الحل الأوحد (القاهرة)، ١٩٦٢.
٨٨. بۆ هووركاریان بنێرە : عبدالفتاح علي البوتاني، العراق، دراسة في ....، بپ ٢٤٣-٢٤٥.
٨٩. مسعود البارزاني، البارزاني والحركة التحرریة الكوردیة، الكورد وثورة ١٤ تموز ١٩٥٨، بەرگێ ٣، ١١ ایلول ١٩٦١ (كردستان، ١٩٩٠) بپ ١٢٧-١٢٨.
٩٠. عبدالفتاح علی البوتانی، وثائق عن ....، بپ ٧٦، ل دۆر هەلویستێ پارتی و بارزانیێ سەرۆكێ وێ ل سەر پێكۆلا تیرۆركرنێ، بنێرە: فرهاد محمد احمد، رۆژنامەیا خەبات، (النضال) ١٩٥٩-١٩٦١، دراسة تأریخیة (هەڤلێر، ٢٠٠٨) بپ ١٢٦-١٢٩.
٩١. عبدافتاح علي البوتاني، وثائق عن....، ص٧٦
٩٢. رۆژنامەیا (اتحاد الشعب) هەردوو هژمارەیێن ٢٢١ و ٢٢٤ یێن رۆژێن ١١ و ١٤ ێ چریا ئێكێ یا ١٩٥٩ێ.
٩٣. ژێدەرێ بەرێ، هژمارەیێن: ٢٢٠، ٢٢١، ٢٢٤، ٢٢٥، ٢٣٠ یێن رۆژێن ١٠، ١١، ١٤، ١٥، ٢١ ێ چریا ئێكێ یا ١٩٥٩ێ.
٩٤. ژێدەرێ بەرێ، هژمارەیێن: ٢٢٠، ٢٢١، ٢٢٤، ٢٢٥ یێن رۆژێن ١٠، ١١، ١٤، ١٥ ێ چریا ئێكێ یا ١٩٥٩ێ.
٩٥. فرهاد محمد احمد، رۆژنامەیا خەبات ....، بپ ١٢٩.
٩٦. رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٣-١٦٤، فرهاد محمد احمد، رۆژنامەیا خەبات ....، بپ ١٢٨-١٢٩.
٩٧. عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن ....، بپ ٣٩٠-٤١٩.
٩٨. رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٢-٢٠٣.
٩٩. شێخ مووسێ وەرمێلی، شۆرەشا ئەیلوولێ ل دەڤەرا زاخۆ (دهۆك، ٢٠٠٠) بپ ١٦.
١٠٠. هلز عثمان میرو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٤.
١٠١. بۆ هووركاریان بنێرە، عبدالفتاح علي البوتاني، العراق، دراسة ....، بپ ١٤٩ و یێن پشتی وێ.

١٠٢. بۆ ناڤێن پێشکێشکەر و پشتەڤانێن داخوازنامێ بنێرە: رۆژنامەیا خەبات، هژمارە ١٤١ یا رۆژا ١٠ی کانوونا دووێ یا ١٩٦٠ێ.

١٠٣. بۆ دەقێ پەیرەو و پرۆگرامی بنێرە: رۆژنامەیا خەبات، هژمارە ١٤٨، ١٨ ی کانوونا دووێ یا ١٩٦٠ێ.

١٠٤. شیرکو فتح الله عمر. الحزب الدیمقراطي الکوردستاني و حرکة التحرر القومي الکوردستانیة في العراق ١٩٤٦-١٩٧٥ (السلیمانیة، ٢٠٠٤) بپ ١٤٣، عبدالفتاح علي البوتاني. العراق دراسة .... بپ ٢٧٨.

١٠٥. حبیب محمد کریم. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٧-٦٩.

١٠٦. رۆژنامەیا خەبات ، هژمارە ١٩٣ یا ٢٤ی ئادارا ١٩٦٠ێ.

١٠٧. هەمان ژێدەر، هژمارە ١٩٥ یا ٦ی نیسانا ١٩٦٠ێ.

١٠٨. عبدالفتاح علی البوتاني. صفحات من الذاکرة .... بپ ٢٥٩.

١٠٩. بۆ ناڤێن وان بنێرە بەریەرێن بهێن.

١١٠. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ٥٤٩، الحیاة الحزبیة في الموصل .... بپ ٣٣٨، صفحات من الذاکرة الموصلیة .... بپ ٢٥٩-٢٦١.

١١١. عبدالفتاح علي البوتاني. صفحات من الذاکرة الموصلیة .... بپ ٢٦٠-٢٦١.

١١٢. زانیارێن تایبەت.

١١٣. فرهاد محمد. من وثائق الحزب الدیمقراطي الکردستاني- العراق ٤ نیسان ١٩٥٩- ٨ اذار ١٩٦١، (دهوك،٢٠١٣) ص ١٥٠ .

١١٤. بۆ ناڤێن پارتیێن قەزایێن ئاکرێ، شێخان، مووسل و زاخۆ یێن پشتی مۆلەت وەرگرتنا پارتی ل رێڤەبەریا ئەمنا مووسل هاتینە توومارکرن، بنێرە بەریەرێن بهێن.

١١٥. رجب جمیل. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٣.

١١٦. رجب جمیل. هەمان ژێدەر، بپ ٢٠٤- ٢٠٥.

١١٧. هەمان ژێدەر ، بپ ٢٠٥.

١١٨. بۆ هوورکاریان بنێرە :عبدالفتاح علي البوتاني. (نبذە عن الحیاة السیاسیة في امیدي (العمادیة)، ١٤ تموز ١٩٥٨-١١ ایلول ١٩٦١) مجلة K٢١ ، هژمارە (٢-٣)، هەڤلێر ٢٠٠٨، بپ ٦٣٧.

١١٩. عبدالفتاح علي البوتاني. هەمان ژێدەر.... بپ ٧٣٦-٧٣٧.

١٢٠. عبدالفتاح علي البوتاني. الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة .... بپ ٢٢٣.

١٢١. بۆ هوورکاریێن بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة .... بپ ٢١١-٢٢٨.

١٢٢. نڤیسار ل نك نڤیسەری هەیە.

١٢٣. ئەو کۆمەلە وەکی روویەکێ کۆمۆنیست بوو، ل سالا ١٩٥٢ێ هاتییە دامەزراندن و ل کانوونا ئێکێ یا ١٩٥٨ێ مۆلەت وەرگرتییە.

١٢٤. بۆ هوورکاریان بنێرە: رجب جمیل. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٦-١٩٧.

١٢٥. عبدالفتاح علي البوتاني. الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة .... بپ ٤٩٩.

١٢٦. بنێرە ناڤێن یێن دی د بەریەرێن بهێت دا.

١٢٧. شێخ مووسێ وەرمێلی. شۆرەشا ئەیلولێ ل دەڤەرا ئامێدیێ (دهۆك، ٢٠٠٥)، بپ ٢٧-٢٨.

١٢٨. هلز عثمان میرو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٥.

١٢٩. شێخ مووسێ وەرمێلی. شۆرەشا ئەیلولێ ل دەڤەرا دهۆك (دهۆك، ٢٠٠١)، بپ ١٩-٣٠، هلز عثمان. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٤-٨٦.

١٣٠. هلز عثمان میرو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٤.

١٣١. ناڤێن وان د بپ بهێت دانە.

١٣٢. نڤیسارا بنکەهێ پۆلیسێن دهۆك، هژمارە ١٠٨ یا ١٨ی تیرمەها ١٩٦٠ێ. ( نڤیسار ل نك نڤیسەرییە).

١٣٣. رۆژنامەیا خەبات، هژمارە ١٨١ یا ٦ ی ئادارا ١٩٦٠ێ.

١٣٤. ناڤێن وان د بەریەرێن بهێت دانە.

١٣٥. شێخ مووسێ وەرمێلی. شۆرەشا ئەیلولێ ل دەڤەرا زاخۆ (دهۆك، ٢٠٠٠، بپ ١٧-١٨).

١٣٦. سعد ناجي. العراق و المسألة الکردیة ١٩٥٨-١٩٧٠، (لندن، ١٩٩٠)، بپ ٥١-٥٥.

١٣٧. هەمان ژێدەر، بپ ٥٥-٥٦.

١٣٨. رۆژنامەیا الثورة (یا ل بەغدا دەردکەڤت)، هژمارە ٤٤٦ یا ٨ ی گولانا ١٩٦٠ێ.

١٣٩. د. ك. و. (دار الكتب و الوثائق العراقية) قرارات مجلس الوزراء المتخذة في اب و تشرين الاول ١٩٦٠، عبدالفتاح على البوتاني، وثائق عن ....، بپ ٧٢.

١٤٠. سعد ناجی جواد. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٤-٥٦.

١٤١. بۆ هوورکاریيان بنێرە: عبدالفتاح على البوتانى. وثائق ....، بەرپەرێن ٨٣ و ٩٣.

١٤٢. زوزان صالح اليوسفي، صالح اليوسفي ١٩١٨-١٩٨١، صفحات من حياته و نضاله الوطني مع ديوانه الشعري الكامل (دهوك، ٢٠٠٩) بپ ٣٣.

١٤٣. حامد محمود عيسى. المشكلة الكردية في الشرق الأوسط منذ بدايتها حتى سنة ١٩٩١، (القاهرة، ١٩٩٢) بپ ٢٠.

١٤٤. بۆ هوورکاریيان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، العراق دراسة .... بپ ٢٨٣ و یێن پشتی وێ.

١٤٥. شيركو فتح الله. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٤. ادمون غريب. الحركة القومية الكردية، (بيروت، ١٩٧٣) بپ ٤٨.

١٤٦. بۆ دەقێ یاداشتێ بنێرە: جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، چاپا دووێ (بيروت،١٩٧١)، بپ ٢٨٨-٢٩٦، جواد. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٧- ٥٨.

١٤٧. اشيريان. أ. ج. الحركة الوطنية الديمقراطية في كردستان العراق، ترجمة عن الروسية ولاتو (بيروت، ١٩٧٨)، بپ ٧٤-٧٥، هەروەسا بۆ هوورکاریێن زێدەتر بنێرە: شكيب عقراوي. سنوات المحنة في كردستان، أهم الحوادث السياسية والعسكرية في كردستان و العراق من ١٩٥٨-١٩٨٠، چاپا ٢، (اربيل، ٢٠٠٧) بپ ٥٣-٦٥.

١٤٨. بۆ هوورکاریيان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني؛ وثائق عن .... بپ ٧٢ و یێن پشتی وێ. عصمت شريف وانلي. كردستان العراق هوية وطنية (دراسة في ثورة ١٩٦١)، ترجمة الدكتوره سعاد محمد خضر (السليمانية، ٢٠١٢)، بپ ١٣٤ و یێن پشتی وێ.

١٤٩. عبدالفتاح علي البوتاني. الحركة القومية الكوردية .... بپ ١٣٤.

١٥٠. رۆژنامەیا (اتحاد الشعب)، هژمارە ٢٠٢ یا رۆژا ٢٠ ی ئیلۆنا ١٩٥٩ ێ.

١٥١. رۆژنامەیا (خەبات)، هژمارە ١٩ ی تیرمەها ١٩٦٠ ێ.

١٥٢. شهاب احمد رحمن، الاغتيالات السياسية في العراق ١٤ تموز ١٩٥٨- ٨ شباط ١٩٦٣، الموصل و كركوك نموذجا، (اربيل، ٢٠١٣) دەهمەنا ٢ یا بپ ٩٣، زانیاریێن تایبەتی.

١٥٣. فرهاد محمد سليفانى. من وثائق الحزب الديمقراطي الكوردستاني ـــ العراق ٤ نيسان ١٩٥٩-٢٨ اذار ١٩٦١، بپ ١٥١-١٥٢

١٥٤. هەمان ژێدەر، بپ ٢٦٨-٢٧١.

١٥٥. بۆ هوورکاریيان بنێرە: محمد على يونس توفى، بەلگە و دۆکیۆمێنت ئەو ب خۆ دئاخڤن، کوڤارا دهۆك، هژمارە ٢٤، ئیلۆنا ٢٠٠٤ ێ، دهۆك بپ ١٧-٢٢.

١٥٦. عبدالفتاح علي البوتاني. صفحات من الذاكرة الموصلية .... بپ ٢٦١.

١٥٧. بۆ دەقێ داخوازنامێ بنێرە؛ فرهاد محمد احمد. من وثائق الحزب الديمقراطي الكردستاني .... بپ ٢٩٠ و بپ ٣٣١-٣٣٢.

١٥٨. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٣٣٧.

١٥٩. نڤیسارا نهێنیيا هاریکاريیا پۆلیسێن شێخان هژمارە ٥١ یا ٢١ ئادارا ١٩٦١ ێ بۆ قائیمقامیيا قەزا شێخان (ل نك نڤیسەری هەیە). عبدالفتاح على البوتانى. صفحات من الذاكرة الموصلية .... بپ ٢٦١.

١٦٠. بۆ ناڤێن وان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. صفحات من الذاكرة الموصلية .... بپ ٢٧٩-٢٨٦.

١٦١. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ٣٩٩-٤٠١.

١٦٢. نڤیسارا نهێنیيا قائیمقامیيا قەزا مووسل یا رۆژا ٢٤ ی تیرمەها ١٩٦١ێ (ل نك نڤیسەری هەیە).

١٦٣. رۆژنامەیا (الفجر الجيد) (یا ل بەغدا دەردکەڤت)، هژمارە ٤٦٢ یا رۆژا ٤ ی تەباخا ١٩٦١ێ.

١٦٤. بۆ دەقێ داخوازیيا دەستەسەرکرنا وان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. ثلاث سنوات دراسية في بردەرش، نبذة تأريخية، ذكريات، مشاهدات، ملاحظات (دهوك، ٢٠١٤)، رەشنڤیسا پەرتووکەکێ. بپ ١٧٥.

١٦٥. عبدالفتاح علي البوتاني. صفحات من الذاكرة الموصلية .... بپ ٢٦٢.

١٦٦. هەر بۆ نموونە بنێرە: یاداشت و داخوازنامەیێن ل رۆژا ٣ ی چریا ئێکێ یا و ٢٠ کانوونا ئێکێ یا ١٩٦٠ێ، ١٣ ی کاناوونا دووێ،

١٥ و ٢٥ ی ئادارا ١٩٦١ ێ ژ سەركردایەتیا پارتی و لق و لیژنەیێن وێ هاتینە پێشكێش كرن». بنێرە: فرهاد محمد السليفاني، ژێدەرێ بەرێ، بپ، ١٥١، ٢٩٠، ٣٢٩، ٣٠٧، ٣٦٤ و ٣٨١.

١٦٧. بۆ دەقێ وێ نڤیسارێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١١٩.

١٦٨. خودانێ ڤێ هەوالدەریێ لبەك ژێ پێشكێشی هاریكارێ ئەمنا زاخۆ و رێڤەبەریا ئەمنا مووسل رێبەریا پۆلیسێن مووسل كریە و رێڤەبەریا دووماهیێ داخواز ژ رێڤەبەرێ پۆلیسێن دهۆك كریە ڤەكۆلین بێتە كرن بۆ نیاسینا نڤیسەرێ ڤێ هەوالدەریێ و راستیا وێ. ل وێ باوەرێ مە كو ناڤێن تێدا هاتین ژ بەر ڤێكنەكرنێن كەسۆكی تێدا هاتبن (ئەو هەوالدەری ل نك نڤیسەری یە).

١٦٩. بۆ دەقێ نڤیسارێ بنێرە: عبدالفتاح علی البوتانی. وثائق عن.... بپ ١٢٠.

١٧٠. دەقێ نامەیێ ل نك نڤیسەری یە.

١٧١. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٢١.

١٧٢. بۆ دەقێ نڤیسارێ و بابەتێ وێ بنێرە: (نشاط انصار الحزب البارتي ضد سلامة الامن و النظام) د ڤی ژێدەری دا: عبدالفتاح علی البوتاني. وقائع واحداث الثورة في دهوك والقرى والمواقع المجاوره لها، خلال المده ٩ ايلول ــ ١٥ تشرين الثاني ١٩٦١، في عدد من الوثائق الحكومية، كوڤارا دهۆك، هژمارە ٢٤، دهۆك، ئیلۆنا ٢٠٠٤، بپ ٦١ و یێن پشتی وێ.

١٧٣. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ٥١٠.

١٧٤. هەمان ژێدەر، بپ ١٠٧.

١٧٥. بنێرە بیرهاتنێن وی ، ژێدەرێ بەرێ. بپ ٣٣-٣٤.

١٧٦. ژیان عەمەر. ژێدەرێ بەرێ. بپ ١٩-٢٠.

١٧٧. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٠٧.

١٧٨. نڤیسار ل نك نڤیسەریە.

١٧٩. بۆ هووركاریان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٢٦-١٢٧ و بپ ٤٥٦-٤٥٨.

١٨٠. فارس كۆرەماركی. ژێدەرێ بەرێ. بپ ٣٨-٣٩.

١٨١. عبدالفتاح علي البوتاني.. الحركة االقومية الكوردية التحررية .... بپ ٥١٠.

١٨٢. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٥٨-١٦٠.

١٨٣. بۆ دەقێ راپۆرتێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ٢٥٨-١٦٠.

١٨٤. بۆ هووركاریێن رزگاركرنا بازێرێ زاخۆ بنێرە: هەمان ژێدەر.... بپ ١٦١ و یێن پشتی وێ.

١٨٥. بۆ هووركاریان بنێرە: هەمان ژێدەر .... بپ ١٤٤ و یێن پشتی وێ. و بپ ١٧٤ و یێن پشتی وێ.

١٨٦. بۆ هووركاریان بنێرە: هەمان ژێدەر ..... بپ ٢٥٩-٢٦٦.، وثائق عن .... بپ ٧١٨.

١٨٧. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٠١ و یێن پشتی وێ. بۆ ناڤێن بنكەهـ و بارەگەهێن پۆلیسان ژی بنێرە بپ ٩٧-٩٨.

١٨٨. بۆ هووركاریان بنێرە: هەمان ژێدەر ، بپ ١٢٢ و بپ ٧٠٧. هەروەسا بۆ شۆرشا ئەیلوولێ ل دەڤەرا بادینان ١٩٦١-١٩٦٢ بنێرە: وصفي حسن. دەسپێكا شۆرەشا ئیلۆلێ ل دەڤەرا بەهدینان ١٩٦١-١٩٦٣ (دهۆك، ٢٠١٢).. فارس كۆرەماركی. ژێدەرێ بەرێ. بپ ٣٤-٣٦.

١٨٩. مسعود البارزاني. البارزاني والحركة التحررية الكردية .... بەرگێ ٣، بپ ٢٧.. بۆ رەوشا بادینان ژی بەری گەهشتنا بارزانی ل رۆژا ٢١ی چریا ئێكێ یا ١٩٦١ێ بگەهیتە وێرێ بنێرە: یوسف صبري و دلوڤان مصطفی. ژێدەرێ بەرێ. بپ ١٠٣ و یێن پشتی وێ.

١٩٠. بۆ هووركاریان بنێرە پەرتووكا وی: ثورة ايلول المجيدة (دهوك، ١٩٩٥) بپ ٣٥-٥١.

١٩١. بنێرە بیرهاتنێن وی. بپ ٣٦-٣٧.

١٩٢. چاڤپێكەڤتنەك دگەل وی ل رۆژا ١٠ی تەباخا ١٩٩٦ێ.

١٩٣. بۆ دەقێ وێ راپۆرتێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وقائع واحداث الثورة في دهوك .... بپ ٧٣-٧٤.

١٩٤. نڤیسارا رێڤەبەریا گشتیا پۆستە و برۆسكەی. هژمارە ٦٤١٥ یا رۆژا ١٩٦١/٩/٢٨ێ (نڤیسار ل نك نڤیسەریە) .

١٩٥. بنێرە بیرهاتنێن وی. بپ ٣٦. ب راستی ژی شێخی پشتەڤانیا عەبدلكەریم قاسم نەكریوو. بەلكی داخوازا تێكگەهشتن و راوەستاندنا شەری كریوو. هەر بۆ هندێ ژی چوو بوو وێ بەغدایا سەر بەختێ وێ چووبوو وێرێ. بۆ هووركاریان بنێرە: مسعود

البارزاني: البارزاني و الحركة التحررية ....، ج ٣، بپ ٣٠-٣١.
١٩٦. هەمان ژێدەر، بپ ٤٤.
١٩٧. بۆ هوورکاریيان بنێرە: شێخ مووسێ وەرمێلی. صادق برۆ گولی، بەردەواميا کەلا شابانیێ، (دهۆك، ٢٠٠١)، بپ ٥١-٥٥.
١٩٨. کوردەکێ شەبەکە (پارێزەرە) پشتی هنگی گەهشتبوو شۆرشێ و پشتی ١١ی ئادارا ١٩٧٠ێ ببوو قائیمقامێ کۆیە.
١٩٩. راپۆرت ل نك نڤیسەرییە.
٢٠٠. هەمان ژێدەر.
٢٠١. مسعود البارزاني. البارزاني و الحركة التحررية ....، ج٣، بپ ٣٥.
٢٠٢. هەمان ژێدەر، بپ ٣٥.
٢٠٣. هەمان ژێدەر...، بپ ٣٦-٣٧.
٢٠٤. هەمان ژێدەر...، بپ ٣٧-٤١. بۆ هوورکاریيان بنێرە: یوسف صبري و دلۆڤان مصطفى. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٩ و بەریەرێن پشتی وێ.
٢٠٥. دیدارەکا من دگەل مەلا حەمدی عەبدلمەجید سەلەفی ل رۆژا ١٠ی تەباخا ١٩٩٦ێ.
٢٠٦. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن ....، بپ ٩٩، بپ ١٣٦-١٤٠.
٢٠٧. ژیان عەمەر. ژێدەرێ بەرێ،، بپ ٢١.
٢٠٨. دیدارەکا من دگەل مەلا حەمدی عەبدلمەجید سەلەفی ل رۆژا ١٠ی تەباخا ١٩٩٦ێ.
٢٠٩. عبدالفتاح علی البوتاني. وثائق عن ....، بپ ٩٠-٩١، بپ ١١١-١١٢.
٢١٠. بۆ دەقێ برۆسکەیێ بنێرە: عبدالفتاح علی البوتاني. وثائق عن ....، بپ ٩٩.
٢١١. بنێرە بیرهاتنێن وی، بپ ٣٧-٣٨، مەسەلا پەنابەریيا وی بۆ ل بەریەرزەکرنێ بوو و بەرئاقل نینە سوریا و تورکیا ب پەنابەریيا بارزانی رازی ببان، هەروەسا وی ب خۆ ژی ب ئێکجاری داخوازا پەنابەریێ نەکربوو، بنێرە، الیوسفي. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٩-١١٠.
٢١٢. دیدارەکا من دگەل وی ل رۆژا ١٩ی ئیلۆنا ١٩٩٨ێ.
٢١٣. بۆ دەقێن وان برۆسکەیان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وقائع و احداث الثورة في دهوك ....، بپ ٧٤-٧٥.
٢١٤. بۆ هوورکاریيان بنێرە: سعید حمو (الفریق)، مذکرات امر لواء مشاة (بغداد، ١٩٧٧)، بپ ١٧-١٩.
٢١٥. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن ....، بپ ٣٩٣-٣٩٨.
٢١٦. بۆ هوورکاریيان بنێرە: وصفي حسن، پێنج داستانێت دەستپێکا شۆرەشا ئیلۆلێ ل دەڤەرا بەهدینان ١٩٦١-١٩٦٣،(دهۆك، ٢٠١٢)، بپ ١٧٧ و یێن پشتی وێ.
٢١٧. بۆ هوورکاریيان بنێرە: عبدالفتاح علی البوتاني. وثائق عن ....، بپ ٩١ و یێن پشتی وێ. الحركة القومية الكوردية التحررية ....، بپ ٢٨٦ و یێن پشتی وێ.
٢١٨. عبدالفتاح علي البوتاني. الحركة القومية الكوردية التحررية ....، بپ ٢٨٧.
٢١٩. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن ....، بپ ٩٢.
٢٢٠. مسعود البارزاني. البارزاني و الحركة التحررية الكردية ....، ج ٣، بپ ٥٢-٥٣.
٢٢١. هەمان ژێدەر، بپ ٥٤. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن ....، بپ ٩٢.
٢٢٢. مسعود البارزاني. البارزاني والحركة التحررية الكردية ... بەرگێ ٣، بپ ٥٤ و ٥٧.
٢٢٣. مسعود البارزاني. البارزاني والحركة التحررية الكردية ... ج ٣، بپ ٤٥.
٢٢٤. سعید حمو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠.
٢٢٥. مسعود البارزاني. البارزاني والحركة التحررية الكردية ... ج ٣، بپ ٤٥.
٢٢٦. وصفي حسن ردێنی. داستانا لۆمانا ....، بپ ٤٥.
٢٢٧. مسعود البارزاني. البارزاني و الحركة التحررية الكردية ....، بەرگێ ٣، بپ ٤٥-٤٦.
٢٢٨. سعید حمو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠.
٢٢٩. وصفی حسن ردێنی. داستانا لۆمانا ....، بپ ٤١-٤٣.
٢٣٠. بۆ هوورکارێن دیدارا عەقید حەسەن عەبود دگەل بارزانی، بنێرە: جرجیس فتح الله المحامي، العراق في عهد قاسم، اراء

و خواطر، ١٩٥٨- ١٩٨٨ (سوید، ١٩٨٩) بپ ٨٤٨-٨٦٠.

٢٣١. سعید حمو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠. بۆ هوورکارییێن دیدارا حەسەن عەبود دگەل بارزانی، بنێرە: یوسف صبري و دلوڤان مصطفی ژێدەێ بەرێ، بپ ١٥١-١٥٣.

٢٣٢. بۆ ناڤێن دەستەسەرکریان بنێرە: وصفي حسن ردێنی. داستانا لۆمانا .... بپ ٤٩-٥١.

٢٣٣. بۆ هوورکاریان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٣٨-١٣٩.

٢٣٤. بۆ هوورکاریان بنێرە: سعید حمو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢١-٢٣.

٢٣٥. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٨٦-١٨٩.

٢٣٦. وصفي حسن. شەرێ گەلیێ قەنتارە ١٨ی ئادارا ١٩٦٢ێ، کۆڤارا دهۆك، ژمارا ٢٣، دهۆك، گولان ٢٠٠٤، بپ ٤٦-٤٧.

٢٣٧. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٨٢. بۆ زانینا هوورکاری یێن شەڕی و ناڤێن پشکداران و وێنەیێن وان بنێرە: وصفي حسن. شەڕێ گەلیێ قەنتارە .... بپ ٤٢-٥٦.

٢٣٨. بۆ دەقێ بروسکێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ٢٨٨.

٢٣٩. بۆ دەقێ وێ بەیانێ بنێرە هەمان ژێدەر، بپ ١٨٩-١٩٠ و بۆزانینا هوورکاری یێن وی شەڕی و ناڤێن پشکدارێن بنێرە، وصفي حسن. شەڕێ گەلیێ قەنتارە .... سعید حمو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤-٢٦.

٢٤٠. بۆ هوورکاریان بنێرە: وصفي حسن ردێنی. داستانا گەلیێ زاخۆ ل نیسانا ١٩٦٢ێ (دهۆك، ٢٠١١)، بپ ١٧-٤٣.

٢٤١. وصفي حسن ردێنی. داستانا گەلیێ زاخۆ .... بپ ٤٧-٥٢.

٢٤٢. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ٣٩٩-٤٠٥.

٢٤٣. بۆ دەقێ وێ هەوالدەریێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. ثلاث سنوات دراسية .... بپ ١٨٠-١٨١ و هەر ئێك ژ یونس قادر، سالح و فارس ئەحمەد ئاغا رۆڤی و حسێن ئۆسمان نەهاتنە گرتن ژ بەرکو رەڤی بوون و خۆڤەشارتبوون.

٢٤٤. بۆ هوورکاریان بنێرە: الیوسفي. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٠-١٣٢.

٢٤٥. یۆنان هورمز. وفادة الی المنطقة المحررة (رۆمان) (اربیل، ٢٠٠٢)، بپ ١٦٣-١٦٤.

٢٤٦. بۆ هوورکاریان بنێرە: هەر وی ژێدەری، بپ ٤٠ و یێن پشتی وێ.

٢٤٧. بۆ دەقێ نڤیسارا سەرۆکاتییا دەستەیا ڤەکۆلینێ یا رۆژا ٧ ی خزیرانا ١٩٦٢ ێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن .... بپ ٢٠١-٢٠٢.

٢٤٨. بۆ ناڤێن گرتییان و ئەوێن مل ومالێ وان هاتییە دەستسەرکرن بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة .... بپ ٢٩٣-٣٢٠.

٢٤٩.بۆ دەقێ بەیانا پارتی و گازیا هەرسێ ئەفسەران بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .... بپ ١٩١-٢٠٠.

٢٥٠. بۆ ئەفسەرێن کوردێن هەر ژ دەسپێکا شۆرشا کوردی هەتا سالا ١٩٧٠ێ گەهشتینە ناڤ رێزێن شۆرشێ بنێرە: ابراهیم حمید ابراهیم پێداوی. رۆلێ ئەفسەرێن کورد د شورەشا ئەیلوولێ دا(١٩٦١-١٩٧٠)، ڤەکۆلینەکا مێژوویی، نامەیا ماستەرێ، زانکۆیا زاخۆ، نیسان ٢٠١٢.

٢٥١. اوریل دان. العراق في عهد قاسم، تأریخ سیاسي ١٩٥٨-١٩٦٣، ترجمة جرجیس فتح الله (سوید، ١٩٨٩)، بپ ٤٢٤، هەروەسا شکیب عقراوي. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٥-٧٦.

٢٥٢. بۆ هوورکاریان بنێرە: دانا ادمز شمدت. رحلة الیٰ رجال شجعان في کوردستان. ترجمة و تعلیق جرجیس فتح الله، (بیروت، ١٩٧٢). ص

٢٥٣. بۆ پتر پێزانینان ل سەر ڤێ کریارێ وناڤێن ئەوێن پشکداری تێدا کری: بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة .... ص ٣٣٧- ٣٤٠ ؛ وصفي حسن، شهید کوردستان هرمز ملك جکو، (دهوك- ٢٠١٠)، ص ٤٢- ٥٧

٢٥٤. وصفي حسن ردێنی، داستانا عەین زالا ل شەڤا ١٩٦٢/١٠/١١، (دهۆك- ٢٠٠٦)، بپ ١٧- ١٩؛ الیوسفي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٢- ١٣٣ ؛ د. رزگار، ملحمة عین زالة في ذاکرة البیشمرگة، (دهوك- ١٩٩٧).

٢٥٥. شاهین شێخۆیێ بێغەباری دگەل دەستەکا هاشم میرۆزی بوو دەمێ هێرش برینە سەر بنگەهێ پۆلیسێن کۆمپانیێ هاتەشەهیدکرن، دهێتەگۆتن کو سۆپایێ عیراقی پاشتر تەرمێ وی دیتبە و بریە عەین زالە و ل سەر جادەیان راکێشایە.

٢٥٦. بۆ زانینا ناڤێن وان بنێرە: وەصفي حسن ردێنی، داستانا عەین زالە، بپ ١٠٤- ١٠٨ ؛ سەعید حمو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٢.

٢٥٧. سعید حمو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥١- ٥٩.

٢٥٨. بنێرە دەقێ بەیانێ: عبدالفتاح علي البوتاني، الحرکة القومیة التحرریة الکوردیة.... بپ ٣٤٠ .

٢٥٩. بنێره بیرهاتنێن وی، مذكرات امر لواء المشاة...، بپ ٥٢، هەژیە بێژین ئەڤ سەكردێ لەشكەری ژ هەموویان پتر داكوكی ل سەر شەرێ شۆرشا كوردستانێ دكر.

٢٦٠. بنێره پەرتووكا وی: حصاد ثورة، مذكرات تجربة، السلطة في العراق ١٩٥٨- ١٩٦٨، ط١ (لندن- ١٩٩٤)، ص ٧٧.

٢٦١. د. رزگار، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٩- ٦٠

٢٦٢. عصمت شریف وانلی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٠ ؛ بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر دەربارى چاوانیا ئەنجامدا كریارا عەین زالە بنێره، وصفي حسن، داستانا عەین زالە ؛ دكتور رزگار، ژێدەرێ بەرێ.

٢٦٣. بۆ بەرفرەهیێ بنێره: ئیسفێ سەعدوێ ئەمین، پێشمەرگێ بێ سنوور، چ١، (دهۆك- ٢٠٠٨)، بپ ٤١- ٤٤.

٢٦٤. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر دەربارەی هەلویستێ حزبا بەعس بەرامبەری كوردان بنێره: عبدالفتاح علي البوتاني، موقف الاحزاب السياسية من القضية الكوردية ١٩٤٦- ١٩٧٠، (دهوك- ٢٠٠٧)، ص ٦٣- ٧٣، ص ١٢٤- ١٢٨ .

٢٦٥. هەمان ژێدەر

٢٦٦. بنێره دەقێ بەیاننامێ د، حزب البعث العربي الاشتراكي، نضال البعث، القطر العراقي ١٩٥٨- ١٩٦٣، ج٧ (بيروت- ١٩٦٥)، ص ١٧٠- ١٧٢ .

٢٦٧. وزارة الدفاع، ژێدەرێ بەرێ، بەرگێ ١٢، بپ ٢٧٨.

٢٦٨. دەربارەی هەلویستێن عەبدولسەلام عارفي ل سەر كوردان و بزاڤا وانا نەتەوەیی بنێره: شیرزاد زكريا محمد، الحركة القومية الكوردية في كوردستان العراق ٨ شباط ١٩٦٣- ١٧ تموز ١٩٦٨، (اربيل- ٢٠٠٦)، بپ ١٤١ و بێن دووڤدا.

٢٦٩. ل دور پەیوەندیێن حزبا بەعس دگەل شۆرشا كوردستانێ بەری كودەتایێ و ئەوا ل سەر پێكهاتین ب مەرەما ژناڤبرنا دەستەلاتێ عەبدولكەریم قاسمی بنێره: شێرزاد زكریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٧- ٧٢ .

٢٧٠. بۆ پتر زانیاریان بنێره: هەمان ژێدەر، بپ ٨٧ و بێن دووڤرا.

٢٧١. مكرم الطالباني (الدكتور)، مراحل تطور الحركة القومية الكردية، (المجلد الاول، السليمانية- ٢٠٠٩)، ص ٢٣٧ .

٢٧٢. بۆ ناڤێن بێن دیتر بنێره: وصفي حسن، دەسپێكا شۆرشا ئیلونێ ل دەڤەرا بەهدینان ١٩٦١- ١٩٦٣، (دهۆك- ٢٠١٢)، بپ ١١٦- ١٤٨ .

٢٧٣. فرهاد عونی، ذاكرة الأيام، تقديم عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، (اربيل- ٢٠١١)، ص ٢٧- ٢٨

٢٧٤. هەمان ژێدەر، بپ ٢٨.

٢٧٥. وصفي حسن، دەسپێكا شۆرشا ئیلونێ...، بپ ١٤٩ ؛ فەرهاد عەونی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨.

٢٧٦. شێرزاد زەكەریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٩- ١٠٠.

٢٧٧. شۆرش حسن عمر، حقوق الشعب الكردي في الدساتير العراقية، دراسة تحريرية و مقارنة، (السليمانية- ٢٠٠٥) ص ١٩٥ .

٢٧٨. بۆ زانیاریێن پتر بنێره: شێرزاد زەكەریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٠- ١٠٤.

٢٧٩. مكرم الطالباني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٣٧.

٢٨٠. زوزان صالح اليوسفي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٠ ؛ مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكوردية، ص ٤٨٨، هندیكە سەرۆكێ شاندی جەلال تالەبانی و ئەندامێن دی حەبیب محەمەد كەریم و شەوكەت ئاكرەیی بوون بەری هنگی ژ بەغدا دەركەتبوون، هەروەسان حكۆمەتێ راوێژكارێ قانوونیێ شاندی جەرجیس فەتحوللا ژی گرت. بنێره: شكیب عقراوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٢.

٢٨١. بۆ پتر زانیاریێن پتر بنێره: شیرزاد زەكەریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ١٠٥ و بەربەرێن دووڤدا.

٢٨٢. شكیب عقراوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٢- ١٢٣.

٢٨٣. بۆ زانیارییێن پتر ل دور هەلویستێ حزبا شیوعی بنێره: عبدالفتاح علي البوتاني، موقف الاحزاب السياسية...، بپ ١٠١ و بێن دووڤدا.

٢٨٤. سلام فواز العبيدي، ذكرياتي عن حياة الانصار، تأملات من قمم الأمال و الألام و المأثر، ط٣، _دهوك- ١٠١٢)، ص ١٧- ١٨.

٢٨٥. هەمان ژێدەر، بپ ١٧ .

٢٨٦. حبيب تومي، البارزاني مصطفى، قائد من هذا العصر (اربيل- ٢٠١٢)، ص ٥٠٣- ٥٠٤ .

٢٨٧. رجب جميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥٦، شكیب عقراوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٦ .

٢٨٨. سلام فواز العبيدي، هەمان ژێدەر، بپ ١٨ .

٢٨٩. بۆ زانینا ناڤێن هەموویان بنێره: هەمان ژێدەر، بپ ١٧- ٤٤.

٢٩٠. حافظ القاضي، ذكريات، ط١ (دهوك- ٢٠٠٦)، ص ١٨٣.

٢٩١. الحزب الشيوعي العراقي، شهداء الحزب، شهداء الوطن، شهداء الحزب الشيوعي العراقي ١٩٣٤- ١٩٦٣، ج١ ط١ (بغداد- ٢٠٠٨)، ص ٣٢٧.

٢٩٢. زانیارییَن تایبەت.

٢٩٣. بنێرە پەرتووكا وی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٦ ؛ فارس كۆرەماركی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٤.

٢٩٤. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكوردية.... ص ٩٢ .

٢٩٥. عبداكریم فرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٦- ٧٧.

٢٩٦. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٦- ٧٧.

٢٩٧. هەمان ژێدەر، بپ ٧٧.

٢٩٨. كوردان دگۆتە وان كەسان یێن دووڤ حكومەتێ دكەتن ئانكو چەكێ دەولەتێ دژی شۆرشا كوردستانێ هەلدگرت جاش، وان ب خۆ دگۆتە خۆ چەتە، پێكهاتا جاشان ل بەراهیێ تنێ ئەو كوردە بوون یێن سەر ب دەولەتێڤە، پاشتر جاشێن ئاسووری ب تایبەت ل دەڤەرا بادینان گەهشتنێ، هندیكە كرێگرتی (چەتە)یێن عەرەبن، ئەو ب پلا دووێ دهاتن، ل كانوونا ئێكێ ١٩٦٣ هژمارا جاشان ل دەڤەرا بادینان گەهشتە ٩٣٨٧١كەسان، (١٧) سەرۆكعەشیرەت یان شێخان ل دەڤەرا دهۆكێ، (١٨)ان ل دەڤەرا زاخۆ، (٢٦)ان ل دەڤەرا ئاكرێ و (١٨)ان ل دەڤەرا شێخان مەزناتیيا وان دكر، د دەمێ شەریدا دگەل پێشمەرگەی ئەو پێش لەشكەرێ عیراقێ دكەتن، ناڤداربوون ب سۆتن و دزین و تالانكرنا گوندانز بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، الحركة القومية الكوردية التحررية...، ص ٤٥٩- ٤٧٧

٢٩٩. عبدالكریم فرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٧- ٨١.

٣٠٠. هەمان ژێدەر، بپ ٧٩.

٣٠١. بنێرە دەقێ نڤیسارێ: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن.... ص ٢٠٣

٣٠٢. بنێرە دەقێ ناما بارزانی یا رۆژا ٤نیسانا ١٩٦٤ێ بۆ الزعیم عبدالرزاق السید محمود موتەسەرفێ لیوا سلێمانیێ، د: عبدالفتاح علي البوتاني (الدكتور)، الملامح الاساسية لشخصية مصطفى البارزاني القيادية و الانسانية (دهوك- ١٩٩٦)، ص ٥٠.

٣٠٣. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە: عەبدولكەریم فەرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٢- ٨٩.

٣٠٤. شێركو فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٢.

٣٠٥. عبدالكریم فەرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٤.

٣٠٦. شێركو فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٢ ؛ د راستیدا ئەو خەلاتێ دراڤی (١٠٠)هزار دینارێن عیراقی بوون، كو وی چاخی بەرامبەری پتر ژ (٣٠٠)هزار دەلاران بوو، بنێرە: عصمت شریف وانلی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٧١و یێن پشتی وی.

٣٠٧. شێركو فتح الله، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٥.

٣٠٨. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە: عصمت شریف وانلی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٧١و یێن پشتی وی.

٣٠٩. عبدالكریم فندی ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٨.

٣١٠. فارس كورەماركی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٤.

٣١١. عبدالكریم فرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ٨٩- ٩٠.

٣١٢. عبدالكریم فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ٥٨- ٥٩.

٣١٣. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: الشماس جميل برنادوس اسكندر هومي، قرية مار يعقوب، عروس الجبل الابيض (دهوك- ٢٠١٣)، ص ٦٣ و ما بعدها.

٣١٤. ئەڤ هێزە ب (لیوا فهد الشاعر) هاتیەناڤكرن، ئەڤ كەسە بەعسیەكێ دورزی خەلكێ پاریزگەها (السویداء) یا سوریێ بوو، دەمێ بەعسیان سەرۆكێ سوریێ (امین الحافظ) ژ دەستەلاتی لادای، (فهد الشاعر)ی ڤیا وی رۆلەك د سەروبەری نوودا هەبیت، لێ بەعسیان ئەو پشتگوهڤە هاڤێت، لەما ژێ بزاڤەكا سەرنەكەتی ئەنجامدا و وان ژێ ل سالا ١٩٦٦ێ ئەو كوشت،ئەڤ هێزێن سوری ب (قوات الیرموك) یان ب (لیواء الیرموك) هاتبوو ناڤكرن،ل دووڤ وی شەری یێ خالد كورێ وەلیدی ل نێزیكی رووبارێ یەرموك دگەل لەشكەرێ رۆمی كری و تێدا سەركەتی. دەربارەی مایتێكرنا لەشكەرێ سوریێ دژی شۆرشا كوردستانێ بنێرە: عصمت شریف وانلی ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨٦- ٢٩٦.

٣١٥. عبدالكریم فرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٠- ٩١.

٣١٦. خەلات موسا، هێرشا لەشکەرێ سوریێ بۆ سەر دەڤەرا بادینان لسالا ١٩٦٣ێ، کۆڤارا دهۆك، هژمار ٣٤ ئادارا ٢٠٠٧، بپ ١٤- ٢٧.

٣١٧. عبدالکریم فرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٢.

٣١٨. عبدالکریم فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٨- ٥٩.

٣١٩. حبیب تومی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٠٣.

٣٢٠. خەلات موسا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢١

٣٢١. مسعود البارزاني، البارزاني و الحرکة التحررية الکوردية.... ج٣ ص ١٠٠- ١٠١.

٣٢٢. هەمان ژێدەر، بپ ١٠١.

٣٢٣. هەمان ژێدەر، بپ ١٠٤، عبدالکریم فرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٥- ٩٨.

٣٢٤. مسعود البارزاني، البارزاني و الحرکة التحررية الکوردية.... ج٣ ص ١٠٤- ١٠٥ ؛ شکیب عقراوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٩.

٣٢٥. هەمان ژێدەر، بپ، بپ ١٠٥.

٣٢٦. هەمان ژێدەر، بپ ١٠٥.

٣٢٧. شیرزاد زکریا، ژێدەرێ بەرێن بپ ١٢٥.

٣٢٨. هەمان ژێدەر، پەراوێزێ (٢) بپ ١١٣.

٣٢٩. مسعود البارزاني، البارزاني و الحرکة التحررية الکوردية.... ج٣، ص ٩٨.

٣٣٠. علی کریم سعید (الدکتور) عراق ٨ شباط ١٩٦٣ من حوار المفاهیم الی حوار الدم، مراجعات في ذاکرة طالب شبیب، (دمشق- ١٩٩٩)، ص ٢٥٧- ٢٥٨

٣٣١ مسعود البارزاني، البارزاني و الحرکة التحررية الکوردية.... ج٣، ص ٩٨- ٩٩ ؛ عصمت شریف وانلی، المصدر السابق، ص ٢٧٣- ٢٧٤.

٣٣٢. عصمت شریف وانلی، المصدر السابق، ص ٦٣ و ما بعدها.

٣٣٣. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، الحرکة القومیة الکوردية.... بپ ٣٥١- ٣٧٢

٣٣٤. هەژیە ل ڤێرێ بێژین کو کوردان ل باکوورێ کوردستانێ ژ دەسپێکا شۆرشێڤە ل ١١ ئەیلوولا ١٩٦١ رۆلەکێ گرنگ د شۆرشێدا هەبوو، ب سەدان ژ وان گەهشتنە ریزێن پێشمەرگەی، جەنگاوەرێن قارەمان و فیداکار ژێ رابوون، زێدەباری هندێ کو ژ ئالیێ داددی و لوجیستیڤە هاریکاریا شۆرشێ دکرن، ئەم دکارین ب هەمان شێوە لێ رەنگەکێ کێمتر پەسنا پشکداریا کوردێن رۆژئاڤایێ کوردستانێ (سوریێ دشۆرشێدا بکەین، زۆریا هژمارا پێشمەرگێن باکوورێ کوردستانێ وە ل سالح یوسفي کر کو رێکخستنەکا پارتی ب ناڤێ (رێکخراوا جودی)یا سەر ب لقێ ئێکێ پارتی ڤە دامەزرینیت و پاشتر ل نیسانا ١٩٦٣ێ بوو لیژنەکا ناوچەی بەرپرسێ وێ مەلا بەهجەت یوسف بوو و پشتی وی مەلا عەبدولغەنی ئیبراهیم و پشتی وی ژی شەعبان سەعید محەمەد بوو، دەمێ ل ١١ تیرمەها ١٩٦٥ێ پارتیا دیموکراتا کوردستانا ترکیا هاتەدامەزراندن لقێ ئێکێ پارتی ل بادینان رێکخراوا جودی دگەل ئەرشیڤێ وێ دانە دەست پارتیا نوو دامەزراندی. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە: خەلات موسا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤- ٢٥.

هەروەسان پێشمەرگەیێن باکوورێ کوردستانێ هزرا دامەزراندنا هێزەکا تایبەت ب وان پێشنیازکر، لێ جێبەجێکرنا ڤێ پێشنیازێ رەزامەندی وەرنەگرت، زێدەباری وێ چەندێ کو دەولەتا ترکیا یا نەرازی بوو ژ بوونا کوردێن وێ د ریزێن پێشمەرگەیدا. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە: ئیسڤێ سەعدوینێ ئەمین، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٨ و پێن پشتی وێ.

٣٣٥. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالکریم فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٠- ٦٤ ؛ مسعود البارزاني، البارزاني و الحرکة التحررية الکوردية، ج٣، بپ ١١٥- ١١٦ ؛ رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٤.

٣٣٦. خەلات موسا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢ ؛ عصمت دینو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٦- ٥٧.

٣٣٧. هەمان ژێدەر، بپ ٢٢

٣٣٨. بنێرە پەرتووکا وی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٠- ١٠١.

٣٣٩. بنێرە بیرهاتنێن وی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٣.

٣٤٠. ب (زەعیم خەلیل) دهاتەنیاسین، بەرپرسێ هەموو هێزێن جاشان بوو، ناڤێ وی د سترانەکا هونەرمەندێ ناڤدار شڤان پەروەر دا هاتیە.

٣٤١. رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥٨- ٢٦٠.

٣٤٢. عصمت شریف وانلی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠٩ و پێن پاشتر.
٣٤٣. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكوردية...، ج٣، پەراوێزێ بەرپەرێ ١١٥.
٣٤٤. هەمان ژێدەر، بپ ١١٥- ١١٦ ؛ فارس كورەماركی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٥- ٥٦.
٣٤٥. بۆ زانیاریێن بەرفرەهتر بنێرە: فارس كورەماركی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٤- ٥٧.
٣٤٦. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكوردية...، ج٣،بپ ١١٦.
٣٤٧. عصمت شریف وانلی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨٧.
٣٤٨. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكوردية...، ج٣، بپ ١١٦.
٣٤٩. بۆ زانیاریێن بەرفرەهتر بنێرە: فارس كورەماركی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٩- ٦١.
٣٥٠. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، الحركة القومية الكوردية التحررية...، بپ ٣٥١- ٣٦٠.
٣٥١. شیرزاد زكریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٢٥.
٣٥٢. بۆ زانیاریێن بەرفرەهتر بنێرە: سلام فواز العبيدي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧- ٤٤.
٣٥٣. هەمان ژێدەر، حبيب تومي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٠٣- ٥٠٤.
٣٥٤. بۆ پتر پێزانینان ل سەر هرمزێ مەلك چكوی هەڤالێن وی و كریارێن شۆرشگێرانە یێن وان بنێرە: وصفي حسن الرديني، شهيد كردستان...، ص ٢٥- ٢٨.
٣٥٥. الحزب الشيوعي، المصدر السابق، ج١، ط٢، ص ٣٣٨.
٣٥٦. وصفي حسن الرديني، شهيد كوردستان...، ص
٣٥٧. گاردێن نەتەوەیی (الحرس القومي) رێكخستنەكا بەعسیيا چەكدار بوو، پشتی گودەتایا ٨ شباتا ١٩٦٣ێ دەست ب چالاكیێن خۆ كرییە، كریارێن هۆڤانە بەرامبەری بەرهەلستكارێن كودەتایێ ئەنجام ددان. بنێرە: الاستخبارات العسكرية العراقية، النحرفون من الحرس القومي، (بغداد- ١٩٦٤)
٣٥٨. الحزب الشيوعي العراقي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٤٤- ٤٤٦.
٣٥٩. هەمان ژێدەرن بپ ٣٤٧.
٣٦٠. هەمان ژێدەر، بپ ٣٤٩؛ فواز سلام العبيدي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤
٣٦١. الحزب الشيوعي العراقي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٥٢.
٣٦٢. الحزب الشيوعي العراقي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤٦، ٣٥٢.
٣٦٣. ذكريات، ج١، ص ١٨١.
٣٦٤. هەمان ژێدەر، بپ ١٨٤؛ ٢٢٣ و پێن پاشتر
٣٦٥. هەمان ژێدەر، بپ ٢٠٤، بپ ١٨٨-١٨٩؛ وصفي حسن، شهيد كردستان، بی ١٤٥.
٣٦٦. حافظ قاضی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨١؛ ٢٢١؛ سلام فواز العبيدي، ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٢٢.
٣٦٧. حافظ قاضی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢١- ٢٢٢؛ باش ل بیرا منە برایێ منێ مەزن عەبدولغەنی وی دەمی گەهشتبوو رێزێن پێشمەرگەیێن حزبا شیوعی، د نامەكێدا ژ مە خواست هندی د شیاندا بیت جلكان و قوماشێ كەڤن كۆمكەین و بۆ وان بهنێرین، ب كریار دگەل هندەك خێزانێن شیوعی ل گوندێ رەشیدیێ كۆمەكا مەزنا جلكان مە كۆمكرن و دانانە مالەكێ ل رەشیدیێ، پاشتر مە زانی ل زڤستانا وێ سالێ گەهشتبوونە بنگەهێن پێشمەرگەیێن شیوعی ل دەڤەرا ئەلقوش و مزووری.
٣٦٨. حافظ قاضی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٢- ٢٢٣.
٣٦٩. هەمان ژێدەر، بپ ٢٢٤ ، عبدالكريم فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٤.
٣٧٠. حافظ قاضی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٣.
٣٧١. رجب جميل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٣٦.
٣٧٢. بنێرە بیرهاتنێن وی، بپ ٥٩- ٦٠.
٣٧٣. حافظ قاضی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٦ ؛ عبدالكريم فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٤.
٣٧٤. حافظ قاضی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢٦.

٣٧٥. سلام فواز العبيدي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢ .

٣٧٦. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: هەمان ژێدەر، بپ ٢٣- ٢٥.

٣٧٧. عبدالكريم فرحان، ژێدەرێ بەرێ، بپ

٣٧٨. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: وريا جاف، مێژووی دەنگی کوردستانی عیراق، (هەولێر- ٢٠٠٢) ؛ وصفي حسن ردێنی، رادیو و تەلەفزیونێن کوردی ١٩٣٩- ٢٠٠٣، (دهۆك- ٢٠١١، بپ ٢٠١- ٢٠٤.

٣٧٩. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: حافظ قاضي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٠١- ٢٠٤.

٣٨٠. عبدالكريم فرحان، ژێدەرێ، بەرێ، بپ ١١٢- ١٢٠.

٣٨١. هژمارا هێزێن سوریێ گەهشتبوو ١٧ هزار کەسان. پشتی پێنج هەیڤان ژ دەسپێکرنا هێرشا لەشکەری بۆ سەر کوردستانێ ل ١٠ حزیرانێ حکۆمەتا سوریێ دانپێدانان کر کو پشکداری د ڤی شەریدا کریبە، زیانێن مەزن ژ گیانی و چەکی ب هێزێن سوری کەتن و چەندین ئەسیر د دەستێن پێشمەرگەیدا ل دووڤ خۆ هێلان دگەل چەندین پارچێن چەکی. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: عصمت شريف وانلي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٨٧- ١٨٩.

٣٨٢. هێزێن سووری د ڤەکشیانا خۆدا د ناڤ باژێرێ مووسلێ را دەربازبوون، گەلەك ژ مووسلیان گول بۆ سەرباز و ترومبێلێن وان د هاڤێتن و دەست بۆ دقوتان، هەرچەندە ڤی لەشکەری چ سەرکەتنەکا بەرچاڤ ژی دەستڤە نەئینابوو، بەلێ دەمێ ل ١٠ کانوونا دووێ ١٩٦٤ێ گەهشتیە دیمەشقێ مینا قارەمانان ب ئامادەبوونا سەرۆکێ سوریێ وی دەمی (امين الحافظ) پێشوازی لێ هاتەکرن، سەرباز و ئەفسەرێن وی ب نیشانان هاتنەخەلاتکرن و ئەڤ رۆژە ب "رۆژا سەرکەتنێ کو خەلکێ سوریێ تێدا ژیای" هاتەناڤکرن. بنێرە هەمان ژێدەر، بپ ٢٨٩.

٣٨٣. شێرزاد زکریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥١.

٣٨٤. هەمان ژێدەر، بپ ١٥٠- ١٥١.

٣٨٥. شێرزاد زکریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥١.

٣٨٦. بۆ ناڤێن زاندانیێن دی بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق.... ص ٣٦٩- ٣٧٢.

٣٨٧. بۆ زانیاریێن پتر: بنێرە: وصفي حسن الرديني، شهيد کوردستان.... بپ ٩٤ و پێن پاشتر.

٣٨٨. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، الحركة القومية الكوردية التحررية.... بپ ٣٨٤ و پێن پاشتر ؛ شێرزاد زکریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٣ و پێن پاشتر.

٣٨٩. شێرزاد زکریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٠ ؛ زۆزان صالح يوسفي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤١ ؛ شکیب عقراوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٢- ١٦١.

٣٩٠. شێرزاد زکریا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٦٠.

٣٩١. عبداكريم فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٧.

٣٩٢. دانا ادمز شمیدت، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٢٠ ؛ شکیب عقراوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٣- ١٣٥.

٣٩٣. هاتیەڤەگوهاستن ژ شێرزاد زکریا، الحركة القومية الكوردية في كوردستان- العراق.... بپ ١٦٨ ، فارس کورەمارکی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٣ ؛ ٦٧.

٣٩٤. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكوردية.... ج٣، بپ ١٣٤- ١٣٥.

٣٩٥. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە، عبدالفتاح علي البوتاني و شێرزاد زکریا، اتفاقية ١٠ شباط ١٩٦٤ بين الحكومة العراقية و قيادة الثورة الكوردية (الاسباب و النتائج) دراسة تأريخية وثائقية، (دهوك- ٢٠١٣)، بپ ٢٢٧ و پێن پاشتر.

٣٩٦. شێرزاد زکریا، الحركة القومية الكوردية في كوردستان- العراق.... بپ ٢٠٠.

٣٩٧. هەمان ژێدەر، بپ ٢٠١- ٢٠٢.

٣٩٨. عبدالكريم فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٨- ٧٩.

٣٩٩. فارس کورەمارکی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٣.

٤٠٠. بۆ بریارێن کۆنگرەی بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن .... ص ٢٦٢- ٢٦٥ ؛ مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكوردية.... ج٣، ص ١٤٣- ١٤٤.

٤٠١. حبیب محمد کریم، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩١- ٩٢ ؛ رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٧٨.

٤٠٢. شێرزاد زکریا، الحركة القومية الكردية في كوردستان العراق.... ص ١٨٦- ١٩٢.

٤٠٣. شێخ موسێ وەرمێلی، شۆرەشا ئەیلولێ ل دەڤەرا دهۆك.... بپ ٣٨- ٣٩

٤٠٤. زانیاریێن تایبەت.
٤٠٥. هەمان ژێدەر.
٤٠٦. شێخ موسێ وەرمێلی، شۆرشا ئەیلولێ ل دەڤەرا ئامێدیێ...، بپ ٢٨- ٢٩.
٤٠٧. شێخ موسێ وەرمێلی، شۆرشا ئەیلولێ ل دەڤەرا دهۆکێ...، بپ ٣١- ٣٢.
٤٠٨. شێخ موسێ وەرمێلی، شۆرشا ئەیلولێ ل دەڤەرا زاخۆ...، بپ ١٩.
٤٠٩. رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٦.
٤١٠. هلز عثمان میرو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٨.
٤١١. بنێرە بیرهاتنێن وی، بپ ٦٦
٤١٢. هەمان ژێدەر، بپ ٦٦- ٦٧. دووردبینم کو عەبدولکەریم فندی گەهشتبیتە جودابوویان، ل دووڤ هەلویستێ وی ل دوور دوبەرەکیێ، بنێرە پەرتووکا وی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٦- ٧٩.
٤١٣. فاروق محمود ئاکرەیی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٢.
٤١٤. فارس کۆرەمارکی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٣.
٤١٥. شیرزاد زکریا، الحركة القومية الكوردية في كوردستان...، بپ ٢٢٣.
٤١٦. بنێرە ناڤێن وان د: عبدالفتاح علي البوتاني و شيرزاد زكريا، اتفاقية ١٠ شباط ١٩٦٤...، ص ٢٦٨- ٢٦٩.
٤١٧. بنێرە هەمان ژێدەر، بپ ٢٦٨- ٢٧١ ؛ ٣٠٥ ؛ ٣٢٩ ؛ ٣٧٧- ٣٧٨ ؛ ٤٣٨ ؛ ٤٤٧.
٤١٨. فاروق محمود ئاکرەیی، ژێدەرێ بەرێ، بپ٢٢.
٤١٩. بۆ زانیاریێن بەرفرەهتر بنێرە: شيرزاد زكريا، مجلس قيادة الثورة في كوردستان- العراق ١٩٦٤- ١٩٧٠، دراسة تأريخية سياسية عامة، تقديم و مراجعة الدكتور عبدالفتاح علي البوتاني، (دهوك- ٢٠١٠)، بپ ٧٤- ٨٢.
٤٢٠. هەمان ژێدەر، بپ ٧٩- ٨٧.
٤٢١. بنێرە دەقێ بیرئینانێ: عبدالفتاح علي البوتاني، اتفاقية ١٠ شباط ...، بپ ٥٠٧- ٥٢٦.
٤٢٢. شيرزاد زكريا، مجلس قيادة الثورة ...، ص ١٦٣١٦٤. ؛ نجم الدين يوسفي، ژێدەرێ بەرێ، بپ١٧١- ١٧٢.
٤٢٣. شيرزاد زكريا، مجلس قيادة الثورة ...، ص٧٢- ٧٥.
٤٢٤. شيرزاد زكريا، مجلس قيادة الثورة ...، ص ١٧٦.
٤٢٥. بۆ زانیاریێن پتر بنێرە هەمان ژێدەری، بپ ١٨٧ و پێن دووڤرا.
٤٢٦. هەمان ژێدەر، بپ ٢٢٠- ٢٢٥.
٤٢٧. هەمان ژێدەر، بپ ٢٢٦- ٢٣٠.
٤٢٨. شيرزاد زكريا، مجلس قيادة الثورة...، بپ ٢٢٦- ٢٣٨؛ مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية، بپ ١٥٠- ١٥١.
٤٢٩. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية، بپ ١٥٠.
٤٣٠. شيرزاد زكريا، الحركة القومية الكوردية في كوردستان العراق ...، بەریەرێن ٢١٦-٢١٧.
٤٣١. عصمت شریف وانلی، ژێدەرێ بەرێ، بەریەرێن ٣٥٠-٣٥١.
٤٣٢. فاروق محمود ئاکرەیی، من ذاكرة ناشط P.D.K (پارتی) (دهوك، ٢٠١٢) بپ ٢٢.
٤٣٣. بۆ زانیاریێن زێدەتر بنێرە دەقێ نامەیا بایزید (الأموی) بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن ...، بەریەرێن ٤٤٣-٤٦٩.
٤٣٤. بۆ هوورکاریێن بنێرە دەقێ پەرتووکێ د: (عبدالفتاح علي البوتاني، وثائق عن ...، بەریەرێن ٦٠٦-٦٠٧)دا.
٤٣٥. بۆ دەقێ بەیانێ بنێرە: هەر وی ژێدەری، بەریەرێن ٥٨٢-٥٨٤.
٤٣٦. بۆ دەقێ وێ گازیێ بنێرە: هەر وی ژێدەری، ٦١١-٦١٥.
٤٣٧. بۆ دەقێ وێ بەیانێ بنێرە: هەر وی ژێدەری، بەریەرێن ٦١٦-٦١٩.
٤٣٨. ماجد حسن علي، الحركة الطلابية الكوردية في العراق، ١٩٢٦-١٩٧٠ (اربيل، ٢٠١١)، بپ ١٧٢-١٧٣، ٣٠٥.
٤٣٩. بۆ دەقێ راپۆرتا قائیمقامێ ئامێدیێ جاسم محەمەد العكام (یا نهێنی) یا رۆژا ١٩٦٥/٢/١٢ بۆ موتەسەرفیێ لیوا مووسل، بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني و شيرزاد و زكريا، (اتفاقية ١٠ شباط ١٩٦٤)، بەریەرێن ٦٣٦-٦٤٠.

٤٤٠. بۆ دەقێ وێ بەیانێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني و شیرزاد و زکریا. ژێدەرێ بەری.، بپ ٦٣١.
٤٤١. بۆ دەقێ نڤیسارا سەنتەرێ هەوالگریا مووسل یا رۆژا ١٩٦٥/٢/١٠ێ بنێرە هەر وی ژێدەری، بەرپەرێن ٦٣٤-٦٣٥.
٤٤٢. سعد ناجي جواد. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١١٧.
٤٤٣. شیرزاد زکریا. الحرکة القومیة الکوردیة ....، بەرپەرێن ٢٢٦.
٤٤٤. شیرزاد زکریا. الحرکة القومیة الکوردیة ....، بەرپەرێن ٢٢٦.
٤٤٥. بۆ دەقێ وێ بەیانێ بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن ....، ٣٥٢-٣٥٣.
٤٤٦. عصمت شریف وانلی. ژێدەرێ بەرێ ، بپ ٥٠٤، بپ ٣٥٦، شیرزاد زکریا، الحرکة القومیة الکوردیة في کوردستان ....، بەرپەرێن ٢٣٥-٢٣٦، شکیب عقراوي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٠، سعدی حمو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٥.
٤٤٧. شیرزاد زکریا. الحرکة القومیة الکوردیة في کوردستان ....، بپ ٢٣٦.
٤٤٨. شکیب عقراوي. ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٩٠.
٤٤٩. عبدالکریم فندی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٣.
٤٥٠. هەر ئەو ژێدەر، ٨٣-٨٤.
٤٥١. فارس کورەمارکی. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٧٣-٧٤.
٤٥٢. هەر ئەو ژێدەر، بەرپەرێن ٧٤-٧٥.
٤٥٣. بۆ هوورکاریان بنێرە: فارس کۆرەمارکی. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٧٤-٧٦.
٤٥٤. هەر ئەو ژێدەر، بەرپەرێن ٧٦-٧٧.
٤٥٥. عبدالکریم فندی. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٨٤-٨٥.
٤٥٦. ئیسڤێ سەعدوینێ ئەمین، ژێدەرێ بەرێ.، بپ ٩٧.
٤٥٧. بۆ بەرێخۆدانا ناڤێن وان بنێرە، عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن ....، بەرپەرێن ٣٦٣-٣٧٢.
٤٥٨. زانیاریێن تایبەتی.
٤٥٩. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .....، بەرپەرێن ٣٦٣-٣٧٢.
٤٦٠. بۆ ناڤێن گرتی و خانەنشینان بنێرە: هەر وی ژێدەری، بپ ٣٧٧-٣٨٠.
٤٦١. زوزان صالح الیوسفي. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٤.
٤٦٢. فارس کۆرەمارکی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٢.
٤٦٣. عبدالکریم فندی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٧.
٤٦٤. فارس کۆرەمارکی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٢.
٤٦٥. عبدالفتاح علي البوتاني. وثائق عن .....، بپ ٧٢.
٤٦٦. بۆ زانینا ئەگەرێن سەپاندنا عگێلی وەك وەزیرێ بەرەڤانیێ. بنێرە: شکیب عقراوي. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ١٩٤-١٩٥.
٤٦٧. عبدالکریم فرحان. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ١٦٠-١٦١.
٤٦٨. عبدالکریم فندی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٦.
٤٦٩. هەر ئەو ژێدەر، بەرپەرێن ٨٦-٨٧.
٤٧٠. ابراهیم حمید ابراهیم پیداوی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٤.
٤٧١. عبدالکریم فندی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٧.
٤٧٢. هەر ئەو ژێدەر، بەرپەرێن ٨٨-٩٠.
٤٧٣. بۆ هوورکاریان بنێرە: هەر وی ژێدەری، بەرپەرێن ٨٨-٩٠.
٤٧٤. بۆ هوورکاریان بنێرە: الیوسفي، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ١٧٧-١٨٠.
٤٧٥. عبدالکریم فندی. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٨٩-٩٠.
٤٧٦. عبدالفتاح علي البوتاني. الحرکة القومیة الکوردیة التحرریة ....، بەرپەرێن ٥٢١-٥٢٢.
٤٧٧. عبدالکریم فندی. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٠.
٤٧٨. بۆ هوورکاریان بنێرە: عبدالکریم فندی. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٨٦-٩٣.

٤٧٩. شیرزاد زکریا. الحركة القومية الكوردية في كوردستان العراق .... بەرپەرێن ٢٥١-٢٦٠.

٤٨٠. بۆ هوورکارییان بنێرە ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢٦١-٢٦٢.

٤٨١. بۆ زانینا هوورکاریێن ڤی شەری، بنێرە: رنيه موريس. كردستان او الموت، ترجمة وتعليق جرجيس فتح الله (اربيل، ١٩٩٩). محمد صالح الزيباري (الدكتور) (معركة هندرين ـــ زوزك ٢ مايس ١٩٦٦ من المعارك الحاسمة في تأريخ الثورة الكوردية)، کۆڤارا مەتین، هژمارە ١٠٠، دهۆك، گولانا ٢٠٠٠ ێ.

٤٨٢. شكيب عقراوي. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢١٢-٢١٣، هەروەسا بۆ زانینا گەهشتنا وان ئەفسەران بۆ ناڤ ریزێن حکومەتێ بنێرە: ابراهیم حمید پێداوی، رۆلێ ئەفسەرێن کورد د شورشا ئەیلوولێ دا (١٩٦١-١٩٧٠)، ڤەکۆلینەکا مێژوویی، نامەیەکا ماستەرنیە هاتیە پێشکێشکرن بۆ کولیژا پەروەردێ/ زانکۆیا زاخۆ، ل سالا ٢٠١٢، بەرپەرێن ١٠٢-١٠٧.

٤٨٣. رجب جمیل. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٧٣، عسمەت دینو. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٥١-٥٤، یوسف سەبری و دلۆڤان موستەفا، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن٢٨٥-٢٩٥.

٤٨٤. بۆ ناڤێن جوداببوویێن ئامێدیێ بنێرە: رجب جمیل، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢٦٦-٢٧٥.

٤٨٥. فارس کۆرەمارکی. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ١١٢-١١٥.

٤٨٦. هلز عثمان میرو. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٧٢-٧٣.

٤٨٧. بۆ بەهانەیێن رازیبوونا بارزانی ل سەر وێ رێککەڤتنێ، بنێرە: شکیب عقراوي. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢١٣-٢١٧.

٤٨٨. بۆ هوورکارییان و بۆ هەلویستێ هێزێن دەرڤەیی و ناڤخۆیی ل سەر وێ (بەیانێ)، بنێرە، شیرزاد زکریا. الحركة القومية الكوردية في كوردستان العراق .... بەرپەرێن ٢٨٠-٢٩٤.

٤٨٩. ژ بەر نەرازیبوونا مەزنە سەرکردەیێن لەشکەری عەبدلرەحمان بەزاز نەشیا چ ماددەیێن رێککەڤتنا ٢٩ی خزیرانا ١٩٦٦ێ ب جهـ بینیت، ژ بەر هندێ، ل رۆژا ٦ی تەباخا ١٩٦٦ێ دەست ژ کارکێشانا خۆ پێشکێش کر و بۆ رازیبوونا لەشکەری ژی عەبدلرەحمان عارف، لیوا ناجی تالب راسپارد و وی ژی ل رۆژا ٩ی تەباخا ١٩٦٦ێ کابینا ویزاری پێك ئینا. بۆ هوورکارییان بنێرە: شیرزاد زکریا. الحركة القومية الكوردية في كوردستان العراق. بەرپەرێن ٢١٣-٣٠٤.

٤٩٠. بۆ هوورکارییان بنێرە: حبیب کریم. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ١٠٩-١١٠ و رجب جمیل. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢٧٩-٢٨٠.

٤٩١. نامەیا حەیدەر حاجی حەیدەر سەعەتچی بۆ نڤیسەرێ ل رۆژا ١٥ی چریا ئێکێ یا ١٩٩٨ێ.

٤٩٢. هەر ئەو ژێدەر، چاڤپێکەڤتنەکا تایبەتی دگەل ئەحمەد محەمەد (ابو خلیل) ل دهۆك یا رۆژا ئێکی گولانا ٢٠٠٠ێ.

٤٩٣. چاڤپێکەڤتنەك دگەل ئەحمەد محەمەد (ابو خلیل)، نامەیا فاروق محمەد حەسەن بۆ نڤیسەری یا رۆژا ٢٥ی خزیرانا ٢٠٠١ێ.

٤٩٤. بۆ ناڤێن دی بنێرە: فاروق مەحمود ئاکرەیی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦.

٤٩٥. بۆ هوورکارییان بنێرە: هەر وی ژێدەری، بەرپەرێن ٢٦-٢٧.

٤٩٦. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢٦.

٤٩٧. زانیاریێن تایبەتی.

٤٩٨. فاروق محمد ئاکرەیی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥.

٤٩٩. بۆ ناڤێن وان بنێرە بەرپەربەرپەرێن بۆری.

٥٠٠. فاروق محمد ئاکرەیی، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٣٣-٣٤ و بپ ٢٥.

٥٠١. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٤٥.

٥٠٢. شێخ مووسێ وەرمێلی. شورەشا ئەیلولێ ل دەڤەرا ئامێدیێ .... بپ ٣٠.

٥٠٣. شێخ مووسێ وەرمێلی. شورەشا ئەیلولێ ل دەڤەرا دهۆك .... بەرپەرێن ٣٢-٣٣، هلز عثمان میرو، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٥.

٥٠٤. شێخ مووسێ وەرمێلی. شورەشا ئەیلولێ ل دەڤەرا زاخۆ .... بەرپەرێن ١٩-٢١.

٥٠٥. شیرزاد زکریا، الحركة القومية الكوردية في كوردستان العراق .... بپ ٣١٧.

٥٠٦. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٣١٨.

٥٠٧. زانیاریێن تایبەتی.

٥٠٨. نامەیا فاروق مەحمود ئاکرەیی بۆ نڤیسەری یا رۆژا ٢٧ ی تیرمەها ٢٠٠٢ ێ، مسعود البارزاني: البارزاني و الحركة التحررية

الکردیة، بەرگێ ٣، بپ ٢١٧، شکیب عقراوي. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢٢١-٢٢٢.

٥٠٩. نامەیا فاروق مەحمود ئاکرەیی بۆ نڤیسەری یا رۆژا ٢٧ ی تیرمەها ٢٠٠٢ ێ.

٥١٠. مسعود البارزاني. البارزاني و الحركة التحررية الكردية...، بەرگێ ٣، بپ ١١٩.

٥١١. نامەیا فاروق مەحمود ئاکرەیی بۆ نڤیسەری یا رۆژا ٢٧ ی تیرمەها ٢٠٠٢ ێ.

٥١٢. مسعود البارزاني. البارزاني و الحركة التحررية الكردية...، بەرگێ ٣، بپ ٢١٧.

٥١٣. شیرزاد زکریا، الحركة القومية الكوردية في كوردستان العراق ....، بپ ٣٤٥.

٥١٤. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٣٤٤.

٥١٥. مسعود البارزاني. البارزاني و الحركة التحررية الكردية...، بەرگێ ٣، بەرپەرێن ٢٠٠-٢٠١.

٥١٦. بۆ هوورکاریان بنێرە: مسعود البارزاني. البارزاني والحركة التحررية الكردية ... بەرگێ ٣، بەرپەرێن ٢٠٣-٢١١.

٥١٧. بۆ هوورکاریان بنێرە: ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٢٠٨-٢٠٩.

٥١٨. عصمت شریف وانلي. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٣٨٣-٣٨٤ ێ.

٥١٩. بۆ هوورکاریان بنێرە: مسعود البارزاني. البارزاني والحركة التحررية الكردية ... بەرگێ ٣، بەرپەرێن ٢١٣-٢٢٣.

٥٢٠. بۆ هوورکاریان بنێرە: ئیسڤێ سەعدۆیێ ئەمین. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ١٣٨-١٤٣.

٥٢١. هەر ئەو ژێدەر، بەرپەرێن ١٤٨-١٥٠.

٥٢٢. بۆ دەقێ بریارێ بنێرە: هلز عثمان میرو. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢١٧، ل نیڤا سالێن بیستان یێن سەدسالا بۆری، نوونەرێن کورد د جڤاتا نوونەرێن عیراقێ دا داخواز کربوون پارێزگەهەکا نوو ب ناڤێ پارێزگەها دهۆك بێتە پێك ئینان، شۆڕشا ئیلۆنێ ژی د گەلەك دان وستاندنێن خۆ دا دگەل حکۆمەتا عیراقێ رژدی ل سەر وێ داخوازێ کربوو، لێ حزبا بەعس و ژ بەر مەرەمەکا د دلێ خۆ دا، د وێ رەوشا شۆڕشا کوردی دا ئەو بریار دا، گرۆڤە ژی بۆ ڤێ چەندێ، بەعس کەسەکێ پارتی ژ ناڤ رێزێن خۆ دەرئێخستی وەك ئێکەم پارێزگارێ دهۆك دامەزراند کو ئەو ژی (عەگید سەدیق ئامێدی) بوو و ل سلێمانیێ عەقیدێ جودابووی محەمەد ئەمین فەرەج وەك پارێزگارێ وێ پارێزگەهێ دامەزراند.

٥٢٣. بۆ هوورکاریان بنێرە: رشید فندی. (تشکیل محافظة دهوك، وجولة في تأريخها المعاصر)، کۆڤارا دهۆك، هژمارە ٣١، تیرمەها ٢٠٠٦ ێ بەرپەرێن ٥٣-٥٨.

٥٢٤. فاروق محمود ئاکرەیی. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٣٤-٣٥.

٥٢٥. وصفي حسن ردێنی. کوشتارا گوندێ دەکان ل تەباخا ١٩٦٩ێ. (دهۆك، ٢٠٠٦)، بەرپەرێن ١٥-١٩.

٥٢٦. وصفي حسن ردێنی. کوشتارا گوندێ ....، بپ ٢٠.

٥٢٧. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢١-٢٤.

٥٢٨. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٢٦-٢٧.

٥٢٩. مسعود البارزاني. البارزاني و الحركة التحررية الكردية ....، بەرگێ٣، بپ ٢١٦.

٥٣٠. بۆ هوورکاریان بنێرە، وصفي حسن ردێنی. کوشتارا گوندێ ....، بپ ٣٢ و یێن پشتی وێ.

٥٣١. وصفي حسن ردێنی. کوشتارا گوندێ ....، بەرپەرێن ٧٣-٧٤.

٥٣٢*. بۆ هوورکاریان بنێرە، ئیسڤێ سەعدویێ ئەمین، ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ١٤٨-١٦٨.

٥٣٣. هەر ئەو ژێدەر، بەرپەرێن ١٤٧-١٤٨ و بەرپەرێن دی.

٥٣٤. یونان هرمز. ایامي في ثورة كردستان (اربیل، ٢٠٠١)، بپ ٨٥-٨٦.

٥٣٥. دەمێ خەلکێ صۆریا دیتین لەشکەر و سەرباز یێن ڤەدگەرێنە گوندی، خۆ ئامادە کرن برەڤن، لێ قەشە حەننا ئەو رازی کرن نەرەڤن و چ ترس ل سەر وان نینە و دێ ئەفسەری تێگەهینیت، گوندیان ژی گوهدارییا وی کرن و چوونە وی جهێ لێ هاتینە کوشتن. بنێرە: یونان هرمز. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٩.

٥٣٦. یونان هرمز. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٦٤، بپ ٦٦.

٥٣٧. هەر ئەو ژێدەر، بپ ٨٨ و یێن پشتی وێ، یۆنان هورمز د وێ کوشتارێ دا دوو برا و دو مام و دو ژنێن کەس وکارێن خۆ ژ

دەستدابوون، دوو جاران تەمەت ڤێ هژمارێ ژی بریندار ژ خێزانا خۆ و ژ خێزانێن مامێن خۆ هەبوون.

٥٣٨. بۆ دەقێ وێ یاداشتێ بنێرە: مسعود البارزاني. البارزاني والحركة التحررية الكردية .... بەرگێ ٣، بەرپەرێن ٧٧٠-٧٧٢ و بۆ هوورکارییێن کوشتارا صۆریا و ناڤێن قوربانی بریندااران بنێرە: وصفي حسن الرديني. مذبحة صوريا ١٦ ايلول ١٩٦٩، ترجمة الى العربية داؤود قادر عبدي (دهوك، ٢٠٠٩)، هەروەسا یونان هرمز. ژێدەرێ بەرێ، بەرپەرێن ٧٥-٩٣.

٥٣٩. عەبدلکەریم فەرحان دبێژیت کو روفائیل شوریز ژ بەر نامەیەکا بۆ کوردان هنارتی هاتبوو گرتن و ئەو نامە وەك گرۆڤە هاتبوو ل قەلەمدان بۆ هاریکارییا وی دگەل شۆرشگێران یان ژی بۆ سیخوریکرنێ بۆ وان و عەبدلسەلام عارف گەلەك ل سەر سێدارەدانا وی یێ رژد بوو، لێ ژ بەر هۆکارێن مرۆڤایەتی و ل بەرچاڤگرتنا رەوشا وی دەمی، حوکمێ زیندانا هەتاهەتایی ل سەرهاتە دانان. بنێرە پەرتووکا وی: ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٤.

٥٤٠. بۆ دەقێ وێ یاداشتێ بنێرە: (وقائع عن الحالة المؤسفة التي يعيشها المسيحيون العراقيون تحت الحكم البعثيين)، البارزاني والحركة التحررية الكردية .... بەرگێ ٣، بەرپەرێن ٧٨٣-٧٨٦.

٥٤١. عصمت دينو بنستاني السندي. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٥٥.

٥٤٢. بۆ زانینا هوورکارییێن ڤان شەڕان و یێن دی و رووداان و ئەنجامێن وان بنێرە: مسعود البارزاني و الحركة التحررية الكردية...، بەرگێ ٣، بەرپەرێن ٢٠٣-٢٢١.

٥٤٣. بۆ پێشنیارێن دی یێن حکۆمەتێ بنێرە: هەر وی ژێدەری، بپ ٢٢٥.

٥٤٤. بۆ هوورکاریان بنێرە: شيركو فتح الله. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢١٤ و یێن پشتی وێ.

**( هندەك ئیدیومێن لەشکەری)**

فصيل: پەل
رعيل: پۆل
سرية: لق
امر سرية: سەرلق
فوج: بەتالیۆن
ملازم: جێدار
نقيب: پێشەنگ
رائد: پێشرەو
مقدم: پێشکار
عميد: راگر
لواء : لیوا
رقيب: سەرکار
مأمور: (مفوض): کومیسەر، رێپێدراو
مخفر شرطة: پۆلیسخانە، بنکەهێ پۆلیسان، قشلەیا پۆلیسان
عريف: پۆلەوان

# دهۆك و وەرارێن سیاسی یێن ناڤخۆیی (١٩٧٠-١٩٧٥)

رەجەب جەمیل حەبیب
وەرگێران: سالح یوسف صوفي

ل سالا ١٩٦٩ێ حکومەتا عیراقێ ب ئۆپەراسیۆنێن خۆیێن سەربازی نەشیا شۆرشا کوردستانێ(١٩٦١-١٩٧٤)ێ ژ ناڤ ببەت کو پێشمەرگەیان چەندین جاران هێزێن حکومەتێ و کوردێن پشتەڤانێن وان شکاندبوون، هەر بۆ نموونە، ل دەڤەرا بەهدینان هێزێن حکومەتێ ژ بەر بەرگریا پێشمەرگەیان نەشیان چارچۆڤێ ئۆپەراسیۆنێن خۆ یێن سەربازی بەرفرەهـ بکەن و ئەو ئۆپەراسیۆن ب تنێ ل رەخ و رویێن باژێر و باژێرك و رێ یێن ل ناڤبەرا وان باژێران بوون، وەکی: رێیا گشتیا ل ناڤبەرا دهۆك - ئامێدیێ، دهۆك - زاخۆ و شێخان - ئاکرێ، ژ بەر هندێ، حکومەتێ هێرشێن خۆ یێن ئاسمانی و تۆپبارانا خۆ ل سەرگوندێن وەلاتیێن مەدەنی بەرفرەهکرن[١].

هۆسا، ژ بەرکو حکومەت ب رێیا سەربازی نەدشیا شۆرشا کوردی ژ ناڤ ببەت[٢]، دەست ب دان وستاندنێن نوو دگەل سەرکردایەتیا شۆرشا کوردی کر[٣] و ئەو دان وستاندن بوونە ئەگەرێ مۆرکرنا پێکهاتنەکێ ل ناڤبەرا شاندێ حکومی ب سەرۆکاتیا سەددام حسێن جێگرێ سەرۆکێ جڤاتا سەرکردایەتیا شۆرشێ (مجلس قيادة الثورة) و سەرکردایەتیا کوردی و ئەو پێکهاتن شەڤا ١١/١٠ێ ئادارا ١٩٧٠ێ ل دەڤەرا ناوپردان هاتە ئیمزاکرن و ئێڤاریا رۆژا ١١ ئادارێ وەك بەیانەکێ ژ لایێ سەرۆك ئەحمەد حەسەن بەکر هاتە خواندن[٤].

ئەو پێکهاتن گرنگترین دەستکەڤتیا شۆرشێ بوو، چونکی ئەڤە جارا ئێکێ بوو د دیرۆکا هەڤچەرخ دا دەولەتەکا خودان سەروەری د بەلگەنامەیەکا یاسایی دا دانپێدانێ ب مافێن گەلێ کورد بکەت و ئەڤە سەرکەڤتنەکا مەزن بوو بۆ شۆرشا کوردستانێ[٥].

ئێك ژ گرنگترین بەندێن بەیانا ١١ ئادارێ ئەڤا خوارێ بوو: راستڤەکرنا دەستوورێ بەروەخت ب ئاوایەکێ وەسا دەڤێ وێ هەبوونا دو نەتەوەیێن سەرەکی یێن عیراقێ بخۆڤە بگریت کو ئەو ژی عەرەب و کوردن و دەستوور بریارێ ل سەر مافێن نەتەوەیی یێن گەلێ کورد بدەت، دەستەیەك ژی بۆ ئاڤەدانکرنا دەڤەرا کوردی بێتە پێکئینان و پێکهاتێن چەکدارێن نەنیزامی (یێن کوردێن پشتەڤانێن حکومەتێ) بێنە هەلوەشاندن و رەوشا دەڤەرا کوردی بەرەڤ ئۆتۆنۆمیێ ڤە بێتە پێشئێخستن و ئەڤ چەندە د ماوەیێ چوار



شاندێ شۆرشا کوردستانێ یێ دانستاندنان دگەل حکومەتا عیراقێ ئادارا ١٩٧٠

سالاندا بێتە کرن[٦].

تشتێ پەیوەندی ب بەهدینان ڤە هەی، وەلاتییان ژ دل چاڤدێریا راگەهاندنا بەیانێ دکرن، کو ئیزگەیێ عیراقێ دەم بۆ دەمی بەلاڤ دکر کو بەیانەکا گرنگ دێ هێتە راگەهاندن، دەمێ هاتییە پێشکێشکرن ژێ کەیف و خۆشی کەڤتە سەر دێمێ خەلکی و ب ڤێ دەستکەڤتێ و سەرکەڤتنێ پیرۆزباهی ل ئێك دو دکرن و خەلك ژ مالێن خۆ دەرکەڤتن و ب گوللەهاڤێتنێ دلخۆشیا خۆ دەردبڕین[٧]. هەلویستێ دهۆکێ ب تمامی پشتەڤانیکرنا پێکهاتنێ بوو و بۆ ئەگەرێ وێ چەندێ وەلاتییان پتر باوەری ب شۆرشێ بهێت و ل دوور سەرکردایەتییا وێ خڕڤە ببن، محەمەد سەلیم موفتی ژێ دبێژیت: کو ئێك ژ ئەگەرێن پێشوازیکرنا خەلکێ دهۆك ل پێکهاتنێ، بۆ رزگاربوونێ بوو ژ گرێدانا کارگێڕیا دهۆکێ دگەل مووسلێ کو چ خێر ژێ نەدیتبوون[٨].

بۆ دەربڕینا دلخۆشییا خەلکێ دەڤەرێ ب وێ پێکهاتنێ، هژمارەکا ئاهەنگان ل باژێر و باژێرکێن دەڤەرێ هاتنە رێکخستن، هەر بۆ نموونە، ل باژێرێ دهۆکێ ئاهەنگەکا مەزن ل سەنتەرێ باژێری ب رەخ رێڤەبەریا پۆلیسان هاتە سازکرن و هەموو تەخ وچینێن جڤاکی ژ فەرمانبەرێن دام و دەزگەهێن حکومی و خویندکار و وەلاتیێن سڤیل و لایەنێن حزبی پشکداری تێدا کرن و پەیڤێن پارتێن سیاسی هاتنە پێشکێشکرن و تێدا پشتەڤانی و دلخۆشیا خۆ ب وێ پێکهاتنێ دەربڕین، ژ وانا پەیڤا پارتی و پەیڤا حزبا کۆمۆنیستا عیراقێ[٩]، هەروەسا رێورەسمێن ئاهەنگەکا دی یا نەوروزێ ب سەرپەرشتیا لیژنا ناوچا مووسلێ و لقێ پارتی ل گوندێ سێجی ناڤبەرا دهۆك-سێمێلێ هاتەگێران، ئەڤ جهە بۆ گێرانا ئاهەنگێ ل دووڤ داخوازا پارێزگارێ مووسلێ هاتەهەلبژاتن ژ ترسێن وێ چەندێ نەکو ببیتە ئەگەرێ ئازراندنا کەسێن دژی پێکهاتنا ١١ ئادارێ و ئاریشە دووڤ را بهێن، د ئاهەنگێدا خەلکێ ب داوەت و شەهیانا و سروودێن وەك شیرین بەهارە و نەوروز و پێشمەرگە دەربرین ژ خۆشی و شادمانیا خۆ دکر[١٠]، ل زاخۆ ژی ئاهەنگەکا جەماوەریا بەرفرەهـ ل زالگەها هیزاوا ل باکوورێ باژێرکێ زاخۆ هاتەکرن و پێشمەرگەیان و

عیسا سوار سەرکردەیێ وان یێ وێ دەڤەرێ و پتریبا خەلکێ باژێڕی و گوندێن دەردۆر ب دەوات و لەیزینێن کوردی پشکداری تێداکرن، هەتا سەربازێن عیراقی یێن ل دەڤەرێ ژی پشکداری د وێ ئاهەنگێ دا کرن و دلخۆشییا خۆ ب ڤەکرنا بەرپەرێ نوو یێ ئاشتیێ ل وەلاتی دەربڕین[11]، ل دەڤەرا شێخان ژی ئاهەنگەك ل سەنتەرێ قەزایێ (ل ئێسڤنێ) هاتە سازکرن و خەلکێ دەڤەرێ پشکدارییەکا بەرفرەهـ تێدا کر و سەرپەرشتیارێن ئاهەنگێ ژی چەندین چالاکی ئەنجامدان وەکی ستران و دەواتێن کوردی و هۆزان و شانۆگەری ئەڤە سەرباری پەیڤێن حزبی ژ وانا پەیڤا پارتی کو ژ لایێ عەلی جۆقی بەرپرسێ لیژنا ناوچەیێ شێخان ڤە هاتبوو پێشکێشکرن[12]، هەروەسا ئاهەنگەکا دی هەر ب وێ هەلکەڤتێ دگەل جەژنا نەورۆزێ ل گوندێ باعەدرێ هاتە سازکرن و جەماوەرێ دەڤەرێ نەخاسمە ژی پێشمەرگەیێن ژ بەرۆکێن شەڕی ژ چیایان هاتینە خوارێ و پشتەڤانێن شۆڕشێ پشکداری تێدا کرن و سەرکردەیێ دەڤەرێ ژی حسۆ میرخان پەیڤەك ب وێ هەلکەڤتێ پێشکێشکر و پیرۆزباهی ل ئاهەنگگێڕان کر و پەسنا گرنگییا ڤێ دەستکەڤتی بۆ دۆزا کوردی کر[13].

ل ئاکرێ ژی رێ ورەسمێن ئاهەنگەکا مەزن ل سەرایا باژێڕی ب پشکدارییا هەموو تەخ وچینێن جڤاکی و نوونەرێن حزبێن سیاسی هاتە رێکخستن و پەیڤێن وان حزبان هاتنە پێشکێشکرن ژ وانا پەیڤا پارتی و پەیڤا حزبا بەعس، ڤێ ئاهەنگێ چەند سەعەتەکان ڤەکێشا و تێدا ئاهەنگگێڕان ب ستران و دەواتێن کوردی دلخۆشییا خۆ ب ڤێ هەلکەڤتێ دیار کرن[14]، هەروەسا ل رۆژا ١٨ێ ئادارێ لیژنا ناڤخۆیا پارتی ل ئامێدیێ ئاهەنگەکا مەزن ل دەڤەرا بانیا مێرستەکێ ل رۆژهەلاتێ ئامێدیێ ساز کر و جە ماوەرەکێ زۆر یێ خەلکێ باژێڕی و و رەخ و روویێن ئامێدیێ ب ژن و زەلام ڤە لێ ئامادەبوون و کارگێڕیا حکۆمەتێ و هاشم سوهەیب بەرپرسێ رێکخستنا حزبا بەعس یا باژێڕی پشکداری تێداکرن و پەیڤا مەکتەبا سیاسییا پارتی ل ناڤ دورووشمێن ئامادەبوویان هاتە پێشکێشکرن، هەر ب وێ هەلکەڤتێ قائیمقامێ ئامێدیێ ژی پەیڤەك پێشکێش کر، پشتی نیڤرۆ ژی دەوات و شەهیان ب



پشکەك ژ رێورەسمێن ئاهەنگ گێرانێ ب هەلکەفتا راگەهاندنا پێکهاتنا ١١ ئادارێ ل دهوکێ

پشکداریا هەمووان ل دووڤ ئاوازێن دەهۆل و زۆرنایان دەست پێکرن، هەڤدەم ئاهەنگگێڕان لافیتە بلندکرن و درووشمێن وەکی (هەر بژیت کورد و عەرەب) هاتنە گۆتن و وێنەیێن بارزانی و ئالایێ پارتی و ئالایێ عیراقێ هاتنە بلندکرن[١٥].

ل باژێرێ مووسل ژی دەمێ شەڤا ١٢/١١ی ئاداری بەیان هاتییە خواندن کەیف و خۆشییێ سەرانسەری دەڤەرێن باژێری ڤەگرت، نەخاسمە ژی ل تاخێن کوردی یێن پتریا ئاکنجیێن وان کورد، ل سەر ڤێ چەندێ دکتۆر عەبدلفەتاح بۆتانی دبێژیت: وێ شەڤێ خوندکارێن کورد ل پشکێن ناڤخۆیی یێن زانکۆیا مووسلێ و خانەیا مامۆستایان و هەردو ئامادەیێن چاندن و پیشەسازی رژیانە سەر جاددان و ب دەوات و دروشمان کەیفخۆشییا خۆ دەربڕین، سپێدەیا ١٢ی ئاداری ژی خۆنیشاندانێن مەزن ل دیارترین جاددێن مووسل ڤەگرتن کو ئەندامێن ئێکەتییا قوتابیێن کوردستانێ رۆل د ئامادەکرن و رێڤەبرنا وان خۆنیشاندانان دا هەبوو، ژ وانا: رۆژ نوری شاوەیس (خوندکارێ کولیژا ئەندازێ) و جەرجیس حەسەن (خوندکارێ کولیژا ئادابێ)، هەروەسا ل رۆژا ٢١ ئادارا(جەژنا نەورۆزێ) ١٩٧٠ێ ئێکەتییا قوتابیێن کوردستانێ مەزنترین خۆنیشاندان و رێپێڤانا پشتەڤان پێکهاتنێ ئەنجامدا، وێ رێپێڤانێ ژ دەڤەرا (رأس الجادة) دەسپێکر د جادا (نینوی)را دەربازبوو و ل نێزیکی یانەیا لەشکەری ل جەم (جسر الحرية) ل ئالیێ راستێ یێ باژێری ب داویهات[١٦].

هەروەسا شاندەکێ لقێ ئێك یا پارتی پشکداری د وێ ئاهەنگێ دا کر یا ل بەغدا ب وێ هەلکەڤتێ هاتییە رێکخستن، ل سەر ڤێ چەندێ عەبدلرەزاق گەرماڤی هاریکارێ فەرماندێ هێز (لیوا) دهۆك یا پێشمەرگەی دبێژیت: کو ئەو ژ لایێ نعمان عیسا بەرپرسێ لقێ ئێك و ئەسعەد خۆشەوی سەرکردەیێ دەڤەرا بەهدینان هاتبوو راسپاردن دەستووریێ ژ حکۆمەتێ وەرگرم داکو ٢٥٠ ژ هێزێن کوردی ژ دەڤەرا بەهدینان قەستا بەغدا بکەن و پشتی دەسەلات ل دهۆك ل سەر وێ چەندێ رازی بووی، ئەو شاند ب سەرپەرشتییا عەبدولرەزاق گەرماڤی و شەعبان سەعید ئەندامێ لقێ ئێك ل رۆژا ١٨ ئاداری گەهشتە بەغدا و دگەل شاندێن دی و جەماوەرێ کورد و عەرەبێن باژێری پشکداری د ئاهەنگەکا مەزن دا کر کو ب هەلکەڤتا جەژنا نەورۆزێ (٢١ی ئاداری) هاتبوو سازکرن، رێ ورەسمێن ئاهەنگێ ژی هەر ژ دەڤەرا (باب المعظم) هەتا (باب الشرجي) بوون (کو نۆکە دبێژنێ گۆڕەپانا ئازادیێ- ساحة التحرير)، ژ وان یێن پشکداری د وێ ئاهەنگێ دا کرین ئەڤێن خوارێ بوون: مەلا عەلی بەرۆشکی، خالد قەساری، حەسەن گەرماڤی[١٧]، مستەفا حەسەن باپیر ئامێدی، مستەفا حەجی ئەحمەد بامەڕنی، فوئاد تەییب بامەڕنی، عەبدلباقی ئیبراهیم بامەڕنی[١٨]، هەروەسا شاندەکێ دی ژ دهۆك کو محەمەد سەلیم موفتی و کەمال تاها ژ ئەندامێن وێ بوون سەرەدانا بارزانی ل بارەگەهێ وی ل ناوپردان بۆ پیرۆزباهیکرنا وی ب هەلکەفتا ئیمزاکرنا پێکهاتنێ کر[١٩].

هەر ژ رۆژا ئیمزاکرنا پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ هەتا ئادارا سالا ١٩٧٤ێ دەڤەرا بەهدینان یا تەنا و هاویش بوو[٢٠] و رەوش یا گونجای بوو وەلاتی قەستا کارێن خۆ بکەن، هەر د وی ماوەی دا یەکەیێن زێرەڤانێن سنووران ژ پێشمەرگەیان هاتنە پێکئینان و مووچە بۆ هاتنە تەرخانکرن بۆ باشکرنا رەوشا ژین و ژیارا وان[٢١]، ئەڤە ژ بلی دانانا یاسایا خانەنشینییا شەهیدان (یێن روودانێن باکوور) کو کەسانێن پەککەڤتی ژی بەر وێ یاسایێ دکەڤتن[٢٢]، هەروەسا ل خزیرانا سالا ١٩٧٠ێ محەمەد مەحمود عەبدلرەحمان (سامی عەبدلرەحمان) وەزیرێ کاروبارێن باکوور سەرەدانا گوندێ بامەڕنێ کر و سۆزدا گوند بێتە ئاڤەدانکرن[٢٣]، ل خزیرانا سالا پاشتر ژی وەزیرێ کاروبارێن باکوور راگەهاند کو ل نێزیك دێ دەست ب ئاڤاکرنا ٣٠٠ خانییان بۆ وان کەسان هێتە کرن یێن ژ بەر روودانێن دلتەزینێن قەزا ئامێدیێ خانیێن خۆ ژ دەستداین[٢٤]، هەروەسا رێڤەبەریا باژێرڤانیێن دهۆك ژی هژمارەکا پرۆژەیان بۆ ب جهئینانێ رادەستی بەلێندەران کرن، ژ وانا: چێکرنا جاددەیێن ناڤخۆیی ل زاخۆ، ئاڤاکرنا

سەرشووەكا مللی ل سێمێلێ، ئاڤاكرنا بازاڕێن هەڤچەرخ ل ئامێدیێ، ئاڤاكرنا سەرشووەكا مللی و بازاڕێن هەڤچەرخ ل مانگێشکێ، ئەڤە سەرباری ئاڤاكرنا گەلەك خواندنگەهـان ل قەزایێن دهۆك، زاخۆ، ئامێدیێ و شێخان[٢٥]، هەروەسا چێکرنا پرەکێ ل سەر روبارێ زێ یێ مەزن ل ناڤبەرا دەڤەرا شێلادزێ ل ئامێدیێ و دەڤەرا بارزان یا سەر ب پارێزگەها هەولێر ڤە[٢٦].

پشتی راگەهاندنا پێکهاتنا ١١ ئاداری، کۆمەلا ل سالێن ١٩٦٤- ١٩٦٦ێ ژ ڕێزێن پارتی جودابووی دەست ب دان وستاندنان دگەل پارتی کر داکو بێتە ناڤ ڕێزێن پارتی، بۆ ب ساناهیکرنا ڤێ پرۆسێ ژی، ڤێ کۆمەلێ کو وێ ژی ل بن ناڤێ پارتی دیموکراتی کوردستان کار دکر، ل کانوونا ئێکێ یا سالا ١٩٧٠ێ ناڤێ حزبا خۆ بۆ (حزبی شۆڕشگێری کوردستان) گوهوری، هەردولا ل سەر بڕیارا ئێککرتنێ پێکهاتن کو ئەندام و کادرێن حزبا شۆڕشگێڕ ب ڕێژا ٣/١ ل سەر هەموو ئاستان بێنە ناڤ دەستەیێن سەرکردایەتیا پارتی دیمۆکراتی کوردستان[٢٧] و هەردولا ل رۆژا ١٠ شواتا ١٩٧١ێ بەیانا ئێککرتنێ دەرئێخستن[٢٨] و پتریا وان ڤەگەڕیانە ناڤ ڕێکخستنێن پارتی، هەر بۆ نموونە، ل قەزا ئامێدیێ محەمەد مستەفا ئامێدی ژ حزبا شۆڕشگێڕ وەك ئەندامێ لیژنا ناڤخۆیا ئامێدیێ ڤەگەڕیا ناڤ ڕێزێن پارتی و دەست ب چالاکیێن خۆیێن حزبی کر[٢٩]، هەروەسا هەر ئێك ژ: سەعدوللا عەلی ئامێدی، مستەفا عەبدلرەحمان ئامێدی ژ ئێکەتیا قوتابیێن حزبا شۆڕشگێڕ گەهشتنە ناڤ ڕێزێن ئێکەتیا قوتابیێن کوردستانێ یا پارتی دیمۆکراتی کوردستان[٣٠]، ل دهۆك ژی حەسەن نعمەت گەرماڤی گەهشتە ناڤ ڕێزێن پارتی لێ هەڤدەم هندەکێن دی ل مالێن خۆ مان وەکی خێزانا تێلی ئێکمالەیی[٣١]، لێ ئەندامێن خێزانا حەجی شەعبان یێن ل سالا ١٩٦٦ێ گەهشتینە ناڤ ڕێزێن جودابوویان، ژ باژێرێ ئامێدیێ دەرکەڤتن و قەستا بەغدا کرن، کو وی دەمی عەلی ئەحمەد حەجی شەعبان پشتی مرنا سدقی یێ برایێ خۆ کاروبارێن



سەرەدانا سالح یوسفی ئەندامێ مەکتەبا سیاسییا پارتی بۆ دەڤەرا بامەرنێ ل ١٩٧٠/٥/١٤

خێزانێ ب رێڤە دبرن[٣٢].

ل دۆر ئاغایێن كوردێن لایەنگرێن حكۆمەتێ ژی، مستەفا سالح نێروەیی دبێژیت: پشتی بارزانی بڕیارا لێبۆرینێ بۆ وان دەرئێخستی، شاندەكێ وان هاتە بارەگەهێ بارزانی ل دەڤەرا (قەسرێ) و ئەو شاند ژ دێوالی سەعید ئاغا دۆسكی، محەمەد ئەمین ئاغا رەسول (پسمامێ محەمەد كەلحێ رێكانی)، بشار ئاغایێ زاخۆیی و هندەكێن دی پێكهاتبوو، دێوالی ب ناڤێ وی شاندی ئاخڤت و سوپاسییا بارزانی كر بۆ وێ لێبۆرینا دای، لێ بارزانی داخواز ژێ كر دلسۆزێن نەتەوەیێ خۆ بن[٣٣].

ل دەڤەرێن شێخان و ئاكرێ ژی هەر ئێك ژ زێبر مەحمود ئاغایێ زێباری، عەبدوللا ئاغایێ شەرەفانی و شێخ ئەحمەدێ سوورچی گەهشتنە ناڤ رێزێن شۆرشێ، لێ هەر ئێك ژ مشیر ئاغایێ گۆران، محیەددین جانگیر ئاغایێ هەركی، عەبدوللەتیف ئەحمەد ئاغایێ زێباری، ئەرشەد ئەحمەد ئاغایێ زێباری و شێخ سابر رەقیب سوورچی دگەل ئالیكرێن خۆ چوونە مووسل و ژ وێرێ ژی چوونە بەغدا و ل مالێن خۆ مان([٣٤]).

مەلا مستەفا بارزانی ل رۆژا ٢٩ ئەیلوولا ١٩٧١ێ بەرهنگاری پێكۆلەكا سەرنەكەڤتیا تیرۆركرنێ بوو كو ژ لایێ كرێگرتیێن دەزگەهێن ئێمناهییا (ئەمنا) حكۆمەتێ ڤە پلان بۆ وێ پێكۆلێ هاتبوودانان[٣٥]، ئەڤە ژی دەمێ شاندەكێ ب ناڤ زەلامێن ئایینی (مەلان) سەرەدانا بارزانی كری ل بارەگەهێ وی ل دەڤەرا حاجی ئۆمەران، كو وان نەدزانین ئامیرێن توومارکرنێ یێن هەلگرتین د تەژی تەقەمەنی بوون[٣٦].

د وێ روودانێ دا بارزانی ب سڤكی بریندار بوو، لێ هەموو زەلامێن ئایینی هاتنە كوشتن و پشتی هنگی ژی شۆفێرێن هەردو ترۆمبێلێن شاندی هاتنە كوشتن، كو ئەو ژی دو ئەفسەرێن ئەمنێ بوون و هەردو ترۆمبێل ژی تژی تەقەمەنی بوون[٣٧].

گەلێ كورد ئەو پیلانگێڕی رسوا و شەرمەزار كر و رێكخراوێن پارتی و رێكخراوێن كوردستانی و جەماوەرێ كوردستانێ برۆسكە هنارتن تێدا پێكۆلا دەستدرێژیكرنێ ل سەر ژیانا بارزانی پرۆتستۆكرن و پیرۆزباهی لێ كرن كو ب سلامەتی ژ وێ پیلانگێڕێ رزگار بوویە و داخواز كرن ژی ڤەكۆلینەكا هوور ل سەر وێ رووداتێ بێتە كرن، هەر بۆ نموونە، ژ دەڤەرا بەهدینان رێكخراو و كەسایەتیێن برۆسكەیێن پرۆتستۆكرنێ هنارتین و د رۆژنامەیا (التآخي) دا هاتینە بەلاڤكرن ئەڤێن خوارێ هندەك ژ وانن: رێكخراوا سەرسنكێ یا پارتی دیمۆكراتی كوردستان، مستەفا حسێن ئامێدی، دلۆ ئیسحاق موختارێ گوندێ مانكێشكێ، سەدیق ئەمین و رەشید ئەترووشی، قوتبەددین شێخ بەدیع سوورچی[٣٨]، خەلكێ گوندێ زێوا شێخ پیرمووس ل رۆژئاڤایێ (بامەڕنێ)، ژ وانا: تاهر ئەحمەد و حەسەن عەبدوللا، مامۆستایێن دەڤەرا بەرواری بالا ژ وانا: خدر مەحمود، تاهر تاهر، شوكری عەبدوللا، تاهر ئەحمەد، یوسف عومەر و عسمەت محەمەد، مامۆستایێن شۆرشا كوردی ل دهۆك، ئێكەتییا قوتابیێن كوردستانێ/ تایێ زاخۆ، خەلكێ گوندێ بلیجانێ ل ناحیا گولی ژ وانا: زاهر زوبێر و خەلیل عەلی، ئەرمەنیێن زاخۆ ژ وانا: ئەسكەندەر مرادیان، ئیبراهیم كۆرەماركی، عەشیرەتا نێروە، ژ وانا، محەمەد تاهر رەشید ئاغا، حاجی سالح ئاغا، مەلا ئەحمەد دوتازایی، سەبری رەشید ئاغا، مستەفا سالح ئاغا، عەمەرخان رێكانی[٣٩]، جەلال ئەمین عەبدۆ دادوەرێ ڤەكۆلینێ ل ئامێدیێ، خەلكێ گوندێ ئەردەنا مەسیحییان، ژ وانا: ئیشۆ و عەمانوئێل و تۆما، قەشەیێ ئەرەدنا، خەلكێ گوندێ رەشاڤا، ژ وانا: تاهر مەلا ئەحمەد، ئێكەتیا لاوێن دیمۆكراتا كوردستانی ل زاخۆ، ئێكەتییا كۆمەلا جۆتیاران ل زاخۆ، ئێكەتییا مامۆستایێن كوردستانێ ل زاخۆ، سەید عەبوش سلێڤانەیی[٤٠]، هەروەسا مستەفا سالح نێروەیی دبێژیت: شاندەكێ پێكهاتی ژ سالح عەبدوللا نێروەیی و حسێن فەتەح نێروەیی دگەل هندەك كەسێن دی ژ هەردو عەشیرەتێن دۆسكی ژووری و رێكانی چوونە بارەگەهێ بارزانی ل حاجی ئۆمەران بۆ پیرۆزباهیكرنا وی ب هەلكەفتا رزگاربوونا

هەژی گۆتنێ یە کو ل سالا ١٩٧٤ێ دو بەتالیۆنێن دی ل دەڤەرێ ب ناڤێ بەتالیۆنێن پاراستنا مللی هاتبوونە پێك ئینان بۆ وەرگرتنا خۆبەخشێن نوو د ناڤ ریزێن هێزێن پێشمەرگەیدا، بەتالیۆنا ئێکێ ب سەرکردایەتیا خالد محەمەد ئیبراهیم شلی و بەتالیۆنا دووێ ژی ب سەرکردایەتیا وەیسی بانی بوو.

لێ هێزا ئاکرێ یا ل سالا ١٩٧١ێ پشتی دەڤەرا ئاکرێ ژ تەوەرێ شێخان - ئاکرێ هاتییە جودا کرن هاتییە پێکئینان، سنوورێ چالاکیا وێ هێزێ ل ناڤبەرا رۆژهەلاتێ رووبارێ زێ یێ مەزن و رۆژئاڤایێ رووبارێ خازری بوو و ئەو هێز ب سەرکردایەتیا زێبر مەحمود ئاغا زێباری هاتبوو پێکئینان و ل سالا ١٩٧٣ێ تەتەرێ برایێ وی ئەرکێ سەرکردایەتیا وێ ب ستۆوێ خۆڤە گرتبوو، ئەڤە ژی پشتی جوداهیێن دیتن وبۆچوونان ل ناڤبەرا زێبر ئاغا و سەرکردایەتیا بزاڤا کوردی دا پەیدا بووین، ئەو هێز ژ ڤان بەتالیۆنێن خوارێ پێك دهات[٧٠].

١- بەتالیۆنا ئێك ب سەرکردایەتیا عەبدوللا قادر زێباری.

٢- بەتالیۆنا دو ب سەرکردایەتیا سەعید عەبێ زێباری

٣- بەتالیۆنا سێێ ب سەرکردایەتیا فەیزۆ سەلیم زێباری.

٤- بەتالیۆنا چوار ب سەرکردایەتیا مستەفا تاها زێباری، هەروەسا هێزا حەمرین ژی ل دەڤەرا ئاکرێ بنەجهـ ببوو کو ئەو هێز ل سالا ١٩٧٤ێ وەك هێزا یەدەك یا پاراستنێ ب سەرکردایەتیا جەسیم بارزانی و سەرکردەیێن مەیدانی: محەمەد عەبدوللا بامەرنی، محەمەد ئەمین مزووری، مەلا ناوخۆش بێخمەیی و ئەحمەد گۆرانی هاتبوو پێك ئینان، بۆ زانین، هێزا حەمرین ل پێشیێ بەتالیۆنەکا سەر ب هێزا هەلگورد بوو لێ پاشی بوو هێز (لیوا) هاتە گوهورین[٧١].

## دەستپێکرنەڤا شەری:

ل نیسانا سالا ١٩٧٤ ێ شەر ولێکدان ل ناڤبەرا بزاڤا نەتەوەیی یا کوردی و حکۆمەتا عیراقێ دوبارە دەست پێکرن[٧٢]، ئەڤە ژی ژ بەر ب جهـ نەئینانا بەندێن پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ ژ لایێ حکۆمەتێ ڤە و سیاسەتا عەرەبکرنێ یا ل دەڤەرێن کوردی ل کەرکوك و شنگال ب کار دئینا و ئەنجامنەدانا سەرژمێریا ئاکنجییان ل وان دەڤەران، ئەڤە سەرباری دەستنیشان نەکرنا سنوورێ دەڤەرا کوردی، هەروەسا بزاڤا کوردی ژی پرۆژێ ئۆتۆنۆمیێ یێ حکۆمەتێ ل رۆژا ١٢ کانوونا ئێکێ ١٩٧٣ێ یێ پێشکێش کری رەتکر[٧٣]، چونکی وی پرۆژەی گرنگترین دەڤەر ب خۆڤە نەگرتبوون یێن بزاڤا کوردی داخواز دکر ل ناڤ دەڤەرا ئۆتۆنۆمی بن کو ئەو ژی کەرکوك و شنگال و خانەقین بوون، هەروەسا ژ بەر دەسەلاتێن کارتۆنی یێن پرۆژەی داینە دەستەییێن ئۆتۆنۆمی، کو د پرۆژەی دا هاتبوو دڤێت دادگەها تەمییزێ یا عیراقێ چاڤدێریێ ل سەر رەوایی یا بریارێن دەستەیێن ناڤبری بکەت، هەروەسا پرۆژەی دەسەلات نەدابوو دەستەیێن ئۆتۆنۆمی چاڤدێریا دەزگەهێن پۆلیس و ئێمناهی و رەگەزنامەیێ بکەت ب ئاوایەکێ گەلەك سنووردار نەبیت[٧٤]، ڤێجا پشتی سەرکردایەتیا بزاڤا کوردی ئەو پرۆژە رەت کری، حکۆمەت عیراقێ ئێکلایەنی یاسایا ئۆتۆنۆمی ل رۆژا ١١ ئادارا ١٩٧٤ێ دەرئێخست[٧٥]، ئێڤاریا وێ رۆژێ ژی وەزیرێن کورد سالح یوسفی، ئیحسان شێرزاد، موحسن دزەیی، محەمەد مەحموود عەبدلرەحمان (سامی عەبدلرەحمان) دەست ژ کارکێشانا ژ حکۆمەتا بەغدا پێشکێشکرن و گەهشتنە شۆرشێ[٧٦].

شەرێ ل نیڤا هەیڤا نیسانێ دەست پێ کرەڤە و ئارمانجا سەرەکییا هێرشا حکۆمەتێ بارەگەهێ سەرکردایەتیا کوردی بوو ل دەڤەرا بالەك[٧٧]، لێ ل دەڤەرا بەهدینان، بەری شەر ل دهۆك بێتە دەست پێکرن، هێزێن حکۆمەتێ خۆ ژ هندەك دەڤەرێن وێ نەخاسمە ژ دەڤەرێن چیایی یێن وەکی ئامێدیێ

ڤەکێشابوون، ژ بەر هندێ، چ کریارێن سەربازی ل ئامێدیێ نەهاتنە روودان[٧٨]، هەروەسا دژواریا روو ب رووبوونان ل ناڤبەرا پێشمەرگەیان و هێزێن حکومی و کوردێن لایەنگرێن وێ و چەکدارێن حزبا کومونیستا عیراقێ ل سەرانسەری دەڤەرێن بەهدینان نەوەکی ئێك بوو، هەر بۆ نموونە، ل ئاکرێ هێزێن حکومەتێ کونترۆل ل سەر سەنتەرێ قەزایێ (بازێرێ ئاکرێ) ب تنێ کر ئەڤە ژی پشتی پێشمەرگەی و پتریا خەلکێ وێ بۆ دەڤەرێن چیایی یێن نێزیکی ئاکرێ خۆڤەکێشاین و ئاوارە بووین و بازێرك ژ خەلکێ وێ نیڤ ڤالا بوو و چ روو ب رووبوونێن مەزن یێن سەربازی ل ئاکرێ ل ناڤبەرا پێشمەرگەی و هێزێن حکومی نەهاتنە روودان، ژ بلی هندەك روو ب رووبوونێن ژێکجودا وەکی هێرشا پێشمەرگەیان کربیە سەر هێزێن حکومی ل گوندێ رۆڤیا و بزاڤا وان بۆ کونترۆلکرنا بازێرکێ بەردەڕەش[٧٩].

ل قەزا شێخان ژی هێزێن حکومەتێ کونترۆل ل سەر بازێرکێ ئێسڤنێ سەنتەرێ قەزایێ و گوندێ باعەدرێ و ڕێیا ل ناڤبەرا هەردووان کر، لێ دەڤەرێن دی ل بن دەستێ پێشمەرگەیان بوون و هژمارەکا روو ب رووبوونێن چەکداری لێ هاتنە روودان نەخاسمە ل ناڤبەرا وان و چەکدارێن حزبا کومونیستا عیراقی و پتریا وان روو ب رووبوونان ژی ل وی تەوەری(میحوەری) بوون، چونکی نێزیکی مووسل بوو کو بارەگەهێ سەرەکیێ کومونیستان ل دەڤەرێ ل وێرێ هەبوو، پێشمەرگەیان ل وی تەوەری هندەك ئوپەراسیونێن جورەیی دژی هێزێن حکومی و چەکدارێن حزبا کومونیست ئەنجامدان، وەکی هێرشێن کرینە سەر: ئێسڤنێ، مەهەتێ، مێرینا، سەنتەرێ ناحیا ئەلکویش (ئەلقوش)، گوندێ باعەدرێ کو ل وێرێ هندەك پێشمەرگەی شەهید ببوون[٨٠]، ل قەزا زاخۆ ژی هێزێن حکومەتێ شیان کونترۆلێ ل سەر سەنتەرێ قەزایێ بکەن، لێ ژ بەر بەرگریا پێشمەرگەیان ئەو هێز د پێکولێن خۆ یێن ئێك ب دوڤ ئێك دا سەرنەکەڤتن و نەشیان پێشڕەویێ بکەن[٨١].

ل دهۆك ژی دگەل دەستپێکرنا شەڕان، پتریا خەلکێ بازێری دەرکەڤتن و قەستا دەڤەرێن رزگارکری کرن کو ل بن دەستەلاتا پێشمەرگەیێن کورد بوون و هێزێن حکومەتێ و کومونیستێن هاریکارێن وان کونترۆل ل سەر سەنتەرێ بازێری کرن[٨٢]، لێ د ماوەیێ سالەکێ دا ژ بەر بەرگریا پێشمەرگەیان یێن خۆ ل چیایێ باکوورێ دهۆك و گوندێن دەردۆرێن وێ ئاسێ کرین نەشیان ژ بازێرێ دهۆك بەرەڤ دەڤەرێن رزگارکری پێشڕەویێ بکەن، کو خالا بنەجهـبوونا هێزا(لیوا) ئامێدیێ ل رۆژهەلاتێ چیایێ دهۆك ل ناڤبەرا گەلیێ دهۆك و گەلیێ بێسرێ بوو ب سەرکردایەتییا سەلیم ئەسعەد خۆشەوی[٨٣] و سەرکردەیێن مەیدانی: ئەحمەد عەبدوللا شانە هرۆری[٨٤]، موحسن سالح عەبدلعەزیز ئامێدی[٨٥]، سەید سالح عەبدولخالق چەمسەیدی و محەمەد عەلی بناڤی[٨٦] و خالا بنەجهـبوونا هێزا دهۆکێ ژ گەلیێ دهۆکێ دەسپێدکر هەتا رۆژئاڤایێ گوندێ برجینی ڤەدگرت ب سەرکردایەتییا عەلی خەلیل خۆشەڤی پاشی ب سەرکردایەتییا عەبدولرەزاق گەرماڤی و سەرکردەیێن مەیدانی: نەعمۆ سەمەد، محەمەد حەسەن باجلۆری، فارس کۆرەمارکی و حەسەن عەلی گەرماڤی[٨٧]، ل نیڤا هەیڤا چریا ئێکێ هێزێن حکومەتێ لەشکەر و چەتەیان ب پشتەڤانیا چەکێ ئاسمانی و تۆپخانا گران پێکۆل کرن بەرەڤ چیایێ باکوورێ دهۆك پێشڕەویێ بکەت و هێرشێ بکەتە سەر چەپەرێن (قەوغا، شکەفتا سمتێ، تەحا، قەشەفرێ) و یەکەیەکا هێزێن هێرشکەر شیا کوپا سەرێ رەش یێ دەڤەرا قەشەفرێ داگیر بکەت، لێ هێزێن کوردی ژ هێزا دهۆك و زاخۆ شیا د دەمەکێ کورت دا وی جهی کونترۆل بکەنەڤە و چەندین کەسان ژ هێزێن حکومەتێ بکوژن[٨٨].

هەرچەندە ژی چ ئوپەراسیونێن سەربازی ل دەڤەرێن رزگارکری نەهاتبوونە کرن، لێ بومبەبارانا ئاسمانی ل سەر بازێر و بازێرك و گوندێن رەخ وروویان یا بەردەوام بوو و خەلکێ وان نەچار بوو مال و حالێن خۆ بهێلن و خۆ ل ناڤ شکەفت و گەلی و دۆل

ونهالێن دەڤەرێ بپارێزن، ل سەر ڤێ چەندێ كەمال عارف ئامێدی دبێژیت كو باژێرێ ئامێدیێ ژ خەلكێ وێ ڤالا ببوو و خویندكارێن وێ ئەزموونێن خۆ ل ناڤ زەڤی و بیستانێن دەڤەرا سیلاڤێ و ئۆتێلا گەشتیاری یا ل رۆژئاڤایێ باژێری كرن، ژ لایەكێ دیڤە سەركردایەتیا شۆرەشێ كارگێرییا پارێزگەها دهۆك ڤەكێشا قەزا ئامێدیێ و بارەگەهێ پارێزگەهێ دانا گوندێ كانیا سنجێ و رێڤەبەریا پۆلیسان ژی ل سیلاڤێ و بارەگەهێ لقێ ئێك ژی ل گوندێ قەدشێ بوو(٨٩)، ژ بەركو كۆمێن مەزن یێن وەلاتیان دگەل خێزانێن خۆ گەهشتبوونە شۆرەشێ، ئەڤە ببوو بارگرانی ل سەر ملێن سەركردایەتیا شۆرەشێ و ژ بەر رەوشا ب زەحمەتا ژیارێ یا خەلكێ گوندان و ئەوێن ژ دەڤەرێن دی یێن هێزێن حكۆمەتێ كۆنترۆل ل سەر كرین، سەركردایەتیا بەهدینان نەدشیا هەموویان بخۆڤە بگریت و ئاهێن خوارنێ بۆ پەیدا بكەت، رەز و زەڤیێن وەلاتییان ژ بەر بومبەباران و تۆپبارانا هێزێن حكۆمەتێ بەرهنگاری سۆتنێ بوون و دۆرپێچا ئابووری یا دژوار یا حكۆمەتێ دانایە سەر پێشمەرگەیان، هەروەسا تركیا سنوورێ خۆ دائێخستبوو و ژ بەر دووراتیا ئیرانێ ژ دەڤەرا بەهدینان ب زەحمەت بوو ئاهێن خوارنێ ژ ئیرانێ بگەهنە دەڤەرێ(٩٠).

دڤێت ئاماژە ب وێ چەندێ بێتە كرن كو خەلكێ دەڤەرا بەهدینان رۆلەكێ بلند د وان شەڕان دا هەبوویە یێن ل ناڤبەرا هێزێن حكۆمەتێ و پێشمەرگەیان ل دەڤەرا سۆران ب گشتی و تەوەرێ بالەك ب تایبەتی هاتینە روودان كو بارەگەهێ سەركردایەتیا كوردی لێ بوو، نەخاسمە هێزا هەلگورد یا ل سالا ١٩٦٨ ێ ژ خەلكێ بەهدینان وەك هێزەكا تایبەت یا سەر ب سەركردایەتیا شۆرەشێ ب سەرپەرشتیا رەشید حاجی بەدریە سندی هاتیە پێكئینان، ئەو هێز ژ سێ بەتالیۆنان پێكهاتبوو كو ئەو ژی ئەڤە بوون: بەتالیۆنا ئێك ب سەركردایەتیا سلێمان حاجی بەدریە سندی، بەتالیۆنا دو ب سەركردایەتیا عەریف سلێمان دۆسكی و بەتالیۆنا سێ ب سەركردایەتیا عەبدلرەحیم جەسیم بارزانی، بەتالیۆنا ئێك ل هەردو تەوەرێن قەلادزێ و هەلەبجە شەڕ دكر و بەتالیۆنا دو ل تەوەرێن قەرەداغ، شارەزوور و سەید سادق شەڕ دكرن، لێ بەتالیۆنا سێ ئەركێ بەرەڤانیكرنێ ژ تەوەرێ دۆكان پێ هاتبوو سپاردن و ب دەهان شەهید دان، ژ لایەكێ دیڤە و ژ بەر دژوارییا شەڕان ل وان تەوەران، گەلەك هێزێن چەكدار ژ هێزێن بەهدینان، ژ وانا بەتالیۆنا عەمەر عەلی هالۆ و بەتالیۆنا حەجی قادۆ ژ هێزا زاخۆ، بەتالیۆنا فارس كۆرەماركی ژ هێزا دهۆك ئەڤە سەرباری عەلی خەلیل مزووری سەركردەیێ هێزێ ب خۆ، بەتالیۆنا نوری عەبدال مزووری و بەتالیۆنا سالح نەرمۆ ژ هێزا شێخان، هێزێن تەیمز ئارەب بارزانی، شەعبان غەفار بەرواری، سەلیم ئەحمەد چێیی ژ هێزا ئامێدیێ و یێن دی، ب فەرمانێن سەركردایەتیا كوردی قەستا وان تەوەران كرن بۆ بەرسینگگرتنا هێرشێن لەشكەرێ عیراقێ و وان هێزان ب ئاوایەكێ باش ئەركێن خۆ ب جهـ ئینان و ب دەهان شەهید ل وان تەوەران دان(٩١).

فەرە بێژین كو پشتی حكۆمەتێ ئێكلایەنی یاسایا ئۆتۆنۆمی بۆ كوردستانێ دەرئێخستی، حكۆمەتێ ل داوییا سالا ١٩٧٤ێ جڤاتەكا یاسادانانێ ژ كوردێن لایەنگرێن خۆ بۆ دەڤەرا ئۆتۆنۆمی پێكئینا، هندەك ژوان ژ پارێزگەها دهۆكێ بوون بوون، ژ وانا: عەگید سەدیق ئامێدی، محەمەد كەلحێ رێكانی، بەدیعە محەمەد نەجیب ئامێدی، ناسر تەوفیق بەگێ بەرواری، عارف خالد حەسەن ئامێدی، محەمەد زەكی حەسەن (پارێزەر)، محەمەد حەجی ئەمین نعمان ئامێدی، تۆما داود تۆما (قەشێ بەرواری)، هاشم تاها حەكیم ئاكرەیی، نەجمەددین مامۆ سوورچی، حسێن خدر سوورچی، لەتیف ئەحمەد زێباری، محیەددین جانگیر هەركی، سابر شێخ رەقیب سوورچی، عەبدولقادر مستەفا مزووری، بەشیر عەبدلرەحمان ئەترووشی، عەونی مستەفا جبرائیل ئاكرەیی، ئیحسان هیبە اللە موفتی ئاكرەیی، محەمەد سەعید عەبدلرەحمان دهۆكی، عەبدلرەحمان شەعبان پیرۆ ئاكرەیی، عەلی شێخ غیاسەددین نەقشبەندی بامەڕنی، یەلدا تۆما ئیسحاق بەرواری و ئیحسان تاهر روشدی موفتی

ئامێدی[٩٢].

ژ بەرکو دەستەلاتا عیراقێ نەشیا ب ئاوایێ سەربازی شۆرشا کوردی ژ ناڤ ببەت، دەست ب پیلانگێرانان دژی شۆرشێ کر، ئەڤە ژی دەمێ سەددام حسێن جێگرێ سەرۆك کۆمارێ عیراقێ بزاڤکری دگەل ئیرانێ بگەهیتە تێکگەهشتنەکێ بۆ راوەستاندنا پشتەڤانی و هاریکاریا ئیرانێ بۆ شۆرشا کوردی، و د کۆنگرەیێ گۆپیتکا ئیسلامی (مؤتمر القمة الاسلامية) دا ل ربات کو ل هەیڤا چریا ئێکێ ١٩٧٤ێ هاتبوو گرێدان داخوازا ناڤگینیا دەولەتێن عەرەبی کربوو بۆ زڤراندنا پەیوەندیێن ل ناڤبەرا عیراقێ و ئیرانێ[٩٣]، هەروەسا دیدارەك ل نیویۆرك ل ناڤبەرا کیسنجەر وەزیرێ دەرڤەیێ ئەمریکا و تالب شەبیب نوونەرێ هەردەمیێ عیراقێ ل نەتەوێن ئێککرتی هاتە سازکرن بۆ خۆشکرنا پەیوەندییان ل ناڤبەرا واشنتۆن و بەغدا و دوورئێخستنا دەسەلاتا سۆڤیەتی ژ دەڤەرا کەنداڤی، هندەك زانیاری ژی هەنە کو کیسنجەر ژ پایتەختەکێ عەرەبی ب ئاوایەکێ نەپەنی بۆ ماوەیێ ٢٤ سەعەتان سەرەدانا بەغدا کربوو و دگەل سەرکردایەتیا عیراقێ کۆم ببوو و ل حەفتیا داویێ یا هەیڤا شواتا ١٩٧٥ێ بنواشەیێ پێکهاتنا جەزائیر دانابوو[٩٤].

ل رۆژا ٦ ئادارا ١٩٧٥ێ ل پەراوێزا کۆمبوونێن کۆنگرێ ئۆپیك یێ ل جەزائیر هاتییە گرێدان، سەددام حسێن دگەل محەمەد رەزا پەهلەوی ئیمزا ل سەر پێکهاتنەکێ ل ناڤبەرا عیراقێ و ئیرانێ کر یا پاشی ب پێکهاتنا جەزائیر هاتییە نیاسین[٩٥]، ل دووڤ وێ پێکهاتنێ، عیراقێ دانپێدان ب داخوازێن ئیرانێ د (شط العرب) دا کر[٩٦]، بەرامبەری وێ، چەندێ ئیرانێ ژی سۆزدا هەموو هاریکاریێن خۆ بۆ پێشمەرگەیێن کورد راوەستینیت[٩٧].

پشتی شەشی ئادارێ شۆرشا کوردی د رۆژێن سەخت و دژوار و وەرارێن بلەز را بۆری[٩٨]، لێ تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ دا ئەوە مەلا مستەفا بارزانی سەرکردەیێ شۆرشا کوردی ل رۆژا ٢٠ ئادارا ١٩٧٥ێ ب داوی هاتنا شۆرشا کوردی راگەهاند[٩٩] و دو رێ دانانە بەر پێشمەرگە و وەلاتیێن کورد: یان ل عیراقێ بمینن، یان ژی وەك پەنابەر قەستا ئیرانێ بکەن[١٠٠].

ل سەر هەلویستێ بەهدینان ژ ڤێ رەوشێ، چەند رۆژەکان پشتی راگەهاندنا شەڕ راوەستاندنێ ژ لایێ بارزانی ڤە، بۆ ڤەکۆلین و هەلویستدانەکێ ل سەر ڤی بابەتی ئەسعەد خۆشەوی کۆمبوونەك دگەل سەرکردەیێن مەیدانییێن دەڤەرا بەهدینان گرێدا، ئەو کۆمبوون ل مانگێشکێ هاتەکرن و هەر ئێك ژ ئەڤێن خوارێ لێ ئامادە بوون: عیسا سوار، عەبدلرەزاق گەرماڤی، حسۆ میرخان، سەلیم ئەسعەد خۆشەوی، فارس کۆرەمارکی، مەلا حەمدی سەلەفي، ئەحمەد عەبدوللا شانە هرۆری، محەمەد تاهر رەشید نێرۆەیی، بەرپرسێن لیژنەیێن ناڤخۆ و یێن دی. پشکدارێن کۆمبوونێ بریاردان ل سەر بەرگریێ بەردەوام بن و شەڕێ پارتیزانی بکەن و عیسا سوار گۆت: کو وی تێرا سالەکێ چەك و ئاهێن خوارنێ هەنە. ل داوەیێ ژی پشکدارێن کۆمبوونێ برۆسکەیەك بۆ سەرکردایەتیا شۆرشێ هنارت و تێدا دیارکرن کو بریاردانە ل سەر بەرگریێ بەردەوام بن، لێ سەرکردایەتیێ برۆسکەیەك بۆ سەرکردایەتیا بەهدینان هنارت و تێدا دیار کو بەردەوامبوون ل سەر بەرەڤانیێ، د بەرژەوەندیا دۆزا کوردی دا نینە[١٠١].

تشتێ گرنگ د ڤێ مەسەلێ ئەوە کو پتریا پێشمەرگەیێن بەهدینان یێن گەهشتینە شۆرشێ خۆ رادەستی دەسەلاتا عیراقێ کرن، ئەڤە ژی ژ بەر دووریا دەڤەرا بەهدینان ژ ئیرانێ و تشتەکێ گەلەك ب زەحمەت بوو ل بن بومبەبارانا ئاسمانیا بەردەوام ل سەر پێشمەرگەی و وەلاتیێن مەدەنی و رەوشا ب سەخت و دژوارا شەڕی و ل بن سیبەرا دووربێچا ئابووریا رژێمێ دانایە سەر دەڤەرێن شۆرشا کوردی دو حەفتییان ل سەر ئێك ب رێڤە بچی هەتا دگەهییە وێرێ، لێ هندەکان قەستا ئیرانێ کرن نەخاسمە بەرپرسێن حزبی وەکی ئەندامێن لقی و لیژنێن ناوچە و سەرکردەیێن سەربازی یێن مەیدانی، هەژییە ئاماژێ بکەینە وێ چەندێ کو دەمێ ئامادەکاری بۆ خۆڤەکێشانێ ژ دەڤەرێ بۆ ئیرانێ دهاتە کرن، عیسا

سوار سەرکردەیێ هێزا زاخۆ و دو کەسێن دگەل وی ب غەدر وخیانەت ل دەڤەرا لێڤێ یا سلێڤانەیی ب دەستێ سەرکردەیێ بەتالیۆنەکا خۆ هاتە کوشتن و بکوژی خۆڕادەستی حکۆمەتێ کر[١٠٢].

فەرە بێژین کو پشتی پارتا کۆمۆنیست گەهشتیە بەرەیێ نیشتمانی (الجبهة الوطنية) یا حزبا بەعس (یاحوکمدار) ل تیرمەها ١٩٧٣ێ پێك ئینای[١٠٣]، پەیوەندی ل ناڤبەرا پارتا کۆمۆنیست و پارتی ئالۆز بوون و روو ب رووبوونێن چەکداری ل ناڤبەرا چەکدارێن هەردولا ل هژمارەکا دەڤەرێن کوردستانێ هاتنە روودان، ئەڤە سەرباری شەڕێ راگەهاندنێ یێ ناڤبەرا هەردولا، جەماوەرێ کوردستانێ ژی ب توندی نەڕازیبوونا خۆ ژ هەوێن ناڤزڕاندنا راگەهاندنێ یا کۆمۆنیستان ل ناڤ و ل دەرڤەی عیراقێ ل دژی پارتی ئەنجامدای دەربڕین[١٠٤]، هەر بۆ نموونە، رێکخراوا رێکان یا پارتی رێبازا رۆژنامەیا (طريق الشعب) زمانحالا پارتا کۆمۆنیست پرۆتستۆ کر ژ بەر هەوێن ناڤزڕاندن و شێواندنێ یێن دژی گەلێ کورد و پارتی دکرن[١٠٥]، گەهشتنا پارتا کۆمۆنیست بۆ ناڤ رێزێن بەرەیێ نیشتمانی کاریگەرییەکا نەرێنی ل سەر پەیوەندیێن ل ناڤبەرا وێ و پارتی دیمۆکراتی کوردستان هەبوو هەتا وی رادەی لێکدان ل ناڤبەرا هەردولا بێنە روودان و پارتی ژی ل دەڤەرێ بێهن ل رێکخستنێن پارتا کۆمۆنیست تەنگ کر و چالاکیێن وان سنووردارکرن هەتا وەلێ هاتی دەست ب کارێ حزبیێ نەپەنی بکەت[١٠٦]، ل دەمێ دەستپێکرنەڤا شەڕی ژی ل ناڤبەرا سەرکردایەتیا شۆرشا کوردی و حکۆمەتا عیراقێ، ئەندامێن پارتا کۆمۆنیست خۆدانە دگەل عیراقێ و دژایەتیا شۆرشا کوردی کرن[١٠٧].

## ژێدەر و پەراوێز:

١. شکیب عقراوي. سنوات المحنة في كردستان، اهم الحوادث السياسية و العسكرية في كردستان و العراق من ١٩٥٨ الى ١٩٨٠، (اربيل: ٢٠٠٧)، چاپا ٢، بپ بپ ٢٥٣- ٢٦١ ؛ نجم الدين اليوسفي. ثورة ايلول المجيدة، (دهۆك – ٢٠٠٣)، چ٢، بپ ١٩٥.

٢. مسعود البارزاني: البارزاني والحركة التحررية الكردية، ثورة أيلول ١٩٦١-١٩٧٥، ج٣، (اربيل– ٢٠٠٢)، بپ٢٢٥- ٢٤٠؛ شيرزاد زكريا محمد، دور مجلس قيادة الثورة في كوردستان من التطورات السياسية في كوردستان- العراق (١٧ تموز ١٩٦٨-١١ ئِزار١٩٧٠)، كۆڤارا زانكۆیا دهۆك،، ب ١٢، هژمارە ١، خزیرانا ٢٠٠٩، بپ ٣٦٢.

٣. صلاح الخراسان. التيارات السياسية في كردستان العراق، قرأة في ملفات الحركات والأحزاب الكردية في العراق ١٩٤٦-٢٠٠١،(بەیرۆت-٢٠٠١)، بپ ١٨٢.

٤. سعد ناجی الجواد (دكتور)، العراق والمسألة الكردية ١٩٥٨- ١٩٧٠، (لەندن-١٩٩٠)، بپ ١٥٢ .

٥. مسعود البارزاني. ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٤٣.

٦. شکیب عقراوي. ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ٢٩٤-٢٩٥. بۆ بەرێخۆدانا دەقێ وێ بەیانێ بنێڕە: مسعود البارزاني. ژێدەرێ بەرێ، بپ بپ ٦١٤-٦٢٠، لێ گرنگترین خالێن لاوازیێ د بەیانێ دا و یێن پاشی بووینە ئەگەرێ سەرنەکەڤتنا پرۆسا ئاشتیێ، ئەو بوو جۆرێ وێ ئۆتۆنۆمیێ نەهاتبوو دەستنیشانکرن یا بڕیار بوو د ماوەیێ چوار سالان دا بێتە پراکتیك کرن، وێ بەیانێ رێ نەددا دەستەیەکا نێڤدەولی مایتێکرنێ بکەت و ب فەرمی سەرپەرشتیا ب جهئینانا بەندێن وێ بکەت، هەروەسا دەڤەرا کوردی نەهاتە دەستنیشانکرن و ژ بەر هندەك خالێن دی. بنێڕە: شکیب عقراوی. ژێدرەێ بەرێ، بپ بپ ٢٩٥-٢٩٧.

٧. دیدارەکا تایبەت دگەل نەجمەددین یوسفي ل دهۆکێ رۆژا ٢٩/١٢/٢٠٠٩ێ، ناڤبری ل سالا ١٩٤١ێ ژ دایکبوویە و ل ١٩٥٨ێ بوویە ئەندامێ پارتی و ل سالا ١٩٦١ێ ژی گەهشتییە شۆرشا ئەیلوولێ، چەندین پۆستێن حزبی وەرگرتینە، ژ وانا: بەرپرسێ

# پارێزگەها دهۆکێ د ناڤبەرا ١٩٧٥-١٩٩١ ێدا

عەبدولجەلیل سالح موسا
و. موسەدەق تۆڤی

## نسکۆیا ١٩٧٥ێ و کاریگەرییێن ل پارێزگەها دهۆکێ

پشتی ١٤ سالان ژ تەمەنێ شۆرشا کوردستانێ (١٩٦١- ١٩٧٥)ێ یا نها ب شۆرشا ئەیلوولێ دهێتەناڤکرن، نە ل سەر کومتێن چیایێن بلند و نە ژی د ناڤ گەلی و نهالاندا و نە ژی ل بەرۆکێن شەری بریار ل سەر پاشەرۆژا شۆرشا کوردستانێ هاتەدان، بەلکی ئەڤ بریارە ل رۆژا ٦ ئادارا ١٩٧٥ێ ل هۆلێن کوچکا (قصر القباب) ل دەڤەرەکا دەوروبەرێن پایتەختێ جەزائیری د پەراوێزا کۆنگرەیێ دەولەتێن هناردەکارێن نەفتێ (ئۆبیك) هاتەدان، ل ڤی جهێ شاهێ ئیرانێ محەمەد رەزا شاهـ و جێگرێ سەرۆکێ جڤاتا سەرکردایەتیا شۆرشێ یا عیراقی سەدام حسێن پێکهاتن داویێ ب ناکوکیێن سیاسی و شەرەنیخا ناڤبەرا هەردو وەلاتان ل سەر هندەك دەڤەرێن سنووری بینن. د ڤێ پێکهاتنێدا سەدام حسێن رازی بوو دەست ژ نیڤا ئاڤا (شط العرب) و هندەك دەڤەرێن سنوورێن ستراتیژی بەردەت بۆ ئیرانێ، د بەرامبەردا شاهێ ئیرانێ رازیبوو ب رێکا برینا هاریکارییان و گرتنا سنووران ب روویێ شۆرشا کوردستانێ و هاریکاریا حکۆمەتا عیراقێ بکەت بۆ ژ ناڤبرنا شۆرشێ[1].

د دەمێ چەند دەمژمێرەکان پشتی موورکرنا پێکهاتنێ ئیرانێ گشت هاریکارییێن خۆ بۆ شۆرشا کوردستانێ راگرتن، سوپایێ عیراقێ ژی ل بەرۆکێن شەری ب تایبەت بەرۆکێن رەواندزێ و ئاکۆیان بەرەڤ دەڤەرا گەلالە و چۆمان دەست ب هێرشێن دژوار کر و هەمی جۆرێن چەکی و گشت شیانێن خۆ د ڤان هێرشاندا مەزاختن ب وێ مەرەمێ کو گەڤان ل دەڤەرا بالەکایەتی و حاجی ئۆمەران بکەت کو بارەگایێن سەرکردایەتیا شۆرشێ بوون، د دوا شەرێ سەردەمێ شۆرشا ئەیلوولێ رۆژا ١٣ ئادارێ بوو دەمێ لیوایەکا لەشکەرێ عیراقێ ل دۆلی ئاکۆیان بەرەڤ پێش هاتی و پێشمەرگەی بەر سنگێ وان گرتی و تووشی زیانەکا مەزن کرین و ناچارکرین بەرەڤ پاش بزڤرنەڤە، د ڤی شەریدا سەرکردەکێ پێشمەرگە ب ناڤێ سالح ئاکۆیی شەهید دبیت، کو ئەڤە دوا شەهیدێ شۆرشا ئەیلوولێ بوو[2]. هەر ل رۆژا ١٣ ئادارێ حکۆمەتا عیراقێ داخوازا شەر راوەستاندنێ

کر هەتا ئێکێ نیسانێ ئەو ژی ب وێ مەرەمێ کو رێکێ بدەتە هێزێن شۆرشا کوردستانێ بەرەف ئیرانێ ڤەکشیێن یان ژی خۆ رادەستی عیراقێ بکەن، د ئەنجامێ ڤان روودانێن ژ نشکەکێڤە هاتینە پێش شۆرش شکەست و ل ٢٠ ئادارێ مەلا مستەفایێ بارزانی بریار دا دەست ژ شەری بەردەت[٣].

د ئەنجامێ ڤێ روودانێدا ل هەموو جهان خەمباری و نەرازیبوونێ خۆ ب سەر خەلکێ کوردستانێدا گرت، ب هەررەنگەکێ شیایین نەرازیبوونا خۆ دەردبری و ئەڤ پێکهاتنە وەك خیانەتا مەزنا دەسەلاتداریا شاهێ ئیرانێ و حکومەتا وەلاتێن یەکگرتیێن ئەمریکا ددانیاسین، بەلێ ڤی سەروبەرێ ترازیدی گەلەك نە ڤەکێشا. سەرکردایەتیا کوردی بریار دا قەبێ کەتوارێ پشتی نسکۆیێ بخوازیت[٤]. دەملدەست د دو وارێن لەشکەری و سیاسیدا دەست ب بەرهەڤییان کر. ل سەر ئاستێ سیاسی دەست ب سەر ژنوو ئاڤاکرنا رێکخستنێن پارتی کر و د ئەنجامدا ل ١٠ کانوونا ئێکێ ١٩٧٥ێ (سەرکردایەتیا کاتی یا پارتی) دامەزراند، د وارێ لەشکەریدا ژی دەسپێکرنا شۆرشا گولانێ ل ٢٦ گولانا ١٩٧٦ێ بەرسڤەکا توندا وی کەتوارێ بوو[٥].

هندی پەیوەندی ب کارڤەدانێن روودانێن پشتی پێکهاتنا ٦ئادارا ١٩٧٥ێ و یێن بەری بریارا شەر راوەستاندنێ ل ٢٠ ئادارا ١٩٧٥ێ ڤە هەی، سەرکردایەتیا کوردی د وێ باوەرێدا بوو کو ب هەر رەنگەکێ هەبیت پێدڤییە بەردەوامی ب شۆرشێ بێتەدان یان رەنگە بەرخودانەك ب شێوازێ شەرێ پارتیزانی ل کوردستانێ بەردەوام بیت و کار بۆ دامەزراندنا چەند بنکەهەکێن سەرکردایەتیا بەرخودانی و سەرژنوو دابەشکرنا بەرۆکێن بەرخودانێ ل کوردستانێ کرن و ل رۆژا ١٢ ئادارێ برووسکەك بۆ وەلاتێن یەکگرتیێن ئەمریکی هنارت و ژێ خواست مایتێکرنێ بکەت و فشارێ بێخیتە سەر ئیرانێ دا کو هاریکاریا لەشکەری دگەل عیراقێ نەکەت، د هەمان دەمدا بزاڤکرن داکو دەرگەهەکێ دانوستاندنێ دگەل حکومەتا عیراقێ ڤەکەن و رەنگە پێکهاتنەکێ بکەن[٦]. د هەمان دەمدا د ناڤبەرا ٦ ئادارێ هەتا رۆژا شەر راوەستاندنێ ل ١٣ ئادارێ پێشمەرگەی ب باوەرییەکا موکمڤە ل بەرۆکێن شەری ب تایبەت بەرۆکێن دەڤەرێن رەواندز و بالەکایەتی بەرخوەدانەکا مەزن بەرامبەری هێرشێن سوپا و جاشێن عیراقێ دیارکر و گەلەك ژ وانا هەست ب وێ چەندێ کر کو ئەو پشتیێ گرانێ ژ ئەنجامێ پەیوەندیا شۆرشێ دگەل حکومەتا شاهێ ئیرانێ نەما و دڤێت ژ نها پاش پشتگەرمێن خۆ و شیانێن خۆ بن، بەلێ د چەند رۆژەکاندا ئەڤ هیڤیێن بەرخۆدانێ ژ ناڤچوون پشتی کو شاهێ ئیرانێ نوونەرێ خۆ هنارتییە جەم بارزانی و ب بەرفرەهی ئەو ل هەموو بەند و بریارێن پێکهاتنێ ئاگادار کری و پشتی کو بارزانی ژی گەهشتییە وێ باوەریێ کو بەرخۆدان دێ زیانێن مەزن دووڤ خۆڤە ئینیت و زیانێن وێ دێ چەند جارکی پتر بن ژ مفایێن وێ، لەوما چ رێك ل بەر سەرکردایەتیا پارتی نەمان ژ بلی هندێ کو بریارا راوەستاندنا شۆرشا چەکداری بدەن[٧].

هندی پەیوەندی ب خەلکێ پارێزگەها دهۆکێ یا نها ب تایبەت پێشمەرگێن خەلکێ دەڤەرێڤە هەی، زێدەباری بەرۆکێن شەری ل دەڤەرا بەهدینان پێشمەرگێن دەڤەرێ ل هەموو بەرۆکێن دێ یێن بەرخوەدانێ د بەلاڤەبوون، بریارا راوەستاندنا شۆرشێ مینا فرەکا ژەهرێ بوو و هەموویان د ڤێ سەربەرێ دژواردا تامکریێ و هەموو کەتنە د سەروبەرەکێ دەروونیێ دژواردا[٨]. د ئەنجامێ بریارا راوەستاندنا شۆرشێدا ئالۆزی و نیگەرانی و خەمباری و بێ باوەریێ خۆ ب سەر ئۆردوگایێن پەنابەرێن کورد ل ئیرانێ دا گرت، هندەکان بۆ خۆ ڤەمان ل ئۆردوگایێن پەنابەریێ ل ئیرانێ هەلبژارت، هندەکان بریارا ڤەگەریانێ بۆ عیراقێ دا، هندەکێن دی بریاردان بۆ خۆ ل دەلیڤەکێ بگەرن و بەرەف دەرڤەی ئیرانێ بچن و بۆ خۆ داخوازا پەنابەریا سیاسی بکەن، ئەڤ هەموو روودانە ل نیڤا دووێ ل مەها ئادارێ بوون[٩]، هندیکە سەروبەرێ دەڤەرێن کوردی یێن ژێر دەسەلاتێ شۆرشێ ل ناڤ عیراقێ یە ب تایبەت ژی ل دەڤەرێن نها سەر ب

پارێزگەها دهۆکێ ڤە، سەروبەرەك تراژیدێ بوو برای برایێ خۆ و هەڤالی هەڤالێ خۆ ماچیدکر و خاترا خۆ ژێ دخواست، هندەکان بەرەف پەنابەرییێ ل ئۆردوگایێن پەنابەران ل ئیرانێ ددا رێ، هندەکان ژی بریار دا خۆ رادەستی هێزێن لەشکەرێ عیراقێ بکەن و پاشەرۆژەکا نە دیار بۆ خۆ هەلبژارت[١٠]. هەژییە بێتەگۆتن گەلەك ژ خێزانێن پێشمەرگەیان و خەلکێ دیتر یێن بۆ خۆ پەنابەری هەلبژارتی و بریار دای بەرەف ئیرانێ بدەنە رێ ژ ئەنجامێ دووراتییا ناڤبەرا دەڤەرا بەهدینان و سنوورێ ئیرانێ و سەقایێ دژوارێ وان رۆژان کو بەفرێ هەموو دەڤەر نخافتبوو و سەختییا رێکێ و نەبوونا ترومبێلان و چوونا ب پییان بەرەف سێکوشا سنووری (سێکوشا ناڤبەرا عیراق- ئیران- ترکیا) و کێمییا خوارن و ڤەخوارنێ زێدەباری نەساخ و برینداران و هژمارا زۆرا ژن و زارۆکان، گەلەك ژ وان ب رێڤە مرن و هەر ب رێڤە ژی هاتنەڤەشارتن، نەوەبیت دەمێ گەهشتینە ئیرانێ تەنا ببن بەلکی ل وێرێ ژی د کاودانەك سەخت و دژواردا دژیان و دەسەلاتدارێن ئیرانێ ب هەموو رەنگان بەرێێن وان تەنگدکرن و سەرەدرییەکا دژوار دگەل وان دکر، لەوما ژی هژمارەکا نەکێما وان جارەکا دی بریار دا بزڤرنەڤە دهۆکێ[١١].

هندیکە خەلکێ پارێزگەها دهۆکێ یە ئەوێن بریاردای بمیننە ل سەر گوند و باژێرێن خۆ و رازینەبووین بچنە دەولەتەکا دی، وانا دگەل چەکێ خۆ ل نێزیکترین خالا لەشکەرێ عیراقێ خۆ رادەستی هێزێن حکۆمەتا عیراقێ کر، ل هندەك جهان ژی گۆژمەکێ پارەی بەرامبەری وی چەکی وەردگرت یێ رادەست کری، بەلێ ڤان دیمەنێن تراژیدی کارگەرییەك دەروونییا نەخۆش ل سەر هەستا خەلکی دکر دەمێ ئەو پێشمەرگەیە د دیتن یێن هەتا بەری چەند رۆژەك هەتا گەلیێ دهۆکێ ل ژێر کۆنترۆلا وان بوو ئەڤرۆ مەفرەزێن وان هەر ل گەلیێ دهۆکێ خۆ ب چەکڤە رادەستی حکۆمەتێ دکەن و پاشتر ل ترومبێلێن زیلێن لەشکەری دهێنە سوارکرن و ڤەگوهاستن[١٢].

پشتی کو دەسەلاتدارێن عیراقێ بریارا لێبۆرینا گشتی بۆ هەموو کوردان راگەهاندی کو مەرەما وێ ئەو کوردە بوون یێن بووینە پێشمەرگە و گەهشتینە رێزێن شۆرشی و یێن ئەو ب خۆ ل دەڤەرێن ژێردەسەلاتێ شۆرشێ دژیان، هژمارەکا دی ژ خەلکی ژ ئیرانێ و دەڤەرێن دی زڤرینەڤە ناڤ مالێن خۆ ل عیراقی و ب کریار کاریگەریا شۆرشێ و پێشمەرگەی نەمایە ل سەر گۆرەپانا باشوورێ کوردستانێ و گۆرەپان بۆ حزبا بەعسا حوکمدار ڤالا بوو، حزبا بەعس ئەڤ چەندە و لاوازییا سەروبەرێ سیاسیێ خەلکێ ب دەلیڤە دیت و ل سەرانسەری کوردستانێ و پارێزگەها دهۆکێ ژی پشکەك بوو ژێ، دەست ب هەوەکا بەرفرەها ب بەعسیکرنا خەلکێ کر، ڤێ هەوێ پتر ژ وان کەسان گرت یێن ژ ناڤ شۆرشێ زڤرینەڤە وی دەمی ب زڤری بۆ رێزا نیشتمانی (عائدون الی الصف الوطني) دهاتنەناڤکرن و ناچارکرن هەموو بچنە د رێزێن حزبا بەعسدا و فۆرمێن ب بەعسیبوونێ ئیمزا بکەن[١٣].

هەر د ڤی دەمیدا سازیێن سەر ب حزبا بەعس دەست ب شەرەکێ دەروونیێ مەزن بەرامبەری کوردان کر، پرۆپاگندەکا دژوار و ب هێز دژی کەسایەتییا مەلامستەفایێ بارزانی دکر کو ئەنجامدا هێدی هێدی رەنگە بێ هیڤیبوونەکا مەزن ل جەم خەلکێ دروستدبوو، رۆژانە بەعسییان و داردەستێن وان زێدەگاڤی دکرنە سەر کەسایەتی و سەروەرییا وان جوین و تەخێن جودایێن خەلکێ کوردستانێ[١٤]. هەروەسان بەعسییان زرتەك و سیخور و ئالیگرێن خۆ ل مالێن خەلکی نیشتەجێکرن[١٥]، د هەمان دەمدا دەست ب هەوەکا بەرفرەها مشەختکرنا خێزان و مالباتێن کوردان بۆ ژێرێ عیراقێ و گرتن و سێدارەدانا هژمارەکا مەزن ژ کوردان کرن[١٦]، هەروەسان بەردەوام وەك شەرەکێ دەروونی بەرامبەری کوردان ئاهەنگێن (وەك وان ب سەرکەتنێ ل سەر شۆرشا کوردان ناڤدکرن) دگێران وەك وان بۆ خۆ هزر دکر کو دۆزا کوردی بۆ هەتا هەتایێ ب داویهات[١٧].

نها ب کورتی دێ ئاماژە کەینە سەربەرێ پارێزگەها دهۆکێ ب سنوورێ وێ یا نهاڤە د هەموو وارانداد ڤێ قۆناغێدا کو ڤەکۆلینا مە ژێ دگریت:

سەروبەرێ کارگێڕیێ پارێزگەهێ د وێ قۆناغێدا پارێزگەها دهۆکێ ژ قەزا و ناحیێن ژێری پێکدهات:

**ئێك-** قەزا دهۆکێ: (رووبەرێ وێ ٩٨١کم٢ بوو)، ژ ناحیێن: دۆسکی (مانگێش) رووبەرێ وێ (٤٥٤کم٢) بوو، ناحیا زاویتە رووبەرێ وێ ٤٢٠کم٢ بوو پێکدهات.

**دو-** قەزا زاخۆ: (رووبەرێ وێ ١٠٣٤کم٢) بوو، ژ ناحیێن سندی (دەرکار) رووبەرێ وێ (٥٣١کم٢) و ناحیا گولی (باتوفا) رووبەرێ وێ (٢٠٨کم٢) و ناحیا رزگاری (ئیبراهیم خەلیل) رووبەرێ وێ (٢٩٥کم٢)بوو پێکدهات.

**سێ-** قەزا ئامێدیێ: (رووبەرێ وێ ٢٧٠٧کم٢ بوو) و ژ ناحیێن: سەرسنکێ رووبەرێ وێ (٩١٩کم٢)، ناحیا نێروە رێکان (بێبۆ، پاشتر دێرەلۆکێ) رووبەرێ وێ (١٠٠٧کم٢)، ناحیا بەرواری (کانی ماسێ) رووبەرێ وێ ٦٠٨کم٢ بوو پێکدهات[١٨].

هندیکە قەزا ئاکرێ یە ل دووڤ قانوونا دامەزراندنا پارێزگەها دهۆکێ سەر ب ڤێ پارێزگەهێ ڤە بوو، بەلێ حکۆمەت ب جێبەجێکرنا ڤێ قانوونێ رازی نەبوو و ما گرێدایی دگەل سنوورێ کارگێڕیێ پارێزگەها مووسلێ، بەلێ قەزا شێخان ب خۆ وەك کارگێری سەر ب پارێزگەها مووسلێ بوو[١٩].

د قۆناغا ئەڤ ڤەکۆلینە ژێ دگریت ئانکو د ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٩١یدا چەندین گۆرانکاری د سنوورێن کارگێڕیێن پارێزگەهێدا هاتنەکرن، ژ وانا ڤەقەتاندنا ناحیا مزووری (ئەترووش) و ژ پارێزگەها دهۆکێ و گرێدانا وێ دگەل قەزا شێخان یا سەر ب پارێزگەها مووسلێ ڤە ل ٨ ئادارا ١٩٧٦ێ و دامەزراندنا قەزایەکا نوو ل پارێزگەها دهۆکێ ب ناڤێ قەزا سێمێلێ و هەردو ناحیەیێن سلێڤانەیی (ئاسهێ) و سەنتەرێ سێمێلێ ل رۆژا ٢٥ تیرمەها ١٩٧٨ێ دگەل هاتنەگرێدان، پاشتر هەلوەشاندنا ناحیا بەرواری (کانی ماسێ) و گرێدانا کەرتێن سەر ب وێ ڤە دگەل سەنتەرێ قەزا ئامێدیێ، هەروەسان هەلوەشاندنا ناحیا رزگاری و گرێدانا کەرتێن سەر ب وێ ڤە دگەل سەنتەرێ قەزا زاخۆ ل٢٦ تەباخا ١٩٨٧ێ[٢٠].



دهۆکا کەڤن

ل دووڤ سیستەمێ کارگێریێ وی سەردەمی پارێزگار کەسێ ئێکێ بوو ل پارێزگەهێ، هەموو رێڤەبەری و فەرمانگەهـ و پشکێن وان بەرپرس بوون بەرامبەری پارێزگاری، ئەو ژی ل دووڤ یاسا پارێزگەهێن عیراقێ بەرپرسێ راستەخۆیێ پاراستنا تەناهی و دامودەزگەهێن کارگێری بوو[21]، بەلێ ب کریار کۆنترۆلا پرانییا رێڤەبەری و فەرمانگەها د دەستێن بەرپرسێن سیاسیێن حکومەتێدا بوو کو د وی دەمیدا بەرپرسێن حزبا بەعسا حوکمدار بوون ب رێکا سازیێن حزبی وان سەرپەرشتیا هەرکارەکێ رێڤەبەری و فەرمانگەهان دکر، و مەزنترین سەرۆکێن سازیێن کارگێری وەك پارێزگار و قائیمەقام و رێڤەبەرێن ناحیان تاگرێن راستەقینەیێن سیاسەتا حکۆمەتێ بوون[22].

پارێزگەهـ ب خۆ ژ دو پشکێن سەرەکێ پێکدهات، فەرمانگەها کارگێریا خۆجهی و فەرمانگەها کارگێریا گشتی، ئەرکێن کارگێریا گشتی ل دووڤ مادێ هەشتێ و شەش ژ یاسا پارێزگەهان هژمار ١٥٩ سالا ١٩٦٩ێ یێ هەموارکری ئەو بوو کو جڤاتا پارێزگەهێ (کارگێریا خۆجهی) تایبەتمەند بوو ب گەلەك کار و خزمەتگوزاریێن خۆجهی[23] کو گرنگترینێن وان: دامەزراندن و ئاڤاکرنا هەموو پرۆژەیان بوو ل پارێزگەهێ، چ ئەوێن بۆدجا وان سەر ب کارگێریا خۆجهی، چ ئەوێن بۆدجا وان د چوارچوڤی بۆدجا پێنج سالیدا وەك ئاڤاکرنا خواندنگەهـ و نەخۆشخانە و بنگەهێن (مەخفەرێن) پۆلیسان و راکێشانا رێکێن گوندان و چێکرنا قەنتەران و پرۆژەیێن ئاڤێ و کارەبێ و سۆلینان و کارگەهان[24]، هندیکە کارگێریا گشتی بوو بەرپرس ژ رێڤەبرنا هەموو قەزا و ناحیێن سەر ب پارێزگەهێڤە[25].

ژ مۆرکرنا پێکهاتنا جەزائیرێ ل ئادارا ١٩٧٥ هەتا سەرهلدانا بهارا ١٩٩١ێ ڤان کەسان ئەرکێ پارێزگاریا دهۆکێ گرتیبەدەست:-

١- محەمەد عەلی ئەمین گوران ١٩٧٤- ١٩٧٦

٢- یەحیا محەمەد رەشید جاف ١٩٧٦- ١٩٧٩

٣- نامیق رەقیب سۆرچی ١٩٧٩- ١٩٨٨

٤- محەمەد پیرۆز روستەم ١٩٨٨- ١٩٩١[26].

## بزاڤا ئاڤاکرنێ و جێبەجێکرنا پرۆژەیان:

د قۆناغا ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٩١یدا چەند پرۆژە د وارێن جوداجودا دا ل پارێزگەهێ هاتنە بجهئینان کو هاریکاربوون د پێشڤەبرنا پارێزگەهێ و بهێزکرنا ژێرخانا وێ کو گرنگترینێن وان یێن ژێری بوون:

### ١- جادە و رێکێن گەهاندنێ:

جادە و رێکێن گەهاندنێ شادەمارێ ژیانێ و ژ ئالیەکیڤە گرێکا ڤێکراگەهاندنا مەلبەندێن باژێران و جهێن بەرهەمئینانێ نە، چ بەرهەمێن چاندنێ یان پیشەسازی و کانزایان بن، ژ ئالیێ دیڤە گرێکا ڤێکرا گەهاندنا ناڤبەرا جهێن ئاکنجیبوون و خرڤەبوونا خەلکی و مەلبەندێن مەزاختن و خەرجکرنا کەرەستەیانن، ب ڤێ چەندێ جادە و رێك رۆلێ سەرەکی و گرنگ د کریارا گەشەپێدا ئابووری و جڤاکی و رەوشەنبیری و ساخلەمی و پەروەردەییدا دگێرن.

پشتی کو ل ١ ئەیلوولا ١٩٧٦ێ رێڤەبەریا رێکێن پارێزگەها دهۆکێ (مديرية طرق محافظة دهوك) ژ رێڤەبەریا کارێن دهۆکێ (مديرية أشغال دهوك) جودا بووی شیا پشتی سەر ژنوو دامەزراندنا خۆ تۆرەکا بەرفرەها رێکان د ناڤبەرا جهێن جوداێن پارێزگەهێ ڤەکەت کو دەڤەرێن ژێکجودا پێکڤە گرێدەت و گۆژمێن دراڤیێن مەزن ژی بۆ ڤان پرۆژان هاتنەتەرخانکرن، د هەمان دەمدا ژی پشتەڤانیێن تەکنیکی و هونەریێن باش لێ هاتنەکرن کو ئەو ب خۆ بشێت خۆ پێشڤەببەت، ب ڤی رەنگی درێژیا جادە و رێکێن د ڤێ قۆناغێدا هاتینەڤەکرن گەهشتە ب سەدان کیلۆمەتران[27]، هەژیە بێتەگۆتن د ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٩١یدا ب درێژیا سەدان کیلۆمەتران جادە

و رێك هاتنەكێشان وەك یێن ژێری كو درێژیێن وان دگەلدا هاتینەدیاركرن:

| | |
|---|---|
| دهۆك- زاخۆ | ب درێژیا ٥٠كم |
| زاخۆ- ئیبراهیم خەلیل | ب درێژیا ١١كم |
| ئالۆكا- فەیدیێ- بەدریكێ | ب درێژیا ٢٥كم |
| دوریانا گرشین- دێرەبوون- پرا سحێلا | ب درێژیا ٣٠كم |
| سێمێلێ- سێجێ | ب درێژیا ١٠كم |
| حەسەن ئاڤا- ئەرمشت- ئۆزمانا- مانگێشكێ | ب درێژیا ٣٨كم |
| زاخۆ- باتۆڤا- زریزە - كانی ماسێ | ب درێژیا ٧٥كم |
| هێزاوا- دەركار- شەرانش | ب درێژیا ٢٠كم |
| كانی ماسێ- شمایلا- تروانش- پرا (جسرێ) بالۆكا | ب درێژیا ٣٠كم |
| شرتێ- داودیێ- بەندا- مانگێشك | ب درێژیا ١٨كم |
| بامەرنێ- ئەرەدنا- ئینشكێ- قەدش | ب درێژیا ١١كم |
| پرا بالندا- ئاڤا مارك-چەم جی-دوكەری | ب درێژیا ٤٥كم |
| دهۆك- زاویتە- سوارەتۆكا- ئامێدیێ | ب درێژیا ٦٨كم |
| دوریانا زاویتە- كۆرێت گاڤانا- بێنارینكێ- بێدویل | ب درێژیا ٤٥كم |
| دوریانا ئەترۆش- نسرا- رەتكێ- هەسنەكا- شلیا- سەرێ كانیكا | ب درێژیا ٧٠كم |
| دوریانا ئەترۆش- لالش- شێخان | ب درێژیا ١٥كم |
| سێمێل- موسێریك | ب درێژیا ٨كم |
| شێڤ شرین- نوران | ب درێژیا ١٧كم |
| كۆرێت گاڤانا- رەشانكێ- مانگێشك | ب درێژیا ٢٧كم |
| بەدریك- باعەدرێ | ب درێژیا ٢٨كم |
| باتۆڤا- هەمزا- دوكەرێ | ب درێژیا ٣٠كم |
| باتێلێ- خراب دێم | ب درێژیا ١١كم |
| سێمێلێ- خانكێ | ب درێژیا ٨كم |

هەروەسان د ڤێ قۆناغێدا ٢٥ پرێن ئاسنی و كونكرێتی ل سنوورێ پارێزگەهێ هاتنەچێكرن[٢٨].

ل بەربوو تۆرا هاتنوچوونێ ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ هێژ بێتەبەرفرەهكرن، بەلێ روودانا شەرێ ناڤبەرا عیراقێ- ئیرانێ سالێن ١٩٨٠- ١٩٨٨ێ كاریگەرییەكا نەرێنی كرە سەر پرۆژێن رێك و پران و بەرێ پرانیا ئامیر و ماشین و كارمەندێن رێك و پران دا كارێن ئەندازیاری و پشتەڤانیا هێزێن لەشكەرێ عیراقێ ل بەرۆكێن شەری[٢٩].

### ٢- ساخلەمی و نەخۆشخانە:

هندیكە ئالیێ ساخلەمیێ و خزمەتگوزاریێن نۆشدارییە د ڤێ قۆناغێدا نەخۆشخانا كۆماری ل دهۆكێ هەبوو و هەتا سالا ١٩٨٦ێ ئەو مەزنترین نەخۆشخانا پارێزگەها دهۆكێ بوو، هندەك پشكێن چارەكرنێ و هندەكێن خۆپاراستنێ لێ هاتنەڤەكرن، هەروەسان كلینیكا دەرڤە یێ ڤێ نەخۆشخانەیێ ژێ پێكهاتبوو ژ پشكێن: هناڤان (الباطنية)، ژن و زارۆكبوونێ، دفن و گوهـ و گەوریێ، چارەسەریا سرۆشتی، ددانان، شكەستنان و دەرمانخانەیان. ڤان پشكان دەمێ پێدڤی دكر وان نەخۆش رەوانە دكرە نەخۆشخانی و دنڤاند و چارەسەریێن پێدڤی ژ ئالیێ نۆشدارێن تایبەتمەندڤە بۆ دكرن. د هەمان دەمدا سازیێن ساخلەمیێ ل قەزا و ناحیان و كۆمەلگەهان و گوندان هەبوون كو وان ئەركێ پاراستنا ساخلەمیا وەلاتیيان ب خۆڤە دگرت[٣٠].

مەزنترین پرۆژە د وارێ ساخلەمیێدا ل سنوورێ پارێزگەها دهۆكێ هاتییەئەنجامدان ئاڤاكرنا نەخۆشخانا گشتی (نها نەخۆشخانا ئازادی) بوو ل دهۆكێ كو نووترین دیزاینێن نەخۆشخانا بوو، ئەڤ پرۆژەیە د چوارچوڤێ پلانەكا گشتیدا بوو و چواردە نەخۆشخانێن ب وی رەنگی هەریەك ل پارێزگەهەكێ ب خۆڤە دگرتن. كۆمپانیێن (هیتاچی و ماروبینی) یێن ژاپۆنی ب ئەركێ ئاڤاكرنا نەخۆشخانێ و دابینكرنا كەرەستە و ناڤمالی و ئامیرێن پێدڤی رابیوو، هیتاچی ب كارێ ئاڤاكرنێ و ماروبینی ب كارێ

دابینکرنا پێدڤییا رابوو[٣١].

د سالێن بەراهیێ یێن شەرێ عیراقێ- ئیرانێ ١٩٨٠- ١٩٨٨یێدا ئەڤ پرۆژەیە هاتەئەنجامدان، ل سالا ١٩٨٢ێ دەست ب کاری هاتەکرن و ل ١٣ کانوونا ئێکێ ١٩٨٥ێ نەخۆشخانە ب فەرمی ژ ئالیێ وەزیرێ ساخلەمیا عیراقێ ڤە هاتەڤەکرن، ١٨ ملیون دینارێن عیراقی یێن وی سەردەمی لێ هاتبوونە مەزاختن و بهایێ ئامیر و ناڤمالییان ٣,٥٠٠٠٠٠ دینار بوون[٣٢]، نەخۆشخانە ل سەر رووبەرێ ٢٨,٠٠٠م٢ چوارگوشە د هەشت قاتاندا (بنبویڤ، قاتێ عەردی و شەش قاتان) هاتبوو ئاڤاکرن، حکۆمەتێ د وێ قۆناغێدا ب نەخۆشخانا سەدام حسێنی ناڤکربوو و پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ ب نەخۆشخانا ئازادی هاتیەناڤکرن[٣٣]، سەخبێریا نەخۆشخانێ ئەرکێ هەردو کومپانیێن ژاپونی بوو هەتا سالا ١٩٩١ێ، بەلێ هەردو کومپانییان ژ ئەنجامێ شەرێ دووێ یێ کەنداڤێ و داگیرکرنا دەولەتا کوێتێ ئەرکێ سەخبێریێ هێلا[٣٤].

سەرۆکاتیا ساخلەمیا دهۆکێ زێدەباری ڤێ نەخۆشخانەیێ چەندین خزمەتگوزارێن ساخلەمیێ و خۆپاراستنێ کو پێکهاتبوون ژ ئاڤاکرن و دابینکرنا نەخۆشخانە و بنکەهێن ساخلەمیێ و لقێن وان ل قەزا و ناحیە و کۆمەلگەهان، ب رەنگەکی هژمارا سەنتەرێن ساخلەمیێ گەهشتە چوار نەخۆشخانەیان و دەهـ بنکەهێن ساخلەمیێ یێن سەرەکی و سێزدە بنکەهێن لاوەکی (فرعي) و سێ بنکەهێن چاڤدێریا دایك و زارۆکان و ئەزموونگەهەکا مەلبەندی و ئامادەییا برینپێچیێ و خواندنگەها برینپێچێن کچ دگەل پێکئینانا تیمێن ساخلەمیێ یێن گەرۆك[٣٥].

## ٣- ئاڤاکرنا سکران:

هندی پەیوەندی ب ئاڤاکرنا سکران ل پارێزگەها دهۆکێ هەی، مەزنترین پرۆژەیێ د ڤی واریدا هاتیەئەنجامدان پرۆژەیێ سکرێ دهۆکێ بوو ل گەلیێ دهۆکێ ل سەر رووبارێ دهۆکی ل جهێ ڤێکگەهشتنا هەردو رووبارکێن سندووری و گەرماڤا زێدەباری ئاڤا ل کانیێن کبرێتێ ب درێژیا دەمێن سالێ دزێت، ب ڤی سەروبەرێ رووبەرێ حەوزێ گەهشتە نێزیکە ١٣٣,٨کم٢، کومپانیا ئەکرۆکومپلکت یا بولگاری ب ئەرکێ ڤەکۆلینا جهێ سکری و هەلبژارتنا جۆرێ سکری و سازیێن وی هاتەراسپاردن، پشتی تەواوبوون و بەرهەڤکرنا ڤەکۆلینێ دیزاینێ سکری و سازیێن گرێدای دگەلدا و پرۆژێ ئاڤدانێ ژ ئالیێ هەمان کومپانیا بولغاری، بجهئینانا ئاڤاکرنا پرۆژەیێ سکری و پرۆژەیێ ئاڤدانێ دانە دەست کومپانیا (الأعمال و الخدمات الهندسية العالمية) کو بارەگایێ وێ ل میرگەها دوبەی بوو و کادرێن تەکنیکیێن وێ ژ رەگەزنامەیێن جودا جودا بوون بەلێ پرانیا وان وەلاتیێن پاکستان و چینێ بوون[٣٦].

ل سالا ١٩٨٠ێ دەست ب چێکرنا سکری هاتەکرن، مەرەما سەرەکی ژ سکری کۆمکرنا ئاڤا بەفر و بارانێن زڤستان و بهارێ بوو و بەردانا وێ ئاڤێ بوو ب رەنگەکێ رێکخستی بۆ ئاڤدانا (١١) هزار دونمان ل دەشتا مالتایێ و سێمیلێ ب نووترین شێواز و سیستەمێن ئاڤدانێ ل رۆژهەلاتێ ناڤین، هەروەسان مەرەم پێ خودانکرنا جۆرێن ماسییان، ئاڤاکرنا گوندەکێ گەشت و گوزاری، دابینکرنا جۆرێن جودایێن فێقی ب درێژیا سالێ، خودانکرنا مێشا هنگڤینێ و گیانەوەرێن دیتر و ب کارئێخستنا خەلکەکێ زۆر و چەندین مفایێن دیتر[٣٧].

پرۆژە ژ دو بەشێن سەرەکی پێکدهات: بەدەنێ سکری و جووا سەرەکییا ئاڤدانێ، سکر دکەڤیتە پشت بازێرێ دهۆکێ ژ ئالیێ باکوورێ رۆژهەلاتڤە ب دووراتییا دو کیلومەتران، هندی جووا ئاڤێ یە ب درێژیا (١٣,٥کم)انە، (٢,٤کم) ژێ تونێلەکە دناڤ چیایێ سپی دا و ب تیرەیا چوار مەتران ب مەرەما ڤەگوهاستنا ئاڤێ بۆ دەشتا سێمێلی و ئاڤدانا عەردێن وێ دەڤەرێ هاتییەراکێشان[٣٨]، هەژییە بێتەگۆتن نها ژ بەر نەمانا پێدڤیاتییێ ب وێ جووێ ئەو نەمایە و درێژیا جووێ بووینە باخچە و گولخانە. جۆرێ سکرێ دهۆکێ ژ جۆرێ داگرتییێ ئاخێ یە (إملائي

ترابي)، بلنديیا وی (٦٠,٥)م و درێژیيا وی (٦١٣,٤٣)م و پانییا كومتێ سكرى (٦١٩,٧٣)م، بلندترين ئاستێ ئاڤ بكەهيتێ (٦١٨,٨٥)م و ئاستێ ئاسايیێ ئاڤێ (٦١٥,٧٥م) مەتره ل سەر ئاستێ دەریای، هندیكه درێژییا حەوزا سكریيه (٤٠٠٠)م و پانییا وێ (١٧٠٠)م و قەبارێ وێ (٥٢) مليون م٣ يه. ل سالا ١٩٨٨ێ كار د چێكرنا سكریدا ب داویهات[٣٩] و گۆژمێ دەهـ مليون دينارێن عيراقى لێ هاتنه مەزاختن[٤٠].

هەر د ڤێ ناڤبەرا ڤەكۆلين ژێ دگريت چەند سكرەكێن ديتر يێن بچووكتر هاتنەئاڤاكرن كو حكۆمەتێ مەرەمێن تايبەت پێ هەبوون، ژ وانا سكرێ ئينشكێ كو ژ ئاليێ مالباتا حوكمدارا عيراقێ بۆ كەيف و سەيرانێن وان هاتبوو چێكرن و سكرێ ئاشاوا كو ئەو ژى سكرەكێ بچووكه و بۆ هەمان مەرەم هاتبوو چێكرن[٤١].

**٤- دامەزراندنا كارگەهان:**

هندى پەيوەندى ب كارگەهانڤه هەی كارگەها داگرتنا بەرهەمێن فێقى مەزنترين كارگەهـ بوو د وێ قۆناغێ و درێژییا سەردەمێن بەرى وێ دا ل پارێزگەها دهۆكێ هاتيیەدانان، ل١٧ تەباخا ١٩٧٧ێ هاتەڤەكرن و گۆژمێ (٢,٥٠٠٠٠٠) دينارێن عيراقێ يێن وى سەردەمى لێ هاتنەمەزاختن، ژ ئاليێ سازيیا گشتيیا ديزاين و ئاڤاكرنا پيشەسازى (المؤسسة العامة للتصميم و الإنشاء الصناعي)ڤە هاتبوو بجهێينان، شەش پشكێن بەرهەمئينانێ ب خۆڤە دگرت كو دو ژوانا تايبەت بوون ب بەرهەمێ ئاڤكا تەماتێ (مەعجوينێ تەماتێ) و شيانێن بەرهەم ئينانا ٤٥٠ تەنان د رۆژێدا هەبوون، هەروەسان چوار پشكێن دى يێن بەرهەمئينانا كەمبود و فيقيێ داگرتى و ريچۆل (مورەبا) و شەربەتا فێقى هەبوون[٤٢]. هەژيیه بێژين ئەڤ كارگەهه ژ ئاليێ كارگێريڤه سەر ب سازيیا گشتيیا داگرتنێ (المؤسسة العامة للتعليب) ل پارێزگەها كەربەلا بوو و ژ دەرڤەی دەسەلاتێ كارگێريیا پارێزگەها دهۆكێ بوو[٤٣].

هەروەسان هندەك كارگەهێن دى يێن مەزن ل پارێزگەها دهۆكێ هاتنەدانان وەك كارگەها گێچ و رەملێ ل ٧ نيسانا ١٩٧٦ێ هاتبوو ڤەكرن و ٢٥ هزار دينارێن عيراقى لێ هاتبوونه مەزاختن دكەته قەزا سێمێلێ و شيانێن بەرهەمئينانا ١٠٠م٣ يێن حەصو رەملێ د رۆژێدا هەبوون، هەروەسان كارگەها بلۆكان ل ٧ نيسانا ١٩٧٧ێ هاتبوو ڤەكرن و (٦٦,٥) هزار دينار لێ هاتبوونه مەزاختن و شيانێن بەرهەمئينانا (٤١٠٠) بلۆكان د رۆژێدا هەبوون، هەروەسان كارگەها تەكنيكيیا يا بەرهەمێ گێچێ ل فەيديێ- قەزا سێمێلێ ل ٧ نيسانا ١٩٧٨ێ هاتبووڤەكرن و (٤١٠) هزار دينارێن عيراقى لێ هاتبوونه مەزاختن و دووەمين مەزنه كارگەهه بوو ژ جۆرێ خۆ ل عيراقێ و رۆژانه (١٠٠) تەنێن گێچێ بەرهەمدئينان، زێدەبارى كارگەها كاشى ب بهایێ (١٥٠) هزار ديناران هاتبوو ئاڤاكرن و گرێبەستا وێ بۆ كومپانيیەكا ئيتالى كەتبوو و رۆژانه شيانێن بەرهەمئينانا دەه هزار پارچێن كاشى ژ قەبارەيێن جودا جودا هەبوون[٤٤]. هەر د وێ قۆناغێدا و ل سالا ١٩٧٨ێ پرۆژەكێ مەزنێ خودانكرنا مريشكان و بەرهەمئينانا هێكان و دگەل كارگەهێن سەربرينا مريشكان ل سێمێلێ هاتنەڤەكرن، زێدەبارى چەند كارگەهێن ديتر وەك كارگەها رستن و تەڤنكارى، كارگەها فەرشێن دەستى، كارگەها دارتاشيێ، ئاشێ مەزنێ ئوتوماتكيێ ئارى، فرنا ئوتوماتيكيیا سەمۆنان، كارگەها بەرهەمئينانا گازێ ئوكسجينى و كارگەهێن ديتر[٤٥].

**٥- پرۆژەيێن ديتر:**

هەر د ڤێ قۆناغێدا چەندين پرۆژێن جۆرا و جۆر و د وارێن جودادا ل پارێزگەهێ هاتنەئەنجامدان، وەك نموونه دێ ئاماژه ب پرۆژێ ئاڤا ڤەخوارنێ يێ دهۆكێ كەين يێ ل سالا ١٩٨٥ێ هاتيیەئەنجامدان، كو مەزنترينێ وان پرۆژانه و (٩,٥) مليون دينارێن عيراقێ لێ هاتينەئەنجامدان و شيانێن پالدانا (٢٠٠٠)م٣ يێن ئاڤێ د دەمژمێرەكێدا هەبوون. هەروەسان پرۆژەيێ ئاڤا زاخۆ ب بهايێ (٣,٥) مليون ديناران هاتەئانجامدان و شيانێن پالدانا (١٠٠٠)م٣يێن ئاڤێ د دەمژمێرەكێدا

هەبوون، هەر ب ڤی رەنگی چەندین پرۆژەیێن دی یێن گەهاندنا ئاڤا ڤەخوارنێ بۆ گوند و باژێرێن پارێزگەهێ هاتنەئەنجامدان[٤٦]، و پرۆژەیێن دی یێن وارێ کارەبێ و چاندنێ و ئاڤدانێ و پەیوەندیێن تەلەفونان و گەشت و گوزرای و یێن دیتر هاتنەئەنجامدان.

**٦- پەروەردە و فێرکرن:**

سەرەرای هندێ کو رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ رێڤەبەریەکا نوو بوو (ل سالا ١٩٧٠ێ هاتبوو دامەزراندن) بەلێ شیا بەرەف پێش بچیت و دەسکەفتێن باش د وارێ پەروەردێدا دەستڤەبینیت. ل سالا خواندنێ ١٩٧٦- ١٩٧٧ێ قەرقودێ (ستراکچەرێ) کارگێریێ رێڤەبەریێ کو ژ هەشت پشکان پێکهاتبوو هاتەدانان، ئەو ژی پشکێن: کارگێری، خۆیەتی، ژمێرباری، پلاندانان، چالاکیێن خواندنگەهان، چالاکیێن هۆنەری و رێڤەبەریا ئەزموونان، رێڤەبەرێ پەروەردێ ژی سێ هاریکار هەبوون، ئەو ژی: هاریکار بۆ کاروبارێن کارگێری و خۆیەتی، هاریکارێ پلاندانانێ و هاریکار بۆ کاروبارێن خواندنگەهێن پیشەیی (ئامادەیێن چاندنێ و پیشەسازی و بازرگانی)[٤٧].

بەری سالا ١٩٨٢ێ رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ ژ ئالیێ سەرپەرشتیا خواندنگەهانڤە ل ژێر سەرپەرشتیا سەرپەرشتکارێن رێڤەبەریا پەروەردا هەولێرێ بوو، ئانکو سەرپەرشتکارێن هەولێرێ وان سەرپەرشتیا خواندنگەهێن دهۆکێ دکر، بەلێ ئەو سەروبەرە ل سالا ١٩٨٢ێ هاتەگۆهارتن و یەکەیا سەرپەرشتییێ یا پێکهاتی ژ (١١) سەرپەرشتان ژ تایبەتمەندیێن جودا ل رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ هاتەڤەکرن[٤٨]. هندیکە قەزایێن پارێزگەهێ (زاخۆ، ئامێدیێ و سێمێلێ بوون) وانا دەستەکێن سەرپەرشتیا سەرەتایی هەبوون و وان ژی سەرپەرشتیا فێرکرنا سەرەتایی ل وان دەڤەران دکر[٤٩].

ژ ئالیێ کارگێریڤە ل سالا ١٩٨٣ێ رێڤەبەریا پەروەردا دهۆکێ بوویە رێڤەبەریا گشتیا پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ[٥٠]. ژ کەسایەتیێن د ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٩١ێدا ئەرکێ رێڤەبەر و رێڤەبەرێ گشتی ل پەروەردا پارێزگەها دهۆکێ گرتییەدەست، ئەڤێن ژێرینە:

١- عەبدولسەمەد ئەحمەد عەلی ١٩٧٥/٢/٢٤-١٩٧٥/٣/٣١
٢- ئیبراهیم ئەلشەواف ١٩٧٥/٣/٣١-١٩٧٦/٣/٣ب وەکالەت
٣- محەمەد پیروز روستەم ١٩٧٦/٣/٣- ١٩٧٦/٤/١٠
٤- محەمەد شەریف ئەلخەیات ١٩٧٦/٤/١٠-١٩٧٧/٤/١٢ ب وەکالەت
٥- ئەنعام غائب مەحموود ١٩٧٧/٤/١٢- ١٩٧٨/١١/٤
٦- عادل یونس عەبو ١٩٧٨/١١/١٤ ١٩٨٢/٩/٩
٧- محەمەد سەعید عەبدولرەحمان ١٩٨٢/٩/٩-١٩٨٨/٤/٤
٨- حیسامەددین عەبدولا سادق ١٩٨٨/٨/٢٥- ١٩٩١/١٠/١[٥١].

هندی پەیوەندی ب کریارا فێرکرنێ ڤە ل پارێزگەها دهۆکێ هەی، پشتی پێکهاتنا جەزائیرێ ل ٦ ئادارا ١٩٧٥ێ هێدی هێدی هێرشا دەسەلاتدارێن حزبا بەعس بۆ سەر دەسکەفتێن گەلێ کورد دەسپێکر، ئەو دەسکەفتێن ژ ئەنجامێ پێکهاتنا ١١ ئادارا ١٩٧٠ێ دەستڤەهاتین و بەری هەر تشتەکی ژی دەست ب نەهێلانا دەسکەفتێن وارێ پەروەردە و فێرکرنێ هاتەکرن، ب یەکجاری بۆچوونا کوردان د وارێ فێرکرنا زارۆکێن واندا هاتەپشتگوهڤە هاڤێتن، هەرتشتەکێ پەیوەندی ب دیرۆکا کوردستانێ و رەوشەنبیریا کوردیڤە هەی ژ بەرنامێن خواندنێ هاتنەلادان، هەتا پەیڤا کوردستان ژ ناڤ بەرپەرێن پەرتووک و رۆژنامەڤانی و ئەدەبیاتاندا هاتەدوورئێخستن[٥٢].

دەملەدەست پشتی شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆکێ کریارا فێرکرنێ کەتە د تەنگاڤیێدا، کێماتییەکا مەزن د میلاکێ خواندنگەهاندا دروست بوو، دەسەلاتداریا بەعسی دەست ب دژایەتیا خواندنا کوردی کر، بزاڤێن کێمکرنا هژمارا خواندنگەهێن کوردی کرن و گەف ل خەلکەکی دکرن کو زارۆکێن خۆ بهنێرنە وان خواندنگەهان[٥٣].

هەژیە بێژین د گەرماتیا شەرێ ناڤبەرا

حكۆمەتا عیراقێ و شۆرشا كوردستانێ د ناڤبەرا ئادارا ١٩٧٤- ئادارا ١٩٧٥ێ حكۆمەتا بەعسی ل دەڤەرێن كوردستانییێن وی دەمی سەرب پارێزگەها مووسلێ ڤە دەست ب عەرەبیكرنا خواندنگەهێن كوردی ل قەزایێن ئاكرێ و شێخان و شنگال و ناڤ مووسلێ كربوو، لێژنا كاروبارێن پەروەردە و رەوشەنبیری و ئەوقافێ ل جڤاتا یاسادانانێ یا دەڤەرا كوردستانێ (المجلس التشريعي لمنطقة كردستان) د راپۆرتا خوەدا بۆ جڤاتا یاسادانانێ ل رۆژا ١٠ شوباتا ١٩٧٥ێ بابەتێ دیاربوونا نیشانێن بزاڤەكێ بۆ گوهۆرینا خواندنا ل پارێزگەها دهۆكێ و دروستكرنا ئاستەنگان ل بەر خواندنا زمانێ كوردی بەرچاڤكرییە، و پشتی دانوستاندنێ ل دۆر بابەتی ب كریار چەند پێنگاڤ بۆ دووڤچوونا بابەتی هاڤێتینە و لیژنە بۆ ڤێ مەرەمێ پێكئینابنە و لێژنان دووڤچوونا بابەتی كرییە و سەرەدانا وان جهـ و خواندنگەهان كرییە یێن خواندنا وان بۆ عەرەبی هاتییەگۆهارتن، پشتی سەرەدان و دیدارێن خۆۆ لیژنا ئاماژەپێكری د كۆمبوونا هژمار ١٨ یا جڤاتێدا ل ٢ نیسانا ١٩٧٥ راپۆرتا خۆ بەرچاڤكرییە و د راپۆرتا واندا هاتییە: ب دروستی ل ٤٦ خواندنگەهێن دەڤەرێن جودایێن پارێزگەها مووسلێ و قەزا ئاكرێ ل دووڤ نڤیسارێن پارێزگەها مووسلێ و پەروەردا مووسلێ د ناڤبەرا ١٩٧٤/٦/٦- ١٩٧٥/٣/٣ێ زمانێ خواندنێ ژ كوردی بۆ عەرەبی هاتییە گوهارتن. هەردڤێ راپۆرتێدا ئاماژە ب هندێ هاتیەكرن كو كریارا گۆهارتنا زمانێ خواندنێ ژ كوردی بۆ عەرەبی یا بەردەوامە و ل جهێن پارێزگەها دهۆكێ ژی بزاڤێن گۆهرینا خواندنا كوردی بۆ عەرەبی هاتینەكرن بەلێ د ڤێ سالێدا سەرنەگرتیە[٥٤].

ژ دووڤچوونا كۆنڤیسێ روونشتنێن جڤاتا یاسادانانێ یێن وێ سالێ دیاردبیت: هەروەك وێ جڤاتێ پێ چێنەبییت یان دەسەلات نەبیتن یان ل سنوورێ وان هاتبنە راوەستاندن ڤێ جڤاتێ و لیژنەیا وێ خوە ب سەر ڤی بابەتیڤە نەبرییە و خوە لێ نەكرییە خودان[٥٥].

ب رووادانا نسكۆیا ١٩٧٥ێ ب دروستی ل سالا خواندنێ ١٩٧٥- ١٩٧٦ێ دەست ب پیلانەكا هوور و بەرنامە بۆ دارشتی بۆ ژناڤبرنا خواندنا كوردی ل خواندنگەهێن پارێزگەها دهۆكێ هاتەكرن[٥٦]. ل سالا ١٩٧٧- ١٩٧٨ێ دەسەلاتدارێن بەعسی پێنگاڤەكا د ڤێ كریارێدا هاڤێت دەمێ بریار دای نیڤا بەرنامێن خواندنێ ژ قۆناغا سەرەتایی هەتا داویا ئامادەیی ژ زمانێ كوردی ببنە عەرەبی كو ڤێ بریارێ ژ وانەیێن كۆمەلایەتی دگرت، هەڤدەم ل گەلەك ژ وان دەڤەران یێن خواندنا كوردی ژێدگرت ئەو خواندن ب عەرەبی هاتەگوهارتن، د هەمان دەمدا كۆڕی زانیاری كورد و رێڤەبەریا گشتیا خواندنا كوردی هاتنەهەلوەشاندن و دیرۆكا گەلێ كورد ژ بەرنامێن خواندنێ هاتەدوورئێخستن و گەلەك ژ وان پەرتووكان یێن دیرۆك و رەوشەنبیریا كوردی ب خۆڤە دگرن ژ پەرتووكخانان دەرێخستن و سۆتن و كۆمەلا رەوشەنبیریا كوردی ژی هاتەهەلوەشاندن[٥٧].

ل دەسپێكا سالا ١٩٨٣ێ ل ژێر فشارا خەباتا نەتەوەیا گەلێ كورد و شۆرشا وی یا چەكدار و هێزێن دی یێن بەهەلستكارێن عیراقێ سەدام حسێنێ سەرۆككۆمارێ عیراقێ ل سەر كەنالێن راگەهاندنێ داخواز ژ رەوشەنبیرێن كورد كر كو "هەتا تێربوونێ دەربرینێ ژ رەوشەنبیریا خۆ بكەن"، مەرەما وی ژێ مێتنا گرنگیپێدانێن وان بوو و د ڤی واریدا ب رەنگەك رێژەیی هندەك دەرگەهـ ل بەر وان ڤەكرن كو ژ بلی پویتەدان ب بابەتێن ئەدەبی د كۆڤاراندا و چاپكرنا هندەك پەرتووكان چ وارێن دی ب خۆڤە نەدگرتن. بەلێ سیاسەتا دروست و راستەقینەیا حزبا بەعس باشتر و ب رەنگەكی زیرەكانە تر بەرچاڤبوو و ب كریار ژی هاتەبجهئینان[٥٨]. ژ ئەنجامێ ڤێ سیاسەتێ دگەل دەسپێكرنا سالا ١٩٨٥ێ (٢١٠) خواندنگەهـ ل گوندێن سنوورێ پارێزگەها دهۆكێ ب مهانەیا هندێ كو دكەڤنە دەرڤەی دەسەلاتێ حكۆمەتێ ل دووڤ فەرمانا نهێنییا ژ رێڤەبەریا گشتیا پەروەردە و پلانا پەروەردەیی یا پارێزگەها دهۆكێ ب هژمار (٥٧٥) ل رۆژا ٢٠ چریا ئێكێ ١٩٨٥ێ هاتنەگرتن، هەروەكی د ڤی فەرمانیدا هاتی: " ل دووڤ ئەوا د نڤیسارا لیژنا

هەڤكاریا تەناهیێ (لجنة التنسيق الأمني) یا پارێزگەها دهۆكێ- نهێنی و كەسایەتی ب هژمار (٢٣٦) ل ١٩٨٥/٩/٢٢ هاتی كو خواندنگەهێن د ڤێ لیستێدا بێنەگرتن، بریار هاتەدان ژ رۆژا ل سەری هاتییەدیاركرن پێرابوونێن پێدڤی بگرینە بەر"[٥٩].

تاكە دواناڤنجیا ل سەرانسەری پارێزگەها دهۆكێ خواندن ب زمانێ كوردی لێ دهاتەخواندن دوا ناڤنجیا برایەتی بوو ئەوا ل سالا خواندنێ ١٩٧٤-١٩٧٥ێ هاتییەڤەكرن[٦٠]، ئەو ژی پشتی دەهـ سالێن خواندنێ ل چریا ئێكێ ١٩٨٥ێ هاتەگرتن، ب گرتنا وێ خواندنا كوردی ل پارێزگەها دهۆكێ هەتا ئاستەكێ مەزن ب داویهات و تنێ چەند پۆلەك مان ل ناڤ چەند خواندنگەهەكێن خواندنا وان ب عەرەبی، ئەو ژی سال ل دووڤ سالێ ل كێمیێ دان و بەرەف داویێ دچوون[٦١].

رژێما بەعسی ب خۆ و د (بەلگەنامەكا هاتییەدیتندا) دانپێدان ب وێ چەندێ كرییە كو وان ل دووڤ پلانەكا هوور و بەرنامەكری و ب هاریكاریا هندەك كەسایەتیێن (دەروون لاواز) ئەڤ سەرەدەرییە دگەل خواندنا كوردی ل پارێزگەها دهۆكێ كرییە و ل سەر ڤێ بنیاتێ پێشنیازكرییە هەمان پلان بۆ ب عەرەبیكرنا خواندنا كوردی ب رێژا (٧٠٪)ێ بۆ سالا خواندنێ ١٩٨٩- ١٩٨٩ێ و ب رێژا (١٠٠٪)ێ بۆ سالا ١٩٩٠- ١٩٩١ێ ل هەردو پارێزگەهێن هەولێرێ و سلێمانیێ بێتەبجهئینان، هەروەسان بەلگەنامەیێ پشكدارێن پلانێ هشیاركرینە كو زۆر نهێنیێ ب پارێزن و كاری د دەمێ هەیڤەكێدا بجهـ بینن[٦٢].

وەك كارڤەدانەك بەرامبەری ڤێ سیاسەتا شوڤێنیا حزبا بەعس بەرامبەری گەلێ كورد ب تایبەت خواندنا كوردی گرتییە بەر، خەلكێ كوردستانێ ب تایبەت ناڤەندێن قوتابییان نەمانە بێدەنگ و د چەندین هەلكەفتاندا قوتابیێن دهۆكێ خۆنیشادانێن نەرازیبوونێ ئەنجامدان ب تایبەت ژی د رۆژێن ڤیستەڤالان و جەژنێن نەورۆزێ و سەیرانێن قوتابیاندا، هەروەك هەموو سەیرانێن قوتابیێن دواناڤنجیا برایەتی ئەنجامێن وان دبوونە خۆنیشادان دژی رژێما بەعسی.

ل ٢٠ ئادارا ١٩٧٧ێ ب هەلكەفتا جەژنا نەورۆزێ قوتابیێن دهۆكێ رێڤەچوونەك ل ناڤەندا بازێرێ دهۆكێ ئەنجامدا، رۆژا پاشتر دەمژمێر (٩,٥) سپێدێ قوتابیێن هەموو خواندنگەهان ل جادا نەخۆشخانا كۆماری یا كەڤن ئامادەبوون و ب رێپیڤان بەرەف ناڤەندێ بازێری ل نك بازارێ مەزن چوون و دەست ب درۆشمێن پشتەڤانیا شۆرشا كوردستانێ كرن و ب دەنگێ بلند دگۆتن و ڤەدگێرانەڤە وەك: (كوردستان داروبەرە ... نیشانا مە خەنجەرە) و (برنۆ رەقەم هەڤدەیە ... نیشانا پێشمەرگەیە) بەلێ رەشەكێن ئەمنا دهۆكێ ل دۆرێن وان زڤرین و بەلاڤەكرن[٦٣].

دەمێ ل نیسانا ١٩٨٢ێ نووچەیێن خۆنیشادانێن قوتابیێن زانكۆیا سەلاحەدین - هەولێرێ[٦٤] و شەهیدبوونا چەند قوتابییەكێن خۆنیشاندەر گەهشتینە قوتابیێن دهۆكێ، وان ژی بەرهەڤیكرن بۆ خۆنیشادانێ و دیاركرنا پشتەڤانیا خۆ بۆ قوتابیێن زانكۆیا سەلاحەدین و داخوازا ئازادكرنا قوتابیێن گرتی و سزادانا كەسێن ب تاوانا كوشتنا قوتابییان رابووین، قوتابیێن (دواناڤنجیا برایەتی و ئامادەییا پیشەسازی، و خانەیا مامۆستایان و دواناڤنجیا مەمێ ئالان) هەموو بەرهەڤیێن خۆكرن و پلانەك دانا كو ل سەنتەرێ بازێری دەست ب خۆنیشادانێ بكەن، دەسپێكا وی ل جهـم دەرمانخانا سەعد یا نها بیت و دیماهییا وی ل جادا دكتوران بیت، هژمارا قوتابییان د ناڤبەرا (٤٠٠- ٥٠٠) كەسان بوو، ڤێ جارێ ژی رەشەكێن ئەمنێ بەرهەڤیێن باش بەرامبەری قوتابییان كرن و ژ هەموو ئالییانڤە قوتابی دووریێچدان و هژمارا رەشكەیێن ئەمنێ پتر بوو ژ هژمارا خۆنیشادەران و د ئەنجامدا خۆنیشادان راوەستیا و رەشەكێن ئەمنێ كۆلان كۆلان دووڤ وان كەتن[٦٥].

ل سالا ١٩٨٤ێ دەمێ قوتابیێن خواندنگەهێن (برایەتی، مەمێ ئالان و هاوكاری) ژ سەیرانا خواندنگەهێ بۆ دەڤەرا كەلەكێ د رێكا مووسلێ را دزڤرینەڤە پۆلیس و زەلامێن دەزگەهێ ئەمنێ بەربارانكرن و ب دەنگێ بلند درۆشمێن نەتەوەیی

گۆتن، د ئەنجامدا گوللە هاتنەبکارئینان و چەند قوتابییەك بریندارببوون و چەندەکێن دیتر هاتنەگرتن، پشتی زڤرینەڤە دهۆکێ رۆژا پاشتر هەمان قوتابییان خۆنیشادانەکا دی ل سەنتەرێ دهۆکێ بۆ پشتەڤانییا قوتابییێن گرتی ئەنجامدا بەلێ دوبارە رەشەکێن ئەمنێ دۆرێن وان گرتن و ژێکبەلاڤەکرن و هندەکێن دی ژ وان ژی گرتن[٦٦].

ئەڤ سەروبەرێ دژوار و ڤان سەرەدەریێن ستەمکارانە نەبوونە رێگر بەرامبەری قوتابییێن دهۆکێ کو پلەیێن خواندنێ یێن هەرە باش دەستڤەبینن، بەلکی ل گەلەك سالێن خواندنێ قوتابییێن دهۆکێ پلەیێن ئێکێ و دووێ و سێێ ل سەر ئاستێ عیراقێ دەستڤەئینان[٦٧]. ب ڤی رەنگی سەرکەتن و زیرکییا قوتابییێن دهۆکێ د وان دەرساندا یێن دخواندن جهێ سەرنجراکێشانا پارێزگەهێن دیترێن عیراقێ بوو، ئەڤە ژی چەند نموونەکن ژ سالا خواندنێ ١٩٨٢- ١٩٨٣ێ وەك نموونە: رێژا دەرچوونێ د وانەیا زمانێ عەرەبی دا ٨٠٪ بوو ل پتر ژ ٢٥ خواندنگەهان ژ کۆما ٣٠ خواندنگەهان، هەروەسان رێژادەرچوونێ ل وانەیا زمانێ ئینگلیزی ٨٠٪ بوو ل ١١ خواندنگەهان ژ کۆما ٣٠ خواندنگەهان، هەروەسان رێژەیا دەرچوونێ د وانەیا کۆمەلایەتی ٨٠٪ بوو ل پتر ژ ٢٧ خواندنگەهان ژ کۆما ٣٠ خواندنگەهان، هەر ب ڤی رەنگی رێژا دەرچوونێ ل وانەیا زیندەوەرزانی ٨٠٪ بوو ل ١٢ خواندنگەهان ژ کۆما ٣٠ خواندنگەهان، و ل وانەیا فیزیك و کیمیایێ ٨٠٪ بوو ل پتر ژ شەش خواندنگەهان ژ کۆما ٣٠ خواندنگەهان[٦٨]. هندەك خواندنگەهان رێژا دەرچوونێ ٩٥٪ دەسخۆڤە ئینا و خواندنگەهەکێ ژی رێژا ٩٨٪ دەستڤەئینا[٦٩].

## رەوشەنبیرییا گشتی و ئەدەبیات

پشتی نسکۆیا سالا ١٩٧٥ێ سەروبەرێ رەوشەنبیری و ئەدەبی وەك هەمووو وارێن دی یێن ژیانێ ل دهۆکێ کەتە د سەروبەرەك لاواز و پشتگوهڤە هاڤێتیدا و ڤی سەروبەری نێزیکی سێ سالەکان ڤەکێشا، ژ ئەنجامێ سەرەدەرییا دەسەلاتدارییا حزبا بەعس تنێ د شیانێن رەوشەنبیر و نڤیسکارێن دهۆکێ دا هەبوو بەرهەم و گۆتار و ڤەکۆلینێن خۆ د کۆڤار و رۆژنامەیێن بەغدادا بەلاڤبکەن، بزاڤا بەلاڤکرنا بەرهەمێن رەوشەنبیری و ئەدەبی رۆژ ل دووڤ رۆژێ ل بەرفرەهبوونێ دا و د شیانێن دەسەلاتداراندا نەبوو بەرسنگێ ڤێ بگرن[٧٠].

ژ ئالیێ دیڤە حکومەتا عیراقێ سەخمەرات بەلاڤکرنا هزر و باوەری و ئەدەبیاتێن حزبا بەعسا حوکمدار چەند دەزگەهـ و سازیێن رەوشەنبیری و ئەدەبی دامەزراندن، ئەو بوو ل ٤ ئەیلوولا ١٩٧٦ێ لقێ خانەیا نیشتمانییا بەلاڤکرنێ و ریکلامان (الدار الوطنية للتوزيع و الإعلان) ل دهۆکێ هاتەڤەکرن و ئەڤ سازیە دشیا هەمووو رۆژنامە و چاپکری و پەرتووکان بگەهینتە سەنتەرێ پارێزگەهێ، هەروەسان بنکەهێن بەلاڤکرنێ ل دەرڤەی باژێرێ دهۆکێ وەك زاخۆ، ئامێدیێ، سێمێلێ و ناحیێن سەرسنك و مانگێشێ هاتنەڤەکرن، هەروەسان ب هەلکەفتێن ئاهەنگێن حزبا بەعس ل ١٧ تیرمەهێ لقێ دهۆکێ یێ سازیا بەلاڤکرنێ و ریکلامان پێشانگەهێن گەرۆکێن پەرتووکا ل قەزا و ناحیە و جهێن گەشتوگوزاریێن[٧١] دەرڤەی سەنتەرێ پارێزگەهێ ڤەکرن[٧٢].

ب مەرەما بجهئینانا ئارمانجێ سەرکیێ حزبا بەعسی بۆ گەهاندنا هزرێن وێ بۆ ناڤ وەلاتیان و بەلاڤکرنا ئەوا دگۆتنێ هشیارییا حزبی ل رۆژا ٤کانوونا دووێ ١٩٧٨ێ رێڤەبەرییا خانەیا رەوشەنبیرییا جەماوەری (دار الثقافة الجماهيرية) ل دهۆکێ هاتەڤەکرن، ڤێ رێڤەبەریێ چەندین چالاکیێن رەوشەنبیری و هونەری وەك پێشکەشکرنا سمینارێن جەماوەری و سمینارێن ئەدەبی و رەوشەنبیری و گێرانا ئاهەنگێن ستران و گێرانا شانۆگەریان و بەلاڤکرن و بەخشینا پەرتووك و بەلاڤۆك و پۆستەران د هەلکەفتێن حزبیدا و نیشادانا فلمێن سینەمائی و بەلاڤکرنا پەرتووکخانێن مللی یێن پری پەرتووك و کۆڤاران ل جهێن جودایێن پارێزگەهێ و چەندین

چالاکیێن دیتر ئەنجامدان[73].

هەر ل ڤێرێ پێویستە بێژین کو ئالیێ هەرەچالاك د وارێ رەوشەنبیری و ئەدەبیدا و خوەدی پەسنێن نەتەوەیی ناڤەندێن قوتابییان بوون، د ڤی واریدا ئامادەییا برایەتی یا خواندنا کوردی پێشەنگ بوو، ڤێ خواندنگەهێ چەندین بەلاڤۆکێن خواندنگەهان ب زمانێ کوردی بەلاڤکرن و چەندین شانۆگەری پێشکەشکرن کو هەر هەموویان دەربرین ژ سەروبەرێ کوردستانێ یێ تراژیدی پشتی نسکۆیا ١٩٧٥ێ دکرن، ژ وان بەلاڤۆکان بەلاڤۆکا (ژیان) ل سالا خواندنێ ١٩٧٥- ١٩٧٦ێ و بەلاڤۆکا (رەوشەنبیری) و بەلاڤۆکا (ئازادی) ل سالا خواندنێ ١٩٧٦- ١٩٧٧ێ، هەروەسان ل رۆژا ٢٣ چریا ئێکێ ١٩٧٧ێ ژمارا ئێکێ ژ بەلاڤۆکا (کوردستان) یا هەیڤانە بەلاڤکرن و بۆ دەمێ دو سالان یا بەردەوام بوو و ڤێ بەلاڤۆکێ دو پاشبەند هەبوون ب ناڤێن (برجا بەلەك و نەڤرۆز) کو ئەو ژی وەك بەلاڤۆك دهاتنەبەلاڤکرن[74].

هەروەسان ناڤەندێن قوتابییان چەندین شانۆگەریێن دی پێشکەشکرن و یا ژ هەموویان پتر دەنگڤەدای و جهێ خۆ گرتی شانۆگەریا (دینێ ئاخی) بوو ل سالا ١٩٧٧ێ کو د پرانییا ئاهەنگێن ئامادەییا برایەتی دا دهاتەڤە پێشکەشکرن، هەر ئەڤ قوتابییە بوونە بەرێ بنیاتێ یێن بزاڤا شانۆگەری ل دهۆکێ، هەر ڤان قوتابییان ل سالا ١٩٧٧ێ بەرهەڤیکرن بۆ پێشکەشکرنا شانۆگەرییەکا دی ب ناڤێ (لێبۆك داستانا مەم و زینێ دگۆهریت) بەلێ ئالیێن پەیوەندیدار نەهێلا ئەڤ شانۆگەرییە بێتەنیشادان[75].

ئالیێ ئێکانەیێ پتر ژ هەموو ئالیێن دیتر خزمەتا رەوشەنبیری و ئەدەبیاتا کوردی ل دەڤەرێ کری ئێکەتییا نڤیسەرێن کورد بوو، (تایێ دهۆکێ یێ ڤێ ئێکەتیێ ل ١٢ تەباخا ١٩٧٢ێ هاتیبەڤەکرن). د ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٧٨ێ ڤێ ئێکەتیێ چ بارەگا و جهـ نەبوون ئەندامێن وێ تێدا کۆمببن، دیدار و هەڤدیتنێن ئەندامێن وێ ل جهێن گشتی بوون[76].

پشتی کو دەسەلاتدارێن عیراقێ گەهشتینە وێ باوەرێ کو د شیاندا نینە کونترۆلێ ل سەر چالاکیێن رەوشەنبیر و نڤیسکارێن کورد و ئەوێن بێهنا کوردینیێ ژێ دهێت بکەن، ب باشتر زانی رێکێ ل بەر دامەزراندنەڤا ئێکەتییا نڤیسەرێن کورد خۆش بکەن ب مەرجەکی د خزمەتا ئارمانج و مەرەمێن واندا بیت[77]، ئەو بوو ئەمینداریێ گشتیێ یێ رەوشەنبیری و لاوان (عەبدولغەفار ئەلصائغ) ل جڤاتا بجهئینانێ یا دەڤەرا ئۆتونومی ل حزیرانا ١٩٧٨ێ دگەل کۆمەکا نڤیسکارێن دهۆکێ کۆمبوو و ژێ خواست کار بکەن بۆ سەرژنوو زیندووکرنەڤا ئێکەتییا نڤیسەرێن کورد و لیژنەکا بەرهەڤکار بۆ پشکداریێ د کۆنگرێ پێنجێ یێ ئێکەتییا نڤیسەرێن کورد ئەوێ دێ ل هەولێرێ هێتەگریدان پێکبینن، ب کریارا وانا لیژنا بەرهەڤکار پێکئینا و ل ئەیلوولا ١٩٧٨ێ پشکداریێ د کۆنگرەیدا کرن، د دەمێ دەنگدانێدا ئەندامێن کەڤنێن ئێکەتییا نڤیسەران و دلسۆژ بۆ گەلێ خۆ سەرکەتن، هندیکە بەعسی و ئالیگرێن وان بوون هەرچەندە لیستەك بۆ مەرەما هەڤرکییا هەلبژارتنان ئامادەکریبوو بەلێ بەریژارێن وان د هەلبژارتناندا سەرنەکەتن[78].

ل ٦ چریا دووێ١٩٧٨ێ لقێ دهۆکێ ل ئاڤاهیێ خۆ ل تاخێ شێلێ کونفرانسێ خۆ ئەنجامدا و دەستەکا کارگێرییا نوو یا پێکهاتی ژ نەهـ کەسان ب سەرۆکاتییا ئەحمەدێ زەرۆ هەلبژارتن، دەستەکا نوو ئاڤاهییەکێ کەڤن کو ب خانا یەلدەی دهاتەنیاسین ب کرێ گرت و کرە بارەگایێ لقێ نڤیسەران ل دهۆکێ و دەست ب چالاکیێن خۆ کر، هەژییە بێژین بەری ڤێ ئاڤاهی و د قۆناغا سەر ژنوو دامەزراندنا لقێ نڤیسەران بارەگایێ وان ل ئاڤاهیەکێ شێخ مەمدوحی بوو ل تاخێ شێلێ[79].

ل چریا دووێ ١٩٧٩ێ کۆنگرێ شەشێ یێ ئێکەتییا نڤیسەرێن کورد سەرکەتیانە ل بەغدا هاتەگێران، پشتی وی ژی کونفرانسێ لقێ دهۆکێ هاتەگێران و دەستەکەکا نوو بۆ لقی هاتەهەلبژارتن[80]. بەلێ ڤێ قۆناغێدا سەروبەر وەك قۆناغا ناڤبەرا کۆنگرێ پێنجێ و شەشێ ب ئاسایی ب رێڤە نەچوو، حکۆمەتا عیراقی یا نیگەران بوو ژ چالاکی و بزاڤێن ئێکەتییا

نڤیسەرێن کورد ل هەموو لڤان، کار بۆ هندێ کر بکریت لێ ب رێکا چوارچووڤەکرنا چالاکیێن وێ وەك یێن ئێکەتیا نڤیسەرێن عیراقێ، ئەڤ چەندە ژی بۆ عیراقێ یا ب ساناهی نەبوو ژبەرکو نڤیسەرێن کورد مەرجێن خۆ هەبوون[٨١]، بۆ دەمێ تێکەلکرنا وان دگەل ئێکەتیا نڤیسەر و ئەدیبێن عیراقێ و بۆ ڤێ مەرەمێ ژی رایا حزبێن کوردی یێن سەرکردایەتیا شۆرشا کوردستانێ دکر وەرگرتبوو[٨٢].

پشتی جهێن پەیوەندیدار ل سەر مەرجێن ئەدیبێن کورد رازیبووین، ل ١ تەباخا ١٩٨٣ێ وەزارەتا ناڤخۆیا عیراقێ بریاردا ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد بێتەگرێدان دگەل ئێکەتیا گشتیا نڤیسەر و ئەدیبێن عیراقێ و هەموو مولك و پێگیریێن وێ ژی بێنە دگەل ئێکەتیا عیراقی[٨٣].

هندێ پەیوەندی ب بزاڤا چاپ و وەشانێ ل پارێزگەهێ هەی، د قۆناغا ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٩١یدا سەرەرای کاودانێ بەرتەنگێ دەڤەرێ سەرەدەریا دژوارا دەسەلاتداریا بەعسییان ل ڤێ پارێزگەهێ چەند بەلاڤۆك و پەرتووك هاتنەبەلاڤکرن، بەلێ دڤێت وێ چەندێ بێژین ژبلی کاودانێ بەرتەنگ و سەرەدەریا دەسەلاتی سەروبەرێ ئابووری و نەبوونا چاپخانەیان ل دهۆکێ ژ ئاستەنگێن سەرەکیێن رێکا چاپ و بەلاڤکرنێ بوون ل دهۆکێ[٨٤]، ژ وان بەرهەمێن هاتینەبەلاڤکرن: کوڤارا (الشموع) ژ ئالیێ خانەیا مامۆستایێن سەرەتایی ل دهۆکێ[٨٥]، تاکە هژمارا کوڤارا (پەیڤ) ل سالا ١٩٧٩ێ ژ ئالیێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد تایێ دهۆکێ وەك کۆمەلە بەرهەمەك نەك کوڤارەك هاتەبەلاڤکرن، ئەو ب خۆ بریارا ئێکەتیا نڤیسەران ئەو بوو وەك کوڤارەك بێتەبەلاڤکرن، بەلێ ژ بەر نەدانا مولەتێ وەك کۆمەلە بەرهەمەك هاتەبەلاڤکرن و (٣٠٠٠)دانە ژێ هاتنەچاپکرن و کار بۆ هژمار دووێ ژی هاتەکرن بەلێ رێڤەبەریا زێرەڤانیا چاپکرێن عیراقی (مديرية رقابة المطبوعات العراقية) رەزامەندی ل سەر بەلاڤکرنا وێ نەدا[٨٦].

هەروەسان د ناڤبەرا ١٩٨٥- ١٩٨٩یدا کۆمەکا نڤیسەرێن گەنج ب شیانێن خۆیی چوار هژمارێن کوڤارەکێ ب ناڤێ (دەنگێ مە) لێ ئەو ژ ب رەنگێ کۆمەلەك بەرهەمان بەلاڤکرن[٨٧]. هەر د ڤێ قۆناغێدا کۆمەکا نڤیسەرێن پارێزگەها دهۆکێ شیان چەند بەرهەمەکێن خۆ ب تایبەت د وارێ ئەدەبیدا چاپ و بەلاڤبکەن، د هەمان دەمدا نڤیسەرێن دەڤەرێ رۆلەك بەرچاڤ د کوڤار و رۆژنامێن کوردی یێن بەغدا و هەولێرێ دا هەبوون، هەژییە ل ڤێرێ بێژین هەموو پەرتووکێن نڤیسەرێن دەڤەرێ ل چاپخانەیێن بەغدا و هەولێرێ دهاتنەچاپکرن، ئەو ژی ئەنجامێ نەبوونا چاپخانە و دەزگەهێن بەلاڤکرنێ بوو ل دەڤەرێ[٨٨].

پشتی ل ٨ تەباخا ١٩٨٨ێ شەرێ عیراقێ و ئیرانێ ب داویهاتی، دەزگەهێن راگەهاندنا بەعسییان راگەهاند کو دێ قۆناغەك نوو د ژیانا خەلکێ عیراقێدا دەسپێکەت، بریارهاتەدان رێك ل بەر دەرچوونا رۆژنامەیێن نوو بێتەڤەکرن، د ڤێ دەلیڤێدا هندەك ژ رەوشەنبیرێن پارێزگەها دهۆکێ پێکهاتن کو داخوازا ئیمتیازا بەلاڤکرنا رۆژنامەکا هەفتیبانە بکەن[٨٩] و داخوازا خۆ پێشکەشی جهێن پەیوەندیدار کرن، دو هەیڤ ل سەر داخوازا وان بۆرین حکومەت ل سەر داخوازا وان رازینەبوو، بەلێ تنێ بەرهەمێ ئەوا حکۆمەتێ راگەهاندی ئەو بوو کو وێ ل بەرە رۆژنامەکێ ب دیالێکتا کرمانجی ب ناڤێ (بزاڤ) و ئێکا دن ب سۆرانی ب ناڤێ (ئاسو) بەلاڤبکەت[٩٠].

ل رۆژا ١٩٨٩/٨/١ رۆژناما (بزاڤ) ل دووڤ داخوازا وەزارەتا رەوشەنبیری و ب سەرنڤیسەریا دکتور نافع ئاکرەیی هاتەبەلاڤکرن، رۆژنامە هەیڤێ دو هژمار ژێ دهاتنەبەلاڤکرن، د ناڤبەرا ١٩٨٩- ١٩٩٠ێ (٥٦) هژمار ژێ دەرکەتن[٩١].

هندی پەیوەندی ب چاپکرنا پەرتووکان ژ بەرهەمێ نڤیسەرێن دەڤەرێڤە هەی، د ڤێ قۆناغێدا هژمارەکا پەرتووکان د وارێن: هەلبەست، چیرۆك، رۆمان، شانۆگەری، فولکلور و وەرگێرانێدا هاتنەبەلاڤکرن، گەلەك ژ وان دەنگەڤەدانەك مەزن د ناڤ مللەتیدا هەبوو و هەرزوو دانەیێن وان ل بازاری نەمان، هندەك ژ وانا هێژ ژ چاپخانەیان نە دەرکەتین خەلکی دکرین و

پێشەكی بهایێ وان ددا پەرتووكخانەیان، وەك نموونە ژ وان پەرتووكان دیوانا هەلبەستان یا عەبدولرەحمان مزووری ب ناڤێ (ل خەلكێ تەحلێ ل من شرینێ)، د وارێ وەرگێرانێدا ژی بەرهەمێن سەلاح سەعدوللای هەژی ئاماژە پێ كرنێنە كو یەكەمین نڤیسەرێ دەڤەرا بەهدینان بوو هند بەرهەم ژ زمانێن بیانی وەرگێراینە سەر زمانێ كوردی[92]. ڤان كوڤار و رۆژنامە و پەرتووكان رۆلەك گرنگ و كاریگەر د ڤەژاندن و نووكرنا پەیڤا كوردی (دیالێكتا كرمانجی)دا هەبوو و خزمەتەك بەرچاڤ بۆ رەوشەنبیری و ئەدەبیاتا كوردی پێشكەشكر.

هندیكە پەرتووكخانەنە دهێنە هژمارتن دەرۆكەكێ دی یێ بەلاڤكرن و پێشڤەبرنا رەوشەنبیرینێ ل هەر جهەكی بیت، یەكەمین پەرتووكخانا گشتی یا رەسمی ل سالا ١٩٦٢ێ ل پشت مزگەفتا گرێ باسێ یا نها هاتەدامەزراندن[93]. هەروەك ئاماژە پێهاتییەكرن ل سالا ١٩٧٦ێ خانەیا نیشتمانییا بەلاڤكرنێ و ریكلامان ل دهۆكێ هاتەڤەكرن، بەلێ ل سالا ١٩٨٣ێ ئەڤ خانەیە هاتەبەرچاڤكرن بۆ فروشتنێ و (ئەحمەدێ زەرۆ) كری و ل شوونا وێ پەرتووكخانا دهۆك دامەزراند كو هەتا نها بەردەوامە. هەژییە بێژین پەرتووكخانا سامی (مكتبة سامي) كەڤنترین پەرتووكخانا ئەهلیيا دهۆكێ یە كو هەتا نها بەردەوام ل دەسپێكا سالێن هەفتییان هاتییەڤەكرن و دكەڤتە سەرێ جادا خەبات ب رەخ دەرمانخانا سەعد ڤە[94]. ل داوییا سالێن هەشتییان پەرتووكخانەكا دی یا ئەهلی ل دهۆكێ ب ناڤێ (مكتبة النهضة) هاتەڤەكرن و نها ب ناڤێ پەرتووكخانا جزیری بەردەوامیێ ب ژینێ خۆ ددەت. بەلێ ل سەنتەرێ ڤەزایێن سەر ب دهۆكێ ڤە تنێ ل ئاكرێ و زاخۆ و ئامێدیێ پەرتووكخانەیێن گشتی هەبوون، لێ د بێ سەروبەربوون چ ب هەژاریيا وان د پەرتووكاندا و چ ب ئاڤاهیێن وان یێن نە هەژی، هەروەسان ل ڤان سەنتەرێن ڤەزایان چ پەرتووكخانەیێن ئەهلی یێن تایبەت نەبوون بەلكی هندەكان ل جهێن فروشتنا پێدڤیێن خواندنگەهێ و فەرمانگەهان هندەك كوڤار و رۆژنامە و كتەكا پەرتووكان د فروشتن[95].

## سەروبەرێ سیاسی

پشتی ژ ئەنجامێ كودەتایێن ١٧ و ٣٠ تیرمەها ١٩٦٨ێ بۆ جارێ دووێ حزبا بەعسا عەرەبییا ئیشتراكی دەسەلاتێ عیراقێ گرتییەدەست كار بۆ وێ چەندێ كر حزب د هەموو وارێن ژیانێدا و ل سەرانسەری عیراقێ سەروەربیت، پشتی پێكهاتنا جەزائیرێ و شكەستنا شۆرشا كوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ پتر ژینگەهـ یا هاریكار بوو ئەوا بەعسییان دڤێت ل كوردستانێ جێبەجێ بكەن و ب خورتی و هێزێ بیروباوەرێن خۆ ل ناڤ جوین و تەخێن جڤاكێ كوردستانی بكەن و هەموو شیان و سازیێن دەولەتێ ئێخستنە د خزمەتا ڤێ مەرەمێدا، هەموو ئێكەتی و كۆمەلەیێن پیشەیی، سەندیكا، رێكخراوێن قوتابییان و ژنان، سازیێن راگەهاندنی و وەشانخانە هەموو كەتنە د خزمەتا سیاسەتا بەعسییاندا.

پشتی رووداننا ١٩٧٥ێ ل دووڤ پلانەكا بەرنامەدارێشتی و بەرهەڤی بۆ كری دەست ب بەعسیكرنا خەلكی ل پارێزگەها دهۆكێ كر، بۆ ڤێ مەرەمی گشت رێكێن فشارێ و شەرێ دەروونی بەرامبەری خەلكی گرتنە بەر، د هەمان دەمدا مفا ژ سەروبەرێ دەروونیێ خەلكێ یێ پشتی شكەستانا شۆرشا كوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ وەردگرت، ب رەنگەكی ل جەم رەشەك و زەلامێن حزبا بەعس ب بەعسیكرنا خەلكی تنێ توومارکرنا ناڤێ وی بوو د فۆرمێ بەعسیكرنێدا بلا ڤیانا وی ل سەر نەبیت یان وی ب خۆ ئیمزا نەكربیت یان ژی هەر د بنیاتدا ئاگەه ژێ نەبیت، ب رەنگەكی بەعسییەكی د رۆژەكێدا (٢٠٠) فۆرمێن هاتنە ناڤ رێزێن حزبا بەعس توومارکریوون، ئەڤە سەروبەرێ هەموو تەخ و جوینێن خەلكێ بوو د پلانا ب بەعسیكرنا واندا، ئەڤ پلانە یا بەردەوام بوو چ ل فەرمانگەهێ بیت، خواندنگەهێ یان بەر دوكانێ و سەر جادەیان هەتا كو ژن د ناڤ مالاندا ژ ڤێ بەلایێ رزگار نەدبوون و گەلەك جاران رەشەك و زەلامێن حزبا بەعس دەرگەهێن مالان د قوتان و ژ ژنان د خواست فۆرمێ ب بەعسیبوونێ پڕ

بکەن و ببنە بەعسی[96].

ئەمینداری گشتیێ سەرکردایەتیا لقێ حزبا بەعس ل دهۆکێ نوونەراتیا حزبێ ل پارێزگەهێ دکر، ئانکو مەزنترین پلەیا حزبی بوو ل پارێزگەهێ، هەموو دەسەلات هەبوون و بۆ هیچ ئالیەکی یان سازیەکێ نەبوو گوهداریا فەرمانێن وی نەکەت، ئەندامێن لقێ دهۆکێ یێن حزبی پشتی وی د وارێ دەسەلاتی و فەرمانان دهاتن، وان ژی سەرپەرشتیا کارێ حزبێ ل قەزایێن سەر ب پارێزگەهێ دکر[97]. سرۆشتێ حزبا بەعس یێ وەسان بوو بۆ ڤان رەنگە کاران ئەو کەسە ل پارێزگەهێن کوردی بەرێزاردکرن کو دلرەشترین و ب کەریترین کەس بن بەرامبەری نەتەوەیێ کورد، هەر بۆ نموونە (طارق کافي فليح العاني) وەك ئەمینداری گشتیێ لقێ حزبا بەعس ل دهۆکێ دانابوو و بۆ دەمەکێ درێژ ما ل دهۆکێ و خەلکێ پارێزگەهێ گەلەك نەخۆشی و سەرەدەریا نەمرۆڤانە ژ دەست سیاسەتا وی یا رەگەزپەرستانە دیتن[98]. ل سەر ڤێ بنیاتی و ژ ئەنجامێ ڤان سەرەدەریان حزبا بەعس تاکە حزبا ئاشکرا بوو ل پارێزگەهێ.

ب مەرەما خاپاندنا خەلکی و درووستکرنا باوەریێ ل جەم وان کو ئازادیا سیاسی و فرەحزبی ل عیراقێ هەیە حزبا بەعس سیاسەتەکا دی گرتە بەر ئەو ژی دروستکرنا حزبێن کارتونیێن کوردی بوو وەك پارتی شۆرشگێری کوردستان، پارتی دیموکراتی کوردستانا کارتونی و بزوتنەوەی پێشکەوتنخوازانی کورد، بەلێ د راستیدا دەزگەهێن ئەمنێ هەوالگری سەرپەرشتیا ڤان حزبان دکر و سنوورێ چالاکیێن وان یێن حزبی ژ دیوارێن ئاڤاهیێ وان دەرباس نەدبوون[99].

سەرەرای هندێ کو ڤان حزبان بارەگا ل دهۆکێ هەبوون، بەلێ ل سەرانسەری پارێزگەهێن کوردستانێ چ چالاکیێن حزبی نەبوون، بەعسیان ب خۆ ژی ئەڤ چەندە د بەلگەنامەکا نهێنیدا تەکەز کریە کو چالاکیێن وان د سنووردای تنێ چەند کۆمبوونەکن و نکارن باندۆرێ ل سەر سەروبەری و ناڤەندێن جڤاکی بکەن[100]. ئەحمەدێ زەرۆ ڤەدگێریت: دەمێ وی عەبدولسەتار تاهر شەریف سکرتێرێ پارتی شۆرشگێری کوردستان ل بەغدا دیتی پرسیارا هژمارا ئەندامان و قەبارێ رێکخستنێن حزبا وی ژێکر، د بەرسڤێدا بۆ دیارکر کو هەموو ئەندامێن وان ئەوون ئەوێن د ڤێ توومارێدا ئەو توومار ل ژوورا وی بوو و نیشا ئەحمەدێ زەرۆ دا دیت هژمارا وان گەلەکا کێمە و ژ بلی ئەوێن د توومارێدا وان چ ئەندامێن دی نەبوون[101]. گەلەك جاران چێبوویە کەسەکی سەرەدانا بارەگایەکێ وان حزبان کریە دەمێ دەرگەهـ قوتای دەرگەهـ لێ نەهاتیەڤەکرن ژبەرکو کەسەك تێڤەنەبوویە دەرگەهی ڤەکەت[102].

هندی پەیوەندی ب حزبێن کوردستانێ یێن راستەقینە و ئەوێن نوونەراتیا خەلکێ کوردستانێ دکر و یێن خودان جەماوەر، ئەڤ حزبە سەرەرای کاودانێ ئەو ب خۆ ژ ئەنجامێ پێکهاتنا جەزائیرێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ تێدا دژیان، هەردەم ل ژێر زێرەڤانیا رەشەك و زێرەڤانێن حکۆمەتا بەعسی بوون و ل هەر جهەکی هەست ب چالاکی یان بوونەکا وان هاتبا کرن دەملدەست ب درندەترین شێوە سەرەدەری دگەلدا دهاتەکرن، د ڤێ قۆناغێدا تنێ حزبا شیوعیا عیراقی کو ژ سالا ١٩٧٣ێڤە د بەرەیێ نیشتمانییێ عیراقیدا بوو و پشکداربوو د جڤاتا وەزیرێن عیراقێدا هەتا سالا ١٩٧٧ێ هندەك چالاکی هەبوون، ئەو ژی د ڤێ سالێدا کەتە بەر دژایەتیا حزبا بەعس و دەزگەهێن ئەمنی و هەوالگری و ئەندامێن وێ هاتنەگرتن و زیندانیکرن و کەتنە بەر توندترین سزایێن بەعسیان، د ڤی سەروبەریدا هەموو حزبێن کوردستانی گەلەك ب هشیار و ب نهێنییەکا زۆر و دوور ژ چاڤێن دەسەلاتی چالاکیێن خۆیێن حزبی ئەنجامددان.

پارتی دیموکراتی کوردستان یا خودان دیرۆکەکا کەڤن و خەباتەکا دوور و درێژ هەتا سالا ١٩٧٥ێ سەرکردایەتیا شۆرشا کوردستانێ دکر و پتر ژ هەموو حزبێن دی بوونا خۆ ل سەر گۆرەپانا کوردستانێ هەبوو، بەلێ ئەو ژی ژ ئەنجامێ پێکهاتنا جەزائیرێ تووشی شکەستنێ بوو و بۆ دەمەکێ کورت هەتا ئاستەکی ژ گورەپانێ دوورکەت هەتا ل داوییا سالا ١٩٧٥ێ هندەك ژ کادر و سەرکردەیێن

شۆرشا ئەیلوولێ بەرهەڤی بۆ سەرژنوو ڤەژاندنا پارتی و دروستکرنەڤا رێکخستنێن وێ و پێکئینانا رێکخستن و شانەیێن نهێنی کرین، ئەڤە ژی وەك بەرسڤدانەکێ بوو بۆ نسکۆیا ئادارا ١٩٧٥ێ و پەیامەك ژی بوو بۆ حکۆمەتا بەعسی کو شۆرشا کوردستانێ یا بەردەوامە و شەهید مەحموود غلبیشی، وەحید ساعاتی و مستەفا مزووری ل پارێزگەها دهۆکێ ل پێشییا وان کادران بێن دەست ب خەباتا چەکداری و نهێنی کری[١٠٣].

پەیکەرێ رێکخستنا پارتی ل دووڤ پەیرەوێ ناڤخۆیی ژ شانا بنەکی پێکدهات کو ب مەرەما پاراستنا نهێنیا کاری نە دبوو ژ سێ کەسان پتر بیت و ئەندامێن هەر شانەکێ ئەندامێن شانا دیتر نە د ناسین، هەر (٥- ٨) شانێن بنەکی د بوونە شانەکا سەرەکی و پێنج شانێن سەرەکی دبوونە رێکخراوەك و کۆمەکا رێکخراوان د بوونە لیژنا ناوچەی و چەند لیژنە دبوونە لقێ حزبێ، هژمارەکا دیارکری بۆ شانە و رێکخراوان نەبوو، ل دووڤ کاودان و سەروبەری جار زێدە دبوون و جار ژی کێم[١٠٤].

شارەزاییا رێکخستنێن پارتی د کارێ رێکخستنێدا د ڤێ قۆناغێدا کو قۆناغا نووژەنکرنێ و زیندووکرنەڤا رێکخستنا پارتی یا کێم بوو، ئەڤە ژی خالا هەرە لاوازا وان بوو و هەر ئەڤە بۆ ئەگەرێ هندێ سازیێن ئەمنا عیراقی جهێ خۆ د ناڤدا بکەن و وان رێکخستنان ئاشکرا بکەن[١٠٥]. یەکەمین رێکخستنا پارتی د ڤێ قۆناغێدا هاتییەگرتن تۆڕا محەمەد سەدیق هروری بوو[١٠٦]. دادگەهێن عەسکەری ل کەرکووکێ بۆ دادگەهکرنا ئەندامێن گرتیێن رێکخستنێن حزبێن کوردی هەبوو وێ دادگەهێ حوکمێ سێدارەدانێ ل سەر گەلەك ژ وان جێبەجێ دکر، و کێمترین حوکمێ ل سەر وان د سەپاند پێنج سالێن زیندانێ بوون.

قوتابیێن خواندنگەهان ب تایبەت دوا ناڤنجییا برایەتی رۆلەك گرنگ د رێکخستنێن پارتی یێن وی سەردەمیدا هەبوو، ب مۆرالەکا بلند و باوەریەکا موکمڤە د چوونە د رێزێن رێکخستناندا و قەبی هەر روودانەکا ژ نشکەکێڤە و هەر کاودانەکێ دژوار دخواست، ل ئاستەکی هندەك کچان ژی پشکداری د ڤان رێکخستنێن نهێنیدا دکر هەرچەندە شانەیێن تایبەت ب وان نەبوون[١٠٧].

بەلاڤکرنا بەلاڤۆکێن پارتایەتی، نڤیسینا دروشمان ل سەر دیوارێن ئاڤاهیێن حکۆمەتێ، بەرهەڤی و پلاندانان بۆ خۆنیشادانان و ڤەژاندنا هەلکەفت و بیرەوەریێن نەتەوەیی و نیشتمانی ژ گرنگترین ئەرکێن ڤان رێکخستنان بوون، بۆ ئەنجامدانا ڤان ئەرکان ژی هەڤکاری دگەل مەفرەزەیێن پێشمەرگەی ل دەرڤەی باژێری دکرن و پێشمەرگەی پەیمان دابوو رێکخستنا د دەمێ خۆنیشادانان ب مەرەما بلندکرنا مۆرالا خۆنیشادەران ئەو خۆ نێزیکێ باژێری بکەن و کریارێن لەشکەری دژی بارەگا و بنگەهێن حکۆمەتێ ئەنجام بدەن، ئەڤ رێکخستنە ل پشت هژمارا هەرە مەزنا ڤان خۆنیشادانان ب تایبەت خۆنیشادانێن قوتابییان بوون[١٠٨].

شکەستنا شۆرشا کوردستانێ ل ئادارا ١٩٧٥ێ هند کاریگەری ل سەر رێکخستنێن حزبا شیوعییا عیراقی ل دهۆکێ نەبوو، ژبەرکو ئەو حزبەکا خوەدی موولەت و وی دەمی دگەل حزبا بەعس د بەرەیەکیدا بوون، ژبەر ڤێ چەندێ ئەو تاکە لایەن بوون پشتی حزبا بەعس بوونا خۆ ل سەر گورەپانا باژێری هەی، وان بارەگایەك ل تاخێ گرێ باسێ هەبوو کو لیژنا ناوچا دهۆکێ یا حزبا شیوعی بوو[١٠٩]. بەلێ ل سالا ١٩٧٧ێ ئالۆزی کەتە ناڤبەرا حزبا بەعس و حزبا شیوعی ژی و دەزگەهێ ئەمن و هەوالگریێن عیراقێ دەست ب لێدان و گرتن و ژناڤبرنا هەموو شیوعییان ل پارێزگەهان کر و بارەگایێن وان گرتن و د ئەنجامدا حزبا شیوعی ژی ناچار پەنا ببەتە بەرچیایێن کوردستانێ و رێکخستنێن نهێنی ل ناڤ باژێران[١١٠]. پەیکەرێ رێکخستنێ یێ وێ حزبێ ژ شانا بنەکی دەسپێدکر و کۆمەکا شانێن بنەکی دبوونە لیژنا بنیاتی (لجنة القاعدة) و چەند لیژنێن بنیاتی دبوونە لیژنا قەزایێ (لجنة القضاء) و چەند لیژنەکێن قەزایێ دبوونە لیژنا ناوچەی و پشتی وێ ژی لیژنا مەرکەزی و دووڤرا ژی لیژنا هەرێمێ (لجنة

الأقليم) دهات. رێکخستنا ڤێ حزبێ ل سەر بنیاتەك پیشەیی هاتبوو رێکخستن وەك شانەیێن تایبەت ب قوتابییان، یێن تایبەت ب پالەیان و یێن ژنان و مامۆستایان هەبوون[111].

ئامادەییا کاوە و هەردو خانەیێن مامۆستایان یێن کوران و کچان جهێن سەرەکییێن رێکخستنێن حزبا شیوعی بوون، بەلاڤکرنا وان بەلاڤۆکان یێن چالاکییێن پێشمەرگەی تێدا دهاتنەبەلاڤکرن ژ گرنگترین چالاکییێن ڤان رێکخستنان بوون، بەلاڤۆکەکا تایبەت ژ سالا ١٩٨٢یڤە ب ناڤێ (الپیشمەرگە) د هەشت بەرپەراندا ژ ئالیێ حزبا شیوعیيا عیراقی ڤە دهاتەبەلاڤکرن[112].

یەکێتی نیشتمانی کوردستان یەك ژ وان حزبان بوو یێن د وی سەردەمیدا بوونا خۆ ل دەڤەرێ هەی، ژ رۆژا دامەزراندنا وێ ڤە ل ١ حزیرانا ١٩٧٥ێ ژ ئالیێ دەمەزرێنەرێ وێ ڤە جەلال تالەبانی کار بۆ وێ چەندێ دکر رێکخستنێن خۆ بگەهینەتە دەڤەرا بەهدینان و پەیوەندی ب هندەك کەسایەتیێن دەڤەرێڤەکر و بۆ ڤێ مەرەمێ ژێ خواست بێنە شامێ (دیمەشقێ)، عەبدولغەنی ئیبراهیم (یەك ژ کەسایەتیێن زاخۆ) ژ وان کەسان بوو یێن چووینە شامێ و هاتەدامەزراندن بۆ کارێ رێکخستنا وێ حزبێ ل دەڤەرا بەهدینان و یەکەمین لیژنا وێ حزبێ کو لیژنا بەهدینان بوو ل سالا ١٩٧٥ێ ل قامیشلو دامەزراند، یەکەمین مەفرەزا پێشمەرگەیێن یەکێتی نیشتمانی کوردستان ل ١ حزیرانا ١٩٧٦ێ کو ژ (٤١) کەسان پێکهاتبوو گەهشتە دەڤەرێ و مەرەم ژ هاتنا وان بەلاڤکرنا رێکخستنێن یەکێتیێ ل بەهدینان و بەرهەڤی بوو بۆ شۆرشێ دژی رژێما بەعسی[113]. دەربارەی رێکخستنێن ڤێ حزبێ هندی بێژی نهێنی بوون و رژێم نەشیا تۆرەکێ ژ رێکخستنێن وان ئاشکرا بکەت، ئەرکێ ڤان رێکخستنا زێدەباری بەلاڤکرن و هەلاویستنا پۆستەر و بەلاڤۆکان، ساناهیکرنا کار و ئەرکێن پێشمەرگەی و گەهاندنا دەنگوباسێن حکومەتێ بۆ وان بوو بەری ب هەر کریارەکا لەشکەری دژی حکومەتێ رابن، دەنگوباسێن پێشمەرگەی د رێکا بەلاڤۆکا (الشرارة) و ئێزگێ (دەنگی گەلی کوردستان) را دگەهشتنە رێکخستنێن یەکێتیێ[114].

هندی پەیوەندی ب رەوتێن ئیسلامیڤە ل دەڤەرێ هەی قۆناغا ناڤبەرا ١٩٧٥-١٩٩١ێ سەردەمێ پەیدابوونا دروستا وان بوو ل دەڤەرێ.

نێزیکییا دهۆکێ ژ باژێرێ مووسلێ ڤە کاریگەرییا خۆ هەبوو ل سەر بەلاڤبوونا هزرێن ئیسلاما سیاسی ل دەڤەرێ ژبەرکو مووسل یەك ژ مەلبەندێن مەزنێن هزرێن ئیسلامی بوو ب تایبەت رەوتێ ئەخوانان (اخوان المسلمين)، هەتا بەری سالا ١٩٧٥ێ هندەك کەسایەتی ل دهۆکێ هەبوون گرێدای هزرا ئەخوانان بوون[115]. بەلێ پشتی سالا ١٩٧٦ێ هندەك کۆم پەیدابوون کو ل ژێر باندۆرا هزرێن ئەخوانان بوون، ڤان کۆمان ل مزگەفتان دەست ب کارێ خۆ کرن و گرنگی ب پێکئینانا بازنەیێن فێرکرن و خواندنا قورئانێ و بەلاڤکرنا باوەریێ (العقيدة) و یەکتاپەرستیێ (التوحيد) و مژارێن تایبەت ب بانگخوازیێ دکرن و ژڤان کۆمان بنیاتێن رێکخستنێن خۆ پێکئینان، ب تایبەت ژێ پشتی کو ژ مزگەفتان هاتنیە دوورێخستن ئەو بوو ل شەڤا ١٧ رەمەزانا ١٩٧٩ێ ل مالەکێ کۆمبوون و باوەری (موبايعه) دا بەرپرسێ خۆیێ مەزن[116] و دامەزراندنا (منظمة الأنصار الإسلامية) راگەهاندن و بۆ خۆ ناڤێن نهێنی دانان و ئابوونەیێن حزبی ژ ئەندامێن خۆ وەرگرتن (هژمارا وان ٣٠ ئەندام بوون)، ئەڤ کۆمە د ئاگادار بوون ل سەر بوونا هندەك کۆمێن دی یێن ل ژێر کاریگەرییا هزرێن ئیسلامی ل باژێری، بەلێ چ پەیوەندی و بهەڤرا گرێدان دگەل وان نەبوون[117].

هەرئێکێ ژ ڤان کۆمان کۆمێن سەر ب خۆ ل قەزایێن سەر ب پارێزگەهێڤە هەبوون، ڤان کۆمان د رێکا دانا دەرسان ل مزگەفتان و خوتبێن رۆژا ئەینی یێن هندەك ئیمامان و خواندنا پەرتووکێن هزری و ئایینی کارێ خۆیێ رێکخستنێ ئەنجامددا، هەتا سالا ١٩٩١ێ ئەڤ کۆمە نە ب رێکا رێکخستنێ بەلێ ژ ئالیێ هزریڤە گرێدایی ئەخوانولموسلمین بوون[118].

# قەرێژێن سیاسەتا حزبا بەعس و کاریگەرییێن شەڕێ عیراقێ ئیرانێ ١٩٨٠- ١٩٨٨ ل دەڤەرێ

## ١- دەزگەهێ ئەمنی و گرتن و زیندانکرنێ

رژێما عیراقی دەزگەهێن ئەمنی یێن رەسمی وەسان دامەزراندبوون کو ئاسوویی و ستوونکی خۆ کێشا بوو ناڤ جڤاکێ عیراقی، ئەڤ دەزگەهە ژ ئالیێ کەسانێن سەر ب مالا سەدام حوسێنی ڤە دهاتنەرێڤەبرن و سەرێ هەموویان ژی دکەتە د دەستێن سەدام حسێنی ب خۆ، سازیێن ڤێ رێکخراوا ئەمنی ل دووڤ نووترین بنەمایێن ئەمنی هاتبوونەدامەزراندن و چاکترین ئامیرێن تەکنیکی بۆ وان هاتبوونە دابینکرن و باشترین پسپۆرێن ڤی واری سەرپەرشتییا کارێ وان دکر و رێنمایی ددانێ، د هەمان دەمدا ب مەرەما مەشقکرنێ ل سەر نووترین شێوازێن ئەمنی و سەرکوتکرنێ هژمارەکا مەزن ژ ئەفسەر و دەرەجەدارێن د ڤی دەزگەهیدا کار دکر هنارتبوونە وەلاتێن جودایێن جیهانێ. هەروەسان ئەڤ دەزگەهە ل سەر بنیاتێ تایبەتمەندیێ د کاریدا هاتبوونە دامەزراندن و چەندین سازیێن دی یێن تایبەتمەند د کاروبار و دووڤچوون و ڤەکۆلینێن گشتیدا پێڤە هاتبوونە گرێدان و ئەڤ سازییە ب کارێ دووڤچوون و ڤەکۆلینا بەلگەنامەیان وشرۆڤەکرنا وان و بەرچاڤکرنا ئەنجامان رادبوون، بەردەوام ژی ڤی دەزگەهێ ئەمنی راپۆرتێن دەوری راستەخۆ ددانە سەدام حسێنی، ب ڤی رەنگی ل دووڤ هەموو رەنگێن هەلسەنگاندن و بنەمایێن ناڤدەولەتی عیراق وەك دەولەتا پۆلیسی و سیخوری و بارەکێ گران ل سەر وەلاتییان دهاتەنیاسین[١١٩].

یەك ژ وان دەزگەهێن ئەمنی رێڤەبەریا گشتییا ئەمنێ (مديرية الأمن العام) بوو، مەزنترین و گرنگترین سازیا ئەمنی یا سەدام حسێنی بوو و ب سەرەدەریا خۆ دگەل خەلکی ژ هەموو سازیێن دیتر درندەتر و دژوار تر بوو، هۆڤترین و زۆردارترین ئالیکر و زرتەکێن سەدامی ب خۆڤە دگرت، ئەڤ رێڤەبەرییە ژ رێڤەبەریا گشتی و دووڤرا رێڤەبەریێن ئەمنێ ل پارێزگەهان و پاشتر ژی فەرمانگەهێن ئەمنێ ل باژێرێن دیترێن عیراقێ و پاشتر تر ژی مەلبەندێن ئەمنێ ل قەزا و ناحیان پێکدهات، هژمارا کارمەندێن ئەمنێ ل عیراقێ ژ (٨٠٠٠) کەسان دبۆری، د ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٧٩ێ رێڤەبەرێ گشتیێ ئەمنێ عەبدولخالق محەمەد بوو ئەو ب خۆ سالێن شێستان هاریکارێ بنکەهێ پۆلیسێن (معاون شرطة) ئامێدیێ بوو، ل سالا ١٩٧٩- ١٩٨٣ێ (فاضل البراك التكريتي) بوو رێڤەبەرێ گشتیێ ئەمنێ و پشتی وی ژی سەبعاوی ئیبراهیم ئەلتکریتی ئەڤ پلەیە وەرگرت[١٢٠].

ل دووڤ قانوونا پارێزگەهێن عیراقی، پارێزگار کەسێ ئێکێ یێ بەرپرسە ژ پاراستنا تەناهی و سەروبەری ل پارێزگەهێ، ب ڤێ چەندی هەموو فەرمانگەهێن ئەمنێ و پاراستنا تەناهیێ دڤێت ل ژێر دەسەلاتێ وی بن[١٢١]. بەلێ رژێمێ ب مەرەما وێ چەندێ کو دەسەلاتەکێ بەرفرەهتر بدەتە دەزگەهێن ئەمنێ و داکو هەردەنگەکێ نەرازی ل پارێزگەهێ دەملدەست کپ بکەن و ژناڤببەن ل رۆژا ٩ شباتا ١٩٨٢ێ سەدام حسێنی بریاردا هەموو رێڤەبەریێن ئەمنێ ل پارێزگەهان راستەوخۆ سەر ب رێڤەبەریا گشتی یا ئەمنێ ڤە بن و پارێزگاری ب کریار چ دەسەلات ل سەر ڤێ دەزگەهێ نەبیت[١٢٢].

ئاڤاهیێ رێڤەبەریا ئەمنا دهۆکێ ل دەسپێکێ یێ فەرمانگەها چارەکرنا چاندنێ (دائرة الإصلاح الزراعي) بوو و ب رەخ وێ ڤە ئاڤاهیێ رێڤەبەریا چارەکرنا چاندنێ (مديرية الإصلاح الزراعي) بوو، ب پێکهاتنەکا ناڤبەرا رێڤەبەرێ ئەمنا دهۆکێ و رێڤەبەرێ چارەکرنا چاندنێ ل دەسپێکا سالێن حەفتییان مولکیەتا ڤی ئاڤاهی ژ وەزارەتا چارەکرنا چاندنێ هاتە ڤەگوهاستن بۆ وەزارەتا ناڤخۆیی. پارێزگەها دهۆکێ ژی وەك گشت پارێزگەهێن دیتر نە ل مەلبەندێ پارێزگەهێ نە ژی باژێر و باژێرکێن پارێزگەهێ یا ڤالا نەبوو ژ بنکەهێن ئەمنی یێن رژێمێ

و مەرەم ژ ڤان بنگەهان موكمكرنا بنیاتێ رژێمێ بوو ل وان جهان و كپكرنا هەردەنگەكێ نەرازی بەرامبەر كریارێن حكۆمەتێ بوو، حكۆمەتا بەعسی پاشەرۆژا خۆ ب ڤان دەزگەهانڤە گرێدا بوو لەوما ژی بێ منەت پارە د ڤی واریدا و سەخمەرەت كرینا كەسانێن بێ باوەر و دەروونزم و مەشقپێكرنا كرێگرتی و چاڤساخێن خۆ بۆ نڤیسینا راپۆرتێن سیخۆراتییێ ل سەر خەلكێ و كۆمكرنا زانیاریان ژ ناڤ جڤاكی و گوهداریكرن و زێرەڤانیكرنا هەر كەسەكی چ د ناڤ سوپایێ عیراقێدا بیت یان د ناڤ فەرمانگەهـ و تاخێن مللی و چایخانە و جهێن دیتردا[١٢٣]. ل پارێزگەها دهۆكێ ژی پلانەكا ئەمنییا رێك و پێك و بنەجهـ هاتەبجهئینان، رێڤەبەرییەكا ئەمنێ یا خوەدی هەموو زیندان و سەرداب و ڤولاچكێن تاری و تاكەكەسی هاتەئاڤاكرن، میلاكەك پڕی كەسێن دڕندە و خوینرێژ دگەل هەموو ئامراز و ئامیرێن ئەشكەنجەدان و ئێشاندنا مرۆڤان و چەكێن پێدڤێ بۆ كوشتن و تیرۆركرنا خەلكی بۆ هاتنەدابینكرن. رێڤەبەریا ئەمنێ ل باژێرێ دهۆكێ پرمەترسیترین دەزگەهێ حكۆمەتێ بوو ل دهۆكێ د هەمان دەمدا ژی گرنگترین سازییا دەولەتێ بوو بۆ رژێمی، بنگەهێ چالاكی و لڤین و كریارێن وان بوو، رووبەرەكێ مەزنێ عەردی ڤەگرتبوو و پڕی جهێن ئەشكەنجەدان و زیندانكرنێ بوو، د هەمان دەمدا دیوارەكێ ئاسێ و قاهیمێ هنداڤی باژێری ب خوڤە دگرت، هەرچەندە وەك ئاڤاهی دەمێ دهاتەدیتن وەك جهەكێ تەنا و بێ بەلا بوو، بەلێ ب كریار جهەكێ پڕی نەخۆشی و دژواری و ئێش و زێدەگاڤییا سەر نامووسێ بوو[١٢٤].

## ٢- ب لەشكەریكرنا (عسكرة) جڤاكی

رژێما عیراقی مەزنترین شیان و سامان مەزاختن دا كو عیراق دەولەتەكا خوەدی لەشكەرەكێ مودرێن و ب باشترین شێوە هاتبیتە مەشقدان، نووترین رەنگێن چەكی و چەكێ كۆمكوژ و شیانێن لەشكەرێ ئێخستنە د خزمەتا ڤی لەشكەریدا، نە تنێ خەم ژ چەكێن بەرگریكرنێ ژ خۆ دخوار، بەلكی ل چەكێن هێرشكرنێ و ڤەگرتنا وەلاتێن عەرەبێن دیتر و هەر وەلاتەكێ تاگرییا خۆ بۆ خاكێ عەرەبان دیاردكەت دگەرییا و دابیندكر، نە تنێ سیاسەتا حزبا بەعس د وێ چەندێدا بوو كو لەشكەرەكێ مدرێن و پڕ چەك و خوەدی نووترین و باشترین چەك ئاڤابكەت بەلكی كار بۆ وێ چەندێ دكر جڤاكەكی لەشكەری و خوەدی هزرەكا لەشكەری ئاڤابكەت كو هەر دەمێ رژێمێ ژێ خواست بێ بەرهەڤبیت بۆ هەر كریارەكا لەشكەری سەخمەرات بجهئینا ڤیان و تەماعكارییێن داگیركاری و بەرفرەهكرنا دەسەلاتی یێن سەدام حسێنی[١٢٥].

پشكەكا مەزن ژ سیاسەتا حزبا بەعس بۆ ب لەشكەریكرنا جڤاكێ عیراقی بەر گەلێ كورد دكەفت، چ ئەڤ گەلە ببیتە ئارمانجێ ڤی لەشكەری و چەكێ وی یێ گران، چ كورد ب خۆ ببنە پشكەك ژ ڤی لەشكەری و ئامرازێ دەستێ سەدامی بۆ بجهئینانا ئارمانجێن وی یێن داگیركاری و بەرفرەهكرنا دەسەلاتێ وی یێ ستەمكار، بێی كو كوردان نە ژ دوور و نە ژ نێزیك مفایەك د ڤێ سیاسەتا وی دا هەبیت.

سیستەمێ لەشكەرییا ب زۆری (التجنيد الإجباري) وەك هەموو خەلكێ عیراقێ ژ كوردان ژی دگرت، سەرباز و ئەفسەر و دەرەجەدارێن كورد د لەشكەرێ عیراقێدا هەبوون، بەلێ د هەمان دەمدا كورد جهێ گومانێ بوون ژ ئالیێ دەسەلاتێڤە، بۆ كوردان نەبوو ل كولیژا لەشكەری یان فرۆكەڤانی بێنەوەرگرتن كتەكا زۆر كێم نەبیت ئەو ژی كرێگرتی و ئالیكرێن رژێمێ[١٢٦].

ب هـزاران ژ كورێن پارێزگەها دهۆكێ وەك پشكەك ژ لەشكەرێ عیراقێ پشكداری د شەرێ عیراق- ئیرانێ دا كرن، د ئەنجامدا گەلەك ژ وان بوونە قوربانی، زێدەباری ڤێ پشكدارییێ پێویست بوو ل سەر تەخ و جوینێن خەلكێ پارێزگەهێ پشكدارێ د رێزێن لەشكەرێ میللی (الجيش الشعبي)دا بكەن، دەسپێكا دامەزراندنا ڤی لەشكەری ل سالا ١٩٧٠ێ بوو ب سەرپەرشتییا حزبا بەعس ب مەرەما مەشقپێكرنا كادرێ حزبی و نە حزبی و دەولەمەندكرنا وان ب زانیارێن لەشكەری ئەڤە ژی ل سەر بۆدجا هێزێن لەشكەری بوو، هەر وەسان ل نیڤا دووێ ژ

سالێن حەفتییان، مەشقێن سەربازی ب جلكێن سەربازی ب خویندكارێن قۆناغا ئامادەیی ژی دكرن ل ژێر ناڤێ (الفتوة)[١٢٧]، د دەمەكیدا كو وی دەمی هژمارا لەشكەرێ عیراقێ یێ فەرمی نێزیكی (٢٥٠) هزار كەسان بوو، ل بەراهیێ و ل سەر ئاستەكێ بەرفرەهـ لەشكەرێ مللی نە هێزەكا لەشكەریا كاریگەر و شەركەر بوو ژبەركو ئارمانج ژ دامەزراندنا وی پاراستنا سازی و ئاڤاهیێن مەدەنی بوو ل باژێران دەمێ لەشكەرێ دەولەتێ ل بەرۆكێن شەری مژوول دبیت[١٢٨].

پشتی بۆرینا چەند سالان ل سەر شەرێ عیراق - ئیرانی و دیاربوونا نیشانێن لاوازی و كێم شیانێ د لەشكەرێ عیراقیدا و رەڤینا هژمارەكا زۆر ژ لەشكەر و دەرجەدارێن كورد ژ لەشكەرێ عیراقێ و گەهشتنا وان بۆ ناڤ رێزێن پێشمەرگەیێ كوردستانێ ل دەڤەرێن رزگاركری، دەلیڤەكا هاریكار بۆ سەرۆكعەشیرەتێن كوردان هەلكەت دا ب رێكا پێكئینانا بەتالیۆنێن سڤك (الأفواج الخفيفة) و بەتالیۆنێن بەرگری نیشتمانی (أفواج الدفاع الوطني) جارەكا دی جهێ پێ خۆ قاهیم كەن و ژ سەنگا خۆ د ناڤ جڤاكی و ل جەم حكۆمەتێ زێدەكەن، پشتی سالا ١٩٨٣ێ هژمارا ڤان بەتالیۆنان گەهشتە (٥٠٠) بەتالیۆنان ئەو ژی پشتی كو حكۆمەتێ رێك دایە كوردان ل شوونا لەشكەریا زۆری پشكداریێ د ڤان بەتالیۆناندا بكەن، یان ژی د سریێن رێكخستی دا (السرايا المرتبة)، كو پێكدهاتن ژ وان كوردێن ژ سەربازیێ د رەڤین، لێ ل ڤێرە ل ژێر فەرماندەیا ئەفسەرێن عیراقی دا بوون و ب جلكێن سەربازی و خزمەتا وان هەر دناڤ كوردستانێ دا بوو[١٢٩]. ب ڤێ چەندێ ژی حكۆمەت شیا هەتا ئاستەكی نەهێلیت ب هزاران گەنجێن كورد بكەهنە ناڤ رێزێن پێشمەرگەی ل دەڤەرێن چیایێن دۆر ژ دەسەلاتێ حكۆمەتێ و د هەمان دەمدا داهاتەكێ دراڤیێ بێ ماندووبوون بۆ سەرۆكعەشیرەتان دابینكر و رێكا دەولەمەندبوونەكا بێ كەد و رەنج ل بەر وان ڤەكر[١٣٠]، ئەڤە ژی ئەگەرێ هندێ بوو پرانییا سەرۆكعەشیرەت و ئاغایێن دهۆكێ پشكداری د دامەزراندنا بەتالیۆنێن بەرگریا نیشتمانیدا كر. هندی خەلكێ ئاسایی بوون وان خۆ ددیت ناچارن پشكداریێ د ڤان بەتالیۆناندا بكەن كو چ نەبیت ژ بەلا پشكداریێ د شەرێ عیراقێ و ئیرانێ بینەپاراستن و گیانێ وانێ سلامەت بیت.

پشكداریا ڤان كەسێن ئاسایی د پێكهاتێن ڤان بەتالیۆناندا و هەلگرتنا چەكی بۆ رژێمێ نە نیشانا هندێ یە كو ئەڤ كەسە دگەل رژێمێ بوون و دژی پێشمەرگەی بوون[١٣١]، بەلكی حكۆمەتێ ب خۆ ژی زۆربەی جاران گومان ل سەر تاگریا وان هەبوو، بەلگە ژی ل سەر ڤێ گۆتنێ ئەوە حكۆمەتێ ب خۆ نڤیسارەك ئاراستەی پێكهاتا هەوالگری یا دەڤەرا باكوور- سەنتەرێ هەوالگریا دهۆكێ (منظومة أستخبارات المنطقة الشمالية- مركز أستخبارات دهوك) كریوو و تێدا (١٥) خالێن نەرێنی ژ نەرێنییێن پێكئینانا ڤان بەتالیۆنان بەرچاڤكریوون، گرنگترین وان نەرێنییێن بەرچاڤكری كو ئاماژە دابوو وێ چەندێ كو هندەك ژ چەك و تەقەمەنیێ ڤان بەتالیۆنان دگەهیتە هێزێن پێشمەرگەی[١٣٢]. ب هەر رەنگەكێ هەبیت دامەزراندنا بەتالیۆنێن بەرگری نیشتمانی ئێك ژ دیاردەیێن هەرە نەرێنییە د مێژووا كوردان‌دا د سالێن شەرێ ئیرانی- عیراقێدا، ئەو ژی ژ ئەگەرێ لەزاتییا بەلاڤبوونا ڤێ دیاردەیێ و پشكداریا بەرفرەها وێ د وێرانكرنا كوردستانێدا، د هەمان دەمدا ڤان بەتالیۆنان هەتا ئاستەكێ مەزن پشتیێ حكۆمەتێ ل بەرۆكێن شەری دگەل ئیرانێ سڤككر[١٣٣].

## ٣- ب عەرەبكرن (تعريب) و ڤەگوهاستنا خەلكی و كۆمەلگەهێن ب زۆری

دگەل شكەستنا شۆرشا كوردستانێ رژێمێ ب هەموو رەنگان كار كر كو مفای ژ ڤێ دەلیڤێ وەرگریت و هەموو پێرابوونێن پێویست بگریتە

بەر دا رێكێ ل وێ چەندێ بگریت جارەكا دی بزاڤا رزگاریخوازیا كوردی یا چەكدار سەرهلدەتەڤە، بۆ ڤێ مەرەمێ ژی دو پلانێن سەرەكی گرتنە بەر:

١- دووركرنا كوردان ژ وارێ باب و باپیرێن وان و ڤەگوهاستنا ب زۆری و كۆچپێكرنا وان بۆ دەڤەرێن ناڤەراست و ژێرێ عیراقێ.

٢- چێكرنا پشتێنەكا تەناهیێ ل سەر سنوورێن ئیرانێ و تركیا ب كووراتیا (١٥- ٢٥)كم و درێژیا (٨٠٠)كم دا كو ببیتە رێگر د پەیوەندیا كوردێن عیراقێ دگەل یێن ئیرانێ و تركیا[١٣٤].

دەسەلاتدارێن رژێمی دەست ب بجهئینانا پلانا خۆ كر ب ڤەگوهاستنا ب زۆریا كوردان ژ دەڤەرێن وان و ئەڤ پلانە ب رەنگەكێ هند بەرفرەهـ هاتەبجهئینان رووبەرێ دەڤەرێن كۆچپێكرنێ ژێ گرتی گەهشتە رووبەرێ هەموو دەولەتا لبنانێ[١٣٥].

هندیكە پارێزگەها دهۆكێ یە ب دروستی ل رۆژا ٨ كانوونا دووێ ١٩٧٦ێ لیستەك ب ناڤێن وان كەسان دەركەت ئەوێن كۆچپێكرنا ب زۆری بۆ ژێرێ عیراقێ ژێدگریت، هاتنەئاگاداركرن و پاشتر ب ترومبێلێن باری و ترومبێلێن لەشكەری هاتنەڤەگوهاستن بۆ پارێزگەهێن دیوانیێ، سەماوە، ناسریێ، حلە و كۆت[١٣٦]، گەلەك ژ وان ژ ئەنجامێ بلندیا پلەیێن گەرمێ و تێهن و برسێ مرن، ئەوێن مایی ژی ل جهێن بێ سەروبەر و كۆخ و كۆلكێن ب تاكێن داران هاتینەچێكرن دژیان، هەتا پشتی دەمەكی ئەو ب خۆ شیاین ب وی دراڤی یێ ژ ئەنجامێ كار و كرێكاریێ ل دەڤەرێن دەوروبەر دگەهشتە وان بۆ خۆ هندەك خانی ژ لبنێن ئاخێ چێكرن و تێڤە ڤەحەویان[١٣٧].

د هەمان دەمـدا حكۆمەتێ ل پارێزگەهێن كوردستانێ و ل وان دەڤـەران یێن دكەتنە سەر جادێن گشتی و ژێر كۆنترۆلا سوپا و دەزگەهێن ئەمنی و نێزیكی باژێران كۆمەلگەهـ ئاڤاكرن و ئەڤ كۆمەلگەهە مینا گوندێن مەزن بوون، خەلكێ چەند گوندەكان ب خۆڤەدگرت و ئەو خەلكە ب زۆری ژ گوندێن وان ڤەگوهاستن و ل وان كۆمەلگەهان ب كوتەكی ئاكنجیكرن و فەرمان دایێ ب هیچ رەنگەكی نابیت بچنە سەر گوند و مولكێن خۆ، هندەك جاران ژی گۆژمەكێ پارەی وەك قەرەبوو بەرامبەری مولك و خانیێن وان بۆ وان هاتەمەزاختن، بەلێ گۆژمە هندێ كێم بوو چ جهەك بۆ وان نەدگرت[١٣٨].

مەرەما سەرەكییا حكۆمەتا بەعسی ژ ئاڤاكرنا ڤان كۆمەلگەهان و ڤەگوهاستنا ب زۆریا خەلكی بۆ ناڤەراست و ژێرێ عیراقێ ئەو بوو كو بەردەوام ل ژێر كونترۆل و چاڤدێریا دەزگەهێن ئەمنی بن، ژبەركو پرۆژێ حزبا بەعس د بنیاتدا پرۆژەك ئەمنی- لەشكەری – سیاسی بوو مەرەم ژێ ژناڤبرنا بزاڤا رزگاریخوازا گەلێ كورد بوو و دا ب هیچ رەنگەكی چ رەنگێن هاریكاریێ نەگەهنە ڤێ بزاڤێ، د هەمان دەمدا د رێكا ڤان كۆمەلگەهان و ڤێ كۆچپێكرنا ب زۆری ئەڤ خەلكە مینا بارمتەیان بوون د دەستێ رژێمێ دا و چاوان وێ دڤیا دكرنە بەعسی و دئینانە ژێر خزمەتا لەشكەریدا[١٣٩].

هەروەك د خشتەیێ ژێریدا ناڤێن وان كۆمەلگەهان هاتین یێن ل هەردو پارێزگەهێن دهۆك و نەینەوا هاتینە ئاڤاكرن ئەو كوردە لێ ئاكنجیكرین یێن ب زۆری ژ سەر گوند و مولكێن وان هاتینەڤەگوهاستن د ناڤبەرا سالێن ١٩٧٦- ١٩٧٧ێ و هەر كۆمەلگەهەكی ب تێكرایی (١٠٠٠) خێزان ب خۆڤەدگرتن[١٤٠].

ب وێ مەرەمێ كوردستان ببیتە دەڤەرەكا نەتنێ ڤالا ژ مرۆڤان بەلكی ڤالا بیت ژ هەموو رەنگێن ژیانێ چ یا مرۆڤان بیت، یان یا گیانەوەران و رووەك شینكاتی بیت، حكۆمەتا عیراقێ د ناڤبەرا ١٩٧٥- ١٩٨٠ێ دۆرێن (٤٥٣) گوند و باژێركێن كوردستانێ سۆتن و ویرانكرن، كانیێن وان ب چیمەتووی پركرن، ب ملیونان دارێن بەردار و بێ بەر سۆتن و برین، زێدەباری ژناڤبرنا ب ملیونان سەرێن پەزی و كەوالی[١٤١]. هندی پەیوەندی ب باژێرانڤە هەی ئەڤا ب سەرێ گوندان هاتی بۆ ئەگەرێ وێ چەندێ ئاریشێن ئابووری و جڤاكی ل باژێران پتر لێ بهێن، هژمارەكا مەزن ژ خەلكی بەرێ خۆ دا باژێران، وەك باژێرەكێ خوەدی بزاڤێن ئابووری و كارگێری و خزمەتگوزاریێن جڤاكی بارا پترا ڤی خەلكی ژ دەڤەرێن جودایێن پارێزگەهێ

| قەزا دهۆکێ | قەزا زاخۆ | قەزا ئامێدیێ | قەزا ئاکرێ | قەزا شێخان |
|---|---|---|---|---|
| باگێرا | هێزاوا | قەدش | قەسرۆك | مرێبا |
| بەرۆشکێ* | دەرکار عەجەم | شێلادزێ | چرە | مەهەدێ |
| کۆرێت گاڤانا | تلکەبەر | دێرەلوك | کەلەکچی | باعەدرێ |
| فەیدیێ | باتیفا | کان و دێرا | چەمکورك | · |
| گرێ پانێ | بێگوڤا | سیریێ | | |
| | بێرسڤێ | | | |
| | دێرابوون | | | |
| | فێشخابوور | | | |

قەستا دهۆکێ کرن[١٤٢].

ژ ئەنجامێ ڤان پێرابوونێن حکۆمەتێ ئەنجامداین چ ڤەگوهاستن و کۆچپێکرنا ب زۆریا کوردان بیت ژ وار و جهێن وان و سۆتن و خرابکرنا گوندێن وان و ئاڤاکرنا کۆمەلگەهێن ئاکنجیکرنا ب زۆری بیت، ب ڤی رەنگی سەروبەرەکێ گونجای بۆ دەسپێکرنا کریارێن ب عەرەبکرنێ ئیناپێش، ئەو بوو چاڤێن مەزن و سەرۆکعەشیرەتێن عەرەبان ب پارەی تاریکرن داکو ئەو و عەشیرەتێن خۆ ژ ژێرێ عیراقێ بارکەن و بێن ل دەڤەرێن کوردان ئاکنجیببن و ژڤان دانێ کو حکۆمەت دێ هاریکاریا وان کەت و خانییان بۆ وان ئاڤاکەت[١٤٣]، بەرپرسێن بەعسییان د هندەك هەلکەفتاندا راگەهاند کو ئەو د بەرهەڤن ب ملیوونان کوردان ژ ناڤبەن دا کو دەڤەرێن وان بکەنە دەڤەرێن عەرەبیێن تەنا[١٤٤]، ل سەر ڤی بنیاتی هژمارێن مەزن ژ خێزانێن عەرەبان یێن چەکدارکری بەرهەڤکرن کو د چەند گەرەکاندا بێنە ڤەگوهاستن بۆ پارێزگەها دهۆکێ و ل دەشتا سلێڤانەییان یا پڕ خێر و بیر و قەزا سێمێلێ و دەوروبەرێن وێ بێنە ئاکنجیکرن[١٤٥]. هژمارا ڤان عەشیرەتان گەهشتە (٢٤) عەشیرەتان و گەلەك دەڤخۆشکرن و ساناهیکرن بۆ هاتنەبەرچاڤکرن وەك دانا عەردێ داگیرکرێ کوردان بۆ وان ب رووبەرێ (٨٠-١٦٠) دونەمێن عەردی بۆ هەر خێزانەکێ و تەرخانکرنا مووچەکێ هەیڤانە د ناڤبەرا (٣٠- ٥٠) دیناران بۆ هەر خێزانەکێ و دابەشکرنا ئاهێن خوارنێ و پێویستییێن دی ل سەر وان، و دابینکرنا هەموو ئامیر و کەرەستەیێن چاندنێ و تۆڤی و زبلی و دابەشکرنا پەزی ل سەر وان و کۆلانا چەندین بیران ل جهێن ئەو لێ ئاکنجیدبن بۆ ئاڤدانێ و ڤەکرنا بارەگایێن حزبا بەعس ل جهێن وان و دابینکرنا تەناهیێ بۆ وان ل دەڤەرێ وەك دامەزراندنا چەندین رەبیعەیێن لەشکەری ل دۆرێن وان و چەکدارکرنا هەرئێك ژ وان یێ بکاریت چەکی هەلگریت[١٤٦].

ئەڤە ژی ناڤێن هژمارەکا گوندێن کوردانە ل دەڤەرا سلێڤانەییان یێن هاتینە ب عەرەبکرن دگەل هژمارا خانییان و ناڤێن عەشیرەتێن عەرەبان یێن هاتینەئاکنجیکرن[١٤٧].

هەروەسان کریارا ب عەرەبکرنی دەڤەرێن دی ل ئاکرێ و شێخان ڤەگرتن، ئەو بوو جڤاتا سەرکردایەتییا شۆرشێ (مجلس قيادة الثورة) ب بریارەکێ ل ١٦ ئادارا ١٩٧٨ێ دەڤەرێن سەر ب قەزا شێخان دانە بەر ب عەرەبکرنێ و ئەرکێ عەرەبێن ڤی جهی نە تنێ ب عەرەبکرنا دەڤەرێ بوو، بەلکی ب ئەرکێ پاراستنا ئێمناهی و تەناهییا دەڤەرێ ژی هاتبوونە راسپاردن[١٤٨]. گومان تێدا نینە کو مەرەما دەسەلاتێ ژ پاراستنا ئێمناهی و تەناهییا دەڤەرێ پاراستنا وێ بوو ژ خودانێن وێ یێن رەسەن یێن ب زۆری

| ز | ناڤێ گوندی | ناڤێ نوو | ژ-خانییان | عەشیرەتێن عەرەبان یێن هاتینەئاکنجیکرن |
|---|---|---|---|---|
| -١ | سەرشور | جبور | ٢٢٠ | جبۆری |
| -٢ | موقبلێ | المنصور | ١٠٠ | شەرابی، حەدیدی |
| -٣ | باستکێ | الصدیق | ٩٦ | سنی، طیاوی، ئەلعوبەیدی |
| -٤ | باتێلێ | الطائي | ٢٣٠ | طائی، سنانی، ئەلصامن، شەرابی |
| -٥ | ئیسماعیل ئاڤا | الربیع | ١٩٨ | الشهدانی، اللویزی، ئەلعجاج، شەرابی |
| -٦ | خراب دێمێ | دجلة | ٢١٠ | شەربای، المعماری، العوص |
| -٧ | باوەردێ | الفاو | ١٧٣ | سنانی، عرعوری، جبۆری |
| -٨ | گرشینێ | الفارس | ٢١٠ | جبۆری، عوبەیدی و حەدیدی |
| -٩ | کێلك | الفاروق | ١٦٧ | جحێش، ئەلدراجی |
| -١٠ | باجد کەندال | الوسطی | ٩٦ | الشیبانی، ئەلعجاج |
| -١١ | دێرەبوون | دیربون | ٢٠٩ | ئەلراشدی، ئەللویزی، ئەلشیبانی، ئەلناصری |
| -١٢ | پێشیابوور | فیشخابور | ١٥٣ | ئەلراشدی، المعرجی، الامارە، ئەلئەحمەد، ئەلزرگانی، ئەلغریباوی |
| -١٣ | قەرەولا | قرولة | ٥٤ | سەربازگەهەکا لەشکەری بوو |

کوتەکی مولك و خاك و گوندێن وان ژێ ستاندین، ئەڤە ژی پشتی وێ چەندێ هات کو خەلکێ دەڤەرێ ژ گوندێن وان هاتینەدوورکرن و ب زۆری ل کۆمەلگەهێن (قەسرۆکی، چرە و کەلەکچی) ئاکنجیکرین و عەرەب ل گوندێن وان ئاکنجیکرین[149]. ب ڤی رەنگی هەموو ناحیا ئەترووشێ ب مەلبەندێ ناحیێ ڤە ژ خودانان هاتبوو ڤالاکرن و خێزانێن عەرەبان ل شوونا وان ئاکنجیکربوون[150].

شێوازەکێ دی یێ ب عەرەبکرنێ هەبوو، ئەو ژی گوهارتنا ناسناما نەتەوەیا ئێزدیان و مەسیحیان و کەمینەیێن دیتر بوو بۆ ناسنامەیا نەتەوەیا عەرەبی، ئەو بوو ل دووڤ سەرژمێریا سالا ١٩٧٧ێ تنێ عەرەبەك ل هندەك دەڤەرێن پارێزگەها دهۆکێ نەبوو، بەلێ ژ ئەنجامێ ب عەرەبکرنێ هژمارا وان ل هندەك جهان ژ کوردان پتر لێ هات، هەروەك ل ناحیەیا سلێڤانەیی رێژەیا عەرەبان گەهشتە ٨٨,٧٪، ل ئامێدیێ گەهشتە ١٣٪، هەروەسان رێژەیا کوردێن ئێزدی ل دهۆکێ بۆ ٢,٤٪ هاتەخوار، بەلێ عەرەبێن ئێزدی یێن کو دبنیاتدا نەیی و بوونا وان بەری کریارێن ب عەرەبکرنێ نەبوو گەهشتە ٩٧,٥٪[151].

چەندین کریارێن دی هەبوون حکۆمەتێ ب مەرەما سەرئێخستنا کریارا ب عەرەبکرنێ ئەنجامددان ژ وانا خەلاتەکێ دراڤیێ مەزن ددا وان عەرەبان یێن هەڤژینی دگەل کچێن کورد پێکدئینا، هەرچەندە دەگمەن نەبیت کەس ژ کوردان رازی نەدبوون ب ڤێ خزمینیێ[152]، زێدەباری پێرابوونێن رژێمی د وارێ ب عەرەبیکرنا بەرنامێن خواندنێ دا.

## ٤- دەست ب سەرداگرتنا سامان و مولکێن خەلکی

رژێما بەعسی هەموو رێك و ئامراز گرتنە بەر داکو رێکێ ل بەر پەیوەندیا ناڤبەرا وەلاتیێن کورد و هێزێن پێشمەرگەی ل دەڤەرێن رزگارکری بگریتەبەر، ئێك ژ ڤان رێکا ئەو بوو دەست ب سەر سامان و مولکێن وان کەساندا بگریت یێن ژێ دیاربیت کو هاریکاریا هێزێن پێشمەرگەی دکەن و ئاسانکاریان بۆ دکەن، یان ژی ئەو ب خۆ ل دەڤەرێن رزگارکری د ئاکنجینە.

دەمێ ل سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ شەری ل کوردستانێ دەسپێکریەڤە هژمارەکا مەزن ژ خەلکێ کوردستانێ گەهشتنە شۆرشێ، د ئەنجامدا مەزنە باژێرێن کوردستانێ رەنگە ڤالا بوون ژ خەلکی، د وی دەمیدا حکومەتا عیراقێ دەست ب سەر مالێن وان کەساندا گرت و رێدا ئالیگر و کرێگرتیێن خۆ د خانیێن وانڤە ئاکنجی ببن، پاشتر ژی حکومەتێ هەمان ئالیگرێن خۆ و کەسوکارێن وان د خانیێن وان کەسانڤە نیشتەجێکرن یێن پشتی شکەستنا شۆرشێ هاتینەڤەگوهاستن بۆ ژێری و ناڤەراستێ عیراقێ[153]. هندەك کاودانان ژی دەست ب پشکنینا ژ نشکەکێڤە یا مالێن وان کەسان دکرن یێن حکومەتێ گومان ل سەر هەی و دەست ب سەر ناڤمالی و دیکیۆمینت و پەرەندەیێن کەسایەتیێن واندا دگرت[154].

بژاڤێن هندەکان ژ وان کەسان یێن دەست ب سەر مال و مولکێن واندا هاتییەگرتن سەرنەکەتن دەمێ دڤیا مال و مولکێن خۆ دوبارە ژ ئالیگر و کرێگرتیێن حکومەتێ بکرن، هەرچەندە ئەڤ مال و مولکە ب ناڤێ خودانێن وان یێن رەسەنڤە هاتبوونە توومارکرن، بەلێ رژێمێ د وی سەردەمیدا چ گرنگی ب وێ راستیێ نە ددا[155].

سالا ١٩٨٢ێ و ژ ئەنجامێ چوونا هژمارەکا زۆرا خەلکی بۆ ناڤ رێزێن پێشمەرگەی حکومەتێ بریاردا ئاگادارکرنەکا توند و ڤەبر بدەتە نە تنێ وان کەسان ئەوێن گەهشتینە رێزێن پێشمەرگەی بەلکی بۆ کەسوکارێن وان ژی کو دێ هێنە بێ باهرکرن ژ هەموو هاریکاریێن حکومەتی، هەروەسان ل شباتا ١٩٨٢ێ بریارەکا دی دا کو هەرکەسەکی ژ کۆمەلگەهان ب رەڤیت دێ خانیێ وی ژێ هێتەستاندن[156]. بەری دەسپێکرنا کریارێن ئەنفالان ل حزەیرانا ١٩٨٧ێ عەلی حەسەن مەجیدێ بەرپرسێ (نڤیسینگەها کاروبارێن باکوور) یا حزبا بەعس برووسکەك دا فەیلەقا ئێکێ و ل سەر هەموو یەکەیێن دی یێن لەشکەرێن عیراقێ ل کوردستانێ بژاند و تێدا چەند بریارەك د چەند خالەکاندا دیارکرن، ژ وانا: هەر تشتەکێ دەست راوێژکار (مستشار)ان و بەتالیۆنێن بەرگری نیشتمانی و چەکدارێن وان دکەڤیت بێی بەرامبەر بۆ وانە ژبلی چەکێن گران و ناڤین[157]، د راستیدا چەکدارێن بەتالیۆنێن بەرگری نیشتمانی وان ب خۆ بێی هیچ دلۆڤانییەك گوند تالاندکرن بەری کو ب سۆژن و هەر وان ژی ب بلدۆزەران ئەو گوند دگەل ئاخێ راستدکرن، دروشما رژێمێ د ڤێ سەرەدەریێدا ئەو بوو: کو " زەلامان بدەنە دەست مە و مولك و مال بۆ هەوە"[158].

## ٥- فرۆشتنا مولك و سامانێن گشتی

زێدەباری ڤێ چەندێ شەرێ عیراقێ – ئیرانێ باندۆرێن نەرێنی ل سەر ل سەر هەموو عیراقێ هەبوون، ب هەمان رەنگ ئەڤ باندۆرە ل سەر پارێزگاها دهۆکێ ژی بوون، چاوان عیراق ژ ئەنجامێ شەری تووشی بێ پارەیێ بوو، ڤێ چەندێ باندۆرا خۆ ل سەر پارێزگەها دهۆکێ ژی هەبوو، ل ڤێ پارێزگەهێ ژی گەلەك ژ مولکێن دەولەتێ هاتنەفروشتن بۆ کەرتێ تایبەت، ئەو بوو کارگەهێن: داگرتنا تەماتێ و فێقی (معمل تعلیب)، دارتاشیێ، بلۆکا، گێچێ، خیز و چەو و بەران، سازیا ڤەگوهاستنا وەلاتیان، هەتا کۆمەلگەهێن ئاکنجیکرنێ یێن سەر ب کارگێریا خۆجهیڤە هەرهەموو ژ بەر دەینداریا دەولەتێ ژ ئەنجامێ شەری هاتنە فروشتن[159].

## ٦- ئەنفال

بەری دەسپێكرنا كریارێن ئەنفالێن بەهدینان پێن ب داویا ئەنفالان (خاتمة الأنفال) دهاتنەناڤكرن و د ناڤبەرا (٢٥ تەباخێ – ٩ ئەیلوولا ١٩٨٨)ێ هاتینەئەنجامدان، ل بهارا ١٩٨٧ێ عەلی حەسەن مەجیدی مەرسوومەك دەرێخست و تێدا راگەهاند كو هەموو پارێزگەها دهۆكێ دكەڤیتە د ناڤ خەتا سوور دا، د نیسان و گولانا وێ سالێدا هەیەجانەكا مەزنا سۆتنا گوندێن دەڤەرێ هەبوو و د ئەنجامدا (٤٩) گوندێن دەڤەرێ هاتنەوێرانكرن و د رادیویا عیراقێدا ب رەسمی هاتە راگەهاندن كو دەڤەر دەڤەرەكا قەدەغەیە (منطقة محظورة)، د رۆژێن بەری روودانا ئەنفالێ چەند نیشان هەبوون كو پێشبینیا هندێ دكر كو دێ چ روودەت؛ وەك كۆمكرنا هێزێن لەشكەریێن مەزن ل درێژیا جادەیێن سەرەكیێن دكەڤنە د سنوورێن پارێزگەها دهۆكێ دا و تۆپبارانكرن و بۆمبا بارانكرنا دەڤەرێ ب فرۆكان و گەلەك جاران بۆمبباینێن هویشی (القنابل العنقودیة) ژی دهاڤێتن[١٦٠].

حكۆمەتا عیراقێ دڤیا ب بێ دەنگی بەهدینان ئەنفالبكەت، ژ بەركو ئەو دەڤەرێن ئەڤ ئەنفالە ژێدگریت دكەڤنە سەر سنوورێ تركیا و نێزیكی وەلاتێن ئەوروپانە و حكۆمەتا عیراقێ ژ هندێ د ترسیا نووچەیێن وێ د رێكا تركیا را بگەهنە رۆژنامەڤانان و رێكخراوێن مافێ مرۆڤی و ببنە ئەگەرێ سزادانا عیراقێ ژ ئالیێ جڤاكێ ناڤدەولەتیڤە، لەوما ژی عەلی حەسەن مەجیدی هێزێن لەشكەری هشیاركرن كو زوو كریارا ئەنفالێن بەهدینان ئەنجامبدەن دا كو رەنگە پێكڤە گرێدانەكێ د ناڤبەرا كریارێن ئەنفالان و شەرێ ئیرانێ دروستكەن[١٦١].

راپۆرتێن هەوالگریێن لەشكەری و مەدەنی پێن رژێمێ راگەهاند كو سەرجەمێ هێزێن پێشمەرگەی ل سنوورێ دەڤەرا بەهدینان ژ (٢٦٠٠) پێشمەرگەیان نابۆریت، بۆ شەرێ ڤێ هێزا بچووكا پێشمەرگەی و شەرێ خەلكێ سڤیلێ دەڤەرێ عەلی حەسەن مەجیدی (٢٠٠)هزار سەرباز ئامادەكرن، و هندەك ڤەگێران دبێژن ئەو (١٤ – ١٦) تیپێن (فرقەیێن) لەشكەری بوون و ژ هەر تیپەكێ (١٢)هزار لەشكەران بەشداری د هەوا ئەنفالاندا كرییە، زێدەباری بەتالیۆنێن چەكێ كیمیاوی و یەكەیێن هێزێن ئاسمانی و بەتالیۆنێن بەرگری نیشتمانی[١٦٢].

حكۆمەتا عیراقێ پلانا خۆیا ئەنفالا بەهدینان ل دووڤ ڤان تەوەرا دارێشتبوو، ژ زاخۆ بۆ گەلناسكێ و چیایێ بێخێری، زاخۆ بەرەف دەشتا خابویری، كانی ماسێ بەرەف زێوێ و ئامێدیێ و رەشاڤا، بێگوڤا بۆ ئێكمالێ و بامەرنێ و چیایێ مەتینی، ژ بالندا بەرەف شەمدینا و بێبو، شێروان بەرەف بارزان، دینارتە بەرەف بلێ و بارزان، بێگوڤا بەرەف مانگێشكی و زاویتە، سەرسنكێ بەرەف مێرگەتیێ و چیایێ گارە، ژ ناحیا ئەترووشێ بەرەف گوندێن سویار و سپیندارێ، سیارەتویكا بەرەف سویار و سپیندار و ئەترووشێ[١٦٣].

حكۆمەتێ هەموو رەنگە بەرهەڤی بۆ ڤێ هێرشێ كربوون و هەموو رەنگێن چەكی ئامادەكربوون و گرنگیەكا مەزن ژی دابوو بەرهەڤكرنا چەكێ كیمیاوی، ژبەركو ئەڤ چەكە ژ ئالییەكێ ڤێ كوشندە و خودان كاریگەریەكا مەزن بوو، ژ ئالیێ دیڤە ژ ئەنجامێ كارەساتا هەلەبجە و پێن دیتر كاریگەرییەكا مەزنا دەروونی ل سەر خەلكێ هەبوو، د نامیلكەكا نهێنیا سەركردایەتییا تیپا (فرقا) پێنجێ یا لەشكەرێ عیراقی دا دەربارەی بەرهەڤیێن لەشكەری بۆ چەكی دەربارەی چەكێ كێمیاوی هاتییە: سنفێ كیمیاوی وەك هەموو سنفێن دیتر رۆلەكێ بەرچاڤ هەبوویە د ئەنجامدانا ئەركێ خۆدا، بەری دەسپێكرنا هێرشان شیانێن یەكەیێن كیمیاوی و بەرهەڤیا ئامیر و چەكێن وان هاتبوونە هەلسەنگاندن، ب رەنگەكی بەرهەڤبن بۆ بۆ هەر رووداندكا ژ نشكەكێڤە دهێتەپێش، هەروەسان سەركردێ تیپێ راستەوخۆ سەرپەرشتیا دەستەیێن موشەكێن ئاگرهاڤێژ (حضائر قاذفات اللهب) كربوو و بەری دەسپێكرنا هێرشان سەرەدانا بارەگایێن تیپان

و پێكهاتێن وان كربوو[١٦٤].

ل ٢٥ تەباخا ١٩٨٨ێ حكۆمەتێ دەست ب ئەنجامدا پلانا ئەنفالا بەهدینان كر، ل دەسپێكێ ب مۆشەكێن كیمیاوی ل گەلیێ زێوە یێ دەڤەرا نێروە – رێكان كو بارەگایێ لقێ ئێكێ پارتی بوو دەسپێكر، هەروەسان فرۆكان ب مۆشەكێن كیمیاوی چەندین دەڤەرێن دیترێن ستراتیژی ئاگربارانكرن، د دەمێ دەمژمێرەكێدا سەدان قوربانی ژ زەلام و ژن و زارۆكان كەتن، ژ دەمژمێر ٦- ٦,٥ سپێدێ (٣٤) گوند و جهێن دەڤەرا بەهدینان كەتنە بەر كیمیا بارانكرنێ، ل پارێزگەها دهۆكێ گوندێن تویكا، بلیجانێ، بابیرێ، گەرەگوهێ، وەرمیلێ، ئێكمالێ، هێسێ، ئاسهێ، دیهێ، بانكا، ئەرزا، برجینێ، دەرگەلێ، زرهەوا، بەلیتێ، باوەركا كەڤرێ، گوهەرزێ، بێمنانش، رەڤەلێ، سویارێ، سپیندارێ و شێروانە كەتنە بەر كیمیا بارانكرنێ[١٦٥].

هێرشێن حكۆمەتێ بۆ سەر دەڤەرێ درێن كوژەك و ڤەبر بوون هەروەك حكۆمەتێ پلان بۆ دانای، ل هەموو دەڤەرێن بەهدینان ترس ئێخستە د دلێ مەدەنی و پێشمەرگەیاندا، هێرش ژ ئالیەكیڤە یا ب هێز و درندانە بوو، ژ ئالیێ دیڤە ژ نشكەكێڤە و ل چەندین بەرۆكان بوو د ئێكدەمدا، هێزێن كوردی كەتنە د ئالۆزیێ و بێ سەروبەرییەكا وەساندا گەلەكان ژ پێشمەرگەی چەپەرێن خۆ هێلان و د هەوارا خێزانێن خۆ چوون داكو وان بگەهینە سنوورێ تركیا[١٦٦].

دڤی سەروبەریدا حكۆمەتا تركیا راگەهاند كو د شیانێن وێ دایە تنێ سیهـ هزار پەنابەران ژ وان ئەوێن گەهشتینە سنووری وەرگریت، كو هەتا ١ێ ئەیلوولێ هژمارا وان گەهشتبوو (٥٠) هزاران[١٦٧]، و كەتبوونە كاودانێن بەرتەنگ ژ ترسێ و برسێ ژ ئالیێ حكۆمەتا تركیاڤە كو گەف لێدكرن كو دێ وان رادەستی حكۆمەتا عیراقێ كەتەڤە، بەلێ ژ ئەنجامێ فشارێن ناڤنەتەوەیی حكۆمەتا تركیا هەلویستێ خۆ گوهارت و رازیبوو وان وەك پەنابەر ل سەر خاكێ خۆ وەرگریت[١٦٨]، ئەڤ خەلكە ل رۆژا ٤ ێ ئەیلوولێ چوونە د ناڤا خاكێ تركیادا و عەلی حەسەن ئەلمەجیدی ئەڤ رۆژە وەك رۆژا ب داویئینانا بزاڤا كوردی دەستنیشانكر . هندیكە سەروبەرێ وان گوندانە ئەوێن دووری سنوورێ تركیا و نەگەهشتن یان نەشیایین خۆ رزگاركەن سەروبەرەك تراژیدی بوو، بەردەوام بەرخۆداندكر، ژ ڤێ قولاچكا ڤی چیایی دچوونە یادی و خۆ ژ دەست هێزێن حكۆمەتێ د پاراست دا نەكەڤنە دەست وان و ب چاڤێن خۆ ژ دوورڤە ددیت چاوان بلدۆزەرێن حكۆمەتێ گوندێن وان د هەرفاندن و هەر تشتەكێ دكەتە درێكا واندا دگەل ئاخێ راستەڤەدكرن، گەلەك ژ ڤانا سێ رۆژان ب پیان دچوون بێی كو دەرۆكەكێ خۆ رزگاركرنێ ببینن، گەلەك ژ زارۆكێن ساڤا ژ ئەنجامێ زكچوون و هشكبوونێ مرن، ل رۆژا دوازدێ ژ خۆ ڤەشارتنا وان ب دروستی ل رۆژا ٦ ئەیلوولێ نووچە گەهشتنە وان كو جڤاتا سەركردایەتییا شۆرشێ (مجلس قیادة الثورة) یا حكۆمەتێ لێبۆردنەكا گشتییا راگەهاندی[١٧٠].

ل دووڤ سەرژمێرەكا رێكخراوا ئاڤەدانكرن و پێشڤەبرنا كوردستانێ پێ رابووی ل پارێزگەها دهۆكێ (٣١٠) گوند د ئەنفالا داویێدا (خاتمة الأنفال)دا هاتنەوێرانكرن، د دەمەكیدا ل دووڤ هژمارا گشتییا لەشكەرێ عیراقێ راگەهاندی تنێ ئەوێن نێرینە یێن هاتینەگرتن و هنارتن بۆ گرتیگەهان د ڤان ئەنفالاندا دگەل پێشمەرگەیێن خۆ رادەستكری و هاتینەگرتن (٣٠٦٣)كەس بوو[١٧١].

د هەمان نامیلكەیا نهێنیدا هاتییە ٢٠٩٠٥ كەسان ژ پێشمەرگە و خەلكێ سڤیل خۆ رادەستكرییە، ژ وانا ٥٥٣١ زەلام، ٤٣٦١ ژن و ١١٠١٣ زارۆك بوون، هەروەكی د ڤێ ژێدەرێ هاتی ژ ڤێ هژمارێ تنێ ٣١١ پێشمەرگەبوونە كو وان ب خۆ خۆ رادەستكرییە و ٨٤٠ ژی پێشمەرگەبوونە كو هاتینەگرتن[١٧٢].

پشتی كو حكۆمەتێ ل رۆژا ٦ ئەیلوولێ لێبۆردنا گشتی راگەهاندی دەست ب كۆمكرن و ڤەگوهاستنا هەموو وان كوردان كر یێن ل دووڤ بریارا لێبۆردنێ خۆ رادەستكری، ل بەراهیێ ژ هەموو جهانڤە ئینان و ل كەلا نزاركێ خرڤەكرن[١٧٣]، ل

وێرێ زەلام ژ خێزانێن وان جوداکرن، ب هەموو رەنگێن دژوار ئەو زەلام ئەشکەنجەدان، پشتی دەمەکی ژ وێرێ هاتنەڤەگوهاستن بۆ ویستگەها دووێ کو گرتیخانا سەلامیێ (السلامیة) بوو (د ناڤبەرا مووسل و هەولێرێ)دا و بۆ دەمێ (١٩) رۆژان مانە ل وێرێ و ل ڤی جهی گەلەك زارۆك ژ ئەگەرێ سەقایی و بەلاڤبوونا نەخۆشییان و سەرەدەریبا دژوارا زرتەکێن رژێمێ مرن[١٧٤]، پشتی ڤی دەمێ ئەڤ خەلکە برنە کۆمەلگەهێ بەحرکێ ل ژوورێ هەولێرێ، ئەو ژی جهەکێ چۆل و بەردای و بێ خانی و بانەکی بوو کو وی خەلکی گەرما تیشکا رۆژێ بپارێزیت، رزگاربوونا پشکا مەزنا ڤی خەلکێ حنێرا خەلکێ هەولێرێ بوو، تنێ ئەو د هەوارا وەلاتیێن خۆ هاتن و دگەل گەهشتنا وان د هەوێن بەرفرەهدا هەموو پێدڤییاتی و خیڤەت و کەرەستە و هەرتشتەکێ ئەو پێدڤی دبنێ بۆ دابینکرن[١٧٥].

کارەساتا ئەنفالان رەنگڤەدانێن خۆ ل سەر پێکهاتەیا دەروونی و جڤاکییا کۆمەلگەهێ کوردی هەبوو، ئەڤ رەنگڤەدانە بۆ دەمەکێ درێژ دێ مینن، مینا کارەساتا هولوکوست کا چەوان هەتا پشتی نیڤ سەدسالیێ کارتێکرنێن وێ د دیاربوون، ب دەهان پەرتووك و فلمێن دوکیومێنتی ل سەر وێ کارەساتێ دەرکەتن، کارتێکرنێن کارەساتا ئەنفالان ژی ب هەمان واتایان هەر ژ دەمی بۆ دەمی دێ دیاربن.

کریارێن ئەنفالان کارتێکرنێن مەزن ل سەر کەسێ کورد و تاکێ کورد کرن. سەبارەت ئەو کەسێن کەتینە بەر ڤێ کریارێ ژ خەلکێ گوندان، تووشی درندانەترین کریار بوون، ژ ئەشکەنجێ و برسێ و لێدانێ و کوشتنێ، چ کریارێن هۆڤ نەمان ب سەری نەئینایین، کەس ژی ژ زارۆك و پیر و ژن و نەساخان و خۆ دینان ژی ژێ بێ بار نەبوون، دا کو ژ لایێن دەروونی و مەعنەوی ب هەلوەرینن؛ ئەو کەسێ ئێك یان دو ژ خێزانا وی شەهید بووین و سێ ژێ دەربەدەربووین، ل پێش چاڤان ژن و زارۆکێن وی دوور ئێخستین و مالا وی وێرانکرین و باغ و بیستانێن وی سۆتین و دەست ب سەر مال و مولکێن وی دا گرتین و گوندێ وی دگەل عەردی تەخت کرین، بارێ وی یێ دەروونی، یان ژ لایێ دەروونی ڤە دێ یێ چەوا بیت؟؟.

لێ ئەو کەسێن تووشی ڤێ رویدانێ نەبووین و مەبەست ژێ خەلکێ باژێرانە، کارتێکرن ب رەنگەکێ دی ل وان ژی هاتەکرن، چونکی ئەو د دوور نەبوون ژ برایێن خۆ خەلکێ گوندان و هەر خێزانەکا ل باژێران پەیوەندیێن مرۆڤانیێ دگەل خەلکێ گوندەکێ ئەنفالکری هەبوون و هەر کریارەکا هۆڤانە کو دەرحەق وان هاتییە ئەنجامدان، کارتێکرنێن خۆ یێن نەرێنی ل سەر کەس و کارێن وان ل باژێران کربوون. هەر ژ دەمژمێرێن دەسپێکی ژ کریارا ئەنفالا بەهدینان، حکومەتێ رێپیڤانێن گەلەکێن مەزنێن سەربازی ل ناڤەراستا باژێرێ دهۆکێ ئەنجامدان و ببوو جهێ حێبەتیا خەلکی و پرسیار ل سەر ڤێ کریارا لەشکەرییا مەزن دکرن، پشتی ئەڤ دیمەنێن مەزنێن ب ترس دیتین ترس کەتە دلێ خەلکێ باژێری دا، لێ گەهشتنە وێ باوەریێ کو رژێم دێ وان بۆ کریارا کوشتنا کوردان و وێرانکرنا کوردستانێ بکارئینت و هەر ل دەسپێکا ڤێ هەوێ، دەنگ و باس دگەهشتنە خەلکێ باژێران، کا چەوان رژێم خەلکی دکوژیت و سێدارەددەت و کا چەوان گوند و باغ و بیستانان د سۆژیت و وێران دکەت و چەوان گازێن ژەهراوی بکاردهینت، ئەڤ کەسێن ژێ قورتال دبوون و خۆ دگەهاندنە باژێران ژی، خەلکی ژبەر زێرەڤانیکرنا دژوارا زەلامێن دەزگەهێن رژێمێ بەری دەرکەتنا لێبوورینا گشتی ب ترس و هشیاری پێشوازی لێ دکرن، پشتی لێبوورینا گشتییا ناڤبری دەرکەتی، ئەو ئەنفالکری ب رەنگەکێ بەروەخت ل هندە جهان، مینا (کەلا نزارکێ) ل دهۆکێ ئاکنجیکرن، هەر چەند حکومەتێ ب ئەشکەرایی نەدهێلا ژی، لێ کەس و کارێن وان ل باژێری بزاڤ دکرن ب هەر رێکەکا هەبت هاریکارییا بگەهینێ.

## باندۆرێن شەرێ کەنداڤی یێ دووێ (داگیرکرنا کوێتێ) ل سەر ژیانا تەبایی ل پارێزگەهێ

سەدام حسێنی زێدەگاڤییا خۆیا هزر ل ئەنجامێن وێ نەکری ئەنجامدا ئەو ژی داگیرکرنا کوێتێ بوو، ل شەڤا ½ مەها تاباخا ۱۹۹۰ێ لەشکەرێ عیراقێ ژ سنوورێ کوێتێ بەرەڤ کووراتییا وێ وەلاتی هێرش برن، د دەمێ شەش دەمژمێراندا شیا کوێتێ داگیربکەت، ئەو بوو سەدام حسێن ل دووڤ هیچ بانگەوازێن ناڤدەولەتی و عەرەبی بۆ ڤەکشیانێ ژ کوێتێ نەهات، ڤێ چەندێ وەلاتێن یەککگرتیێن ئەمریکی پالدا کو سەرکردایەتییا هەڤپەیمانییەکا ناڤدەولەتی یا پێکهاتی ژ (۳۳) دەولەتان بۆ رزگارکرنا کوێتێ بکەت و ل رۆژا ۱۵ کانوونا دووێ ۱۹۹۱ێ ئاگربارانەکا توندا هێزێن عیراقێ کر و ل نیڤا مەها شباتێ دەست ب هێرشا پەژاییا مەزن کر و هێزێن عیراقێ نەشیان بەرخودانێ بکەن و بلەز شکەستن و د سەروبەرەك ئالۆز و نەخۆشدا ژ کوێتێ ڤەکشیان[۱۷٦].

پارێزگەها دهۆکێ ژی وەك پارێزگەهێن دیترێن عیراقێ گرفتاری چەندین ئاریشە و پرسگرێکان بوو، وەك: کێمبوونا سۆتەمەنییان و نەمانا کەرەستێن خوارنێ، د بەردەوامییا ڤان پرسگرێکان هەموو باژێرێن عیراقێ د تاریێدا دژیان و دهۆك ژی وەك وان ژ بێ کارەباییێ د تاریێدا دژیا، د ئەنجامدا خەلك بۆ رۆهنکرنا مالێن خۆ زڤرینەڤە بکارئینانا لەمپە و فانووسان و بۆ گەرمکرنا ناڤمالێ و لێنانا خوارنێ ژی پەنا برەڤە بەر دار و تەراشۆك و چیلکان، د هەمان دەمدا بهایێن کەرەستێن خوارنێ ژی ب رەنگەك بەرچاڤ زێدەبوون و چەند جارکی بهایێن خۆیێن کەڤن لێهاتن.

ژ ئالیەکی دیڤە پشتی کو دەولەتا ترکیا خۆ بەکلا کری و بریاردای پشکدارییێ د شەرێ رزگارکرنا کوێتێ دا بکەت، هزر ل وێ چەندێ هاتەکرن عیراق بەرسڤەکا لەشکەری ل سەر ڤێ هەلویستێ ترکیا بدەت د وی دەمیدا باژێرێ زاخۆیێ سنووری دێ ببتە نیشانا ئێکێ یا بەرسڤا لەشکەرییا دەولەتا ترکان ژبەرکو زاخۆ دکەفتە بەرسنگێ نیشانا تۆپێن سڤکێن ترکیا، لەوما خەلکێ زاخۆ بریاردان ب رەنگەکی دەمکی باژێرێ خۆ ڤالا کەن هەتا سەروبەر ب ئالیەکی دکەڤیت، ل رۆژا ۱۵ کانوونا دووێ ۱۹۹۱ێ کو رۆژا راگەهاندنا شەری بوو دژی عیراقێ مشەختبوونەکا تەبایا خەلکی ژ زاخۆ دەسپێکر و زاخۆ ڤالا بوو ژ خەلکێ وێ[۱۷۷].

ترسا شەری ب سەر هەموو پارێزگەهێدا گرت، نەکو هێزێن دژە ئاسمانییێن عیراقێ بەرێ چەکێ خۆ بدەنە فرۆکەیێن هەڤپەیمانان و ئەو ژی د بەرسڤا واندا بۆمبا بارانا دەڤەرێن سڤیل بدەن، ب دروستی ژی ڤێ چەندێ روودا و ل شەڤا ۱۲ شباتێ دو جهـ ل دهۆکێ بوونە ئارمانجێ مۆشەکێن فرۆکەیێن هەڤپەیمانان، یا ئێکێ نێزیکی پرا نەخۆشخانا ئازادی کەت و یا دوویێ کەتە تاخێ ئاشتی (جەمعیا کەڤن) و د ئەنجامدا زێدە باری زیانێن مادی پێنج کەس ژ سێ خێزانان بوونە قوربانی زێدەباری بریندار بوونا چەندین کەسێن دی[۱۷۸].

ئەو بوو هێزێن عیراقی د شەریدا شکەستن و هەتا دەسپێکا ئاداری ژ کوێتێ ڤەکشیان و بێی هیچ مەرجەك پێکهاتنا شەر راوەستاندنێ دگەل هەڤپەیمانان ب سەرۆکاتییا ئەمریکا مۆر کر، شکەستنا لەشکەرێ عیراقێ ب ڤی رەنگی کاریگەرییا خۆ یا نەرێنی ل سەر مۆرالا ڤی لەشکەری ل دەڤەرێن کوردستانێ هەبوو، لەوما ژی خەلکی ب هەستیاری و گرنگی چاڤدێرییا سەروبەری دکر، ئەو بوو سەرهلدانا کوردان ل هەموو باژێر و باژێرك و کۆمەلگەهێن کوردستانێ دەسپێکر، دەسپێك ل ٥ ئاداری ل باژێرێ رانیێ بوو، بلەزەکا بلەز باژێرێن دی ڤەگرتن هەتا ل رۆژا ١٤ێ ئاداری گەهشتییە باژێرێ دهۆکی و ب یەکجاری ژ رژێما بەعسی هاتەرزگارکرن[۱۷۹]، هەژییە بێژین د دو سێ رۆژێن پێشتردا هەموو باژێر و باژێرك و کۆمەلگەهێن پارێزگەهێ هاتبوونە رزگارکرن.

# ژێدەر و پەراوێز:

١. د. کونتر دشنر، احفاد صلاح الدين، الكرد شعب الذي يتعرض للخيانة و الغدر، ت: عبدالسلام برواري، (دهوك- ٢٠٠٠)، ط٢ ص ٣٧٣- ٣٧٤ ؛ ماريانا خاروداكي، الكرد و السياسة الخارجية الامريكية، ت: خليل الجيوسي، (اربيل- ٢٠١٣)، ص ٣٠٣.

٢. مسعود البارزاني، البارزاني و الحركة التحررية الكردية، الجزء الثالث، (اربيل- ٢٠٠٢)، ص ٣٤٨

٣. ديفيد ماكدوّل، تأريخ الاكراد الحديث، ت: راجيل محمد، (بيروت- ٢٠٠٤)، ص ٥١٠.

٤. ل داویا مەها ئاداری بارزانی راگەهاند کو شۆرش ب هێزەکا مەزنتر و باشتر ژ بەری دێ دەسپێکەتەڤە و گەلێ کورد دێ بەردەوامیێ ب خەباتا خۆ دەتەڤە، هندی پتر ژی خەباتێ بکەت دێ مافێن وی ژی پتر لێ هێن هەتا سەرکەتنێ دەستڤەدئینن. بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني، ملا مصطفى البارزاني قائد الثورة الكوردية و ملهمها: (دهوك- ٢٠١٢)، ص ١٠٩.

٥. حبيب محمد كريم، تأريخ الحزب الديموقراطي الكردستاني- العراق (في المحطات رئيسية) ١٩٤٦- ١٩٧٥، (دهوك- ١٩٩٨)، ص ١٤٧ و ١٥٢.

٦. مسعود البارزاني، ژێدەرێ بەری، بپ ٣٤٦- ٣٥٣ ؛ علي سنجاري، صفحات من نبع ذاكرتي في الحزب الديموقراطي الكردستاني، (دهوك- ٢٠١٥)، ص ٨٦- ٨٧ ؛ زوزان صالح اليوسفي، صالح اليوسفي ١٩١٨- ١٩٨١صفحات من حياته و نضاله الوطني مع ديوانه الشعري الكامل، (دهوك- ٢٠٠٩)، ص ٦٩- ٧٠

٧. زوزان صالح اليوسفي، ژێدەرێ بەری، بپ ٦٩- ٧٠.

٨. دیدارەك د گەل عەبدولرەزاق گەرماڤی ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/١٨ ل دهۆکێ، عەبدولرەزاق گەرماڤی ل سالا ١٩٤١ێ ل گەرماڤا نێزیکی دهۆکێ هاتیەسەردنیایێ، پەیمانگەها بەرهەڤکرنا مامۆستایان داویئینایە، د ناڤبەرا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ جێگرێ ئامرهێزێ دهۆکێ بێ پێشمەرگەی بوو، پشتی نسکویێ چوویە ئیرانێ، پاشتر زڤریەڤە و وەك فەرمانبەر ل دیوانا پارێزگەها دهۆکێ کار کرییە، ل سالا ٢٠٠٩ێ ب پلا شارەزا (خبير) ل کارگێریا خۆجهیا پارێزگەهێ هاتیەخانەنشینکرن، نها ل دهۆکێ ئاکنجییە.

٩. دیدارەك دگەل موسەدق تۆڤی، سالا ١٩٥٧ێ ل بامەرنێ- قەزا ئامێدیێ هاتیەسەردنیایێ، د ناڤبەرا ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ ل ئێزگێ دەنگێ کوردستانێ کار دکر، هەتا داوی شەڤا وەشانا ئێزگەی شەڤا ٢١/٢٢ ئاداری ل ئێزگەی کار دکر، پاشتر ئەو ژی مشەختبوویە ئیرانێ و پشتی دەمەکێ کورت ڤەگەریایە عیراقێ و بەردەوامی ب خواندنا خۆ ل قوناغا ئامادەیی دایە. ل رۆژێن ڤان رووداناں ل ئەمانەتا گشتیا رەوشەنبیری و راگەهاندنێ و ئێزگێ دەنگێ کوردستانێ ل چۆمان کار دکر. و دەمێ چوویە ئیرانێ ئەڤ هەمەوو سەروبەرە ب چاڤێن خۆ دیتییە، نها فەرمانبەرە ل دهۆکێ و سەرپەرشتێ پرۆژێ ڤێ ئینسکلۆپیدیایێ یە.

١٠. علي سنجاري، ژێدەرێ بەری، بپ ٨٠ ؛ كريم حبيب حاجي، مذكراتي في ثورتين ايلول و گولان المجيدتين، (دهوك- ٢٠١٣)، ص ٣٢.

١١. دیدارەك کەسایەتی دگەل عەبدولرەزاق گەرماڤی، ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/١٨، ل دهۆکێ.

١٢. دیدارەك کەسایەتی دگەل تەبار گەرماڤی ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/٢٦ ل دهۆکێ، ناڤبری سالا ١٩٦٣ێ ل گوندێ گەرماڤا یێ نێزیکی دهۆکێ هاتیە سەردنیایێ، سالا ٢٠٠٢ کولیژا ڤانوونێ ل زانکۆیا دهۆکێ خواندییە، چەندین ئەرکێن پارتایەتی و رێکخراوێن سەر ب پارتی وەرگرتینە وەك: بەرپرسێ دهۆکێ یێ ئێکەتیا لاو و ڤوتابیێن دیموقراتێن کوردستانێ سالا ١٩٨٨ێ، نها ژی بەرپرسێ لیژنا شێورکاری یا لقێ شێخان یێ پارتی دیموکراتی کوردستانە.

١٣. سعيد الحاج صديق الزاخوبي، زاخو الماضي و الحاضر، (دهوك- ٢٠٠٩)، ص ١٦٦

١٤. دیدارەك دگەل موسەدەق تۆڤی، ل رۆژا ٢٠١٥/١١/٣٠ ل دهۆکێ

١٥. د دەمێ شەرێ ١٩٧٤- ١٩٧٥ێ ناڤبەرا شۆرشێ و حکومەتێ دا باژێرێن کوردستانێ یێن مابنە ل ژێر دەستەلاتێ حکومەتێ نیڤ ڤالا ببوون.

١٦. هەمان دیدار دگەل عەبدولرەزاق گەرماڤی.

١٧. موسەدەق تۆڤی، شۆرشا گولانێ درێژە پێدانا شۆرشا ئەیلوولێ، کۆڤارا دهۆك، هژمار ٢٣، گولان- ٢٠٠٤، بپ٤.

١٨. محافظة دهوك (بغداد- د. ت) ص ١٤- ١٥ ؛ دیدارەك کەسایەتی دگەل جەلال بنیامین، ل رۆژا ٢٠١٥/١١/٢٣، ل دهۆکێ، جەلال بنیامین توما (ابو وسام) سالا ١٩٤٧ێ هاتیە سەردنیایێ، دەرچوویێ قوناغا ناڤنجییە، ژ سالا ١٩٧٨یڤە وەك نڤیسەر (کاتب) ل کارگێریا پارێزگەها دهۆکێ کار دکر، ل سالا ٢٠١١ێ هاتیەخانەنشینکرن، نها ل دهۆکێ دژیت.

١٩. عبدالله غفور، التشكيلات الادارية في جنوبي كردستان ١٩٢١- ٢٠٠٧، (اربيل- ٢٠٠٨)، ص ٥٤.

٢٠. هەمان ژێدەر، بپ ١٠٧،١٢٥،١٠٠.

٢١. دیدارەك کەسایەتی دگەل محەمەد عومەر (ئەبو ئازاد) ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/١٩ ل دهۆکێ، ئەبو ئازاد سالا ١٩٤٢ێ ل هەولێرێ هاتیە سەر دنیایێ، ل سالا ١٩٦٠ێ قوناغا ئامادەیی ب داوی ئینایە، ژ دامەزراندنا پارێزگەها دهۆکێ ڤە وەك فەرمانبەر ب پلا تێبینەر و سەرۆکێ تێبینەران هەتا سالا ٢٠٠٦ێ کارگرییە، نها خانەنشینە و ل دهۆکێ ئاکنجییە.

٢٢. دیدارەك کەسایەتی دگەل سەید عەلی ئامێدی (عەلی مستەفا یاسین) ل رۆژا ٢٠١٥/١٢/٣، ل دهۆکێ، ناڤبرە سالا ١٩٤٢ێ ل ئامێدیێ هاتیەسەردنیایێ، دەرچوویە پەیمانەگەها ژمێریارییە ل بەغدا، وەك فەرمانبەر ل کارگێریا پارێزگەهێ کارکرییە، سالا ١٩٧٨ێ بوویە رێڤەبەرێ کارگێریا خۆجهی (الادارة المحلية)، نها ب پلا شارەزا خانەنشینە و ل دهۆکێ ئاکنجییە.

٢٣. محافظة دهوك، دهوك في احضان الثورة، (بغداد- ١٩٧٩)، ص ٢٦.

٢٤. هەمان دیدارا کەسایەتی دگەل سەید عەلیێ ئامێدی.

٢٥. هەمان دیدارا کەسایەتی دگەل ئەبو ئازادی.

٢٦. موسەدەق تۆڤی و ئیسماعیل بادی، رێبەرێ پارێزگەهێ، (دهۆك- ٢٠١٠)، بپ ٥٣- ٥٤.

٢٧. محافظة دهوك، دهوك في احضان الثورة، ص ١٢٧

٢٨. دیدارەك کەسایەتی دگەل ئەندازیار ئەحمەد محەمەد رەشید، ل رۆژا ٢٠١٥/١٢/٢٥ێ ل دهۆکێ، ئەندازیار ئەحمەد محەمەد رەشید ل سالا ١٩٥٥ێ ل ئامێدیێ هاتیەسەردنیایێ، سالا ١٩٧٨ێ کولیجا ئەندازیاری پشکا رێك و پران داویئینایە و سالا ١٩٧٨ێ ل رێڤەبەریا رێك و پران یا پارێزگەها دهۆکێ هاتیەدامەزراندن، نها بەرپرسێ پشکا سەرپەرشتی و دووڤچوون و پێشکەشکرنا شێورمەندییا ئەندازیارییە بۆ چێکرن و ڤەکرنا رێك و پران ب پلا شارەزا.

٢٩. هەمان دیدار دگەل ئەندازیار ئەحمەد محەمەد رەشید.

٣٠. محافظة دهوك، دهوك في احضان الثورة، بپ ١٣٨- ١٣٩.

٣١. دیدارەك کەسایەتی دگەل ئەندازیار سلێمان عەبدوللا حسێن، ل رۆژا ٢٠١٥/١٢/١٤ ل دهۆکێ، ئەندازیارێ ناڤبری ل سالا ١٩٧١ێ هاتیەسەردنیایێ، باوەرناما بەکالوریۆس د ئەندازیاریا میکانیکدا وەرگرتییە، ژ سالا ١٩٩٣یڤە ل وەرشا تەکنیکی یا نەخوشخانێ کار دکەت و نها بەرپرسێ وەرشا تەکنیکی یە.

٣٢. محافظة دهوك،... بپ ١٤٥- ١٤٦

٣٣. نەخوشخانە ل سالا ١٩٨٧ (ل دووڤ راگەهاندنا حکومەتا عیراقێ) کەتە بەر هێرشەکا فروکێن جەنگیێن ئیرانی و کونترۆلا ئاسانسوورا و ڤاتێ سێ یێ وێ بوونا ئارمانجێ فروکان.

٣٤. هەمان دیدار دگەل ئەندازیار سلێمان عەبدوللا حسێن.

٣٥. حمید المطبعي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٦٠.

٣٦. رمضان حمزة، سد دهوك الاروائي الواقع و الطموح، مجلة دهوك، العدد٣،(دهوك- نيسان ١٩٩٨، ص ١٠٣- ١٠٤.

٣٧. هەمان ژێدەر، بپ ١٠٤.

٣٨. محافظة دهوك، دهوك في.... ص ٢٢.

٣٩. رمضان حمزة، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٤.

٤٠. حمید المطبعي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥٧.

٤١. موسەدەق تۆڤی و ئیسماعیل بادی،... بپ ١٧٩- ١٨٠.

٤٢. محافظة دهوك، دهوك في.... ص ٢٧.

٤٣. هەمان دیدار دگەل موسەدەق تۆڤی، د ناڤبەرا ١٩٧٩- ١٩٨٢ێ فەرمانبەرێ ڤێ کارگەهێ بوو.

٤٤. هەمان ژێدەر، بپ ٢٧- ٢٨.

٤٥. موسەدەق تۆڤی و ئیسماعیل بادی،...، بپ ٢١١- ٢١٢ ؛ محافظة دهوك، دهوك في...، بپ ٢٨.

٤٦. محافظة دهوك، دهوك في...، بپ ١٢١.

٤٧. دیدارەك كەسایەتی دگەل رافع عادل ئەسعەد (حەجی رافع) ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/١٢ێ ل دهۆكێ، حەجی رافع ل سالا ١٩٤٤ێ ل دهۆكێ هاتییەسەردنیایێ، دەرچوویێ زانكۆیا بەغدا- كولیژا زمانان- پشكا زمانێ كوردی یە ل سالا ١٩٦٩، چەندین بەرپرسیاتی ل رێڤەبەریا گشتییا پەروەردا پارێزگەها دهۆكێ گرتینەدەست و ل سالێن ١٩٩١- ١٩٩٤ وەك بریكارێ رێڤەبەرێ گشتی كاركرییە، نها خانەنشینە ل دهۆكێ ئاكنجییە.

٤٨. هەمان دیدار دگەل رافع عادل ئەسعەد.

٤٩. دیدارەك كەسایەتی دگەل حوسامودین عەبدوللا سادق ل رۆژا ١٠١٥/١٠/١٢ ل دهۆكێ، ناڤبری ل سالا ١٩٤٤ێ ل ئاكرێ هاتییە سەردنیایێ، دەرچوویێ زانكۆیا مووسلێ كولیژا زانست- پشكا فیزیكێ یە، چەندین بەرپرسیاتی ل رێڤەبەریا پەروەردێ وەرگرتییە و د ناڤبەرا ١٩٨٨- ١٩٩١ێ بوویە رێڤەبەرێ گشتیێ پەروەردا پارێزگەها دهۆكێ، نها خانەنشینە و ل دهۆكێ ئاكنجییە.

٥٠. رێڤەبەریا پەروەردا پارێزگەها دهۆكێ ل ئاڤاهیێ بەرامبەری ئوتێلا لومانا یا نها بوو، هەتا ١٩٨٢ێ ل وی جهی بوو، د وێ سالێدا هاتەڤەگوهاستن بۆ ئاڤاهیێ نوو بەرامبەری نەخوشخانا ئازادی هەمان ئاڤاهیێ نها هاتییەنوژەنكرن. بنێرە: موسەدەق تۆڤی، پەروەردە و فێركرن ل پارێزگەها دهۆكێ، كۆڤارا دهۆك، هژمار ٨- كانوونا ئێكێ ١٩٩٩ێ، بپ ٢٦.

٥١. هەمان دیدار دگەل حوسامەدین عەبدوللا سادق، ؛ موسەدەق تۆڤی، پەروەردە و فێركرن... بپ ٢٦

٥٢. أ. پ، عن التعليم في كردستان العراق (د.م – ١٩٨٦)، ص ٢٨- ٢٩

٥٣. هەمان دیدار دگەل رافع عادل ئەسعەد.

٥٤. موسەدەق تۆڤی، دیرۆكا پەروەردە و فێركرنێ ل پارێزگەها دهۆكێ، هێژ نەهاتییەچاپكرن.

* د ڤێ ئینسكلۆپیدیایێدا ڤەكولینەك بەرفرەهـ دەربارەی خواندنا كوردی ل سنوورێ پارێزگەها دهۆكێ هاتییەبەلاڤكرن.

٥٥. هەمان ژێدەر.

٥٦. هەمان ژێدەر.

٥٧. أ. ب پرشنگ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٠

٥٨. هەمان ژێدەرن بپ ٣٠- ٣١.

٥٩. بۆ ئاگاداربوون ل سەر هژمار خواندنگەهێن ل هەر قەزایەكێ یان ناحیەكێ هاتینەگرتن بنێرە: د. احمد عبدالعزيز الحاج، صمود الشعب الكردي في مواجهة التحديات، (اربيل- ٢٠١٤)، ص ٢٢٥.

٦٠. موسەدەق تۆڤی و عزت فندی، ئامادەیا برایەتی فێرگەها زانست و هەستا نەتەوەیی و شۆرشگێری، كۆڤارا دهۆك، ژمارە ٢٢- شوات ٢٠٠٤، بپ ٢٩- ٣١.

٦١. هەمان دیدار دگەل حوسامەدین عەبدوللا سادق.

٦٢. بۆ دیتنا دەقێ ڤێ بەلگەنامەیێ بنێرە: چیایی، قارەمانێن ئەنفالكرنا خواندنا كوردی، كۆڤارا دهۆك، هژمار ٣٢، چریا ئێكێ - ، بپ ٣٤- ٣٥.

٦٣. موسەدەق تۆڤی و عزت فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٩.

٦٤. ئەڤ خۆنیشادانە ب هەلكەفتا بیرهاتنا ٢٤ نیسانا ١٩٧٤ێ هاتبوو ئەنجامدان، د ڤێ رۆژێدا فرۆكێن شەركەرێن حكۆمەتا عیراقێ باژێركێ قەلادزە یێ سەر ب پارێزگەها سلێمانیێ ڤە بۆمبەباران كربوو و (١٣٢) كەس كو (١٠) ژ وان قوتابیێن زانكۆیا سلێمانیێ بوون كو گەهشتبوونە رێزێن شۆرشا كوردستانێ و ل وێرێ بەردەوامی ب خواندنا خۆ ددا شەهید بوون، هەرسال رێكخراوێن قوتابییان و خەلكێ كوردستانێ رێورەسمێن بیرهاتنا ڤێ رۆژێ كو ب رۆژا شەهیدی هاتییەناڤكرن دگێرن. بنێرە: أ. پ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٧- ٢٨.

٦٥. دیدارەك كەسایەتی دگەل تەیار محەمەد سەلیم گەرماڤی، ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/٢٦ێ ل دهۆكێ، ناڤبری وی دەمی یەك ژ قوتابیێن دواناڤنجییا برایەتی بوو و یەك ژ وان بوو یێن پلانا خۆنیشادانێ دانای.

٦٦. دیدارەك كەسایەتی دگەل نیعمەت سەعید عەبدوللا، ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/١٨ێ ل دهۆكێ، ناڤبری ل سالا ١٩٦٦ێ لدهۆكێ

هاتییەسەردنیایێ، یەك ژ وان قوتابییان بوو یێن پشکداری د خۆنیشاندنێن دهۆکێ و مووسلێ دا کری و د ئەنجامدا هاتییەگرتن و کامیرا وی ژی ژ ئالیێ پولیسانڤە هاتییەشکاندن، نها ل دهۆکێ دژیت.

٦٧. هەمان دیدار دگەل رافع عادل ئەسعەد.

٦٨. حمید المطبعي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥١- ٢٥٢

٦٩. هەمان ژێدەر، ص ٢٥٣.

٧٠. د. رەشید فندی، مێژویا ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد لقێ دهۆکێ (١٩٧١- ١٩٩١)، (دهوك- ٢٠١٥)، بپ ٨٥.

٧١. ژبەر سرۆشتێ خۆیێ جوان و سەقایێ خوش و دیمەنێن سەرنجراکێش ژ مێژوەرە دەڤەرێن سەر ب پارێزگەها دهۆکێ بووینە جهێن گەشتوگوزاری و سالانە ب دەهان هزار کەس قەستا ڤان دەڤەران دکەن.

٧٢. محافظة دهوك، دهوك في...، بپ ١٤٧- ١٤٨.

٧٣. هەمان ژێدەر، بپ ١٤٦.

٧٤. موسەدەق تۆڤی و عزت فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٣- ٣٤.

٧٥. هەمان دیدار دگەل تەیار سەلیم گەرماڤی.

٧٦. دیدارەك کەسایەتی دگەل ئەحمەد عەبدوللا مستەفا (ئەحمەدێ زەرۆ) ل رۆژا ٢٠١٥/١١/٢١ێ ل دهۆکێ، ئەحمەدێ زەرۆ ل سالا ١٩٤٤ێ ل زاخۆ هاتییە سەردنیایێ، سالا ١٩٦٨ێ کولیژا ئاداب- پشکا کوردی ل زانکۆیا بەغدا داوی ئینایە، د ناڤبەرا ١٩٧٢- ١٩٨٦ێ سەرۆکێ لقێ دهۆکێ یێ ئێکەتیا نڤیسەرێن کورد بوو، د چەندین کۆڤار و رۆژناماندا وەك ئەندامێ دەستەکا نڤیسەران کار کرییە وەك (کۆڤارا نووسەری کورد، رۆژناما بزاڤ، و کۆڤارێن، کاروان، تەندروستی و پەیڤ کارکرییە، نها ل دهۆکێ ئاکنجییە و خودانێ کەڤنترین پەرتووکخانەیە ب ناڤێ (پەرتووکخانا دهۆك).

٧٧. د. رەشید فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٨٦.

٧٨. هەمان دیدار دگەل ئەحمەدێ زەرۆ.

٧٩. د. رەشید فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٦.

٨٠. هەمان دیدار دگەل ئەحمەدێ زەرۆ.

٨١. ژ وان مەرجان جێگرێ ئێکێ یێ سکرتێرێ گشتی (ئەمینداری گشتی) و حەفت ئەندامێن دەستەکا سکرتاریەتێ کورد بن و ژ ئالیێ لقێ دەڤەرا ئوتونومی بێنەهەلبژارتن.

٨٢. د. رەشید فندی، ژێدەرێ بەرێ، ١١٣- ١١٥.

٨٣. بۆ زانیارییێن بەرفرەهتر بنێرە: هەمان ژێدەر.

٨٤. هەمان دیدار دگەل موسەدەق تۆڤی.

٨٥. موسەدەق تۆڤی و ئیسماعیل بادی،... ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨٥.

٨٦. هەمان دیدار دگەل ئەحمەدێ زەرۆ.

٨٧. موسەدەق تۆڤی و ئیسماعیل بادی،... ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨٥- ٢٨٦.

٨٨. هەمان دیدار دگەل موسەدەق تۆڤی.

٨٩. ئەو رەوشەنبیر: حافز مستەفا قازی، تێلی ئەمین و کەریم فندی بوون.

٩٠. حافظ قاضي، ذکریات (٢)، (دهوك- ٢٠٠٦)، ص ١٦١- ١٦٢.

٩١. رۆژناما بزاڤ

٩٢. هەمان دیدار دگەل موسەدەق تۆڤی.

٩٣. موسەدەق تۆڤی و ئیسماعیل بادی،... ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٠٤.

٩٤. دیدارەکا کەسایەتی دگەل رەجەب حسێن ئیبراهیم، ل رۆژا ٢٠١٦/٢/٨ێ ل دهۆکێ، ناڤبری ل سالا ١٩٥١ێ ل دهۆکێ هاتییە سەردنیایێ، دەرچوویێ خواندنگەها مامۆستایانە ل هەولێرێ سالا ١٩٧٢- ١٩٧٣، نها خودانێ پەرگەها زێرەڤانە بۆ قورتاسیێ، ئەڤ پەرگەهە بەردەوامیا پەرتووکخانا سامی یا ناڤبرییە.

٩٥. هەمان دیدار دگەل ئەحمەدێ زەرۆ.

٩٦. هەمان دیدار دگەل موسەدەق تۆڤی.

٩٧. هەمان دیدار دگەل حوسامەدین عەبدوللا سادق.

٩٨. حافز قازی د بیرهاتنێن خۆدا چیرۆكەكا هەژی كەنیێ ل دوور ئاستێ نزمێ ڤی كەسی ڤەدگێریت و د بێژیت: وی دگەریانەكا خۆدا ل ئەوروپا چاڤ ب كەسایەتیێ عیراقی (الحاج مجید العاني) كەت، دەمێ پرسیار ژێ كری كی بەرپرسێ حزبا بەعسە ل دهۆكێ؟ حافز قازی گۆتی (طارق كافي فليح العاني) یە، حەجی مەجیدی د بەرسڤێدا گۆت: ئەرێ حزبا بەعس چ كەرێن ژ وی كەری باشتر نەدیتن ڤرێكەتە دهۆكێ. هەژیە بێژین (طارق كافي) برایێ حەجی مەجیدی بوو، بنێرە: حافظ قاضي، هەمان ژێدەر، بپ ١٦٤.

٩٩. هەمان دیدار دگەل موسەدەق تۆڤی.

١٠٠. بۆ دیتنا وێ بەلگەنامەیێ بنێرە:عەلی تەتەر، سیاسەتی حكومەتی عیراق لە سایەی بەڵگەنامە فەرمەییەكاندا، (دهۆك- ٢٠١٠)، بەرگی یەكەم، بپ ٣٧٨.

١٠١. هەمان دیدار دگەل ئەحمەدێ زەرۆ.

١٠٢. هەمان دیدار دگەل موسەدەق تۆڤی.

١٠٣. دیدارەك دگەل فەهیم عەبدوللا حەمو، ل رۆژا ٢٠١٦/١٢/٧ ل دهۆكێ. فەهیم عەبدوللا ل سالا ١٩٦١ێ ل دهۆكێ هاتییەسەردنیایێ، سالا ٢٠٠٠ێ كولیژا ئاداب ل زانكۆیا دهۆكێ داوئیناپە، سالا ١٩٧٦ێ چوویە د رێزێن پارتی دیموكراتی كوردستان دا، نها سەرۆكێ جڤاتا پارێزگەها دهۆكێ یە.

١٠٤. دیدارەكا كەسایەتی دگەل تەیار سەلیم گەرماڤی، ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/٢٦ێ ل دهۆكێ. تەیار سەلیم ل سالا ١٩٧٩ێ چوویە د رێزێن پارتی دیموكراتی كوردستان دا.

١٠٥. هەمان دیدار دگەل فەهیم عەبدوللا حەمو.

١٠٦. دیدارەكا كەسایەتی دگەل عابد محەمەد حەسەن ئێتویتی ل رۆژا ٢٠١٥/١٢/١٦ێ ل دهۆكێ. عابد محەمەد حەسەن ل سالا ١٩٥٤ێ هاتییەسەردنیایێ. دەرچوویێ كولیژا قانوون- زانكۆیا (سانت كلینتس)ە، یەك ژ وان كەسان بوو یێن دگەل تۆرا محەمەد سەدیق هروری هاتینەگرتن و پاشتر هاتییەهنارتن بۆ زیندانا كەركووكێ. نها بەرپرسێ رێكخستێن دێرینێن یەكێتی نیشتمانی كوردستانە.

١٠٧. هەمان دیدار دگەل فەهیم عەبدوللا حەمو ؛ موسەدەق تۆڤی و عزت فندی، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤١.

١٠٨. هەمان دیدار دگەل فەهیم عەبدوللا حەمو.

١٠٩. دیدارەك كەسایەتی دگەل شێرزاد موختار محەمەد عەلی ل رۆژا ٢٠١٥/١٢/٦ێ ل دهۆكێ، شێرزاد موختار ژ مالباتێن كەڤنێن دهۆكێ یە، سالا ١٩٥٧ێ ل دهۆكێ هاتییەسەردنیایێ ئەندامێ رێكخستنێن حزبا شیوعی ب تایبەت خەتا قوتابییان بوو، نها بەرپرسێ پەیوەندییانە ل حزبا شیوعیا كوردستانی- لیژنا دهۆكێ.

١١٠. الشيخ عطا الطالباني، ذكريات ايم النضال في كوردستان، (السليمانية- ٢٠١٠)، ص ٣١٤.

١١١. هەمان دیدار دگەل شێرزاد موختار محەمەد عەلی.

١١٢. بۆ پتر زانیارییان ل سەر دەمەزراندنا یەكێتیێ بنێرە: سالار اوسي، جلال طالباني احداث و مواقف، (بيروت- ٢٠٠٨).

١١٣. دیدارەك كەسایەتی دگەل عەبدولسەلام عەبدولغەنی ئیبراهیم، ل رۆژا ٢٠١٥/١٢/١٢ ل دهۆكێ، ئەو ل سالا ١٩٥٧ێ ل زاخۆ هاتییەسەردنیایێ، بۆ دەمێ نەهـ سالان هەتا سالا ١٩٩٦ێ چەندین بەرپرسیارێن حزبی د رێزێن یەكێتی نیشتمانی كوردستاندا وەرگرتینە، نها جێگرێ رێڤەبەرێ گشتیێ لیژنا دووڤچوون و پشكنینێ یە د فەرمانەدیا گشتی یا پێشمەرگێن یەكێتی نیشتمانی كوردستان دا.

١١٤. هەمان دیدار دگەل عابد محەمەد حەسەن.

١١٥. دیدارەكا كەسایەتی دگەل دیندار نەجمان شەفیق دوسكی ل رۆژا٢٠١٥/١١/١٢ ل دهۆكێ. دیندار نەجمان ل سالا ١٩٥٤ێ ل دهۆكێ هاتییەسەردنیایێ، باوەرناما ماستەر د زانستێن سیاسیدا وەرگرتییە، یەك ژ دامەزرێنەرێن یەكگرتووی ئیسلامی كوردستانە، ل مەها حزیرانا ٢٠١٥ێ دەست ژ یەكگرتوو بەردایە و نها وەك كەسەك سەربەخۆ ل دهۆكێ دژیت.

١١٦. ئەوێ دیدار دگەلدا هاتییەكرن نەڤیا ناڤێ مامۆستایێ خۆ بدەت و ڤیا ب نهێنی بمینیت

١١٧. دیدارەك كەسایەتی دگەل جەمال یەحیا عەلی، ل رۆژا ٢٠١٥/١١/٤ ل دهۆكێ، جەمال یەحیا سالا ١٩٦٠ێ ل دهۆكێ هاتییەسەردنیایێ، دەرچوویێ پشكا ماتماتیكە ل زانكۆیا مووسلێ، یەك ژ دامەزرێنەرێن یەكگرتووی ئیسلامی كوردستانە و نها ئەندامێ سەركردایەتیا وێ حزبێ یە.

١١٨. هەمان دیدار دگەل دیندار شەفیق نەجمان دوسكی.

١١٩. د. كاظم حبيب، لمحات من عراق القرن العشرين في العهد الجمهوري، (اربيل- ٢٠١٣)، ج٢، ص ٢١٥.

١٢٠. شیمال زیێر محمود (شیمال زنباری)، هندەك راستیێن ڤەشارتی د شۆرشا گولانێ دا، (هەولێر- ٢٠١٥)، بپ ٥٩٨.

١٢١. دیدارەکا کەسایەتی دگەل محەمەد عومر، ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/١٩ ل دهۆکێ.
١٢٢. د. عەلی تەتەر نێرۆەیی، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد لە کوردستانێ عیراق لە سالەکانێ شەری عێراق و ئێران دا (١٩٨٠- ١٩٨٨)، (دهۆك- ٢٠٠٨)، بپ ٢٠٨.
١٢٣. سلام فواز العبيدي، دهوك لمحات من ماضيها و حاضرها، (دهوك- ٢٠١٥)، ص ١٢١.
١٢٤. هەمان ژێدەر، بپ ١٢١- ١٢٢.
١٢٥. بۆ زانیارێن بەرفرەتر بنێرە: د. كاظم حبيب، ژێدەرێ بەرێ، ب ١، بپ ١٧٢- ١٧٧
١٢٦. هەمان دیدار دگەل موسەدەق تۆڤی.
١٢٧. دیدارەك دگەل نڤیسەر خالد صالح، سالا ١٩٥٧ هاتیە سەردنیایێ، دەرچوویێ پەیمانگەها مامۆستایانە ل هەولێرێ، سالا ١٩٧٩ێ هاتیەدامەزراندن و نها مامۆستایە.
١٢٨. ميدل ئيست ووج- مركز مراقبة حقوق الانسان، التطهير العرقي في العراق "كردستان"، ترجمة: د. رزكار، (دهوك- ١٩٩٩)، ص ٣٢٢
١٢٩. هەمان دیداردگەل نڤیسەر خالد صالح.
١٣٠. عەلی تەتەر نێرۆەیی، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، بپ ٣٦٣- ٣٦٥.
١٣١. علي سنجاري، الحركة التحررية الكوردية مواقف و اراء، (دهوك- ١٩٩٧)، ص ٢٨٥.
١٣٢. بۆ دیتنا وێ بەلگەنامەیێ بنێرە: عەلی تەتەر نێرۆەیی، سیاسەتی حکومەتی عێراق لە کوردستان ١٩٧٥- ١٩٩١، بپ ٦٥.
١٣٣. عەلی تەتەر نێرۆەیی، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، بپ ٣٧٥.
١٣٤. د. عەلی تەتەر، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، بپ ٣٧.
١٣٥. بشرى برتو، الفترة الاولى في حكم حزب البعث في العراق ١٩٦٨- ١٩٨١، (السليمانية- ٢٠٠٩)، ص ٢٨.
١٣٦. دیدارەك کەسایەتی دگەل عەبدولرەزاق گەرماڤی، ل رۆژا ٢٠١٥/١٠/١٨ێ ل دهۆکێ.
١٣٧. میدل ئیست ووچ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٢- ٩٣.
١٣٨. هەمان ژێدەر، بپ ٩٤- ٩٥.
١٣٩. د. عەلی تەتەر نێرۆەیی، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، بپ ٤٠- ٤١.
١٤٠. علي سنجاري، القضية الكردية و حزب البعث العربي الاشتراكي في العراق، (دهوك- ٢٠٠٩)، ج٢، ص ٢٦٨ ؛ د. احمد عبدالعزيز الحاج، صمود الشعب الكردي في مواجهة التحديات (اربيل- ٢٠١٥)، ص ١٦٠.
* ل دەسپێکێ ئەڤ کۆمەلگەهە ب مەرەما ئاکنجیکرنا خەلکێ وان گوندان یێن راگوهاستن ژێ دگرت هاتەئاڤاکرن، بەلێ ژبەر ئاریشا مەزنا ئاکنجیبوونێ ل بازێری خانیێن کۆمەلگەهی ل سەر تەخێن جوداێن فەرمانبەرێن دهۆکێ هاتنە لێکڤەکرن.
١٤١. علي سنجاري، القضية الكردية و حزب البعث العربي الاشتراكي في العراق، ص ١٩٥ ؛ بۆ زانینا هژمار و ناڤێن گوندێن ل پارێزگەها دهۆکێ هاتینەوێرانکرن بنێرە: علي سنجاري، هەمان ژێدەر، بپ ٢٨١- ٢٨٤.
١٤٢. نشوان شكرى هروري، تطور استعمالات الأراضي السكنية في مدينة دهوك ١٩٧٧- ١٩٨٧، مجلة دهوك، العدد ١١، دهوك- كانون الاول ٢٠٠٠، ص ٩٨- ٩٩.
١٤٣. میدل ئیست ووچ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٩٠- ٩١.
١٤٤. د. عەلی تەتەر بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، بپ ٣٨.
١٤٥. د. احمد عبدالعزيز الحاج، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٠٠.
١٤٦. سعيد الحاج صديق الزاخويي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٨١- ٢٨٢.
١٤٧. هەمان ژێدەر، بپ ٣٨٢.
١٤٨. د. عەلی تەتەر بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، بپ ٤٣.
١٤٩. الشيخ عطا الطالباني، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٩٤.
١٥٠. مجلة دهوك، وثيقة حكومية تعترف صراحة بتعريب بلدة أتروش الكوردية، مجلة دهوك، العدد ٢٨، دهوك، تشرين الاول ٢٠٠٥، ص ٨٥.
١٥١. د. عەلی تەتەر نێرۆەیی، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی کورد، بپ ٤٤.
١٥٢. علي سنجاري، القضية الكوردية و حزب البعث العربي الاشتراكي في العراق، ص ١٩٦.

١٥٣. هەمان دیدارا كەسایەتی دگەل عەبدولرەزاق گەرماڤی.

١٥٤. هەمان دیدارا كەسایەتی دگەل تەیار سەلیم گەرماڤی.

١٥٥. دەربارەی ڤێ چەندێ بژڤرەڤە چیرۆكا دەست ب سەردا گرتنا مولكێن شیمال زیێر زێباری، ژ بەركو د وی دەمیدا ئەندامێ لیژنا ناوچا شێخان یا پارتی بوو، بنێرە: شیمال زیێر مەحموود، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٣٢٨.

١٥٦. د. عەلی تەتەر نیروەیی، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی كورد، بپ ٢٠٧.

١٥٧. بۆ دیتنا دەقێ برووسكێ بنێرە: علي سنجاري، القضية الكوردية و....، بپ ٤١٢- ٤١٣.

١٥٨. میدل ئیست ووچ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٢٥٨.

١٥٩. دیدارەك كەسایەتی دگەل سبحی حەجی مستەفا، رۆژا ٢٠١٥/١٢/٢ ل دهۆكێ، ناڤبری سالا ١٩٥٧ێ ل دهۆكێ هاتیبەسەردنیایێ، سالا ١٩٨٤ێ بەكالوریۆس د ئەندازیاریا مەدەنی دا وەرگرتییە و د هەمان سالدا ل كارگێریا خۆجهیا پارێزگەها دهۆكێ هاتیبەدامەزراندن، نها رێڤەبەرێ پلاندانان و دووڤچوونێ یە ل پارێزگەها دهۆكێ؛ هەروەسان دیدارەك كەسایەتی دگەل سالح دربوو، ل رۆژا ٢٠١٦/٣/٢٨ ل دهۆكێ، ناڤبری فەرمانبەرێ كیمیاوی بوو ل كارگەهێ و وەك رێڤەبەرێ بەرهەمی بەری فروشتنا كارگەهێ و پشتێ فروشتنێ ژی كاركرییە.

١٦٠. هەمان ژێدەر، بپ ٣٩٤- ٣٩٧.

١٦١. زۆزان ناسر مستەفا، ئۆپراسیۆنێن ئەنفالێ ل كوردستانێ، دەرئەنجام كاردانەڤە، (هەولێر- ٢٠١٣)، بپ ١٣٦.

١٦٢. میدل ئیست ووچ، ژێدەرێ بەرێن بپ ٣٩٣.

١٦٣. زۆزان ناسر مستەفا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٣٩.

١٦٤. مجلة مەتین، معركة خاتمة الأنفال لفترة من ٨/٢٨- ١٩٨٨/٩/٣، العدد ٣٥، ێب ١٩٩٤ ص ٧٤-٧٦.

ئەڤ نامیلكەیا لەشكەری و نهێنی ب ئیمزا سەركردێ تیپا پێنجا لەشكەرێ عیراقێ وی سەردەمی اللواء الركن یونس محمد الذرب هاتیبەبەلاڤكرن.

١٦٥. هەمان ژێدەر، بپ ١٤٠- ١٤١.

١٦٦. میدل ئیست ووچ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤٠٩.

١٦٧. د. عەلی تەتەر نێروەیی، بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەیی كورد، بپ ٥٦٢- ٥٦٣.

١٦٨. خالد ئەحمەد بادی، رۆژانێت چادرگەها مێردینێ، (دهۆك- ٢٠١٤)، بپ ٥٦٥.

١٦٩. د. عەلی تەتەر نێروەیی، بزاڤی....، بپ ٥٦٥.

١٧٠. میدل ئیست ووچ، ژێدەرێ بەرێ، بپ ٤١٢- ٤١٣.

١٧١. هەمان ژێدەر، بپ ٤١٧.

١٧٢. مجلة مە تین، معركة خاتمة الأنفال لفترة من ٨/٢٨- ١٩٨٨/٩/٣، العدد ٣٥، ێب ١٩٩٤ ص ٧٤-٧٦.

١٧٣. ئەڤ كەلایە بۆ مەرەمێن لەشكەری ل سالێن حەفتییان هاتبوو ئاڤاكرن.

١٧٤. زۆزان ناسر مستەفا، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٥٣- ١٥٤.

١٧٥. د احمد عبدالعزیز الحاج، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٤٢- ١٤٣.

١٧٦. بۆ پێزانینێن بەرفرەهتر بنێرە: د. كاظم حبیب، ژێدەرێ بەرێ،بەرگێ ٣، بپ ٨٦- ١٨٢.

١٧٧. سعید الحاج صدیق الزاخویي، ژێدەرێ بەرێ، بپ ١٧٢- ١٧٣.

١٧٨. دیدارەكا كەسایەتی دگەل رەشید محەمەد مستەفا ئامێدی، ل رۆژا ٢٠١٦/٤/٣ ل دهۆكێ، رەشید مەحەمەد مستەفا ل ئامێدێ هاتییەسەردنیایێ، قوناغا سەرتایی ل ئامێدێ خواندیە، سالا ١٩٥١- ١٩٥٢ قوناغا ئامادەیی پشكا زانستی تەواوكریە و وەك مامۆستا هاتییەدامەزراندن، مالا وی كەتییەبەر ڤێ هێرشا فرۆكان و د ئەنجامدا هەڤژینا وی و كچەكا وی هاتینە شەهیدكرن.

١٧٩. علي سنجاري، القضية الكوردية و.... بەرگێ ٣، بپ ٩١.

# سیاسەتا گوهۆرینا دیموگرافی ل پارێزگەها دهۆکێ (۱۹۷۵- ۱۹۸۸)

م. زۆزان ناصر مستەفا
زانکۆیا دهۆک - کولیژا زانستێن مروڤایەتی

## پێشەکی

گوهۆرینا دیموگرافی کو بوارێن تایبەت ب ئاکنجیبیانڤە بگرە ژ زۆربوون، کێمبوون و کوچکرن... هتد بخۆڤە دگریت، دهێتە هژمارتن ژلایەنێن زۆر گرنگ و کارتێکرنەکا مەزن ل سەر هەمموو بوارێن ئابووری، سیاسی و کۆمەلایەتی هەی، لەورا حکۆمەتێن ئێك ل دووڤ ئێكێن دەسەلاتداری ل ڤی وەلاتی کرین هەر ل پشتی دامەزراندنا دەولەتا عیراقێ (۱۹۲۱)ێ و گرێدانا ویلایەتا مووسل ب عیراقێ ڤە ل سالا (۱۹۲۵)ێ، ب هەمموو رەنگان هەولداینە ژبۆ کێمکرنا رێژەیا نەتەوەیێن نە عەرەب د عیراقێدا ب تایبەت کوردان؛ چونکی ژ رێژەیا ئاکنجییێن عیراقێ پشتی عەرەبان ب رێژەیا دووێ دهێن.

ژبۆ پاراستنا بەرژەوەندییا نەتەوێ عەرەب ل عیراقێ، و بجهـ ئینانا خەونا سەرەکی ئەوژی دەولەتەکا ئێك نەتەوە، ئێك زمان، ئێك پارت و ئێك سەرکردە، مللەتێ کورد ب ئاستەنگا سەرەکی یا بجهـ ئینانا ڤێ خەونێ ددا زانین، لەورا دەسەلاتدارێن عیراقێ ب تایبەت رژێما بەعس ب درێژییا هەردو قوناغێن ژێ حوکمدارییا خۆ ل عیراقێ (۸ی شوبات ۱۹٦۳ ــ ۹ی نیسان ۲۰۰۳) ژبۆ بجهـ ئینانا ڤێ خەونێ و نەهێلانا ڤێ ئاستەنگێ هەمموو هەولەك داینەکاری، و بەردەوام د نڤیسینێن خۆدا باسێ مەترسییا کوردان بۆ سەر نەتەوێ عەرەب و ئاخا عەرەبی کرییە، و ئەندام و لایەنگرێن خۆ ژ هەمموو جۆر و شێوازێن ژ ناڤبرنێ دژی گەلێ کورد ئاگەهدار کرینە، پلان و نەخشەیێن تێروتەسەل ژ بۆ ڤێ چەندێ دارشتینە مینا: کوشتن، گرتن و ڤەگوهاستن...هتد. کو ب لایەنێن گرنگێن گوهۆرینا دیموگرافی دهێنە دانان.

## کورتییەکا مێژوویی ل دوور سیاسەتا گوهۆرینا دیموگرافی ل کوردستانا عیراقێ

کوردستان ب درێژاهییا مێژوویێ جهێ حەزا داگێرکەران بوویە، ژ رۆژهەلات و باکوور و رۆژئاڤا و باشووری ڤە، شەپۆلێن مەزن و بەربەلاڤێن کۆچکرن و هاتنا عەرەبان ژ نیمچە دۆرگەیا عەرەب و شامێ ب سەدان سالان بوویە تا گەهشتینە سنوورێ

دەڤەرێن باشووری کوردستانێ و دەست ب سەر ئاخ و زەڤی و زار و مال و سامانێ گوند نشینێن کوردا دا گرتییە[١].

ل ڤێرێ ئەم دشێین ڤێ سیاسەتێ بۆ چەند قۆناغەکێن مێژوویی دابەش بکەین:

( ١٩٢٥_ ١٩٥٨)ێ کو قۆناغا سەردەمێ شاهاتی (مەلکی) بخۆڤە دگریت، دڤی سەردەمیدا؛ چونکی دەولەتا عیراقێ د قۆناغەکا نوی دابوویە و کویراتییەکا مێژوویی، سوپایەکێ ب هێز و مودرن، شیانێن ئابووری و مرۆڤی ل بەر دەست نەبوون، لەورا سیاسەتا گوهۆرینا دیموگرافی هندەك دەڤەرێن کێم ڤەگرتن[٢].

(١٩٥٨ _ ١٩٦٣)ێ د ڤێ قۆناغێدا بۆ ئێکەمین جار د مێژوویا عیراقێدا رژێما کۆماری هاتە راگەهاندن، سەردەمێ پاشایەتی ب داویهات، د ڤی ماوەیدا دەولەتا عیراقێ د دەستوورێ کاتیێ خۆدا راگەهاند کو گەلێ عیراقێ ژ دو نەتەوێن سەرەکی پێکدهێن کو عەرەب و کوردن، لێ ب کردار چ مافەك بۆ کوردا ب رەوا نەددیت، بەلکو ب پێچەوانە ب دژی وان راوەستیان[٣].

(١٩٦٣_ ١٩٦٨)ێ د ڤی ماوەیدا و ل ٨ شوباتا ١٩٦٣ێ پارتا بەعس ژ ئەنجامێ کودەتایەکا لەشکەری حوکمرانی گرتەدەست، هەر پشتی گرتنا دەستەلاتا سیاسی رژێمەکا خویناوی دامەزراند، سیاسەتا کوشتن و گرتن و کافل کرن و تەخت کرنا گوندێن کوردی دارشت، لێ ژبەر کو ژیێ وی بتنێ ٦ هەیڤ بوون، نەشیان درێژاهیێ ب ڤێ سیاسەتێ بدەن، ژبەرکو د ڤی ماوەیدا بەعس پارتەك بوو خودان شیانێن ئابووری و سیاسیێن تەمام نەبوون، لێ هەر د ڤی ماوەیێ کێمدا کوردستان یا بێ بەهر نەبوو ژ ڤەگوهاستن و عەرەبکرنێ[٤].

(١٩٦٨ _ ١٩٧٥)ێ ل سالا (١٩٦٨)ێ بۆ جارا دووێ و ب رێکا کودەتایەکا لەشکەری پارتا بەعس هاتە سەر حوکمی[٥]، سیاسەتا گوهۆرینا دیموگرافی کەفتە د قۆناغەکا نویدا، ئەڤ جارە ب پلان و نەخشەیێن تێروتەسەل پێنکاڤ هاڤێتن[٦].

## گرنگیا پێکهاتا پارێزگەها دهۆکێ

### ئێك: ژ روویێ جوگرافی ڤە:

پارێزگەها دهۆکێ دکەڤیتە باکووری عیراقێ، ژ لایێ باکووری ڤە کۆمارا ترکیایە، و رۆژئاڤایێ وێ کۆمارا عەرەبیا سوری و رۆژهەلاتێ وێ پارێزگەها هەولێرێ و نەینەوا و باشووری وی پارێزگەها نەینەوا یە[٧].

دهۆك دهێتە هژمارتن ژ پارێزگەهێن سنووری، و گرنگییەکا زۆر ژ روویێ مێژوویی و جوگرافی ڤە هەیە، شوینوارێن مێژوویی بگرە ژ گر و شکەفتێن زۆر بەلگەنە ل سەر گرنگیا وێ، زێدەباری جهێ جوگرافیێ وێ یێ باش کو دکەڤیتە سەر سنوورێن دو دەولەتان وەکی ل سەری مە ئاماژە پێ دای[٨].

جیوپولەتیکا دەڤەرێ ب گشتی تایبەتمەندییەکا جودا دابوو ڤێ دەڤەرێ هەرسێ وەلاتێن عیراق، سوریا، ترکیا پێکڤە گرێ ددەت و ب دەرازینکا ئێکانەیا عیراقێ بەرەڤ وەلاتێن ئەوروپا دهێتە هژمارتن، د ڤێ دەڤەرێدا چەندین ئایین و مەزهەبێن جۆرا و جۆر و نەتەوە دژیان، مینا: موسولمان، مەسیحی، ئێزدی، لەورا دەسەلاتێن ئێك ل دووڤ ئێکێن عیراقێ هەموو دەمان هەولدا ئەڤێ دەڤەرێ ژ هەموو روویەکیڤە (سیاسی، جوگرافی، کەلتووری، کۆمەلایەتی... هتد) ژ هەموو دەڤەران دا ببریت[٩].

### دوو: ژ روویێ ئاکنجییان ڤە:

رێژەیا ژدایکبوونێ ل هەرێما کوردستانێ ب گشتی تا رادەیەکی زێدەترە ژ رێژەیا ژدایکبوونێ ل ناڤەراست و باشووری عیراقێ و ب ڤی رەنگی هەر هزار ژنا ژ ژنێن کورد سالانە ٩٧٧ زارو دبوون، د هەمان دەمدا هەر هزار ژنێن ناڤەراست و باشووری عیراقێ سالانە ٩٢٢ زارو دبوون[١٠].

هەروەسا رێژەیا مرنێ د هەرێما کوردستانێ دا کێمترە ژ دەڤەرێن ناڤەراست و باشووری عیراقێ،

ئەڤ چەندە ژی د زڤریت بۆ هەبوونا ئاڤ و هەوایێ پاقژ و كێمیا نەخۆشیا ...هتد[11].

پارێزگەها دهۆكێ لایەكێ بەرفرەهێ ڤێ زێدەبوونێ بخۆڤە ددیت، دیاردا گەشەكرنا ئاكنجییان برەنگەكێ باش یا دیاربوو د ماوێ سالێن حەفتێیاندا ب تایبەت د هندەك بنگەهێن شارستانی ل دەڤەرێدا[12]، لێ سەرەرای ڤێ چەندێ هەمیێ دێ بینین هەژمارا كوردان ل عیراقێ ئامار بۆ ئامارێ بەرەڤ كێمبوونێ دچوون، ئەڤە ژی د زڤریت بۆ وێ سیاسەتا ژلایێ حكومەتێ ڤە دهاتە پەیرەوكرن[13].

### سێ: ژ روویێ كارگێری ڤە:

پارێزگەها دهۆكێ ب بریارەكا فەرمی یا ژمارە ۲۱۱ یا (ئەنجوومەنا سەركردایەتییا شۆرشێ) و ل ۲۷ێ گولانا ۱۹٦۹ێ هاتیە پێكئینان و ژ پارێزگەها مووسل هاتە دابرین[14]. مەبەستا حكومەتا عیراقێ ژ ڤێ دابرینێ كێمكرنا رێژەیا كوردان بوویە، ب ڤێ چەندێ ژ روویێ جیوپولەتیكی ڤە زیانەكا مەزن گەهاندە كوردان؛ چونكی ئەڤ كارە بۆ ئەگەرێ تێكدانا دیموگرافی و ئیتنیكی یا پارێزگەها مووسل ب ڤێ چەندێ ۱۳.۷٪ ژ ئاكنجییێن پارێزگەهێ كێمبوون، و نێزیكی ۳۰.۷٪ رێژەیا كوردان ژ پارێزگەها مووسلێ كێمكرن[15].

پارێزگەها دهۆكێ ژ روویێ كارگێری ڤە بەردەوام گوهۆرین بخۆڤە دیتینە، پشتی سالا ۱۹٦۹ێ یا پێكهاتی بوو ژ:

١-مەلبەندێ قەزا دهۆك، ب هەردو ناحییێن زاویتە و دۆسكی ڤە، ۸۸ گوندان بخۆڤە دگرن.

٢-قەزا زاخۆ، ب هەرسێ ناحییێن سندی، گولی و رزگاری، ۱۸٦ گوندان بخۆڤە دگرن.

٣-قەزا ئامێدی، ب هەرسێ ناحییێن سەرسنك، بەرواری بالا و نێروە و رێكان، ۳۰۱ گوندان بخۆڤە دگرن.

٤-قەزا سێمێلێ*، ژ مەلبەندێ سێمێلێ و هەردو ناحییێن فەیدێ و سلێڤانی پێكدهێت، ۱٦٥ گوندان بخۆڤە دگرن[16].

## رژێما بەعس و گوهۆرینا دیموگرافیا پارێزگەها دهۆكێ ۱۹۷٥ــ ۱۹۸۸

ئەڤ قۆناغە ب مەترسیدارترین قۆناغ ژ سیاسەتا عەرەبكرن و ڤەگوهاستنا كوردان دهێتە دانان[17]، پشتی تێپەربوونا ماوەیەكی ل سەر نسكۆیا ئادارا سالا ۱۹۷٥ێ و دەسەلاتا راستەوخۆیا بەعسییان ل سەرتاسەری باشوورێ كوردستانێ، ئەوا حكومەتا بەعس چاڤەرێ بوو دكر بجهـ نەهات، نە كورد زۆر ژ پارتا بەعس و حكومەتا وان نێزیكتر كرن، و نە زۆر ژ شۆرشا كوردی ژی دور كرن، لەورا و ژ بۆ هندێ جارەكا دیتر بەرخۆدان ل سەر سنووران دروست نەبیت حكومەتێ ئەڤ سیاسەتە پەیرەو كر:

١-لێكدابرینا نەتەوێ كورد ل سەر ئاخا خۆ بخۆ و ڤەگوهاستنا وان[18].

ئەوبوو حكومەت رابوو ب ڤەگوهاستنا دەڤەرێن سنووری و ل ئوردوگایێن زۆرەملێ كو بەعسییان ناڤ لێنابوو (گوندێن هەڤچەرخ) ئاكنجیكرن، ل پارێزگەها دهۆكێ ژمارەیەكا زۆرا ڤان ئوردیگایان ئاڤاكرن كو هژمارا وان نیزیكی ١٤ تا ١٥ ئوردوگایان بوون مینا ئوردوگایێن: قەدش، شێلادزێ، دیرەلۆك، كان و دیرێ، سیرێ، هیزاڤا، دەركار عەجەم، تلكەبەر، باتیفا، بێكوڤا، بێرسڤێ، چەم كویركێ، باگێرا و كۆرێت گاڤانا. خەلكێ نیزیكی ۲۰۷ گوندان لێ ئاكنجی كرن[19].

دگەل ڤەگوهاستنا وان گوندێن وانژی خرابكرن و ئەو دەڤەر ب دەڤەرێن قەدەغەكری ژ هەموو مرۆڤ و ئاژەلان ددانە زانین[20].

٢-دروستكرنا پشتێنەیا ئاسایشێ ل سەر سنوورێ ئیران، تركیا دگەل عیراقێ ب كووراتیا ۱٥ تا ۲٥ كلم و ب درێژاهیا ۸۰۰ كلم[21].

ئارمانجا حكومەتێ ژ دروستكرنا پشتینەیا

ئاسایشێ ئەڤێن ل خوارێ بوون:

١-گوندێن کوردستانێ ب دەڤەرێن ئاسێ د ناسیارن، کو ئەڤەژی باشترین جهـ بوون، و هێزا بنچینەیا شۆرشێ و ژێدەرێن سەرەکییێن پێشمەرگەی بوون، حکۆمەتا عیراقێ هوسا دزانی ب تێکدانا ڤان گوندان دێ هێزا پێشمەرگەی ب داوی ئینیت.

٢- گوهۆرین و تێکدانا چاوانییا دابەشبوونا ئاکنجییان، واتا گوهۆرینا پێکهاتەیا نەتەوایەتی ب تایبەتی کوردێن هەڤسنوور دگەل پارچەیێن دیێن کوردستانێ کو هەستا نەتەوایەتی ل دەڤ وان زۆر یا بهێز بوو، دوورکەفتنا وان دێ بیتە ئەگەرێ برینا ڤی هەستی و دگەل ئێك ئاگەهدار نابن و نەشێن سوودی ژ ئێك دوو وەربگرن.

٣- گوند لایەکێ هەڤسەنگێ باژێرانن، پێکڤە پارسەنگییا هەرێما کوردستانێ رادگرن، چۆلکرنا وان دێ بیتە ئەگەرێ ژناڤبرنا ئابووری کوردستانێ ب تایبەتی گوندنشین د بەرهەمهێن بوون ب هەردو بوارێن کشتوگال و ئاژەلداری، ب ڤەگوهاستنا وان دێ بنە چینەکا بەکاربەر[٢٢].

٤- کۆمکرنا ئاکنجییان د ئوردوگایێن زۆرەملێ دا ل سەر رێێن گشتی، زێدەتر وەکو هندەك زیندانێن عەسکەری د چوون کو دۆرماندۆری وان ژ هەر چوار لایانڤە رەبیعە دانان ژ بۆ هندێ ددەمێ پێدڤی و ل دووڤ بەرنامەیێن وان رەفتار دگەلدا بهێتەکرن.

٥- ژ روویێ کۆمەلایەتی ڤە، گوندێن کوردستانێ ل بەری ڤەگوهاستنێ، پەیوەندیێن وان یێن کۆمەلایەتی زۆر دخۆش بوون و ئێکودو خۆش دڤیا، حکۆمەتێ هەولدا ب ڤەگوهاستنا وان ڤان پەیوەندییان لاواز بکەن، هەر داب و نەریت و بەهایێن ئەخلاقی یێن کورد بشکێنن و ب هندەك مرۆڤێن بێ رهو ریشال ب دەنە دیارکرن.

٦- زێدەباری بەلاڤبوونا بێکاریێ ددەمێ کۆمکرنا وان دئێك جهدا، کو ئەڤە ژی مەبەستا حکۆمەتێ بوو ژبۆ هندێ خەلکێ کوردستانێ ب ئابووریێ حکۆمەتا ناوەندیڤە بگرێدەن[٢٣].

حکۆمەتێ ل ناڤەراستا سالێن حەفتییاندا ژمارەکا مەزن ژ ئێل و عەشیرەتێن عەرەبان مینا: ئێلێن شەرابی، تایی، زوبێدی، حەدیدی، شەمەری. ب بیانوویا خودانکرنا پەزوحەیوانان ل سێمیلێ کۆمڤەکرن[٢٤].

هەروەسا د هەمان سالدا حکۆمەتێ ئاکنجییێن ١٣ گوندێن ئێزدی سەر ب قەزا زاخۆ ڤە ژ وانا: دێرەبوون، پێشابوور، قەرەولا، کورینی، پێبزنێ، باجدا میری، باجدا کەندالا، باجدا براخی، کانی عەرەبی و قرودا ...هتد، ڤەگوهاستن و گوندێن وان خرابکرن و دگەل عەردی راستکرن، و دەست ب سەر عەردێن وان داگرت و عەرەب ل جهێ وان پشتی دروستکرنا گوندێن نموونەیی و تایبەت ب واناڤە لێ ئاکنجیکرن[٢٥].

حکۆمەتێ د هەمان سالدا و ل دەڤەرا ئاسهێ سەر ب قەزا سێمێلێ ڤە خەلکێ نێزیکی (٧٢) گوندان ژ ڤێ دەڤەرێ ڤەگوهاستن و ل کۆمەلگەهێن ژ ئالیێ حکۆمەتێ ڤە هاتینە دروستکرن ئاکنجیکرن[٢٦].

ل سالا (١٩٧٧)ێ ژمارەکا زۆر ژ خێزانێن عەرەبان ژ پارێزگەهێن ( واست، زیقار، نەینەوا، سەلاحەددین) ل کۆمەلگەهێن دەڤەرا ئاسهێ ئاکنجیکرن[٢٧].

حکۆمەت ل سەر سیاسەتا ڤەگوهاستنا کوردان هند یا سوور بوو وەکو نەعیم حەداد ئەندامێ سەرکردایەتییا نەتەوەییا پارتا بەعس ل سالا (١٩٧٨)ێ گۆتی: کو ئەو د ئامادەنە ب ملیونەها کوردان ژ ناڤ ببەن ژبۆ پاراستنا ئاسایش و سەقامگیری و شارستانیەتێ و دەڤەرێ ب دەڤەرەکا عەرەب یا ئارام ب گوهۆرن[٢٨].

حکۆمەتێ ژ بۆ گوهۆرینا دیموگرافی هەموو شێوازەك گرتنەبەر، ژ وانژی گوهۆرینا نەتەوەیی بوو، ئەو بوو پێکهاتەیێن مەسیحی، ئێزدی و شەبەك وەك نەتەوە ب عەرەب ددانە دیارکرن. ل دووڤ سەرژمێرییا سالا (١٩٧٧)ێ رێژەیا عەرەبان ل هندەك جهان کو ئێك عەرەب ژی تێدانەبوو، ژ ئەگەرێ پرۆسەیا عەرەبکرنێ ژ کوردان زێدەتر لێ هاتبوون، بۆ وێنە: رێژەیا عەرەبان ل دەڤەرا سلێڤانەیا دا گەهشتبوو ٨٨.٧٪، و ل ئامێدیێ

ژی گەهشتبوو ١٣٪، رێژەیا كوردێن ئێزدی ل دهۆكێ بۆ ٢.٠٤٪ كێم ببوو، لێ رێژەیا عەرەبێن ئێزدی كو هەر هەبوون نینە، گەهشتبوو ٩٧.٥٪[٢٩].

حكۆمەتا عیراقێ ب ڤەگوهاستنا كوردان ل سەر گوندێن وان ل سالێن (١٩٧٧ – ١٩٧٨)ێ، زیانەكا زۆر گەهاندە ژێرخانەیا ئابووریا كوردستانێ، ب هزاران كوردێن بەرهەمهێنەرێن بەرهەمێ كشتوكالی، ب تاكێن بێكار و بێ بەرهەم و بێ داهات گوهۆرین، بۆ وێنە: رێژەیا ئاكنجییێن چالاك ژ روویێ ئابووری ڤە بەرامبەر ئاكنجییێن كوردستانێ ب گشتی ل سالا (١٩٧٧)ێ ٤٧.٤٪ بوو، لێ بۆ سالا (١٩٧٨)ێ بۆ (٣٠.٤٪)ێ هاتە خوارێ، و رێژەیا بێكاریێ ژ (٣.٢٧٪)ێ بلند بوو بۆ (١٦.٢٨٪)[٣٠].

د ناڤبەرا سالێن (١٩٧٧ـ ١٩٧٩)ێ ژمارا وان گوندێن هاتینە ڤەگوهاستن ل پارێزگەها دهۆكێ ب ڤی رەنگێ ل خوارێ بوون: قەزا زاخۆ ٥١ گوند ل هەردو ناحییێن سندی و گولی. قەزا ئامێدی ١٥٦ گوند. ٩٦ گوند ل ناحیا نێروە و رێكان، ٦٠ گوند ژی ل ناحیا بەرواری بالا[٣١].

ل سالا (١٩٨٠)ێ و پشتی دەستپێكرنا جەنگی دگەل ئیرانێ سیاسەتا ڤەگوهاستن، دوورێخستن و عەرەبكرنا كوردستانێ توندتر لێهاتن ب بیانوییێن پشكەك ژ جەنگی، هژمارا ئەو گوندێن هاتینە خرابكرن ژ لایێ حكۆمەتا عیراقێ ڤە زێدەببوون، د ڤێ سالێ دا و ل دەڤەرێن باشوور و رۆژئاڤا پرۆژەیەكێ مەزن ژلایێ حكۆمەتێ ڤە هاتبوو رێكخستن بۆ ڤەگوهاستنا كوردان و ئاكنجیكرنا عەرەبان ل جهێ وان و بۆ ڤێ مەبەستێ ژی نیزیكی ٢٠٠٠ خانی دروست كربوون[٣٢].

بوارێن رەوشەنبیری و خواندنێ بەشەكێ دی یێ گوهۆرینا دیموگرافی بوو، هەر بۆ ڤێ مەبەستێ ژی خواندنا سەرەتایی و ناڤنجی ل پارێزگەها دهۆكێ ب تەمامی بۆ زمانێ عەرەبی گۆهارتبوو[٣٣].

مەبەستا حكۆمەتێ ژ نیشتەجێكرنا عەرەبان ل كوردستانێ تنێ عەرەبكرن نەبوو، بەلكو پاراستنا ئەمنیەتا خۆ ژی بوو، ل دەمێ سەرەدانا عزەت دووری ل گولانا (١٩٨١)ێ بۆ پارێزگەها دهۆكێ و ب تایبەت قەزا زاخۆ، بڕیاردا كو ئەو هوزێن عەرەب ئەوێن كو ژ دەڤەرا ئیبراهیم خەلیل و دەڤەرا سێ سنووری تركیا – سوریا – عیراق ل پێشابوور ئاكنجی كرین چەكدار بكەن. واتە دیاردەیا جاشایەتیێ[٣٤] تنێ كورد نەڤەگرتن، بەلكو ئەو عەرەبە ژی ڤەگرتن كو د ئامادە بوون بێنە كوردستانێ، و ل سەر مولك و مالێن كوردا د روینشتن، پێدڤی بوو ئاسایشا خۆ و حكۆمەتێ ژی بپارێزن و ب ڤی رەنگی حكۆمەتا عیراقێ دوژمنداری ژی دناڤبەرا كورد و عەرەبان دا دروستكر[٣٥].

رۆژ ب رۆژ پرۆسەیا گوهۆرینا دیموگرافییا كوردستانێ توندتر لێ دهات، كوردا ژی هەولددا بەرگریێ ژ ئاخا خۆ بكەن و هندەك جارا ژی نەچار دبوون پەنا دبرە بەر هێزێ؛ چونكی حكۆمەتێ چ مافەك بۆ نەهێلا بوون و ل سەر ئاستێ جیهانێ ژی چەندین جارا هوشداری داینە وان عەرەبێن كو هاتبوونە سەر گوندێن كوردان ب تایبەت ل زاخۆ و سێمێلێ. لێ ئەڤان هوزێن عەرەبان ب هاندانا حكۆمەتێ دبەردەوام بوون ل سەر مانەڤەیا خۆ و حكۆمەتێ ئەو چەكدار كربوون و زۆرداری ل خەلكێ كورد دكر، پێشمەرگەیێ پارتی ل ٢ی شوباتا ١٩٨٣ێ هێرش كرە سەر كۆمەلگەهێن باستكێ دناڤبەرا زاخۆ – سێمێل، كو عەرەبێن هاوردە لێ بوون و چەندین جاش و سەرباز ژێ كوشتن[٣٦].

حكۆمەتێ نە بتنێ ب ڤەگوهاستنا گوندان دڤیا دژایەتییا پێشمەرگەی بكەن، بەلكو سیاسەتەكا زۆر توند بەرامبەر كەس و كارێن وان ژی بكاردئینا، مینا گرتن، بێ بەهركرن و سێدارەدانا وان، بۆ وێنە: ل دووڤ بڕیارا ژمارە ٨٧ ل ١٤ی تەباخا ١٩٨٥ێ رێڤەبەریا ئاسایشا زاخۆ بڕیاردا محەمەد عەلی عادل بەهائەدین پێشنڤێژێ مزگەڤتا كوندك ل قەزا زاخۆ ب ڤەگوهێزن ژبەر كو بابێ وی گەهشت بوو ناڤ رێزێن پێشمەرگەی[٣٧].

لیژنا هەماهەنگییا ئاسایشێ ل پارێزگەها دهۆكێ ل ٢٨ی چریا ئێكێ ١٩٨٥ێ بڕیاردا كارمەندێن ڤان رێڤەبەریێن سەر ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە ئەو

ژێ: رێڤەبەریا پەروەردێ، رێڤەبەریا تەندروستی، رێڤەبەریا ئەوقاف و كاروبارێن ئایینی، رێڤەبەریا رێك و پرا و رێڤەبەریا ڤەگوهاستنێ ژ گوندێن قەدەغەكری بێنە ڤەگوهاستن بۆ بنكەهێن قەزا و ناحییان[٣٨].

د یاداشتەكێدا كو ئێكەتییا نیشتمانییا كوردستانێ كو پێشكێشی سكرتێرێ نەتەوەیێن ئێككرتی و چەند رێكخراوێن دی یێن جیهانی كریوو دبێژیت: بتنێ د ناڤبەرا هەیڤا تیرمەهێ ــ چریا دووێ ١٩٨٦ێ دا حكۆمەتێ زێدەتر ژ ١٩٩ گوندێن كوردان خراب كرن. لێ ب گشتی ل دەستپێكا سالا ١٩٨٥ێ تاكو خزیرانا ١٩٨٧ێ زێدەتر ژ ٩٠٠ گوندان خراب كرن ژ وانا، ١٥٠ گوند سەر ب پارێزگەها دهۆكێ ڤەنە[٣٩].

هەر د بەردەوامییا سیاسەتا گوهۆرینا دیموگرافی و ل سالا ١٩٨٧ێ حكۆمەتا عیراقێ جارەكا دی ٧ گوندێن ناحیا فەیدیێ سەر ب قەزا سێمێلێ ڤە خراب كرن ئەو ژێ: گرێ پان، گرشینی، رِكاڤا، سینا، شێخ خدری، شاریا و كەلە بەدرێ. هەروەسا دەست ب سەر ئەردێ چاندنێ یێ جۆتیارێن گرێپان و كەبەرتو داگرت[٤٠].

هەر ب مەبەستا كیمكرنا كوردان ل ٢٣ی شوبات ـ ٦ی ئەیلوول ١٩٨٨ێ ئۆپەراسیۆنێن ئەنفالێ ل ژێر سەركردایەتییا عەلی حەسەن ئەلمەجید و ب بەشداریا فەیلەقێن ١ و ٥ و رێڤەبەریێن گشتیێن ئەمن و هەوالگێرییا سوپای و فەوجێن جاشان، د ٨ قۆناغاندا دەستپێكرن[٤١]، ژ وانا ل ٢٥ی تەباخێ ١٩٨٨ێ ڤان ئەنفالا دەڤەرا بەهدینان بخۆڤەگرن و د رۆژا ئێكێ یا ڤێ ئۆپەراسیۆنێ دا ٧٧ گوندێن سەر ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە كیمیابارانكرن[٤٢].

فەرماندێ فەیلەقا ٥ یونس ئەلزەرب د ئاخفتنەكا خۆدا دەربارەی ئەنفالا بەهدینان دبێژیت: پێدڤییە كارێن خۆ زۆر ب رێكوپێكی و نهێنی جێبەجێبكەن، كو دگرێداینە ب وێرانكرنا (٣٠٠- ٤٠٠) گوندێن دەڤەرێ[٤٣].

ئەڤ كارە وەكو وان دانای بجهـ هات، د ماوەیێ ڤێ ئەنفالێ دا هەر ژ ٢٥ی تەباخ ــ ٦ی ئەیلوول ١٩٨٨ێ هژمارا گوندێن هاتینە خرابكرن ٤٠٣ گوند بوون، كو زۆربەیا وان سەر ب قەزا ئامێدیێ ڤە بوون وەك هەڤبەركرن دگەل قەزایێن دیێن سەر ب پارێزگەها دهۆكێ ڤە، ئەڤ چەندە ژێ دزڤریت بۆ وێ هژمارا زۆرا گوندان ل ڤێ قەزایێ[٤٤].

## كورتی

گوهۆرینا دیموگرافییا ئاخا كوردستانێ بەشەكێ بەرفرەهێ سیاسەتا درِندانەیا حكۆمەتێن دەسەلاتدار ل عیراقێ بخۆڤە دگرت، ب تایبەت رژێما بەعس، نەخشە و پلان و داهاتەكێ زۆر ژ بۆ بجهـ ئینانا ڤێ سیاسەتێ تەرخان كرن.

پارێزگەها دهۆكێ ژێ مینا هەموو دەڤەرێن دیێن كوردستانێ ب بەر ڤێ سیاسەتێ كەفت، و رژێما بەعس هەموو رێیەك گرتنە بەر ژبۆ گوهۆرینا دیموگرافییا ڤێ دەڤەرێ؛ چونكی پارێزگەها دهۆكێ تایبەتمەندییەكا زۆر هەبوو ژ روویێ جوگرافی و پێكهاتەیا وێ یا نەتەوەیی...هتد.

هەر ژ هاتنا رژێما بەعس بۆ سەر دەسەلاتداریێ ل ١٩٦٨ێ دەست دا جێبەجێكرنا سیاسەتا گوهۆرینا دیموگرافی ل هەموو دەڤەرێن كوردستانێ، لێ ل ناڤەراستا سالێن حەفتێ باندا ڤێ سیاسەتێ شێوازەكێ دیتر بخۆڤە دیت و ڤەگوهاستن و كاڤلكرنا گوندێن كوردستانێ لایەكێ بەرفرەهێ ڤێ سیاسەتێ بخۆڤە گرت، و د ئەنجامدا هژمارەكا زۆرا گوندێن پارێزگەها دهۆكێ تووشی ڤێ سیاسەتێ هاتن.

دگەل دەستپێكرنا جەنگی دگەل ئیرانێ ل دەستپێكا سالێن هەشتێیاندا سەرەرای كوشتن، گرتن و كیمیابارانكرن، سیاسەتا گوهۆرینا دیموگرافی ژێ هەر یا بەردەوام بوو و توند تر ژێ لێ هات، داوی جار ژێ و هەر ب مەبەستا كیمكرنا رێژەیا كوردان ئۆپەراسیۆنێن ئەنفالێ ژێ دارشتن، د ئەنجامدا زیانەكا زۆر ب پارێزگەها دهۆكێ و هەموو كوردستانێ گەهاند.

## ژێدەر و پەراوێز:


١. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: محەمەد سەعید صوفی: بەلگەنامەکانی حکۆمەتی عیراق خۆیان لە پاکتاوکردنی رەگەزیدا دەدوێن, گۆڤاری (ئەنفال), ژمارە (٣), ٢٠٠٢, ل ٤٦.

٢. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: ئەمین قادر مینە, ئەمنی ستراتیجی ی عیراق و سێکوچکەی بەعسیان: تەرحیل, تەعریب, تەبعیس, چاپی دووەم, (سلێمانی: ١٩٩٩), ل ٣٣٣.

٣. هەمان ژێدەر, بپ ٣٣٧.

٤. هەمان ژێدەر, بپ ٢٣٧- ٢٣٨.

٥. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: موراد حەکیم محەمەد, ئاکامە کۆمەلایەتیەکانی سیاسەتی راگواستنی کورد لە عیراق لە سەردەمی بەعس دا, سەنتەری لێکۆلینەوەی ستراتیجی کوردستان, (سلێمانی: ٢٠٠٤), ل ١٢٠.

٦. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: بابان کەرکوکی, تەعریب شەمەندەفرێکی بێ وێستگەیە, گۆڤاری (هاواری ئەنفال), ژمارە (١), ٢٠٠٢, ل ٩٢.

٧. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: هلز عثمان میرو, دهۆك ١٩٤٥- ١٩٧٥, رسالة ماجستیر غیر منشورة مقدمة الی مجلس کلیة التربیة جامعة زاخو, (زاخو: ٢٠١١).

٨. هەمان ژێدەر.

٩. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: لەتیف نێرویی, یادی ئەنفالکردنی دەڤەری بادینان و پێداچوونەوەیەکی کورت, رۆژنامەی (کوردستانی نوێ), ژمارە (١٦٩٥), ١٩٩٨/٩/١٠, ل ١٠.

١٠. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: نەوشیروان سابیر, کاریگەرییەکانی ئەنفال لەسەر خێزانی کورد, گۆڤاری (عەرعەر), ژمارە (٣), ٢٠٠٨, ل ١٤٤.

١١. هەمان سەرچاوەی, ل ١٤٤.

١٢. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: خلیل اسماعیل محمد, دهۆك - نینوی دراسات في الخصائص الدیموغرافیة للسکان, مرکز کردستان للدراسات الاستراتیجیة, (سلیمانی: ٢٠٠٥), ل ٣٣.

١٣. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: رزگار سعید قادر بشدري, الهجري والتغیر الدیموغرافي و خطط التنمیة في العراق (أقلیم کوردستان نموذجا), مرکز کوردولوجي, (سلیماني: ٢٠٠٩), ل ١٠٦.

١٤. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: هاشم خضیر الجنابي, مدینة دهوك دراسة في جغرافیة المدن, (موصل: ١٩٨٥), ل ٧.

١٥. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: فرمان عبدالرحمن, پاکتاوکردنی رەگەزی کورد لە کوردستانی عیراقدا, (سلێمانی: ٢٠٠٦), ل ٩٥.

- سێمیلێ هەتا سالا ١٩٧٨ێ ناحیەکا سەر ب قەزا دهۆکێ ڤە بوو, د ڤێ سالێدا بوویە قەزا و هەردو ناحیێن فەیدێ کو هەتا هنگێ سەر ب دهۆکێ ڤە بوو و ناحیا سلێڤانەیی (ئاسهێ) کو سەر ب زاخۆ ڤەبوو داینە دگەلدا.

١٦. هاشم خضیر الجنابي, ژێدەرێ بەرێ, ل ٧.

١٧. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: مورادحەکیم محەمەد, سەرچاوەی پێشوو, ل ١٢٤.

١٨. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عەلی تەتەر نێرویی, سیاسەتی حکۆمەتی عێرا ق لە کوردستان لە سایەی بەلگەنامە فەرمییەکاندا ١٩٧٥- ١٩٩١, بەرگی یەکەم, سەنتەرێ ڤەکولینێن کوردی و پاراستنا بەلگەنامان/ زانکۆیا دهۆك, (دهۆك: ٢٠١٠), ل ٦٥.

١٩. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: هەلکەوت, ئوردوگای پەناهەندەیی زۆرەملێ, رۆژناما (برایەتی), ژمارە (٢١٦٥), دهۆك, ١٩٩٦/٤/٢١, ل ٢.

٢٠. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عومەر هەمزە سالح, راگواستن لێکولینەوەیەکی جوگرافی و مێژوویی راگواستنی زورەملێ گوندنشینەکانی کوردستانە, پشدەر وەك نموونە, چاپی یەکەم, دەزگەهێ موکریان, (سلێمانی: ٢٠٠٩), ل ٧١- ٧٢.

٢١. عەلی تەتەر نێروەیی, سەرچاوەی پێشوو, ل ٦٥.
٢٢. عومەر هەمزە ساڵح، سەرچاوەی پێشوو, ل ٧١- ٧٢.
٢٣. هەمان ژێدەر, بپ ٧٤.
٢٤. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: ئەحمەد بالایی, کورد و پێڤاژۆیا ئاشتیێ, (کولن:٢٠٠٢), ل ١٠٥.
٢٥. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: حسو هورمي, الابعاد الديموغرافية لسياسة البعث ضد الايزيدية, ل ٣١٨. ڤەکۆلینەکە پێشکێشی کونفرانسێ ب جیهان ناساندنا کۆمکوژییا گەلێ کورد کریوو.
٢٦. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: درباس مستەفا و بلند محمد, سێمێلێ دناڤبەرا دوهی و ئەڤرودا, گۆڤارا (دهۆك), ژمارە(٥), کانوونا ئێکێ ١٩٩٨, ل ٤٩.
٢٧. هەمان ژێدەر, ل ٤٩.
٢٨. عەلی تەتەر نێروەیی, سەرچاوەی پێشوو, ل ٦٧.
٢٩. هەمان ژێدەر, بپ ٧٥.
٣٠. عەلی تەتەر نێروەیی, سەرچاوەی پێشوو, ل ٧٢.
٣١. مراد حکیم محمد, سەرچاوەی پێشوو, ل ١٣٣.
٣٢. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عەلی تەتەر نێروەیی: بزاڤی رزگاریخوازی نەتەوەی کورد لە کوردستانی عیراق لە سالەکانی جەنگی عیراق و ئیران دا (١٩٨٠ ــ ١٩٨٨)، دەزگای سپیریز، دهۆك، ٢٠٠٨, ل ٢٠١.
٣٣. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: ئیزگەی دەنگی کوردستانی عیراق: شیعر و ئەدەب و فلکلوری کوردی لە ژێر سیبەری رژێمی بەعسی تکریتی رەگەز پەرستی، ١٩٨١/١٢/١٦.
٣٤. بۆ ئێکەم جار مەلا مستەفا بارزانی ناڤێ وان کوردا کریوو (جاش پولیس) ئەوێن کو ب تنێ بۆ پارەی خزمەتا رژێمێ دکر، و هندەك جارا د گوتێ (چەتە)، لێ پشتی کودەتایا ٨ی شوباتێ ١٩٦٣ێ حکومەتێ ناڤێ وان کرە (فرسان صلاح الدين) - وەك ئاماژە ب سەلاحەدینێ ئەیوبی- و هەر د ڤێ سالێدا هندەك عەرەب ژی ب کارێ جاشایەتیێ رابوون کو ناڤێ وان کریوو ( فرسان الوليد) — وەك ئاماژە ب خالد کورێ وەلیدی. بۆ پتر پێزانینان بنێرە: عبدالفتاح علي البوتاني (دكتور)، الحركة القومية الكوردية التحررية دراسات و وثائق، تقديم خليل علي مراد(دكتور)، دهوك، ٢٠٠٤، ص ٤٦٠ — ٤٦١.
٣٥. عەلی تەتەر نێروەیی: سیاسەتی حکومەتی... سەرچاوەی پێشوو, ل ١٠٣- ١٠٤.
٣٦. هەمان ژێدەر, بپ ١٢٤- ١٢٥.
٣٧. ئەرشیفێ سەنتەرێ ڤەکۆلینێن کوردی و پاراستنا بەلگەنامان: کتاب قائمقامية قضاء القلم السري, العدد ١١٤١/٢ في ١٩٨٥/٩/٢١, الى/ مديرية الاوقاف والشؤن الدينية لمحافظة دهوك.
٣٨. ئەرشیفێ سەنتەرێ ڤەکۆلینێن کوردی و پاراستنا بەلگەنامان: کتاب لجنة التنسيق الامنية في محافظة دهوك, العدد ٣٩٦, سري و شخصي, في ١٩٨٥/٢/٨, الى/ الهيئة العامة للزراعة والاصلاح الزراعي لمحافظة دهوك.
٣٩. عومەر هەمزە ساڵح, سەرچاوەی پێشوو, ل ٩٠.
٤٠. حسو هورمی, سەرچاوەی پێشوو, ل ٣١٨.
٤١. بۆ پتر پێزانینان ل دوور ئۆپەراسیۆنێن ئەنفالێ بنێرە: زۆزان ناسر مستەفا: ئۆپەراسیۆنێن ئەنفالێ ل کوردستانێ دەرئەنجام و کاردانەڤە ٢٣ی شوبات- ٦ی ئەیلوول ١٩٨٨, ڤەکۆلینەکا مێژوویيە, ئەکادیمیای کوردی, (هەولێر: ٢٠١٣).
٤٢. بۆ پتر پێزانینان بنێرە، رووف كامل عقراوي (أ. كاوە), الحملة على بادينان وأوضاع اللاجئين, تقديم: فلك الدين كاكەيی, الطبعة الثالثة, (اربيل، ٢٠٠٧), ل ٣٣.
٤٣. زوزان ناسر مستەفا, ژێدەرێ بەرێ, ل ١٣٦.
٤٤. رووف كامل عقراوي (أ. كاوە), ژێدەرێ بەرێ, ل ٣٣.

# خوێندنەک د سیاسەت، فاکتەر و مەرجێن پروسا ئەنفالکرنا کوردان دا ئەنفالا هەشتان "خاتمة الانفال" وەک میناک

د. سالمێ جاسم
زانکۆیا دهۆک - کولیژا زانستێن مروڤایەتی

## دەرازینک

ئوپەراسیونێن ئەنفالان "عملیات الانفال" کو ل ٨٨/٢/٢٢ تا ١٩٨٨/٩/٦ێ د هەشت قوناغ و هەشت دەڤەرێن جوداێن کوردستانێ دا ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ل دژی کوردان هاتبوونە ئەنجامدان، ژ گەلەک لایان ڤە تایبەتمەندیا خۆ هەیە و دهێنە هژمارتن ب گوپیتکا سیاسەتا دەولەتا عیراقێ ل دژی کوردان. "عملیات الانفال" وەک ناڤ و زاراڤە بۆ پروسا جینوسایدکرنا کوردان ب هزرەکا تیژ و پلانەکا پێشوەخت ژ لایێ سەرۆکاتییا رژێما عیراقێ ڤە هاتییە هەڵبژارتن بۆ قرکرنا کوردان وەک نەتەوە. بۆچی دەولەتەک جێنوسایدێ ل دژی گروپەکا نەتەوەیی، رەگەزی یان ژی ئولی ئەنجام ددەت؟ ئەڤە پرسیارەکە و دەهان سالە بسپورێن بوارێ جینوسایدێ مژویلی لێگەریانا بەرسڤا وێ نە.

ئەم کورد نکارین د سیاسەتا ئەنفالکرن، ئانکو جینوسایدکرنا کوردان دا، بگەهین، بێی خواندنەکا بەراوردکاری دگەل جینوسایدا ئەرمەنییان و هولوکوستا جهوویان دا بکەین. پروسا ئەنفال – جینوسایدکرنا کوردان ل ژێر کارتێکرنا هندەک فاکتەر، ئەگەر و مەرجێن تایبەت دا هاتییە ئەنجامدان. ڤان فاکتەر و مەرجان د هەمی جینوسایدێن د دیرۆکێ دا چێبووینە رولەکێ مەزن دیتیە و وەکهەڤی د مەرجێن بەراوردکرنا پروسا ئەنجامدانا وان دا خویا دبیت.

ئوپەراسیونێن ئەنفالان پەیوەندییەکا خورت یا ب شێوێ چێکرنا دەولەتا عیراقێ و سیستەمێ دەسەلاتدارییێن عیراقێ ڤە هەی. عیراق ل سالا ١٩٢١ێ دا وەک دەولەتەک دەستکردی ژ لایێ ئینگلیزان ڤە ب زورێ ژ پێکهاتەیێن بنگەهین، عەرەب (شیعە و سوننە) و کورد بێی رەزامەندیا وان بهێنە وەرگرتن، هاتە دامەزراندن. ئەڤ دەولەتە هەر ژ دەستپێکێ ژ ئالیێ کەمینەیا تاییفی یا عەرەبێن سوننە هاتە برێڤەبرن کو تەنێ ٢٠ ژ سەدێ ژ رێژا خۆجهێن عیراقێ پێکدهات و کورد وەک کێمەنەتەوەیەک کو پتر ژ ٢٠ ژ سەدێ پێکدهاتن کەتە دبن دەستەلاتا عەرەبانڤە. ب درێژاهییا دیرۆکا خۆ و تا نها ژی عیراق نەشیایە ببیتە دەولەتا کوردان و دەربرینێ ژ حەز و خواستەکێن وان بکەت. سیاسەتا پشتگوهـ ئێخستنا کوردان و بندەستکرنا وان دگەلەک پەریودێن جودا دا دەرباس

بوویە و ڕاگوهاستنا کوردان و تەعریبکرنا دەڤەرێن کوردان ستۆنێن سیاسەتا دەولەتێ ل بەرامبەری کوردان پێکدئینان. لێ پشتی ڤێ سیاسەتێ نەشیای سەرکەڤتنێ ب دەستڤەبینیت و کوردان بێدەنگ بکەت، حکومەتا بەغدا دەست ب پلانا سیستەماتیک یا ڤرکرنا کوردان کر. شەڕێ عیراق – ئیرانێ (١٩٨٠ - ١٩٨٨) دەلیڤەیەکا زێڕێن دا ڕژێما عیراقێ پروسا جینوسایدا کوردان ل ژێر سیبەرا شەری ئەنجام بدەت.

## ئەنفال و زانستێ بەراوردکرنا لێکولینێن جینوسایدێ

هەرچەندە بسپورێن مژارا جینوسایدێ نکارینە تا نها ل سەر یەک پێناسا گەلکوژیێ هەڤهزر بن و تیوریەک گشتی ژی نینە کو ل سەر هەموو حالەتێن جینوسایدێ بهێتە بکارئینان، لێ لێکولەرێن جینوسایدێ شیاینە ب ڕێیا زانستێ بەراوردکرنا لێکولینێن جینوسایدان گەلەک هوکارێن وەکهەڤ دەستنیشان بکەن کو جینوسایدێ ژ کوشتاران یان ژی ژ ئوپەراسیونێن عەسکەری ێێن سنوردار جودا بکەن.

ئەرکێ سەرەکی یێ "دانەبەرهەڤدانا لێکولینێن جینوساید"ێ ئەوە کو بەراوردکرنێ دناڤبەرا هەمی جور و شێوێن ڤرکرنا مرۆڤان -جینوساید - دا بکەت، دا بکاریت خال و ستراکتەرێن وەکهەڤ دەستنیشان بکەت[1]. دڤان لێکولینان دا هوکارێن چێبونا جینوسایدێ و پروسەیا ڤوناغێن وێ دهێنە شروڤەکرن، دا د پاشەڕۆژێ دا ڕێ ل بەر کوشتن و ڤرکرنا کێمەنەتەوەیان یان ژی گروپێن ئایینی کو ل ژێر گەفێن کوشتنێ و نەمانێ دانە، بهێتە گرتن. ڤەرێژا شروڤەکرنا لێکولینێن جینوسایدێ بۆ سیاسیان، ڕاگەهاندنێ و بوارێ مافێ مرۆڤان وەك سیستەمێ ئەلارمێ، ئانکو یێ هەوارێ یە، دا کو زوی دهەوارا گروپێن دکەڤنە بەر سیاسەتا جینوسایدکرنێ بهێن[2].

زانایێ جینوسایدێ پێتەر ترومەر Peter I. Trummer خویا دکەت کو جینوساید نە تەنێ پرسگرێکەکا مێژوویی یە، بەلکی د هەمان دەمی دا پرسگرێکا ئەکتوئێلا ڕۆژەڤێ یە، ئانکو یا دەمێ ڤێگاڤێ یە ژی. (٣) لێکولەر روگەر سمیت Roger W. Smith بەرسڤێن دو پرسیارا دبەراوردکرنێ دا گەلەك گرنگ دبینیت: ئامانجا بکەرێ جینوسایدێ، ئانکو ئەو لایەنێ ب جینوسایدێ رادبیت، چی یە و یا دوێ ژی فورمێ پروسەیا جینوسایدێ یێ چەوایە؟ ئەو بەرسڤا پرسا ئێکێ وەك گراماتیکا ئارمانجێن جینوسایدا دەستنیشاندکەت، کو ئەو ژی داگیرکرن، تولڤەکرن، دەستکەڤتی، دەستەلات و ئیدیولوجی یە. بەرسڤا پرسا دوێ ژی گرێدایی پرسگرێکا کارتێکرن و ڤوناغێن جینوسایدێ نە، کو تیپێ مرۆڤێن دهێنە ڤرکرن – ڤوربانی - و پێشکەڤتنا ئالەتێن تەکنیکا ژناڤبرنێ و ڤەرێژا وێ یا داویێ یە[4].

لێکولەرێ ئەرمەنی میهران دەباغ Mihran Dabag سەروکێ ئینستیتوتا لێکولینێن جینوسایدێ ل زانکۆیا بوخومێ ل ئەلمانیا، دبێژیت مرۆڤ دکاریت وەکهەڤیێ د ستراکتەر و پروسێسا بەرواوردکرنا جینوسایدان دا دەستنیشان بکەت، لێ مودێلەکا جینوسایدێ، کو هەمی جینوساید وەکی ئێکن، نینە[5]. هەرچەندە هەر جینوسایدەك دهندەك مەرج و رەوشێن جودا ژی دا رویدایە و هەر ئێکێ جودابونەك دگەل یا دی هەیە ژی، لێ لێکولەر و زانایێن بوارێ جینوسایدێ کارینە هندەك مودێلان یان ژی موستەران دەستنیشان بکەن کو هەمی جینوسایدان هەمبێز دکەن. شروڤەکرنا ڤان مودێلان خویا دکەت کا بوچی، ل کیرێ، کەنگی و چەوا جینوساید چێدبیت.

شروڤەکرنا "دانەبەرهەڤدانا لێکولینێن جینوسایدێ" گەلەك هوکار و ئەگەرێن گرنگ ێێن پروسێسا جینوسایدێ بو مە دەستنیشانکرینە:

١. دەولەتێن دکتاتور و ئەو دەولەتێن نە دیموکراتی پتر ئەگەرا رویدانا جینوسایدێ ل دژی خەلکێ خو لێ هەیە.

٢. پەیوەندییەکا مەزن یا جینوسایدێ ب شەری ڤە هەیە، کو شەر رێکێ خوش دکەت بۆ ئەنجامدانا جینوسایدێ.

٣. بکەرێ جینوسایدێ، ئانکو لایەنێ ب جینوسایدێ رادبیت، بەردەوامیێ ب کارێ خو ددەت و جینوسایدێ دوبارە ژی دکەت، ئەگەر سنورەك بۆ نەهێتە دانان.

٤. سیستەمێن سیاسی یێن یەك پارتی، کو تەنێ یەك پارتی دەسەلاتدارە، وەکی سیستەمێن یەك پارتییێن کومونیزمێ، پتر بەرف ئەنجامدانا جینوسایدێ ڤە دچن وەکی سیستەمێن دیموکراتی کو دمێژوویا نیزیك دا چ جینوساید نە کرینە[٦].

ئەم دێ پێکولێ کەین ب مێتودا "بەراوردکرنا لێکولینێن جینوسایدێ" ئەو مەرج و فاکتەرێن کو دبنە ئەگەرا رویدانا هەر جینوسایدەکێ ل سەر ئوپەراسیونێن ئەنفالان (عملیات الانفال) یێن دەولەتا عیراقێ ل دژی کوردان ل سالێن ١٩٨٧/١٩٨٨ بکار بینین.

ئەم شیاین ب رێیا پێناسێن جیاواز و ب بەراوردکردنا ئوپەراسیونێن ئەنفالان ل گەل جینوسایدا ئەرمەنان و هولوکوستا جووهییان چەندین مەرج و فاکتەرێن وەکهەڤ جودا بکەین کو رولەکێ بنگەهین د پروسا ئەنفال– جینوسایدکردنا کوردان دیتی یە:

## پلانا پێشوەخت یێ دارشتی و بەرهەڤکری بۆ ئوپەراسیونێن ئەنفالان

هەرجینوسایدەکێ سیاسەتەکا دەستنیشانکری ل پشتە و پێتڤی ب پلانەکا دارشتی و رێکخستی هەیە. ئەڤ پلان و رێکخستنە، کو پترین جاران ژ لایێ دەولەتێ ڤە دهێتە دارشتن، ژ جینوسایدەکێ بۆ جینوسایدەکا دی جوداهی د هویراتی و پروسەیا بجهئینانا وان دا هەیە. بسپورێ جینوسایدێ دانیێل گولدهاگن Daniel Goldhagen کو وی لێکولین ل سەر ئەنفالان ژی کریە دبێژیت تەڤکوژی ئوپەراسیونێن مەزنن یێن کو قوربانیێن وان دگەهنە سەدهزاران، ملیونان و ب دەهان ملیونان ژی و هژمارا بکوژا ژی یێن کو بەشداریێ د جێنوسایدکرنێ دا دکەن ب دەهان و سەدان هزارانە و تا ملیونانە ژی و دەڤەرێن ئوپەراسیونان ژی وەلاتەکە و یان ژی هندەك جاران کیشوەرەکە. ئەو جهێن کو دهێنە پشکنین و دبنە ئارمانجا ئوپەراسیونان ب هزارانە. رێکخستن و رێڤەبرنا هەمی دەزگەهـ و کەسێن پشکداریێ د ڤان ئوپەراسیونان دکەن گەلەك دبەرفرەهن و ب ئالوزینە. ژبەرهندێ ژی بەری هێرشین ژناڤبرنێ دەسپێبکەن پلانەکا بەروەخت یا دارشتی دهێتە بەرهەڤکرن[٧].

بسپورێ جینوسایدێ یێ ئەلمان ڤولفگانگ بێنز Wolfgang Benz دەربارێ پلانکرنا جینوسایدا ئەرمەنییان دبێژیت کو ژ دەمێ ڤرکرنا ئەرمەنییان ل سالا ١٩١٥ێ تا نها خویا بوویە کو گەلکوژی ب پلانەکا دارشتی و بێ بەزەیی دهێنە ب رێڤەبرن و ئەو ئەنجامێ پلانەکا سیستەماتیکە و حێجەت و هوکارێن وێ ژی نێزیکی ئێکن: خەتابارکرنا کەمینەیەکا ئێتنی، ئایینی و کولتوری یە. ژناڤبرنا وان ب حێجەتا کو پرانی، ئانکو دەستەلات، هاتییە ئازراندن و ڤێجا دەست ب چارەسەریا سیاسی دهێتەکرن کو ئەو ژی پاقژکرن یان ژی راگوهازتنا ئێتنیکی یە کو وەکی دەستەلات دبێژیت بۆ مەرەمێن ئاشتیێ نە و دفورمێن دەرئێخستن، تالانکرن و کوشتنێ دا دهێتە پراکتیزەکرن[٨].

بکوژێن تورک ب مەهان و گەلەك ب هویراتی پلانکرن و رێکخستنا جینوسایدا ئەرمەنییان بەرهەڤکرن. وان هێزێن تایبەت یێن کو سەرکێشیا ئوپەراسیونان دکرن، بەرهەڤکرن و وانا لیستێن ناڤێن تەخا بژارە یا ئەرمەنی یان چێکرن، کو پێدڤی بوو ب لەز و ل پێشیێ بێنە ژناڤبرن[٩].

ناڤلێکرنا پروسا گەلکوژیێ ب(الانفال) کو ناڤێ سورەتا هەشتێ یە ژ قورئانێ، وێ واتەیێ دگەهینیت کو حکومەتا عیراقێ ب هویری و پلانەکا بەروەخت دارشتی سیاسەتا ڤرکرنا کوردان وەك شرعیەتەکا

دینی و سیاسی بەرهەڤکریە. دەولەتا عیراقێ ب رێیا نامەیێن فەرمی و دانوستاندنێن دناڤبەرا دەزگەهێن خۆ یێن جودا دا، کو نها پتریا وان ل بەر دەستێن مەنە، گومانبر کریە کو ئوپەراسیونێن ئەنفالان پروسەیەکا گەلکوژیێ یا ئورگانیزەکری بوویە. فەرمان و پارڤەکرنا ئەرکێن دەزگەهێن جودا یێن کو د پروسا ئەنفالکرنێ دا بەشداربووینە وێ چەندێ خویا دکەن کو پروسا ژناڤبرنا کوردان ب شێوەیەکێ پیرامیدی، ئانکو هەرەمکی، و ناڤەندی ژ سەری کو "مجلس قیادة الثورة"یە بەرەڤ خوارتر تا دگەهیتە دەزگەهێن سیخوریێ و فەوجێن جاشان. ئەڤ دۆکۆمێنتێن دەولەتا عیراقی کو پتر ژ ١٨ تەنانن و پتر ژ ٤ ملیون رۆپەلانە وگەلەک کاسێتێن ڤیدیویێ و دەنگینە ب رەنگەکێ گەلەکێ ئاشکرا هەمی پێنگاڤێن سیاسەتا حکومەتا عیراقێ هەر ژ تەعریبێ، تەبعیتێ و چولکرنا گوندان و تا جینوسایدکرنێ ل دژی کوردان دۆکۆمێنت کرینە[١٠]

د جڤینەکا هەڤپشک یا ئەنجومەنا سەرکردایەتیا شۆرشێ(مجلس قیادة الثورة) ب سەرۆکایەتیا سەددام حسین ی وەک سەرۆکێ وێ و سەرۆکێ کۆمارا ئیراقێ، سەرۆکێ حکومەتێ و فەرماندەیێ گشتی یێ عەسکەرێ ئیراقێ دگەل بەرپرسێن پارتیا بەعس یا عەرەبی و سەرکردایەتیا عەسکەری (جەنەرال نزار الخزرجي)، رێڤەبەرێ گشتی یێ ئیستیخباراتا عەسکەری (سابر عبدالعزيز الدوري) و جێگرێ سەرۆکئەرکانێ عەسکەری (حسن رشيد التكريتي) ل ١٨ێ ئادارا ١٩٨٧ێ دا بریار هاتە دان کو پرسا کوردی، حکومەتێن عیراقێ دگوتنێ (المشكلة الكردية)، ب یەکجاری ب رێیا بکارئینانا چەکێن تەڤکوژیێ یێن کیمیاوی بێی جوداهیێ دناڤبەرا خەلکێ سڤیل و پێشمەرگەیان دا بکەن[١١].

بریارا ڤێ جڤینێ د فەرمانا فەرمی یا ئەنجومەنا سەرکردایەتیا شۆرشێ(مجلس قيادة الثورة) ب ئیمزا سەددام حسین ل رۆژا ١٩٨٧/٣/٢٩ دەرکەفت و علي حسن المجيد هاتە دامەزراندن وەک سکرتێرێ

نڤیسینگەها رێکخستنێن باکووری (مكتب تنظيم الشمال) یا حزب البعث العربي الاشتراكي و هەمی یەکەیێن عەسکەری، دەزگەهێن ئاساییشێ و سیخوریێ و دەزگەهێن سڤیل یێن دەولەتێ ئێخستنە دبن فەرمانا وی دا. د خالا ئێکێ یا ڤێ بریارێ دا گەلەک ب ئاشکرایی خویا دبیت کو حکومەتا ئیراقێ هەر ل سالا ١٩٨٧ بریارا ژناڤبرنا کوردان دا بوو و سیاسەتەکا نەخشەکری ل دژی کوردان هەبوو:

"یەکەم: هەڤال علي حسن المجيد، ئەندامێ سەرکردایەتیا نیشتیمانی یا حزبا بەعسا عەرەبی یا ئشتیراکی، دێ رابیت ب نوێنەرایەتیا سەرۆکاتیا نیشتیمانی یا حزبێ و جڤاتا سەرۆکاتیا شۆرشێ د بجهئینانا سیاسەتا وان ل هەمی دەڤەرا باکووری و دەڤەرا کوردستانێ یا ئوتونومی ژی، ب ئارمانجا پاراستنا ئاساییشێ و نیزامێ و دابینکرنا تەناهیێ و بجهئینانا قانونا ئوتونومی ل دەڤەرێ"[١٢].

رێزکا "... بجهئینانا سیاسەتا وان ل هەمی دەڤەرا باکوور..." وێ چەندێ دگەهینیت کو رژێما ئیراقێ سیاسەتەکا پلاندارشتی ژ بۆ جینوسایدکرنا کوردان هەبوویە و ئەرک و کارێن پروسا ئەنفالکرنا کوردان ب سیستەم هاتیبە دانان.

ئەڤ بریارا ١٦٠ یا رۆژا ١٩٨٧/٣/٢٩ یا(مجلس قیادة الثورة) دهێتە هژمارتن وەک بریارێن کونفرەنسێ ڤان زێ (Wannsee-Konferenz) یا ئەلمانیا نازی. دکونفرەنسێ ڤان زێ دا ل رۆژا ١٩٤٢/١/٢٠ ب بەشداریا ١٥ بەرپرسێن بلند یێن نازیا و ب سەرۆکایەتیا راینهارد هێدریشReinhard Heydrich بریارا ژناڤبرنا هەمی جهوویێن ئەوروپا "چارەسەرکرنا داوی یا پرسا جهوویان" هاتە دان[١٣].

هەر ب ڤێ شێوەی لیژنا ناڤەندی یا ئیتیحاد و ترقی د جڤینەکێ دا ل ١٩١٥/٩/١٥ "پلانا ڤرکرنا" ئەرمەنییان کو دهێتە نیاسین ب "چارەسەرا داوی یا پرسا ئەرمەنی" هاتە دان[١٤].

ئەرکێ سەرەکی د هەر سێ مەهێن پێشین یێن دەستبکاربوونا علی حسن المجيد وەک سکرتێرێ نوو یێ "مكتب تنظيم الشمال" پێناسەکرنا وان

گروپێن مرۆڤان بوو یێن كو دێ بنە ئارمانجا پروسا ئوپەراسیونێن ئەنفالان[١٥]. گرنگییا دانانا المجیدی وەک ئەندازیار و بەرپرسێ یەكێ بۆ ئورگانیزەكرنا ئوپەراسیونێن ئەنفالان ڤەدگەریتەڤە بۆ وێ یەكێ كو تا نها و بەری دەستبكاربوونا وی، عەسكەرێ ئیراقێ سەرپەرشتییا شەرێ ل كوردستانێ دكر، ب تایبەتی ژی فرقا ئێكێ ل كەركوكێ و فرقا پێنجێ ل هەولێرێ، لێ د ئوپەراسیونێن ئەنفالان دا هەمی لەشكەرێ ئیراقێ كەتە د بن فەرمانا المجید و حزب البعث العربي الاشتراكی دا و هوسا حزب البعث العربي و بەرپرسێن وێ دهێنە هژمارتن ژ یەكەمین بكوژ د جینوسایدكرنا كوردان دا. المجیدی دەست ب دەرئێخستنا فەرمان و رێنمایيان كر ژ بۆ سەرەدەریكرنێ دگەل ئەو مرۆڤێن كو هاتینە پێناسەكرن ژ بۆ ئەنفالكرنێ و ئەو دەڤەرێن هاتینە دەسنیشانكرن بۆ هێرشكرنێ و كۆمكرنا خەلكێ وێ ژ بۆ قركرنێ[١٦]. ئەڤ فەرمان و رێنمایێ یێن المجیدی ژ لایێ هەمی یەكەیێن عەسكەری، دەزگەهێن ئاسایيشێ و سیخوریێ و دەزگەهێن سڤیل یێن دەولەتا عیراقێ بێی دودلی هاتنە بجهئینان.

## دکتاتوریەتا سەددام حوسەین وەک مەرجێ جینوسایدکرنا کوردان

ئەنجامێ شروڤەكرن و لێكولینێن دیرۆكی و بەراوردكرنا جینوسایدان وەسا خویا دكەن كو ئەنجامدەرێن جینوسایدێ ب پتری سیستەما سیاسی یا توتالیتێرە و یان ژی یا ئوتوریتێرە. ب كێمبونا مافێن ئازادیێ و دیموكراتیێ مەرجێن رویدانا جینوسایدێ دناڤ سنوورێن دەولەتێ دا، ئانكو جینوسایدا ناڤخۆیی، مەزنتر لێ دهێن. د دەما دەستەلاتا ئتتیحاد و ترقی دا ل سالا ١٩١٥-١٩١٦، كو هەمی رێبەرێن وێ عەسكەری بوون و هەمی پارت و رێكخستنێن سیاسی د قەدەغە بوون، سیستەمێ یەك پارتی بوو كو هەمی دەستەلاتێن سیاسی، عەسكەری و قەزائی ددەستێ وان دا بوون.

بریارا جینوسایدكرنا ئەرمەنییان ژ كومیتا ناڤەندی یا ئیتیحاد و تەرەقی هاتە دان و ژ لایێ محەمەت تەلعەت پاشا، كو وەزیرێ ناڤخۆ و رێكخەرێ سەرەكی بوو د ئورگانیزەكرنا جینوسایدێ دا و ئەنوەر پاشایێ وەزیرێ شەری هاتە بجهئینان. هەروەسا ژی ئەلمانیا نازی كو سیستەما وێ یا توتالیتێر بوو و تەنێ پارتا سوسیالستا نەتەوەیی یا ئەلمانی دەستەلاتدار بوو و هەمی پارتیێن دی دقەدەغە بوون. هەمی دەستەلات ددەستێ هتلەری دا بو و جڤاكا ئەلمانی هەمی هات بوو عەسكەری كرن. ئوپوزسیونێ چ شیانێن خو نە بوون. ل عیراقێ ژی سیستەما سیاسی توتالیتێر بوو، هەمی دەستەلاتا سیاسی، عەسكەری و قەزائی د دەستێ حزبا بەعسا عەرەبی یا سوسیالستی دا/ سەددام حوسێنی دا بوو. هەمی رێكخستنێن سیاسی د قەدەغە بوون. جڤاكا عیراقی ب میتودێن عەسكەری و ئاسایيشێ هاتبوو كونترۆلكرن.

لێكولەرێ ئەلمانی هێنەر فورتیگ Henner Fürtig د لێكولینا خۆ یا ل سەر دیرۆكا عیراقێ دا گەهشتە وێ دەرئەنجامێ كو دەستەلاتا سەددام حسین هەمی نیشانێن دكتاتوریەتا كەسی هەمبێز دكەن. ئەو سەرۆك و سەرۆكوەزیرێ ئیراقێ بوو، سەرۆكێ ئەنجومەنا سەركردایەتییا شۆرشێ بوو كو دهاتە هژمارتن ب مەزنترین دەزگەهێ دەستەلاتێ ل عیراقێ، فەرماندارێ بلند یێ گشتی یێن هێزێن عیراقێ بوو، سكرتێرێ گشتی یێ حزبا بەعسا عەرەبی یا ئیشتیراكی و یێ نڤێسینگەها وێ یا عەسكەری بوو[١٧]. بسپورێ مافناسیێ عدنان ئەنساری د لێكولینا خۆ یا ل سەر دەستوورێ عیراقێ دا گەهشتە وێ ئەنجامی كو دەولەتا عیراقێ دەولەتەكا توتالیتێرێ بە ل سەر بنگەهێ دكتاتوریەتا عەسكەری و ئیدیولوجییا حزب البعث[١٨]. خرڤەبوونا ڤان هەمی دەستەلاتان د دەستێ تەنێ سەددام حسین دا فاكتەرەكێ گرنگێ فەرمان و بریاردانا جینوسایدێ بوو ل دژی كوردان.

## رولێ ئیدیولوجیا نەتەوەپەرستیا بەعسییان د ئەنفالکرنێ دا

بسپورێن جینوسایدێ د هەڤهزرن د رولێ ئیدیولوجیێ دا د پروسا گەلكوژیێ دا. فەیلەسوفا مەزن یا ب رەگەز جهوویا ئەلمانی هانا ئارێند Hannah Arendt گومانبر خویا دکەت کو ئیدیولوجیا توتالیتێر دگەل دەستەلاتا توتالیتێر یا نازیان فاکتەرێن هەری گرنگ بێن هولوکوستێ بوون[١٩]. لێکولەر یانێ سپرینگەر Jane Springer ل وێ باوەرێ یە کو رژێمەك گروپەکا نەتەوەیی، سیاسی و یان یا جڤاکی ژناڤ دبەت، چونکی ئەو وێ گروپا دەستنیشانکری وەك بڤە – خطر – ل سەر خۆ دبینیت. یان ژی سیاسەتا هندەك رژێم و دەستەلاتا ئەوە کو دخوازن جڤاکەکا سەرداسەد راست، دروست و پاك، ئانکو جڤاکەکا خەیالی – ئوتوپی - چێکەن، کو تەنێ مرۆڤێن رەگەزەکی، تەخەکا جڤاکی یان دینەکی مافێ ژیانێ تێدا هەبیت. گەلەك بکەرێن جینوسایدێ دبێژن ئەو دخوازن گەلێ خۆ پاقژ بکەن[٢٠].

هوکارێ میتولوجیا تورانی ل دژی ئەرمەنییان دجینوسایدێ دا رولەکێ مەزن دیت. ناسیونالیزما تورکی کو دخواست دەولەتەکا نەتەوەیا تورکی و ئیسلامی ژ رەگەز و کارتێکرنێن دەرڤە وەکی روسیا و ئەوروپا یا دویربیت، چێکەت[٢١]. ئەرمەنی وەك کێمەنەتەوە و دینەکێ جودا کو نە ئیسلام، رێگر بوون بۆ ڤێ سیاسەتێ. ئیدیولوجیا نازی ژی کو دڤیان رەگەزێ پاکێ ئاری بپارێزن، ژناڤبرنا جوهی یا ببو ئارمانجا هەری مەزن یا سیاسەتا ئەلمانیا نازی، کو پێویستە جڤاك و رەگەزێ ئەلمانی یێ ئاری ژ ئەلەمەنتێن پیس بهێنە پاککرن. ئیدیولوجیا ناسیونالیزما عەرەبی جهەکێ مەزن د پروگرام و باوەریا حیزبا بەعسا عەرەبی یا سوسیالیست دا دگرت. خەون ب دیرۆکا ئیسلامێ و وەلاتەکێ عەرەبی ژ کەنداوی حەتا مەغریبێ ڤە دیتن. کورد وەك خائین هاتنە دەستنیشانکرن و ژبەرهندێ ژی ئەو رێگر بوون بۆ ب جهئینانا سیاسەت و ئیدیولوجیا نەتەوەیی یا بەعسیزمێ، هەر ژبەر ڤان ئەگەران ژی بریارا ڤرکرن و کونترۆلکرنا کوردان هاتەدان. ئیدیولوجیێ دپلان و بجهئینانا ڤان هەر سێ جینوسایدا دا رۆلەکێ هەری مەزن لەیست.

## شەرێ عیراق و ئیرانێ وەك فاکتەر و مەرجێ ئەنجامدانا جینوسایدێ

بسپورا جینوسایدێ هێلین فاین Helen Fein ل دەستپێکا سالێن نوتان د چەرخێ بۆری دا ب ئاشکرایی خویا دکەت کو ئەنجامدانا گەلکوژیێ پەیوەندییەکا گەلەکا خورت یا ب دەمێ هەبوونا شەرەکی ڤە هەی[٢٢]. پتریا گەلكوژییان د شەران دا دهێنە ئەنجامدان، ئانکو ل ژێر سیبەرا شەرەکی دا، چونکی شەر ژ لایێ دەستەلاتێ ڤە دهێتە بکارئینان بۆ پێچەکرن و بەرزەکرنا تاوانەکێ یان ژی وەک شەرعییەتەک بۆ ئەنجامدانا کوشتنێ. د شەری دا، ئانکو بەروڤاژی دەمێن ئاشتیێ، وەکی بوریس بارت Boris Barth خویا دکەت، ئوپەراسیونێن عەسکەری ب ساناهی دکەڤن و کوشتن و ژناڤبرن شەرعییەتێ وەردگرن و دبنە بەشەک ژ شەری. هەروەسا د شەری دا کوشتن و ژناڤبرن ب نهێنی دمینن و چ گرفتێن عەسکەری و چەکی و ئامادەباشییا شەری نینن. د شەری دا کوشتن و توندوتیژی دبنە رەوشەکا نورمال و وەرگرتن و بجهئینانا فەرمانان ب ساناهی دکەڤیت[٢٣].

سیستەما سیاسەتا دەولەتێ و دامەزراو و دەزگەهێن وێ یێن عەسکەری و ئاسایشێ ب هەر شێوەیەکی بن ژی، لێ دشەرێن ناڤخۆیی یان ژی یێن دەڤەری و جیهانی دا ئەگەرێن چێبونا جینوسایدێ گەلەك مەزنتر لێ دهێن[٢٤]. هولوکوست نموونەیەکا گەلەکا بەر بچاڤە. ل بەری سالا ١٩٣٩ ژی کۆمکوژی ل دژی جوهییان هەبوو، لێ نەوەك سیاسەتا دەولەتێ کو هەمی جوهییان یێن کو دکەڤنە بن کونترۆلا وان بکوژن. ئەڤ سیاسەتە دوی دەمیدا هاتە بکارئینان دەمێ ئەلمانیا کەتیە دناڤ شەرێ دوێ یێ جیهانێ

دا. ب بەشداربوونا رژێما ئتیحاد و تەرەقی د شەرێ جیهانێ یێ ئێكێ دا دگەل ئەلمانیا و نەمسا ل دژی ئنگلیز و فرەنسا و روسیا دەلیڤەیەكا مەزن بۆ بجهئینانا پلانا جینوسایدێ چێبوو و بوو ئەگەرێ رێخوشكرنا ژناڤبرنا ئەرمەنییان ل سالێن ١٩١٥-١٩١٦. هەرچەندە بەری ڤی دەمی ژی كۆمكوژیا ئەرمەنییان هەبوو ژی. ب هەمان شێوەی ئەنفال و جینوسایدا كوردان ژی رویدایە: بەری دەستپێكرنا ئوپەراسیونێن ئەنفالێ رژێما عیراقێ كورد ب كۆم دكوشتن، وەكی گرتن و بێ سەروشوینكرنا ٨٠٠٠ هەشت هزار بارزانییان ل سالا ١٩٨٣، لێ وەك كارەكێ پلانكری، رێكخستی و درێژخایەن ئوپەراسیونێن ئەنفالان وەك جینوساید ل سالا داویێ یێ شەرێ ئێكێ یێ كەنداوی – شەرێ عیراقێ و ئیرانێ – ئانكو ل سالا ١٩٨٨ هاتە ئەنجام دان. رژێما عیراقێ مفا ژ وێ هاریكاریا بێ سنوور یا دەولەتێن عەرەبی، ب تایبەتی ژی یێن كەنداوی، دەولەتێن بلوكا رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی وەرگرت، كو ڤان دەولەتان ژ مەترسیا دەركەتنا شۆرشا ئیسلامی ژ سنوورێن ئیرانێ بۆ دەولەتێن هەڤسوی، بێ مەرج پشتەڤانیا عیراقێ دكرن. حكومەتا ئیراقێ شەرێ عیراق – ئیرانێ ب دەلیڤەیەكا زێرین دیت گرفتا كوردی (المشكلة الكردیة) ب ئەنفالكرن و جینوسایدكرنا كوردان ب یەكجاری ب داوی بینیت، چونكی ئەو یا پشتراست بوو كو دەولەتێن دەرەكی وێ تاوانبار ناكەن و پشتێ وێ ل دژی ئیرانێ و ژبەر كوردان بەرنادەن.

## فرەپێكهاتەیی یا جڤاكا عیراقی وەک فاكتەرێ جینوسایدێ

ئەگەرێ رویدانا گەلكوژیێ د دەولەتەكێ دا گەلەک مەزنتر لێ دهێت، دەمێ ئەڤ دەولەتە ژ گەلەک نەتەوە، رەگەز یان گروپێن ئایینی پێک بهێت. د جڤاكەكێ دا كو گەلەك نەتەوەپەرستە یان ژی ب نەتەوەپەرستیێ هاتییە پەروەردەكرن و خۆ باشتر و مەزنتر ببینیت ژ نەتەوەیێن دی و ب چاڤەكێ نزم ل نەتەوەیێن دی بنێریت و یێ ڤەكری نەبیت بۆ هندەك هزر و دیتنێن دی، ئایینێن دی و ئازادیا دەربرینێ، د جڤاكەك هوسا دا گەلەك ب ساناهی تر جینوساید دهێتە ئەنجامدان وەكی د جڤاكەكا لیبەرال و دیموكراتی دا بیت[٢٥].

بسپورێ جینوسایدێ لیئو كوپەر Leo Kuper ل وێ باوەرێ یە كو مەترسیا رویدانا جینوسایدێ دناڤ پێكهاتەیێن ئێتنی – نەتەوەیی – كو ژ نەتەوەیەكێ وەک دەستەلاتدار و ژ نەتەوەیەک وەک دەستەلاتلێكەر دا پتر لێ دهێت[٢٦]. د پێكهاتەیا ئمپراتوریەتا عوسمانی دا ئایین و نەتەوە فاكتەرێن بنگەهین بوون ژبۆ جینوسایدكرنا مینوریتەیا ئەرمەنییان؛ ل ڤێرێ دین وەك كریست و نەتەوە وەك ئەرمەنی رولەكێ مەزن لەیستی یە. د هولوكوستێ ژی دا دین و نەتەوە كو جوهینە فاكتەرەێن هەرێن گرنگ بوون بو ئەنجامدانا ژناڤبرنا جوهییان.

دەولەتا عیراقێ ل سالا ١٩٢١ێ دا وەک دەولەتەک دەستكردی ژ لایێ ئینگلیزان ڤە ب زورێ ژ پێكهاتەیێن بنگەهین، عەرەب (شیعە و سوننە) و كورد بێی رەزامەندییا وان بهێتە وەرگرتن، هاتە دامەزراندن. ئەڤ دەولەتە هەر ژ دەستپێكێ ژ كەمینەیا تایبفی یا عەرەبێن سوننە هاتە برێڤەبرن كو تەنێ ٢٠ ژ سەدێ ژ رێژا خوجهێن عیراقێ پێكدهات و كورد وەک كێمەنەتەوەیەک كو پتر ژ ٢٠ ژ سەدێ پێكدهاتن كەتە دبن دەستەلاتا عەرەبان ڤە. د ئەنفالان ژی دا كورد وەك نەتەوە و ناڤكرنا ئوپەراسیونان ب ئەنفال، كو د دیروكا ئیسلامێ دا ئەنفال ل دژی كافران چێبوویە، بەعسییان شەرعیەتەك دینی دایە جینوسایدێ. ل ڤێرێ دەولەتا ئیراقێ كورد وەك كافر پێناسە كرینە و هوسا ژی كوشتن و قركرنا وان حەلال كریە.

## هەشت قوناغێن ئەنفالكرنا كوردان

ئەنفالا هەشتا یان ژی (خاتمة الانفال)، ئانكو داویا ئەنفالان، خەلەكا هەشتێ یە ژ زنجیرا ئەنفالكرنا كوردان، لەوما ژی ئەم نكارین دویر ژ تێگەهشتن و خوێندنا هەمی قوناغێن ئەنفالان د ئەنفالا هەشتان، كو جوگرافیا دەڤەرا بەهدینانە، بگەهین. چونكی

ئوپەراسیونێن ئەنفالان پروسەیەکا دەمدرێژ بوویە و قوناغ ب قوناغ هاتییە ئەنجامدان.

### ئەنفالا یەکێ: دۆلا جافایەتی
### (١٩٨٨/٢/٢٣ - ١٩٨٨/٣/١٩)

ل شەڤا ٢٢/ ١٩٨٨/٢/٢٣. رژێما عیراقێ دەست ب پروسا عەسکەری یا ئوپەراسیونێن ئەنفالان کر ل دەڤەرا ئەنفالا ئێکێ ل دۆلا جافایەتی کو بارەگایێن سەرکردایەتییا یەکێتی نیشتیمانی کوردستان و پتریا دەزگەهێن گرنگێن وەک ڕاگەهاندن، تەندروستی، مەڵبەندێ دوو و فەرماندەیا گشتی لێبوون[٢٧]. ژبەر گرنگیا ستراتیجی، عەسکەری و سیاسی یا ڤێ دەڤەرێ هێرشێن ئەنفالا ئێکێ بۆ رژێما عیراقێ گەلەک دگرنگ بوون، چونکی چارەنڤیسێ هەر حەفت قوناغێن دی یێن ئەنفالان گرێدایی ئەنجامێ ئەنفالا ئێکێ بوون. لەوما ژی سەددام حسێنی دەڤەرا ئوپەراسیونا ئەنفالا ئێکێ وەک سەرێ ماری پەسنکر و گوت: "دڤێت ل پێشیێ سەرێ ماری ب هەرشیت"[٢٨]. بۆ بزاڤا کوردی ژی ڤەرێژا ئوپەراسیونا ئەنفالا ئێکێ وەک مان و نەمانێ بوو. لێ پشتی ب دژواری بکارئینانا چەکێ کیمیایی، ب تایبەتی ژی ل ١٩٨٨/٣/١٦ ل حەلەبچە، و پشتی پتر ژ سێ حەفتییان بەرگریێ و ژ ئەنجامێ نەهەڤسەنگی د هێزا رژێما عیراقێ و بزاڤا کوردی دا ل رۆژا ١٩٨٨/٣/١٩ ێ عەسکەرێ عیراقێ شیا جوگرافیا ئەنفالا ئێکێ کۆنترول بکەت.

### ئەنفالا دوێ: دەڤەرا قەرەداغ
### ١٩٨٨/٣/٢٢ — ١٩٨٨/٤/١

رژێما عیراقێ چ دەلیڤە نە دانە هێزێن کوردی پشتی شکەستنا وان د قوناغا ئەنفالا ئێکێ دا خو رێکبێخنەڤە و هەر پشتی سێ رۆژان و ب وورەیەکا بلند دەست ب ئەنفالا دوێ ل دەڤەرا قەرەداغ کر. عەسکەرێ عیراقێ ژ هەشت تەوەران ب تانک، توپ، فروکە، چەکێ کیمیایی و ب هاریکاریا ٢٧ فەوجێن سەربازی و جاشان هێرشی دەڤەرا قەرەداغ کرن[٢٩].

The Anfal Campaigns: February - September 1988



خەلکێ ڤێ دەڤەرێ ژبەر گرانییا هێرشێن سەربازی بوونە سێ جوین و بەرەڤ سێ سەمتان رەڤین: هندەک ژ خەلکی بەرەڤ باشوورێ قەرەداغ، ئانکو بۆ دەڤەرا گەرمیان رەڤین و پتریا وان هاتنە گرتن و بەرزەکرن و پشکا دوێ هەر زو خۆ دادەست عەسکەرێ عیراقێ و هندەکێن دی ژی رەڤین بۆ باژێرێ سلێمانیێ و کۆمەلگەهێن راگوهاستنێ[٣٠]. هێزێن چەکدارێن عیراقێ گەلەک زەحمەتی د هێرشا ئەنفالا دوێ دا نەدیتن و هەر زوی شیان د دەمێ حەفتیەکێ دا ل ١٩٨٨/٤/١ سەرکەڤتنا خو رابگەهینن.

### ئەنفالا سیێ: دەڤەرا گەرمییان (١٩٨٨/٤/٧ – ١٩٨٨/٤/٢٠)

ئوپەراسیونا ئەنفالا سیێ بۆ سەر دەڤەرا گەرمیان بوو، کو دهێتە هژمارتن ب گرنگترین قوناغێن ئەنفالان ژبەر کو ئەڤ دەڤەرە گرێدایی هەر سێ پارێزگەهێن سلێمانی، کەرکوک و دیالە بوو و دکەڤیتە سەر سنوورێ پارێزگەها تکریت ژی و ڤێ دەڤەرێ ژبەر پێترولێ و سیاسەتا تەعریبکرنێ ژی گرنگییەکا مەزن بۆ ستراتیژیەتا رژێمێ هەبوو. لەوما ژی بەروڤاژی قوناغێن دی یێن ئەنفالان هەمی کەسێن د ڤی قوناغی دا هاتینە گرتن، پشتی هاتینە پارڤەکرن ل سەر گرۆپان، بێی رەحم و بێ جودایی هاتنە ژناڤبرن. مەزنترین هێرشا عەسکەری بۆ سەر دەڤەرێن چەمچەمال، سەنگاو، قادر کەرەم، دووز، کفری، کەلار، پێباز و تیلەکو ل رۆژا ٧ێ نیسانێ کو هەلکەڤتا دامەزراندنا حزبا بەعسا عەرەبی یا ئیشتیراکی یە، دەستپێکر[٣١]. ژبەرکو دەڤەرا گەرمیان دەشتە و جهێن خوڤەشارتنێ نەبوون و ناکەڤیتە سەر سنوورێن ترکیا و ئێرانێ و رژێمێ هەمی رێ ل خەلکی گرتبوون، هژمارا قوربانیێن ڤێ قوناغێ ژهەمی قوناغێن دی پتر بوون. پروسا ڤرکرنا خەلکێ گەرمیان گەلەک یا ب لەز بوو و هەر ل رۆژا ١٤ێ نیسانێ نێزیکی ٢٠٠٠٠ هزار کەس ژ ژن، مێر و زارۆکا هاتنە ئەنفالکرن. ژبەرهندێ ژی ئەڤ رۆژە بۆ رۆژا بیرئانینا ئەنفالان ل کوردستانێ هاتییە دەستنیشانکرن[٣٢].

### ئەنفالا چوارێ: دۆلا زێی بچوک (١٩٨٨/٥/٣ – ١٩٨٨/٥/٨)

قوناغا چوارێ یا ئەنفالان ل دەڤەرا دۆلا زێیێ بچوک پشتی سەرکەڤتنێن عیراقێ ل هەر سێ قوناغێن دی یێن ئەنفالان و سەرکەڤتنا ل ١٧ -١٨ ێ نیسانێ ل شەرێ فاو ل دژی ئێرانێ ب ورەیەکا بلند یا عسکەرێ عیراقێ ل رۆژا ٣یێ گولانێ ب هێرشێن کیمیاوی بۆ سەر گوندێن عەسکەر و گوپتەپە ژ هەشت بنکەهێن عەسکەری و ژ هەڤدە لایان ڤە دەستپێکر[٣٣]. هێزێن چەکدارێن عیراقێ هەر زوی رێکێن رەڤینا خەلکی گرتن و ل باکووری ژی سکرێ دوکان رێ ل خەلکی گرت و رژێمی ژی ئاڤا سکری بەردا و هوسا ژبەر ئاستێ بلندێ ئاڤێ یێ زێیێ بچوک گەلەک خەلک نەشیان برەڤن و کەتنە د دەستێن رژێمێ دا و پتر ژ حەفت هەزار کەسان هاتنە گرتن و بێ سەروشوین کرن[٣٤].

### ئەنفالێن پێنج، شەش و حەفت: دۆلێن خوشناوەتی، بالیسان و مەلەکان (١٩٨٨/٥/١٥ – ١٩٨٨/٨/٢٦)

رژێما عیراقێ د پلانا خو یا پێشوەخت دارشتی دا ل وێ هێڤیێ بوو کو ئوپەراسیونێن ئەنفالان ب زویترین دەم ب داوی بینیت، لێ ژبەر بەرخوەدانا پێشمەرگەی و ئالوزییێن لوجستیکی یێن گرتن، ڤەگوهاستن و ژناڤبرنا خەلکی و مژیلبوونا هێزا سەرەکی یا لەشکەرێ عیراقێ ب شەرێ دگەل ئیرانێ ڤە، ئەو نەشیا وەکی وێ دخوەست د دەمێ دەستنیشانکری دا کو هەیڤا هەشت بوو، ئوپەراسیونان سەرکەڤتیانە ب دویماهی بینیت. لەوما ژی سەرکردایەتیا عیراقێ بریاردا ژبەر کێماسیا دەمی هەر سێ ئوپەراسیونێن

پێنج، شەش و حەفت د یەک قوناغ دا ب رێڤە ببەت. ب تایبەتی ژی پشتی کو ئیرانێ ل رۆژا ۱۹۸۸/۸/۸ ب بریارا ۵۹۸ یا نەتەوەیێن ئێککرتی UN رازی بووی و شەرێ هەشت سالی یێ د ناڤبەرا هەر دو دەولەتان دا ب دویماهی هاتی[۳۵] ڤێجا رژێما عیراقێ شیا لەشکەرەکێ زێدەتر ژ بەرەیێن شەرێ ئیرانێ ڤەکێشیت و ل دژی کوردان بکاربینیت. حکومەتا عیراقێ ل رۆژا ۱۵ێ گولانێ ب فروکەیان چەکێ کیمیایی ل دژی گوندێ وەرتێ یێ دەڤەرا بالەکایەتی ب کارئینا و هێرشێن سەربازی ل دژی دەڤەرێن کۆیە، دیگەلە، ئالتون کوپری، هەولێر، شەقلاوە، رەواندوز، چیایێ قەندیل، رانیە، چوارقورنە، هیزوپ و چیایێ باواجی دەستپێکر. ل ڤان دەڤەران چەند دۆلێن کویر و درێژێن وەک خوشناوەتی و بالەکایەتی و سەختترین چیایێن کوردستانێ یێن وەکی هەیبەت سولتان، سەفین، هەورێ، ماکۆک، کۆرەک، کاروخ، هەندرین، کێوەرەش و قەندیل یێن لێ[۳۶]. ڤان هەر سێ ئوپەراسیونان درێژترین دەمی کێشا کو نێزیکی ۱۰۰ رۆژان بوو و دژوارترین شەر ل ڤێ جوگرافیێ هاتنە کرن و هەروەسا ژی پترترین هێرشێن کیمیایی ل ڤان دەڤەران هاتنە ئەنجامدان. لێ پرانییا خەلکی شیا ژبەر نێزیکبیا سنووری برەڤن ئیرانێ و گیانێ خو رزگارکەن[۳۷].

## ئەنفالا هەشتان "خاتمة الانفال": دەڤەرا بەهدینان (۱۹۸۸/۸/۲۵ – ۱۹۸۸/۹/٦)

ئەنفالا هەشتان دهێتە هژمارتن ب قوناغا داویێ یا ئوپەراسیونێن ئەنفالان ل دژی کوردان. ژبەرهندێ ژی دگەلەک دوکۆمێنت و راگەهاندنا فەرمی یێن حکومەتا عیراقێ دا ب "خاتمة الانفال"، ئانکو دویماهیک ئەنفال، ژی هاتییە بناڤکرن. جوگرافیا دەڤەرا بەهدینان ژی دکەڤیتە باکوورێ هەرێما کوردستانێ و لایێ رۆژهەلاتی یێ روبارێ دیجلە و ئەو هەمی دەڤەرێن دکەڤنە دناڤبەرا رووبارێ هیزل ژ لایێ رۆژهەلاتێ و تا دگەهیتە کێلەشین ل سەر تخوبێ ئیرانێ ژ ئالیێ رۆژئاڤای ڤە و دەڤەرێن تیارییا یێن نێزیکی جولەمێرگێ ژلایێ باکووری ڤە و تا دهێتە خوارێ بۆ باژێرێ موسل ژ لایێ باشووری ڤە بخوڤە دگریت[۳۸]. ژ لایێ جیوستراتیجیڤە ژی دەڤەرا بەهدینان گرنگیا خۆ یا هەی، چونکی هەر سێ وەلاتێن ئیراق، ئیران و ترکیا پێکڤە گرێددەت و ب دەرازینکا ئێکانە یا ئیراقێ بەرەڤ ئەوروپا ڤە دهێتە هژمارتن[۳۹].

بەری حکومەتا عیراقێ دەست ب ئەنجامدانا ئوپەراسیونا هەشتان ل دەڤەرا بەهدینان بکەت، وێ ل رۆژا ۱۹ێ تەمموزێ دەست ب هێرشەکا دژوار کر ل سەر دەڤەرا خواکورک کو دکەڤیتە سەر سێگوشێ سنوورێن ئیراق، ئیران و ترکیا و هاتبوو دابەشکرن بۆ سەر ئەنفالێن پێنج، شەش و حەفت، ئانکو نە د ناڤ ئوپەراسیونا ئەنفالا هەشتان دا بوو، ئەو ژی ب ئارمانجا گرتنا رێکا ئیرانێ ل دەڤەرا بەهدینان[۴۰].

عەلی حەسەن ئەلمەجید ئەندازیار و رێکخەر و بەرپرسێ یەکێ یێ ئوپەراسیونێن ئەنفالان ژبەر ڤان فاکتەران دەڤەرا بەهدینان وەک قوناغا داویێ "خاتمة الانفال" یا پروسا ئەنفالکرنا کوردان هەلبژارت:

- جوگرافیا ئوپەراسیونا ئەنفالا هەشتان دهێتە هژمارتن مەزنتر ژ هەمی دەڤەرێن ئەنفالێن دی.
- ژبەر هەبوونا گەلەک دول، گەلی و چیا کونترولکرنا وێ ژ لایێ حکومەتا عیراقێ ڤە یا ب زەحمەت بوو.
- ژبەرکو ڤێ دەڤەرێ سنوورەکێ درێژ دگەل ترکیا هەیە وگەلەک خەلک دێ رەڤیتە ترکیا و دەنگوباسێن گرتن، کوشتن و بکارئینانا چەکێ کیمیایی دێ ل جیهانێ بەلاڤبیت[۴۱].

فاکتەرەکێ دی ژی یێ گرنگ یێ ئەنفالا بەهدینان ئەوە کو دەڤەرا ڤێ ئوپەراسیونێ دویر ژ سنوورێ ئیراقێ و ئیرانێ، ئانکو دویر ژ بەرەیێن شەرێ ئیراقێ و ئیرانێ، و پشتی راوەستاندنا شەرێ ئیراقێ و ئیرانێ

**Final Anfal: 25 August - 6 September 1988**




هاتیيه ئەنجامدان. ژبەر ڤان ئەگەران بۆ رژێما ئیراقێ گەلەک یا گرنگ بوو کو قوناغا هەشتێ یا دەڤەرا بەهدینان ب زویترین دەم ب داوی بهێت. لەوما ژی حکومەتا ئیراقێ گەلەک هێزێن عەسکەری دگەل تانک، توپ، فروکە و چەکێ کیمیایی و هژمارەکا مەزن یا جاشان بۆ ئەنجامدانا ڤێ قوناغا ئوپەراسیونا ئەنفالان بەرهەڤکر. ب تایبەتی ژی پشتی راوەستیانا شەرێ ئیراقێ و ئیرانێ گەلەک هێزێن سەربازی ژ بەرەیێن شەری هاتنە ڤەکێشان بۆ کوردستانێ. نێزیکی ۲۰۰۰۰۰ هزار سەرباز و ۱۸۰۰۰۰ هزار جاش و (جیش الشعبي) بەشدار بوون د هێرشا ئەنفالکرنا دەڤەرا بەهدینان دا. پشتەڤانییا ڤان هێزان ژلایێ فروکە و یەکەیەکا چەکێ کیمیایی هاتەکرن.

لیوا (یونس محمد الذرب) فەرماندێ فەیلەقا پێنج یێ سوپایێ ئیراقێ کو سەرۆکاتییا عەسکەری یا ئوپەراسیونا هەشتان یا دەڤەرا بەهدینان دکر، ڤێ چەندێ د شروڤەکرنەکا عەسکەری دا ل دور شەرێ دویماهیک ئەنفال "معركة خاتمة الانفال" کو دناڤبەرا ۲۸ تەباخێ تا ۳ ئەیلولا ۱۹۸۸ێ، ئانکو دنیڤا ئوپەراسیونا ئەنفالا هەشتان، دا نڤیسییە و ژ ۲۹ روپەلان پێکدهێت، پشتراست دکەت و دبێژێت:

"دەڤەر ب شێوەیەکی گشتی چیایی و سەختە ل پشکێن باکووری و رۆژهەلاتی یێن دکەڤنە سەر هێلا سنوورێ ئیراق و ترکیێ هەمی بیستان و دارێن سروشتینە. توپوگرافیا دەڤەرێ پێکهاتییە ژ ئەردێن کەڤرین و کلسی ل دەڤەرێن بلند و بنارێن چیایا تێکەلەکە ژ ئەردێن رەق دگەل تەخەکا تەقنێ و ئاخێ دەست پێدکەت ب نزمبوونێ ژ رۆژئاڤا و "باشووری' تا دەشتا سلێڤانەییا و دەشتا ئاکرێ و کۆمەکا نهال و شیڤ و شکەفت و جوکێن ئاڤێ ل ڤێ دەڤەرێ هەنە کو بەلاڤ دبنە باشووری و رۆژهەلاتی و رۆژئاڤایی(...) و ژبەر هەبوونا زنجیرێن چیایێن بلند لڤینێن کەرتان

(یێن عەسکەری) هاتینە سنووردارکرن"[٤٢].

پاشی ئەو ل جهەکێ دی وەک بەرسڤەک بۆ ڤان ئاستەنگان دنڤێسیت:

"مانا بەردەوام یا کەرتان ل دەڤەرێن ئاستەنگ لێ هەین و یێن سەرسنوور و دەسنیشانکرنا لڤینێن تێکدەران. دەڤەرێن چیایی، دەڤەرێن ئاسێ نە، دڤێت لێگەریانێن هویر و باش ل ڤان دەڤەران بێنە کرن و پتر دەم پێتڤی یە ..."[٤٣].

ئەڤ شروڤەیا توپوگرافی، عەسکەری و سیاسی کو ناڤێن هەمی روبار، چیا و دولێن ئاسێ تێدا هاتینە ریزکرن، بۆ مە گەلەک ب رۆنی ئاشکرا دکەت کو ئوپەراسیونێن ئەنفالان گەلەک ب هویری و پێشوەخت ژ لایێ عەسکەری و لوجستیکی ڤە هاتینە پلانکرن و هەمی شیان بۆ سەرئێخستنا وان د دەمەکێ کێم دا هاتینە تەرخانکرن[٤٤]. لیوا (یونس محمد الذرب) دڤێ پلانا خو یا ئوپەراسیونا ئەنفالا هەشتان دا هوسا ئارمانجا خو یا عەسکەری دڤان هەر سێ خالان دا د یاردکەت:

"أ. دڤێت ئارمانج ژناڤبرن و نەهێلانا تێکدەران بیت.

ب. بێنە دوورپێچکرن و دورگرتن.

ج. بکارئینانا دژوارترین دلرەقیێ دگەل تێکدەر و پشتەڤانێن وان."[٤٥].

و هوسا ژی ل دووڤ ڤێ پلانێ و ب دلرەقی دەست ب هێرشێن ل سەر دەڤەرێن ئەنفالا هەشتان هاتەکرن و ئەڤ هێرشە هاتنە پارڤەکرن بۆ سەر یازدە تەوەران:

١. ژ زاخۆ بۆ گەلناسکێ و چیایێ بێخێری
٢. ژ زاخۆ بەرەڤ دەشتا خابور
٣. ژ کانی ماسێ بەرەڤ زێوە و ئامێدیێ و رەشاڤا
٤. ژ بێگوڤا بەرەڤ ئێکمالێ و بامەرنێ و چیایێ مەتینا
٥. ژ بالندا بەرەڤ شەمدینان و بیبو
٦. ژ شێروان بەرەڤ بارزان
٧. ژ دینارتە بەرەڤ بلێ و بارزان
٨. ژ بێگوڤا بەرەڤ مانگێش و زاویتە
٩. ژ سەرسنگێ بەرەڤ مێرگەتی و چیایێ گارە
١٠. ژ ناحیا ئەتریش بەرەڤ گوندێن سیار و سپیندارا
١١. ژ سیارەتیکا بەرەڤ سپیندار و ئەتریش[٤٦].

ل شەڤا ٢٥/٢٤ ێ مەها هەشتان حکومەتا ئیراقێ دەست ب هێرشا ل سەر بەهدینان کر. ل پێشیێ فروکەیان ب بۆمبێن کیمیایی بارەگایێ لقێ یەک یێ پارتی دیموکراتی کوردستان، گەلیێ بازێ و گوندێن دەڤەرێن ئامێدیێ، کانی ماسێ، بێگوڤا، مانگێشکێ و زاویتە ب تایبەتی ژی گوندێن برجینی، تویکا، گەلناسکێ، تلاکور و وەرمیلێ، بازێ، بلیجانی، بانێ، ئاڤوکێ، سیارێ، سپینداری، باورکا کەڤری، مێرگەتی، سەرگە و گیزێ و شێران[٤٧]. پتر ژ ٧٧ گوندان کەتنە بەر ڤان هێرشێن کیمیایی. ئوپەراسیونا ئەنفالا هەشتان ب هێرشین کێمیایی، وەکی فەرماندێ فەیلەڤا پێنج یونس محمد الذرب دبێژیت ب "بکارئینانا دژوارترین دلرەقیێ دگەل تێکدەر و پشتەڤانێن وان" هاتە دەستپێکرن. ئارمانجا ژ بکارئینانا چەکێ کیمیایی ئەو بوو کو ڤێ قوناغا "دویماهیک ئەنفال" ب زویترین دەم ب داویبینن و ورەیا پێشمەرگەی و خەلکی بشکێت ژ چەپەر و گوندێن خو دەرکەڤن و دەست ژ بەرەڤانیێ بهێتە بەردان. و هوسا ژی خەلک ب ساناهی بهێتە گرتن و ژناڤبرن.

تنێ ل گەلیێ بازێ کو ٢٠٠ مال بەرەڤ ترکیا درەڤین ١٣٠٠ کەس ژ ئەگەرا بکارئینان چەکێ کیمیایی هاتنە کوشتن. لێ ب سەدان بریندارێن کیمیای پاشی چەند رۆژ و حەفتیان ژ ئەنجامێ نەبوونا چارەسەریێ مرن[٤٨].

چەکێ کیمیایی کارتێکرنەکا گەلەکا مەزن ل خەلکی کر. بەری هێزێن ئیراقی بگەهنە سەر سنوورێ ترکیا ب دەهان هزاران خەلک ژ هەمی سەمتان بەرەڤ سنوورێن ترکیا رەڤین، پشتی وانا

هەمی مال و مولكێن خو هێلاین و گەلەک ژوانا ب رێڤە جارەكادی بوونە ئارمانجا چەكێن كیمیایی ڤە. گەلەک ژێدەر هژمارا وان كەسان یێن خۆ قورتال كرین و گەهاندینە سەر سنوورێن تركیا ب ٦٥٠٠٠ – ٨٠٠٠٠ هزاران ددەنە زانین(٤٩).

بەروڤاژی قوناغێن دی یێن ئوپەراسیونێن ئەنفالان د ڤێ قوناغێ دا گەلەک خەلک دەما هاتینە گرتن یەكسەر هاتنە كوشتن. وەكی رێكخستنا PHR/ MEW د لێكولینا خۆ یا ل سەر خرابكرنا گوندێ كورێمێ خویاكری، هێزێن سەربازی یێن ئیراقێ ل رۆژا ١٩٨٨/٨/٢٨ نێزیكی ١٥٠ – ٣٠٠ گوندیيان گرتین. عەسكەری ئەو گرتی پارڤەكرنە سەر سێ گروپان: گروپا ژن و زارۆكان، گروپا پیرەمێر و پیرەژنا و گروپا زەلاما. ٣٣ زەلام ژ تەمەنێ ١٣ سالیێ و پێڤەل هاتنە رێزكرن و ژ لایێ ١٢ سەربازان كو پێنج مەتران ژ وان دور بوون ئەو گولەبارانكرن. هەرچەندە "گولەیەكا رەحمێ" ژی ل هەر كەسەک ژ وان دان، لێ دیسا ژی شەش كەس ژ وێ كۆمكوژیێ رزگاربوون(٥٠).

پشكەكا مەزن یا خەلكی كو نەشیان خو بگەهیننە سنوورێ تركیا ژلایێ عەسكەرێ ئیراقێ ڤە هاتنە گرتن. لیوا یونس محمد الذرب د راپورتەكێ دا بۆ سەرۆكاتییا لەشكەرێ ئیراقێ ددەتە خویاكرن كو هێزێن ئیراقی ١٣٣٩٥ كەس د ئوپەراسیونا هەشتاندا گرتینە كو ٦٩٦٤ ژ وان زارۆك بووینە و ٣٣٦٨ ژن بووینە و ٣٠٦٣ زەلام بووینە(٥١). لێ ئەڤ هژمارە نە گەلەكا هویر و یا دروستە، چونكی گەلەک خەلكێ دی ژ لایێ دەزگەهێن ئەمنی ڤە هاتبوونە گرتن و هەروەسا ژی گەلەک كەسان پشتی راگەهاندنا لێبورینێ ل ٦ێ ئەیلوولێ خۆ رادەستی حكومەتا ئیراقێ كرن و ئەو ژی هاتنە گرتن. د ئەنفالا بەهدینان دا ٦٦٣ گوند هاتنە وێران كرن(٥٢).

لایێ لەشكەری یێ ئوپەراسیونا ئەنفالا هەشتان ل بەهدینان ب بریارەكا سەرۆك كۆمارێ ئیراقێ سەددام حسین ل رۆژا ١٩٨٨/٩/٦ ب داویهات. بەلێ گرتن، زیندانیكرن و كوشتنا ب كۆم یا خەلكی تا سالا ١٩٩١ ژی یا بەردەوام بوو.

## سێ پێنگاڤێن ڤركرنێ د ئەنفالا هەشتان دا

نڤیسەر و بسپورێ جینوسایدێ یێ ب بنیاد جهوویێ ئەلمان رائول هیلبێرگ Raul Hilberg، كو ئێک بوویە ژ قورتالبوویێن هولوكوستا جهوویان، د پرتووكا خو یا ب ناڤودەنگ "ژناڤبرنا جهوویێن ئەورویی"(٥٣). دا كو پتری ٢٠ سالا كار تێدا كریە، گەهشتییە وێ ئەنجامێ كو هەر جینوسایدەک پێتڤی یە د سێ پێنگاڤان را دەرباس ببیت. ئەڤ بیردوزە وەكی رێكخراوا چاڤدێرییا مافێن مرۆڤی – بەشێ رۆژهەلاتا ناڤین د لێكولینا خۆ یا ل سەر ئوپەراسیونێن ئەنفالان دا وەک جینوساید گەهشتە وێ ئەنجامێ كو پروسا ئوپەراسیونێن ئەنفالان وەكی یا ژناڤبرنا جهوویان ژ لایێ نازی یێن ئەلمانیاڤە د سێ پێنگاڤان دا دەرباس بوویە(٥٤). ئەو سێ پێنگاڤێن هیلبێرگی دەستنیشانكرین ب ڤی شێوێ خوارێ نە: پێناسەكرن – كۆمكرن (گرتن) و ژناڤبرن.

بكەرێ جینوسایدێ ل پێشیێ پلانەكا سیستەماتیک و پێشوەخت ددانیت بۆ ژناڤبرنا هەر گروپەكا دەستنیشانكری. ئەو گروپا كو حكومەتا ئیراقێ ڤیایە ژناڤ ببەت، ئانكو ئەنفال بكەت كورد بوون و ب تایبەتی ژی ئەو كورد بوون یێن بەری نها هاتینە پێناسەكرن و ل دەڤەرێن قەدەغەكری یان ژی حەرامكری دژیان (المناطق المحرمة) یان ژی (المناطق المحظورة). ئەڤ دەڤەرە ئەو بوون یێن دبن كونترولا بزاڤا رزگاریخوازا كوردی دا بوون، ئانكو دبن كۆنترولا پێشمەرگەی دا بوون، و حكومەتا ئیراقێ نەشیابوو وان دەڤەران ژ دەستێ پێشمەرگەی دەربینیت و بێخیتە بن دەسەلاتا خوڤە، ڤێجا ژبەرهندێ ژی رژێما ئیراقێ ناڤێ ڤان دەڤەران كرە دەڤەرێن قەدەغەكری یان ژی حەرامكری. رژێمێ ئەڤ دەڤەرە پارڤەكرنە سەر

هەشت دەڤەران و هەشت قوناغێن ئەنفالان بۆ گرتن و ژناڤبرنا کوردان. ل دووڤ وان بریارێن ژ حکومەتا ئیراقێ دەرکەتین هەر کەسەکێ ل ڤان دەڤەران بژیت مافێ ژیانێ نینە و دڤێت بهێتە کوشتن یان گرتن و ژناڤبرن.

ل دووڤ هەر سێ پێنگاڤێن هیلبێرگی پێتڤییە ئەو گروپا هاتییە پێناسەکرن و دهێتە جینوسایدکرن بهێتە کۆمکرن یان ژی گرتن، هەکە نەشێت بهێتە جینوسایدکرن. رژێما ئیراقێ ژی ل پێنگاڤا دوێ هێرش کرە سەر وان دەڤەرێن ب دەڤەرێن قەدەغەکری هاتینە پێناسەکرن و ئەو مرۆڤێن د وان دەڤەران دا دژیان، بێی جوداهی بهێتەکرن دناڤبەرا پێشمەرگە، پیر، ژن و زارۆك. هەمی هاتنە گرتن و کۆمکرن. ل پێشیێ ئەڤ خەلکێ ل دەڤەرێن قەدەغەکری یێن بەهدینان هاتینەگرتن یان ژی خۆ ڕادەستی هێزێن رژێمێ کری ل هندەک ناحیا، گوندا د خاندنگەها ڤە یان ژی د مزگەفتا ڤە هاتنەکۆمکرن و پاشی ژی هاتنە ڤەگوهاستن بۆ کەلا نزارکێ ل دهۆکێ یان ژی بۆ زیندانا سەلامیێ ل موسل. ئەڤ خەلکێ هاتییە گرتن و ل کەلا نزارکێ هاتییە کۆمکرن هەمی پارە و دوکۆمێنت و تشتێن وان هاتنە ژێ وەرگرتن و پاشی هاتنە پارڤەکرن بۆ سەر چوار گروپان:

١. گروپا زەلامان یا تەمەنێ وان ژ ١٢ تا ٥٠ سالان
٢. گروپا ژ ٥٠ سالان پێنهەل
٣. گروپا کچان ب تنێ
٤. گروپا ژن، دەیک و زارۆکێن وان

پێنگاڤا سێێ یا هیلبیرگی ژناڤبرنا ئانکو کوشتنا ب کۆم یا وان گرتی و کۆمکریایە. ل ئەنفالا بەهدینان ئەو کەسێن هاتینە گرتن و کۆمکرن و پارڤەکرن ل سەر چوار گروپان ل کەلا نزارکێ و زیندانا سەلامیێ ڤێجا گروپ گروپ هاتنە ڤەگوهاستن بۆ دەڤەرێن ژ دەرڤەی هەرێما کوردستانێ و د گورێن ب کۆمەل دا هاتنە گولەبارانکرن و بنئاخکرن.

**پێناسەکرن،**
(دەڤەرێن قەدەغەکری – حەرامکری، دەڤەرێن ئەنفالێن ١ تا ٨)

**کۆمکرن (گرتن)،**
(کەلا نزارکێ و سەلامیە)

**ژناڤبرن،**
(کوشتنا قوربانییان د گورێن ب کۆم دا)
ئەڤ هەر سێ پێنگاڤە بۆ هەر جینوسایدکرنەکێ گەلەک دگرنگن و بێی ڤان پێنگاڤان گەلەک گرانە بکەرێن جینوسایدێ بکارن گروپەکا دەستنیشانکری قڕ بکەن.

Hilbergسێ پێنگاڤێن قرکرنێ، پێناسەکرن، گرتن(کۆمکرن) و قرکرن

١ . پێناسەکرن، سنورێن ئەنفالا هەشتان




٢.گرتن و کۆمکرنا قوربانیێن ئەنفالا هەشتان، ژن، مێر و زاروک



کۆمکرنا وان ل ١٦ جهان،

گوندێن تروانش، سەرسنگێ، رەزیکێ، بێناتا، کۆرکا، زێواشکان، هەڤندکا، بەلیتێ، سپینداری، شیرانێ، دێرەشێ برجینی، ئێکمالە، گیزێ، مەمانێ و هێسێ

کەلا نزارکێ، پارڤەکرنا خەلکێ گرتی ل سەر چوار گروپان



٣.گورێن ب کۆمەل ل بیاباناباشورێ عیراقێ



زیندانا سەلامیێ ل موسل



کەمپا بەحرکێ ل هەڤلێرێ



# ژێدەر و پەراوێز:


1. بنێره ل روپەل Schaller, Dominik J: Genozid, Historisierung & Rezeption. Was kann die1
Analyse der Rezeption des Völkermordes an den Armenien (1915) in Deutschland während der Jahre 1915-1945 zum Verständnis der Shoah beitragen?

2. بنێره ل: Das wohl ambitionierteste Early Warning System ist dasjenige des Sozialwissenschaftlers Ted Gurr. Siehe im Internet: www.bsos.umd.edu/didcm/mar/.

3. بنێره ل: Trummer I., Peter: Genozid: Lehren aus dem 20. Jahrhundert und Herausforderungen für das 21. Jahrhundert. In: Der Bürger im Staat. (Hg.) Landeszentrale für politische Bildung Baden Württemberg: 54. Jahrgang, Heft 4, Stuttgart 2004.

4. بنێره ل: Smith, W. Roger: Pluralismus und Humanismus in der Genozidforschung. In: Dabag, Mihran und Platt, Kristin (Hg.). Genozid und Moderne, Strukturen kollektiver Gewalt m 20. Jahrhundert. Leske + Buderich, Opladen 1998. Seite 310.

5. بنێره ل روپەل 29: Dabag Mihran: Genozidforschung. Leitfragen, Kontroversen, Überlieferung. Zeitschrift
für Genozidforschung. Jh. 1. Heft 1(1999).

6. بنێره ل ژێدەرێ بەرێ روپەل 218 .Trummer I., Peter, 2004

7. بنێره ل روپەل 104: Goldhagen, Daniel Jonah 2009: Schlimmer als Krieg. Wie Völkermord entsteht und wie er zu verhindern ist. Siedler Verlag, München.

8. بنێره ل روپەل 57: Benz, Wolfgang 2006: Ausgrenzung, Vertreibung, Völkermord. Genozid im 20. Jahrhundert. dtv, München.

٩. بنێره ل روپەل ١٠٥ ژێدەرێ بەرێ: Goldhagen, Daniel Jonah ٢٠٠٩:

١٠. پتر پێزانین ل سەر دوكومێنتێن حكومەتا عیراقێ بنێره ل:
Montgomery, Bruce P. 2010: Counterpoint. Reurning Evidence to the Anfal Files Should be Repatriated to Iraqi Kurdistan. In: Archivaria, The Journal of the Association of Canadian Archivists. Nr. 69, Spring 2010. P. 143-171. هەر ئەو دیسان: The Iraqi Secret Police Files: A Documentary Record of the Anfal Genocide. In: Archivaria, The Journal of the Association of Canadian Archivists. Nr. 52. هەروەسا Bahjat, Sarbest 2011, و HRW/ME 1995.

١١. بنێره ل: عسكرى مصطفى و ئامێدى محمد صالح و اخرين ٢٠٠٦: نص اللائحة الاضاحية المقدمة من قبل هيئة الدفاع عن ضحايا جريمة الانفال الى محكمة الجنايات العراقية العليا فى القضية المرقمة ١/جنايات الثانية. مطبعة مندلاوى، اربيل. روپەل ٤٦.

١٢. ئورگینالا خالا یەكێ ب ڤی رەنگی یە"اولا. يقوم الرفيق على حسن المجيد، عضو القيادة القطرية لحزب البعث العربى الاشتراكى، بتمثيل القيادة القطرية للحزب و مجلس قيادة الثورة فى تنفيذ سياستهما فى عموم المنطقة الشمالية و بضمنها منطقة كردستان للحكم الذاتى بهدف حماية الامن والنظام وكفالة الاستقرار فيها و تطبيق قانون الحكم الذاتى فى المنطقة". بنێره ل ئورگینالا ڤێ بریارێ ل روپەل ٣٠٥ – ٣٠٦:
Hajy, Salim 2012: Die Anfal-Operationen der irakischen Regierung gegen die Kurden (1987-1988). Eine Fallstudie über die Bedingungen des Genozids. Han, Berlin.

١٣. پتر ل سەر کونفرەنسێ ڤان -زێ بنێره ل روپەل ١٦٤ -١٧٠:

Benz, Wolfgang 2006: Die Wannsee-Konferenz vor 65 Jahren. In: Tribüne, Jg. 45 (2006). Nr. 4.

14. بنێره ل روپەل 133: Hoffmann, Tessa 1980: Der Völkermord an den Armeniern vor dem Gericht. Der Prozess Talaat Pascha (Berlin 1921). Göttingen.

15. بنێره ل روپەل 5: Human Rights Watch/Middle East 1995: Iraq´s Crime of Genocide. The Anfal Campaign against the Kurdes. Yale University Press. New York ans London.

16. پتر ل سەر فەرمان، دوکۆمێنت و جڤینێن المجید بنێره ل ژێدەرێ بەرێ: Hajy, Salim 2012.

17. بنێره ل روپەل 139: Fürtig, Henner 2003: kleine Geschichte des Irak. Von der Gründung 1921 bis zur Gegenwart. Verlag C.H. Beck, München.

18. بنێره ل روپەل 543:

Ansari, Adnan 1972: Die Staatsverfassungen der Welt in Einzelausgaben. Herausgegeben von der Forschungsstelle für Völkerrecht und ausländisches öffentliches Recht der Universität Hamburg. Band 2. Die Verfassung des Libanon, der Vereinigten Arabischen Republik und des Irak. Alfred Metzner Verlag. Frankfurt a.M./Berlin.

19. بنێره ل روپەل 895:

Arendt, Hannah 2008: Elemente und Ursprünge totaler Herrschaft. Antisemitismus, Imperialismus, totale Herrschaft. Piper Verlag, München.

20. بنێره ل روپەل 45: Springer, Jane: Genozid. Aus dem Englischen von Birgit Fricke. Carstenberg Verlag. Hildesheim 2007.

21. بنێره ل روپەل 62-63: Alfred Gosser: Verbrechen und Erinnerung, Der Genozid im Gedächtnis der Völker. Aus dem französischem von Ulrike Bokelmann. München 1993.

22. بنێره ل:

Hankel, Gerd 2011: Was heißt eigentlich Völkermord? Überlegungen zu einem problematischen Begriff. In: http://www.eurozine.com/articles/2005-09-29-hankel-de.htmlS. 6/11.

23. بنێره ل روپەل 181 -182، ژێدەرێ بەرێ: Barth, Boris 2006.

24. بنێره ل روپەل 11: Rummel, R. J.: Genocide. In: http://www.demozid.de/genozid.htm (07.08.2012)

25. بنێره ل 46: Springer, Jane 2007 ژێدەرێ بەرێ.

26. بنێره ل روپەل 54:

Kuper, Leo 1981: Genocid – It's a political Use in the Twentieth Century. New Haven/London: Yale University Press.

٢٧. بنێره ل: عومەر محەمەد: پەلامارە سەربازیەکانی ئەنفال لە هەشت قوناغدا. چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠١٣. ل ٢٥.

٢٨. بنێره ل شۆرش حاجی رەسولْ: ئەنفال و کورد و دەولەتی عیراق. لەندەن ٢٠٠٣. ل ٨٧.

٢٩. بنێره ل زوزان ناسر مستەفا: ئوپەراسیونێن ئەنفالێ ل کوردستانێ، دەرئەنجام و کاردانەڤە. ئەکادیمیای کوردی، هەولێر ٢٠١٣. ل ١٠٨.

٣٠. بنێره ل ژێدەرێ بەرێ ل ١١٠-١١١.

٣١. بنێره ل گومبەتی، یئدریس ئومەر: ئەنفالی زێ بچوک. لێکۆلینەوەیێکی مێژوویی، سیاسی، ئابووری، کۆمەڵایەتییە. چاپە یەکەم، سلێمانی ٢٠١٣. ل ٤٥.

٣٢. بنێره ل ژێدەرێ بەرێ.

٣٣. بنێره ل عومەر محەمەد: پەلامارە سەربازیەکانی ئەنفال لە هەشت قوناغدا. چاپی یەکەم، سلێمانی ٢٠١٣. ل ١٤٧.

٣٤. بنێره ل Salim Hajy ژێدەرێ بەرێ. ل. ٢٢٦-٢٢٧.

٣٥. بنێره ل ژێەرێ بەرێ. ل ٢٢٧.

٣٦. بنێره ل شۆرش حاجی رەسولْ: ژێدەرێ بەرێ. ل. ١١٠.

٣٧. بنێرە ل Salim Hajy ژێدەرێ بەرێ. ل ٢٢٨.

٣٨. بنێرە ل ئەرشەد حەمەد محو، ئوپراسیونێن ئەنفالا ل دەڤەرا بادینان (دەمهیک ئەنفال) ٢٥ تەباخێ – ٦ ئەیلولێ ١٩٨٨ (خواندنەكا دیروكی). د گوڤارا زانكوی سلێمانی دا. بەشێ B. ژمارە ٤١ تەمموزی ٢٠١٣. سلێمانی. ل ٩.

٣٩. بنێرە ل زوزان ناسر مستەفا، ژێدەرێ بەرێ، ل ١٣٥.

٤٠. بنێرە ل علی نبی صالح دوسكی، عملیات الانفال فی كردستان العراق. دار سپیریز للطباعة و النشر، دهوك ٢٠٠٦. ل ١٩٧.

٤١. بنێرە ل ئاسو حەسەن، لە دووریانی مەرگ و ژیان دا. دەزگای موكریانی. هەولێر ٢٠٠٧. ل ٦٦.

٤٢. بنێرە ل عەلی بەندی، ئەنفالكرنا بەهدینان. بەرگێ سێ. سپیریز. دهوك ٢٠٠٨. ل ٢١٦.

٤٣. بنێرە ل ژێدەرێ بەرێ.

٤٤. بۆ پتر پێزانینان ل سەر ڤێ شروڤەیا عەسكەری بنێرە ل ئورگینال و وەرگێرانا وێ د عەلی بەندی، ژێدەرێ بەرێ، ل ١٥٦.

٤٥. بنێرە ل ژێدەرێ بەرێ. ل ١٥٧.

٤٦. بنێرە ل زوزان ناسر مستەفا. ژێدەرێ بەرێ. ل. ١٣٩.

٤٧. بنێرە ل علی نبی صالح دوسكی. ژێدەرێ بەرێ. ل. ٢٠٠ – ٢٠٢.

٤٨. بنێرە ل Salim Hajy. ژێدەرێ بەرێ. ل ٢٣٠.

٤٩. ژێدەرێ بەرێ. ل ٢٣١.

٥٠. پتر ل سەر كومكوژیا گوندێ كورنمێ بنێرە ل ٢٣١:

HRW/ME. Iraq´s crime of Genocide. The Anfal Campaign against the Kurds. Yale University press, New Haven and London, 1995.

51. بنێرە ل Salim Hajy، ژێدەرێ بەرێ. ل. ٢٣٢.

٥٢. بنێرە ل عەلی بەندی، ژێدەرێ بەرێ، ل ١٣١-١٥٣.

٥٣. بنێرە ل روپەل ٤١ و ٦٧٧:

Hilberg, Raul 1982: Die Vernichtung der europäischen Juden. Die Gesamtgeschichte des Holocaust. [Hrsg. Wolter, Ulf. Aus dem Amerikanischen von Seeger, Christian…] – Berlin: Olle und Wolter.

٥٤. بنێرە ل روپەل ٥ ژێدەرێ بەرێ: HRW/ME ١٩٩٥

# سەربۆرێن دهۆکییان د کۆچ و کۆچبەری و گرتیگەهێن سەر بەردایدا ل(عێراق،ئیران،ترکیا،فرەنسا،کەنەدا،ئەمریکا)

رێکارێ مزویری

دەڤـەرا بەهدینان یان ژی پارێزگەها دهۆکێ سەربۆرەك دیرۆکی دگەل کۆچ کۆچبەریێ و مشەختی و مشەختبوونی و ژیان ل گرتیگەهـ و ئاکنجیکەهێن ئاوارەیان هەیە، ئەڤ مژارە پێدڤی ب ڤەکولینێن بەرفرەهـ و دووڤچوونێن بەرفرەهترە، ل ڤێرێ و ل دووڤ شیان و ژێدەرێن بەردەست دێ ب کورتی ل دووڤ ڤی بابەتی چین و هندەك زانیارییان ل دوور مژارێ بەرچاڤکەین و دێ ب هندەك ئیدیۆمان دەسپێکەین:

## جهێن کوچبەر لێ دهاتنە ئاکنجیکرن دگوتنێ:

(کۆمەلگەهـ، ئوردووگا، مجمع، تەجمع، خیڤەتکە، چادرگەهـ، محەل، کەمپ، ناڤسیم، سیمکری)

هەمی کوچبەرێن کوچدکرن یان دهاتنە راگواستن ل جهەکی کۆمدکرن، ناڤەک بۆ داتینا:

کۆمەلگەهـ: پەیڤەک کرمانجییا خوارێیە، بۆ جهەکی دهێتەگۆتن کۆمەلەکا سەرۆک خێزانان لێ دهێنە کۆمکرن. بنیاتێ وێ ژ کۆمەکا مرۆڤان خەلکێ کۆمبووی هاتییە.

ئوردووگا: بۆ جهەکی دهێتە گۆتن کو کۆمەکا مرۆڤان لێ هاتبیتە کۆمکرن، پەیڤەکا فارسییە، دەمێ کوردێن باشوور ئاوارەی ئیرانێ بووین ئەڤ پەیڤە لناڤ کوردان بەلاڤ بوو.

مجەمع: پەیڤەکا عەرەبییە بۆ وی جهی دهێتەگۆتن یێ بەعسییان راگوهاستییێن کورد ل ناڤ دا کۆمکری، لێ جهێ تێدا دژین خانی بوون نە خیڤەت، گەلەک جاران ژی کوردان دگۆتێ تەجەمع.

خیڤەتکەهـ: بۆ وان جهان دهاتە بکارئینان یێن کۆمەکا مرۆڤان لێ کۆمدکرن و لبن خیڤەتان ژیانا خۆ دبوراند، بنیاتێ وێ ژ خیڤەتێ ( خیمة ) عەرەبی هاتییە،هەروەسا بفارسی و کوردیش چادرگە، بکاردئینن.

ل باشوورێ کوردستانێ بهزاران گوند هاتن وێرانکرن و راگواستن، خەلکێ زێدەتر ژ (٤٥٠٠)

گوندان بوونە دو بەش بەشەک رەڤین و چوونە دەڤەرێن ئازاد و وەلاتێن هەڤسوی وەک ( ئیران، ترکیا، دەڤەرێن ئازادکری ) بەشێ زۆر هاتن ڤەگواستن بۆ ناڤ (١٤٢) کۆمەلگەهێن ب زۆر هاتینە چێکرن ل پارێزگەهێن هەولێر (٣١)کۆمەلگە، دهۆك (٣١)، سلێمانی (٣٢)، شنگال (١٢)، کەرکوکێ (٣٦) هەروەسا لسەر عەردێ کوردان، گەرەک (تاخ) بۆ عەرەبان بناڤێن عەرەبی چێکرن بێ خواست و ویستا خەلکێ.

## خەلکێ راگوهاستیێ پارێزگەها دهۆکێ د کۆمەلگەهێن ژێریدا دا ئاکنجیکرن:

(مانگێشک، سۆریک، دەرکار، شاریا، کورێت گڤانا، بێگۆڤا، کانێ، دێرەلوکێ، کانی عەرەب، ئاڤرزەیک، دێرەبین، چەمکویرک، سیریێ، خانکێ، پیرسڤێ، گرشین، باتێل، تلکەبەرێ، شێلادزێ، بالقوس، باستک،یاوەردێ، سەرتەنگ، هێزاڤا، یامودێ، فیشخابوور، ئیبراهیم خەلیل، باتیفا، باگێرا، قەدش)

چەندین کۆمەلگەهێن دن ل باشوورو ناڤەراستا ئێراقێ هاتبوون ئاڤاکرن، مەرەم پی ئەو بوو کوردان ژ کوردستانێ دوور بێخن و ل وان کۆمەلگەهان ئاکنجیبکەن، وەک شحاتیە ل ناحیا بوسیە باشوورێ عێراقێ، هەروەسا بەعسیان سالا ١٩٨٨ێ نێزیکی هزار سەرۆك خێزانێن دهۆکی یێن ژ هێرشا بناڤ ئەنفال رزگار نەبووی، گرتن و ڤەگواستن سەربازگەها سەلامیێ دویفدا، ل کۆمەلگەها جیژنیکان ل ناحیا بەحرکێ کۆمکرن.

خەلکێ دهۆکێ ب ڤی رەنگی لناڤەراست و ژێریێ عێراقێ بەلاڤەکرن

١٩٧٦ ل(٥)چادرگەها سەماوە

١٩٧٦ گەرەکی کوردان ناسریە

١٩٧٦ گەرەکی کوردان رومادی (سورة سوفیة)

١٩٧٦ زۆربەی ئەو کوردێن ل ئێرانێ ڤەگەریای، ل پاش نسکۆی سالی ١٩٧٥ ل ناڤەراستا عێراقا



دیمەنەك ژ تراجیدیا کۆچا ملیونێ ل سالا ١٩٩١ی

نیشتەجێکرن، ل قەزا و ناحیە و گوندێن وەک (فەلوجە، مەحموودیە، خالدیە، حسێبیەی شەرقی، حسێبیەی غەربی، روتبە، مقدادیە، بەغدادیە، عانە، راوە)، دگوتنێ (عائدوون) ب رامانا ئەوێن زڤرینەڤە.

## ١٩٩٢–٢٠١٤ ئاوارەیێن تۆپبارانێن ترکیا و ئیرانێ

هەر دگەل دامەزراندنا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ خەلکێ زۆربەی گوندێن سنووری ڤەگەریان سەر گوندێن خۆ، لێ دەولەتێن داگیرکەرێن کوردستانێ وەک ( ترکیا و ئیرانی ) ب بەهانا پارتیێن دژبەری وان (دیمقرات، کۆمەلە، پەژاک، پەکەکە) ب فرۆکە و توپان، و هێرشێن لەشکەری، هێرش دکرە سەر گوندان و چادرگەهێن خودانێن تەرش و کەوالی و مەرومالاتی، زێدەتر ل ( ٢٥٠ ) کەسان شەهید کرن و سەدان کەسژی بریندارکرن، زۆرجاران ژی مەرۆ مالاتێ وان ب تالان دبر، ئەڤ خەلکەژی ئاوارە و مشەختی دبوون، چادرگە بۆ دهاتنە ڤەدان بهزارن کەس تێدا دهاتنە ئاکنجیکرن، ب تایبەت ل سنووری قەزایێن (وران، رەواندوز، چومان، ئامێدی، زاخۆ، مانگێشک، رانیە، قەلادزێ ، پێنجوین)، زێدەتر ژ ١٧٠ گوندێن دهۆکێ د ویرانن و خەلکێ وان بەر توپباران و فروکێن ترکیا ئاوارەبوونە و نەشێن ڤەگەرن جهێ باب وکالان. چەندین خەلک بکۆم بڤان فروکان هاتن کۆمکوژی کرن وەک کۆمکوژێن: کورتەک ، زارگەلی، گوندێ توبێ ناڤ مزوریان.

## دهۆکی ل کۆمەلگە و تاخ و گەرەکێن شارێن وەلاتێ ئیرانێ

هەژیە ل ڤێرێ بێژین ژ سالا ١٩٧٤- ١٩٧٥یڤە بەرەڤ ژوور ب سەدان هزار کوردێن باشووری کوردستانێ مشەختبووینە ئیرانێ و رۆژهەلاتێ کوردستانێ کو پشکەك مەزن ژ وانا خەلکێ پارێزگەها دهۆکێ بوون و ل باژێر و باژێرك و دەڤەرێن ئیرانێ یێن ژێری بەلاڤەبووینە و لێ ئاکنجووبووینە و پشتی دامەزراندنا حکومەتا هەرێما کوردستانێ پرانییا وان زڤرینەڤە باشووری کوردستانێ و ل گوند و باژێرێن خۆ و هندەك ژی ل کۆمەلگەهـ و باژێرێن دی ئاکنجی بووینە.

(تاران، گەیلان، زەنجان، قەزوین، مازندەران، گولستان، سمنان، خوراسان، زاهیدان، فەریمان، سیستان و بەلوچستان، کەرمان، ئەسفەهان، هەمەدان، لورستان، خۆزستان، هۆرمزگان، ئابادان، کاشان، کەرەج، شهرکورد، بۆشەهر، فارس، شیراز، جەهرۆم، بەندەرعەباس، چاربەهار، یاسوچ، مەشهەد، قوم، کرماشان، سەنەندەج، نەغەدە، ساوە، یەزد، ئورمیێ، ئەهواز، تەبرێز، بابک، بەهرام، خۆرەم ئاباد، سەنگور، زێوە، خوێ، بێمزورتە، سێگرکان، بارزان ئاباد).

## خەلکێ دهۆکێ ل کۆمەلگەهێن ترکیا یێ

پشتی نسکویا ئادارا ١٩٧٥ی هژمارەك ژ خەلکی دەڤەرا بەهدینان مشەختبوونە باکووری کوردستانێ و دوور ژ چاڤێن دەستەلاتدارێن ترکیا ل ناڤ مرۆڤ و عەشیرەتێن خۆ ل دەڤەرێن سنووری ئاکنجیبوون بەلێ ل سالا١٩٨٨ێ ل پاش کیمیابارانا کوردستانێ و ئەنفالا بەهدینان بهزارەها کوردین باشووری کوردستانێ کو پرانییا پرانییا وان خەلکێ پارێزگەها دهۆکێ بوون مشەختی باکووری کوردستانی بوون و حکومەتا ترکیا ناچار بوو ل ژێر فشارا رایا گشتییا جیهانی و رێکخراوێن مافێ مرۆڤی وانا ل چەند کەمپەکان ڤەحەوینیت بەلێ د ژیانەکا پڕی ئەشکەنجە و ئازاردا دژیان و ل. ١٩٩١ د مشەختییا ملیونیا گەلێ کوردا بەهرەکا دیتر ژ خەلکێ بەهدینان مشەختی ترکیا بوون هندەك ل وان کەمپان و پرانی ژی ل کەمپا چەلێ نیشتەجێ کرن، ئەو کەمپ ژی ئەڤە بوون:

١- چادرگەها (ماردین)، دکەڤیتە ناڤبەرا قەزا قزلتەپە و ویلایەتا ماردینێ ل سەر جادا سەرەکی، دەف گەلیێ خۆرسێ. (١٥٧٥٠) پازدە هزارو حەفت سەدوو پەنجا کەس ژیانا خوە تێدا بسەربەن.



**دیمەنەك ژ کەمپێن پەنابەران ل باکوورێ کوردستانێ**

پێکهاتەیا چادرگەهێ ژ خەلکێ (٧٥) گوندێن ڤان (٤) دەڤەرانەبوون (بەرواری بالا، دوسکیا، ناوچێ زاخۆ، ناوچێ دهۆکێ)، رۆژا (١٩-١-١٩٨٩) گەنجەک بناڤێ (هەوار توفیق عوسمان)، تەمەنێ وی (١٣) سالبوو کەفتە دناڤ بیرێن پیسایدا چونک و زۆر دسەربەردای بوون. ل ماوێ (٤) سالاندا، (٣٥٠- ٤٠٠) کەسان ژیانا خۆ ژدەست دا و ل گوڕستانا (خۆرسێ) هاتنە ڤەشارتن.

٢- ١٩٨٨ چادرگەها ئامەدێ (دیاربەکرێ)، هەر ل هەیڤا (١١) سالا (١٩٨٩) هژمارەکا شوقان کو ژلایێ کوردەکیڤە هاتبوونە چێکرن، ئێخستنە دخزمەتا خەلکێ مشەختیدا، خەلکەکێ زۆر ژ مشەختان ل بەر شۆر و دیوارێ ئامەدێ دەستگێڕی دکر تشت ل سەر دەستان و بەر دیواری دفرۆتن، هەول ددا بخوها ئەنیا خۆ بژین .

٣- ١٩٨٨ چادرگەها (سلوپی) ئەڤ چادرگەهە (٢-٣) کیلومەتران ژ ئیبراهیم خەلیل دوورە و بۆ وان کەسا هاتییە چێکرن یێن سالانە سەرەدانا مالا خودێ دکەن، ئەو حەجیێن دچنە مەکەهێ. ل رۆژا (٢٧-٩-١٩٨٨) شاندەکا بیانی ژ رۆژنامەڤان و کەسایەتیێن مرۆڤ دۆست، دڤیا بچنە دناڤ چادرگەها سلوپیدا بۆ دیتنا برینداڕێن چەکێن کیمیاوی، بتایبەتی شوینوارێن کیمیایێ لسەر بنەمالەکا گوندێ وەرمێلێ مابوون، لێ جەندرمێن ترکان نەهێلا ئەڤ شاندە برینداران ببینن.لەورا خوپیشاندان هاتن ئەنجامدان، شەڕ دناڤبەرا جەندرمان و خوپیشاندەران رووددا، جەندرمان بهۆڤانە دو گەنج رەمیکرن و بڤێ گولەبارنێ (شیر نەزیر) خەلکێ گوندێ ناڤداران، (عەتەم محەمەد) خەلکێ گوندێ مایێ شەهیدبوون و (جاسم گەرماڤی) بریندار بوو. چونکو خەلک ل بەعسیان و مخابراتا عێراقێ دترسان، هاتن ڤەگواستن بۆ چادرگەها ماردینێ، مخابن ل دەمێ ڤەگواستنێ خەلک کرە دناڤ لورییێن شوینا رەژوی و کۆمرێ دا، دەمێ گەهشتی ناڤا کەمپێ مێردینێ هەمی رەشببوون وەک تەنیا بەرێ سێلێ مێر و ژن بزۆری ژێک دهاتنە جوداکرن.

٤- ١٩٨٨ چادرگەها ( موش )، پارێزگەها ئامەد،(٣٠)

کەس ژیانا خوە تێدا بسەردبەن.

٥- ١٩٩١ چادرگەها ( چەلێ )، پاش خیانەتا دوویێ یا ئەمریکا ل کوردێن باشوور کری دبن چادرگەهێن (سەفوان)دا سالا ١٩٩١ ل باشوورێ عێراقێ، چادرگەها چەلێ ل ترکیایێ هات دامەزراندن، ئەڤ چادرگەهە دۆزەخ و هێتوینەکا ساربوو. ژن و زارۆک و پیرو لاو وەک بەلگێن داران بایێ پایزێ دئینیت دخشیانە ناڤا چادرگەهێ، کوردێن باشوور د کۆرەوا ملیوونیا سالا ١٩٩١ دا ب (٤) ریان بەرەڤ چەلێ دچوون ئەڤ چوار رێکە بۆ خەلکێ دەڤەرا دهۆکێ رێکێن مان و نەمانێ بوون، ل ئەسمانی بەفرو باران و باو باهۆز، ل عەردی ژی تانک و توپ و تەیارە، ل خەلکی ژی قێرێ و گازی و گری و هەوارە. ل ماوێ (١٥) رۆژان زێدەتر ژ (٢٥٠٠٠٠) دوو سەد و پێنجی هزار مرۆڤ لناڤ چادرگەهێ کۆمبوون.

رێکێن دچوون بەرف دۆزەخا سار (چەلێ):

چەم جوهی: خەلک برێکا ( نێروە، رێکان، ئامێدیێ، نەهلێ ) دچوون بەرەڤ چەلێ.

پرا بلبل: خەلک برێکا روبیارێ مەزن و پرا ( بلبل ، کارە، بێتکارێ) سەر ئەفراز دچوون بەرەڤ چەلێ.

کانی ماسێ: خەلک برێکا (دۆرێ، سەر زێری، دەشتانێ) دچوون بەرەڤ چەلێ.

گوندێ ئۆرە: خەلک برێکا گوندێن (ئارۆشێ، ئاشۆتێ) دچوون بەرەڤ چەلێ.

رۆژا (٨-٤-١٩٩١) وەزیرێ دەرڤە یێ ئەمریکی (جیمس بێکەر) ب هەڤکاریا وەزیرێ دەرڤەیێ ترکیا ل چادرگەها چەلێ گوتارەک پێشکەشی کوردستانییان کر.

ل چادرگەها چەلێ گەلەك ژ کوردان ب رێکێن جۆراوجۆ بوونە قوربانی و هاتنەکوشتن ژ وان رێکان:

نەبوونا پێدڤیاتییان: ژبەر نەبوونا خوارن و ڤەخارنا و سۆر و سەرمایێ و پێدڤیاتیێن تەندرۆستی، سەدان جەنازێن کوردان ل حەوشا مزگەفتا چەلێ رێزکربوون، پاشان ب تەرەکتور و شوفەران بکۆم هاتنە ڤەشارتن.

کوللەبارانکرن: ل پاش زۆری و ستەما جەندرمێن ترکان خەلک و زێرەڤانێن دەردۆرێن چادرگەهێ بشەڕ چوون، دووڤدا لەشکەرێ زۆردار ( ٤ ) کەس گوللەبارنکرن و (١٢) کەس ژی ب سەختی بریندارکرن.

دنگەبارین: فرۆکێن وەلاتێن ئێککرتی دنکە و بالێن خارن و ڤەخارنان و جل و پێلاڤان، بەردانەڤ سەر سەرێ خەلکی مشەختێن چەلێ، ( ٦-٨ ) کەس ببەرکەفتن و شەهید بوون.

ژهەرە ئاڤ: ژنەکا کوردا خۆفرۆشا بەعسییان بهەڤکاریا ترکان ژهەر کرە دناڤ ئاڤێدا کو تنێ یەک بۆریا ئاڤێ دهاتە ناڤ چادرگەهێ، نێزیکی (٣٠٠٠ ) کەسان بڤێ ئاڤێ نەخۆشبوون و هاتن ڤەگواستن بۆ نەخۆشخانان، ژنا خۆفرۆش و هەڤکارێن وێ هاتن گرتن و رادەستی بەرەی کوردستانی کرن، ترکان خۆ ژێ خەلاس کر، لێ یاراست ئەوە ئەوژی تاوانباربوون.

١٩٩١ چادرگەها ( بیادرێ ) ئەڤ چادرگەهە ل دەردۆرێن چەلێ بوون ب هزارەها کورد تێدا بوون.

١٩٩١ چادرگەها ( دەشتانێ ) ئەڤ چادرگەهە ل دەردۆرێن چەلێ بوون ب هزارەها کورد تێدا بوون.

## کۆچبەرییا دهۆکیان بۆ ئەوروپا و ئەمریکا و فرەنسا

سەرەرای وێ یەکێ کو دهان هزار خەلکێ پارێزگەها دهۆکێ برێکێن جوراو جور ئاوارەی ئەوروپابوونە،

چادرگەهێن کوردێن باشوور ل (فرەنسا) : ل رۆژا (٢-٥-١٩٩٢) خانما ( دانیال میتران) دگەل شاندەکێ هاتن ناڤ چادرگەها ماردینێ، سۆزدا هندەک ژ پەنابەران ببەت فرەنسا، ل (٢٨-٧-١٩٨٩) چەند کارمەندەک ژ بالیوزخانا فرەنسا هاتن ناڤێن (٣٠٠) کەسا نڤیسین، ل رۆژا (٣٠-٧-١٩٨٩)، د ماوێ سێ رۆژاندا ئەڤ (٣٠٠) کەسە ژ رزگاربوویێن ئەنفالا ١٩٨٨ یا دەڤەرا بادینان، هاتن ڤەگواستن بۆ وەلاتێ فرەنسا.




## مەنتوئوبان فرەنسا

سالا ١٩٨٩ێ ٢٥٠ سەرۆك خیزان ل کەمپا ماردینێ هاتنە ڤەکواستن ژلایێ فرنسا میتەرانڤە.

٩-١٩٩٢ چادرگەهێن کوردێن باشوور ل (ئەمریکا): ل رۆژا (٢٩-١١-١٩٩٠) شاندەکا بالیوزخانا ئەمریکی و یوئێنێ ناڤێن (١٢٥٠) هزارو دو سەدو و پەنجا کەس ل ناڤ چادرگەها دیاریەکرێ و (١٧٥٠) کەس ل چادرگەها ماردینێ پشکنین بۆ هاتنە کرن و هەر کەسەک ل ئەمریکا ببوو بریکار و کەفیلێ (١٠-١٥) کەسان، ل هەیڤا (٥) سالا ١٩٩٢ دەست ب ڤەگواستنا پەنابەرێن کوردێن رزگاربوویێن ئەنفالا ١٩٨٨ کرو ل هەیڤا (٩) سالا (١٩٩٢) ئەڤ سێ هزار کەسانە هاتنە ڤەگواستن بۆ ئەمریکا.

١٩٨٩ چادرگەهێن دهۆکیان ل (دانیمارک)، ل رۆژا (٢١-٨-١٩٨٩) چەند کەسێن داخازنامە بۆ هاتبوو شاندا دانیمارکی سەرەدانا چادرگەهێ کرو، دگەل خۆب رنە دانیمارک.

## سەروبەرێ خێزان و کەسوکارێن پێشمەرگەیان ل ژێر دەستەلاتی بەعسیان:

سالێن ١٩٨٠ حکۆمەتا بەعسیان بهزاران ژن و زارۆک و پیرو لاوێن کورد گرتن وەک بارمتە ل جهێن کەسوکارێن وان یێن چویە ناڤ پێشمەرگان و دەڤەرێن ئازاد و ترکان و ئیرانێ، یاسایێن بەعسیان یێن دارستانێ بوون، ئەشکەنجەدانا برای لجهێ برای، دایک و بابان لجهێ زارۆکان.

## دیدەڤان و شایەتحالێن ناڤ کۆمەلگەها و گرتیگەهێن سەربەردایدا:

سەبارەت چەوانییا رەوشا ژیانا وان گرتیان و چیرۆکێن ناڤا چوار دیواران و کۆچ و کوچبەرییان، مە ئەڤ چاڤپێکەفتن دگەل بەرێز (مستەفا نجمان گەنجۆی) دا کر ئەویژی بڤی ئاوایی سەرهاتی و سەربۆرا ژیانا خۆو هەڤالێن خۆ یێن ب چاڤێ خۆ دیتی وەک دیدەڤان شرۆڤەکرن:

ببهاناوێ‌یەكێ‌برایێن‌من‌چوبوونەناڤ‌پێشمەرگان، سالا ١٩٨١ مەها ئاداری، ئەز و دایک و بابێ من هاتینە گرتن ژلایێ حكومەتا بەعسییانڤە، ژ دهۆكێ ب ترومبلەكا تێلبەندكری ئەم ڤەگواستینە مووسل، وەجبە وەجبە كەسوكارێن پێشمەرگان و كەسێن چوویی دەڤەرێن ئازدكری ل زاخۆ و دهۆك و شێخان و سێمێلێ دەردۆرێن دهۆكێ دگرتن و دئینانە مووسل، ژن و زارۆک پیرۆ لاوبوون، هەر سەیارەكا پولیسی (٥٠-٦٠) كەس بوون، دووڤدا ئەم ڤەگوهاستین بۆ باژێرێ بەغدا ل جهەكی ئاكنجیكرین وەكی گرتیخانە بكارئینابوو، لێ دبنگەهدا تەویلخانا دەواران بوو خانا هەسپ و هێسترێن حكومەتێ بۆ ناڤێ وێ (معتقل فضیلة) گرتیگەها فەزیلیە، ل مەها چوار سالا ١٩٨١ ئەم زوگردی جوداكرین، ژن و زارۆک ژی جوداكرن، ئەو (٢٠٠) مەتران ژمە دووربوون، (٨) هەیڤان ل بەغدا ئەم د بێ سەروشوین بووین كەس چ ژ مە نەدزانی، خەلكێ هەولێرێ و سلێمانیێ و كفری و كەلار دگەل مەدا هەبوون، دووڤدا ژن و زارۆک ڤەگواستن بۆ پارێزگەها سەماوە ل ناحیا بوسیە سەر سنوورێ عێراق سعودیێ، ئەم ماوێ سالەكێ ماینەڤە دگرتیگەهێ دا، لێدان و ئەشكەنجەدان نەبوو لێ ژلایێ دەروونی و نەبوونا پێدڤیاتیێن ژیانێ، ئەم دهاتینە ئەشكەنجەدان، بیرا منە كەسەكێ خەلكێ زاویتە دگەل مەدابوو ناڤێ وی (محەمەد سالح) بوو، یێن وەک مە هاتییە بارمتەكرن و بیرا من لێدهێتەڤە ئەڤەبوون (محەمەد نەجیب مائی، یەكتا محەمەد نەجیب) دوو برایێن خورشید سەلیم شێرە(نەجمەدین سەلیم، سەباح سەلیم)، (عماد بەرواری، نەسرین بەرواری)، بابێ میلازم عومەری دگۆتنێ (عوسمان كچكە)، هەروەسا بابێ دكتور ئەرسەلان بایزی و برایێ وی ( بایز ئەرسەلان، براهیم بایز) بابێ دانا مەجیدێ پارێزگارێ سلێمانیێ( ئەحمەد مەجید) هەروەسا (عوسمان چوارتای) دگەلمەدا بوو، (٤-٥) خەلكێ كفری و كەلار بوون، حەجییەک دگەلمەدا بوو چو بەردلوڤانییا خودێ جەنازێ وی برە دەرێ مە نەزانی داڤ مالا وان یان وان ڤەشارت، سالا ١٩٨٢ دكۆمبوونەكێدا ل هەولێرێ مەلایەكی گۆتە سەدامی ڤی خەلكی بەردە بلا بچن مرۆڤێن خۆ بینەڤە ل ئیرانێ، دووڤدا لێبوورینەكا گشتی دەركر، ئەم ئازادبووین لێ چ ئازادی هەمی گاڤان دەستێ مە ل سەر دلێ مەبوو، (٥-٦) سالەک چوون ئەنفالا سالا ١٩٨٨ دەست پێكر و گرتی و خۆرادەستكرێن خەلكێ دهۆكێ هەمی ل ناڤ كەلا نزاركی كۆمكرن، پاشان برنە سەلامیێ و بەحركێ و جێژنیكان. بۆ پتر پێزانینان، بڕیا تەلفوونێ مە پەیوەندی ب ( محەمەد سالح )ی كر، سەبارەت رەوشا ژیانا وان ل ناڤ گرتیگەهێ ل بۆسیێ چونكو ژ مستەفای جوداكربوون، محەمەدی گۆتن، ل بەغدا ئەم خێزاندار ژن و زارۆک ژێک جوداكرین دگەل زوگوردییان، مالا مە برە زیڤار، ناحیا بوسیە، كۆمەلگەها ( شحاتیە)، ئەم (٦٣) شێست و سێ سەرۆک خێزان بووین، زێدەتر (٢٠٠-٣٠٠) كەسبوون هاتبووینە دەستبسەركرن، مالا مە ئەم سێ زارۆک دگەل دایک و بابێ من گرتبووین، ل شحاتیێ (٧-٨) كۆمەلگەهـ بۆ كوردان چێكربوون، خانی دو ژوور و حەمام و مەدبەخ و ئاڤدەست بوون، سەحرا بوو، بتانكەران ئاڤ بومە دئینا، بنكەكێ بۆلیسی هەبوو، رۆژا دبوو ئاخ بارین و تۆزو تویخ، دایكا من هەڤیر دكر هەمی كون و دەرز و تیک بهەڤیری دگرتن، نەوەک ئەم دا خەندقین ژبەر توزێ، رۆژا دبوو باهۆز رۆژا رەشبوو، دووڤدا ئەم زارۆک ژ دایک و بابان جوداكرین ئینانە دهۆكێ ئازادكرین، ل پاش چەند مەهان دایک و باب ژی ئازادكرن. دووبارە مە رویێ خۆ وەرگێڕا مستەفای ویژی درێژە بگۆتنێن خۆداو گوتن، ل دووڤ راپەڕینا ١٩٩١ دووبارە حكومەتا بەعسیان هێرش ئینا سەر دهۆكێ و ب سەدان كەس هاتن گرتن و شەهیدكرن و ب هزاران خەلک رەڤین بەرەڤ چیان و تركیا، ئەمژی رەڤین چووینە چەم جوی و گەلیێ بالندا و چووینە چەلێ، رێكا چەلێ رێكا مرنێ بوو.



هەروەك مە ئاژە پێكری هندەك ژ وان ئاوارەیێن پشتی سەرهلدانێ ژ ئیرانێ زڤرینەڤە ژبەر توپ تەیارێن تركان نەكارین ڤەگەریێن گوندێن خو، لەوما حكومەتا هەرێمێ دو كۆمەلكە ب ناڤێن (تەناهی، هێتویت) چێكرن و ئەو خەلكێ ئاوارە لێ نیشتەجێبوون و نها هەردو كۆمەلكەهـ بووینە باژێرێن مەزن و هەموو رەنكە خزمەتگوزاریەك لێ هەنە.

## كۆمەلگەهێن كوردێن باكور ل دهۆكێ

ل پاش بومەلەرزا وانێ سەدان سەرۆك خێزان ئاوارەی شێلادزێ، زاخۆ، سێمێلێ بوون، بەری ڤێ بۆیەری ژی بۆ ماویێ چەند سالان۱۲۰۰۰ دوازدە سەرۆك خێزانێن كوردین باكوور ئەوێن د سالێن نوتاندا مشەختبووینە باشوورێ كوردستانێ ل دو خیڤتكەهان بوون ل ئەتروش.

## كۆمەلگەهێن كوردێ رۆژئاڤا ل دهۆكێ

پشتی بۆیەرێن قامیشلو یێن سالا ۱۹۹٤ێ و دووڤـرا ژی سەهلدانا خەلكێ سوریێ ل سالا ۲۰۰۱ێ هژمارەك ژ خەلكێ رۆژئاڤایێ كوردستانێ مشەختبوونە پارێزگەها دهۆكێ نێزكی ۲۵۰۰۰۰ دوو سەد و پێنجە هزار سەرۆك خێزانێ كوردێن رۆژاڤا هاتنە باشوور بەهرا هەرەزۆر ل دهۆكێ مانەڤە ل ناڤا كەمپێن (موقبل، دومیز، گەویلان، ئاكرێ، ناڤەندا باژێرێ دهۆكێ).

## كۆمەلگەهێن كوردێن ئێزدی

ل پاش هێرشا داعشان بۆ سەرشنكالێ ب هزاران كوردێن ئێزدی مشەختبوونە دەڤەرێن سەر ب پارێزگەها دهۆكێ چەندین كۆمەلكە بو هاتنچێكرن وەك: (خانكێ، چەممشكو، شێخان، باعەدرێ) و هەتا نهاژی پتریا وان ل وێری دژین.

# رێکخراوێن نە حکۆمی ل سنووری پارێزگەها دهۆکێ

کاوار حەمید باقی

## رێکخراوچنە؟ و چەند جورن:

دەستپێکێ ئەم دێ جورێن رێکخراوان دیار کەین و پاش دێ NGOیا باس کەین یێن کو مە ئەڤ نڤیسینە پێ مەرەم و دێ ل سەر راوەستین، ژبەرکو هەر جورەکێ رێکخراوان پێناسە و تایبەتمەندیێن خۆ یێن جودا هەنە.

رێکخراو ژ ئەڤان جوران پێك دهێن:

١- رێکخراوێن نێڤنەتەوەیی (منظمة عالمیة) International Organization (IO):

ئەڤە ئەو رێکخراون یێن دناڤبەرا وەلاتان دا و ژ وەلاتەکی پتر تێدا ئەندامن و بناڤ دەنگترین رێکخراوێن نێڤ نەتەوەی وەکی (UN- EU- OAS) د بوارێن سەربازی و کۆمەلایەتی و دارایی و ئابووری دا کار دکەن،نموونەیا پێشچاڤ UN رێکخراوا نەتەوەیێن ئێکگرتی ل سالێن ١٩٤٢-١٩٤٦ دروست بوو پێخەمەت چارەسەرکرنا هندەك کێم و کاسیێن کۆمەلگەهێ نێڤنەتەوەیی، و هندەك رێکخراوێن دی هەنە ل سەر ئاستێ جیهانێ کار دکەن کو گرێدایی رێکخراوا (UN)ێ نە، و هەر ئێکێ ژ ئەڤان رولێ خۆ یێ تایبەت دگێرن، وەکی:

(WHO) رێکخراوا تەندروستیا جیهانی

(WTO)رێکخراوا بازرگانیا گشتی

(ICAO) رێکخراوا رێنماییێن شارستانیا نێڤ نەتەوەیی

(ILO) رێکخراوا کرێکاران یا نێڤ نەتەوەیی

(IMF)هاریکاریا دراڤی یا نێڤ نەتەوەیی

٢- رێکخراوێن نێڤنەتەوەیی یێن حکۆمی(المنظمات الحكومیة الدولیة) International Government Organization (IGO):

سازیبەکە ژ پێکهاتەیێ کۆمەلگەهێ نێڤ نەتەوەیی و پشکداریێ د کاراکرنا ئیرادا ب کۆم یا نێڤ دەولەتی دکەتن و پێکهاتەیەکێ کارگێری و بجهـ ئینانێ بۆ دهێتە دارێشتن، چارچوڤەیەکێ یاسایی وەردگریت و ژ ئەنجامێ رێکەفتنەکا نێڤدەولەتی دهێتەدانان، و ئەڤ جورێ رێکخراوا د کەڤن دا هەبوویە وەکی رێکخراوا (عصبة الأمم League of nation-) کۆمەلا گەلان ل سالا ١٩١٩-١٩٣٦ پشتی ب داویهاتناشەرێ ئێکێ یێ جیهانی هاتە دامەزراندن،

و ئێکەم رێکخراوا IGO بوویە یا فرە مەبەست د چەرخێ بیستێ دا ژ ٥٨ دەولەتان پێکدهات، پاش تەواوبوونا شەرێ جیهانی یێ دووێ گەلەك ژ رێکخراوێن جورێ (IGO) بدووڤ خۆ دا ئینان.

٣- رێکخراوێن نێڤنەتەوەیی یێن نە حکۆمی (منظمة غیر حکومیة)

(NGO (Non-GovernmentOrganization:

## رێکخراوا NGO چنە و چ پێناسە بۆ هەنە؟

پێناسەیێن جودا جودا بۆ رێکخراوێ هاتینەکرن و ئەڤە چەند پێناسەیەکن :

رێکخراوێن نە حکۆمی: ئەو رێکخراون یێن بۆ بەرژەوەندیا گشتی دهێنەدانان و ل بن سیبەرا حکۆمەتێ و چ سازیێن دەولی نینن، و نە یا قەدەغەکریە بۆ وان کو هاریکاریێ و پشتەڤانیێ ژ حکۆمەتێ وەرگرن، بەلێ هاتینە دامەزراندن و کار و بزاڤان دکەن بێ کو حکۆمەتا ئەوی وەلاتی چاڤدێری ل سەر هەبیت[1].

رێکخراو: گرۆپەکێ پێکهاتییە ژ تاکان و بۆ ئارمانجەکا دەسنیشانکری کاردکەن، و رێکەکێ یان زێدەتر بکار دئینن بۆ گەهشتنا ئەوێ ئارمانجێ وەکی رێکخراوێن مرۆڤایەتی و ژینگەهێ و نێڤ دەولەتی و هتد[2].

رێکخراو: دیاردەیەکا کۆمەلایەتی یە کو ب شێوەیەکێ هوشیارانە، و خودان مەرج و سنوورەکێ دیارکری یە ب مەبەستا ب دەستڤەئینانا ئارمانجەکێ یان بزاڤێ بۆ چەند ئارمانجان دکەتن، ئەڤە ژی ل سەر بنچینەیێ زنجیرەیەکا بنەمایێن بەردەوام چالاك دبیت[3].

ل هەرێما کوردستانێ یاسایا ژمارە ١ یا سالا ٢٠١١ێ و تایبەت ب رێکخراوێن نە حکۆمی ڤە ب ئەڤی رەنگی رێکخراوێن نە حکۆمی پێناسە کریە:

رێکخراو: رێکخراوا نە حکۆمی، کو ژ کۆمەکا کەسێن ئاسایی یان یێن مەعنەوی پێکدهێت کو ل دووڤ حوکمێن ئەڤێ یاسایێ خۆدان کەسایەتییەکا مەعنەوی یە و پێکولێ دکەتن بۆ بجهئینانا هندەك ئارمانجان و بەلاڤکرنا مفایی تێدا نینە.

هەر د یاسایا ژمارە ١٢ یا سالا ٢٠١٠ یا عیراقێ دا یا تایبەت ب رێخکراوێن نە حکۆمی دا، ل مادێ ئێکێ برگا ئێکێ رێکخراوێن نەحکۆمی ب ڤی رەنگی پێناسەکریە:

رێکخراوێن نەحکۆمی ژ کۆمەکا کەسێن ئاسایی و مەعنەوی و کەسایەتییا مەعنەوی پێکهاتن ل دووڤ برگەیێن ئەڤێ یاسایێ ب دەستخۆڤە دئینن، و بۆ گەهشتنا ئارمجێن خۆ یێن نە مفادار بن تێدا کار دکەن.

رێکخراو: رێکخراو ژ ئەوان گرۆپا پێکهاتییە کو هەر ئێك ژ وان ل دووڤ بەرژەوەندیێن خۆ یێن تایبەت دگەرهیت[4].

رێکخراو: رێکخراو ژ ئورگانێ تا رادەیەکی سەربەخۆ پێکهاتینە و دشێن ئارمانجێن وەکی ئێك و ناکوکی ژی هەبن[5].

ب داویهاتنا شەرێ جیهانی یێ دووێ گەلەك کارتێکرنێن خراب د هەمی بواران دا ل پاش خۆ هێلان ب تایبەتی ئەو وەلاتێن پشکدار بووین و ئەو وەلاتێن شەر کەفتیە سەر ئەردێ وێ زیانڤێکەفتیێن ئێکێ یێن شەری بوون، پاش دەستپێکرنا قوناغا نوی یا پشتی راوەستیانا شەری و دروستبوونا دەولەتێن نوی و پەیرەوکرنا سیستەمێ دەولەتێ و پێکئینانا حکۆمەتان و ڤەگەریان بۆ بارێ ئاسایی خۆ ئاشکرا بوو حکۆمەت نەشیان د هەمی بوارێن ژیانێ دا وەکی پێدڤی کار بکەن ڤالاتی مان د هندەك بواران دا یێ ژ ئەنجامێ شەری پەیدا بووین و هاتنە پشت گوهـ هاڤێتن و خەلکێ ئاسایی ژ زیانڤێکەفتیێن مەزن بوون، د ئەڤان کاودانان دا خەلکێ سڤیل ل ئەوی دەمی هزر ل هژمارەکا رێکخراوێن جڤاکێ مەدەنی (رێکخراوێن نە حکۆمی) کر ژ دەرڤەی بازنەیێ حکۆمەتێ کار بکەن بۆ پرکرنا هندەك ژ ئەوان ڤالاتییێن، و ل سەر بنیاتێ هندێ گەلەك رێکخراو هاتنە دامەزراندن و رێکخراو بوونە هاریکار و ب ملێ

حكۆمەتێ هاریكاریبا حكۆمەتان دكر د هاریكاریكرنا خەلكی و پێشكێشكرنا خزمەتگوزاریێن جورا و جور دا و حكۆمەتێن وەلاتان ژی پشتەڤانی لێ كر و نەبوونە رێگر د رێكا دامەزراندنا ئەوان دا و ئەڤە ژی بۆ خالەكا بهێز بۆ بەربەلاڤبوونا ئەڤان رێكخراوانو ژلایەكێ دیڤە ئەڤان رێكخراوان كار كرد هندەك پرسێن دەستەلاتێ دا ببنە فشار بۆ سەر بریارێن دەستەلاتێ و چاڤدێریێ ل سەر كارێن دەستەلاتێ وەكی دەستهەلاتا چوارێ.

پاشتر هزرا دروستبوونا ئەڤان رێكخراوان كەفتیە د بوارێ بجهـ ئینانێدا و چەندین رێكخراو دروست بوون و رێكخراوە ب رەنگەكێ بەرچاڤ بەر ب زێدەبوونێ نە و نوكە هژمارا ئەوان ژ ١٠٠,٠٠٠ هزاررێكخراوان ل جیهانێ دەرباس بوویە، و پەیدا بوونا ئەڤان رێكخراوان چەندین دیتن لسەر هەنە و هندەك دبینن ئێكەم رێكخراوا ژ بۆ سالا ١٦٧٤ پەیدابوویە و هندەك بۆ دروستبوونا ئەڤان رێكخراوا بۆ سالا ١٨٤٦ ڤەدگەرینن كو دروستبوونا هەڤپەیمانا ئینجیلی یا جیهانی دهژمێرن ئێكەم رێكخراوا NGO و هندەكێن دی گەلەك دویر تر دبینن و دبێژن كەنیسا كاسولیك وەكی ئێكەم رێكخراوا NGO یە دروست بووی.

رێكخراوێن نە حكۆمی (رێكخراوێن جڤاكێ مەدەنی) دهێتە هژمارتن ئێك ژ پێكهاتەیێن جڤاكێ مەدەنی، و رێكخراوان ب گشتی رولەكێ دیار بۆ پێشئێخستنا سیستەمێ جیهانگێریێ هەیە، هندەك ژ رێكخراوێن NGO چاڤدێریێن كۆمەلایەتی دكەن وەكی: (كۆمەلا پزیشكێن بێ سنوور)، و هندەك ژی رێكخراوێن پیشەیی نە وەكی (كۆمەلا خوێندنا نێڤ دەولەتی و ژوورا بازرگانییا نیڤ دەولەتی و رێكخراوا لێبورینا گشتیيا نێڤ دەولەتی)و دیسان رێكخراوی مەبەستدار ژی وەكی (كەنیسا كاسولیكی) هەنە.

رێكخراوێن جڤاكێ مەدەنی ئەڤرۆ دهێنە نیاسین بـ دەستەلاتا پێنجێ و ئەڤرۆ لـ جیهانێ و بـ تایبەت وەلاتێن پێشكەفتی گرنگییەكا مەزن پێ دهێتەدان، رێكخراوێن جڤاكێ مەدەنی دهێنە نیاسین كو هندەك سازی نە پێكدهێن ژ كۆمەكا كەسێن خۆبەخش و كار دكەن بێ لـ سەر بهێتە سەپاندن و ژ دەرڤەیی بازنەیێ حكۆمەتێ كار دكەن، و د سەربەخۆ نە و بۆ هندەك ئارمانجێن دەستنیشانكری كار دكەن و پێكڤە كار دكەن بۆ بەرژەوەندی و ئارمانجەكا دەسنیشانكری یا رێكخراو ل سەر هاتییە دانان، ئەڤ رێكخراوە رولەكێ مەزن دبینن د ناڤ جڤاكی دا و شوین دەستێن وان د دیارن و گەلەك جاران دبنە هاریكار بۆ دەولەتێ و ئەو ڤالاتییا پەیدا بووی یان ب حكۆمەتێ نە هاتییە پركرن، و دیسان دبیتە چاڤدێر و دگەلەك بابەتان دا فشارێ ل سەر دەستەلاتی دروست دكەن.

داهاتێ ئەڤان رێكخراوان برێكێن جودا دەستدكەڤیت وەكی پارە ئێخستن بۆ ناڤ كارەكی هندەك ب دەستدكەڤن یان پشكداریكرن د پرۆژەیێن خێرخوازیێ دا یان ژ كارێن گەلەك مەزن یان ژ سەرچاڤەیێن گشتی وەردگرن وەكی حكۆمەتێ یان ژی هاریكاریێن كەسی نە كو بۆ مرۆڤایەتیێ یان گەهشتنا ئارمانجەكێ پێ دهێتە بەخشین.

جەماوەرێ رێكخراوێ دوو جورن:

١- جەماوەرێ د ناڤ رێكخراوێ دایە كو دەستەیا كاری و كارمەندێن رێكخراوێ بخۆڤە دگریت.

٢- جەماوەرێ دەرڤەی رێكخراوێ كو هەمی ئەو خەلكێ بەرژەوەندی و كاركرنا وان ب رێكخراوێ ڤە یێ گرێدایی بیت.

## كارێ رێكخراوان:

رێكخراو ل دووڤ ئارمانجێن خۆ كار دكەن ئەڤجا (كۆمەلایەتی، سیاسی، ئابووری، بازرگانی، مرۆڤایەتی، پیشەیی.. هتد) ل ئەوی دەمێ كاركرن بۆ ئارمانجێن خۆ جوداهی هەنە بۆ نموونە رێكخراوەكا خێرخوازی دێ ب هاریكاریكرنا دەستكورت و هەژاران كار كەتن و چالاكییان ئەنجام دەتن و رێكخراوەكا مافێ مرۆڤی دێ ب پاراستنا مافێ تاكان كاری كەتن و رێكخراوەكا ژنكەهێ ب گرنگیدان ب ژنكەهێ و ب ئەڤی رەنگی.

بۆ نموونە ئەگەر کارێ رێکخراوا (لێبورینا گشتی یا نێڤ دەولەتی) دیار بکەین:

رێکخراوا (لێبورینا نێڤ دەولەتی) ل سالا ١٩٦١ دا هاتیە دامەزراندن و ئەڤرۆ زێدەتری ئێك ملیون ئەندامان هەیە، و نێزیکی ٥ هزار پشك و بنگەهان ل ١٠٠ وەلاتێن جودا هەنە و پەیاما خۆ د ئەڤان هەر چوار خالان دا دگەهینن:

١- بۆ ئازادکرنا هەمی گرتییان ب هزرا وان دبێ تاوانن.

٢- بۆ پشتراستبوونا ژ دادگەهێ و دادگەهکرنا گرتیێن سیاسی.

٣- بۆ نەهێلانا سزایێ مردنێ و ئەشکەنجەدانێ و هەر جورە سزایەکێ دی یێ توند و تیژی تێدا بیت ل جیهانێ.

٤- بۆ ب داوی ئینانا سێدارەدانا ب هزرا وان نە یاسایی (هەولایستن).

## مەرجێن پێدڤی یە د رێکخراوێن NGO دا هەبن:

١- خۆبەخشی (الطوعیة).

٢- سەربەخۆیی (الاستقلالیة).

٣- نە مفاداری (عدم الربحیة).

٤- بەرژەوەندییا گشتی (للمنفعة العامة).

## رێکخراوێن نە حکۆمی NGO هاتینە دابەشکرن بۆ سەر دوو جوران:

١- رێکخراوێن نەحکۆمی یێن ناڤخویی: ئەڤە ئەو رێکخراون یێن د چارچوڤێ دەولەتەکێ بتنێ دا کار دکەن ل دووڤ یاسا ئەوێ دەولەتێ.

٢- رێکخراوێن نەحکۆمی یێن دەولی: ئەڤ رێکخراوە ژ چارچوڤێ دەولەتێ دەردکەڤن و ل وەلاتێن جودا کار دکەن و ئارمانجا رێکخراوا وان ل کیش وەلاتی بیت ل وێرێ کار دکەن.

## پەیدابوونا رێکخراوێن نە حکۆمی ل عیراقێ؟

حکۆمەتا عیراقێ یا سەردەمێ حزبا بەعس و پێشتر ژی ب چ شێوازان رێك ب هاتنا رێکخراوێن بیانی نە ددا د چارچوڤێ عیراقێ دا کار بکەن هەتا رێکخراوێن خێرخوازی و مرۆڤی ژی پێخەمەت هندێ ئەو دەلیڤە پێ نەهێتە دان کو بارێ ناڤخۆیا عیراقێ ڤەگوهێزن بۆ خەلکێ دی و بەرەڤاژی، ژبلی هندێ ئەو رێکخراوێن ل بن چەمکێ حزبا بەعسا عیراقی کار دکر د بوارێن خۆ یێن پیشەیی دا کو دهاتنە هژمارتن پشکەك ژ حزبا بەعس وەکی (اتحاد الطلبة) و هندەك رێکخراوێن دی.

پشتی شەرێ ئازادیا عیراقێ ٢٠٠٣ێ و دانانا حکۆمەتا نوی رێك ب رێکخراوێن NGO هاتەدان بێنە دامەزراندن و دیسان دەلیڤەکا مەزن ب رێکخراوێن بیانی هاتەدان ل عیراقێ کار بکەن ب تایبەت د بوارێن خێرخوازی و مرۆڤایەتی دا، و دەستپێکی ب هندەك یاسایێن تایبەت رێکخراوێن نە حکۆمی هاتنە دروستکرن و دەرگەهێ دروستبوونێ بۆ رێکخراوێن ناڤخۆیی هاتە ڤەکرن و بریارا ژمارە ٤٥ ل سالا ٢٠٠٣ یا (دەستەلاتێ دەمکیێ عیراقێ ) یا هەلوەشیایی ل دور رێکخراوێ نە حکۆمی دهێتە هژمارتن ئێکەم بریار پشتی شەرێ ئازادیێ رێك دایە دروستبوونا رێکخراوێن NGO و پاش بریارا ژمارە ١٦ یا سالا ٢٠٠٥ یا گرێدایی ب نڤیسینگەها هاریکارییێن رێکخراوێن نە حکۆمی ڤە دەرکەفت و بۆ ماوەیەکی کار ب ئەوێ ژی هاتەکرن و حکۆمەتێ ب ئەڤێ بریارێ هاریکارییێن دراڤی ددانە رێکخراوان پێخەمەت رێکخستن و گەشەکرنا رێکخراوێن نەحکۆمی و هەتا ژ پەرلەمانی عیراقێ یاسا ژمارە ١٢ یا سالا ٢٠١٠ێ یا تایبەت ب رێکخراوێن نە حکۆمی ڤە دەرکەفتی بۆ دروستکرنا رێکخراوێن ناڤخۆ و رێکەپێدان ب یێن بیانی، ئەڤ یاسایە پشتی بەلاڤبوونێ لـ رۆژناما (الوقائع العراقیة) یا ژمارە ٤١٤٧ ل ٩ ئادارا ٢٠١٠ێ کەفتە کاری و لـ دووڤ

یاسایێ ( فەرمانگەها رێکخراوێن نە حکومی ل سکرتاریەتا گشتی ل جڤاتا وەزیران) هاتە دامەزراندن بۆ سەرپەرشتیکرنا رێکخراوێن NGO و رێنما ل بەر دەرکەفتن هەتا نوکە سێ جاران رێنما هاتییە راستڤەکرن بۆ رێکخستنا رێکخراوێن نە حکومی و بجهـ ئینانا یاسایا ژمارە ١٢ یا رێکخراوێن نە حکومی ل عیراقێ.

ل بەر رۆناهیا ئەڤان یاسایان ب سەدان رێکخراو هاتنە دامەزراندن و ئەوێن تا داویا سالا ٢٠١٥ هاتینە توومارکرن، ژ چەند جورێن رێکخراوان پێکدهێن ب ئەڤی رەنگی:

١- رێکخراوێن NGO یێن توماری کری دبنە ٢٥٧٥ رێکخراو ل سەرانسەری عیراقێ.

٢- تورێن رێکخراوێن NGOیێن تومارکری دبنە ١١ تور ل سەرانسەری عیراقێ.

## پەیدابوونا رێکخراوێن نە حکومی ل کوردستانێ:

## رێکخراوێن NGO بەری سەرهلدانا بهارا ١٩٩١ێ:

هەرێما کوردستانێ ب دهۆك ڤە پشکەکە د چارچوڤێ عیراقێ دا و د ئەوی دەمی دا رژێما عیراقێ یا زال بوویە ل سەر دەڤەرێ و دەستێ وێ لسەر هەمی جومکەیێن دەستەلاتی بوو و نە دهێلا ب چ رەنگەکی رێکخراوێن NGO بهێنە دامەزراندن و رۆلێ خۆ بگێرن، بەلێ بەری سەرهلدانێ هندەك ژ پارتیێن سیاسی یێن کوردی هندەك رێکخراوێن پیشەیی هەبوون وەکی (قوتابیان و خوێندکاران و ئافرەتان و ژنان و ماموستایان و هۆنەرمەندان و لاوان و گەنجان و کرێکاران و جوتیاران...هتد) کو ئەڤان زێدەتر مل ب ملێ پارتیێن خۆ یێن سیاسی کار دکر و گەلەك جاران وەکی پێشمەرگە ل چیا بەرەڤانی کریە و ژ چارچوڤێ خۆ یێ رێکخراوەی دەرکەفتی نە و بووینە پشکەك ژ شۆرشێ بۆ گەهشتن ب مافێن گەلێ کورد یێن ئەوان باوەری پێ هەی، بەلێ دیتنەك هەیە و وەسا دیاردکەن ژبلی ئەڤان جورە رێکخراوێن پیشەیی یێن هاتینە دامەزراندن هندەك ژ رێکخراوێن NGO هەبووینە کو پێش سەرهلدانێ رۆلێ خۆ هەبوویە، بەلێ هژمارا وان زۆر کێم بوون و تلێن دەستان دەرباس نە دکر وەکی (KHF دەزگەهێ تەندروستی کوردستان، KRAکۆمەلا فریاکەوتنا کوردستان)، و ئەڤە ب ئەڤی رەنگی مان هەتا بهارا ١٩٩١ێ و سەرهلدانێ.

## رێکخراوێن NGO پشتی سەرهلدانا ١٩٩١ێ:

قوناغا گرنگ یا پەیدابوونا رێکخراوێن NGO بۆ پشتی سەرهلدانا کوردستانا باشوور یا ئادارا ١٩٩١ـێ ڤەدگەریت و پشتی پەیدابوونا کۆچا ملیونی و چوونا خەلکێ کوردستانێ بەر بسنووران ڤە و دەنگدانڤەدانا ئەڤێ تاوانێ لـ جیهانێ هاتەکرن و هاتنا گەلەك وەلاتان بۆ سەر خەتێ و ژ ئەنجامێ هندێ و بـ پێشنیازا فەرەنسا و پشتەڤانیا ئەمریکا و بریتانیا جڤاتا ئاسایشا نێڤدەولەتی بریارا ٩٦٦ دەرئێخست و لـ دووڤ ئەوێ بریارێ (دەڤەرا تەنا) لـ دژی فرینا فروکەیێن سوپایێ عیراقێ دروستکر ل سەر هێلا پان یا ٣٦ پلە بۆ پاراستنا گەلێ کوردستانا باشوور، و ئەڤ بریارە بۆ ئەگەرێ راوەستاندنا هندەك یاسا و رێنمایێن حکومەتا عیراقێ ل هەرێما کوردستانێ و ب تایبەت هندەك بریارێن ناڤخۆ و کاریگەریا بەغدا ب سەر هەرێما کوردستانێ ژ هندەك روویان ڤە لاواز بوو و هەلبژارتنا پەرلەمانێ کوردستانێ و دامەزراندنا حکومەتا کوردستانێ و دەرئێخستنا هندەك یاسایێن نوی ژلایێ پەرلەمانێ کوردستانێ و بجهـ ئینانا ئەوان یاسایان ژلایێ حکومەتا کوردستانێ ڤە و ئەڤە بوو ئەگەرێ ڤەکرنا دەرگەهێ هەرێما کوردستانێ ل بەر هاتنا رێکخراوێن بیانی بۆ پێشکێشکرنا هاریکار و خزمەتگوزاریان و دگەل هندێ دا دەلیڤە بـ دروستبوونا رێکخراوێن نە حکومی یێن ناڤخۆی ژی هاتەدان و ب دەهان رێکخراوان ناڤخۆی دروست بوون، و خزمەتگوزارێن خۆ د بوارێن جودا پێشکێشکرن.

پاش دروستبوونا هژماریەکا زۆر یا رێکخراوان

جڤاکێ مەدەنی بۆ ئەگەرێ هندێ ئێدی هزر ل هەبوونا یاسایەکا تایبەت بهێتەکرن بۆ رێکخستنا رێکخراوێن جڤاکێ مەدەنی ل هەرێما کوردستانێ، ل دەستپێکێ لـ دووڤ یاسا ژمارە ١٨ (یاسا کۆمەلەیان ل هەرێما کوردستانێ – عیراق) ل ٣١-١٠-١٩٩٣ کو ئێکەم یاسا بۆ دەربارەی رێکخراوێن نەحکۆمی ل کوردستانێ ژ پەرلەمانێ کوردستانێ هاتە دەرکرن و پاشان یاسا ژمارە ١٥ (یاسا رێکخراوێن کوردستانی یێن نە حکۆمی ل هەرێما کوردستانێ – عیراق) ل ٢٤-١٠-٢٠٠١ ژ پەرلەمانێ کوردستانێ دەرکەفت و جورە نوویبوونەك د رێکخراوان دا هاتەکرن و هەتا سالا ٢٠٠١ کار پێ هاتەکرن و پاشان یاسایەکا دی یا یا تایبەت ژمارە ١ ل ٠٦-٠٤-٢٠١١ تایبەت ب رێکخراوێن نە حکۆمی ڤە دەرکەفت و باشتر هاتنە رێکخستن.

ل بەر رۆناهیا یاسا ژمارە ١ (فەرمانگەها رێکخراوێن نە حکۆمی ل هەرێما کوردستانێ) یا گرێدایە ب سەرۆکایەتیا جڤاتا وەزیران یا حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ ڤە هاتە دامەزراندن و ئەرکێ وێ یێ سەرەکی بجهـ ئینانا یاسایا ژمارە ١ یا سالا ٢٠١١ـێ یا تایبەت ب رێکخراوێن نە حکۆمی ڤە، کو ئەڤ یاسایە ژلایێ پەرلەمانێ کوردستانێ ڤە دەرکەفتی یە و نوکە د بوارێ بجهـ ئینانێ دایە و هەمی رێکخراوێن نە حکۆمی لـ دووڤ ئەڤێ یاسایێ دهێنە دامەزراندن و سەرەدەری دگەلدا دهێتەکرن.

ل دووڤ یاسایا ژمارە ١ یا رێکخراوێن نە حکۆمی و بریارا ژمارە ٤ یا ٢٠١١ یا پەیرەوێ فەرمانگەها رێکخراوێن نە حکۆمی ل ٢٧ کانوونا دووێ ٢٠١٣ ئەڤ فەرمانگەها رێکخراوێن نەحکۆمی ڤەبوو و کەفتە کاری ب بریارا ژمارە ٢٣٢٧ ل ٢٠١١/٠٩/٢٢ سەرۆکایەتیا ئەنجوومەنێ وەزیران لـ حکۆمەتا هەرێما کوردستانێ.

٢٠١٣/٠٢/٠١ وەکی ئێکەم رۆژ بۆ دەستپێکرنا تووماركرنا رێکخراوان د ئەڤێ قوناغا نوی یا توماركرنا رێکخراوان دا لـ کوردستانێ و ئەڤ یاسایە بوو ئەگەر کو ب دەهان رێکخراو بێنە دامەزراندن و یێن کەڤن ژی خۆ دگەل ئەڤێ یاسایێ بگونجینن و دەستویریا وەرگرتنا مولەتا کارکرنێ وەربگرن و هەتا نوکە سەرجەم رێکخراوێن ل فەرمانگەهێ هاتینە تومارکرن دبنە ٢٥٦٤ رێکخراوێن (ناڤخۆیی- کوردستانی، عیراقی و جیهانی – بیانی) یێن تومارکری ل هەرێما کوردستانێ.

ل دووڤ ئامارێن ل بەر دەستێ مە (هەتا دەمێ نڤیسینا ڤێ نڤیسینێ ل داویا ٢٠١٤ێ) سەرجەمێ ئەوان رێکخراوێن ل دهۆکێ ب هەمی قەزایێن خۆ ڤە کار دکەن (٣١٤) رێکخراون و (٢٤٠) رێکخراو یێن ناڤخۆیی - کوردستانی نە و (٤) رێکخراو یێن عیراقی نە و لدووڤ یاسایا ژمارە ١٢ یا سالا ٢٠١٠ یا عیراقا فیدرال هاتینە دامەزراندن و (٦) رێکخراو بیانی ل سەر بارا دهۆکێ ئانکو بنگەهێن وان یێن سەرەکێ ل دهوکێ نە د دەستوری دایی نە ژلایی فەرمانگەهێ ڤە، و دیسان رێکخراوێن دی یێن بیانی کو پشکێن خۆ هەنە یان دهۆك ژی سنوورێ کارکرنا وانە هژمارا وان ژی ل دووڤ لیستا مە دبنە (٧٤) رێکخراو ل سنوورێ پارێزگەها دهۆکێ کار دکەن.

## یاسا ژمارە ١ یا٢٠١١ـێ ل کوردستانێ رێکخراو یێن پارڤەکرین بۆ سەر چوار جوران:

١- **رێکخراوێن کوردستانی،** ئەو رێکخراوێن یێن ل دووڤ یاسا ژمارە ١ هاتینە توومارکرن یان خۆگونجاندن و ئەڤ رێکخراوە د کوردستانی و ناڤخۆیی نە.

٢- **رێکخراوێن عیراقی،** ئەو رێکخراوێن یێن لـ دووڤ یاسایا عیراقی یا ژمارە ١٢ یا ٢٠١٠ ل بەغدا هاتینە توومارکرن و کار و چالاکیێن خۆ لـ هەرێما کوردستانێ دکەن و دکەڤنە بن حوکمێن یاسایا کار پێ دهێتەکرن ل هەرێما کوردستانێ یا ژمارە ١ ل ٢٠١١ یا فەرمانگەها رێکخراوێن نە حکۆمی و توومارکری نە ل فەرمانگەهێ.

٣- **رێکخراوێن بیانی**، ئەو رێکخراوێن یێن لـ دووڤ یاسایا وەلاتەکێ دی هاتینە دامەزراندن و کار و چالاکیێن خۆ لـ هەرێما کوردستانێ ئەنجام ددەن و لـ دووڤ یاسایا ژمارە ١ یا ٢٠١١ یا پەرلەمانێ کوردستانێ کاردکەن، و د توومار کرینە ل فەرمانگەها رێکخراوێن نە حکۆمی.

٤- **تورا رێکخراوان**، ئەڤە رێکخراوەکا نە حکۆمی یە ل دووڤ یاسا ژمارە ١ هاتیەتوومارکرن ل فەرمانگەها رێکخراوێن نە حکۆمی کو ژ چەند رێکخراوەکێن دەستویردایی پێکدهێت و دبنە خۆدان کەسایەتیەکا مەعنەوی، دو یان زێدەتر رێکخراوێن توومارکری مافێ دامەزراندنا تورا رێکخراوان هەیە.

بەلێ ئەو خالا رێکخراوێن مە یێن نەحکۆمی یێن کوردستانی و عیراقی جودا دکەتن ژ رێکخراوێن نە حکۆمی یێن بیانی و وەلاتێن دی ئەوە ل دەرڤە و وەلاتێن پێشکەفتی حکۆمەت چ هاریکاریێن مادی پێشکێشی ئەڤان رێکخراوان ناکەتن بەلکو پرانییا رێکخراوێن دەرڤە خۆدان داهات و پرۆژەنە، بەلێ ل ڤێرە پرانییا جاران رێکخراوێن مە نیڤ حکۆمی نە و حکۆمەت پشتەڤانیا مادی دکەتن و دیسان ل ئەڤرۆ گەلەك فیلتەر حکۆمەتێ لـ فەرمانگەها رێکخراوێن نە حکۆمی دەسنیشانکرینە کو ڤالاتینە و هەر رێکخراوەکا بڤێت د ئەوی بواری دا کار بکەتن رێکێ پێ ددەن و وەکی حکۆمەت ژی هاریکاریا مادی و مەعنەوی لێ دکەتن.

## پەیدابوونا رێکخراوێن نە حکۆمی لـ دهۆکێ:

ل دهۆکێ ژی بەری سەرهلدانێ رێکخراوێن پیشەیی وەکی قوتابیان و لاوان و ئافرەتان و کرێکاران... هتد رۆلێ خۆ هەبوویە و بەردەوام ب بزاڤ بووینە، و هەتا پشتی سەرهلدانا ئادارا ١٩٩١ێ و پێکئینانا حکۆمەتا هەرێمێ و ڤەکرنا دەرگەهێ هەرێما کوردستانێ بۆ دامەزراندنا رێکخراوێن نافخۆی وهاتنا رێکخراوێن(NGO) یێن بیانی بۆ کوردستانێ و کارکرن ل دهۆکێ ب تایبەت د بوارێن ئاڤەدانکرنێ و خێرخوازی و مرۆڤایەتی و پەروەردێ و کەرتێ چاندنێ و ساخلەمیێ دا رۆلەکێ پێشچاڤ هەبوو، ژبەرکو کاودانێن ئەوی سەردەمی یێن حکۆمەتا کوردستانێ د نەخۆش بوون ل بن دودووڕپێچان بوو و ئێك ژ ئەوا بسەر عیراقێ دا هاتیە سەپاندن و دو ئەوا عیراقێ ب سەر هەرێما کوردستانێ دا سەپاندی و رەنگڤەدانێن وێ د دیاربوون لسەر خەلکی ژی و بارێ ئابووری یێ پرانییا خەلکی یێ لاواز بوو، و ئەڤ کاودانە بوونە ئەگەر دەلیڤەیا کارکرنێ ب رەنگەکێ بەرفرەهـ بۆ ئەڤان رێکخراوان هەبوو، و هەتا ئەڤرۆ ژی شوین دەستێن ئەوان رێکخراوێن بیانی دیارن.

پشتی سەرهلدانێ کوردان د دو دووربێچێن ئابووری دا بوو، دووڕپێچا لسەر عیراقێ و دووڕپێچا عیراقێ ژی لسەر کوردستانێ بارێ ئابووری یێ کوردستانێ زۆرێ خراب بوو و ل ئەوی دەمی رێکخراوێن NGOرۆلەکێ مەزن گێرا بۆ پرکرنا ئەوان بوشایێن هەبن و ژ وان دبوارێن ئاڤەدانکرنا گوندان و دیسان ئینان رێکان دا و دانان پرا و هاریکاریکرن د بوارێن کشتوکالی و گانەوەران دا و و کەرتێ پەروەردێ و پێدڤێن قوتابییان و خواندنێ ل قوتابخانەیان و دیسان دانا ئازوقەی و هاریکاریێن دی یێن پێدڤی کو ل ئەوی ماوەیی ب تایبەت ل سالێن دەستپێکێ ئەڤان رێکخراوان رولەکێ ئێکجار مەزن ئینا د هاریکاریکرنێ دا و چاڤێ خەلکی ژی لسەر بوویە و بەرە بەرە ئابوور باشتر لێ هات.

دووماهیك یاسا ژمارە ١ یا ٢٠١١ێ و دامەزراندنا فەرمانگەها رێکخراوێن نەحکۆمی ل هەرێما کوردستانێ دەلیڤە خۆشتر بوو بۆ پەیدابوونا رێکخراوێن نە حکۆمی و ب دەهان رێکخراوان ل پارێزگەها دهۆکێ هاتنەدانان و ئەگەر پولینکرنەکێ بۆ رێکخراوێن دهۆکێ بکەین دێ ب ئەڤێ رەنگی بیت:

ل دەستپێکێ ئەگەر دامەزراندنا جهێن رێکخراوێن NGO ل پارێزگەها دهۆکێ ب سەر قەزایێن دهۆکێ

دا دهێنە بارڤەكرن كو ل فەرمانگەهێ ب ناڤێن ئەوان قەزایان هاتینە تومارکرن ژبلی یێن بیانی کو هژمارا وان (٢٤٠) نە دێ بـ ئەڤی رەنگی بن:

١- قەزا دهۆکێ: سەنتەرێ باژێرێ دهۆکێ بخۆ ڤە دگریت و ناحییێن (زاویتەی- مانكێشك)؛ ئەو رێكخراوێن د کەڤن د چارچوڤەیێ سنووری ئەڤێ قەزایێ دا، (١٧٠) رێكخراوێن NGO لێ نە.

٢- قەزا ئاکری: (بجیل، گردەسین، دینارتە)، (٢٤) رێكخراو لێ کار دکەن.

٣- قەزا زاخۆ: (دەرکار، باتیفا، رزگاری)، (١٦) رێكخراوا بخۆ ڤە دگریت.

٤- قەزا سێمێل: (باتێل، فەیدیێ)، ژبەرکو کەلەك نێزیکی دهۆکێ یە، ل فەرمانگەها رێكخراوێن نەحکۆمی رێكخراوێن وێ ل سەر ناڤێ دهۆکێ هاتینە تومارکرین.

٥- قەزا ئامێدیێ: (بامەرنێ، سەرسنکێ، چەمانکێ، شێلادزێ، دێرەلوك، کانی ماسی)، (١٠) رێكخراوێن نەحکۆمی لێ هەنە.

٦- قەزا بـەردەرەش: (دارەتـو، روڤیا، کەلەك)، (٣) رێكخراوێن NGO لێ هاتینە تومارکرن.

٧- قەزا شێخان: ( قەسروك، باعەدرێ، ئەتریش)، (١٧) رێكخراوێن جودا بخۆڤە دگریت.

## ئەگەر رێكخراوان بۆ سەر بوارێن کارکرنێ پولێن بکەین:

**ئەو رێكخراوێن د بوارێن (ئافرەت ، زەلام، لاوان، زاروك، سنێلە، زگوردان) دا:**

١- رێكخراوا نوژین بۆ دیموکراسیکرنا خێزانێ (NFDO)

٢- رێكخراوا هەڤپەژراندنا جڤاکی

٣- رێكخراوا زێرین بۆ هشیارکرنا جڤاکی

٤- رێكخراوا هاودەم بۆ هشیارکرنا کۆمەلگەهێ

٥- رێكخراوا دەریا بۆ پەرەپێدانا ئافرەتێ و خێزانێ (Darya)

٦- رێكخراوا (4H)کوردستانی یا زرکورا (مێرمندال)

٧- رێكخراوا پاڤان یا ئافرەتێن کوردستانێ

٨- رێكخراوا سیوان بۆ پێگەهاندنا کچان

٩- رێكخراوا پەیمانگەها کوردستان بۆ پەروەردە و گەشەپێدانا سنێلان

١٠- رێكخراوا خێزان و زاروك

١١- رێكخراوا دەنگێ پیران و خێزان

١٢- رێكخراوا ئەلند بۆ دیموکراسیکرنا گەنجان

١٣- رێكخراوا نازك (زارۆكان)

١٤- رێكخراوا هێلین بۆ پەیوەندیێن هەڤژینی

١٥- رێكخراوا هەلسانەوەی رەوشەنبیری و مرۆڤی ئافرەتان

١٦- رێكخراوا سولین بۆ هشیاری و رەوشەنبیریا ژنان

١٧- رێكخراوا گولیزار بۆ گەشەپێدانا کەسیاتیا ژنان

١٨- رێكخراوا خانم بۆ ئاڤاکرنا کەسایەتیا ژنان

١٩- رێكخراوا ستێرا گەش یا جڤاکی

٢٠- رێكخراوا داسنیا بۆ پەرەپێدانا لاوان

٢١- رێكخراوا هشیارکرن و رێكخستنا خێزانی

٢٢- رێكخراوا خێزانا بەختەوەر

٢٣- رێكخراوا هیڤی بۆ چالاکیێن گەنجان

٢٤- رێكخراوا ڤەدەنگ بۆ پرسێن گەنجان

٢٥- رێكخراوا سیماف بۆ بەختەوەریا خێزانێ

٢٦- رێكخراوا هێلینا مە بۆ ئاڤاکرنا خێزانەکا بەختەوەر

٢٧- رێكخراوا کارناس بۆ رەوشەنبیرکرنا گەنجان

٢٨- رێكخراوا بەرهەڤ بۆ پێشئێخستنا شیانێن گەنجان (BOYD)

٢٩- رێکخراوا هەنگاوێك بۆ ژیان (بوارێن گشتی)
٣٠- رێکخراوا بکارئێخستنا توانایێن گەنجان
٣١- رێکخراوا سەرهلدان بۆ پەرەپێدان و توانیایێن لاوان
٣٢- رێکخراوا دهۆك بۆ لاوێن خۆبەخش (DOVY)، ل ٢٠١٤/١٢/٣٠ هاتییە دامەزراندن.
٣٣- رێکخراوا ئاسودە بۆ بەرەنگاربوونەوەی توندوتیژی دژی مێینە (ASUDA)
٣٤- رێکخراوا پێکەهاندنا ئافرەتان (WRO)
٣٥- رێکخراوا رینبو بۆ پاراستنی مندالان (ROCP)
٣٦- رێکخراوا چیاڤین (CHAVIN) – مندالان
٣٧- رێکخراوا نوبهار بۆ نویکرنا ژیانا خێزانان (NORFL)

**ئەو رێکخراوێن د بوارێن (گەشەپێدانا مرۆڤی و ئاڤاکرن و هشیارکرنا جڤاکی) دا کار دکەن:**

١- رێکخراوا بوژین بۆ گەشەپێدانا مرۆڤی (Bojeen for Human Development)، کار د بوارێن هەوار هاتنێ و گەشەپێدانا کۆمەلگەهێ و ئابووری و رێڤەبرنا کارگێرییا خیفەتگەهان و فێرکرنێدا دکەتن.
٢- رێکخراوا ئایندە بۆ هشیارکرنا جڤاکێ
٣- رێکخراوا ستێر بۆ گەشەپێدانا مرۆڤایەتی (SOD)
٤- رێکخراوا وەرار یا ڤەکولین و گەشەپێدانێ
٥- رێکخراوا نووبوون بۆ گەشەپێدانا کارگێری (NIAD)
٦- رێکخراوا سیما بۆ خزمەتێن جڤاکی
٧- رێکخراوا دەلتا بۆ گەشەپێدانێ
٨- رێکخراوا بیناهی (گەشەپێدانا گشتی)
٩- رێکخراوا ژین یا راهێنان و گەشەپێدانێ
١٠- رێکخراوا پێشەنگ بۆ گەشەپێدانا توانایان
١١- رێکخراوا هاوکار یا گەشەپێدانا جڤاکی
١٢- رێکخراوا هزر بۆ گەشەپێدانا توانایان
١٣- رێکخراوا قارەمانەکان بۆ گەشەپێدان و پەرەپێدانێ
١٤- رێکخراوا دەشتازێ DO– (پەرەپێدانا مرۆڤی و مرۆڤایەتی)
١٥- رێکخراوا بونیاتنانی توانسا مرۆڤی
١٦- رێکخراوا رۆناهی بۆ گەشەپێدانا مرۆڤی
١٧- رێکخراوا گەنجێن پێشەنگ (پەرەپێدانا بیرا تاکی)
١٨- رێکخراوا پسپورێت گەشەپێدانا کوردستانێ
١٩- رێکخراوا لیدەر بۆ گەشەپێدانا مرۆڤی (LOHD)
٢٠- رێکخراوا گەشەپێدانا کۆمەلایەتی(SDO)
٢١- رێکخراوا پەنابەر یا گەشەپێدانا جڤاکی (P.O.S.D)
٢٢- رێکخراوا گەنجینە بۆ گەشەپێدانا گەنجان
٢٣- رێکخراوا سەرمەد بۆ پێکەهاندنا لاوان
٢٤- رێکخراوا هەڤدەم بۆ گەشەپێدانا جڤاکی
٢٥- رێکخراوا پشکوژ بۆ گەشەپێدانا زاروکان
٢٦- رێکخراوا ئەستێرەیا رۆژهەلات بۆ بۆژانەوە و پەرەپێدانا لاوان (NAOYDI)
٢٧- رێکخراوا سیڤو بۆ گەشەپێدان و پێشڤەبرنێ (SOPD SAIFO)
٢٨- رێکخراوا داك بۆ گەشەپێدانا ژنا ئێزدی (DOEWD)
٢٩- دەزگایێ عیراقی بۆ گەشەپێدانێ (IID)
٣٠- رێکخراوا NLP بۆ راهێنان و راوێژکارییێ (NLP.O.T.C)
٣١- رێکخراوا نوریل بۆ گەشەپێدانێ (NDO)
٣٢- رێکخراوا شنگال بۆ گەشەپێدانا جڤاکی (SOSD)

**ئەو رێكخراوێن د بوارێن (مافێن مرۆڤی و مافێن مەدەنی و دیموكراسیەتێ) دا كار دكەن:**

١- رێكخراوا لانا بۆ پاراستن و داكوكیكرن ل مافێ مرۆڤی
٢- رێكخراوا داد بۆ پرسێن مەدەنی و مافێن مرۆڤی
٣- رێكخراوا مافێن مەدەنی ل كوردستانێ
٤- رێكخراوا نیشتیمانی بۆ بەرگیریكرنێ ژ مافێن مرۆڤی
٥- رێكخراوا زاب بۆ دیموكراسیەت و مافێن مرۆڤی، كار دكەتن بۆ بەلاڤكرنا رەوشەنبیریا دیموكراسی و چاڤدێریكرنا مافێن مرۆڤی ل هەرێما كوردستانێ.
٦- رێكخراوا سودی كوردستان (دیموكراسیەت و مافێ مرۆڤی)
٧- رێخكراوا پابەند بۆ چالاكیێن دیموكراسی
٨- رێكخراوا هاندان بۆ چالاكیێن دیموكراسی
٩- رێكخراوا شیان بۆ خزمەتا مافێن پیر و كالان
١٠- رێكخراوا ژین بۆ داكوكیكرن ل مافێن ئافرەتان
١١- رێكخراوا باڤین بۆ پێشئێخستنا دیموكراسیەتێ و مەدەنیەتێ
١٢- رێكخراوا بەرفین بۆ دیموكراسیەتێ
١٣- رێكخراوا دادرەس بۆ دیموكراسیكرنا جڤاكی
١٤- كۆمەلا ئاڤەدانكرن و گەشەپێدانا كوردستانێ KURDS(Kurdistan Reconstruction and Development Society)، ل سالا ١٩٩٢ێ هاتیە دامەزراندن.
١٥- رێكخراوا پێل بۆ مەدەنیكرنا جڤاكی- دهۆك
١٦- رێكخراوا رۆشنگەری بۆ پیادەكرنا دیموكراسیەتێ (ROPD)
١٧- رێكخراوا نوبهار بۆ پاراستنا مافێن زاروكان
١٨- رێكخراوا رۆژا ئازادیێ بۆ مافێن مرۆڤی
١٩- رێكخراوا سەفین بۆ پەرەپێدانا كۆمەلگەها مەدەنی
٢٠- رێكخراوا چاڤ بۆ پاراستنا مافێن بەكاربەری
٢١- رێكخراوا هیومانتی بۆ چالاكیێن مەدەنی (HOCA)
٢٢- كۆمەلا زەلال لایف (ZLA)
٢٣- رێكخراوا جیهانی یا مافێ مرۆڤی (WOHR)
٢٤- رێكخراوا مافێن مرۆڤی ل كوردستانێ (K.H.R.O)
٢٥- رێكخراوا جینوساید و دادپەروەریا ڤەگوهاستی (G.T.J.O)

**ئەو رێكخراوێن د بوارێن(ژینگەهێ و چاندنێ و گیانەوەران)دا ل دهۆكێ كار دكەن:**

١- رێكخراوا دۆستێن ژینگەهێ – دهۆك
٢- رێكخراوا رووەكێ سروشتی یێ كوردستانێ
٣- رێكخراوا پێكەهاندنا پاراستنا ژینگەهێ (A.E.P.O)
٤- رێكخراوا سەوزا كوردستانی (KGO)
٥- رێكخراوا پاراستنا ژینگەهێ ل ئاكرێ (EPO)
٦- رێكخراوا ئاڤ یا كوردستانێ (K.W.O)، (Kurdistan Water Organization، ل سالا ٢٠٠٩ هاتیە دامەزراندن، رێكخراوەكە پارێزڤانیێ ل پاراستنا ئاڤێ دكەتن وەكی سامانەكێ سروشتی.
٧- رێكخراوا كوردستان بۆ پاراستنا مافێن ئاژەلان (KOARP)، Kurdistan Organization for Animal Rights Protection، ل سالا ٢٠٠٩ هاتیە دامەزراندن و پارێزگاریێ ل مافێن ئاژەلان دكەتن و ب تایبەت ئەو ئاژەلێن بەر ب كێمبوونێ دچن.
٨- رێكخراوا باسك بۆ گەشەپێدانا چاندنێ (BOAD)

٩- رێکخراوا ئازا بۆ پاراستنا ژینگەهێ (A.O.E.P)
١٠- رێکخراوا چەمێ ریزان بۆ چاندنێ (C.R.O.A COA)
١١- رێکخراوا گارە بۆ پاراستن و گەشەکرنا ژینگەهێ
١٢- رێکخراوا پاك بۆ پاراستنا ژینگەهێ ل ئاکرێ
١٣- رێکخراوا دەشت بۆ هەڤکاریکرنا جوتیاران
١٤- رێکخراوا بەیبین یا چاندن و پاراستنا گیایێن نوژداری ژ ناڤچوونێ
١٥- رێکخراوا سیل بۆ هوشیاریا ژینگەهێ (S.O.E.A)
١٦- رێکخراوا رکاڤا بۆ پەرەپێدانا چاندنێ (R.O.A.D)
١٧- رێکخراوا هەلگورد یا پاراستن و رەوشەنبیریا ژینگەهێ
١٨- رێکخراوا مەحفەل بۆ گەشەپێدانا چاندنێ
١٩- رێکخراوا پەرەپێدانا سامانێن سروشتی (O.N.D.R)
٢٠- رێکخراوا گەشەپێدان و ئاڤەدانکرنا گشتوکالی ل کوردستانێ (KARDO)

**رێکخراوێن د بوارێن (هاریکاری و هەوارهاتنێ و خێرخوازی) دا کار دکەن،**

١- رێکخراوا هاریکار H.O (ل ئەیارا ٢٠٠٤ هاتیيەدانان و پشتەڤانیا جڤاکێ مەدەنی ل پاریزگەها دهۆکێ ل سەر بونیاتێ بنەمایێن ریزگرتن ل مافێن مرۆڤی و بۆچوون و بۆچوونا جودا ل سەر بنەمایێ دیموکراسیەتێ دکەتن و ب تایبەت یێن گریدایێ ژنێ و زارۆکی ڤە).
٢- رێکخراوا گاف بۆ گەشەپێدان و هەوار هاتنێ.
٣- رێکخراوا ئاوار یا شێلتەر و ئاکنجیکرنێ
٤- رێکخراوی رزگاریخوازی مرۆیی عیراقی.
٥- رێکخراوا ئاڤەر بۆ ساخلەمیيا جڤاکی، (Aver for community health organization)، رێکخراوەکا خێرخوازە و ب تایبەت گرنگیێ ب نەخۆشێن گولچیسکان ددەتن.
٦- رێکخراوا هەڤکار بۆ ئاڤاکرنا شیانان (هاریکاری و خێزخوازی یە)، کار دکەتن بۆ هاریکاریکرنا نەخۆش و هەژاران ل دهۆکێ بێ جوداهیکرنا سیاسی و ئاینی و نەتەوەی، ل ٢٠١١/٠١/١٦ هاتییە دامەزراندن.
٧- رێکخراوا زروە یا خێرخوازی
٨- رێکخراوا پرۆگرامێ هاریکاریا مەسیح ل هەرێما کوردستانێ (CAPNI)
٩- رێکخراوا نیژین –NIZHEN (خێرخوازی)
١٠- رێکخراوا ڤیار بۆ هەڤکاریکرنا زاروکێن بێ سەمیان
١١- رێکخراوا شرق بۆ خێرخوازی و گەشەپێدانا کۆمەلایەتی
١٢- رێکخراوا ئێزیدیان بۆ هاریکاری و پشتەڤانیێ
١٣- MEDEAST ORGANIZATION (هاریکاریێن مرۆڤایەتی)
١٤- رێکخراوا فریاکەوتنا مللی–PAO (بۆ هاریکاریکرنا ئاوارە و پەنابەران)

**ئەو رێکخراوێن د بوارێن (پێکڤەژیانێ و وەکهەڤیێ و ئاشتخوازیێ و دوستایەتیێ) دا کار دکەن،**

١- رێکخراوا کەسکەسور بۆ پێکڤە ژیانێ (K.O.P.C)
٢- رێکخراوا دۆست بۆ پێکڤەژیانێ (DOC)، ل سەر دروستکرنا پرێن پێکڤەژیانێ ل کوردستانێ د ناڤبەرا ئاینان و تاکان دا کار دکەتن ، ل دهۆکێ ٢٢-١١-٢٠١٢ دەست بکاربوويە.
٣- رێکخراوا مەند بۆ یەکسانیێ (پێکڤەژیان)، ل ٢٣-٠١-٢٠٠٧ هاتییە دانان و د بیاڤێ یەکسانیێ د هەمی وارێن ژیانێ دا کار دکەتن.

٤- رێکخراوا کانی بۆ پێکڤەژیانێ و لێبورینێ

٥- رێکخراوا پێکڤەژیانێ (زاروکان – ئاکرێ)

٦- رێکخراوا هاوژیانا ئاشتیانە P.C.O (پێکڤەژیان)

٧- رێکخراوا ئاشتیخوازانی کوردستانی (ئاشتی و پێکڤەژیان)

٨- رێکخراوا ئاوات بۆ پێکڤەژیانێ (A.O.C)

٩- رێکخراوا جوودیا هیڤیا یا هاوکاری (هاریکاری و پێکڤەژیانێ)

١٠- رێکخراوا مەقلوب بۆ ئاشتی و پێکڤەژیانێ

١١- رێکخراوا پێکڤەژیانا ئایینان (شێخان)

١٢- رێکخراوا داسن بۆ گەشەپێدانا ئاشتیێ (گەشەپێدان ب پێکڤەژیانێ – شێخان)

١٣- کۆمەلا نوبل یا ئاشتی و گەشەپێدانێ و مافان.

**ئەو رێکخراوێن د بوارێن (هونەری و رەوشەنبیریا گشتی) دا کار دکەن:**

١- ئینستتیوتا دهۆک بۆ رەوشەنبیریا گشتی (DIGC) ل سالا ٢٠٠٥ هاتییە دامەزراندن.

٢- رێکخراوا ئاشووب بۆ رەوشەنبیریا گشتی

٣- رێکخراوا هەنگاو بۆ پەرەپێدانا رەوشەنبیری

٤- رێکخراواراتێستایارەوشەنبیری (RCO)

٥- رێکخراوا نوورۆژ یا رەوشەنبیری

٦- رێکخراوا جوان بۆ هشیاریێ

٧- رێکخراوا هەستێن چاند و هونەری

٨- رێکخراوا کلاسیك موزیك (هونەری)

٩- رێکخراوا گەشەپێدانا هونەری

١٠- رێکخراوا شەدا (هونەری و رەوشەنبیری)

١١- رێکخراوا بیك ستێر (هونەری و رەوشەنبیری)

١٢- رێکخراوا رەنگ بۆ گەشەپێدانا کارێن هونەری

١٣- رێکخراوا سەردەم بۆ هونەر و موزیکێ

**ئەو رێکخراوێن د بوارێن (ساخلەمیا گشتی و ساخلەمیا دەروونی و پەیداکرنا سەخلەمیێ) دا کار دکەن:**

١- رێکخراوا ڤینوس بۆ تەندروستیا خێزانی

٢- رێکخراوا شاد یا ساخلەمیێ

٣- رێکخراوا تەندروستی و جڤاك (HSO)

٤- رێکخرارا تیروژك یا تەندروستی

٥- رێکخراوا گەشبوون بۆ راوێژکاری و ئاراستەکرنا دەروونی (GOGPC)

٦- رێکخراوا هەکاری بۆ چارەسەریێن دەروونی

٧- رێکخراوا مینا بۆ گەشەپێدانا رەوشەنبیریا تەندروستی

٨- رێکخراوا راهوز بۆ پەروەردەکرنا خێزانەکا ساخلەم

٩- رێکخراوا ئاراس بۆ رەوشەنبیری و تەندروستیا گشتی

١٠- رێکخراوا دەروون (چارەسەریا دەروونی)

١١- دەزگای پالپشتی پێداویستی پویست (CNSF) – پشتەڤانیا هێزێن پێشمەرگەی و ئاوارەیان ژلایێ تەندروستی ڤە دکەتن.

١٢- رێکخراوا هیڤی نازدار بۆ زاروکان – تەندروستی (HNFC)

**ئەو رێکخراوێن د بوارێن(سیاسەتێ و یاسا و راپرسینێ) دا کار دکەن:**

١- پەیمانگەها گەل و سیاسەت(PGS)، ل ٢٠٠٩/٠٦/٢٩ هاتییە دامەزراندن و د بوارێن (پێشڤەبرنا بەهرەیان، پشکداریا جڤاکی، ڤەکولینێن زانستی و پیڤانا رایا گشتی) دا کار دکەتن.

٢- رێکخراوا یاسا بۆ پشتەڤانیا جڤاکێ سڤیل

٣- پەیمانگەها دهۆك بۆ پرسێن سیاسی (Dipi)

٤- رێکخراوا ماف یا خزمەتگوزاریا یاسایی

٥- رێکخراوا پێرس بۆ هشیارکرنا یاسایی
٦- رێکخراوا ئازاد یا راپرسیێ
٧- رێکخراوا گلۆپ بۆ راپرسی و پرسێن سەردەم
٨- رێکخراوا نیشتمان بۆ پاراستنا پێکهاتەیا خێزانێ یا یاسایی
٩- رێکخراوا بنەما بۆ پاراستنا مافێن یاسایی یێن مرۆڤی (BODLER)، کار دکەتن بۆ بەرگریکرن ژ مافێنیاسایی یێن مرۆڤی ل سەر (وەرگرتناپێزانینان ل سەر پێشێلکارییێن هاتینە ئەنجامدان لسەر مافێن مرۆڤی و فشار ئێخستن بۆ سەر لایەنێن ئەنجامدەر بۆ قەرەبووکرنێ و بەلاڤکرنا رەوشەنبیریایاسایی ل سەر مافێن مرۆڤی).
١٠- رێکخراوا میتان بۆ ڤەکولین و راپرسی و نەزاهێ

**ئەو رێکخراوێن د بوارێن (ڤەکولینێن زانستی و تەکنەلۆژیایێ و ئەلکترونیاتان) دا کار دکەن:**

١- پەیمانگەها نورسی بۆ خواندن و ڤەکۆلین و راهێنانێ (ڤەکولین)
٢- رێکخراوا دەزگەهێ قەلەم بۆ ڤەکولینێن قورئانێ Q.I.K.S– (ڤەکولینێن قورئانێ)
٣- رێکخراوا ئۆپن - تانکا هزران (ڤەکولین – فکری)
٤- رێکخراوا نووتر بۆ تەکنەلوجیا و ڤەکولینان (NOTR)، ل ٢٠١٣ هاتییە دامەزراندن.
٥- رێکخراوا داهێنان بۆ ڤەکولینێن زانستی و گەشەپێدانا داهێنانێ
٦- رێکخراوا رەوشەنبیریا ئەلکترونی
٧- رێکخراوا سبە بۆ کۆمەلگەهەکێ تەکنولوجی
٨- رێکخراوا زلڤان بۆ تەکنولوژیا سەردەم
٩- رێکخراوا دەلال بۆ پێشکەفتنا تەکنەلوجیا سەردەم
١٠- رێکخراوا ڤەکولینێن جڤاکی و رامیاری – ڤەکولینێن زانستی (S.P.R.O)

**ئەو رێکخراوێن د بوارێن (پەروەردە و فێرکرنێ و ئەکادیمەتیێ) دا کار دکەن:**

١- رێکخراوا پەروەر یا گەشەپێدانا رەوشەنبیریا پەروەردە و فێرکرن (PODCE)
٢- رێکخراوا کوردی – ئەمریکی بۆ پەروەردە و پێگەهاندن
٣- رێکخراوا پشتەڤانیا خوێندکاران
٤- رێکخراوا زانا بۆ گەشەکرنا پەروەردەیێ (ZOED)
٥- رێکخراوا فێرخواز سەرکردێن دیموکراسیەتێ نە (پەروەردە و ئەکادیمی)
٦- رێکخراوا گەهین بۆ پێشئێخستنا شیانێن قوتابییان و لاوان (لاوان و پەروەردە)
٧- رێکخراوا رێژین بۆ پێشڤەبرنا ئاستێ زانیاری (پەروەردە و فێرکرن)
٨- رێکخراوا دەنگێ مامۆستا –V.T.O (بۆ پێشئێخستنا مامۆستایان)

**ئەو رێکخراوێن د بوارێن (نەتەوەی و و وەلاتی و نشتمانپەروەری) دا کار دکەن:**

١- رێکخراوا گەنجێن دەولەتا کوردستانێ
٢- رێکخراوا کوردایەتی (بۆ بهێزکرنا هەستا نەتەوایەتی)، گرنگیێددەتە بلندکرنا هەستا نەتەوایەتی ل دەف گەنجان و بلندکرنا ئاستێ رەوشەنبیری یێ نەتەوەی د ناڤ گەنجان دا.
٣- گرۆپێ دەولەتبوونا کوردستانێ، ل بن درویشمێ (کوردستان دەولەتا مەیە، کوردستان هەمی دگەل مەیە) کار دکەتن، و ل ٣١-٠٧-٢٠١١ ل دهۆکێ هاتییە راگەهاندن.
٤- رێکخراوا وەلات بۆ گەشەپێدانا رەوشەنبیریا هاولاتیبوونێ
٥- دەزگایێ پاراستنا ئالایێ کوردستانێ
٦- رێکخراوا ئاریا بۆ پەروەردەیا نیشتمانی

٧- رێكخراوا پاشەرۆژ بۆ بەلاڤكرنا هزرێن نەتەوایەتی
٨- رێكخراوا نیوستزن یا هوشیار كرن ژ ئەرك و مافێن هاولاتیبوونێ (NOEDRC)

**ئەو رێكخراوێن د بوارێن (پیشەیی و دیتنا دەلیڤێن كاری و هاندانا خەلكی بۆ كاری) دا كار دكەن:**

١- رێكخراوا مەتین بۆ بەرهنگاربوونا بێكاریێ
٢- رێكخراوا گەشەپێدان و نەهێلانا هەژاریێ
٣- رێكخراوا كارساز بۆ راهێنانێن پیشەیی
٤- رێكخراوا سەروار یا هاندانا هاولاتییان بۆ كەرتێ تایبەت
٥- رێكخراوا هان یا هاندانا هاولاتییان بۆ كەرتێ پێشەسازی
٦- رێكخراوا نیڤان بۆ راهێنانێن پیشەیی
٧- رێكخراوا ژنەر یا راهێنانا پیشەیی (Jinar VTC)

**ئەو رێكخراوێن د بوارێن (رۆژنامەگەری و میدیایی و رۆژنامەڤانی) دا كار دكەن:**

١- رێكخراوا بادینان بۆ رۆژنامەڤانیا ئازاد
٢- رێكخراوا نێرگز پرێس بۆ پەرەپێدانا توانایا رۆژنامەڤانی ل ئاكرێ
٣- رێكخراوا رەهەند بۆ پرسێن میدیایی
٤- دەزگەهێ ڤۆن گرۆپ بۆ رەوشەنبیری و راگەهاندنێ
٥- رێكخراوا جۆرنالست بۆ میدیاكارێن كورد
٦- رێكخراوا سیڤا بۆ پێگەهاندن و رەوشەنبیركرنا رۆژنامەڤانان

**رێكخراوێن د بوارێن (ئاڤەدانكرنا گوندان و گرنگیدان ب كەلتورێ گوندان) دا كار دكەن:**

١- رێكخراوا پرۆژەیێ بچوویك یێ گوندێن زاخۆ
٢- رێكخراوا فەرهەنگ بۆ گەشەپێدانا گوندان
٣- رێكخراوا رەوش بۆ گەشەپێدانا لادێكان (گوندان)
٤- رێكخراوا سوز بۆ گەشەپێدانا گۆندان (ئاكرێ)
٥- رێكخراوا ئاڤەدانكرنا كوردستانێ (KRO)، ل ١٩٩١/٥/١٥ هاتییە دامەزراندن و دەستەكێ بلند هەبوویە د بزاڤا ئاڤەدانكرنا گوندان دا ل دەستپێكا سالێن نوتان و هەتا نوكە ژی شوین تبلێن وێ دديارن كو رولەكێ مەزن دیتی یە.

**ئەو رێكخراوێن د بوارێ (وەرزشی) دا كار دكەن:**

١- رێكخراوا بادینان بۆ پەرەپێدانا وەرزشی
٢- رێكخراوا كۆك بۆ پەرەپێدانا وەرزشی
٣- رێكخراوا بزاڤ بۆ پەرەپێدانا وەزرشی
٤- رێكخراوا رەڤەند بۆ پشتەڤانیا وەرزشی

**ئەو رێكخراوێن د بوارێن(پێشمەرگە و شەهید و ئەنفالكریان) دا كار دكەن:**

١- رێكخراوا وەفاداری بۆ پێشمەرگەیێن دێرین
٢- رێكخراوا ماردین بۆ كاروبارێن ئەنفالكریان
٣- رێكخراوا شەهیدان OM- (بۆ خزمەتكرنا شەهیدان)

**ئەو رێكخراوێن د بوارێن (كێم ئەندام و خودان پێدڤیێن تایبەت) دا كار دكەن:**

١- رێكخراوا زیكو بۆ خودان پێدڤیێن تایبەت
٢- رێكخراوا ڤینوار یا كێم ئەندامان ل ئاكرێ

**ئەو رێكخراوێن د بوارێن (بەرگری شارستانی و شارستانیەتێ) دا كار دكەن:**

١- رێكخراوا پەیڤین بۆ هشیاركرنا بەرەڤانییا شارستانی
٢- رێكخراوا گەل یا شارستانی (PCO)

**ئەو رێکخراوێن (ئابووری و بازرگانی) دا کار دکەن:**

١- رێکخراوا گولیستان بۆ مرۆڤایەتی و سیستەمێ بازرگانی عیراقی – ئەمریکی (هاریکاری ئابووری)

٢- رێخکراوا ئاڤاکرن و وەبەرئانین (ئابووری و شەفافیەت)

**رێکخراوێن شوینەوار و گەشت و گوزاری:**

١- رێکخراوا شوێنەوارێن کوردستانێ

٢- رێکخراوا نێرگز یا هوشیاریا گەشت و گوزارێ و ژینگەهێ

**ئەو رێکخراوا د بوارێ (ئەدەبی و نڤیسکاری) دا کار دکەت:**

١- رێکخراوا وێژەی بۆ ئەدەبیات و رەوشەنبیریا گشتی.

**هندەك رێکخراو ژی یێن هەین رولێ ئەوان یێ مەزنە ل دهۆکێ بەلێ ژبەرکو ئوفیسا سەرەکی یا ئەوێ رێکخراوێ ل هەولێرێ یان سلێمانیێ نە و لقێن وان ل دهۆکێ کار دکەن وەکی:**

١- دەزگەهێ بارزانی یێ خێرخوازی، ل هەرێما کوردستانێ سالا ٢٠٠٥هاتیە دامەزراندن، و دەزگەهەکێ کوردستانی یە بۆ گەهاندنا هاریکاریێ بۆ خەلکێ لێقەومای و کێم دەرامەت و ئاوارە و پەنابەر کار دکەتن، و گرنکیێ ب پەروەردا زارۆکان و باشترکرنا رەوشا ساخلەمیێ و دابینکرنا پێدڤیێن خودان پێدڤیێن تایبەت ل کوردستانی ددەت، ل سەر سێکتەرێن (خوراك، پەروەردە، رەوشەنبیری، تەندروستی، کولایەتی و هەنەری) کار دکەتن و ئوفیسا سەرەکی ل هەولێرێ یە و نڤیسینگەها خۆ ل دهۆکێ هەیە.

٢- دەزگەهێ رەوانگە RWANGA، Decide, Commit, Succeed، کار دکەتن ل بن پەیاما ئەرکێ دەستەبەرکرنا حزمەتگوزاریان و بلندکرنا ئاستێ هشیاری و گەشەپێدانا شیانێن مرۆڤی و پاراستنا گروپێن لێقەومایی بۆ باشترکرنا ژین و ژیارا وان، هاریکاریا د ئەڤان بواران دا (ساخلەمی، پەروەردە، زاروکێن بێ سەمیان، ئافرەتان، خێزانێن بێ پالپشت، وەرزش، ژینگەهـ گرتنا خواندنێ ب ستویی خۆڤە) دکەتن.

٣- رابیتا ئیسلامی یا کوردی، رێکخراوەکا خێرخوازی یە و ل سالا ١٩٨٨ هاتییە دامەزراندن بۆ خزمەتکرنا هەمی خەلکێ عیراقێ و ب تایبەت یێ کوردستانێ و کار دکەتن د پێشکێشکرنا خزمەتگوزاریان دا ل سالا ١٩٩٢ وەرە و چاڤدێریا ئێتم و سێوییان دکەتن و ئاڤاکرنا مزگەفت و قوتابخانان.

٤- رێکخراوا ئاڤەدانکرن و فێرکرن و تەندروستیا کۆمەلێ (REACH)، ل سالا ١٩٩٥ هاتییە دامەزراندن و ئوفیسا سەرەکی ل سلێمانیێ یە و ل سالا ٢٠١٢ ئوفیسا دهۆکێ هاتییە دانان.

**رێکخراوێن NGO یێ نێڤدەولەتی ژی هەنە ل دهۆکێ کار دکەن، هندەك ل سەر پشکا دهۆکێ هاتینەدان و بارەگایێ وان یێ سەرەکی ل دهوکێ یە هژمارا وان (٦) رێکخراون و هندەك ژی ل هەولێر و سلێمانیێ نە و لقێن وان ل دهۆکێ نە هژمارا وان (٦٨) رێکخراون، کو سەرجەمێ وان دبیت (٧٤) رێکخراو ب ئەڤی رەنگی نە:**

١- (IMOB) رێکخراوا ئەلمانی – عیراقی یا د بوارێن مافێ مرۆڤی دا ل کوردستانێ کار دکەتن.

٢- (MEDAIR) میدایر رێکخراوەکا (سویسری) یە ل سالا ١٩٨٩ هاتییە دامەزراندن و د بوارێن هاریکاریێن مرۆڤی و ئاڤاکرنا دەستپێکێ و ئاڤاکرن د دەمێ تەنگاڤ و ساخلەمی و خوراکی و ئاڤ و پاقژیێ دا کار دکەتن.

٣- (OPM) اوبریشن میرسی، رێکخراوەکە کار

دکەتن د بوارێن مرۆڤایەتی – مافێن مرۆڤی و ئاواران دا و یا (سویدی) یە.

٤- (WVI) الرویا العالمیة الدولیة، کار دکەتن دبوارێ مرۆڤایەتی و مافێن مرۆڤی دا و رێکخراوەکا (ئەمریکی) یە.

٥- (DORCAS) دورکاس، رێکخراوەکە د بوارێن مرۆڤایەتی و مافێن مرۆڤی و ئاواران دا کار دکەتن و رێکخراوەکا (ھولەندی) یە.

٦- Mission East (M.E)، ئەڤ رێکخراوە ل سالا ١٩٩١ ھاتییە دامەزراندن و کار دکەتن بۆ ھاریکارێن مرۆڤی ل دەمێن تەنگاڤیان دا وەکی ئاڤا پاقژ و باشترکرنا ساخلەمیێ و راگرتنا پاقژیێ و گرنگیدان ب چاندنێ و بکارئینانا شیانێن وان بۆ ژیارێ و چاڤدێریا زارۆکی، و رێکخراوەکا (دانیمارکی) یە.

٧- People in Need (PIN)، ئەڤ رێکخراوە ل سالا ١٩٩٢ ھاتییە دامەزراندن و کار دکەتن د بوارێن پاراستنا مافێن مرۆڤی و پێکێشکرنا ھاریکارێن مرۆڤی د دەرگەھێن جودا دا، ورێکخراوەکا (کۆمارا تیشك)یە.

٨- (QANDEL) قەندیل، رێکخراوەکا بیانی یە د بوارێن ھاریکارێن مرۆڤی دا کار دکەتن، و رێکخراوەکا (سویدی) یە ل سالا ١٩٩١ێ ل ستوکھولم ھاتییە دامەزراندن.

٩- (IOHRDPF)(المنظمة الدولیة لحقوق الانسان و الدفاع عن الحریات العامه)، رێکخراوەکە دکەتن د بوارێن بەرەڤانیێ ژ مافێن مرۆڤی کار د چارچوڤێ جارنامەیێن جیھانی یێن مافێ مرۆڤی دا و پاراستنا ئازادیێن گشتی، و رێکخراوەکا (ئەمریکی) یە ل ١ ینایر، ٢٠١٢ ھاتە دامەزراندن.

١٠- Norwegian Church Aid (NCA) ھاریکارێن کەنیسا نەرویجی، رێکخراوەکە کار دکەتن د بوارێن ھاریکارێن بلەز د کاودانێن بەرتەنگ و رووبدانان دا و گەشەکرنا جڤاکی و رێکخراوەکا (نەرویجی) یە و بنگەھێ وێ ل ئوسلو یە.

١١- Mercy Corps (MCO)، رێکخراوەکە د بوارێن ھاریکارێن مرۆڤایەتی دا کار دکەتن و بنگەھێن وێ ل ئەمریکا باکور و ئەوروپا ھەنە، و ل سالا ١٩٧٩ ھاتییە دامەزراندن.

١٢- Norwegian Refugee Council (NRC) (المجلس النرویجي للاجئین) جڤاتا نەرویجی یا پەنابەران، رێکخراوەکا (نەرویجی) یەل سالا ١٩٤٦ ھاتییەدانان و د بوارێن مرۆڤایەتی و مافێن مرۆڤی و پەنابەران دا کار دکەتن.

١٣- CARE Deutschland-Luxemburg (CARE)، رێکخراوەکا (ئەلمانی) یە ل سالا ١٩٨٠ ھاتییە دانان و د بوارێن مرۆڤایەتی و مافێن مرۆڤی دا کار دکەتن.

١٤- Catholic Relief Services (CRS) ھیئة الاغاثة الکاثولیکیة، دەستەیا ھەوارھاتنا کاسولیکی، رێکخراوەکا کاثولیکایێن(ئەمریکا) یە ل ١٩٤٣ ھاتە دامەزراندن و د بوارێن مرۆڤایەتی و گەھاندنا ھاریکاریان ل دەمێ رویدانان دا کار دکەتن.

١٥- Welthungerhilfe (WHH)، رێکخراوەکا (ئەلمانی) یە ل سالا ١٩٦٢ ھاتییە دامەزراندن وئارمانجا وێ یا سەرەکی نەھێلانا برسێ و ھەژاریێ یە ل سەرانسەری جیھانێ.

١٦- French Red Cross (FRC) (الصلیب الاحمر الفرنسي) خاچا سۆرا فەرەنسی، رێکخراوەکا (فرەنسی) یە د بوارێن مرۆڤایەتی و ھەوارھاتنێ و ئاڤاکرنێ و ئاڤا پاقژ و ساخلەمیێ و پێشکەفتنێ و دانەکارکرنێ دا کار دکەتن.

١٧- Lutheran World Federation (LWF) (الاتحاد اللوثري العالمي)، رێکخراوەکا (سویدی) یە ل سالا ١٩٤٧ ھاتییە دامەزراندن و و بنگەھێ وێ یێ سەرەکی ل سویسرایە و د بوارێن مافێن مرۆڤی و ھاریکارێن مرۆڤایەتی و ئاسایشا خوارکی و فێرکرنێ و ئاڤاکرنێ و ساخلەمی و

پاقژیێ دا کار دکەتن.

١٨- (I.B.C)– (الهلال الازرق) هەیڤا شین، رێکخراوەکا (تورکی) یە د بوارێن مرۆڤایەتی و پەروەردە و فێرکرنا زارۆکان دا کار دکەتن.

١٩- Handicap International (HI)، رێکخراوەکا (فەرەنسی) یە ل سالا ١٩٨٢ هاتییە دامەزراندن، و بارەگایێ وێ یێ سەرەکی ل فەرەنسا و بەلجیکایە، د بوارێن مرۆڤایەتی و هاریکاریان بۆ خیڤەتگەهێن پەنابەراندکەتن.

٢٠- (WADI) وادی، رێکخراوەکا (ئەلمانی) یە د بوارێن مافێن ژنێ و گرنگیدان ب ژنێ و کێمکرنا توندوتیژیێ دژی ژنێ دا ل کوردستانێ کار دکەتن.

٢١- Un Ponte Per (UPP)، رێکخراوەکا (ئیتالی) یە ل سالا ١٩٩١ هاتییە دامەزراندن، د بوارێن هاریکاریێن مرۆڤایەتی و مافێن مرۆڤی دا کار دکەتن.

٢٢- (Tearfund)تیرفند، رێکخراوەکا خێرخوازی یا (بریتانی) یە ل سالا ١٩٦٨ هاتییە دامەزراندن د بوارێن هاریکاریێن مرۆڤی و ئاڤاکرنێن تەنگاڤیا و پاقژی و ساخلەمیێ دا کار دکەتن.

٢٣- Samaritan's Purse (SPIR)، (ساماریتا نبورس)، الإغاثة الأزمات والتنمية، رێکخراوەکا (ئەمریکی) یە ل سالا ١٩٧٠ هاتییە دامەزراندن و د بوارێن هاریکارێن مرۆڤایەتی و پشتەڤانیکرن ل قەیرانان و گەشەپێدانێ دا کار دکەتن.

٢٤- Agency for Technical Cooperation and Development (ACTED)،

رێکخراوەکا (فەرەنسی) یە ل سالا ١٩٩٣ هاتییە دامەزراندن، و د بوارێن هاریکاریێن مرۆڤی یێن بلەز و پاراستنا مافێن مرۆڤی و ساخلەمی و خوراکی دا کار دکەتن.

٢٥- Danish Refugee Council (DRC) (جڤاتا دانیمارکی یا پەرنابەران) المجلس الدانماركي للاجئين، ل سالا ١٩٥٦ ل (دانیمارك) هاتییە دامەزراندن، و د بوارێن هاریکاریکرنا مرۆڤایەتی و بریڤەبەرنا کارگێرێن چادرگەهان و پێشڤەبرنێ و پاراستنێ و ئاڤا پاقژ و ساخلەمیێ دا کار دکەتن.

٢٦- Peace Winds Japan (PWJ) (چەنگێ ئاشتیێ یێ یابانی)، رێکخراوەکا (یابانی) یە ل سالا ١٩٩٦ هاتییە دامەزراندن، و د بوارێن هاریکاریێن مرۆڤی و کارکرن بۆ نەهێلانا هەژاریێ دا کار دکەتن.

٢٧- Arbeiter - Samariter-Bund (ASB)، رێکخراوەکا (ئەلمانی) یە، د بوارێن هاریکاریێن مرۆڤی و خزمەتگوزاریێن رویدانان و کارێن جڤاکی یێن خۆبەخش و چارەسەریێن دەستپێکی و چاڤدێریا دانعەمران دا کار دکەتن.

٢٨- (FYF) دەزگەهێ ئێزدی یێ ئازاد، رێکخراوەکە د بوارێن مرۆڤایەتی و مافێن مرۆڤی و ئاواران دا کار دکەتن و رێکخراوەکا (کوردستانی – ئەمریکی) یە.

٢٩- (War Children UK) زاروکێن شەری یا بریتانی، رێکخراوەکا خێرخوازی یا (بریتانی) یە ل سالا ١٩٩٣ هاتییە دامەزراندن، و د بوارێن گەشەپێدانا زاروکێن ژ ئەگەرێ شەران زیان ڤێ کەفتی دا کار دکەتن.

٣٠- Save the Children International (SCI) رێکخراوا جیهانی یا رزگارکرنا زاروکان، رێکخراوەکا جیهانی یە د بوارێن پاراستنا زاروکان و پێشکێشکرنا خزمەتگوزاریان بۆ زاروکێن پەنابەر کار دکەتن.

٣١- Friends of Waldorf Education - (W.E) in Kurdistan (FWE) (أصدقاء والدورف التعليم) هەڤالێن وولدروف یێن فێرکرنێ، رێکخراوەکا (ئەلمانی) یە د بوارێن مرۆڤایەتی و پشتەڤانیا دەروونی و جڤاکی بۆ زاروکان دا کار دکەتن.

٣٢- (S.A.Z) رێکخراوا چاڤدێریکرنا زاروکان، رێکخراوەکا (ئەلمانی) یە د بوارێن مرۆڤایەتی و

